چاكسازى تێدا كردنى بۆ ئەوەى بەرى باش بگرێ ٥ درەختۆكێكە لە پێرى (الأريكة)يە ميوەيەكى دەنك سورى هەيە، ئەم درەختە چيلكەكەى زوو گڕ دەگرێ ٥ لەگەڵ دارى مەرخ لێكيان بدەى وەكوو شقارتە ئاگرى لێ دێتە دەر ٥ لە پەندا هاتووە: (في كل شجر نار واستمجد المَرْخَ والعفار) هەموو درەختێك ئاگرى تێدايە وەلێ درەختى مەرخ و عەفار لە هەموان زياتر ئاگريان لەخۆ گرتووە ٥ **العُفارِيَةُ**: پيس و چڵكن و قيز لێكراو ٥ **العَفَرُ**: روى زەوى ٥ گڵ ٥ يەكەم ئاودانى كشت و كاڵە ٥ **العَفْرُ**: روى زەوى ٥ گڵ ٥ دەگوترێ: (كلام لا عفر فيه) قسەيەكە بێ مانايە، ماناى جوانى لەخۆ نەگرتووە ٥ **العِفْرُ**: شتى پيس و قێزەون ٥ يەكانەبەراز، بەرازى نێر ٥ **العُفْرُ**: ئازا ٥ كەتە و بەهێز ٥ دورى و كۆنەسالى ٥ ديدەنى كردنى كەم ٥ دەگوترێ: (ما تأتينا إلا عن عُفرٍ) كەم كەم نەبێ نايەيتە لامان ٥ بازاڕى كەوتو و داوەشاو ٥ شەوى حەوتەم و هەشتەم و نۆيەمى مانگ ٥ **العُفْرُ**: دورى و كۆنەسالى ٥ **العَفْراءُ**: زەوييەك بێ خۆست نەكرابێ ٥ شەوى سيانزەى مانگ ٥ **العِفراةُ**: ئەو موانەى لە تەوقەسەرى ئادەميزاد دەروێن ٥ توكى پشتەسەرى شێر ٥ (يالى شێر) ٥ پۆپنەى كەڵەشێر ٥ **العُفْرَةُ**: سپيايى يەك تێكەڵ بە سورايى ببێ ڕەنگى وەكوو ڕەنگى گڵى لێ بێ ٥ موى پشتەسەرى شێر (يالى شێر) ٥ پۆپنەى كەڵەباب.

**العَفَرَةُ**: بەمانا (العِفراةُ)دێ ٥ **العِفْرُ**: پيس و قێزەون ٥ موى يالى شێر ٥ پۆپنەى كەڵەشێر ٥ (أَسَدٌ عِفِرٌّ) شێرێكى بەهێز و زەبەللاح ٥ **العِفْرِيُّ**: بەمانا (العِفْرُ)دێ ٥ **العُفُرَّةُ**: خەڵكى تێكەڵ لە زۆر تاقم و پێر ٥ **العِفِرِّينَ**: لێزان و كار دروست، ئيش لەدەست هاتوو ٥ (ليث عِفِرِّينٌ) شێر ٥ پياوى بەهێز و پێگەيشتو ٥ **العِفْرِيَةُ**: بەهێز و توانا، پيس و قێزەون ٥ پەڕو پۆڵى ملى كەڵەشێر ٥ موى پاشە سەرى ئادەميزاد و وڵاخ ٥ قژى پێشەسەر (كاكۆڵ) ٥ دەگوترێ: (جاء فلان نافشاً عِفرِيَتَه) فلانكەس بە ڕق هەڵساويى هات ٥ **العَفّارُ**: ئەو كەسەى پيشەى موتوربەكردنى دارخورما بێ ٥ **العَفِيُّ**: ئەو كەسەى هيچ جۆرە دياريیەك نادا بەكەس ٥ گۆشتى برژێندراو و وشكەوەبوو لەسەر بەردو لمبەلان بەهۆى گەرمايى خۆرەوە ٥ (زرع العفير) پرژاندنى تۆوى كشت و كاڵ كە دەچێندرێ پێش ئەوەى ئاو بدرێ ٥ **المُعافِرُ**: ئەو كەسەى لەگەڵ هاوەڵەكانى دەڕوا بۆئەوەى شتێكى لێيان دەست بكەوێ.

**المَعْفُورة**: بازاڕى كەوتوو بازاڕى بێ مامەڵە كە تەپ و تۆز كاڵاكانى داپۆشيبێ ٥ زەوييەك گياو گژەكەى خورابێ و گەڵاكەى دەركەوتبێ ٥ **اليَعفورُ**: ئاسكى ڕەنگ خاكى ٥ گۆلكەڵەى مانگا كێوى ٥ بەشێك لە شەو ٥ **تَعَفْرَتَ**: بووبە عيفريت ٥ **العِفريتُ**: پيس و چڵكنى و قێزەون ٥ كار ڕۆيشتو و لێزان ٥ **العَفاز**: گوێزى خوراو ٥ **العُفازَةُ**: ناوكى لۆكە ٥ **عَفَسَهُ عَفساً**: بە زويدا داو ژێر پێى خست و شێلاى ٥ زەبرى لە سمتى دا ٥ لە نيشەكەى گێڕايەوە ٥ بەندى كرد ٥ سوكايەتى پێ كرد ٥ **عافَسَ الأمورَ**: لە گژ كارەكەى ڕاچوو ٥ دەستى دايە نيشەكەى ٥ **إعتَفَسَ القومُ**: خەڵكەكە كەوتنە بەرەبەرەكانى يەكترى و يەكتريان كوشت ٥ **إنعَفَسَ في الماء**: خۆى لەئاوەكەدا نوقم كرد ٥ خۆى لەناو گڵ و خۆڵدا گەوزاند ٥ **تَعافَسوا**: شەڕو بەگژ يەكدا چوونيان كردە پيشەى خۆيان هەميشە لەناو خۆياندا شەڕو هەرايانە ٥ **عَفَشَ الشَّئَ عفشاً**:

شتەکەی کۆکردەوە ◊ **الأعفَشُ**: شەو کوێرو کوێرە مشە ◊ **العُفاشَة**: ئادەمیزادی بێ خێرو بێر.

**عَفَصَ** الشَّيءَ عَفصاً: شتەکەی داهێناو چەماندی ◊ دەگوترێ: (عَفَصَ یدە) دەستی خوارکردەوە، چەماندیەوە ◊ دەریهێنا ڕیشە کێشی کرد.

**عَفَصَ** القارورةَ: سەرپۆشی خستە سەر دەمی گۆزەکە ◊ **أعفَصَ** الحِبرَ: مازوی خستە ناو مەرەکەبەکەی ◊ **عَفَّصَ** الثوبَ: کراسەکەی بە مادەی (ألعَفَص) ڕەنگ کرد ◊ **العِفاصُ**: پەرۆیەکە سەری گۆزەو دیزەی پێ دادەپۆشرێ، هەمبانە، تێشودان: کە شوان نان و خۆراکی خۆی تێدا هەڵدەگرێ ◊ **العَفصُ**: داربەڕو ◊ بەری دار بەڕو ◊ مازو و گزگلک و سیچکە ◊ دەرمانی سکچوون لەو بەرە دارانە دروست دەکرێ ◊ هەروا بۆ دروستکردنی حیبرو ڕەنگو شتی وا بەکار دەهێندرێ ◊ **ألعَفَصُ**: لوتگیران، خواریی لە لوت دا ◊ **عَفَطَتِ** العَنزُ أو الضَّأنُ: مەڕەکە یان بزنەکە جرتی لێ دا ◊ پژمی ◊ دەگوترێ: (هو لا یساوي عفطة عنز) ئەو ترێکی بزن ناهێنێ.

**عَفَطَ** الراعي بغنمه عفطاً: شوانەکە بە دەنگێک کەوەکو جرت لێدان بێ دەنگی ئاژەڵەکانی دا بۆئەوەی دەریان بکاو رایان جمێنێ.

**عَفَطَ** فلان بشفته: فلانکەس بە لێو جرتی لێ دا.

**عَفَطَ** في کلامه: بەعەرەبی قسەی کرد بەلام بە زمانێکی خوارو نارەوان.

**عَفَّ** عِفَّةً وعفافاً: وازی لەکارو گوفتاری نارەوا هێنا ◊ دەگوترێ: (هم أعِفَّة الفقر) ئەوانە ئەگەر هەژاریشبن سواڵ ناکەن.

**عَفَّ** اللبنُ عَفّاً: شیرەکە لەگوانی ئاژەڵەکەدا کۆبوەوە ◊ **أعَفَّه** الله: خودا بەدووری کرد لە حەرام و نارەوا ◊ **أعَفَّتِ** الشاةُ: مەڕەکە چۆڕ چۆڕە شیری لەگوانیدا کۆکردەوە ◊ **عَفَّفَهُ**: شیری کەمی دەرخوارد دا ◊ **إعتَفَّ**: بەمانا (عَفَّ) دێ ◊ **تَعَفَّفَ**: بەمانا (عَفَّ) دێ ◊ بەزۆرە ملێ پاکداوێنیو کارو گوفتار باشی بەسەر خۆی دا هێنا ◊ شیری کەمی خواردەوە ◊ **إستَعفَفَ**: بەمانا (عَفَّ)دێ ◊ **العُفافُ**: چۆڕە چۆڕە شیر کە لەگوانی ئاژەڵەکەدا کۆدەبێتەوە پێش ئەوەی زۆر بێ ◊ یان پێش دۆشینی ◊ **العُفَّةُ**: ماسی بچکۆلەی سپی ڕوت ◊ **العِفَّةُ**: وازهێنانو دورکەوتنەوە لە هەرشتێک نارەوابێ ◊ دوایی تایبەت کراوە بۆ داوێنپاکیو شەرواڵ پاکی ◊ **العَفیفَةُ**: ئەو ئافرەتەی ڕەوشتی داوێنپاکی هەیەو لەکاری نارەوا خۆی بپارێزێ ◊ ئافرەتی خاتونو ڕەنگ زن.

**عَفَقَ** فلان عفقاً: فلانکەس زۆری هاتووچۆ کرد بەبێ هودە کەمێک نوستو بەخەبەر هاتو پاشان نوستەوە.

**عَفَقَ** فلانا بالسوط: بە قامچی لە فلانکەسی دا.

**عَفَقَ** الشيء: شتەکەی کۆکردەوە.

**عَفَقَ** العمل: کارەکەی بەخراپی ئەنجامدا.

**عَفَقَ** العازفُ الوترَ: مۆسیقا ژەنەکە دەستی لەوەتەرەکان توند کردو بەهێز پەنجەی پێدانا ◊ **أعفَقَ**: زۆر هاتو چوو بەبێ سود ◊ یان بەبێ نیش هاتو چوو ◊ **عافَقَهُ** مُعافَقَةً وعِفاقاً: موعالەجەی کرد ◊ فێڵی لێ کرد ◊ **عافَقَ** الذئبُ الغنمَ: گورگ کەوتە ناو مەڕەکەو تەفرو تونای کردن.

**عَفَقَ** الغنم: مەڕەکەی بەسەر یەکدا دایەوە، تێکی کردنەوە خڕی کردنەوە ◊ **إعتَفَقَ** الشَّيءُ: شتەکە دوای هەڵچوونو ڕاست قامەتی، چۆمایەوە، خوار

بۆوە ◊ **إعتَفَقَ** القومُ: خەڵکەکە بە شمشێر لێکیان دا، شەڕە شمشێریان کرد ◊ **إعتَفَقَ** الأسدُ: شێرەکە بۆ نێچیرەکەی گەڕایەوەو گرتی ◊ **إنعَفَقَ** فِي حاجَته: دەستی بە کارەکەی کردو خێرا ئەنجامی دا ◊ **تَعَفَّقَ**: پەنای بۆ برد ◊ **المِعفاقُ**: (رجل مِعفاقٌ) پیاوێکە زۆر دیدەنی دەکا، هەر دێو دەچێ.

**عَفِكَ** عفكاً وعفكاً: زۆر گێلو ئەحمەق بوو.

**عَفَلَ** الكبشَ عفلاً: دەستی لە سمتو گەڵو گونی بەرانەکە دا بۆئەوەی بزانێ قەڵەوە یان نا ◊ **عَفِلَت** المرأة أو الناقة عَفلاً: شتێکی خڕ لە منداڵدانی ئافرەتەکە هاتە دەرەوە، یان لە هێنی حوشترەکە هاتە دەرەوە، بەزۆری هاتنە دەرەوەی ئەو شتە دوای منداڵبوون دەبێ، ئەم حاڵەتە توشی ئافرەتی شوو نەکردو نابێ.

**عَفَلَ** الرجلُ: پیاوەکە شتێکی خڕی لە کۆم هاتە دەر وەکوو هێلکە وایە ◊ **عَفَّلَ**: ئەو شتە خڕەی لە شەرمگای ئافرەتەکەوە هاتە دەر بەداخکردن پوکاندیەوە ◊ **العافِلُ**: ئەو کەسەی لەسەر پۆشاکی درێژەوە پۆشاکی کورت لەبەر بکا ◊ **العَفلُ**: بەزی ناو گەڵو گونی بەرانو ئاژەڵی لەو جۆرەیە، هەرکاتێ چێودار ویستی بزانێ ئاخۆ ئەو حەیوانە قەڵەوە یان نا دەست لەگەڵو گونی لاڕانی بەرانەکە دەدا ◊ هێڵە تیلماسکی نێوان کونی پاشو هێنی پێشەوە ◊ **العَفَلُ**: شتێکی خڕە وەکوو هێلکە گون لە منداڵدانی ئافرەتو هێنی حوشتر دێتە دەر دەشوبهێتە هێلکە گونی پیاو ◊ جاری واش دەبێ ئەم شتە خڕە لەکونی پاشەوەی پیاو دێتە دەر وەکوو هێلکەی ئاسایی وایە ◊ **العَفلاءُ**: ئافرەتێکە (بیلا ماناکە)ی تەنگ بێ بەهۆی ئاوساویو ئەستوربوونی دیواری ڕێڕەوی ناوەوەی ◊ **العَفَلَةُ**: قیتکە یان میتکەی بیلا مانەی ئافرەت ◊ شتێکی خڕو هێلکەییە لە منداڵدنی ئافرەت یان شەرمگای حوشتر یان کونی پاشەوەی پیاو دێتە دەر.

**عَفَنَ** الشَّئَ عفناً: شتەکەی ڕانواندو بەرهەوای دا بۆئەوەی بترشێو بۆگەن بکا.

**عَفِنَ** الشَّئُ: شتەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد ◊ **أعفَنَ** فلان: فلانکەس پێستی قەڵش قەڵش بوو ◊ **اعفَنَ** الشَّئَ: شتەکەی بەخراپیو بێ کەڵکی کەوتە دەست ◊ **عَفَّنَ** الشَّئَ: شتەکەی خراپو بۆگەن کرد وای لێ کرد بەکەڵکی هیچ نەیەت ◊ **تَعَفَّنَ** الشَّئُ: شتەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد ◊ **العَفَنُ**: ڕوەکێکی فوترییە دەبێتە هۆی بۆگەنبوونی شتی تر.

**عَفَا** الأثرُ: شوێنەکە نەما، شوێنەواری کوژایەوە ◊ دەگوترێ: (عفا أثر فلان) شوێنەواری فلانکەس نەما کوژایەوە .

**عَفَا** الشَّئُ: شتەکە گوم بوو دیار نەما.

**عَفَت** الأرضُ: زەویەکە ڕوەکی زۆری لێ ڕواو داپۆشرا.

**عَفَا** الماءُ: ئاوەکە صاف بوو هیچ شتێکی تری تێکەڵ نەبوو لێڵی بکا.

**عَفَا** الريحُ الأثرَ: ڕەشەبایەکە شوێنەوارەکەی پڕکردەوە، کوژاندیەوە.

**عَفَا** الشَّئَ: شتەکەی زۆرکردو درێژی کرد.

**عَفَا** فلاناً: هاتە لای فلانکەس داوای بەخششو یارمەتی لێ کرد.◊**عَفَا** له بماله: ئەوەی لە پێداویستی خۆی زیاد بوو دای بەئەو.

**عفا** عن ذنبه وعنه: لێی خۆش بوو، چاو پۆشی لێ کرد ◊ لەسەر تاوانەکەی سزای نەدا ◊ **أعفى**

فلان: زیادەی خۆی پێدا، ئەوەی لە پێداویستی خۆی زیاد بوو دای بەئەو ٥ **أعفى المريضُ**: نەخۆشەکە چاك بۆوە ٥ **أعفى فلاناً**: قەرزەکەی لە فلان داگرت‌و داوای لێ نەکردەوە ٥ موحاسەبەی نەکرد ٥ **أعفى الله**: خودا فلانکەسی لە بەلاو ناخۆشی پاراست ٥ **أعفى الرجلَ**: بەشی پیاوەکەی دا، بەخششی دایە ٥ **أعفى الشَعرَ**: مووەکانی هێشتنەوەو نەیتاشی ٥ لەحەدیسدا هاتووە دەڵێ: (قصوا الشوارب وأعفوا اللحي) سمێڵ کورت بکەنەوەو ڕیش بهێڵنەوە ٥ **عافاه الله معافاةً وعِفاءً وعافيةً**: خودا لە بەلاو نەخۆشی رزگاری کردو لەش ساغی پێدا ٥ **عافت الدولةُ فلاناً من الجندية**: دەوڵەت فلانکەسی لە ئەرکی سەربازی مەرەخەس کرد عەسکەری پێ نەکرد ٥ **عَفّى الحيوانُ**: ئاژەڵەکە مووی درێژ بوون‌و زۆر بوون ٥ **عَفّى فلانٌ الشَّعرَ**: فلانکەس مووی جەستەی هێشتنەوە ٥ **إعتَفاهُ**: هات بۆلای داوای بەخششی لێ کرد ٥ **إعتَفَت الإبلُ اليبسَ**: حوشترەکە بە لێوەکانی پوش‌و پەلاشەکەی لە گڵ‌و خۆڵەکە جیاکردەوەو خواردی ٥ **تعافى فلان**: فلانکەس چاك بۆوە ٥ **تعافى الشَّئُ**: وازی لە شتەکە هێنا ٥ **تعَفّى الشَّئُ**: شتەکە لاچوو نەما ٥ **إستَعفى مُكَلَّفَهُ**: داوای لێکرد ئەرکەکەی لەسەر لابەرێ ٥ **إستَعفى الإبلُ اليبسَ**: حوشترەکە بە لچی پل‌و پوشەکەی لە گڵ‌و خۆڵەکە جیاکردەوەو خواردی ٥ **العافي**: پێشەوا ٥ ئەو کەسەی دەچێ بۆ سەر بیرو کارێزاو ٥ میوان ٥ هەر کەسێك داوای بەخشش‌و یارمەتی بکا ٥ **العافِيَة**: تەندروستی تەواو ٥ میوان ٥ داواکاری بەخشش‌و یارمەتیدان ٥ داواکاری بژێوی‌و خۆراك ٥ هەڵوەدای خواردەمەنی چ ئادەمیزاد یان زیندەوەری تر.٥ **ألعَفَا**: وڵاتێکە دیاردەی فەرمانڕەوایی‌و پاشایەتی تێدا نەبێ، وڵاتی بێ میرو حاکم بێ ٥ **ألعَفاءُ**: فەوتان‌و تێداچوون ٥ گڵ‌و خۆڵ ٥ باران ٥ سپیایی چاو ٥ **العِفاءُ**: خوری‌و موی درێژەوەبوو ٥ پەڕی درێژ ٥ قژی درێژ ٥ **العِفاءَةُ**: پەڕو پۆڵی نەعامە کە درێژبن ٥ **العُفاوةُ**: شتی چاك‌و باش لەهەر جۆرێك بێ ٥ کەفی مەنجەڵ بنکرو بەرماوەی شۆربا ٥ **ألعَفوُ**: ماڵ‌و سامانێك زیاد بێ لە بژێوی پێویست ٥ بەرماوەی ئاو خۆرەوە ٥ ئاوێك زیاد بێ لە ئاو خۆرەوەو بەئاسانی دەست بکەوێ ٥ باشترین کاڵا لەهەر جۆرێك بێ ٥ چاکەو پیاوەتی ٥ زەوی‌و زارێك چۆڵ بێ‌و کەسی تێ نەچووبێ‌و شوێنەواری کەسی لێ نەبێ ٥ **ألعَفُوُّ**: کەسێك زۆر لێبوردە بێ، لێ خۆشبوونی زۆربێ ٥ **عَقَبت الإبلُ**: حوشترەکە لە لەوەڕگایەکەوە چووە ناو لەوەڕگایەکی تر.

**عَقَبَ** فلان على فلانة: فلانکەس فلان ئافرەتی مارە کردوە دوای ئەوەی بێوەژن بوو، لەژێر نیکاحی مێردی یەکەمی نەما.

**عَقَبَ** فلان فلاناً عقباً: فلانکەس دوای فلان کەوت‌و بەشوێنی دا هات ٥ زەبری لە پاژنە پێی دا ٥ بە ژێی وەتەری کەمان شەتەکی دا.

**عَقِبَ** النَّبتُ: ڕوەکەکە لاسکی باریك‌و گەڵاکەی زەرد بوو.

**عُقِبَ** فلان: فلانکەس پاژنەی پێی ئێشا.٥ **أعقَبَ الرجلُ**: پیاوەکە منداڵی لەپاش جێما ٥ **أعقَبَت الإبلُ**: حوشترەکە لە لەوەڕگایەکەوە گواستیەوە بۆ لەوەڕگایەکی تر ٥ **أعقَبَ الأمرُ**: سەرەنجامی کارەکە بەسوود بوو ٥ **أعقَبَ بين الشيئين**: ئەو دوو شتەی یەك بەدوای یەکدا هێنان ٥ **اعقَبَ**

عن الشَّيْ: لە شتەکە گەڕایەوە ◊ ژیوان بۆوە ◊ **اعقب** فلان في الراحلة والعمل وغيرهما: فلانی کردە پاشکۆ ◊ **أعقبَ** فلاناً باحسانه: پاداشتی خێری فلانکەسی دایەوە ◊ **أعقبَ** الطائفُ فلاناً: دەم دەمو جارجار شێتیەکە بۆ فلان دەگەڕێتەوە، هەر دەمە نادەمێك کابرا تووشی حاڵەتی شێتی دەبێتەوە ◊ **عاقبَ** بين الشيئين: ئەو دووشتەی یەك بەدوو یەك دا هێنان ◊ **عاقبَ** فلاناً: بەدوا فلانکەسدا هات ◊ **عاقب** فلاناً في الرحلة والعمل: لە سەفەرو کردەوەدا شوێن فلانکەس کەوت.

**عاقَبَ** فلاناً مُعاقبةً بذنبه: بە گوێرەی کارە خراپەکەی سزای فلانکەسی دایەوە ◊ **عَقَّبَ** فلانٌ: شوێن مافی زەوتکراوی خۆی کەوت بۆئەوەی مافەکەی بسێنێتەوە ◊ **عَقَّبَ** فلان في الصلاة: دوای ئەنجامدانی نوێژ دانیشتو مایەوە چاوەڕێی نوێژێکی تری کرد ◊ **عَقَّبَ** في الأمر: ڕاڕا بوو لە درێژەپێدانی کارەکەی ◊ **عَقَّبَ** على فلان: هێرشی کردە سەر فلانکەسو بە ناڕەوا ناوی زڕاندو عەیبو هەڵەکانی دەرخستن ◊ **عَقَّبَ**: گەڕایەوە سەری‌و ئاوڕی لێ دایەوە ◊ **عَقَّبَ** القاضي على حكم سلفه: دادوەر بڕیاری دادوەری پێش خۆی گوێ پێنەداو هەڵی وەشاندەوە ◊ **عَقَّبَ** فلاناً: بووە جی نشینی فلان ◊ **عَقَّبَ** فلاناً حَقَّهُ: مافی فلانکەسی دواخست ◊ **عَقَّبَ** الشَّيْءَ: شتەکەی بەتیل سیرمە شەتەك دا ◊ شتێکی تری هێنایە شوێنی شتەکە ◊ **عَقَّبَ** الجيشَ: هەندێکی لە سوپاکە گێڕایەوەو هەندێکی لێ ناردن ◊ **إعتَقَبَ** القوم عليه: خەڵکە لەسەر ئەوە کۆمەکی یەکتریان کرد ◊ **إعتَقَبَ** من كذا ندامةً: لەوە پەشیمانی بۆ مایەوە.

**إعتَقَبَ** الرجل: پیاوەکەی بەند کرد ◊ **إعتَقَبَ** البائع السلعة: فرۆشیار کاڵاکەی نەدایە کڕیار بۆئەوەی پارەکە وەرگرێ ◊ **إعتَقَبَ** فلاناً: بوو بەجێنشینی فلان، دوای ئەو هاتە سەر تەخت ◊ **إعتَقَبَ** القومَ الشَّيْءَ: خەڵکەکە شتەکەیان خستە بەرباس‌و لێکۆڵینەوە ◊ **إعتَقَبَ** فلاناً خيراً أو شرّاً بما فعل: بە گوێرەی کردەوەی چاك یان خراپ پاداش‌و سزای فلانکەسی ڕەچاو کرد ◊ **تعاقَبَ** الشيئان: ئەو دوو شتە یەك لەدوای یەك هاتنە کایەوە ◊ **تعاقَبَ** القوم في الشَّيْءِ او الأمر: خەڵکەکە شتەکەیان بەنۆبەو یەك لەدوای یەك گرتە ئەستۆ ◊ **تعاقَبَ** القوم عليه: خەڵکەکە لەسەری کۆك بوون‌و یارمەتی یەکتریان دا بۆ ئەنجامدانی ◊ **تَعَقَّبَ** فلان بخير: فلانکەس جار دوای جار خێرو بێری هێنا ◊ **تَعَقَّبَ** فلاناً: شوێن فلانکەس کەوت لێکۆڵینەوەی دەربارەی کرد، فلانکەسی لەسەر تاوان سزادا ◊ **تَعَقَّبَ** عورة فلان أو عثرته: لە عەیب‌و عاری فلانکەسی کۆڵیەوەو هەڵەو کارە ناشیرینەکانی شی کردنەوە بڵاوی کردنەوە.

**إستَعقَبَ** منه خيراً أو شرّاً: لە جیاتی فلان شت خێرو بێر یان شەڕو نەگبەتی لێوە دەست کەوت ◊ **إستَعقَبَ** فلاناً: بە دواداچوون‌و لێکۆڵینەوەی دەربارەی فلان کردو هەوڵی دا عەیب‌و عاری تێدا بدۆزێتەوە ◊ **الأعقابُ**: ئەو لەتە سواڵەت‌و شتە وردانەیە دەخرێتە نێوان درزی ئەو خشتانەی دیواری پێ هەڵدەچندرێ بۆئەوەی دیوارەکە چاك کون بڕبێ‌و یەکتر بگرێ ◊ **التَّعَاقُبُ**: (التعاقب القمي) لەبواری زانستی ڕووەکناسیدا گەشەکردنی هەموو ئەندامەکانی ڕووەکە لەڕەگەوە تاسەرە تۆپەی لق‌و گەڵاکانی ◊ **العاقِبُ**: کۆتایی‌و خاتیمەی شت

◊ هەر شتێك دوای شتێكی تر بێ یان ببێتە جێ نشینی ◊ ئەو كەسەی دەبێتە جێنشینی گەورە پیاو لە پلەو پایەدا ◊ پاداشی چاكە ◊ **العُقابُ**: هەڵۆ، یان داڵاش ◊ باڵندەیەكی گۆشت خۆرو جنگ قەویە دەندوكی كورتو كەوانەییە ◊ زۆر چاو تیژو دوور بینە ◊ لە پەندی پێشینانەدا هاتووە دەڵێ: (ابصَرُ من عقاب) فلانكەس لە داڵاش چاو تیژترو دووربینترە ◊ **العُقبُ**: كۆتایی شتو خاتیمەكەی ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا﴾ ◊ دەشگوترێ: (سافرت في عُقبِ الشهر) كۆتایی مانگ سەفەرم كرد ◊ (عُقبُ الجمال) شێوەو شێوازی جوانی ◊ **العَقَبُ**: ئەو رەگە ئەستورو پتەوەی جەستەی حەیوانە كە ژێی كەوانو ئامێری مۆسیقای لێ دروست دەكرێ ◊ **العَقِبُ**: پاژنە پێ ◊ ئێسقانی پاژنە پێ كە گەورەترین ئێسقانی قاچە ◊ كۆتاییو خاتیمەی شت ◊ منداڵ، منداڵی پیاو كە دواخۆی لە ژیاندابن ◊ دەگوترێ: (جاء عَقِبَهُ وبعَقِبهِ) دوا ئەو هات ◊ (رجع على عقبه) بەرێگای خۆیدا گەڕایەوە ◊ (وَطِئوا عَقِبَ فلان) بە شوێن پێی فلاندا ڕۆیشتن ◊ (فلان مُوَطَّأ العقِب) فلانكەس شوێنكەوتوی زۆرە ◊ **العُقبى**: قیامەت ◊ گەڕانەوە بۆلای خودا ◊ كۆتایی هەموو شتێكو خاتیمەی ◊ پاداشتی كار ◊ **العُقبَةُ**: كۆتایی شتو خاتیمەی ◊ نۆرەو بەدەل ◊ ئەو شیرینیو شتەی دوای نان دەخورێ ◊ شۆرباو و چێشتی تر كە لەمەنجەڵی خوازراودا دەبرێتەوە بۆ خاوەنی مەنجەڵە خوازراوەكە ◊ شێوەو شێوازی جوانی ◊ دەشگوترێ: (فلان ما يفعل ذلك إلا عُقبة القمر) فلانكەس ئەو كارە ناكا مەگەر كۆتایی مانگ ◊ **العَقَبَةُ**: كاری قورسو كۆسپی گەورە ◊ **العَقوبُ**: ئەو كەسەیە لەكاری باشدا دەچێتە جێگای یەكێكی پێش خۆی ◊ **العُقوبةُ**: سزای تاوان ◊ **العَقيبُ**: هەر شتێك دوای شتێكی تر بێو ببێتە جێ نشینی ◊ **المُعقِبُ**: سزادەر ◊ تۆڵە سێن ◊ **المِعقابُ**: ئافرەتێك عادەتی وابێ كوڕی بێ دوایی كچی بێ ◊ **المُعَقِّبُ**: كۆتایی ڕۆژ دەمەو ئێوارە ◊ دەگوترێ: (جاء فلان مُعَقِّباً) فلانكەس ئێوارە هات ◊ **المُعَقِّبات**: فریشتەی ڕۆژو شەو كە خودا داینـاون كـردەوەی چاكو خراپی بەندەكان بنووسن؛ كاروبارێ كە پێیان سپێردراوە ئەنجامی بدەن وەجبە وەجبەنو كە فریشتەی شەو هاتن فریشتەی ڕۆژ بەرز دەبنەوە ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾ ◊ تەسبیحات كە جۆرەكانی بەدوای یەكدا دەگوترێن ◊ **اليَعاقِبَةُ**: تاقمێكی نەصرانین شوێن كەوتووی (يعقوب البراذعي)ن ئەم یاقوب ناوە لە چەرخی شەشەمی زایینی دا لە وڵاتی شام دا ژیاوە، بڕوایان بەیەكیەتی (لاهوت و ناسوت) هەیەو پێیان وایە ئەم دوو شتە یەك سروشتیان هەیە ◊ **اليَعقُوبية**: بەمانا (اليعاقبة)ی ◊ بیرو باوەڕی یاقوبیەكان ◊ **تَعَقَبَلَهُ**: شوێنی كەوت ◊ **العُقبُولُ**: كاری قورسو كۆسپی گران ◊ پاشماوەی نەخۆشی ◊ پاشماوەی دوژمنایەتی، یان دڵداری ◊ ئەو كەفو لیكەی لە ناكامی لەرزوتادا لەسەر لێو دەردەكەوێ ◊ **العَقابيلُ**: بەڵاو كارەسات.

**عَقَدَ** السائلُ: شلەمەنیەكە بەستی، ڕەق بوو جا یان بەهۆی ساردی یان گەرمی ◊ گوڵوك كە دوایی دەومرێو لە شوێنەكەی بەرو بووم دێتە ئاراوە.

**عَقَّدَ** لفلان على البلد: فلانكەسی كردە فەرمانڕەوای وڵات.

**عَقَدَ** الحبلَ: گرێی لەحەبلەکە دا.

**عَقَدَ** ناصیته: ناوچەوانی گرژ کردو خۆی ئامادە کرد بۆ شەڕ.

**عَقَدَ** طرفي الحبل ونحوه: هەردوو سەری حەبلەکەی بەیەکەوە گرێدا.

**عَقَدَ** البناء: بەردی دیوارەکەی بەیەکەوە لکاندن بەجۆرێك یەکتری بگرن‌و دیوارەکە خۆڕاگر بێ ٥ بەشێوەی کەوانەیی بیناکەی دروست کرد.

**عَقَدَ** التاج فوق رأسه: تاجی لەسەرنا، تاجی بەسەری خۆیەوە شەتەك دا.

**عَقَدَ** البیع والیمین والعهد: مامەڵەکە یان سوێندەکە یان بەڵێنەکەی دوپات کردەوەو سووربوو لەسەر ئەنجامدانی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ﴾ ٥ **عَقَّدَ** العَسَلَ: هەنگوینەکەی شل کردەوەو تواندیەوە ٥ **عَقَّدَ** الکلام: قسەکەی چەواشە کرد وای لێ کرد ماناکەی باش دەرنەکەوێ‌و بەئاسانی نەزاندرێ ٥ **إعتَقَدَ** الشَّيْءُ: شتەکە ڕەق‌و پتەو بوو ٥ دەگوترێ: **إعتَقَد** الاخاء بینهما: برایەتی‌و دۆستایەتی لەنێوانیاندا چەسپا ٥ **إعتَقَدَ** الحبلَ ونحوه: حەبلەکەی گرێ دا.

**إعتَقَدَ** التاج فوق رأسه: تاجی لەسەرنا، تاجی لەسەری خۆی قایم کرد ٥ **إعتَقَدَ** الدُّرَّ: ملوانکەی مرواری هۆنیەوە ، لە مرواری ملوانکەی دروست کرد ٥ **إعتَقَدَ** فلان الأمرَ: فلانکەس شتەکەی بەلاوە ڕاست بوو لێی دڵنیا بوو، دڵ‌و دەروونی لەسەری دامەزرا ٥ **إعتَقَدَ** عَقاراً: زەوی‌و زارەکەی لەسەر خۆی تاپۆ کرد بۆخۆی دانا ٥ **إنعَقَدَ**: دامەزرا ٥ بۆ موتاوەعەی (عَقَدَ)دێ ٥ دەگوترێ: **إنعَقَدَ** الحَبلُ أو البناءُ أو الیمینُ: حەبلەکەی گرێ دا، باڵەخانەکەی ڕابەست، سوێندەکەی دامەزرا ٥ **تَعاقَدَ** القومُ: خەڵکەکە پەیمانیان بەست‌و وادەو بەڵێنیان دا بەیەکتری ٥ **تَعَقَّدَ** الخیط ونحوه: دەزووەکە گرێی خوارد، گرێ درا ٥ **تَعَقَّدَ** السائلُ: شلەمەنییەکە ڕەق بوو ٥ **تَعَقَّدَ** الرملُ: لمەکە یەکتری گرت‌و ڕەق بوو ٥ **تَعَقَّدَ** السحابُ وقوسُ قُزَح في السماء: هەورەکە لە ئاسمان چین لەسەر چین وەستا وەکوو چینی دیوار یان شۆقە زێڕینە وەکوو دیواری کەوانەیی خۆی نواند ٥ **تَعَقَّدَ** الثری: گڵەکە ڕەق ٥ **تَعَقَّدَ** الاخاءُ: برایەتیەکەیان دامەزرا ٥ **تَعَقَّدَ** الکلامُ: کەلامەکە گرێ‌و گۆڵی تێدا پەیدا بوو بەهۆی خراپ ڕیزکردنی وشەکان، یان هەبوونی تەم‌ومژ لەسەر ماناکەی ٥ **التَّعقیدُ**: بەلای زانایانی زانستی بەیانەوە ڕێکخستنی کەلامە بەشێوەیەك ماناکەی ئاشکرا نەبێ ٥ بەمە دەگوترێ تەعقیدی لەفزی ٥ ئەگەر تەعقیدەکە بەهۆی مەجازێکی پەیوەندی دوورو کینایەکی دوورە لزوم بوو ئەوە پێی دەگوترێ تەعقیدی مەعنەوی ٥ **العَقدُ**: دیواری کەوانەیی بێ، عەگادەیی بێ ٥ عەهدو پەیمان ٥ ڕێکەوتنامەی نێوان دوو لایەن ٥ وەکوو گرێبەستی نێوان کڕیارو فرۆشیار ٥ نێوان ژن‌و مێرد ٥ هەروا ناوە بۆ هەموو گرێبەستێکی ئابووری‌و سیاسی ٥ لە ژمارەدا بریتیە لە خانەی دەیان تا دەگاتە نەوەد ٥ (صِیَغ العقود) ئەو ڕستەو وشانەن کە گرێبەستەکەی پێ دادەبەسترێ ٥ وەکوو ڕستەی: (زوجتك بنتي فلانة) (بعتك مالي هذا) ٥ **العِقدُ**: دەزوویەکە مووروی پێ دەهۆنرێتەوە دەکرێتە ملوانکە یان دەستەوانەی مەچەك ٥ **العُقدَة**: گرێ ٥ ئەو شوێنەی گرێیەکی لێ دەدرێ ٥ گرێیەکەی لەسەر لێ دەدرێ ٥ لە بواری

زانیاری ڕووەکناسیدا شوێنی دەرکەوتنی چرووزەو خونچەو گەڵایە لەسەر لاسك یان پەل‌و تولەی درەختەکە دەردێن ◊ لە بواری زانیاری دەروونناسی دا دیاردەیەکە لە خەمۆکی‌و کەبتەوە سەرهەڵدەداو هەبوونی خۆی دەچەسپێنێ ◊ لە بواری جوگرافیادا یەکەیەکە بۆ مەزەندەکردنی مەسافاتی دەریایی‌و بە میلی دەریایی دەناسرێ‌و درێژیەکەی (١٨٥٢مەترە) ◊ گرتنی شتێك‌و بەستنەوەی ◊ کۆمەڵ‌و تاقم ◊ ئیمامی عەلی لە وتارێکدا فەرمووی: (هذا جزاء من ترك العقدة) ئەمە سزای ئەو کەسەیە لەکۆمەڵ تار بووە ◊ فەرمانڕەوایی وڵات ◊ زمان گیران‌و لاڵی کە زمان وەکوو پێویست ناتوانێ وشەو ڕستەکان دەرببڕێ ◊ هەرچی ئادەمیزاد خاوەنداری بێ وەکوو خانو و بەرەو زەوی‌و زارو کاڵا ◊ زەوییەك لەوەڕی زۆرو درەختی لێ بێ ◊ دەگوترێ: (عَشِّ إبلكَ بتلك العُقدَة) وشترەکەت لەو پارچە زەویەدا بلەوەڕێنە ◊ هەروا وشەی (عُقدَة) بە مانا چەسپان‌و دامەزران‌و بڕانەوەو بڕیاردان دێ ◊ **العُقدَةُ** النفسية: تەنگەژمیەك تووشی ژیانی هەندێ ئادەمیزاد دەبێ سەردەکێشێ بۆ تێکچوونی دەروونی.

**العَقَدَةُ**: بنکی زوبان، ئەستوورایی زوبان ◊ **العَقّادُ**: بەمانا زێدە ڕۆیی لە گرێدان دا دێ ◊ دەزوو ڕێس، دەزوو فرۆش ◊ **العَقِيدُ**: لە بواری شلەمەنیدا مەبەست شلەمەنی خەستە ◊ پلەیەکی سەربازیە لە نێوان پلەی (مقدم)و عەمید دا ◊ **العَقِيدةُ**: بیرو باوەڕ کە بگاتە پلەی دڵنیایی‌و خاوەن باوەڕەکە شك‌و گومانی تێدا نەمێنێ ◊ لە بواری ئایینیدا بریتییە لە بیرو باوەڕ بەبێ کردار وەکوو بڕوابوون بە هەبوون‌و تاك‌و تەنهایی خودا ◊ ناردنی پێغەمبەران ◊ **العنقود**: هێشوە ترێ‌و شتی وا ◊ **المُعتَقَدُ**: بەمانا (العقيدة)دێ ◊ **المَعقِدُ**: شوێنی گرێبەست ◊ شوێنی گرێ ◊ دوخینی دەرپێ‌و شتی وا ◊ **المُعَقَّدُ**: هەرشتێك زۆر پڕگرێ‌و گۆڵ بێ قۆرت‌و چورتمی زۆربن ◊ قسەی پڕ تونێکڵ‌و گرێ‌و گۆڵ ◊ **المُعَقِّدُ**: جادوباز، ئەو کەسەی گرێ لەشت دەداو فوی لێ دەکا ◊ **عَقَرَت** المرأة والرَّجلُ عَقراً وعُقراً: ژن‌و پیاوەکە نەزۆك بوون منداڵیان نەبوو.

**عَقَرَ** النخل عقراً: دارخورماکەی لەسەرەوە بڕی.

**عَقَرَ** الإبلَ: قاچێکی حوشترەکەی بڕیەوە بۆئەوەی بکەوێ‌و بتوانێ سەری ببڕێ.

**عَقَرَ** الحيوانَ: ئاژەڵەکەی سەر بڕی.

**عَقَرَ** السرجُ والرحلُ الظَّهرَ: زین‌و کورتانەکە پشتی وڵاخەکەی بریندار کرد.

**عَقَرَ** الكلبُ الولدَ: سەگەکە منداڵەکەی گەست.

**عَقَرَ** الرجلُ عن حاجته: پیاوەکەی لە نیازو مەبەستەکانی لادا لێی مەنع کرد.

**عَقِرَ** الرجلُ عقراً: پیاوەکە لە شوێنی خۆی مایەوە پاش‌و پێشی نەکرد، چونکە ترساو حەبەسا، هەروەکوو قاچی بڕابێ ◊ **عَقِرَت** المرأة عَقاراً: ئافرەتەکە منداڵی نەبوو ◊ **عَقُرَتِ** المرأةُ عُقراً: ئافرەتەکە نەزۆك بوو.

**عَقُرَ** الرجلُ: پیاوەك نەزۆك بوو.

**عَقُرَ** الأمرُ: کارەکە سەرئەنجامی نەبوو ◊ **أعقَرَ** الرَّحلُ والسرجُ الظَّهرَ: کورتان‌و زینەکە پشتی وڵاخەکەی بریندار کرد ◊ **أعقَرَ** الله رحم المرأةِ: خودا منداڵدانی ئافرەتەکەی تووشی دەردێك کرد توشی نەزۆکی بوو ◊ **عاقَرَ** الخمرَ: هۆگری ئارەق خواردنەوە بوو وازی لێ نەهێنا ◊ **عَاقَرَ**

فلاناً: پێشبڕکێی لەگەڵ فلاّندا کرد لە حوشتر سەربڕیندا بۆ خۆدەرخستن لەوەدا ئاخۆ کامیان سەخی ترە ◊ **إنعَقَرَ** ظَهرُ الدابة: پشتی وڵاخەکە بریندار بوو ◊ **إنعَقَرَ** البَعیرُ والفرسُ: حوشترەکە قاچی بڕدرایەوە بە شمشێر ◊ **تَعاقَرَ** الرجلان: دوو پیاوەکە پێشبڕکێیان کرد لە حوشتر سەربڕیندا ◊ **تَعَقَّرَ** فلان: بەمانا (أعقَرَ)ی ◊ **تَعَقَّرَ** ظهر الدابّة: پشتی وڵاخەکە بریندار بوو ◊ **تَعَقَّرَ** شَحمُ الناقة: بەز و پیوی حوشترەکە کۆبوەوە ◊ **تَعَقَّرَ** الغَیثُ: بارانەکە بەردەوام بوو ◊ **تَعَقَّرَ** النبتُ: ڕوەکەکە درێژ بوو ◊ **العاقِرُ** من الطیور: ئەو باڵندەیەیە کە پەڕو پۆڵی تووشی نەخۆشی دەبن ناهێڵێ باش بڕوێن ◊ هەروا وشەی (العاقِر) ناوە بۆ ڕوەکێك لە پێڕی (المرکبة) ڕەگەکانی لە بواری دەرمان سازیدا بەکار دەهێندرێ، ئەم ڕوەکە لە وڵاتی ئەفریقیا زۆرە ◊ **العَقارُ**: زەوی و خانوبەرە ◊ موڵکی نەگوێزراوە ◊ **العَقارُ** الحُرُّ: موڵکی پاڵفتەی وەها ساڵانە بەری خۆی بدا ◊ **العَقارُ**: لەهەموو شتێکدا جۆری باشییەتی ◊ **العُقارُ**: شەراب ◊ لە هەموو شتێك جۆری باشی ◊ **العَقرُ**: شوێنکە، شوێنەوار وەکوو شوێنکەی پەتی بەستنەوە بەقاچی وڵاخ و شتی واوە ◊ بناغەی هەموو شتێك ◊ هۆبەی گەل و هۆز ◊ **العُقرُ**: بناغەی هەموو شتێك ◊ ناوەڕاستی خانو ◊ هۆبەی گەل و هۆز ◊ لەوەڕی باش ◊ مارەیی ئافرەت ئەگەر بە شوبهەو هەڵە خرایە پەردەی بوکیەتییەوە ◊ جوانترین دێڕە شیعری چامەشیعر ◊ (بیضة العُقر) یەکەم هێلکەی مریشك کە دەیکا ◊ **العُقُرُ**: سەرەتای ئاگر، یەکەم دەستە چیلەی ئاگر کە لەوەوە ئاگرەکە بەهێز دەبێ و بڵێسە دەسەنێ ◊ دەرمانێکە دەبێتە هۆی دروست بوونی زاروك لە منداڵداندا ◊ **العُقرَةُ**: نەزۆکی ◊ **العُقرَةُ**: جۆرە مورویەکە ئافرەت هەڵی دەگرێ بۆئەوەی سکی نەبێ، ئاوس نەبێ ◊ دەگوترێ: (إمرأة عُقَرَة) ئافرەتێکە منداڵدانی نەخۆشەو منداڵی تێدا دروست نابێ ◊ **العَقّارُ**: ئەو کەسەی زۆر حوشتر سەربڕێ ◊ ئەو گژو گیاو کەرەستانەی دەرمانیان لێ پێك دەهێندرێ ◊ **العَقُورُ**: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (عاقِر)دێ ◊ دەگوترێ: (کلب عقور) سەگی دڕو مێنگر ◊ **العَقیرُ**: سەربڕاو ◊ پیاوێك کە نەزۆك بێ منداڵی نەبێ ◊ **العَقیرَةُ**: سەر بڕاو لە نێچیرو ئاژەڵی تر ◊ قاچی بڕدراوە ◊ دەنگ ◊ **عَقرَبَ** المکانُ والأرضُ: شوێنەکە، زەویەکە دووپشکی زۆری بوو ◊ **العَقرَبُ**: دووپشك؛ پیرۆیەکە لە پێڕی (عەنکەبیات)و ژەهرداره ◊ **عَقرَبُ** البحر: جۆرە ماسیەکی دەریاییەو سەری گەورەیەو بەسەر پشتیەوە زێدە باڵ و گەندەمۆ هەن، بڕێکیان ژەهراوین ◊ بورجێکە لە بورجەکانی ئاسمان ◊ سیرمە چەرمو ڕایەڵە چەرمی نەعلە کە قاچی تێ دەکرێ ◊ هەرەتی سەرمای زستان و کوشندەی ◊ **العَقارِبُ**: فیتنەو فیتنەجۆ ◊ **عَقرَبا** الساعة: دووکلکی کاتژمێر ◊ یەکیان سەعات و ئەوەی تریان دەقیقە مەزندە دەکا ◊ **العَقرَباءُ**: دووپشکە مێیە ◊ **العَقرَبَةُ**: بەمانا (العقرباءُ)دێ ◊ ئاسنێکی سەر گۆچان بە زین و کەژاوەو کورتانەوە هەڵدەواسرێ بۆئەوەی دێمکەو شتی وای پێدا بکرێ ◊ **العُقرُبانُ**: دووپشکە نێرە ◊ **المُعَقرَبُ**: شتی چەماوەو گۆچانی ◊ ئادەمیزادی تێکسمڕاوو کەتەو زەبەللاح ◊ **عَقَصَت** المرأة شَعرَها: ئافرەتەکە پرچ و قژی خۆی گورزە گورزە کردن و لول کردن و گرێی دان بۆئەوەی

بـار بەشـكاوەیی‌و پەرێـشانی بگـرن‌و ئـەمجار كردنیەوە، نالی دەڵێ:

﴿ئەژدەهای زولفت لەدەوری گەنجی حوسنت حاریسە حەلقە حەلقە چین بەچین سەرتا بەخواری گرتووە.﴾

یان قژی هەڵوێزنین‌و سەرە داوی قژەكانی بـردەوە بۆلای بنكە كانیان‌و وەك هەنار خـڕی هەڵدان‌و لەپاشەسەری یان لە تۆقەسەری بەستنی.

**عَقَصَ** أمرهُ: كارەكەی خـواركردو لـەڕێڕەوی خـۆی لایدا ◊ چەواشەی كرد.

**عَقِصَ** التَّيسُ ونحوه عَقَصاً: نێرییە قەرەكە شاخی بـۆ دواوە كەوانـە بوونـەوە ◊ **عَقِـصَت** أسـنان الرجـلِ: ددانـی پیاوەكـە بـۆ نـاو دەمـی خواربوونـەوە ◊ **عَقِـصَت** أصـابعُهُ: پەنجـەی پیاوەكە سواری یەكدی بوون.

**عَقِصَ** الرجلُ: پیاوەكە بەخیل‌و ڕژد بوو، ڕەوشـتی ناشیرین بـوو ◊ **عَقِصَت** الدابةُ: وڵاخەكە لەكاتی لێخـوڕین دا لـەباتی ئـەوەی بـەرەو پـێش بـڕوا پاشـەو پـاش كـشایەوە ◊ (فهـو اعقـص وهـي عقصاء) ◊ **العِقاصُ**: دەزوویەكە سەری پرچی پـێ دەبەسـترێ ◊ **العَقـصُ**: ملەگـەدە ◊ لیبەلانێـكی قەبارە بەستو كە ڕێگای پێدا ڕۆشتنی نـەبێ ◊ **العِقـصَةُ**: كۆمەڵـە قـژو پرچـی هـەڵوێزنراو وكۆكراوەن لە پشتە سەر یان لـە تۆقەسـەر ◊ **العُقصَةُ**: گرێی شاخی ئاژەڵ ◊ **العَقَصَةُ**: كۆمەڵە لیی قـەبارە بەسـتووە كـە ڕێـگای تێدا نـەبێ ◊ **العَقِّيصُ**: ڕژدو دەسـت قوچـاو تـەبیات زبـرو ڕەوشت ناشیرین.

**العُقَيصاءُ**: گەدە بچكۆلەی نووساو بەگەدە گەورەوە ◊ **العَقيـصَةُ**: بـەمانا (العِقـصَةُ)دێ ◊ **المِعقـاصُ**: مەڕی شاخ خوارو خێچ ◊ **المِعقَصُ**: تیری خوار ◊ مقەست ◊ **عَقعَقَ** العَقعَقُ: قەلە ڕەشـەكە قرانـدی ◊ **العَقعُـقُ**: باڵندەیەكـە لـە پێـڕی قەلەڕەشـە دەندوك درێژو كلك درێژە، عەرەب بەنیـشانەی نەگبەتی دەزانن ◊ **العَقعَقَةُ**: دەنگی قەلە ڕەشـە، قـرە قـری قەلەڕەشـە ◊ دەنگـی كاغـەزی تـازەو قوماشی تازە.

**عَقَفَ** الشَيءَ عقفاً: لاری كـردەوە، خواری كـردەوەو چەماندیەوە ◊ **عُقِفَـتِ** الـشاةُ: مەڕەكـە تووشی نەخۆشی عوقاف بوو ◊ **عَقَّفَهُ**: بەمانا (عَقَفَهُ) دێ ◊ **إنعَقَفَ** الشَيءُ: شتەكە چەمایەوە، خوار بۆوە ◊ **تعَقَّـفَ** الـشَيءُ: بـەمانا (إنعَقَـفَ)دێ ◊ **الأعقَـفُ**: چەماوەو خوارەوەبوو ◊ دەگوترێ: (عود أعقَفُ) داری چەماوە، ئاسنی چەماوە ◊ (ظَبيٌ أعقـف القـرون) ئاسـكی شـاخ چـەماوە ◊ **العُقـافُ**: نەخۆشیەكە تووشی چوارپەلی مەڕوبزن دەبێ‌و قاچی خوار دەبن ◊ **العَقفاءُ**: ئاسنێكە سەرێـكی خواركراوەتەوەو شتی پێ كێش دەكرێ.

**العُقّافَةُ**: دارێـكە سەرێـكی چەماوەتەوە شتی پێ كێش دەكرێ ◊ **المَعقـوفُ**: (الـصليب المَعقـوف) صـەلیبی چـەماوە ◊ ئـەم شـێوە صـەلیبە ℵ شـیعارو نـارمی نازیـەكان بـووە ◊ (القوسـان المَعقوفان: لەبواری چاپەمەنیدا ئەو زانیاریـەیان تێدا دەنووسرێ كە لەدەقە ئەصلیەكە زیادە ◊ **عَقَّت** أنثى الحيوان عَقَقاً وعِقاقاً: ئاژەڵە مێیەكە ئاوس بوو.

**عَقَّ** البَرقُ عقّاً: بروسكەكە دەركەوت.

**عَقَّ** فلان: فلانكەس موی پێشەسەری منداڵە تازە لەدایك بووەكەی تاشی بۆئەوەی عەقیقـەی بۆ بكا. **عَقَّ** القومُ بسهمٍ: خەڵـكەكە تیریان بە ئاسمانەوە نا، ڕووەو حەوا تیریان هاویشت وەكوو نیشانەیەك بۆ ڕازیبوون بـەخوێن وەرگـرتن‌و خوێن بەستنی كوژراوەكەیان، واتە: ڕازی بوون لەجیاتی ئەوەی بكوژ بكوژنەوە خوێن وەرگرن.

**عَـقَّ** عـن ولـده: ئاژەڵێـکی سـەربڕی لـە ڕۆژی حەوتەمی لەدایك بوونی منداڵەکەیدا، حەوتمی بۆکرد.

**عَـقَّ** ثوبـهُ: قوماشـەکەی دادڕی ◊ **عَقَّـت** الـريحُ السحابَ: بایەکە هەورەکەی کردەوەو بارانی لێ باراند.

**عَقَّ** أباه عَقاً وعُقوقاً: ئەزیەتی باوکی داو سوکایەتی پێ کـردو چاکەی لەگـەڵ نـەکرد ◊ (فهـو عَـقٌّ وعاقٌ وعَقوق).

**عَـقَّ** رحمـهُ: سـیلەی ڕەحمـی بـڕی پەیوەنـدی خزمایەتیو کەسایەتی پچڕاند ◊ **أعقَّـت** النخلة أو الكرمـة: دارخورماکـە یـان دار مێوەکـە قوناریـان دەرکـرد واتـە: نـەمامو لقـی تـر لـە بنکەکـەیان سـەریان هەڵـدا ◊ **أعَـقَّ** فـلان: فلانکەس بەرامبەر دایكو باوکی خراپەی کرد یان ئەزیەتی باوکیو دایکیو کەسانی تری دا ◊ **أعَقَّتِ** المرأةُ: ئافرەتەکە لەسکی دا منداڵەکەی قـژی لێ ڕوا ◊ **أعَـقَّ** المـاءَ: ئاوەکـەی تـاڵ کـرد ◊ **عاقَّـهُ**: پێـچەوانەی ئـەو جولایـەوە ◊ **إعتَـقَّ** الـسَّحابُ: هەورەکـە بـارانی بارانـد ◊ **إعتَـقَّ** المُعتَذِرُ: پاساو هێنەرەوە کە درێـژەی دا بەپاساو هێنانەوەکەی زێدە ڕۆیی کرد لەوبارەوە ◊ **إعتَقَ** فلان السيفَ: فلانکەس شمشێری ڕاکێشا ڕوتی کرد ◊ **إنعَقَّ** الثوب والغبارُ والسحابُ: قوماشـەکە دڕا، تەپوتۆزەکـە ڕەویـەوە، هەورەکـە کـەلێنی تێکەوتو خۆی سوك کرد ◊ **إنعَقَّ** البرقُ: هـەورە بروسـکەکە لەهەورەکـەدا بـلاو بـۆوە ◊ **إنعَـقَّ** الـوادي: شیوەکە قـوڵ بـوو ◊ **إنعَقَّـتِ** العقـدةُ: گرێـکە توند بوو ◊ **العُقاقُ**: ئاوی زۆر تاڵو تفت ◊ **العَقُّ**: بـەمانا (ألعاق)دێ ◊ هـەموو درزێـك لـە لمبـەلانو شتی تـر ◊ چاڵێـکی درێـژو قـوڵ لـە زەوی ◊ ئـاوی تـاڵ ◊ **العُقَـقُ**: هەورەبروسکە لـە پانتایی هـەوردا کـەوەکوو شمشێری بریسکەدار شـوعلەی درێژبێتـەوە ◊ منداڵێـك ئەزیـەتی بـاوكو دایکـی بـدا ◊ **العِقـانُ**: (عِقـان الكـروم والنخيل) ئـەو قونـارو دەوەنانـەی لـە بنکی دار مێـو و دارخورمـا دێنـە دەر ◊ **ألعَقَّـةُ**: چاڵێـکی قوڵ لە زەوی ◊ هەورە بروسکە کە بـە پانتـایی ئاسمان درێژ دەبێتەوە ◊ **العَقوقُ**: ئاژەڵی ئـاوس ◊ نمونـەی شتێـکە کەنـەبێ وەکـوو تـەیری عـەنقاو شـاری جابولقـا ◊ چونکە (الأبلـق) بـە ئەسـپی نێـر دەگـوترێ دیـارە ئەسـپیش ئـاوس نابێ ◊ دەگـوترێ: (كلفتني بيض الأنـوق والأبلـق العقوق) داوای هێلکەی حوشترو ئەسپی ئاوست لێ کـردم ◊ **ألعُقُـقُ**: دوژمنـی دوور ◊ ئەوانـەی قەتعی سیلەی ڕەحم دەکەن ◊ **ألعَقيـقُ**: ئـاقیق، بەردێـکی سـوورە لەگـەڵ ئـاڵتون بـەکاردێ بـۆ خشڵ، ئـەم جـۆرە ئاقیقـە لـە وڵاتـی یەمـەنو کـەنارەکانی دەریـای سـپی ئاوەڕاسـت دەسـت دەکـەون ◊ شـیوی قـوڵ کـە ئـاو لـە کۆنـدا دایـدڕیبێو بووبێتـە چـەم ◊ مـوی بێـچو کەلەسکی دایکیدا لێی ڕوابێ ◊ **العَقيقَـةُ**: موی سەری بێچو کە لەسکی دایکیدا لێی ڕوابێ ◊ حەیوان سەربڕین بۆ ڕۆژی حەوتـەمی لەدایك بـوونی منـداڵ (حـەوتم) ◊ ڕوناکـایی هـەورە بروسکە کـە بـۆ ماوەیـەکی کـەم لـە ئاسمانـدا دەمێنێتـەوە ◊ شـیوی درێـژی قـوڵ لەزەویـدا ◊ **العَقائقُ**: شمشێری بریسکەدار کـەوەکوو هـەورە بروسـکە درەوشـاندنەوەی لێ بـەدی دێ ◊ دەگـوترێ: (سَـلّو عقـائق كالعقـائق) ◊ شمشێر لەکالان ڕاکێشن وەکوو بروسکە بریسکەیان بێ.

**عَقَلَ** عقـلاً: شتەکانی وەکوو حەقیقـەتی خۆیـان زانی.

**عَقَلَ** الغلامُ: منداڵەکە پێگەیی‌و چاکەو خراپەی لێك جیاکردەوە ◊ دەگوترێ: (ما فعلت هذا مذ عقلت) لەوەتای دەست‌و دوی خۆم ناسیوە شتی وام نەکردووە.

**عَقَلَ** الیه عَقلاً وعقولاً: پەنای پێ بردو خۆی تێدا قایم کرد.

**عَقَلَ** الظلُّ عقلاً: سێبەرەکە هەڵکشانەوەو کۆبوونەوە لەکاتی نیوەڕۆدا.

**عَقَلَ** الشَّيءَ: شتەکەی وەکوو حەقیقەتی زانی.

**عَقَلَ** البعيرَ: دەستی حوشترەکەی بە ئەستورایی پشت ئەژنۆیەوە بەحەبل شەتەك دا بۆئەوەی بەییخ دراوی بمێنێتەوە.

**عَقَلَ** الرجلَ: پاشقولی هێنایە پیاوەکەو بەزەویدا دا.

**عَقَلَ** فلانا عن حاجته: فلانکەسی لە پێویستیەکانی مەنع کرد.

**عَقَلَ** القتيلَ: خوێنی کوژراوەکەی دا.

**عَقَلَ** الدَّواءُ البطنَ: دەرمانەکە سکچونەکەی ڕاگرت دوای ئەوەی کابرا سکی دەچوو سکچونەکەی ڕاوەستا.

**عَقَلَ** فلان فلانا عَقلاً: فلانکەس لە فلان عاقڵتر بوو.

**عَقِلَ** البعيرُ ونحوه: حوشترەکە قاچی تێك گیران قاچی لێك دان فەیزەن بوو ◊ **عاقَلَهُ**: لە عەقڵ‌و ئەزموونـدا پێشبڕکێیان کرد ◊ **عَقَّلَ** الكرمُ: دارمێوەکە بەرسیلەی دەرکرد ◊ **عَقَّلَ** فلاناً عن حاجته: فلانکەسی لە پێداویستیەکانی مەنع کرد ◊ **عَقَّلَ** فلاناً: فلانکەسی ئاقڵ کرد ◊ **إعتَقَلَ** بَطنُهُ: گەدەی گیرا، سکچونی نەما ◊ **أُعتُقِلَ** لِسانُهُ: زمانی گیرا ◊ **إعتَقَلَ** من دم فلان: لەجیاتی خوێنی فلان ماڵی وەرگرت ◊ **إعتَقَلَ** فلاناً عن حاجته: فلانکەسی لە پێداویستیەکانی مەنع کرد ◊ **إعتَقَلَ** الشرطة المُتَّهمَ: پۆلیس تۆمەتبارەکەی گرت، بەندی کرد بۆئەوەی دادگایی بکرێ ◊ **إعتَقَلَ** الدواءُ بَطنَهُ: دەرمانەکە سکی نەخۆشەکەی لە ڕەوانی ڕزگار کرد ◊ **إعتَقَلَ** فلاناً: پێپیلکەی هێنایە قاچی فلان‌و بەعەرزیدا دا ◊ **إعتَقَلَ** الرجلَ: قاچی نوشتاندەوە خستیە سەر کلێجەی ◊ **إعتَقَلَ** فلان رُمحَهُ: شمشێرەکەی خستە نێوان قاچی‌و زینەکەوە ◊ **تعاقَلَ** الرَّجلُ: پیاوەکە خوێنەکەی خستە سەرخۆی ◊ **تعاقَلَ** القوم دم القتيل: خەڵکەکە لەناو خۆیاند پارەی خوێنی کوژراوەکەیان دا ◊ **تَعَقَّلَهُ** عن حاجته: پێداویستیەکانی لێ مەنع کرد ◊ **تَعَقَّلَ** البعيرَ: دەستی حوشترەکەی هەڵبەست بۆئەوەی بەیخ دراوی بمێنێتەوە ◊ **تَعَقَّلَ** الرَّجلَ: قاچی نوشتاندەوەو خستیە سەر سمتی ◊ **العاقِلُ**: زیرەك‌و هەستیارو بەئاگاو عاقڵمەند ◊ ئەو کەسەی پارەی خوێنبەستنەکە دەدا ◊ **عاقِلَة** الرجل: خزم‌و کەسی پیاو ئامۆزاو بن ئامۆزاو بەرەو خوارتریش ئەوانەی هاوبەشی دەکەن لەخوێن دانەکەدا ◊ **العاقولُ**: ڕووەکێکە چقڵاویە، پەل‌و پۆپەکانی دەبنە چقڵی درێژ، گوڵەکانی سورن لەبەهاردا دەپشکون، بەرێکی ڕەقی هەیە لە شیو و دۆڵ‌و چۆڵەوانی دەڕوێ ◊ خۆشترین لەوەڕی حوشترە ◊ هەروا ناوە بۆ زەویەکی درکە درکەو پڕ شیو و دۆڵ‌و ڕێگا نادیار ◊ کاروباری شێواو ◊ **العِقالُ**: ئەو حەبلەی حوشتری پێ دەبەسترێتەوە ◊ جوانوە حوشتر ◊ (عِقال المِئين) لەلای عەرەبەکان بەکەسێکی خانەدانی وا گوتراوە کە دیل کرابێ دووسەد

حوشتری بۆ دراوه بەفیدیە ◊ پارچە بادراوێکە لەخوری یان لە ناوریشم کرابێتە عەگاڵو لەسەر گۆترەوە لەسەر بنرێ ◊ گۆترمو عەگاڵ بەزۆری عەرەب دەیکەنە پۆشاکی سەر ◊ اَلْعُقّالُ: گرژبوونی ماسولکەو دیاردەیەکی ئێش‌و ئازاری ماسولکەیە و سەردەکێشێ بۆ وەستانی جم‌و جۆڵی کاتی لەهەندێ ئەندامی جەستەدا ◊ دەشگوترێ: (داء ذو عُقال) دەردێکی درێژ خایەنەو چاکبوونەوەی نیە ◊ العُقَيلِي: بەرسیلە ◊ العَقْلُ: ئاوەز ◊ پێچەوانەی غەریزەیەکە کە ئیختیاری نیە ◊ هەربۆیە دەگوترێ: (ألإنسان حیوان عاقل) ئادەمیزاد گیانلەبەرێکی عاقڵمەندە ◊ ئەو هێزە نادیارەی ئادەمیزاد بەهۆیەوە بیردەکاتەوە بەڵگە دەهێنێتەوە، تەصەوەرو تەصدیق رێك دەخا ◊ ئەو هێزەی چاکەو خراپەو جوان و ناشیرین لێك جیادەکاتەوە ◊ خێرو شەڕ دیاریدەکا ◊ حەق‌و بەتاڵ لێك هەڵدەهاوێژێ ◊ هەروا بەمانا: دڵ، خوێن، قەلاو پەنادێ ◊ العُقلَةُ: ئەوەی شتی پێ دەبەسترێتەوە وەکو زنجیرو گوریس‌و حەبل‌و شتی وا ◊ لە بواری وەرزشی جەستەییەوە بریتییە لە پارچە دارێك، ئاسنێك لەنێوان دوو حەبلی بەستراو بەشتێکی ژوور خۆیەوە ◊ لولەیەکی قەفەزاژە کەبکەوێتە نێوان دوو گرێی لولە ژازمکەوە ◊ لەبواری ئەمام‌و شەتڵ ناسیدا لقێکە لەدرەخت جیادەکرێتەوەو دەنێژرێ، وەکوو تولە مێوو لقە هەنجیرو شتی وا ◊ اَلْعَقولُ: بۆ زێدە رۆیی لەمانای (عاقل) دێ ◊ دەرمانێکە سکچون رابگرێ ◊ لەبواری پزیشکیدا هۆکارێکە ئەنسیجەکان وێك بێنێتەوە ◊ یان ئیفرازات بوەستێنێ ◊ یان نەزیف‌و شتی وا بوەستێنێ ◊ العَقِيلَةُ: خانمی ماڵ‌و کەژاوە نشین ◊ ژنی ڕەنگ ژن‌و خان‌و مان ◊ گەورەی گەل‌و هۆز ◊ المُعتَقَلُ: بەندیخانە، شوێنی بەندکردن ◊ المَعقِلُ: پەناو قەلاو شورە ◊ عَقَمَت المرأة والرجلُ عَقماً وعُقماً: ژن‌و پیاوەکە نەزۆك بوون ◊ جۆرە نەخۆشیەکیان پێوە بوو کە ڕێگر بوو بۆ دروست بوونی منداڵ لە منداڵداندا.

**عَقَمَ** الله الرجل والمرأة عَقماً: خودا ژن‌و پیاوەکەی نەزۆك کردن منداڵیان نەبوو.

**عَقِمَ** عَقماً: بەمانا (عَقَمَ)دێ ◊ (فهو عقیم وهي عقیم) ◊ (ریح عقیم) بای بێ باران ◊ (یوم عقیم) رۆژی بێ هەوای سازگارو خۆش ◊ (عقل عقیم) عەقڵی بێ خێر. عاقمَهُ: کێشەی لەگەڵ دا کردو حەنەحەبەشەی لەگەڵدا نایەوە ◊ عَقَّمَ الشَّئَ: تەعقیمی شتەکەی کرد، هەرچی بەکتریاو میکرۆبی تێدا بوو لەناوی برد ◊ العُقامُ: دەگوترێ: (یوم عقام) رۆژگاری سەخت‌و ناخۆش کەس وسەر کەسی ناپرژێ ◊ (داء عقام) دەردی درێژ خایەن کە چاك بوونەوەی لێ نەبێ ◊ اَلْعَقامُ: بەمانا (العُقام) دێ ◊ پیاوێك منداڵی نەبێ ◊ العُقمُ: نەزۆکی، نەخۆشیەکە دەبێتە بەربەست لە دروستبونی منداڵ، جا نەخۆشیەکە لە ژنەکەیە یان لە پیاوەکەیە یان لە هەردووکیانە ◊ العَقَنقَلُ: شیوی قوڵ‌و گەورە ◊ تەپۆڵکە لمبەلانی پەکگرتوو.

**عَقِيَ** الرجلُ: پیاوەکە بیری هەڵکەندو لەقەراغیەوە ئاوی تێ چوو بەنارەحەتی ئاوی لێ هەڵدەگوزرێ.

**عَقِيَ** فلان الأمر: فلانکەس کارەکەی پێ ناخۆش بوو.

**عَقَى** المولودُ عَقياً: منداڵە تازە لەدایك بووەکە پیسایی ناوسکی دەردا ◊ أعقى الشَّئُ: شتەکە

تاڵ بوو ◊ **أعقى** فلان الشَّيَ: فلانكەس شتەكەی تف دایەوە لەبەر تاڵی بۆی قوت نەچوو ◊ **عقّى** الطائرُ: باڵندەكە زۆر بەرز فڕی ◊ **عقّى** المولودَ: خواردنێكی دایە منداڵەساواكە پیسایی ناوگەدەی فڕێدایە دەر ◊ **إعتَقَى** الرجل: پیاوەكە بیری هەڵكەند ئاو لە قەراغیەوە ڕژایە ناوی ◊ **إعتقى** فلان: فلانكەس چووە ناو قسەو لەزۆر باس و خواس دوا ◊ **العَقَاةُ**: شوێنی بەرفراوان لەبەردەم ماڵ یان لەدەورو بەری ◊ **ألعَقْوَةُ**: بەمانا (ألعَقَاة)دی ◊ **العِقيُ**: پیساییەكە لەگەدەی منداڵی تازە لەدایك بوو دێتە دەر ◊ **العِقيانُ**: زێڕی كۆبوەوە لە كانەكەیدا، زێڕی بێ خشت و خۆڵ، زێڕی پاڵفتە.

**عَكَبَ** عكوباً: پاڵەپەستۆیان كرد ◊ **عَكَبت** القِدرُ: مەنجەڵەكە بوخاری بەرز بۆوە.

**عَكِبَ** فلان عكباً: فلانكەس جەستەو قەبارەی كەتەو زەبەللاح بوو ◊ پەنجەكانی لێك نزیكبون و سواری یەكتر بوون.◊ **عَكَّبَتِ** النارُ: ئاگرەكە دوكەڵی كرد ◊ **إعتَكَبَ** الغبارُ: تەپوتۆزی هەڵساند ◊ **تَعَكَّبَتهُ** الهموم: خەم و خەفەت لێی كۆبوونەوە ◊ **ألعُكابُ**: تەپو تۆز ◊ دوكەڵ ◊ هەڵمی مەنجەڵ و دیزەی پڕ لەخواردەمەنی ◊ هەڕمتی كوڵانی مەنجەڵە كێشت ◊ **العَكوبُ**: تەپو تۆز ◊ كەنگر.

**عَكَدَ** الیه عَكداً: پەنای بۆ برد.

**عَكَدَ** الأمر فلاناً: كارەكە بۆ فلانكەس مەیسەر بوو.

**عَكِدَ** البعیرُ والضَّبُ عكداً: حوشترەكە قەڵەو بوو گۆشتی توند بوو ◊ **أعكَدَ** الیه: پەنای بۆ برد ◊ **إعتَكَدَهُ**: پێوەی نووسا، لەگەڵیدا بوو لێی دانەبڕا ◊ **إستَعكَدَ** البعیرُ والضبُ: بەمانا (عَكِدَ)دێ ◊ **إستَعكَدَ** الطائرُ والضبُ: باڵندەكە یان بزن مژەكە خۆی شاردەوە لەترسی ئەوەی باڵندەی وەكوو بازو داڵاش پەلاماریان بدەن ◊ **إستَعكَدَ** الماءُ: ئاوەكە ڕاوەستا ◊ **ألعُكدَةُ**: بنكی كلك و بنی زوبان ◊ هێزو توانا ◊ كون و لانەی بزن مژە ◊ پەڕێكە نانی پێ كونج كونج دەكرێ ◊ **المَعكودُ**: نیشتەجێی بەردەوام ◊ خۆراكی هەمیشەیی.

**عَكَرَ** عكراً وعكوراً: گەڕایەوە ◊ دەگوترێ: (عكر علی الشیئ) گەڕایەوە بۆسەر شتەكە.

**عَكَرَ** علیه الزمان بخیر: ڕۆژگار بەخێرو بێرەوە گەڕایەوە سەری.

**عَكَرَ** به بعیرُهُ: بە سواری حوشترەكەی گەڕایەوە بۆ لای ماڵ و منداڵ و خزم و كەس و كاری.

**عَكِرَ** الماءُ: ئاوەكە لیل بوو ◊ دەگوترێ: (فلان یصطاد في الماء العكر) فلانكەس لەناوی لیل و قوڕاودا ماسی دەگرێ، ڕاودەكا ◊ سود لە پشێویی كاروبار وەردەگرێ ◊ **أعكَرَ** الرجلُ: پیاوەكە جەڵەبە حوشتری هەبوو ◊ **أعكَرَ** السنامُ: دوگی حوشترەكە بەزی زۆر بوو ◊ **اعكَرَ** اللیلُ: شەو تاریكی زرینگایەوەو چڕبووە ◊ **أعكَرَ** الشَّيَ: شتەكەی لیل كرد ◊ **عَكَّرَ** الشَّيَ: بەمانا (أعكَرَهُ)دێ ◊ **إعتَكَرَ** فلان: فلانكەس هات و ڕۆیی ◊ ڕوی تێكردو پشتی تێكرد ◊ **إعتَكَرَ** علی الشَّيَ: گەڕایەوە بۆسەر شتەكە ◊ **إعتَكَرَ** القوم في الحرب: خەڵكەكە لەشەڕدا تێكەڵاو بوون ◊ **إعتَكَرَ** الشَّيَ: شتەكەزۆر بوو كۆبوەوە ◊ **إعتَكَرَ** اللیلُ: شەو زرینگایەوەو تاریكیەكەی چڕ بۆوە ◊ **إعتَكَرَت** الریحُ: ڕەشەباكە تەپوتۆزی هێنا.

إعتكَرَ الشبابُ: گەنجی مایەوەو بەردەوام بوو زوو پیر نەبوو ◊ **تعاكر القوم**: خەڵكەكە لەشەڕدا تێكەڵ بوون ◊ **ألعَكَرُ**: جەڵەبە حوشتری زۆر ◊ **ألعِكرُ**: ئەصلو بنەما، دابو نەریت ◊ **العَكَرُ**: خاكو زەوی كشتوكاڵی ◊ بەجێماوو بنزیلی هەرشتێك بێ ◊ **ألعَكَرَةُ**: جەڵەبە حوشتر، بنی زوبان ◊ **العِكرِشُ**: ڕوەكێكی گراوەیەو پەل دەهاوێ ◊ لەشوێنی تەڕو شێداردا دەڕوێ گەڵاكەی درێژكۆلەو گوڵەكەی سونبوولیە ◊ **عِكرِم الليل**: تاریكایی شەو ◊ **العِكرِمَةُ**: كۆترە مێ ◊ **عَكَزَ** بالشئ عَكزاً: شوێن شتەكە كەوتو كردی بە ڕێ نیشاندەری خۆی ◊ **عَكَزَ** على عُكازَتِهِ: خۆی بەسەر گاڵۆكەیدا دا.

**عَكَزَ** الرُمحَ: ڕمبەكەی لەزەوی چەقاند ◊ **تَعَكَزَ** على عُكازته: خۆی بەسەر گاڵۆكەكەیدا دا.

**عَكَزَ** قوسهُ: كەوانەكەی كردە گاڵۆكو خۆی دا بەسەری ◊ **العُكازَةُ**: بەمانا (العُكاز)دێ.

**عَكَسَ** الشئ: شتەكەی پێچەوانە كردەوە هەڵیگێڕایەوە ◊ بەسەر یەكی دا دایەوە ◊ دەشگوترێ: (عكس الكلام) قسەكەی بە پێچەوانەوە گێڕایەوە.

**عَكَسَ** الدّابةَ: جڵەوی وڵاخەكەی توند كرد، سەری وڵاخەكەی بۆ دواوە كێش كرد.

**عَكَسَ** الراكبُ الدابة: سوارەكە جڵەوی وڵاخەكەی كێش كرد بۆ دواوە بۆئەوەی پاشەو پاش بگەڕێتەوە.

**عَكَسَ** على فلان أمرهُ: كارەكەی بەسەر فلانكەسدا دایەوە.◊ **عَكَسَ** الشئ: شتەكەی بۆلای زەوی كێشكردو پەستاوتی.◊ **عَكَسَ** الدّابة عكساً وعكَساً: حەبلێكی لە لوتی وڵاخەكە كردو بە دەستێكیەوە بەستیو بۆئەوەی نەتوانێ جوڵەو بكاو زەلیل بێ.

**عَكَسَ** القضية: قەزیەی مەنتیقەكەی پێچەوانە كردەوە ◊ **عاكَسَهُ**: پێچەوانەی ئەو جوڵایەوەو ڕەدی دایەوە ◊ هەر یەك لەو دووانە پێشەسەری ئەوی تریانی گرت چنگیان تێك وەرهێنا ◊ **إنعَكَسَ الشَّئُ**: كۆتایی شتەكە بەسەر سەرەتاكەیدا درایەوە ◊ لایەكانی كەوتنەوە سەر یەك ◊ هەڵەوگێڕ كرایەوە ◊ **العَاكِسُ**: (عاكس التیار) ئامێرێكە گەڕانەوەی تەیار پێچەوانە دەكاتەوە ◊ بۆ شێوەی ڕاوەستان ◊ (المفتاح العاكِسُ) ئامێرێكە ڕێڕەوی تەیاری كارەبا پێچەوانە دەكاتەوە لە دائیرەی كارەبایی دا ◊ **العَكَسُ**: ستەمو ناحەقی ◊ بەستنەوەی وڵاخ بەبێ ئالیك بەبێ ئەوەی ئاڵفی بۆ دابنرێ ببەسترێتەوە ◊ لە زانستی مەنتیقدا گۆڕینو هەڵەوگێڕ كردنی هەردولای قەزییەیە بۆئەوەی قەزییەكی تری لێ پەیدا بێ لە ڕاستیدا وەكوو قەزییەی پێشوو وەهابێ ◊ لەبواری زانستی بەدیعدا بریتیە لە پێش خستنی بەشێكی كەلامەكە بەسەر بەشێكی تری داو پێچەوانە كردنەوەی، دەگوترێ: (عادات السادات سادات العادات) ◊ **ألعَكِیسُ**: شیر شۆرباى بەسەردا بكرێو بخورێتەوە ◊ تولە مێو بەسەر زەویدا بگوێزرێتەوەو بكرێتەوە بەنەمام ◊ **عَكَشَتِ** العنكبوتُ عَكشاً: جاڵجاڵۆكە تەونی ئەنجام دا.

**عَكَشَ** على الشَّئ: سۆزی بۆ شتەكە بوو.

**عَكَشَ** الشَّئ: شتەكەی كۆكردەوە.

**عَكَشَ** الشَّئُ: شتەكە وێك هاتەوە چووە ناو یەكەوە.◊ **عَكَشَ** الأمرُ: كارەكە قورس بوو ڕاوەستا ◊ **عَكَشَتِ** العنكبوتُ: جاڵجاڵۆكەكە

قاچی وێکهێنانەوە بۆ ئەوەی تەونەکەی بکا ٥ بچنێ ٥ **العَكَاشَةُ** و **العُكَّاشَةُ**: جاڵجاڵۆکە ٥ **عَكَصَهُ** عَكصاً: ڕەتی کردەوە، گێڕایەوە.

**عَكِصَ** عَكصاً: ڕەوشتی ناشیرین بوو ٥ **عَكَصَتِ** الدَّابَةَ: وڵاخەکە پاشەو پاش کشایەوە ٥ **تَعَكَّصَ** بە: ڕژدی پێکرد، لەدەستی دەرنەهات.

**عَكَظَ** الشَّئَ عكظاً: شتەکەی تاشی، شتی پێدا هێنا

**عَكَظَ** الأديم بالدِّباغ: بە دەباغکردن پێستەکەی خۆشکرد.

**عَكَظَ** خصمهُ بالحجج: بەبەڵگەوە بەرامبەرەکەی بۆڕدا ٥ **عَكَظَهُ** في المفاخرة: لە خۆ هەڵنانەوەدا باڵادەست بوو بەسەریدا، بەرامبەرەکەی بۆڕدا.

**عَكَظَ** الدابةَ: وڵاخەکەی حەبس کرد ٥ **عَاكَظَهُ**: لەمەبەستەکانی گێڕایەوەو نەیهێشت بەمراد بگا ٥ **عَكَظَهُ** عن حاجته: لە پێویستیەکانی لایدا ٥ **تعاكظوا**: شیعریان خوێندەوەو خۆیان هەڵنایەوەو شانازیان کرد ٥ شەرەشمشێریان کرد، مامەڵەو کڕینو فرۆشتنیان ئەنجام دا ٥ **تَعَكَّظَ** أمره، وعليه أمره: کارەکەی خوارو خێچ بوو گەیشتە بنبەست ٥ **تَعَكَّظَ** القوم في مكان كذا: خەڵکەکە لەوێ کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بیر لە ئیشو کاری خۆیان بکەنەوە ٥ **عكاظ**: بازاڕێکی عەرەب بوو لەسەردەمی پێش ئیسلامدا وەرزانە تێیدا کۆدەبوونەوە، شیعریان دەخوێندەوە شانازیان بەخۆیانەوە دەکرد ٥ ئەم بازارە کەوتبوە نێوان (النحلة) و (طائف)ەوە لەیەکەم ڕۆژی مانگی زیلقە عیدەوە دەستی پێ دەکرد تابیستی ئەو مانگە بەردەوام دەبوو.

**عَكَفَ** في المكان عكفاً وعكوفاً: لەو شوێنە مایەوەو تێیدا جێگیر بوو.

**عَكَفَ** في المسجد: لە مزگەوتدا مایەوە بەنیازی خودا پەرستی.

**عَكَفَ** على الشَّئِ: ڕوی لە شتەکە کردو دەستی دایەو وازی لێ نەهێنا.

**عَكَفَ** القوم حولهُ: خەڵکەکە لەدەوری گرد بوونەوە.

**عَكَفَ** الطيرُ حولَ القتيل: باڵندەو داڵەکان لەدەوری کوژراوەکە گرد بوونەوە.

**عَكَفَ** فلاناً على كذا عَكفاً: فلانکەسی لەسەر فلان شت بەندکرد.

**عَكَفَ** فلاناً عن حاجته: فلانکەسی لە پێداویستیەکانی مەنع کرد ٥ **عَكَفَ** الشَّئَ: شتەکەی خوارکرد، چەماندیەوە ٥ **عَكَفَ** الشَّعرَ: قژەکانی گشتو گرژ کردنەوە ٥ **عَكَفَ** القومَ عن كذا: خەڵکەکەی لەو شتە مەنع کرد ٥ **إعتَكَفَ** في المكان: لە شوێنەکە مایەوە ٥ **إعتَكَفَ** على الشَّئِ: لەسەر شتەکە مایەوە، بەردەوام بوو.

**تَعَكَّفَ** في المكان: لە شوێنەکە مایەوە ٥ **الإعتِكاف**: مانەوە لە مزگەوتدا بەنیەتی تاعەتو خودا پەرستی ٥ **العَكِفُ**: قژی گرژ.

**عَكَّ** الحرُّ عَكّاً: گەرما ڕەویەوەو بایەکەشی خست.

**عَكَّ** الرجلُ: پیاوەکە جێنشین بوو مایەوە.

**عَكَّ** بالأمر: ئەوەندەی شتەکە دووبارە کردەوە تا لێی ماندو بوو.

**عَكَّ** فلاناً بالقول: بەڕەقیو لالوتەوە وەڵامی فلانکەسی دایەوە.

**عَكَّ** فلاناً بشرّ: هێرشی هێنایەوە سەر فلانکەس، مافی فلانکەسی دواخست ٥ بەندی کرد ٥ **عَكَّهُ** عن حاجته: لە پێداویستیەکانی لایدا.

**عَكَّ** فلاناً بالحجة: بەبەڵگە فلانی بۆڕدا.

**عَكَّ** الحُمىّ: لەرزوتا توشی فلانکەس بوو کزو لاوازی کرد.

**عَكَّ** الكلام: قسەکەی شی کردەوە.

**عَكَّ** الحديث من غيرە: قسەی فلانی دووبارە کردەوە.

**عُكَّ** فلان: فلانکەس تای لێ هات ٥ گەرمی جەستەی زۆر زۆر بوو کاریگەری خراپی خستە سەر تەندروستی ٥ **ألعِكَاكُ**: هەرمتی گەرما لەگەڵ خستنی رەشەبا ٥ دەگوترێ: (يوم عِكَاك ٥ ومكان عِكاك) ٥ **العَكَكُ**: بەمانا (ألعِكَاكُ) دێ ٥ **العَكّ**: بەمانا (ألعِكَاكُ) دێ ٥ **العَكَّةُ**: زۆری گەرمیو وەستانی رەشەبا ٥ لەبەلان کە خۆر گەرمی کردبێ ٥ لەرزوتاو سەرەتای هەڵلەرزین لەکاتی لەرز داگرتندا ٥ **ألعُكَّةُ**: هیزەی بچکۆلە بۆ هەڵگرتنی رۆن تیایدا.

**عَكَلَ** عليه الأمر عكلاً: کارەکەی لێ تێکچوو لێی گۆڕا.

**عَكَلَ** فلان في الأمر: فلانکەس ڕای خۆی دەربارەی کارەکە دەربڕی.

**عَكَلَ** الشئ: شتەکەی کۆکردەوە، شتە بلاوەکانی گرد کردنەوە.

**عَكَلَ** الدابة: دەستی ولاخەکەی هەڵبەست بۆئەوەی نەتوانێ بڕوا.

**عَكَلَ** المتاع: کالاکانی لەسەر یەکتر ڕیز کردن ٥ **أعكَلَ عليه الأمر**: کارەکەی لێ شێوا، لێی گۆڕا ٥ **إعتَكَلَ الرجلُ**: پیاوەکە گۆشە نشین بوو، لاکەوت ٥ شەڕو بەربەرەکانی کرد ٥ دوو کەلەگاکە شەڕە قۆچیان کرد ٥ **إعتَكَلَ عليه الأمر**: بەمانا (عَكَلَ عليه الأمر) دێ ٥ **ألعِكالُ**: حەبلێکە دەستی ولاخی پێ هەڵدەبەسترێ ٥ حەبلەکە لە زەندی ولاخەکە دەبەسترێو بە ئەستورایی دەستیەوە شەتەکی دەدا.٥ **ألعُكَلِلُ**: خوێڕیو پڕوپوچ ٥ **العَوكَلُ**: پشتی کۆمەڵە لمب، سەر کۆمەڵە لمب ٥ پیاوی کورتە بالا کە قاچەکانی لێک دوور کەوتبنەوە ٥ ئافرەتی گێلو کەودەن ٥ **العَركَلَةُ**: بەمانا (ألعَوكلُ)دێ.

**عَكَمَ** عكماً: قەڵەو بوو.

**عَكَمَ** فلان: فلانکەس چاوەڕوانی کرد.

**عَكَمَ** المتاع: کالاکەی بەحەبلو شتی وا شەتەک دا ٥ قوماشەکەی بلاو کردەوە شتەکی خستە ناو و ئەمجار قوماشەکەی بەسەردا دایەوە، واتە: قوماشەکەی لەشتەکەوە پێچا ٥ شتەکەی خستە ناو لایەکی هۆڕەکەوە.

**عَكَمَ** الدابة: ولاخەکەی تەنگە دا ٥ دەمی جەواڵو خەرارو گوێنیەکەی بەست ٥ **أعكَمَ فلاناً**: یارمەتی فلانکەسی دا لەسەر شەتەک دانی کالاکان ٥ **عَكِمتِ الدّابةُ**: ولاخەکە قەڵەو بوو ٥ **إعتَكَمَ القومُ**: خەڵکەکە بارو بارگەنەیان ڕێکخست بۆئەوەی لەسەر پشتی ولاخەکان شەتەکیان بدەن ٥ **إعتَكَمَ الشّئُ**: شتەکان کەوتنە سەر یەک ٥ **ألعِكامُ**: ئەو حەبلو گوریسو شتانەی کالایان پێ شەتەک دەدرێ ٥ **ألعِكمُ**: قوماش لاتاو تێرەو هۆڕو قەرتاڵەو شتی وا بەمەرجێ کالایان تێدا بێ ٥ حەبلی بیر، گوریسی بیر ٥ حەبلی ئاو هەڵکێشان لەبیر ٥ **العَكّامُ**: ئەوکەسەی لاتاو لابارەکان لەسەر پشتی ولاخ ڕێک دەخاو شەتەکی دەدا ٥ قەتارچی ٥ **عَكَنَتِ الجارية**: جەتیوەکە لوێچی لەگەدەی پەیدا بوون بەهۆی قەڵەویەوە ٥ **تَعَكَّنَ البطنُ**: گەدەی شورابەی کرد لوێچو لۆچی تێدا پەیدا بوون ٥ **تَعَكَّنَ الشّئُ**: شتەکە

هەندێکی کەوتە سەر هەندێکی‌و دوو لۆو سێ لۆ بۆوە ◊ أَلعَكناءُ: ئافرەتی قەڵەوی ورگ شۆڕ ◊ العُكنَةُ: گۆشتی گەدە کە لوێچ‌و لۆچی تێدا پەیدا بوون‌و چرچەکانی کەوتبنە سەریەك.

**عَكَتِ** الدّابةُ عَكواً: وڵاخەکە لەبەهاردا کەتەو زەبەللاح بوو، قەڵەو بوو.

**عكا** الدخان: دووکەڵەکە بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە.

**عكـا** فلان بازاره: فلانکەس بە بەرکۆش‌و ئیزارەکەی ورگی شەتەك دا بۆئەوەی گەدەی دانەچۆڕێ ورگی شل نەبێ.

**عكـا** الضبُّ: بزنمژەکە کلکی خوارکردەوە، چەماندیەوە.

**عكا** الرجل ذنب الدابّة: پیاوەکە کلکی وڵاخەکەی گرێدا.

**عكا** الشّئ: شتەکەی شەتەك دا.

**عكا** فلاناً في الحديد: فلانکەسی پێوەند کرد.

**عَكَتِ** المرأةُ شَعرها: ئافرەتەکە قژەکانی کۆکردنەوە.

**عكـى** فلان بازاره عكياً: فلانکەس بە ئیزارو بەرکۆشەکەی بەرموسڵدانی خۆی بەست بۆئەوەی ورگی شۆڕابە نەکا.

**عكـى** فلان: فلانکەس مرد ◊ أعكى فلان: بەمانا (عكـى)دێ ◊ عكـىٌّ فلان: بەمانا (عكـى)دێ ◊ عَكىٌّ على السيف والرُمح: ڕەگە لاملێکی تەڕی لە شمشێرەکە یان لە ڕمبەکە شەتەك دا بەو سیرمە شمشێرەکەی پێچا ◊ عَكـىٌّ الدخان: دوکەڵەکە بەرەو حەوا بەرز بۆوە ◊ الأعكى: قەد ئەستۆر ◊ کەلەکەو خالیگە ئەستور ◊ ألعاكى: ریس ڕێسێك کە دوای ڕستنی ریسەکە بیفرۆشێ واتە: کەسێك پیشەی ئەوە بێ ریس بڕێسێ‌و بیفرۆشێ ◊ کەسێك زۆر حەزی لە شێری ساغ بێ، شیری بێ غەل‌و غەش بخواتەوە ◊ العَكوَةُ: بنکی کلك کە توکی ڕوتابێتەوە ◊ بنکی زمان ڕەگێکی سپیە تڵیش دەکرێ‌و بادەدرێ‌و دەکرێتە قەمچی منداڵانەو یاری پێ دەکرێ ◊ چاڵیەکە لە چەناگەی منداڵی ساوادا ◊ العُكوَةُ: بەمانا (العَكوَةُ) دێ ◊ ئەستوراییی شت ◊ زوربەی شت ◊ ناوقەد ◊ گلۆڵە ریسی ڕێسراو کە لەتەشیەکە دادەماڵدرێ ◊ ألعَكِيُّ: شیری خالیص‌و بێ غەش.

**عَلَبَ** الشّئُ علباً: شتەکە ڕەق بوو، وشکەوە بوو ◊ دەگوترێ: (عَلَبَ اللحمُ) گۆشتەکە بۆگەنی کرد.

**عَلَبَ** الشّئَ عَلباً وعلوباً: شتەکەی نیشانە کرد خەتخەت‌و کونج کونجی کرد دابڕدابڕی کرد.

**عَلَبَ** السيف ونحوه: دەسکی شمشێرەکەی بە ڕەگە لاملی حوشتر پێچا ◊ عَلِبَت يده: دەستی ئەستوور بوو.

**عَلِبَ** الحيوانُ: ئاژەڵەکە نەخۆشی توشی ڕەگی لاملی بوو ملەخڕەی گرت وملی خواربوو.

**عَلِبَ** السيفُ: شمشێرەکە کەل بوو، کەڵکی تێکەوت ◊ عَلِبَ الرجل: پیاوەکە ڕەگی لاملی دەرکەوت بەهۆی لوتبەرزی‌و خۆ بەزلزانی ◊ عَلَّبَ الرجلُ: پیاوەکە قسناغی دروست کرد (ئامێرێکی پێوانەی دانەوێڵەیە لەدار یان لە پێستی حوشتر دروست دەکرێ) ◊ عَلَّبَ السيف: دەسکی شمشێرەکەی بە تیلمە سیرمەی ڕەگی لاملی حوشتر پێچا ◊ عَلَّبَ الشّئَ: شتەکەی نیشانە کرد، خەت خەتی کرد، کەلکەلی کرد ◊ عَلَّبَ الفاكهة واللحمَ والخضر ونحوها: میوە یان گۆشت یان سەوزەکەی خستە ناو سندوق‌و کارتۆنەوەو پێچایەوە بۆئەوەی بنێردرێ بۆ

فرۆشتن یان بەشێوەیەك لە شێوەكان بۆ ماوەیەك هەڵبگیرێ ◊ اسْتَعْلَبَ اللحمُ: گۆشتەكە بۆگەنی كرد، بۆنی گۆڕا ◊ اسْتَعْلَبَ البَقلَ: پۆڵكەو دانەوێڵەكەی بە كاملی و ڕەق بوبی هاتەدەست ◊ اسْتَعْلَبَت الماشية البقل: ئاژەڵەكە پۆڵكەو لەوەڕەكەی بەدڵ نەبوو نەیخوارد ◊ إعلنبی الديك والكلبُ: كەڵەشێر یان سەگەكە خۆی ئامادەكرد بۆ شەڕ (شەڕە كەڵەشێرو) و (شەڕە سەگ) ◊ العَلْبُ: شتی توندو پتەو و ڕەق ◊ شوێنكەو كەلكەل كردن ◊ زەوی كە گیای لێ نەڕوێ ◊ العِلبُ: زەوی گیا تیانەڕواو ◊ پیاوی تەبیات وشكو كەتە ◊ شوێنی ڕوانی درەختی سیدر ◊ العَلِبُ: كەتەو زەبەللاحو بەتەمەنو زبر ◊ بەزۆری دەكرێتە ئاوەڵناوی نێریە قەرەو گاكێوی ◊ زەوی گیا تیانەڕواو ◊ پیاوی وشك تەبیاتو كەتەو تورە ◊ العلباءُ: ڕەگی لامل ◊ دەگوترێ: (تَشَنَّجَ عِلباء الرجل) ڕەگی لاملی پیاوەكە گرژ بوو ◊ العُلبَةُ: عەرەبەو قسناغ (ئامێرێكی دانەوێڵە پێوانە لە تەختەدار یان پێستی حوشتر دروست دەكرێ) ◊ زەرفێكە، سندوقێكە، هیزمیەكە، تەنەكەیەكە شتی تێدا هەڵدەگیرێ بۆ كاتی پێویست ◊ المَعلوبُ: ڕێگای تەخت كراو وخۆش كراو.

**عَلَثَ** الزندُ علثاً: چەرخەكە ئاگری نەكردەوە.

**عَلَثَ** الشيَ: شتەكەی كۆكردەوە، تێكەڵاوی كرد.

**عَلَثَ** القومُ علثاً: خەڵكەكە شەڕیان كرد.

**عَلَثَ** بهِ: پێوەی نووسا، هۆگری بوو.

**عَلَثَ** الذئبُ بالغنم: گورگەكە كەوتە ناو مەڕەوەو دەستی خۆی وەشاند ◊ عالَثَهُ: خۆی لێ نزیك كردەوەو شەڕی لەگەڵ كرد ◊ عَلَّثَت النفس: دەروونی تێكەڵهات ◊ عَلَّثَ الشَيَ: شتەكەی تێكەڵ كرد ◊ إعتَلَثَ فلان: فلانكەس نیسبەت درا بۆلای غەیری باوكی خۆی ◊ إعتَلَثَ الزندُ: چەرخەكە ئاگری نەكردەوە ◊ دەگوترێ: (فلان غير مُعتَلِثِ الزناد) فلانكەس بەدڵی خۆی ژنی نەهێناوە ◊ (فلان معتلث الزناد) فلانكەس بەدڵی خۆی ژنی هێناوە ◊ إعتَلَثَ الشَيَ: شتەكەی هەڵنەبژارد، هەروا هەڕەمەكی هەڵی گرت ◊ إعتلث زنداً: دارێكی هەڵگرت نازانێ ئاخۆ ئاگری تێدایە یان نا ◊ ئاگری پێ دەكرێتەوە یان نا.

إعتلث الشَيَ: شتەكەی تێكەڵاو كرد ◊ العُلاثَةُ: دووشت كە تێكەڵاو كرابن ◊ پیاوێك لەم لاو لەلا قاچو قۆچ بكا ◊ العَلَثُ: ئەو شتەی تێكەڵ گەنم دەكرێ ◊ (گەنمو ماش، گەنمو جۆ) خواردەمەنی تێكەڵكراو بەگەنمو جۆ ◊ العَلِثُ: كەسێك پاڵ غەیری باوكی بدرێ ◊ العُلثَةُ: ئەو شتەی پیاو قنیاتی پێدەكا لە بژیو ◊ العَلثی: خواردن كە شتێكی تری كوشندەی تێكەڵ بكرێ ◊ دەگوترێ: (قتل النسر بالعلثی) بازەكەی بەخواردنی ژەهر تێكەڵاو كوشت ◊ العَلیثُ: ئاردی لەگەنمو جۆ تێكەڵكراو ◊ العَلیثَة: بەمانا (ألعلیث)دێ.

**عَلَجَ** الغلام وغيره علجاً وعلوجاً: منداڵەكە زلو كەتە بوو.

**عَلَجَ** البعيرُ: حوشترەكە ڕوەكی عیلجانی خوارد ◊ عَلِجَت الناقةُ عَلَجاناً: حوشترەكە هەڵسورو داسوڕی كرد.

**عَلَجَ** فلاناً علجاً: بەسەر فلانكەسدا زاڵ بوو.

**عَلِجَ** علجاً: پتەو بوو، گشت بوو، هێزی پەیداكرد ◊ عالَجَ الشَيَ معالجةً: خەریكی شتەكە بوو سەرو بەری كرد ◊ عالَجَ المريض: دەرمانی

**قَصِرَ قَصَراً**: ئازار لەملی پەیدا بوو ملی خوار کرد.
**قَصُرَ الشَّيْئُ**: شتەکە کورت بوو ◊ (فهو قصير) ◊ **أقْصَرَ عن الشَّيْئِ**: وازی لەشتەکە هێناو دەسەلاتی هەبوو بەسەری دا ◊ **أقْصَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کورت کردەوە ◊ **قَصَّرَ عن الشَّيْئِ**: وازی لەشتەکە هێناو دەسەلاتی بەسەردا نەبوو ◊ **قَصَّرَ في الأمر**: کەمتەرخەمی لەکارەکەدا کرد ◊ **قَصَّرَ في العَطِيَّة**: بەخششەکەی لێ کەم کردەوە ◊ **قَصَّرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کورت کردەوە ◊ **قَصَّرَ الصلاة**: لە نوێژی چوار ڕکاتی دا دوو ڕکاتی کردن واتە نوێژەکەی کورت کردەوە.
**قَصَّرَ شعرَهُ**: قژی کورت کردەوە، هەندێکی لێ گرت ◊ **قَصَّرَ الثوبَ**: بەداری جل شتن قوماشەکەی لەسەر جلشۆر کوتاو پاکی کردەوە، سپی کردەوە ◊ **إقتصر على الشَّيْئ**: بەشتەکە قنیاتی کردو تەجاوزی لێ نەکرد ◊ **إقتصرَ الشَّيْئَ**: لە درێژی شتەکەی کەم کردەوە ◊ **إقتصرَ أثر الشَّيْئ**: بەدواداچوونی بۆ شتەکە کرد ◊ **تقاصَرَ عن الأمر**: وازی لە کارەکە هێناو نەیتوانی بیکا ◊ بە ئەنقەستو تەصەننوع خۆی بەکورت نیشان دا ◊ **تقاصَرَ نفس فلان**: نەفسی فلانکەس بچوک بۆوە توایەوە ◊ **تَقَوْصَرَ الرَّجُلُ**: پیاوەکە وێکهاتەوە، چووە یەکەوە وەکوو ژیشك خۆی خڕ کردەوە ◊ **إستقصره**: بەکورتی لەقەڵەم دا ◊ بەکەمتەرخەمی حسێب کرد ◊ **القاصِرُ من الورثة**: میراتگرێك منداڵ بێ نەگەیشتبێتە تەمەنی ڕوشدو بەخۆچاران ◊ **القاصِرَةُ**: دەگوترێ: (إمرأة قاصِرة الطرف) ئافرەتێکی بەحەیاو بەشەرمو چاو نەرمو دڵ زیندووە ◊ کچۆڵێك تەمەنی نەگەیشتبێتە تەمەنی ڕوشدو بەخۆچاران.

**القُصَارُ**: ئەو پەڕی کارو پیشە ◊ دەگوترێ: (قصارك أن تفعل كذا) ئەو پەڕی کارت ئەوەیە ئەوە بکەی ◊ ئەو کارەت بەسەو کیفایەتت دەکا ◊ **القِصَارَةُ**: پیشەی جلشۆریو جل کوتان بەداری جل شتن ◊ **القُصَارَةُ**: ئەو سەر کوێزرو سۆو شتەی لە هێڵەكو بێژینگ دا دەمێنێتەوە دوای لە بێژینگ دانو لە هێڵەکدانی شت ◊ ئەو دانەوێڵەی لە گوڵەکەی دا دەمێنێتەوەو بە گێرەکردن دەرنایە ◊ توێکڵی سەرەوەی دانەوێڵە ◊ شوێنی تایبەتی ناو ماڵ: کەهەر خاوەن ماڵ بۆی هەیە بچێتە ناوی: وەکوو ژووری نوستن ◊ **القَصْرُ**: پێچەوانەی مانای (المدّ) ◊ کەمتەرخەمی ◊ کۆتایی شتو ئەو پەڕیو غایەتی ◊ دەگوترێ: (قَصْرُكَ أن تفعل كذا) ئەو پەڕی کاری تۆ ئەوەیە ئەو کارە بکەی ◊ یان ئەگەر ئەوەبکەی بەستەو هیچی ترت ناوێ ◊ باڵەخانەو تەلار ◊ هەروا ناوە بۆ کاتی ئێوارەو سەرەتای شەو ◊ دەگوترێ: (أتيته قَصراً): کاتی عیشا هاتم بۆلای ◊ یان دەمەو ئێوارە هاتم بۆلای. هەروا وشەی (القَصْرُ) ناوە بۆ لابردنی ڕەنگ یان کاڵ کردنەوەی لە ئەلیافی شتی چندراو ◊ **القَصْرَةُ**: کورت هەڵهێنانو تایبەت کردن ◊ دەگوترێ: (أبْلِغْ هذا الكلامَ بني فلان قصرة) ئەم قسە بەهۆزی فلان بگەیەنەو بەکەسی تری مەڵێ ◊ **القَصَرَةُ**: بنکی درەخت ◊ لای خواروی مل بەلای شانەوە ◊ ئەستوراپی مل ◊ لای خواروی درەختی خورما ◊ پارچە دار ◊ وردە ئاسن ◊ ئەو سەرگوێزرو پوشو سۆو شتە بێکەڵكو پوچو خراپانە دەکەوێتە سەر بێژینگو گڵگیر ◊ کاو کۆتی گەنمو جۆ: کە وشك بۆوە، توێکڵی بەروبوم وەکوو توێکڵی گوێزو توێکڵە بادامو شتی وا ◊ تەمبەڵیو قونگرانی ◊

**القَصَّارُ**: ئەو کەسەی جل دەشواو پاکیان دەکاتەوە بەهۆی کوتانی جلەکان لەسەر بەردو بەشەپکە داری جل شتن ٥ **القُصُورُ الذاتي**: کورت هێنانی جەستەو نەبوونی ئامادەباشی تێیدا بۆ ئەنجامدانی کارەکانی بەشێوەیەکی ئاسایی، واتە نەتوانێ بەئاسایی بڕوا یان بەئاسایی دابنیشێ یان هەر جەو جوڵێکی تر.

**القَصیر من السیول**: لافاوێکە لەچەند شیو و دۆڵێك کۆببێتەوە ٥ دەشگوترێ: (فلان قصیر النسب) واتە بەس ناوی باوکی بێنی دەناسرێ ٥ هەرگوترا: فلان کوڕی مەلامستەفای بارزانییە ئیتر ناسراوەو پێویست بەناوهێنانی باپیرو باپیرە گەورەی ناکا ٥ **القَصیرة**: ئافرەتێك هەر لە ماڵەو بێ و ڕێگای نەدرێ لەماڵ بچێتە دەر ٥ دەشگوترێ: (هو إبن عمي قَصیرة) ئەوە کوڕی مامەو نەژادمان لێك نزیکە ٥ **القُصَیْری**: بنکی مل بەلای شانەوە ٥ لای سەروی پەراسوو لای خواروی پەراسوو (کورتە پەراسوو) ٥ دەشگوترێ: (قُصَیْراك أن تَفعل کذا) ئەو پەڕی توانای تۆ ئەوەیە ئەوە بکەی هیچی ترت بۆ ناکرێ ٥ **القَوْصَرَّةُ**: قەرتاڵەو سەبەتە کە لەقەصەب دروست دەکرێ و خورمای تێدەکرێ ٥ **المَقْصَرَةُ من الظلام**: تێکەڵاو بوونی تاریکی، داهاتنی تاریکی کاتی ئێوارە ٥ لارێ ٥ **المِقْصَرَةُ**: کوتك و شەپکەداری جل شۆر کە پۆشاکەکانی پێ دەکوتی بەمەبەستی پاکبوونەوەیان.

**المَقْصورَة من النساء**: ئافرەتی بەنازو نیعمەت پەروەردەبوو خانم و خاتوونی ماڵ ٥ لەناو ماڵ و خانوو شانوودا بریتییە لە هۆدەیەکی جیاکراوەو تایبەتە لەسەر نهۆمی ئەرزی ٥ هەروا ناوە بۆ چامە شیعرێك کۆتاییەکەی بەئەلفی مەقصورە بێ ٥ خرخاڵ ٥ هەر سوچو قوژبنێك لەناو خانووی گەورەو فراوان دا ٥ شوێنی خوتبە خوێندنەوەی وتارخوێن و جێ نوێژی پێش نوێژ ٥ دەشگوترێ: (أبلغ هذا الکلام بني فلان مقصورة) ئەم قسەیە بگەیەنە بە خێڵی فلان و بەس، بەکەسی تری مەڵێ ٥ هەروا دەگوترێ: (هو إبن عمي مقصورة) ئەو کوڕی مامەو خزمایەتیمان لێك نزیکە ٥ **قصت الفرس قَصّاً**: ماینەکە ئاوسبوونی دەرکەوت.

**قَصَّ** الثوبَ وغیره: بەمەبەست قوماشەکەی بڕی.

**قَصَّ** بینهما: لێکی دابڕین و ناوانی تێك دان.

**قَصَّ** الشيْءَ: شوێن پێی شتەکەی هەڵگرت و دوای کەوت.

**قَصَّ** القِصَّةَ: چیرۆکەکەی گێڕایەوە ٥ دەگوترێ: (قَصَّ علیه الرؤیا) خەونەکەی بۆ گێڕایەوە ٥ (قَصَّ علیه خبره) هەواڵەکەی بەڕاستی بۆ گێڕایەوە ڕوداوەکە چۆن بوو ئاوا بۆی گێڕایەوە ٥ **أقَصَّ فلان من نفسه**: کابرا وای کرد دوژمنەکەی زەفەری لێ بێنێ و تۆڵەی لێ بکاتەوە (أقَصَّ فلان من غریمه) فلانکەس فرسەتی لە دوژمنەکەی هێناو تۆڵەی لێ کردەوە ٥ **أقَصَّ فلانٌ فلاناً**: فلانکەس هەلی بۆ فلانکەس ڕەخساند کە تۆڵە لە دوژمنەکەی بسێنێ ٥ **قاصَّهُ مقاصَّةً**: قەرزدارەکە قەرزی لەسەر هاوەڵەکەی بوو، قەرزەکەیان بەیەك گرتن، قەرزەکەیان خستە بری قەرزی یەکتر ٥ **قَصْقَصَ الشَّعرَ والصوتَ والظُفرَ**: قژەکەی قرتاند، دەنگی پێ بڕی ٥ نینۆکی قرتاند ٥ **قَصَّصَ دَارَهُ**: خانوەکەی گەچکاری کرد ٥ **إقْتَصَّ فلانٌ**: فلانکەس تۆڵەی ستاند ٥ بەدواداچوونی بۆکرد ٥ **إقْتَصَّ الخبرَ علیه**: هەواڵەکەی بێ زیادو کەم بۆ

گێڕایەوە ٥ **تقاصَّ القومُ**: هەریەکە لە قەومەکە تۆڵەی لە هاوەڵەکەی ستاند ٥ **تَقَصَّصَ أثَرَهُ**: بەدواداچوونی بۆ شوێن پێی فلان ئەنجام دا ٥ دەگوترێ: (تَقَصَّصَ أثَرَ القوم وتَقَصَّصَ الخَبَرَ) بەدواداچوونی بۆ شوێنەواری خەڵکەکە ئەنجام دا بەدواداچوونی بۆ هەواڵەکە کرد ٥ **تَقَصَّصَ الكلامَ**: قسەکەی لەبەر کرد ٥ **إستَقَصَّهُ**: داوای کرد ئەوەی دەست درێژی کردۆتە سەر تۆڵەی لێ بسێنن ٥ **الأُقصُوصَةُ**: چیرۆکی کورت، کورتە چیرۆك ٥ **التَّقَاصُّ**: لەبواری بڕین دا واتە: بڕینێك وەکوو هەمان بڕین بێ ٥ **القاصُّ**: ئەو کەسەی چیرۆکەکە لەسەر شێوەی خۆی بیگێڕێتەوە ٥ ئەو کەسەی چیرۆك دادەنێ ٥ وتار بێژ کە لە خوتبەکەی دا پشت بەچیرۆك ببەستێ ٥ **القُصَاصُ من الوركين**: کلێچە، شوێنی بەیەك گەیشتنی هەردوو ڕان ٥ **القِصَاصُ**: ئەوەیە تاوانبار سزای تاوانی هاوچەشنی لێ بسێندرێ ٥ **القُصَاصَةُ**: ئەوەی لە قژو بڕژانگو کاغەز دەقرتێندرێن واتە: وردە مووی سەرە مقەست ٥ **القَصُّ**: ئێسقانی سینگ: کەلەهەردوو لاوە سەری پەراسووەکانی تێچەقیون ٥ ئەوەی لەخوریو شتی وا دەبڕدرێ ٥ گەچ ٥ **القَصَصُ**: چیرۆکەکان ٥ هەواڵی گێڕدراوە ٥ شوێنکە ٥ **القَصَّاصُ**: بەمانا (القاصُّ) دێ ٥ **القَصَّاصَةُ**: ئامێرێکە پرزو پاڵو سەرەکاغەزو شتی وای پێ دەبڕدرێ.٥**القِصَّةُ**: چیرۆکی نوسراو ٥ ڕستەو کەلام ٥ حەدیس ٥ کار ٥ هەواڵ ٥ حاڵو وەزع ٥ چیرۆکێکی پەخشان ئامێزو درێژە زۆربەی وێنەکان لەخەیاڵ یان لەواقیع وەردەگیرێ، لەنووسینی دا چەند یاساو ڕێسایەك لەبواری نووسینی ئەدەبی دا بەرچاو دەگیرێ ٥ **القُصَّةُ**: گلۆلەموو پارچەموو کۆلەموو ٥ کاکۆڵو قژی پێشە سەر ٥ **القَصِیصُ**: بەمانا (المقصوص) دێ ٥ **القَصِیصَة**: بەمانا (القصة) دێ ٥ **المِقَصُّ**: مەقەست ٥ **المَقصُوصَة**: کەوگیر ٥ یان شتێکی لەو جۆرەیە: کە گۆشتی پێ لەمەنجەڵ دەردەهێندرێ ٥ **القَصْطَل**: بڕوانە (القسطل).

**قَصَعَ الرجلُ قَصْعاً**: پیاوەکە ناوەکەی قومقوم خواردەوە ٥ **قَصَعَت الدَّابَّةُ المُجْتَرة**: ئاژەڵە کاوێژکارەکە خواردنەکەی هێنایەوە ناو دەمیو کاوێژی کردەوە بۆئەوەی سەرلەنوێ قوتی بداتەوە.

**قَصَعَ فلاناً**: فلانکەسی ڕیشەکێش کرد ٥ بچوکی کردەوە سوکایەتی پێ کرد.

**قَصَعَ الغُلامَ**: بەبەری دەستی لەسەری کوڕەکەی دا.

**قَصَعَ اللهُ شَبَابَهُ**: خودا گەنجی لێ شێواندو نەیهێشت تەمەنی گەنجی بەخۆشی بەسەر بەرێ ٥ **قَصَعت الرَّحى الحَبَّ**: ئاشەکە دانەوێڵەکەی هاڕی.

**قَصَعَ القَمْلَةَ**: ئەسپێکەی بەنینۆکی فلیقاند.

**قَصَعَ اليربوعُ جُحرَهُ**: یەربوعەکە زارکی کونەکەی گرتو خۆی لە کونەکەدا حەشار دا.

**قَصَعَ الرجلُ بَيْتَهُ**: پیاوەکە لەماڵ دەرنەچوو ٥ **القَاصِعاء**: کونێکە یەربوع هەڵی دەکۆڵێ ٥ جا کەچووە ناوی دەمی کونەکە بەگڵ دەگرێ بۆئەوەی مارو جرو جانەوەری تر نەچنە ناو کونەکەیەوە ٥ **القَصْعُ**: خوراندن بەنینۆك ٥ لکاندنی دووشت بەیەکەوە ٥ **القَصْعَةُ**: لەگەن قاپێکی گەورەیە تێگوشاوی تێدا دەکرێو دەخورێ ٥ بەزۆری لەداری گوێزو شتی وا دروست دەکرێ پێشی دەگوترێ کاسە.

**قَصَفَ الرَّعدُ قصفا وَقصِيفاً**: هەورەکە دەنگی گەورە بوو.

**قَصَف** الرجلُ: پیاوەکە لەناو تەعامو شەراب دا مایەوە ◊ دەگوترێ: (قصف باللهو واللعب).

**قصف** العودَ ونحوه قَصْفاً: دارەکەی شکاند.

**قَصِفَ** النَّبتُ: ڕوەکەکە درێژ بوو بەرز بۆوە تا بەهۆی زیاد بەرز بوونەوە خوار بۆوەو سەرەکەی داهات ◊ **أقصَفَ الشجرُ**: درەختەکە باریك و تەنك بوو ◊ **إنقَصَفَ الشَّيْءُ**: شتەکە شکاو دوولەت بوو ◊ **إنقَصَفَ القومُ عن الشَّيْءِ**: خەڵکەکە وازیان لەشتەکە هێناو نەیانتوانی تەواوی بکەن و بەردەوام بن تێیدا ◊ **إنقَصَفَ القومُ**: خەڵکەکە کۆبونەوەو پاڵەپەستۆی یەکتریان کرد دەشگوترێ: (إنقصفوا على الشَّيْءِ) خەڵکەکە بەشوێن یەکتردا هاتن و لەسەر شتەکە گردبوونەوە ◊ **تقاصَفَ القومُ على الشَّيْءِ**: خەڵکەکە لەسەر شتەکە کۆبوونەوەو پاڵپەستۆی یەکتریان کرد ◊ **تَقَصَّفَ الشَّيْءُ**: شتەکە شکا ◊ **تَقَصَّفَ القومُ على الشيءِ**: خەڵکەکە لەسەر شتەکە کۆبوونەوەو کردیانە پاڵەپەستۆ ◊ **تَقَصَّفَ القومُ**: خەڵکە کەوتنە کێشەو هەڕەشە کردن ◊ **تَقَصَّفَ فلان على الطعام**: فلانکەس لەسەر خواردنەکە گاڵتەو پێکەنینی هێنایە کایەوە ◊ **القَصْفُ**: گاڵتەو گەپ و زێدەڕۆچون لە خواردن و خواردنەوەدا ◊ دەست پێکردنی یاری و هەڵپەرکێ و ئاشکرا کردن ◊ **القَصِفُ**: هەرشتێك قبوڵی شکان بکا ◊ شتێك خێرا بشکێ ◊ (رجل قصفٌ) پیاوێکی بێ عەزم و جەزمە ◊ **القصفة**: قەرەباڵغی کردن و پاڵەپەستۆ کردنی خەڵك ◊ هەڵینگدانی ئەسپ لەکاتی گەیشتن بەدوژمن ◊ **القَصِيفُ**: پرزوباڵ و چیلکەو چەوێڵ، وشکەڵی درەخت ◊ **المَقْصِفُ**: کەومنتەرو دۆلاب و شتی وایە لە زۆری نان خواردن دا قاپ و قاچاغی نانخواردنی تێدا هەڵدەگیرێ ◊ یان ناوە بۆ سفرەو مێزی نانخواردن ◊ شوێنی حەفلەو خۆشی و شایی و خواردن و خواردنەوە ◊ **قَصْقَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی شکاند ◊ شتەکەی کەرت کرد بڕیەوە ◊ **القُصَاقِصُ**: شێری جەستە گەورەو بەهێزو توانا ◊ پیاوی کوڵەبنەو چوارشانەو بەهێز ◊ **القَصْقَصُ**: شوێنی ڕوانی موی سینگ.

**قَصَلَ** الشَّيْءَ قَصْلاً: بەتوندی و پرتەوو خێرایی شتەکەی بڕیەوە.

**قَصَلَ** الحِنطَةَ: گەنمەکەی گێرە کرد.

**قَصَلَ** الدَّابَّةَ: وێنجەو شێخوارو گیا دوراوی تەڕی دا بەوڵاخەکە ◊ **أقْصَلَ الزرعُ**: کشت وکاڵەکە کاتی ئەوەی هاتووە دروێنە بکرێ ◊ **إقتَصَلَ الشَّيْءُ**: شتەکە بڕا، کۆتایی هات ◊ **إقْتَصَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دابڕی لێی کردەوە ◊ **إنْقَصَلَ**: شتەکە بڕا، کۆتایی هات ◊ **تَقَصَّلَ**: کەرت بوو، دابڕا.

**القُصَالَةُ**: سەر گوێزرو بنزیل کە بە بێژینگ و کڵگیر جیادەکرێتەوە ◊ دەگوترێ: (ما هو إلا قصالة وحثالة) ◊ **القِصْلُ**: بەمانا (القصاله) دێ ◊ درەختی شلك ◊ **القَصِيلُ**: وێنجەو گیا دوراوی سەوز بۆ شێخواری وڵاخ ◊ **المِقْصَلُ**: شمشێری برندەو تیژو ڕمبی تیژ ◊ **المِقْصَلَةُ**: ئامێرێکە بۆ سەربڕین ◊ ئامێرێکی تیژ بووە کاتی خۆی ملی حوکمدراو بە ئیعدامیان پێ قت کردووە ◊ لە شۆڕشی فەرەنسی دا ئەم ئامێرە باو بووە.

**قَصَمَ** فلان قَصْماً: فلانکەس لە کوێوە هات بەرێگای خۆیدا گەڕاوەتەوەو نەگەیشتۆتە مەبەستی خۆی.

**قَصَمَ** الشَّيْءَ: شتەکەی شکاند بەشکاندنی تەواو و لێك جیاکردنەوە ◊ (قَصَمَ اللهُ عُمْرَ الظالِمِ وقَصَمَ

الله ظهــر الظــالِم) خـودا بـەلاو كارەسـاتی گورچكبڕی بەسەر ستەمكاردا دا ٥ **قُصِمَتْ ثَنِيَّتُهُ قَصَماً**: ددانی لە ناوەڕاستییەوە شكا.

**قَصِمَ الرجلُ**: پیاوەكە زوو وردی ڕوخاو تێك شكا.

**قَصِمَ الرُمحُ**: ڕمبەكە شكا ٥ **إنْقَصَمَ**: شكا، تێك شكا ٥ **تَقَصَّمَ**: شكا، تێك شكا، لێك بۆوە.

**القاصِمَةُ**: دەگوترێ: (نزلت بهم قاصمة الظهر) بەلاو كارەساتی پشت شكێن دابەزییە سەر ئەو گەلە ٥ **القُصَمُ**: ئەوەی هەرچی بێتە بەردەستی تێكی دەشكێنێ ٥ **القَصْماءُ من المعز**: بزنێكە هەردوو شاخی لەبنەوەڕا شكابن ٥ **القَصْمَةُ**: پلیكانەو پەیژە ٥ ئەو پرژە شكاوەی سیواك كە لەناو دەمی سیواككەردا دەمێنێتەوەو تفی دەداتەوە ٥ **التَّيْصُومُ**: جۆرە ڕوەكێكە لەساراو چۆلەوانییەكانی ولاتی عەرەب دا دەڕوێ، ئەگەر بمانەوێ بەكەسێك بڵێین لادێیەكی ڕەسەنە ٥ **قَصْمَلَ الرجلُ**: پیاوەكە لە ڕۆیشتنی دا هەنگاوی كورتی هاویشتن ٥ **قَصْمَلَ الطعامَ**: خواردنەكەی هەموو خوارد ٥ **قَصْمَلَ الشَّيْءَ**: شتەكەی شكاند ٥ **قَصْمَلَ فلاناً**: فلانكەسی بەزمویدا دا ٥ فلانكەسی بەتوندی گەست ٥ **القَصْمَلَةُ**: نەخۆشییەكە توشی ددان دەبێو دایدەوەشێنێ.

**قصا عنه قَصْواً وقُصُوّاً**: لێی دوور كەوتەوە.

**قَصِيَ عنه قَصاً وقَصاءً**: لێی دوور كەوتەوە ٥ **أقصَى الشَّيْءَ**: شتەكەی دوور خستەوە، گەیشتە ئەوپەڕی شتەكە ٥ دەگوترێ: (نزلنا منزلاً لا تقصيه الإبلُ) لە شوێنێك دابەزین حوشتر چەندێك بڕوا ناگاتە ئەو پەڕی ٥ **قاصاه مقاصاةً**: دووری خستەوە ٥ **تقصَّى المكانَ**: كەوتە ئەو پەڕی شوێنەكەوە ٥ **تقصَّى الأمرَ**: ئەو پەڕی لێكۆڵینەوەو بەدواداچوونی بۆ كارەكە ئەنجام دا ٥ **تقصَّى المَسألةَ**: لە مەسەلەكەدا گەیشتە ئەو پەڕی ٥ **تقصَّى الأميرُ الجنودَ**: ئەمیر یەكە یەكە سەربازەكانی بانگهێشت كردن لەدوور تا نزیكیانی بەسەركردنەوە ٥ **إستَقصَى الأمرَ**: لە كارەكەدا گەیشتە ئەو پەڕیو باش لێكۆڵینەوەی تێدا كرد ٥ **الأقصى**: دوورتر، زۆر دوور ٥ دەگوترێ: (فلان بالمكان الأقصى) ٥ هەروا وشەی (الأقصى) ناوە بۆ حوشترێك یان مەڕێك كە كەمێك لە قەراخی گوێچكەی بڕابێ ٥ **القاصي**: دوور ٥ مرۆڤی دوور، شوێنی دوور ٥ **القاصية من الناس والبقاع**: دوور، ئافرەتی دوور ٥ شوێنی دوور ٥ هەروا وشەی (القاصية) ناوە بۆ مەڕی تاكەوەبوو تەرەبوو لە مێگەل ٥ **القصا**: بەربیلای خانوو ٥ **القَصاءُ**: بەمانا (القصا) دێ ٥ **القَصْواء**: مێینەی (الأقصى)یە لە حوشترو مەڕ.

**القُصْوى**: مێینەی (الأقصى)یە ٥ دەگوترێ: (فلان في الناحية القُصوى) ٥ لایەكی شیو و دۆڵ ٥ مەبەستی دوور ٥ **القَصِيُّ**: دوور ٥ دەگوترێ (رميت المرمى القصيّ) بیرو بۆچونێكی دوور لە واقیعت دەربارەی ڕوداوەكە ڕاگەیاند ٥ گومانت دوور ڕۆیشت.

**قَضِئَ السِّقاءُ قَضَأً**: دێمكە ئاوەكە بۆگەن بوو. كەڵكی نەما ٥ **قَضَبَهُ قَضْباً**: بڕییەوە.

**قَضَّبَ الدابَّةَ**: سواری جوانوە ئەسپەكە یان جاشە كەرەكە بوو پێش ئەوەی ڕام بكرێ.

**قَضَبَ فلاناً**: بەشوركە دار لە فلانكەسی دا. بەقامچی لێی دا ٥ **أقضبت الأرضُ**: زەوییەكە درەختی زۆری لێ ڕوا ٥ **قَضَّبَت الشمسُ**: تیشكی خۆر وەكوو كۆڵەكە عەموود درێژ بوونەوە بۆسەر زەوی ٥ **إقتَضَبَ الشَّيْءَ**: شتەكەی

بڕییەوە ◊ قسەکەی بڕی ◊ **إقتضب الكلامَ:** بەبێ خۆ ئامادەکردن و بیرکردنەوە قسەی کردو وتاری دا ◊ **إقتَضَبَ الدَّابَّةَ:** سواری ولاخەکە بوو پێش ئەوەی ڕام بکرێ و کاتی سواربوونی بێ ◊ **إقتَضَبَ فلاناً:** داوای ئەنجامدانی کارێکی لە فلانکەس کرد پێش ئەوەی فێری کارەکە ببێ و بتوانێ بەجوانی ئەنجامی بدا ◊ **إنقَضَبَ:** دابڕا ◊ لەشوێنی خۆی نەبوو، دەگوترێ: (إنقَضَبَ الكوكب من مكانه) ئەستێرەکە لە شوێنی خۆی نەماو کشا ◊ **تَقَضَّبَ الشَّيْءُ:** شتەکە کەرت کەرت بوو، کوت کوت بوو ◊ **تَقَضَّبَت الشمسُ:** تیشکی خۆر وەکوو کۆڵەکەو عەموود شۆڕبوونەوە بۆسەر زەوی ◊ **القُضابَةُ:** ئەوەی بڕاوە لەشت ◊ پرژوپاڵ و سەرە مقەست ◊ **القُضابَةُ من الشجر:** مێولاك و پرژو پاڵ و شکەڵی درەخت ◊ **القَضْبُ:** هەر درەختێك بەرز ببێتەوەو لق وپۆپی بلاو بکاتەوە ◊ درەختی تەڕ کە ناو ناوە ببڕدرێ و هەڵبداتەوە ◊ درەختێکە وەکوو درەختی کومەثری، گەڵاکەی وەکوو گەڵای ئەو وایە هەندێ لەگەڵای ئەو وردترو نەرمترە، حوشتر زۆر حەزی لە گەڵاکەیەتی کەلێی تێر خوارد ماوەیەك وازی لێ دەهێنێ چونکە ددانی پێی ئاڵ دەبنەوەو توشی کۆکەی دەکا ◊ **القِضْبَةُ:** مێگەلە بزن و مەڕ، گارانە حوشترو ڕەشە ولاخ ◊ پیاوی زەعیف و چوست و چالاك ◊ **القَضَّابُ والقَضَّابَةُ:** شمشێری بڕندە ◊ پیاوی ئیش لەدەست هاتو و بەتوانا بۆ ئەنجامدانی کار ◊ **القَضِيبُ:** لقەدرەخت ◊ لقەدرەختی بڕاو ◊ شریتێکی درێژە لەمادەیەکی زۆر ڕەق و پتەو دروست دەکرێ و ڕادەخرێ بۆئەوەی ببێتە سکەی شەمەندەفەر ◊ شمشێری بڕندە.

**قَضَّ النَّسْعُ والوَتَرُ قَضِيضاً:** جومزگەکە یان ژێیەکە دەنگی لێ هات وەکوو ببڕدرێ.

**قَضَّ الجدارَ قَضّاً:** دیوارەکەی بەزەخت و فشار ڕوخاند.

**قَضَّ الشَّيْءَ:** شتەکەی وردو هاڕ کرد.

**قَضَّ الوَتَدَ:** سنگەکەی دەرهێنا.

**قَضَّ الخيلَ عليهم:** بەئەسپ سوار کەوتە سەریان و هێرشی کرد.

**قَضَّ الطعامُ:** خواردنەکە گڵی کەوتە ناو.

**قَضَّ الفِراشُ والثَّوبُ:** نوێنەکە یان قوماشەکە گڵ و وردە بەردی کەوتە سەر.

**قَضَّ الدِرعُ:** زرێیەکە بەهۆی زۆر تازەییەوە زبر بوو.◊ **قَضَّ المَضجَعُ:** نوێنەکە، شوێنی پاڵکەوتن و نوستنەکەی زبر بوو ناخۆش بوو نووستنی لەسەر ناخۆش بوو ◊ **أقَضَّ المكانُ وغَيْرُه:** شوێنەکە گڵ و خۆڵی زۆر بوو وردە چەو و زیخی زۆر بوو ◊ **أقَضَّ الرجُلُ:** پیاوەکە خەوی لێ نەکەوت ◊ **أقَضَّ فلان الشَّيْءَ:** فلانکەس شتەکەی وردوهاڕ کرد کردی بەوردە بەردو چەو و زیخ ◊ **إنْقَضَّ الشَّيْءُ:** شتەکە پارچە پارچە بوو تێك شکا، پچڕا ◊ دەگوترێ: (إنْقَضَّت أوصالُه) ڕەگو دەمارەکانی پچڕان و پارچە پارچە بوون و لێك ترازان ◊ **إنْقَضَّ الجدارُ:** دیوارەکە ڕوخا ◊ **إنْقَضَّ الطائرُ:** باڵندەکە لەحەواڕا زۆر بەخێرایی خۆی داهەنگاوتە سەر نێچیرەکە ◊ **إنْقَضَّ الخيلُ على الأعداء:** ئەسپەکان بەرەو دوژمن ڕاجمین ◊ **تَقَضَّضَ الطائرُ:** باڵندەکە لەبەرزاییەوە بەگورجی خۆی داهێشت بۆئەوەی خۆبەسەر نێچیرەکەدا بدا ◊ دەشگوترێ: (تَقَضّى تَقَضِّياً) ضادی سێیەم بکەی

به (ي) بۆ سوككردنى وشەكە ٥ إنْقاضَّ الجدارُ: ديوارەكە درزى گەورەى بردوە بەلاّم هێشتا نەڕوخاوە ٥ القِضاضُ: بەردى سەر بەرد، دركەشاخ لەسەر دركەشاخ ٥ القَضُّ: دەگوترىَ: (طَعامٌ قَضٌّ) خواردنێكە كەوتبێتە ناو چەو و گڵەوە بۆنى ئەوانى گرتبىَ ٥ دەگوترىَ: (مكان قَضٌّ) شوێنێكە چەوە وردەو گڵو خۆڵى تێدا بىَ ٥ دەشگوترىَ: (جاء القوم قَضَّهُم وقَضيضُهُم) خەڵكەكە بە ورد و درشتيانەوە هاتن ٥ هەروا وشەى (القَضُّ) ناوە بۆ بەردەلاّنێك بەردەكانى گەورە بن ٥ (القضيض) چەو و بەردە وردكە ٥ القَضَضُ: گڵو خۆڵ كە بكەوێتە سەر نوێنو جێگاى نووستن ٥ بەردە وردەو بەردى هاڕاو ٥ القَضَّةُ: يەكجار ٥ بەردى وردكراو ٥ سەرەتەشى، باقى ماندەى شت ٥ هەروا دەگوترىَ: (أرض قَضَّةٌ) زەوييەكى بەردەلاّنو چەواوى بىَ، گڵو چەوى زۆر بىَ ٥ القِضَّةُ: زەوييەكە چاڵو نزم: كەگڵەكەى لمبەلاّن بىَ ٥ القَضيضُ: دەنگى جومژگەى دەست ٥ دەنگى ژێى كاتى وێكهێنانەوەو هاويشتنى ٥ بەردە وردەو چەو ٥ المِقَضُّ: كوێنو پيك كە بەردى پىَ ورد دەكرىَ ٥ قَضَعَهُ قَضْعاً: ملكەچى كرد ٥ إنْقَضَعَ القومُ: خەڵكەكە پەرتەوازە بوون ٥ تَقَضَّعَ القوم: خەڵكەكە پەرتەوازە بوون ٥ تَقَضَّعَ الرجلُ عن قومه: پياوەكە لە خزمو قەومەكەى دوور كەوتەوە ٥ التَّقْضيعُ: پێچى ناوسكو ڕيخۆڵە ئازارى سك ئێشە ٥ ژانە سك ٥ القضاع والقضاعَةُ: تۆزى ئارد ٥ ئاردەلۆك ٥ ئەو تەپوتۆزو خشتو خۆڵەى لە ديوارەوە دەكەوێتە خوار.

**قَضُفَ** قضافَةً وقَضَفاً: بەسروشت باريكو لەڕو لاواز بوو.

القَضْعَةُ: تەنكە بەرد، تاشە بەردى تەنك ٥ گردۆڵكە كە ديمەنى لەتاكە بەردێك بچىَ ٥ قَضْقَضَتِ العظام: ئێسقانەكان لەكاتى شكاندنيان دا دەنگيان لێوە هات ٥ خرميان هات ٥ قَضْقَضَ الشَّيْئَ: شتەكەى شكاندو وردى كرد ٥ تَقَضْقَضَ الشَّيْئُ: شتەكە تێك شكا ٥ پەرتەوازە بوو ٥ دەگوترىَ: (تَقَضْقَضَ القومُ) خەڵكەكە پەرتەوازە بوون ٥ القُضاقِضُ: دەگوترىَ: (أسد قُضاقِض) شێرێكى بەهێزو تێك شكێنەرە، هەرچى بێتە بەرى تێكى دەشكێنىَ ٥ القُضْقاضُ: ئەسپۆنى ولاّتى شام.

**قَضَمَ** الشَّيْئَ: شتەكەى بەددان شكاند ٥ قَضِمَت السِّنُّ قَضَماً: قەراخى ددانى شكان.

**قَضِمَ** الرجلُ: پياوەكە قەراخى ددانەكانى شكان ٥ (فهو أقضم وهي قضماء).

**قَضِمَ** السيف: شمشێرەكە تيژاييەكەى شكا، كول بوو ٥ (فهو قَضِم وقَضيمٌ) ٥ أقْضَمَ القومُ: خەڵكەكە كەميان بژێو پەيدا كرد بۆكاتى قاتو قڕى ٥ أقْضم الدابَّةَ: هەرزنى كرد بەئاليكى وڵاخەكە ٥ قاضَمَ فلان مقاضَمةً: فلاّنكەس كەم كەم شتى كڕى، كەمێكى كڕىو پارەكەى دا، ئەمجار كەمێكى ترى كڕى هەروا بەو جۆرە واتە: بەجوملەو كۆ شتى نەكڕى ٥ إسْتَقْضَمَ القومُ: خەڵكەكە بژێوى كەمو خراپيان بۆ كاتى گرانى پەيدا كرد ٥ القَضامُ: هەر شتێك كەرت بكرىَو بهاڕدرىَ وەكوو جۆ و هەرزنو نۆكو شتى وا ٥ دەگوترىَ: (ماذقت قضاماً) من دەنكە هەرزنێكم چەشت نەكردووە ٥ القُضّامُ: درەختى خورما درێژ بىَو بەرەكەى خورما وشكەڵ بىَ يان كەم بەر بگرىَ: القُضْمَةُ: بەمانا (القُضامُ) دىَ ٥ القَضيمُ: بەمانا

(القُضام) دێ ٥ دەگوترێ: (ما ذقت قضيماً) ٥ کەوڵی ڕاخستن ٥ پێستی سپی کەلەسەری بنووسرێ ٥ شمشێری کۆن کەتیژایی نەمابێو کەڵکی تێکەوتبن ٥ پەڕەی سپی.

**قَضَى** قَضياً وقَضاءً وقَضِيَّةً: بڕیاری دا، حوکمی کرد، کێشەکەی بەکالا کردەوە ٥ دەگوترێ: (قضى بين الخصمين وقضى عليه وقضى له وقضى بكذا ٥ فهو قاضٍ).

**قضى** الله: خودا فەرمانی کرد.

**قضى** اليه: فەرمانی گەیاندە ئەو.

**قضى** الصلاة: نوێژی کرد ٥ یان دوای تێپەڕبوونی کات، نوێژەکەی گێڕایەوە.

**قضى** الدين: قەرزەکەی دایەوە.

**قضى** عبْرَتَهُ: فرمێسکی خۆی هەڵڕشتو فرمێسکی لەچاواندا نەمان.

**قضى** الشَّيْئَ: شتەکەی مەزندە کردو دروستی کرد.

**قضى** حاجته: ئیشی خۆی جێبەجی کرد.

**قضى** أجَلَهُ: گەیشتە ماوەی بۆ دیاریی کراوی خۆی.

**قضى** نحبَهُ: مرد ٥ دەشگوترێ: (قضى فلان) فلان مرد (ضربه فقضى عليه) لێی داو کوشتی ٥ **قاضاه مقاضاةً**: دادگایی کرد ٥ **قاضاهُ على مالٍ**: لەسەر ماڵ صوڵحی لەگەڵدا کردو ڕێک کەوت.

**قضى** حاجَتَهُ تَقضِيَةً: ئیشی خۆی ئەنجام دا.

**قضى** الأميرَ فلاناً: پاشا فلانکەسی کرد بە قاضی.

**قضى** أمرهُ: کاری خۆی ڕۆیاند ٥ **إقتضى الدينَ**: داوای قەرزەکەی خۆی کردەوە ٥ **إقتضى أمراً**: کارەکەی پێویست کرد.

**قضى** الأمرُ الوجوبَ: فەرمانەکە مانای واجب بوون دەگەیەنێ ٥ **إنقضى الشَّيْئُ**: شتەکە تەواو بوو بەسەر چوو ٥ دەشگوترێ: **إنقضى أجَلُهُ**: تەمەنی تەواو بوو ژیانی بەسەرچوو ٥ **تقاضاه الدَّيْنَ**: داوای قەرزەکەی لێ کردەوە ٥ قەرزەکەی لێ وەرگرتەوە.

**تَقَضَّى** الشَّيْئُ: شتەکە تەواو بوو بەسەرچوو ٥ دەگوترێ: **تقضَّى عُمْرُهُ**: تەمەنی تەواو بوو ٥ **إسْتَقْضى السلطانُ فلاناً**: پاشا فلانکەسی کرد بە قاضی ٥ **إستقضى فلان فلاناً**: فلانکەس داوای بڕیارو حوکمی فلانی کرد یان فلانکەس داوای کرد فلان پەلکێشی دادگا بکەن ٥ **إسْتَقضَر، فلان الدينَ**: فلانکەس داوای کرد قەرزەکەی بدرێتەوە ٥ **القاضي**: دادوەر ٥ یەکالەکەرەوەی شت بڕیاردەر دەربارەی کێشە ٥ کەسێک بەگوێرەی شەریعەتی خوا بڕیار بداو حوکمو بڕیار دەربکا ٥ کەسێک فەرمانڕەوا دایبمەزرێنێ بەدادوەر بۆئەوەی بڕوانێتە کێشەو نیزاعی نێوان خەڵکو بەگوێرەی قانونو یاسا کێشەکان یەکالابکاتەوە ٥ دەشگوترێ: (سمٌّ قاضٍ): ژەهری کوشندە ٥ **القاضِيَةُ**: مردن ٥ (ضَرْبَة قاضية) زەبری کوشندە ٥ **القَضَاءُ**: بڕیار ٥ بەجێهێنان ٥ کاری دادوەر ٥ پیاوانی یاسا ٥ لیژنەی یاسایی: کەیەکالا کردنەوەی کێشەی هاو وڵاتیانیانی دەخرێتە ئەستۆ ٥ دەشگوترێ: (وقع هذا الحادث قضاءً وقدراً) ئەم ڕوداوە بەقەزاو قەدەر ڕوی داو بەئەنقەست نەبوو ٥ **القُضَاةُ**: پێستێکی تەنکە لەسەر دەمو چاوی منداڵ دەبێ لەکاتی لەدایکبوونی دا ٥ **القضية**: حوکمو بڕیار ٥ مەسەلەیەکە کێشەی تێدایە دەخرێتە بەردەم دادوەر یان لیژنەی یاسایی بۆئەوەی یەکالای

بکەنـەوە ◊ لـەزاراوەی مـەنتیق دا (قـەضیَّة) بریتیە لە ڕستەیەك پێك هاتبێ لە (موضوع) و (محمول) کە ئەو ڕستەو هەواڵە لەخودی خۆی دا ئەگـەری ڕاستی یـان درۆی تێدا چاوەڕوان بکرێ.

**قَطَبَ فلان قطوباً**: فلانکەس برۆی هێنانەوە یەك و ڕوی خۆی گرژ کرد.

**قَطَبَ فلاناً**: فلانکەسی ڕەنجاند، ڕقی هەڵساند.

**قَطَبَ الشَّيْءَ قَطْباً**: شتەکەی کۆکردەوە.

**قطب الشرابَ**: شەرابەکەی تێکەڵ کرد ◊ **أقطبَ القومُ**: خەڵکەکە کۆبوونەوە ◊ **أقطب الشرابَ**: شەرابەکەی تێکەڵ بەشتی کە کرد ◊ **قَطَّبَ الرجلُ**: بەمانا (قَطَبَ) دێ ◊ دەگوترێ: (قَطَّبَ بين عينيه) ناوچەوانی وێکهێناو ڕوی گرژ کرد ◊ (قَطَّبَ وَجْهَهُ) ڕوی گرژ کرد ◊ **قَطَّبَ الشرابَ**: شەرابەکەی تێکەڵ کرد.

**الإستقطاب**: حاڵەتی کۆبوونەوەی دوو قوتبی دژ بەیەك ◊ **قاطِبَةً**: دەگوترێ: (جاء القوم قاطِبَةً) خەڵکەکە هەموویان هاتن ◊ **القُطْبُ**: بەرداشی ژێرەوەی ئاش ◊ (قوتبی ئاش) ◊ **قُطْبَا الأرض**: قوتبی باکورو قوتبی باشور ◊ هەروا وشەی (القُطْبُ) ناوە بۆ سەرە تیرو تیژایییەکەی ◊ جۆرە ڕوەکێکە بەسەر زەوی دا درێژ دەبێتەوە ◊ گوڵێکی زەردی هەیەو چقڵێکی هەیە کە دروایەوەو وشك بوو زۆر زەحمەتە بتوانرێ ڕۆیشتنی بەسەرا بکرێ ◊ **القُطْبُ من القوم**: ڕیش سپیو پیاو ماقوڵی نەتەوە ◊ **القُطْبَةُ**: بستەی ئاشو بناغەی ئاش ◊ **القطوبُ**: کەسێك ناوچەوانی لێك بنێو گرژ بێ ◊ شێر ◊ **القَطِيبُ من الشراب**: شەرابی تێکەڵ کراو ◊ **المقطوب**: بەمانا (القطیب) دێ.

**قَطَرَ الماءُ والدَّمعُ وغيرهما قَطْراً وقطراناً وقطوراً**: ئاوەکە یان فرمێسکەکە دڵۆپ دڵۆپ چۆڕایە خوار.

**قَطَرَ الماءَ والدَّمعَ ونحوهما من السوائل**: ئاوەکەی دڵۆپ دڵۆپ داچۆڕاند یان فرمێسکی ڕژاند.

**قَطَرَ القطور في العين**: دڵۆپە قەترەی کردە ناو چاوەوە ◊ دەشگوترێ: (قطر الله الصمغ من الشجر) خودا قەترە قەترە صەمغی لە درەختەکە داچۆڕاند.

**قَطَرَ فلاناً**: فلانکەس بەتوندی قاچی بەزەوی دا دا ◊ **قَطَرَهُ فرسه**: ئەسپەکەی بەلایەکی دا سوارەکەی هەڵدایە خوار ◊ (ماقطرك علينا) کێ تۆی بۆ ئێمە باراند بۆ ئێمەی هێنای.

**قَطَرَ الإبلَ**: حوشترەکانی لێك نزیك خستنەوەو ڕیزی کردن ◊ هەروا دەگوترێ: (قطر البعير الى غيره) حوشترەکەی خستە پەنا یەکێکی ترەوە بە جوتە لێی خوڕین.

**قَطَرَ البعيرَ**: حوشترەکەی بەقەتران هەنووی و ڕەنگی کرد.

**قَطَرَ الثوبَ**: قوماشەکەی درو ◊ **أقطرَ النبتُ**: ڕوەکە بەسەر چوو وردە وردە خەریکە وشك بێ ◊ **أقطرَ الماءُ وغيرُهُ**: ئاوەکە کاتی ئەوەی هاتووە قەترە قەترە داچۆڕێ ◊ دەگوترێ: (أقطرت السماءُ) ئاسمان کەم کەم بارانی باراند ◊ **أقطرَ الماءَ والدَّمعَ ونحوهما**: دڵۆپ دڵۆپ ئاو یان فرمێسکی ڕژاندە خوار ◊ دەگوترێ: (أقطر الماء في الحلق) و (أقطر الدواءَ في العين) ◊ **قَطَّرَ الماءَ والدَّمعَ وغيرهما من السوائل**: بەمانا (قَطَرَهُ) دێ ◊ **قَطَّرَ السائلَ**: شلەمەنییەکەی کوڵاندو بوو بەهەڵمو ئەمجار دڵۆپ دڵۆپ داچۆڕایەوە خوار ◊ **قُطِّرَ اللصوصُ في المقطورة**: دزو جەردەکان

هـەموويان بـەڕیز یەكیەكـە خرانـە نـاو پێوەندو دەسبەندەوە بە شوێن یەك دا ڕاپێچی بەندیخانە كران ◊ **تقاطر القومُ**: خەڵكەكە ڕیز ڕیز بەشوێن یەك دا هاتن ◊ **تقاطر الماءُ والدَّمعُ وغيرهما من السوائل**: ئاوەكە یان فرمێسك زەنگۆڵ زەنگۆڵ داچۆڕا ◊ **تقاطر كتبُ فلان**: نامەو نووسراوەكانی فلان یەك بەدوایەك دا هاتن ◊ **تَقَطَّرَ فلان**: فلانكەس لەبەرزاییەوە خۆی فڕێدایە خوارەوە ◊ **تَقَطَّرَ بفلان فَرَسُهُ**: ئەسپەكە فلانكەسی هەڵدایە خوار، گلاندی ◊ **تَقَطَّرَ الرَّجُلُ عن كذا**: پیاوەكە لەمەو شتە دواكەوت ◊ **تَقَطَّرَ الرجُلُ**: پیاوەكە خۆی ئامادەكرد بۆ شەڕو بەحەماسەتەوە چاوەڕوانی دەست پێكردنی كرد ◊ **إستَقْطَرَ الشَّيْئَ**: هەوڵی دا شتەكە دڵۆپ دڵۆپ بچۆڕێتەوە ◊ **إستَقْطَرَ فلان الخيرَ**: فلانكەس وردە وردە خێرو بێری بۆ هات ◊ **الإستقطارُ**: پاڵاوتنی عونصورە سەرەكیەكانی شلەمەنی كە لەگوڵو شتی وا دەگیرێ بەهۆی بەكارهێنانی جیهازێكی تایبەتی ◊ **التَّقطيرُ**: بەمانا (الإستقطار) دێ ◊ پاڵاوتنی ئاو و پاككردنەوەیەتی لەهەر مادیەكی بێگانەو زیانبەخش ◊ گۆڕاندنی شلەمەنیو كردنی بەهەڵم پاشان سارد كردنەوەیو بۆئەوەی ببێتەوە بەشلەمەنی، ئەمیش بەهۆی جیهازی (تەقطیر) ◊ **القاطرةُ**: شەمەندەفەر ◊ هەر عەرەبەیەك هێزی بوخار یان وزەی كارەبا بیجوڵێنێ ◊ **القِطار**: قافڵەی حوشتر كەیەك لەدوا یەك ڕێچكە ببەستن ◊ دەگوترێ: (جاءت الإبِلُ قِطاراً) كاروانە حوشترەكە ڕێچكەیان بەستو بەڕیز هاتن ◊ كۆمەڵە عارەبانەیەك یەك لەدو یەك كە قاطیرەیەك ڕایانكێشێ ◊ شەمەندەفەر ◊ **القِطارَةُ**: كۆمەڵە حوشترێك یەك لەدو یەك پێكەوە ببەسترێن ◊ **القُطارَةُ من الشَّيْئِ**: ئەوەی لە شتەكە داچۆڕاوە ◊ ئاوی كەم ◊ **القَطْرُ**: باران ◊ دڵۆپە باران ◊ فرمێسك ◊ **القِطْرُ**: مسی تواوە ◊ ئاسنی تواوە ◊ **القَطْرُ**: ئەوەیە كابرا سەبەتە خورمایەك كێشانە بكا یان فەردە شتێك بكێشێو باقی ماندەی شتەكە بەو مەزندە بكاو نەیكێشێ ◊ **القُطْرُ**: دەڤەرو ئیقلیم.

**قُطْرُ الإنسان**: لای ئادەمیزاد؛ تەنیشتی ◊ بەشێكی جەستەی.

**قُطْرُ الدائرة**: هێڵێكی ڕاستەو كەوانە دەكاتە دووبەشی وەكوو یەك ◊ **القَطْرَةُ**: یەكجار ◊ دڵۆپە ئاو ◊ خاڵو نوقتە ◊ قەترە دەرمانی چاو ◊ دەشگوترێ: (رماه الله بِقَطْرَةٍ) خودا بەلایەكی بۆ ناردن ◊ **القَطّارَةُ**: ئامێرێكە دەرمانی پێ دەكرێتە دڵۆپ دڵۆپو دەچۆڕێندرێتە ناو شتی تر بەمەبەستی چارەسەرو شتی تر ◊ **المُقاطَرَةُ**: بەمانا (القَطَر) دێ ◊ دەشگوترێ: (أكراه مُقاطَرَةً) بەكرێی گرت بۆچوونو هاتنەوە ◊ **المِقْطَرَةُ**: تەختەدارو چەپەرێكە كونكونە، قاچی بەندكراوانی تێدەكرێ، ئەم جۆرە بەندكردنە ئێستا نەماوە ◊ **المَقْطُورَةُ**: عەرەبەیەكە قاتیرە ڕادەكێشێ ◊ **تَقَطْرَبَ الرجُلُ**: پیاوەكە زۆر بەخێرایی سەری خۆی بادا ◊ **القُطْرُبُ**: دزی كارامە لە دزیكردن دا ◊ ڕوەكێكی چقڵاوییە دەنكە تۆمی وەكوو گەنمی هەیە، هەركەسێ بەلای دا بڕوا پێوەی دەنووسێ ◊ مێشێكە حەجمینی نیە بەكوردی پێی دەگوترێ: بزبزۆكە، بەشەو دەدرەوشێتەوە وەكوو گوڵە ئەستێرە ◊ نەخۆشیەكە توشی مێشك دەبێو ماخۆلان دەخاتە ناو جەستەی نەخۆشەكەو حەجمینی لێ دەبڕێ وەكوو بزبزۆكە هەمیشە

لەجەو جۆلدایە ○ **قَطِرَنَ البعيَ**: حوشترەکەی بەقەتران هەنووو ڕەنگی کرد ○ **القَطِرانُ**: گوشراوی درەختی ئەرمزو ئەبهەلە دەکوڵێندرێن‌و پاشان حوشترو شتی وایان پێ دەهەنوون ○ مادەیەکی ڕەش‌و لینج‌و شلەمەنییە لە درەخت‌و خەڵوزو شتی وا دەردەهێندرێ بەشێوەی تەقطیری وشک‌و بەکاردەهێندرێ بۆ پاراستنی دار لە مۆرانەو ئاسن لەژەنگ.

**قَطَّ** السعرُ قَطّاً وقطوطاً: نرخ بەرز بۆوە.

**قَطَّ الشَّيْءَ** قطّاً: شتەکەی لەپانیدا بڕی ○ دەشگوترێ: (قَطَّ القَلَمَ) قەڵەمەکەی دادا ○ (قَطَّ البيطار حافر الدابة) بەیتارەکە سمی وڵاخەکەی تاشی ڕێکی خست.

**قَطَّ** السّعر: نرخەکەی بەرز کردەوە.

**قَطَّ** الشَّعْرُ قطَطاً وقطاطةً: قژەکە کورت‌و گشت‌و گرژ بوو ○ **قَطَّط الخراطُ الحُقّةَ**: دارتاشەکە، وەستاکە قوتووەکە یان سندوقە بچوکەکەی دروست کردو ئەملاو ئەولای ڕنین‌و ڕێکی خستن ○ **إقْتَطَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕییەوە قرتاندی ○ **اقْتَطَّ الشَّيْءَ**: پانەوپان شتەکەی بڕییەوە ○ **الأقَطُّ**: ئەوەی ددانی تێک شکابن بنکی ددانەکانی دەرکەوتبن.

**قَطَاطِ**: واتە بەسمە ○ بەشم دەکاو لێم زیادە ○ **القَطَّاطُ**: قەراخی کێو ○ قەراخی بەرد ○ کەرسەی پینەچی‌و پێڵاو دروستکەر ○ قژی زۆر گشت ○ قەراخی سمی وڵاخ ○ دەوران دەوری ○ **القَطَائِطُ**: دەگوترێ: (جاءت الخيلُ قَطائِطَ) حوشترەکان جەڵەب جەڵەب هاتن.

**قَطُّ**: ئەم وشەیە بە سێ جۆر بەکاردێ: (١) زەرفی زەمان ○ دەگوترێ: (مافعلتُ هذا قَطُّ) ○ (٢) بەمانا (حَسْبُ)بێ، بەزۆری ئەو کاتە پیتی (ف) دەخرێتە پێشەوەی ○ دەگوترێ: (أخذت درهماً فقط) ○ (٣) ئیسم فیعل بێ، ئەو کاتە (نون الوقاية)ی پێوە دەنرێ ○ دەگوترێ: (قَطْنِي) بەسمە ○ دەشگوترێ: (قَطْكَ) ○ **القَطُّ من الشَّعر**: قژی کورت‌و گرژو گشت ○ دەگوترێ: (رجل قَطُّ الشَّعرِ) پیاوێکی قژ کورت‌و گرژو گشتە ○ **القِطُّ**: پشیلە ○ بەش‌و بار ○ چەکی پارە ○ کتێبی موحاسەبە ○ کتێب بە گشتی ○ **القَطَطُ**: دەگوترێ: (شَعرٌ قَطَطٌ) قژی گرژو گشت‌و کورت ○ (رجل قَطَطٌ) یان (هو جعد قَطَط) پیاوێکی ڕژدو چروکە ○ **القَطَّاطُ**: بەردتاش، دارتاش واتە دەق بەمانا (الخَرّاط) دێ.

**القَطَّةُ**: قاشە شت، کەرتی شت ○ دەگوترێ: (هات قَطَّةَ من البَطيخُ) قاشە کاڵەکێکم بۆ بێنە ○ **القِطَّةُ**: پشیلە مێینە ○ **القَطيطةُ**: بەرزایی قەراخی ئەشکەوت ○ **المَقَطُّ من الفرس**: نێوان لای خواروی پەراسو و ورگ لە جەستەی ئەسپ ○ **المِقَطُّ**: قەڵەم دادەر ○ هەرشتێک نووسەر قەڵەمی پێ دابدا ○ **المِقَطَّةُ**: بەمانا (المِقَطّ) دێ ○ **قطعَتِ الطيرُ قُطوعاً**: باڵندەکان لە وڵاتێکەوە ڕەویان کرد بۆ وڵاتێکی تر.

**قَطَع** الرجلُ بحبل قَطْعاً: پیاوەکە بەحەبلێک خۆی خنکاند. ○ **قَطَعَ** برأيه: بڕیاری خۆی داو پاشگەز بوونەوەی نیە.

**قَطَعَ الشَّيْءَ قَطعاً**: شتەکەی بڕییەوە، هەندێ پەل‌و پۆی لێ کردنەوە.

**قَطَعَ** النَّخلَةَ: بەری دارخورماکەی چنی.

**قَطَعَ** الثَّمَرَ: میوەکەی لێ کردەوە، ڕنی.

**قَطَعَ** النخالةَ من الدقيق: سۆ و شتەکەی جیاکردەوە.

**قَطَعَ** الصَديقَ: وازى له برادەرەكەى هێناو دەنگى لێ دابڕى.

**قَطَعَ** رَحِمَه: وازى له خزمايەتى ئەو هێناو هاموشۆى نەكردن.

**قَطَعَ** الصلاةَ: نوێژەكەى بەتاڵ كردەوە، بەقسەى بێگانەو كردارى جودا له كردارى نوێژ.

**قَطَعَ** النهرَ: له ڕوبارەكە پەڕييەوە لەمبەر بۆ ئەوبەر يان بەپێچەوانەوە.

**قَطَعَ** فلاناً: بەبەڵگەى بەهێز فلانكەسى بێدەنگ كرد.

**قَطَعَ** الطريقَ: ڕێگاكەى گرت، بوو بەچەتر، خەڵكى ترساند يان خەڵكى ڕوت كردەوە.

**قَطَعَ** فلاناً عن حق فلان: فلانكەسى مەنع كرد لەمافى فلان ◊ **قُطِعَتْ يَدُهُ**: دەستى بڕاو لێ بۆوە ◊ بەتيغ بڕا يان بەهۆى دەردێكەوە بڕايەوە.

**قَطُعَ** الرجلُ قطاعةً: پياوەكە نەيتوانى قسە بكا.

**قُطِعَ** بفلان: فلانكەس نەيتوانى سەفەر بكا، لەسەفەرەكەى دابڕا ◊ دەگوترێ: (قُطِعَ بِه) له سەفەر كردن نائومێد بوو كاتى لەمپەرو شتى وا هاتنە سەر ڕێى ◊ **أقْطَعَ النَّخلُ**: خورماكە وەختى ڕنينى هات، كاتى بڕينى هێشوەكانى هات ◊ **أقطَعَت الدُّجَاجَةُ**: مريشكەكە له هێلكە چۆوە ◊ **أقطع السماءُ بموضوع كذا**: ئاسمان لەفلان شوێن بارانى نەباراند ◊ **أقطَعَ القومُ**: خەڵكەكە بارانيان لێ نەبارى ◊ **أقطع ماءُ البئر**: ئاوى بيرەكە ڕۆچوو.

أقْطَعَ فلان: فلانكەس بەڵگەى پێ نەماو بۆڕى خوارد ◊ **أقْطَعَ خَصْمَهُ بالحجة**: بەبەڵگە بەرهەڵستكارەكەى بێدەنگ كرد ◊ **أقطع فلاناً**: فلانكەسى له ڕوبارەكەوە پەڕاندەوە ◊ دەشگوترێ: (أقْطَعَهُ النهرَ): پەڕانديەوە بۆ ئەوبەرى ڕوبار ◊ **أقْطَعَ فلاناً أرضاً**: زەوييەكى دابڕى بۆ فلانو كردى بەمڵكى ئەو ◊ دەشگوترێ: (أقْطَعَهُ أغْصاناً) ڕێگاى داچەند لقێكى درەختەكە ببڕێ ◊ **قاطَعَ فلاناً**: دەنگى له فلانكەس دابڕى پەيوەندى خۆى لەگەڵ پچڕاند ◊ **قاطَعَ القومَ**: ئامادە نەبوو هاريكارى لەگەڵ خەڵكەكە بكا ◊ ياساغى كرد پەيوەنديى ئابورى يان كۆمەڵايەتىو شتى وايان لەگەڵدا ببەسرێ ◊ دەشگوترێ: (قاطع بضائعهم ومنتجاتهم) نەيهێشت كالاو بەروبوميان لێ بكڕدرێ ◊ **قاطع الرجلان بسيفهما**: دووپياوەكە شمشێرەكانيان بەتاقى كردەوە بزانن كاميان بڕندەترە ◊ **قاطع فلاناً على كذا وكذا من الأجر والعمل ونحوهما**: فلانكەسى كردە سەرپەرشتيارى فلان شوێن بە كرێيەكى دياريكراو.

قَطَّعَهُ: بۆ زێدەڕۆيى لەماناى (قَطَعَ) دێ ◊ **قَطَّعَ الخمرَ بالماء**: شەرابەكەى تێكەڵ بەئاو كرد ◊ **قَطَّعَ الفرسُ الجريَ**: ئەسپەكە بەهۆى تەڕدەماخىو نيشاتيەوە بەچەند جۆرە ڕۆيشتنێك ڕۆيشت ◊ **قَطَّعَ الجوادُ الخيلَ**: ئەسپە ڕەسەنەكە له پێشبڕكێدا پێش ئەسپەكانى تر كەوت ◊ **إقتَطَعَ من الشيئ قِطعَةً**: پارچەيەكى لەشتەكە كردەوە ◊ **إقتَطَعَ من المال**: بەشێكى لەماڵەكە بۆخۆى دابڕىو وەلاى نا ◊ **إنقَطَعَ الشيئُ**: شتەكە كاتى بەسەر چوو ◊ دەگوترێ: **إنقَطَعَ الحَرُ والبردُ**: گەرما كاتى بەسەرچوو يان سەرما نەما ◊ **إنقَطَعَ النهرُ**: ڕوبارەكە وشك بوو ◊ **إنقَطَعَ الكلامُ**: قسەكە تەواو بوو قسەكەر وەستاو درێژەى پێ نەدا ◊ **إنقَطَعَ الى فلان**: كەوتە گەڵ فلانو بوو بەدۆستو هاونشينى ئەو بەتايبەتى ◊ **أنقُطِعَ**

بفلان: فلانكەس بەناچارى لەسەفەركردن
كەوتو ڕێگەى درێژەدان بەگەشتەكەى لێ گیراو
كەوتەوە ○ **تقاطَعَ الشَّيْئُ**: شتەكە هەندێكى
لەهەندێكى جیابۆوە ○ **تقاطَعَ القومُ**: خەڵكەكە
هەندێكیان دەنگییان لە هەندێكیان دابڕى،
دەشگوترێ: (تقاطعت أرحامهم) قەتعى سیلەى
ڕەحمیان كرد لەناو خۆیان داو دەنگییان لێك
دابڕى ○ **تَقَطَّعَ الشَّيْئُ**: شتەكە لێك ترازاو
پارچە پارچە بوو ○ **تَقَطَّعَ أمرهم بینهم**: لەناو
خۆیاندا لێك ترازان و پارچە پارچە بوون ○
**تَقَطَّعَ بهم الأسباب**: داماو بوون و كاریان بۆ
ئەنجام نەدراو هۆكارەكانیان لەدەست چوون ○
**إستَقْطَعَهُ**: داواى لێ كرد پارچەیەكى بۆ دابڕێ ○
**الأَقْطَاعُ**: دەگوترێ: (ثوب أقطاع) قوماشێكە
پارچە پارچە كراوە، لێكدراوە ○ **الإقطاعُ**: یاساى
دەرەبەگایەتى كە دابونەریتى ناغایەتى و
مسكێنى یان ناغایەتى و سەپانى ○ بەوە ناغاو
بەگ چین لەدواى چین خاوەنداریەتى زەوییان
بەدەستەوە بێ و بێ ماندوو بوون بەشێكى
زۆرى ڕەنجى شانى مسكێن و هەژار بۆ خۆیان
قۆرغ بكەن ○ **الإقطاعي**: ساماندارو دەرەبەگ
كە بەیاساى دەرەبەگایەتى ببێتە خاوەنى زەوى
○ **الأقطع**: دەست بڕاو ○ كەڕو بێ گوێ ○
**الأقطوعة**: وەرەقەى لێك جودا بوونەوە بۆ
نموونە وەرەقەى تەلاقنامە كە لە مێردەوە
دەنێردرێت بۆ ژن ○ **التَّقطيعُ**: ژانەسك ○ سك
نێشەو پێچى ئازارى سك ○ **القاطِعُ**: ئەو
نموونەیە كەلەسەر شێوەى ئەو قوماش یان
پێست دەبڕدرێ ○ دەگوترێ: (قطع الأديمَ على
القاطع) ○ دەگوترێ: **سیف قاطِعٌ**: شمشێرێكى
بڕندەیە ○ (كلام قاطعٌ) قسەیەكى ڕەتنەكراوە ○
(لبن قاطعٌ) ماستێكى ترش ○ (فلان قاطع
الطریق) فلانكەس ڕێگرو چەتەیە ○ خەڵك
ڕوت دەكاتەوە ○ **القِطَاعُ من اللیل**: بەشێك
لەشەو لەسەرەتاوە تا سێیەكى شەو ○ بەشێكى
تایبەتى و دابڕاو لەهەر شتێك بێ ○ ئەو
نموونەیەى كە قوماش و شتى واى لەسەر
شێوەى دەبڕدرێ ○ (زمن قِطاع النخل): كاتى
گەیشتنى خورماو وەختى چنینى ○ **القُطَاعَةُ**:
كۆمەڵە شتێك لە شتێك دەكرێنەوە ○ ئەو
پرزو پاڵ و شتەى لەكاتى بڕینەوەو
لێكردنەوەى شت دا هەڵدەوەرێ ○ **القَطّاع من
الرجال**: پیاوێك گوێ نەداتێ دۆست و ئاشناى
خۆى تورە بكاو دەنگیان لێ دابڕێ و لایەنى
دۆستایەتى و خزمایەتى بەرچاو نەگرێ ○
قەتعى سیلەى ڕەحم بكا ○ دەشگوترێ: (سیف
قاطع) شمشێرێكى بڕندەو تیژە ○ **القُطْعُ**: پێچى
سك هێشان، ژانە سك ○ هەناسە سوارى بەهۆى
ماندوو بوونەوە یان بەهۆى قەڵەوییەوە ○ یان
بەهۆى شتى ترەوە، تەنگە نەفەسى ○ **القِطْعُ من
الشجرة**: لق و پۆپى بڕدراوى درەخت ○ هەروا
وشەى (القِطْعُ) ناوە بۆ بەشێك لەشەو ○
**القِطْعَةُ**: بەشێك لەشت ○ **القُطْعَةُ**: شوێنى بڕاوى
لەشتە بڕاوەكە ○ **القَطَعَةُ من الشجر**: خەڵفو
نەمام كە لەشوێنى بڕاوى درەخت سەر
هەڵدەدەنەوە ○ **القُطُوعُ**: كەسێك دۆستایەتى و
برادەرایەتى بەردەوام نەبێ ○ پەردەو لەمپەرى
نێوان دوو شت ○ **القَطِیعُ**: بڕدراو ○ لقە درەختى
بڕدراو (مێولاك) ئەو جۆرە دارەى سەرە تیرى
لێ دروست دەكرێ ○ قامچى كە لە تیلمە چەرم
دروست دەكرێ بەم جۆرە تیلمەكان تێك
باهەڵدەدرێن و ئەمجار وازیان لێ دێنن تا وشك
دەبنەوەو وەكوو عەصا ڕەق دەبن ○ جەڵەبە
مەڕو بزن و ڕەشەوڵاخ و ئاسك و حەیوانە كێوى و

شتی وا ◊ هەروا وشەی (القطیع) بەمانا هاوشانو هاو وێنە هاتووە ◊ دەگوترێ: (فلان قطیع فلان) فلان هاوشانی فلانە یان وەکوو ئەو دەچێ لەسەرو سیمادا ◊ یان دەگوترێ: (هذا الثوب قطیع هذا) ئەم قوماشە لەو قوماشە دەچێ ◊ هەناسە سوار، تەنگە نەفەس ◊ پیاوێک نەتوانی بەئاسانیو ئاسایی هەڵسێ ◊ مرۆڤێك لە قسەکردندا ناوبەناو زمانی بگیرێ ◊ یان زمان ڕەوانو قسە لوس نەبێ ◊ **القُطَیْعاء**: دەگوترێ: (إتّقوا القُطیعاء) خۆ لەوە بپارێزن لەشەڕدا پەرتەوازە ببنو لێك دابڕێن ◊ **القَطیعَةُ**: واز لێکتر هێنانی دۆستو ئاشناو و دەنگ لێك دابڕین ◊ وازهێنان لەچاکە کردن لەگەڵ خزمو کەسو کاردا ◊ پارچە زەوییەك، دەڤەرو ناوچەیەك فەرمانڕەوا بەبێ بەرامبەر دەیبەخشێ بەیەکێك لەکاربەدەستەکانی یان بەیەکێك لەهەوادارانی ◊ **القَواطِعُ من الطیور**: ئەو پۆلە باڵندانەن کە بەسروشت وەرزانە لە دەڤەرێکەوە ڕەو دەکەن بۆ دەڤەرێکی تر، گەرمێنو کوێستان دەکەن ◊ هەشت ددانی پێشەوەی دەم (چواری سەرەوە چواری خوارەوە) کە پێیان دەڵێن کەڵبە ◊ بڕەر بڕندە ◊ **المُقاطَعَة**: خۆ دابڕین لە مامەڵە کردن لەگەڵ کەسانی دیکەو وڵاتی دیکە لەڕوی ئابوریو کۆمەلایەتی بەگوێرەی یاسایەکی هەرەوەزیو سەرانسەری ◊ **المُقَطَّعُ من الحدید**: ئەو ئاسنەی چەکی لێ دروست دەکرێ ◊ هەروا وشەی (المُقَطَّع) ناوە بۆ پیاوی قاڵبوو و خاوەن ئەزموون ◊ ئاڵتون کە بکرێ بەخشڵ ◊ قوماشی بڕدراو و لێك دراو و دوورواو و کراو بە پۆشاك، وەکوو کراسو دەرپێو شتی وا ◊ پۆشاکی کورت ◊ **المُقَطَّعات**: جۆرە قوماشێکە گوڵو خەتخەتی دابڕ دابڕی تێدا بێ ◊ **مُقَطَّعات الکلام ومُقَطَّعات الشعر**: پارچەو بڕگەی کەلامو شیعر ◊ **المَقاطِعُ**: هەرشتێك دوایینی ئەو شوێنە بێ کە کۆتایی دێ، وەکوو پارچە لبەلانو پارچە شیو و دۆڵو پارچە زەوی کشتو کاڵ ◊ لە ڕوبارو شتی وادا بەو شوێنە دەگوترێ کە لێی دەپەڕیەوە بۆ ئەو بەر (بوار) ◊ **مَقْطَعُ الحق**: ئەو قسە حەقو ڕاستەی قسەی بەتاڵی پێ دەبوچێندرێتەوە ◊ بڕگەی شیعرو بڕگەی کەلام ◊ بڕگە بریتیە لە پیتێکی خاوەن بزوێنی (فەتحە) یان پیتی داخراو، وشەی (کَتَبَ) پێك هاتووە لە سێ بڕگەی خاوەن فەتحە ◊ (قالَ) پێك هاتووە لە دوو بڕگە ◊ بڕگەی داخراو پێك هاتووە لە پیتێکی فەتحەدارو پیتێکی ساکن وەکوو (قَدْ) (بَلْ) ◊ **المِقْطَعُ**: سەرە تیری باریك لەدار بێ یان لەشتێکی تر کاغەزی پێ دەبڕدرێ ◊ نموونەیەکە کاغەزو چەرمو شتی وای لەسەر شێوەی دەبڕدرێ ◊ پیاوێك قەتعی سیلەی ڕەحم بکا ◊ شمشێری بڕندە ◊ **المُقْطَعُ من الرجال**: پیاوی بێ کارو کاسبی ◊ پیاوێك لە زێدو نیشتمانی خۆیو ماڵو خێزانی دابڕابێ ◊ بواری ڕوبار کە لەم بەر بۆ ئەوبەر لێی دەپەڕنەوە ◊ **المَقْطَعَةُ**: دەگوترێ: (الهجر مقطعة للود) هاتوچۆ نەکردن دەبێتە هۆکار بۆ نەمانی خۆشەویستی ◊ **المُنقَطِعُ**: دەگوترێ: (فلان منقطع القرین في السخاء ونحوه) فلانکەس لە بەخشندەییو شتی وادا بێ وێنەیە ◊ هەروا دەگوترێ: (فلان منقطع العِقالِ في الشر والخبث) فلانکەس هیچ شتێك لەشەڕو خراپەکاری نایگێڕێتەوە ◊ **قطفت الدّابّةُ قطافاً**: ولاخەکە بەسستیو تەمبەڵی ڕۆیی

**قَطَفَ الشَّيْءَ قطفاً**: شتەکەی بڕییەوە.

**قَطَفَ** الثمرَ: میوەکەی چنی.

**قطف** رأس الجراد: سەری کوللەکانی لێ کردنەوە.

**قَطَفَ** وَجهَهُ: ڕوخساری ڕوشاند ◊ **أَقطَفَ الكَرْمُ**: میوەکە وەختی برینی هاتووە ◊ **أقطَفَ القومُ**: خەڵکەکە میوەکەیان کاتی برینی هاتووە ◊ **قَطَّفَهُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (قَطَفَ) دێ ◊ **قَطَّفَ الماءَ في الخمر**: ئاوەکەی تکاندە ناو شەرابەکەوە ◊ **إقتَطَفَ**: بەمانا (قَطَفَ) دێ ◊ **القَطائِفُ**: ماریلە پارچە هەویری بچکۆلە لول دەکرێن و بەکەوانەیی سور دەکرێنەوەو ناواخن دەکرێن بەکاکلە گوێزو شتی وا ◊ برمەو شیرینی لەو جۆرە کە بەزۆری لەمانگی ڕەمەزان دا ئەنجام دەدرێ ◊ **القِطاف**: بەمانا (القطف) دێ ◊ کاتو وەرزی چنینی میوە ◊ **القطافة من الشجر**: هەرچی لە درەخت بچندرێ ◊ میوەمیەك لەکاتی ڕنین و چنینی دا بکەوێتە خوار.

**القِطْفُ** هەرشتێك لە درەخت بچندرێ ◊ هێشوە ترێ و هێشوە خورما لەکاتی لێکردنەوی دا ◊ **القَطَفُ**: نەسەرو شوێن دەست ◊ ڕوەکێکە لەخاکی خوێناوی (شۆرەخاك)دا دەڕوێ و ئاژەڵ حەزی لێیەتی و بەباشی دەیخوا گەڵای بڕێ جۆری دەکوڵێندرێ و دەخورێ وەکوو سپێناخ ◊ **القِطْفَةُ**: ڕوەکێکی بەهارییە، چقڵەکەی وەکوو چقڵی گیاحەسەکە وایە، گەڵایەکی تەپوتۆزاوی هەیە ◊ **القَطُوفُ من الدواب**: وڵاخێکە خراپ بڕوا ڕەوتی ناشیرین بێ ◊ دەشگوترێ: (غلام قطوف) کوڕێکی نارێك و پێکە لەڕۆیشتن دا ◊ **القَطيفُ**: میوەی ڕندراو و چندراو ◊ **القطيفة**: قوماشی قەدیفە ◊ قوماشێکی پڕزدارو نەرمە ◊ **المِقْطَفُ**: پوش و بەرچنەیەکی بچکۆلەیە لە پڕزی دارخورما دروست دەکرێ و میوەی تێدا دەچندرێ، یان ناوە بۆ ئەو گلێنەو بنکە کوپانەی گڵ و سەمادیان تێدەکرێ و درەختو ڕوەکیان تێدا دەڕوێندرێ ◊ **المِقْطَفُ**: داس و چەقۆ و کێردی میوە لێکردنەوە ◊ لاسکی هێشوە ترێ و هێشوە خورما ◊ **تَقَطْقَطَت السماءُ**: ئاسمان بارانی بەردەوامی باراند ◊ **قَطْقَطَتِ القَطاةُ والحجلة**: قەتێکە، یان کەوەکە خوێندی قرتە قرتی کرد ◊ (فهي مُقَطْقِطة) ◊ **تَقَطْقَطَ الرجلُ**: پیاوەکە سواری سەری خۆی بوو هەر بەقسەو ڕاو و بۆچوونی خۆی کرد ◊ **تقطقط فلان في البلاد**: فلانکەس بەوڵات دا ڕۆیی ◊ **تَقَطْقَطَ الدَّلو الى البئر**: دۆڵچە بە بیرەکەدا شۆڕ بۆوە ◊ **القَطْقاط**: ڕۆیشتنی خێرا ◊ **القِطْقِطُ**: بارانی بەردەوام ◊ وردە تەرزە ◊ **المُقَطْقَطُ**: سەری بچوکی درێژکۆلە ◊ **قَطَلَهُ**: بڕی ◊ لێی کردەوە ◊ (فهو مقطول) ◊ **تَقَطَّلَ الجذعُ**: لقەدارەکە لە بن ڕا بڕایەوە، لێ بۆوە ◊ **القَطِيلَةُ**: پارچە پەڕۆو پارچە ئیسفنجێکە دڵۆپە ئاوی سفرەو کاشیو مێزی پێ وشك دەکرێتەوە ◊ **المِقطَلَةُ**: ئاسنێکە یان ساتوڵ و کێردۆکێکە شتی پێ دەبڕدرێ ◊ **قَطَمَهُ قَطماً**: گەستی ◊ بڕی ◊ کرتاندی ◊ دەگوترێ: (قَطَمَ الشَّيءَ بأطراف أسنانه): (قطم الفصيلُ النَّبتَ) بە بێچوە کارژیلەکە، یان بەرخۆلەکە چڵەگیایەکەی بەدەمی کرتاند.

**قَطِمَ** قَطَماً: حەزی لە گۆشت کرد ◊ دەگوترێ: (قَطِمَ الصقرُ الى اللحم) هەڵۆکە حەزی لە گۆشت کرد ◊ **القَطَامُ**: هەڵۆ، باز ◊ **القَطَامِيّ**: بازو هەڵۆ ◊ کەسێك خودبەسەری کاربکاو پرس و ڕا بەکەس نەکا ◊ شەرابێك زۆر تیژو ناخۆش بێ ◊ **القُطَامَةُ**: ئەوەی لەشت دەبڕدرێ و فڕێ دەدرێ و کەڵکی نیە ◊ **القَطِيمَةُ**: گوێچکە نان و شتی وا ◊ لوێچە گەنمێك ◊ شیرو ماستی بزرکاو ◊ **المِقْطَمُ**: چنگ و نینۆکی بازو هەڵۆ ◊ **المُقطَمُ**

کێوێکە لەخۆرهەڵاتی شاری قاهیرەی وڵاتی میصرە ◊ **القِطميُّ**: ئەو توێکڵە تەنکەی بەسەر ناوکە خورماوەیەو تێوەی پێچراوە ◊ شتی زۆر بێ نرخو بێ کەڵک.

**قَطَنَ** في المكان وبه قطواناً: لە شوێنەکە مایەوە.

**قَطَنَ** الرَّجُلَ: فێڵی لە پیاوەکە کرد.

**قَطِنَ** ظَهْرُهُ قَطَناً: پشتی چۆمایەوە ◊ (فهو أقطن) ◊ **قَطَّنَ الكَرْمُ**: دارمێوەکە پۆخی کرد، پۆخەکانی دەرکەوتن ◊ **القَطَّانُ**: کەسێك بازرگانی لۆکە بکا ◊ **القُطْنُ**: ڕوەکی پەمۆ ◊ لۆکە ◊ **القَطَنُ**: بناغەی کلکی باڵندە ◊ لای خواروی پشت بەلای سمتەوە.

**قَطَنَ** النار. ئەوەی بەرپرسیاری ئاگری ئاتەشکەدەی ئاگرپەرستانو هەڵگیرسێنەری ئاگرەکەیە ◊ **القِطْنَةُ**: شتێکە وەکوو هەنار وایە بەسەر گەدەی ئاژەڵی سمدارەوەیە ◊ **القُطْنِيَّةُ**: بەرەکێشت، ئەوەی لە ماڵدا هەڵدەگیرێ بۆ چێشت لێنان وەکوو نیسكو نۆكو شتی وا ◊ **القَطِينُ**: (قطين الدار) دانیشتووی ناو خانو ◊ (قطين الله) دانیشتوی حەرەمی مەککە ◊ دەستو پێوەندو خزمەتکار ◊ **القِيطانُ**: قەیتان، چندراوێکە لەمادەی ئاوریشمو شتی وا قۆندەرەو شتی وای پێ شەتەك دەدرێ ◊ **القَيْطُومُ**: ژووری بچوك لەماڵدا بۆ تێدا حەوانەوەی ئافرەتو منداڵ لەکاتی هاتنی میوانی بێگانەدا ◊ **المَقْطَنَةُ**: کشتوکاڵی پەمۆ ◊ زەوی کشتوکاڵی پەمۆ ◊ **اليَقْطِينُ**: هەر ڕوەکێك قەدی نەبێ وەکوو ڕوەکی کولەکەو ترۆزیو خەیار ◊ بەزۆری بۆ کولەکە بەکاردێ.

**قطا** قَطْواً: بەتەمبەڵی ڕۆیشت، هەنگاوی هێدی هێدی هەڵێنان ◊ **قطت القطاة**: قەتییەکە خوێندی ◊ **تَقَطَّى**: تەمبەڵی کرد ◊ **تَقَطَّى لأصحابه**: فێڵی لە هاوەڵەکانی کرد ◊ **تَقَطَّى بوجهه عنه**: ڕوی وەرگێڕا ◊ **تَقَطَّى الفرسَ**: سواری کەفەڵی ئەسپەکە بوو.

القَطَى: ئەخۆشییەکە توشی مەڕو بزن دەبێ ◊ **القطاة**: کورکی، قەتێ ◊ جۆرە کۆترێکە حەزی لە ژیانی چۆڵەوانییە هێلانە لە زەویدا دروست دەکا ◊ کۆمەڵ کۆمەڵ دەفڕنو مەسافاتی زۆر دوورو درێژ دەبڕن ◊ هێلکەکانی پەڵەپەڵەو بەڵەکە ◊ هەروا ناوە بۆ شوێنی سواربوونی پاشکۆی سوار، واتە سەرکەفەڵی وڵاخ ◊ **القَطَوان**: هەرکەسێكو هەرشتێك بەهێواشی هەنگاو هەڵبێنێو هەنگاوی نزیك نزیك بهاوێ ◊ **القَطَوْطىَ**: پیاوی کورتە باڵا: کە هەنگاوی کورت کورت بهاوێ ◊ **القَعْبُ**: قاپێکی گەورەیە لە گەنو سەعەند ◊ **القُعْبَةُ**: کونەبەردو چاڵاو لە شاخو بەردا ◊ **القَعيبُ**: ژمارەی زۆر ◊ **قَعْبَلَ**: وا ڕۆیشت وەکوو ئەوە بەقاچی زەوی هەڵبکۆڵێ واتە: بەڕۆیشتن پێکۆڵی کرد ◊ **القَعْبَلُ**: لەگەنو سەعەندو سەتڵ کە شیری تێدا بدۆشرێ ◊ **القِعْبَلُ**: بەمانا (القَعْبَلُ) دێ ◊ **المُقَعْبَلُ**: دەگوترێ: (رجل مُقَعْبَلُ القدمين) پیاوێك پێشەوەی قاچی لێك نزیك بوونەوەو پاژنەکەیان لێك دوور کەوتنەوە.

**قَعَثَ** له من الشَّيْءِ قَعْثاً وقَعْثةً: شتێکی کەمی پێدا.

**قَعَثَ** الشَّيْءَ قَعْثاً: شتەکەی لەبێخ دەرهێنا ◊ کۆنترۆڵی کرد ◊ **أقْعَثَ له في ماله**: لە ماڵ خەرج کردندا زێدەڕۆیی کرد ◊ **أقْعَثَ في العطية**: یان (أقْعَثَ له في العطية) بەخششی باشی پێدا ◊ **إنقَعَثَ الشَّجرُ ونحوه**: درەختەکە لە بن ڕا هەڵکەندرا ◊ **إنقَعَثَ البناءُ**: باڵەخانەکە لە

بناغەکەیەوە ڕوخا ◊ القُعَاثُ: نەخۆشییەکە توشی لوتی مەڕو بزن دەبێ ◊ القَعِيثُ: لافاو، یان بارانی بەخوڕەو قەترە گەورە.

**قَعَدَ قُعوداً:** دانیشت (لەحاڵەتی ڕاوەستانەوە دانیشت) ◊ **قَعَدَت الفسيلة:** نەمامەکە ڕەگەی کردو خۆی گرت.

**قَعَدَ بفلان:** هاوکوفی فلانکەس بوو ◊ **تَقَعَدَ عن الأمر:** لەکارەکە دواکەوت، وازی لەکارەکە هێنا ◊ **قَعَدَت المرأةُ عن الحيضِ والولد:** ئافرەتەکە لەعادەی مانگانەو منداڵبوون وەستایەوە ◊ **قَعَدَت النخلةُ:** دارخوماکە ساڵە ناساڵێک بەری گرت.

**قَعِدَ البعيرُ ونحوه:** حوشترەکە شلییەک بەزمنگیەوە بوو باریکایی دەستو قاچی نێوان سمو باریکایی قاچی شل بوو.

**أقْعَدَ بالمكان:** لە شوێنەکە جێگیر بوو ◊ **أُقْعِدَ فلان:** فلانکەس جەستەی تووشی نەخۆشییەک بووە لەجێگای خست ◊ **أقْعَدَ الهَرَمُ فلاناً:** پیری فلانکەسی لە ڕۆیشتن خست ◊ **أقْعَدَ فلاناً آباؤه:** باوکو باپیری فلانکەس خوێڕیو هیچو پوچ بوونو نەبوونە جێگای شانازی بۆ ئەو ◊ **أقعد فلاناً أباهُ:** فلانکەس کیفایەتی باوکی دا بۆ پێداویستی بژێو ◊ **قاعَدَهُ:** لەگەڵ فلانکەس دانیشتو هاونشینی بوو ◊ **قَعَّدَه عن كذا:** لەو شتە مەنعی کرد ◊ **قَعَّدَ أباهُ:** باوکو باپیری خۆی شەرمەزار کردن ◊ **إقْتَعَدَ الدَّابَّةَ ونحوها:** وڵاخەکەی ئامادەکرد بۆ سواری ◊ **إقْتَعَدَ فلاناً عن كذا:** فلانکەسی لەو شتە مەنع کرد ◊ **تقاعد عن الأمر:** گرنگی بەکارەکە نەدا ◊ **تقاعَدَ الموظفُ:** مووچەخۆرەکە خانەنشین کرا ◊ **تَقَعَّدَهُ:** لەکارەکەی مەنعی کردو کۆسپو لەمپەری بۆ دانا ◊ **تَقَعَّدَ عن الأمر:** گرنگی بەکارەکە نەدا ◊ **الإقعادُ:** دەردێکە تووشی هەرکەسێک بێ گۆجو ئیفلیجی دەکا ◊ **القاعِدُ عن الأمر:** کەسێک گرنگی بە شت نەدا یان تەمبەڵی بکا لە جێبەجێ کردنی کاردا ◊ ئافرەتێک لە منداڵبوون وەستابێتەوە یان لەعادەی مانگانەی ◊ یان لەتەمەنی شوکردن تێپەڕی کردبێ ◊ هەروا وشەی (القاعد) بەجەواڵو هۆڕو خەرار دەگوترێ: کە پڕبێ لەدانەوێڵە ◊ **القاعدة من البناء:** بناغەو کانگەی خانو ◊ قاعیدەو یاساو دیاردەیەکی گشتی کە هەموو فەردەکانی خۆی بگرێتەوە ◊ **القُعَادُ:** دەردێکە ئادەمیزاد لە جمەوجۆڵ دەخا ◊ نەخۆشییەکە توشی کلۆتی حوشتر دەبێ ◊ **القَعَدُ والقَعَدَةُ:** ئەو کەسانەی خۆیان لەشەڕ دەدزنەوەو بەشداری شەڕی بەرگری لە وڵات ناکەن ◊ پیرێک لە خەواریج ئەم ناوەیان لێ نراوە ◊ **القِعْدَةُ:** ئەو شوێنەی ئادەمیزاد لەکاتی دانیشتن دا جەستەی ڕێی دەکەوێ ◊ شێوە دانیشتن ◊ دەشگوترێ: **بئر قِعْدَةٌ:** بیرێکە قوڵیەکەی بەئەندازەی بەرزی مرۆڤێکی دانیشتو بێ ◊ (ذو القَعِدَة) مانگی یانزەهەمی مانگی قەمەرییە ◊ **القُعْدَةُ:** ئەو شتەی زۆر دانیشتنی لەسەر دەکرێ، وەکوو سەرزینو کورسیو شتی وا ◊ یان مینەکی شوان واتە: ئەو گوێدرێژەی شوان کەلوپەلی خۆی لێ دەپێچێو سواریشی دەبێ ◊ یان ئەو وڵاغەی دەکرێتە مینەکو قەتارچی بەکاری دەهێنێ بۆ سواربوونی خۆی ◊ **القُعَدَةُ:** کەسێک زۆر دابنیشێ ◊ **القُعْدِيُّ:** کەسێک زۆر دابنیشێ : کەسێک پەککەوتە بێ نەتوانێ جمو جوڵ بکا ◊ **القَعَدِيُّ:** کەسێک بڕوای بە بیرو بۆچوونی (قەعەدییە خەواریجەکان) بێ ◊ **القَعودُ:** منداڵ تێ

تەمەنی شەش ساڵانەی ◊ القَعِيدُ: هاونشین ◊ چاودێر ◊ باوك ◊ كوللە كە هێشتا باڵی نەگرتبێ ◊ قعيد النسب: كەسێكە باوكو باپیری لە باپیرە گەورەیان نزیك بن زۆر دوور نەكەوتبنەوە ◊ القعيدة: ئافرەت ◊ پارچە عەبایەك، دۆشەكەڵەیەك لەسەری دابنیشی ◊ خەرارو گوێنی كە كەشكە وشكەو شتی وای تێدا بێ ◊ المَقْعَدُ: دانیشتن ◊ دۆشەكەڵەو شتی وا كە لەسەری دابنیشی ◊ شتێك زۆر لێت نزیك بێ ◊ دەگوترێ: (هو مني مقعد القابلة ومقعد الخاتن) ئەو ئەوەندە لەمن نزیك بوو بەئەندازەی مامان لەژنێك كە خەریكی منداڵبوون بێ یان بەئەندازەی كێربڕ لەو منداڵەی كە خەتەنەی دەكا ◊ المُقْعَدُ: لەپەلوپۆ كەوتوو جەمو جوڵ لێ بڕاو ◊ ئیفلیجو پەككەوتە ◊ شەلو سەقەت ◊ مەمك قیت: كە شۆڕ نەبنەوە ◊ هەڵۆ داوی بۆ بندرێتەوە بۆئەوەی بگیرێو پەرو باڵی لێ بكرێنەوە ◊ شیعرێك زیحافی عەروزی تێدا بێ ◊ (مُقْعَد الحسب) كەسێك بنەماڵەی خانەدان نەبێ ◊ المَقْعَدَةُ: خوێڕیو پروپوچ بێچوە قەتێ پێش ئەوەی بتوانێ هەڵفڕێ ◊ بۆق ◊ القُعْدُدُ: ترسنۆك ◊ پیاوێك هەوڵی پیاوەتی نەدا ◊ قَعَرَت الشاةُ: مەڕەكە بەری هاویشت.

**قَعَرَ البئرَ:** گەیشتە قوڵایی بیرەكە.

**قَعَرَ الشجرةَ رأسها:** درەختەكەی هەڵكەند لەبێخ.

**قَعَرَ الإناءَ:** هەرچی لە قاپەكەدا بوو خواردیەوە ◊ قاپە شلەمەنییەكەی هەڵقوڕاند تا جۆری لێ بڕی ◊ قَعَرَت البئرُ: بیرەكە قوڵ بوو بنكی بیرەكە دوور بوو ◊ قَعَّرَ: لێكۆڵینەوەو بەدواداچوونی كارە نهێنیو نەزانراوەكانی كرد تا ڕوونی كردنەوە ◊ لە قوڵایی قوڕگیەوە قسەی كرد ◊ قَعَّرَ الشيءَ: شتەكەی قوڵ كرد ◊ إنقَعَرَ: لە ڕیشەوە هەڵكەندرا، ڕیشەكێش كرا ◊ إنقَعَرَ الرجلُ عن مالٍ له: پیاوەكە مرد ◊ تَقَعَّرَ: هەڵگەڕایەوە، وەرگەڕا ◊ تَقَعَّرَ في كلامه: لە قوڵایی قوڕگیەوە قسەی كرد ◊ زۆر قوڵبۆوە ◊ القَعْرُ من كل شيءٍ أجوف: كۆتایی قوڵایی شتە بۆشەكە ◊ دەگوترێ: (جَلَسَ في قعر بيته) لەناو ماڵی خۆی دانیشتو نەچوە دەر.

**قَعْرُ الفم:** ناو دەم ◊ القَعْرانُ: (إناءٌ قعران) قاپو سوراحی قوڵ ◊ القَعِرَةُ: (قَصْعَةٌ قَعِرَة) لەگەنێكە ئەوەندەی شت تێدایە بنكەكەی شاردۆتەوە ◊ القَعْرَةُ: ئەو شتەی بنكی لەگەنەكەی داپۆشیبێ ◊ القُعْرَةُ: چاڵایی ◊ چاڵو چوێڵ ◊ القَعُورُ: شتێك زۆر قوڵ بێ، بنكی قوڵ بێ ◊ القَعيُ: بەمانا (القَعُورُ) دێ ◊ المِقْعارُ: ئەو كەسەی دەنگی لەبنكی قوڕگیەوە بێنێتە دەر (قَدَح مقعار) پیاڵەیەكی قوڵە.

**قَعَسَ الشيءُ قَعْساً:** شتەكە دواكەوت ◊ گەڕایەوە بۆ دواوە.

**قَعَسَ الشيءَ:** شتەكەی نوشتاندەوە ◊ قَعِسَ قَعَساً: سنگی دەرپەڕیو پشتی قوڵ بوو.

**قَعِسَ الفَرَسُ:** ئەسپەكە شوێنی سواربوونیو سەرپشتی نەرمو ئارامە.

**قَعِسَ فلان:** فلانكەس داكۆكی كرد مانیع بوو ◊ تقاعَسَ: سنگی دەرپەڕاند ◊ تقاعَسَ عن الأمر: لەكارەكە دواكەوت ◊ تقاعَسَ الفَرَسُ: ئەسپەكە ژێربار نەبوو، بە ویستی سوارەكە هەوسارو ڕیشمەی خۆش نەبوو ◊ تقعَّسَتِ الدابَّةُ: ولاخەكە لە شوێنی خۆی وەستاو نەڕۆیی ◊ إقْعَنْسَسَ: بەسروشت سنگ دەرپەڕیوو پشتی قوڵ بوو ◊ دواكەوتو گەڕایەوە بۆ دواوە ◊

**كَسَرَ الحرْفَ**: بزوێنی ژێری خستە سەر پیتەکە ٥ كَسَّرَ الشَّيْءَ: زێدەڕۆیی کرد لە شکاندنی شتەکەدا ٥ كَسَّرَ الكلمةَ: وشەکەی بەشێوەی (جمع تكسير) جەمع کردەوە ٥ إنْكَسَرَ العسكرُ: سوپا شکاو تارومار بوو ٥ إنْكَسَرَ الشِعْرُ: شیعرەکە لەنگ بوو ٥ إنْكَسَرَ العجينُ: هەویرەکە شل بوو هەڵات ٥ الكُسارُ: ئەو پارچە وردانەی لەشتەکە دەبێتەوە ٥ وەکوو وردە کاشی وردە شوشە، وردەنان ٥ الكُسارَةُ: بەمانا (الكُسار) دێ ٥ الكِسْرُ: قەراخی خانوو ٥ لای شتو کەناری شت ٥ الكَسْرُ: بەمانا (الكِسْرُ) دێ ٥ شتی کەم ٥ لەبواری حیسابو ریازیات دا ژمارەی کەرتو شتی وایە وەکوو ($\frac{1}{2}$ $\frac{1}{3}$ $\frac{1}{4}$)...هتد. دەگوترێ: (ضرب الحسابُ الكسورَ): ژمێریارەکە کەرتەکانی زەربی یەك کردن ٥ الكَسْرَةُ: تێشکان ٥ الكِسْرَةُ: پارچە شکاوی هەرشتێك بێ ٥ الكَسَّارَةُ: شتێکە وەکوو گازو پلایس گوێزو شتی وای پێ دەشکێنن.

**الكسور من الجلد والثوب**: چرچو لۆچی پێستو قوماشو شتی وا ٥ المكاسِرُ: جیرانی نزیك، ئەوەی دیواری بەدیواری خانوەکەتەوەیە ٥ المَكْسِرُ: شوێنی شکاندنی شت ٥ المُكَسَّراتُ: گوێزو بادامو بندەقو فستەقو شتی وا.

**كَسَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی کوتاو وردوهاڕی کرد.

**كَسَّ الرجلُ**: پیاوەکە ددانی دەرکەوتن ٥ ددانی خوارەوەی بەرز بوونەوە دەرکەوتنو مەلاشوێو شەویلەی سەرەوەی بۆ دواوەو شەویلەی خواروی هاتەپێشەوە ٥ تَكَسَّسَ: بەئەنقەست شەویلەی خۆی پاشو پێش کردن ٥ الكَسِيسُ: گۆشت کەلەسەر بەردی گەرم وشك کرابێتەوە پاشان ورد بکرێو بکرێتە توێشوی سەفەر ٥ هەروا ناوە بۆ شەرابێك لەزوراتو جۆ دروست بکرێ.

**كَسَعَ فلاناً**: لەپاشەوەی دا، بەدەستی یان بەپێشەوەی قاچی لەفلانکەسی دا ٥

**كَسَعَ الشَّيْءَ كذا بكذا**: شتەکەی کردە شوێنکەوتەی ئەوەو بەو شێوەی لێ کرد.

**[illegible]ناً بما ساءَهُ**: قسەی کردو وەڵامی ناشیرینی قسەی فلانکەسی دایەوە ٥ فلانکەسی دەرکرد ٥ إكْتَسَعَتِ الخيلُ بأذنابِها: ولاخە بەرزەکە شتەکەیان خستە ژێر قاچیانەوە ٥ إكْتَسَعَ الفَحْلُ: کەڵەکە کلکی لەرانی دا ٥ تَكَسَّعَ في ضلاله: لەگومڕایی خۆیدا ڕۆچوو ٥ الأكْسَعُ: دەگوترێ: (حمام أكسع) کۆترێکە لەژێر کلکی دا پەری سپی هەن ٥ الكُسْعَةُ: خاڵی سپی لەناوچەوانی هەرشتێك دا بێ ٥ پەڕی سپی لەژێر کلکی باڵندەدا ٥ گوێچکەنان ٥ كَسَفَتِ الشمسُ: خۆر گیراو ڕوناکی نەما.

**كَسَفَ الوجه**: دەموچاو زەرد هەڵگەڕاو

**كَسَفَ الرجلُ**: پیاوەکە چاوی داگرت

**كَسَفَ بَصَرُهُ**: بەهۆی چاو ئێشەوە چاوی بۆ نەکرانەوە.

**كَسَفَ بالُهُ**: وەزعو حاڵی ناخۆش بوو.

**كَسَفَ أمَلُهُ**: هیواو ئاواتی پوکانەوە.

**كَسَفَ الشَّيْءَ**: شتەکەی داپۆشی ٥ كَسَفَتِ الشمسُ النجومَ: خۆر بەڕوناکی خۆی ڕوناکی ئەستێرەکانی داپۆشی.

**كَسَفَ الشيئَ**: شتەکەی بڕیەوە ٥ أكْسَفَ القمرُ الشمسَ: مانگ بەری ڕوناکی خۆری گرت ٥ أكْسَفَ الحزنُ فلاناً: خەفەت وەزعو حاڵی

فلانكەسی گۆڕی ◊ كَسَفَ الشَّيْءَ: شتەكەی بڕیەوە.◊**الكِسْفَةُ**: پارچەی شت ◊ پەت و كەرت ◊ الكُسُوفُ: خۆرگیران یان كەمبوونەوەی ڕوناكییەكەی ◊ كَسْكَسَ الشَّيْءَ: شتەكەی بەتوندی كوتاو وردوهاڕی كرد.

**كَسِلَ الأمرُ الرجلَ**: كارەكە پیاوەكەی تەمبەڵ كرد ◊ تكاسَلَ: بەئەنقەست تەمبەڵی نواند ◊ المكسلة: هەرشتێك سەر بكێشێ بۆ تەمبەڵی.

**كَسَمَ كَسْماً**: تێكۆشاو هەوڵی دا لەپێناو پەیداكردنی بژێو.

**كَسَمَ الحَرْبَ**: شەڕی هەڵگیرساند.

**كَسَمَ الشَّيْءَ اليابِسَ**: شتە وشكەكەی بەدەستی خۆی وردوهاڕ كرد ◊ الأكسوم من الرياض: باخێك ڕوەك و گیاو گژی كەوتبێتە سەریەك ◊ الكَسْمُ: باقی ماندەی شتی وشك كەدوای شكاندن و ورد كردن بەدەستیەوە بمێنێتەوە ◊ الكَسُومُ: ماندوو شەكەت لەنێش و كاردا.

**كسا فلان ثوباً**: كراسێكی دا بەفلان.

**كَسِيَ كَساً**: پۆشاكی پۆشی ◊ إكتسى: پۆشاكی پۆشی ◊ إكتَسَتَ الأرضُ بالنبات: زەوی بەڕوەك و گیاوگژ خۆی ئارایش دا، خۆی داپۆشی ◊ تكسّى بالكساءِ: پۆشاكی پۆشی ◊ إستَكْساهُ: داوای پۆشاكی لێ كرد ◊ الكِساءُ: پۆشاك.◊**الكُسْوَةُ**: كراس و پۆشاكێكە بۆ خۆڕازاندنەوە دەپۆشرێ.

**كَشَأَ اللحمَ**: گۆشتەكەی ئەوەندە برژاند تا وشك بۆوە.

**كَشَأَ الطعامَ**: خواردنەكەی داكرۆشت و خواردی.

**كَشَأَ الشَّيْءَ**: شتەكەی پاك كرد توێكڵەكەی لێ كردەوە.

**كَشِئَ من الطعام**: پڕبوو لە خواردەمەنی ◊ كَشِئَتْ يدُه: پێستی دەستی ئەستورو پتەو بوو، گرژبوو ◊ أكْشَأَ: گۆشتی برژاوی خوارد ◊ تَكَشَّأَ الأديمُ: پێستەكە دامالدرا لێ بۆوە ◊ تَكَشَّأَ الرجلُ من الطعام: پیاوەكە لەخواردن تێربوو ◊ تَكَشَّأَ اللحمَ: گۆشتی وشكەوەبوی خوارد ◊ الكَشِيءُ: برژاوی تازەو پێگەیشتوو ◊ الكُشَيْباتُ: جامیلكەیەكی زۆر بچكۆلە خەیات دەیكاتە سەری پەنجەی بۆئەوەی دەرزییەكە ئازاری نەدا ◊ هەروا ناوە بۆ بۆرییەكی بچكۆلە مۆسیقار لەسەر پەنجەی دەگاو ئامێری قانونی پێ لێ دەدا.

**كَشَحَ القوم عن الماء كَشْحاً**: خەڵكەكە لەدەوروبەری ئاوەكە ڕۆیشتن و پەرتەوازە بوون.

**كَشَحَ الطائرُ**: باڵندەكە بەگورجی هات.

**كَشَحَ لفلان بالعداوة**: دژایەتی فلانكەسی كرد ◊ كَشَحَتِ الدَّابَّةُ: ولاخەكە كلكی لەناوگەڵی خۆی نا.

**كَشَحَ القومَ**: خەڵكەكەی دەركرد.

**كَشَحَ البعيرَ**: لاكەلەكەی حوشترەكەی بەئاگر داخكرد.

**كَشَحَ فلاناً**: زەبری لەلاقەبرغەی فلانكەس دا.

**كَشَحَ العودَ**: شوڕكە دارەكەی سپی كرد

**كَشَحَ**: لاكەلەكەی هێشا ◊ كاشَحَهُ: دوژمنایەتی كرد ◊ كَشَّحَ العودَ: لقەدارەكەی سپی كرد ◊ إنْكَشَحوا عن الماء: لەئاوەكە دوور كەوتنەوەو پەرتەوازە بوون ◊ الكاشح: دوژمنی سەرسەخت و دڵ پیس ◊ **الكِشاحُ**: شوێنەكەی داخ ئەو شوێنەی بەهۆی سوتاندن بەداخ توكی

لێ نەروێ ٥ **الكشاحَةُ**: موقاتەعەو دەنگ دابڕین ٥ **الكَشَحُ**: کەلەکە، خالیگە ٥ خوار پەراسو ٥ ویشاحو ویسام کە دوو خەتی گەوهەر یان ئاوریشم لێك دەدرێنو بەسەر شان دا بۆ بن هەنگڵ ڕاستو چەپ دەهێندرێن ٥ **الكَشَحُ والكُشاحُ**: دەردێکە توشی لاکەلەکە دەبێ ٥ **المِكْشاحُ**: پاچ ٥ تیژایی شمشێر.

**كَشَدَ الشَّيْئَ**: بەددان شتەکەی بڕی (قرتاندی).

**كَشَدَ النَّاقَةَ**: بەسێ پەنجە گوانی حوشترەکەی دۆشی ٥ **اكْشَدَ**: ڕۆنەکەرەکەی لەماستەکە جیاکردەوە ٥ **الكاشِدُ**: کەسێك زۆر هەوڵو تەقەلا بدا بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی

**كَشَرَ** عن اسنانه **كَشْراً**: ددانی دەرخستن لەکاتی پێکەنین دا ددانی دەرخستن.

**كَشَرَ** فلان لصاحبه: فلانکەس زەردەخەنەی بۆ هاوەڵەکەی کرد.

**كَشَرَ السَّبُعُ** عن نابه: دڕندەکە ددانی دەرخستنو خۆی ئامادەکرد بۆ پەلاماردانو نێچیر کردن.

**كَشَرَ** العَدُوُّ عن انيابه: دوژمن خۆی گیف کردەوەو هەڕەشەی توندی لەبەرامبەری کرد ٥ **كاشَرَهُ**: بەدەمیەوە پێکەنیو ڕوخۆش بوو ٥ **كَشَّرَ**: بۆ موبالەغەی مادەی (كَشَرَ) دێ ٥ **الكَشَرُ**: هێشومتڕێ یان هێشوەخورما کە بۆڵەکانیان لێکرابنەوەو لاسکو قونچکیان مابێ ٥ **الكُشَرِيُّ**: خواردەمەنییەکە لەبرنجو نیسك دروست دەکرێ ٥ **كَشَتِ الأفعى**: مارەکە: کەهەندێ جەستەی لەهەندێکی تری خشا دەنگی لێ هات ٥ یان بەدەمی فیشکانی.

**كَشَّ** الجملُ: حوشترەکە باڕاندیو باڕاندنەکەی لەقوڕگیدا خواردەوە.

**كَشَّ القِدْرُ**: مەنجەڵەکە کوڵیو کەوتە قڵپە قڵپ ٥

**كَشَّ الثوبُ او الجِلْدُ**: قوماشەکە یان چەرمەکە تێچوو وێکهاتەوە.

**كَشَطَهُ عنه**: لێی داڕنی.

**كَشَطَ الجلَ عن الفرس**: زینەکەی لە ئەسپەکە کردەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (لأكْشِطَنَّ عن أسرارك) هەموو نهێنییەکانت ئاشکرا دەکەم.

**كَشَطَ الحرفَ**: پیتە نووسراوەکەی سڕیەوە.

**كَشَطَ غِلالَةَ اللبن**: سەرتوێژی ماستەکەی کۆکردەوە ٥ **تَكَشَّطَ السحابُ**: هەورەکە لێك بڵاو بوونو نەمان ٥ **الكُشّاطُ**: حەیوانکوژەرەوە، قەساب.

**كَشَفَ الشَّيْئَ**: شتەکەی دەرخستو پەردەی سەری لادا.

**كَشَفَ اللهُ غَمَّهُ**: خودا خەمو خەفەتی لەدڵ دا لابرد.

**كَشَفَ الكواشفُ فلاناً**: شتە دەرخەرەکان فلانیان فەزح کرد، حەیایان برد.

**كَشَفَ عليه الطبيبُ**: پزیشکەکە وردبینی بۆ کردو نەخۆشییەکەی دەرخست.

**كَشِفَ فلان**: فلانکەس پێشەسەری ڕوتایەوە ٥ یان فلانکەس لەشەڕدا مەتاڵی پێ نەبوو ٥ کڵاو خودەی لەسەر نەکرد ٥ لەشەڕدا خۆی نەگرتو هەڵات.

**كَشِفَ الفرسُ**: ئەسپەکە ئێسقانی کلکی یان لای سەرە کلکی خوار بوو ٥ **اكشَفَ فلان**: فلانکەس پێکەنی تاپوکی دەرکەوتن ٥ **كاشَفَهُ بالأمر**: کارەکەی لەلا ئاشکرا کرد ٥ **كاشَفَهُ بالعداوة**: دوژمنایەتیەکەی بۆ ئاشکراکرد ٥ **كَشَّفَ**: بۆ موبالەغەی (كَشَفَ) دێ ٥ **إكْتَشَفَتِ المرأةُ**:

نافرەتەکە زۆری لەجەستەی خۆی ڕوت کرد، دەرخست ◊ إِكتَشَفَ الأَمرَ: بەھەوڵو ماندوبونێکی زۆر توانی ئیشەکە ئاشکرا بکا ◊ إِكْتَشَفَ الشَّيْءَ: بۆ یەکەمجار شتەکەی ئاشکرا کرد پەردەی لەسەر لادا ◊ إِنْكَشَفَ الشَّيْءُ: شتەکە دەرکەوت ◊ تَكَشَّفَ الشَّيْءُ: بەمانا (إِنْكَشَفَ) دێ ◊ تكاشَفَ القوم: خەڵکەکە نهێنی خۆیان بۆ یەکتری ئاشکرا کرد ◊ تَكَشَّفَ فلان: فلانکەس فەزح بوو ◊ تَكَشَّفَ البرقُ: هەورەبروسکە ئاسمانی داگرت ◊ تَكَشَّفَتِ الأرضُ: زەوییەکە وشك هەڵات ◊ إِسْتَكْشَفَ عنه: داوای لێ کرد شتەکەی بۆ ڕون بکاتەوە نهێنییەکانی لەلا بدرکێنێ ◊ الكَشْفُ: یاسایەکی پوختەکەرو بژارکەرە هەوڵ دەدا کەسایەتی وا لەکۆمەڵگا دا دروست بکا گیانی هاریکاریو پشت بەخۆبەستنو فریادڕەسی تێدابێ ◊ الكشّاف: یەکێکە لەئەندامانی کۆمەڵەی کەشافەو چەند پلەو پایەیەکی هەیە ◊ ناوێی کتێبێکی تەفسیری قورئانە ◊ الكَشْفاءُ (جَبْهَةٌ كشفاء): پێشەسەری ڕوتاوە ◊ المِكْشافُ الكهربي: ئامێرێکی کارەباییە جۆری شوحنەی کارەباییو شوێنکەی لەسەر شت دیاری دەکا ◊ الكِشْك: کەشك، دۆینە؛ خواردنێکە لەئاردو ماست دروست دەکرێو وشك دەکرێتەوەو هەڵدەگیرێ کاتی پێویست دەکرێ بەکێشت ◊ الكُشْكُ: خانوی بچوك، کۆشك، قۆختە، کەوشەك ◊ كَشْكَشَ فلان: فلانکەس هەڵات ◊ كَشْكَشَ الأفعي: مارەکە پێستەکەی خشەخشی هات ◊ كَشْكَشَ الثوبَ: چرچو لۆچو نوشتانەوەی لەقوماشەکەدا دروست کرد ◊ الكشكشة: زاراوەی هۆزی بەنی ئەسەدو هۆزی ڕەبیعەیە لەشوێنی کافی ڕاناوی مێینە پیتی (شین) بەکاردێنن

**كَشَمَ أنفَهُ**: لەبن ڕا لوتی بڕی.

**كَشَمَ القثاءَ او الجَزَرَ**: خەیارەکە یان گێزەرەکەی بەخێراییو بەهەڵپە هەڵپ خوارد.

**كَشِمَ**: بە زگماك کەم ئەندام بوو یان لەبنەچەو نژاد دا کەمو کوڕی هەبوو.

اكتَشَمَ أنفَهُ: بەمانا (كَشَمَهُ) دێ ◊ **كَشْمَرَ**: لەپرمەی گریانی دا ◊ **كَشْمَرَ أنفَهُ**: لوتی شکاند ◊ **الكُشامِرُ**: ئادەمیزادی ناشیرین ◊ **الكِشْمِشُ**: کشمیش مێوژو ترێی دەنك وردیلە.

**كشا الشَّيْءَ**: شتەکەی بەددانەکانی گەستو دەری هێنا.

**كَصَّ**: وێکهاتەوە تێچو ◊ **اكصَّ فلان**: فلانکەس هەڵاتو قاچاندی ◊ **الكصيصُ**: دەنگی نزم بەهۆی ترسو بیمەوە ◊ تێچوونو وێکهاتنەوە

**كَصَمَ**: چۆن هات ئاوا بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە

**كَظَبَ كظوباً**: پڕبوو لە ڕۆن.

**كَظَرَ القَوْسَ**: لایەکی کەوانەکەی بڕبڕکرد کەلی کرد بۆئەوەی ژێیەکەی تێدا چەسپ بکرێو بەرنەبێ.◊ **الكُظْرُ**: بەزی دەوروبەری گورچیلە.

**كَظَّ المَسيلُ بالماء**: ڕێڕەوی ئاوەکە ئاوەکەی نەکێشا لەبەر زۆری ئاوەکە.

**كَظَّ الحَبْلَ**: حەبلەکەی کشت باداو.

**كَظَّ الطعامُ او الشرابُ الحيوانَ**: خواردنو خواردنەوەکە گەدەی حەیوانەکە نەیکێشاو هەناسەی توند کرد.

**كَظَّ الغَيْظُ صدرَهُ**: بوغزو کینە دڵو دەرونی پڕ کرد.

**كَظَّ الأمرُ فلاناً**: کارەکە فلانکەسی نارەحەت کرد.

**كَظَّ فلان خَصْمَهُ**: فلانکەس ڕکابەرەکەی خۆی بۆڕداو هەموو ڕێگاچارەیەکی ڕزگاربوونی لێ بڕییەوە ○ **كاظّهُ**: ماوەیەکی زۆر تەنگی پێ هەڵچنیو وازی لێ نەهێنا ○ **كاظَّ فلاناً في الحرب**: فلانکەسی باش فێری شەڕ کرد ○ **إكْتَظَّ**: باش پڕبوو ○ **إكْتَظَّ الوادي بالسيل**: شیوەکە لافاوەکە ناکێشێو پڕاوپڕو لێوان لێوە ○ **تكاظّوا**: لەگۆڕەپانی جەنگ دا تەنگیان بەیەکتر هەڵچنی ○ **تكاظَّ القومُ**: خەڵکەکە سنووری یاساییان شکاند لەدژایەتیکردنی یەکتری ○ **الكِظاظُ**: توندو تیژیو چورتمو ناخۆشی ○ هەرشتێك دڵ ناخۆش بکا ○ **الكَظّ**: دەگوترێ: (رجل كظٌّ) پیاوێکە ئیشو کاری تەنگی پێ هەڵدەچنو نارەحەتی دەکەن ○ **الكِظّةُ**: ورگنی ○ **كَظْكَظَ السِّقاءَ**: کوندە ئاوەکە بەئاو تێکردن لێك کشاو فش بوو ○ **تَكَظْكَظَ عند الأكل**: چوارمەشقی دانیشت بۆئەوەی ورگی پڕبکا لە خۆراك.

**كَظَمَ** السِّقاءَ: کوندەکەی پڕکرد لەئاو و دەمی توند بەست.

**كَظَمَ** مجرى الماء: ڕێڕەوی ئاوەکەی گرت.

**كَظَمَ** الرجلُ غيظه: پیاوەکە ڕقی خواردەوەو ددانی بەخۆیا گرت.

**كَظَمَ** نَفَسَهُ: نەفسی خۆی گرت نەیهێشت سەرکەشی بکا.

**كَظَمَ** كظوماً: بێدەنگ بوو ○ **الكاظِمُ**: ئەو کەسەیە لەکاتی تورەبوونو ڕق هەڵسان دا ددان بەخۆی دا دەگرێ ○ **الكِظام**: تۆپەوانەو سەدادەی شت ○ **الكِظامةُ**: سەدادەو تۆپەوانە ○ حەبلێکە لوتی حوشتری پێ دەبەسترێ بۆئەوەی ژێربار بێ ○ پێشی دەگوترێ: مەهار ○ هەروا ناوە بۆ دەراوی شیو ○ **الكَظْمُ**: بۆری هەناسە بەلای بینە قاقاوە، ئەو شوێنەی هەناسەی لێوە دێتەدەر بۆناو دەم ○ **الكظيمُ**: بەمانا (الكاظِمُ) دێ ○ هەروا بەمانا خەفەتباریش دێ

**كَظا** لحمُهُ: گۆشتی زۆر بوو، خۆی دارشت ○ **تَكَظّى لحمُهُ سِمْناً**: گۆشتی سواری یەك بوو، قەڵەو بوو ○ **كَعَبَت الفتاةُ**: کچەکە مەمکی خڕکردن.

**كَعَبَ فلاناً**: زەبری لەشوێنی ڕەقایی جەستەی فلاندا وەکوو (سەرو قاپەڕەقەو دەفەی شان).

**كَعَبَ الإناءَ او الحوضَ**: قاپەکە یان حەوزەکەی پڕکرد ○ **اكعَبَ الرجلُ**: پیاوەکە بەخێرایی ڕۆیی ○ **كَعَّبَت الفتاةُ**: کچەکە مەمکی خڕکردن ○ **كَعَّبَ الشّيْءَ**: شتەکەی موکەعەب کرد (سوچ سوچی کرد) ○ **كَعَّبَ العددَ**: ژمارەکەی دووجار زەربی خۆی کرد ○ **كَعَّبَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕکرد ○ **كَعَّبَ الثوبَ**: قوماشەکەی توند پێچایەوە ○ **تَكَعَّبَ ثَديُ الفتاة**: مەمکی کچەکە خڕبوون ○ **التكعيبة**: کەپری مێو ○ **التكعيبيةُ**: جۆرە بیروبۆچوونێکە لەبواری وێنەگرتن دا یەکێك لەهونەرمەندە بەناوبانگەکانی ئەم بوارە بیکاسۆیە ○ **الكَعْبُ**: هەر جومژگەیەك لەنێسقان ○ قاپەڕەقە ○ هەروا وشەی (كَعْب) ناوە بۆ گرێی قەفەژاژو لاسکی گندۆڕو هەر لاسکە ڕوەکێك کە گلۆر بێ ○ (رجل عالي الكعب) واتە پیاوێکی خاوەن ڕێزو خانەدانە ○ **الكَعْبَةُ**: کابە، ماڵی خودا ○ هەر خانویەك چوارلایەکەی چوارگۆشەیی بێ ○ **المكعَّبُ**: بودرەو عەبای پەراوێز چندراو ○ لەبواری مەساحەو ڕوپێوی دا قەبارەیەکە شەش چوارگۆشە دەوریان دابێ ○ لەبواری ژمارەو

حيساب دا ئەو ژمارە بەدەستهاتوميە كەلەئاكامى زەربكردنى دوو چەندانەى خۆى پەيدابووبێ؛ بۆ نمونە ژمارە هەشت موكەعەبى ژمارە دووە ◊ **كَعْبَرَهُ بالسيف**: بەشمشێر بڕى ◊ **الكُعْبُرَةُ**: گرێى لاسكى هەر ڕوەكێكە كە گلۆرە وەكوو لاسكى قەفەزاژو شتى وا ◊ بەيەك گەيشتنى هەردوو ئێسقانى جومگەكان ◊ **كُعْبَرَةُ الوظيف**: جومگەى نێوان گوزنگو قاچ ◊ **كُعْبَرَةُ الكتف**: قەپيلكى شان ◊ كۆتايى ملو سەرەتاى سەر ◊ كلۆتى ڕان ◊ كوتەگۆشت ◊ بن ژيلو سەرگوێزرى گەنمو جۆ كەلە بێژنگ دەدرێو زيزانەو شتى وا دەكەوێتە ژێرەوەو پلو پوشيشى دەكەوێتە سەر ◊ **الكعبورة**: هەردوو ئێسقانێك بەيەك بگەن ◊ **كَعْبَسَ الرجلُ**: پياوەكە بەخێرايى هەنگاوى نا ◊ يان بە هێواشى بازى دا ◊ **اكْعَمت فلان**: فلانكەس بەشێوەى ڕق هەلساوىو خۆ گيفكەرەوە ڕۆيشت ◊ **الكُعَيْتُ**: بالندەيەكە لەپێرى بولبولو جستە بچوكو گورجو گۆلەو هەميشە لەجمو جۆلدايەو هەدادانى نيە ◊ **كعتر في مشيه**: لەرۆيشتن دا وەكوو سەر خۆش بە لۆژ لۆژ هەنگاوەكانى هەلێنان.

**كَعِرَ الصبيُّ**: مندالەكە ورگى پڕ بوو قەلەو بوو.

**كَعِرَ الفصيلُ**: بێچوە حوشترەكە پيو لە دوگى دا كۆبۆوە ◊ **اكْعَرَ البعيرُ**: حوشترەكە دوگى گەورە بوو ◊ **الكَعْسُ**: ئێسقانى پەنجەى دەستو قاچ ◊ **كَعْطَلَ بيدِهِ**: خۆى كێشايەوەو دەستى هەلبڕين خۆى درێژ كرد.

**كَعَّ فلان**: فلانكەس ترسنۆكو لاواز بوو ◊ **اكَعَّ فلاناً**: فلانكەسى ترساند. **الكَعْكُ**: كەعك، شەكرلەمە، خواردنێكە لەئاردو شەكرو ڕۆن دروست دەكرێ ◊ **كَعْكَعَ في كلامِهِ**: زمانى گيراو قسەى بۆ نەكرا ◊ **كَعْكَعَ فلاناً**: فلانكەسى ترساند ◊ **تَكَعْكَعَ**: ترساو پاشەكشەى كرد.

**كَعَمَ البعيرَ**: دەمى حوشترەكەى شەتەك دا

**كَعَّمَ الوعاءَ**: دەمى قاپەكەى گرت، زاركى تورەكەكەى بەست.

**كَعَمَ الخوفُ**: ترسو بيم زمانى فلانكەسى بەست ◊ **كاعَمَها**: دەمى بەدەميەوە نا، ماچى كرد ◊ **الكِعامُ والكِعامَةُ**: ئەوەى دەمى حەيوانى پێ دەبەسترێ بۆئەوەى نەتوانێ گازبگرێ يان شت بخوا ◊ **كُعْنِبَ قَرْنُ التَّيس**: شاخى نێرييەكە كەلكەلو بادراو بوو ◊ **الكاغز**: كاغەز.

**كَفَأَ الإناءَ**: قاپەكەى سەرنقوم كردەوە.

**كَفَأَ القومَ عن الشيئِ**: خەلكەكە ڕويان لەشتەكە وەرگێڕاو جێيان هێشت.

**كَفَأَ فلاناً**: فلانكەسى گێڕايەوە ◊ **اكْفَأَ في سيرِهِ**: لەڕێگاى مەبەستو ڕێڕەوى خۆى لاى دا ◊ **اكْفَأَ في الشعر**: لەشيعرەكەدا پيتى ڕەوى گۆڕى بۆ پيتێك كەلێى نزيك بێ لەدەنگو مەخرەج دا ◊ **اكْفَأَ لونه**: ڕەنگى گۆڕا ◊ **اكفأ له**: هاوكوفو هاوشانى بۆ دانا ◊ **اكْفَأَ الخِباءَ**: پەردەيەكى ترى بۆ خێمەكە دانا ◊ **اكْفَأَهُ على الشيئِ**: پاداشى دايەوە لەسەر شتەكە ◊ **كافَأَهُ بصُنْعِهِ**: پاداشى دايەوە لەسەر كردەوە باشو ڕەسەنەكانى ◊ **كافَأَ فلاناً**: فلانكەسى يەكسان كرد بەهاوتاى خۆى ◊ **كَفَّأَ الإناءَ**: قاپەكەى سەرەو نقوم كرد ◊ **إكْتَفَأَ لونهُ**: ڕەنگى گۆڕا ◊ **إكْتَفَأَ الإناءَ**: قاپەكەى سەرەو نقوم كرد ◊ **إنْكَفَأَ على الشيئِ**: خۆى بەسەر شتەكەدا شۆڕكردەوە ◊ **إنْكَفَأَتْ على ولدِهِ ترضعه**: خۆى بەسەر مندالەكەيدا كۆم كردەوە شيرى دەداتێ ◊ **إنْكَفَأَ عنه**: ڕوى لێ وەرگێڕا ◊ **إنْكَفَأَ**

**اليه**: بۆى گەڕايەوە ○ **إنْكَفَأَ الى وطنه**: گەڕايەوە بۆ زێدى خۆى ○ **إنْكَفَأَ لونه**: ڕەنگى گۆڕا ○ **إنْكَفَأَ القومُ**: خەڵكەكە شكان‌و هەڵهاتن ○ **تكافَا الشيئان**: دوو شتەكە وەكوو يەك وابوون‌و هاوتابوون ○ دەگوترێ: (تكافَا القوم وتكافَأت الفرس) ○ **تَكَفَّأَ لونه**: ڕەنگى گۆڕا ○ **إستَكفَأ شجرةً**: داخوازى ئەوە بوو درەختەكە ساڵێك بەرى بداتێ ○ **إستَكْفَأَ فلاناً الشرابَ**: داواى لەفلانكەس كرد لەپياڵەكەى خۆيەوە شەراب بكاتە پياڵەى ئەمەوە ○ **الكُفءُ**: هاوشان ○ مرۆڤى بەتوانا لەسەر بەڕێوەبردنى كارەكانى ○ **الكِفاءُ**: هاوشان ○ هەروا ناوە بۆ ئەو پەردەيەى دەدرێ بەسەر چادردا تا سەرزەوى دايدەپۆشێ وەكوو چۆن پەشتەماڵ عەورەتى مرۆڤ دادەپۆشێ ○ **الكَفاءَةُ**: هاوشان لەهێزو تواناو خانەوادەو وەجاخزادەيى دا ○ **الكُفْأةُ**: (كفأة الشئ) بەرهەمى ساڵانەى شت ○ **كُفأةُ الأرض**: بەروبوومى كشت‌وكاڵى ساڵێكى زەوى ○ (كُفأة الغَنم) بەروبوومى مەڕ بەشيرو خورى‌و بێچوپەوە ○ **الكَفِئ**: بەمانا (الكفوء) دێ.

**كَفَتَ الشَّئَ كَفْتاً**: شتەكەى هەڵەوگێڕ كرد.

**كَفَتَ الطائرُ**: باڵندەكە لەفڕين دا پەلەى كردو باڵەكانى لێك دان.

**كَفَتَ فلاناً**: فلانكەسى لەمەبەستى خۆى گێڕايەوە. ○ **كَفَتَ الشَّئَ وإليه**: شتەكەى لەخۆى گرت‌و بۆلاى خۆى كێش كرد.

**كَفَتَ المتاع**: كاڵاكەى كۆكردەوە

**كفت ذيله**: داوێنى هەڵكرد.

**كفت الله فلاناً**: خودا گيانى فلانكەسى كێشا.

**كَفَتَ الشَّئَ**: شتەكەى لەخۆگرت.

**كفت الدرعَ بالسيف**: زرێيەكەى بەشمشێرەكەوە هەڵواسى‌و خستنيە پەنايەك ○ **إكْتَفَتَ المالَ**: هەموو ماڵەكەى لەخۆ گرت ○ جێگاى هەموو ماڵەكەى تێدابۆوە ○ **إنْكَفَتَ الرجلُ**: پياوەكە جەستەى خۆى دارِشت ○ **إنْكَفَتَ الفرسُ**: ئەسپەكە ورگى باريك بوو ○ **إنْكَفَتَ الرجلُ**: پياوەكە گەڕايەوە ○ **إنْكَفَتَ القوم الى منازلهم**: خەڵكەكە گەڕانەوە بۆ شوێن‌و مەنزڵگاى خۆيان ○ **تَكَفَّتَ الثوبُ**: چاكى پۆشاكەكە هەڵدرايەوە ○ **تَكَفَّتَ في سيره**: لە ڕۆيشتن دا پەلەى كرد ○ **الكِفَاتُ**: (أرض كِفات) زەوييەكە مردوو و زيندوى تێدا كۆبووەتەوە ○ (موضع كِفات) شوێنێكە شتى زۆرو هەمەجۆرى لەخۆ گرتووە ○ **الكَفْتُ**: (رجل كَفْتٌ) پياوێكى چوست‌و چالاكە ○ **الكُفْتُ من الخيل**: ئەسپێك بازى بەهێزو توند بهاوى‌و سوارەكەى نەتوانێ جڵەوى بگرێتەوە ○ **الكُفْتَةُ**: كفتە: خواردنێكە لەگۆشتى هەنجندراو و هەندێ تەوابيل‌و پيازو ساوەرو بروێش يان برنج دروست دەكرێ ○ **الكَفِيتُ**: (رجل كفيت) پياوێكى قەد باريك‌و چوست‌و چالاكە ○ كوندەيەكى پتەو و ڕەختەيە ○ **المُكْفِتُ**: كەسێك دوو زرێ بەسەر يەكدا لەبەر بكاو كراسێك لەنێوانيان دا لەبەر بكا.

**كَفَحَ الشَّئَ كَفْحاً**: پەردەى شتەكەى لادا خستيە بەرچاو.

**كَفَحَ فلاناً**: ڕوبەڕو توشى فلانكەس بوو.

**كَفَحَ بالعصا**: بەگۆچان لێى دا.

**كَفَحَ لجام الدابة**: هەوسارو جڵەوى وڵاخەكەى ڕاكێشا بۆئەوەى ڕايبوەستێنێ.

**كَفَحَ عنه كَفْحاً**: لێى ترسا ○ **اكْفَحَ فلاناً عنه**: فلانكەسى گێڕايەوە ○ **كافَحَةُ**: ڕوبەڕو تووشى

بوو ◊ كافَحَ قِرْنَهُ: بەتوندیی روبەرِوی رکابەرەکەی بۆوە ◊ كافَحَ الأطباءُ الأمراضَ: پزیشکەکان بەرەنگاریی نەخۆشییەکانیان کرد ◊ كافَحَ الأمورَ: بۆخۆی سەروکاری ئیشەکانی کرد ◊ تكافح المقاتلون: شەرکەرەکان روبەروی یەکتر بوونەوە ◊ تكافح الأمواج: شەپۆلەکان تێکیانەوە هاویشت.

**الكفيحُ**: هاوشان رکابەر ◊ راکشاو، پاڵکەوتوو ◊ میوانی چاوەروان نەکراو ◊ میوانی ناوەخت.

**كفر الرجلُ**: پیاوەکە کافربوو

**كفر بهذا**: خۆی لەوە بێبەری کرد.

**كَفَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی داپۆشی.

**كَفَرَ الزارعُ البذر بالتراب**: کشتیارەکە تۆوەکەی بەگڵ داپۆشی، تۆوەکەی ژێر گڵ دا ◊ اكفر غَيْرَهُ: خەڵکانی دی بەکافر دانان ◊ اكفر من يطيعه: گوێرایەڵیەکەی خۆی واڵێ کرد یاخی بێ ◊ كَفَّرَ لسيده: دەستی بەسنگیەوە گرتو سەری دانەواند بۆ گەورەکەی ◊ كَفَّرَ عن يمينه: کەفارەتی سوێندەکەی دا ◊ كَفَّرَ الشَّيْئَ: شتەکەی داپۆشی ◊ كَفَّرَ فلاناً: فلانکەسی بەکافر لەقەڵەم دا ◊ كَفَّرَ الله عنه الذنب: خودا لەتاوانی خۆش بوو ◊ تَكَفَّرَ بالشيئ: شتەکەی داپۆشیو شاردیەوە ◊ تَكَفَّرَ في سلاحِهِ: چووە ناو چەکو سیلاحی خۆیەوە، خۆی بەست ◊ الكافِرُ: بەرگی پۆخی خورماو میوە ◊ تاریکی ◊ زەوی چۆڵەوانیو دوردەست کە کەس لێی نەمێنێتەوەو پێیدا نەرِوا ◊ کەسێك خۆ لە شوێنێك حەشاربدا ◊ کەسێك بروای بە بوونی خودا نەبێ ◊ الكافور: درەختێکە لە پێرِی (الغاریة) مادەیەکی رونی شەفافو بلوریی مەیلەو سپی لێ دەردەهێندرێ بۆنێکی عەتر ئامێزی خۆشی هەیەو تامی تاڵە ◊ الكَفْرُ: تاریکایی شەو و رەشی شەو ◊ گۆر ◊ گڵ ◊ پارچە زەوییەك لەئاوەدانییەوە دوور بێ ◊ گوندی بچوك ◊ داری کورتو ئەستور ◊ الكُفْرُ: ئینکاریکردنی راستیو حەق ◊ قیر کە کەشتیو شتی وای پێ روکەش دەکرێ ◊ الكَفَرُ: بەردەی پۆخی خورما ◊ الكَفَّارَةُ: کەفارەتو قەرەبوو کردنەوەی تاوان بەماڵ بەخشینو تاعەت کردن کەلەشەرع دا دیاریی کراون ◊ المُكَفَّرُ: خاوەن چاکەو نیعمەت کەسوپاسگوزاری نیعمەتەکانی نەکرێ ◊ کەسێك بەلا لەنەفسی خۆی دا بێ یا لەماڵو سامانی دا بێ بۆئەوەی کەفارەتی هەڵەکانی بدا ◊ کەسێك چەکی لەخۆی دابێ ◊ چەكو سیلاحی لەخۆی بەستبێ ◊ دەستو پێ کەلەبچە کراو ◊ المَكْفُورُ: (أثر مكفور) ناسەوارێك رەشەبا گڵو خۆڵی بەسەردا دابێو شاردبێتیەوە ◊ ژێر گڵو خۆڵی خستبێ ◊ (عمل مكفور) کارێکی باش کەچاکەی نەدرابێتەوە.

**كَفَّ عن الأمر كفّاً**: وازی لەکارەکە هێناو بەجێی هێشت.

**كَفَّ بَصَرُهُ**: بینایی نەما.

**كَفَّ الثوبَ**: جارێکی تر قوماشەکەی دورییەوە، بەسەر دورمانەکەدا چۆوە.

**كَفَّ الشَّيْئَ**: شتەکەی پێکەوە لکاند ◊ إنْكَفَّ عن الأمر: وازی لە کارەکە هێنا ◊ تكافّوا: خەڵکەکە هەندێکیان وازیان لە هەندێکیان هێنا ◊ تَكَفَّفَ السائِلُ: سواڵکەرەکە دەستی بۆ سواڵکردن پانکردەوە ◊ تَكَفَّفَ الدَّمعُ: فرمێسکەکان وشك بوون ◊ تَكَفَّفَ عن الأمر: وازی لەکارەکە هێنا ◊ تَكَفَّفَ الشَّيْئَ: شتەکەی

بەبەری دەست هەلگرت ٥ **تَكَفَّفَ النَاسَ**: سوالّی لەخەلّك كرد ٥ **كَفَّفَ الثوبَ بالحرير وغيره**: دامێنی قوماشەكەی بەئاوریشم پەراوێزچن كرد، سەردەستەو يەخەی كراسەكەی پەراوێزچن كرد ٥ نەخشی ئاوريشمی لەداوێنی كراسەكە دروست كرد ٥ **إستَكَفَّ الشَّيئُ**: شتەكە كەوانەيی بوو ٥ دەگوترێ: (إستَكَفَّ الحَيَّةُ) مارەكە پاپۆكەی بەستو خۆی خڕكردەوە ٥ **إستَكَفَّ الشجرُ والشعرُ**: درەختەكە يان مووەكان تێكچڕژان ٥ **إستَكَفَّ القومُ الشَّيئَ وبالشيئ**: خەلكە لە دەوری شتەكە گردبوونەوە ٥ چەمبەرەيان لەدەوری شتەكە بەست ٥ **إستَكَفَّ الشَّيئَ**: شتەكەی بەدەست هەلگرت ٥ **إستَكَفَّ الناسَ**: دەستی لەخەلّك پان كردەوە و داوای يارمەتی لێ كردن ٥ **إستَكَفَّ فلاناً عن الشَّيئ**: داوای لە فلانكەس كرد واز لەشتەكە بێنێ ٥ **إستَكَفَّ عَيْنَه**: لەپەدەستی خستە سەر چاوی لەبەرامبەر تیشكی خۆردا بۆئەوەی بزانێ ئاخۆ شت دەبینێ يان نا ٥ (إستَكَفَّ الشَّيئَ) هەولی بینینی شتەكەی دا واتە: لەپی دەستی خستە سەر برۆی وەكوو ئەوە سێبەر لەچاوی بكا بۆئەوەی كاريگەری تیشكی خۆر كەم بكاتەوەو بتوانێ شتەكە ببینێ ٥ دەشگوترێ: (إستَكَفَّتُ عينه) لەژێر لەپی دەستییەوە چاوی شتەكەی بینی ٥ **كافّة**: هەموو ٥ **الكَفَافُ**: (كفاف الشَّيئِ) بەئەندازەی شتەكە ٥ **الكَفَافُ من الرزق**: بژێوی پێويست بێ زيادو كەم ٥ دەگوترێ: (ليتي أخرجُ من هذا كفافاً) خۆزگە لەم كارەم دا بەبێ قازانجو زيان ڕزگارم بوايە ٥ **الكِفافُ**: ئەوەی دەورەی شتێكی دابێ ٥ وەكوو دەوران دەوری گوێچكە ٥ **الكِفافُ من الثوب**: پەراوێزو قەراغو بێجاخی قوماش ٥ **الكِفافُ من السيف**: تیژايی شمشێر ٥ **الكَفُّ**: بەری دەست، لەپەدەست بەپەنجەكانيشەوە ٥ قاچ ٥ لابردنی پيتی حەوتەمی زەنەدار وەكوو لابردنی پيتی (نون) لە (مفاعيلن وفاعلاتن) ٥ **الكَفَفُ من الرزق**: بژێوی بێ كەمو زياد ٥ **الكِفَّةُ**: هەرشتێك كەوانەيی بێ ٥ (كفة الميزان) تاكی تەرازو ئەو تاكەی كێشراوەكەی تێدايە يان تاكەكەی تری ٥ خالّی دروستكراو بەكوتان ٥ تەلّە و داوی نێچیرەوان ٥ چالآييەك ئاوی تێدا كۆبێتەوە ٥ (الكُفَّةُ) دەوران دەوری كلك ٥ كاتی بەيەك گەيشتنی شەوو ڕۆژ لەبەرەبەيانا يان دەمەو ئێوارەو خۆرئاوابوون ٥ پەراوێزی هەر شتێك ٥ تۆپەلآكی درەخت ٥ لای خواروی زرێ ٥ **كَفْكَفَ دَمْعَهُ**: جار دواجار فرمێسكی سڕين بۆئەوەی وشك ببنەوە ٥ **كَفْكَفَ فلاناً**: فلانكەسی لەشتەكە گێڕايەوە ٥ **تَكَفْكَفَ عنه**: وازی لێ هێنا بەجێی هێشت.

**كَفَلَ فلان**: فلانكەس بەردەوام بەڕۆژو بوو. بڕياری دا لەكاتی بەڕۆژوبوونی دا قسە لەگەلّ كەس نەكا ٥ نانی بێ پێخۆری خوارد.

**كَفَلَ الرجلَ وبالرجل**: بوو بەكەفيلی پياوەكە. بەرعۆدەی بوو.

**كَفَلَ الصغيرَ**: منداڵەكەی گەورەكرد ٥ **اكفل فلاناً المالَ**: فلانكەسی كردە بەرعودەو كەفيلی ماڵەكە ٥ **اكفَلَ فلاناً مالَهُ**: ماڵو سامانەكەی دا بەفلانكەس بۆئەوەی چاودێری بۆ بكا ٥ **كافَلَهُ**: پەيمانی لەگەل بەست ٥ **كَفَّلَ فلاناً المالَ**: بەمانا (أكفل) دێ ٥ **كَفَّلَ فلاناً الصغيرَ**: فلانكەسی كردە كەفيلو چاودێری منداڵەكە ٥ **إكْتَفَلَ بالشيئ**: شتەكەی خستە سەر لايەكی

سمتی ◊ **إكْتَفَلَ البعيرَ**: بارگەنەیەکی خستە سەر پشتی حوشترەکەو ئەمجار سواری بوو ◊ **تَكَفَّلَ بالشيءِ**: شتەکەی خستە ئەستۆی خۆی ◊ **تَكَفَّلَ البعيرَ**: بارگەنەی خستە سەر پشتی حوشترەکەو سواری بوو ◊ **الكَفَلُ**: سمتی ئادەمیزادو وڵاخو ئاژەڵ ◊ **الكِفْلُ**: بەش ◊ هاوشانو هاو وێنە ◊ **الكفيل**: هاوشانو هاو وێنە.

**كَفَنَ** الصُّوفَ كفناً: خورییەکەی ڕست.

**كَفَنَ** الميتَ: كفنی بۆ مردووەکە کرد

**كَفَنَ** الخُبْزَةَ: نانەکەی ڕاداشتە سەر قوڵکە ئاگرەکە ◊ **كَفَّنَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (كَفَنَ) دێ ◊ **الكَفَنُ**: كفن؛ بەرگێکە لەمردووەوە دەپێچرێ ◊ **إكْفَهَرَّ الرجلُ**: پیاوەکە دەمو چاوی خۆی گرژ کردن ◊ **إكْفَهَرَّ الليلُ**: شەوەکە تاریکی زۆر پەرەی سەند ◊ **إكْفَهَرَّ النجمُ**: ئەستێرەکە لەناو تاریکی زۆر بەهێزدا ڕوناکی دەرکەوت ◊ **المُكْفَهِرُّ**: هەرشتێك بکەوێتە سەر یەك ◊ هەوری پڕی چین لەسەر چینو ڕەش ◊ دەمو چاوی بێ شەرمو حەیا ◊ **كفاه الشَّيْءُ**: شتەکە بەسی کردو شتی تری پێویست نەبوو.

**كفى** فلاناً الأمْرَ: لەجیاتی فلان کارەکەی ئەنجام دا.

**كفى** الله فلاناً فلاناً او شرّ فلان: خودا فلانکەسی لەشەڕو داوی فلان پاراست ◊ **إكْتَفى بالشيءِ**: بەشتەکە قنیاتی کرد ◊ **إكْتَفى بالأمر**: کارەکەی ئەنجام دا ◊ **تَكَفَّى النباتُ**: ڕووەکە درێژ بوو ◊ **إسْتكفاه الشَّيْءَ**: داوای لێ کرد لەشتەکە بەشی پێویستی بداتێ ◊ **الإكتفاء الذاتي**: ئەوەیە هەرێمێك، دەوڵەتێك بەروبوومی خۆی پێداویستییەکانی دابین بکاو پێویستی بەهاوردەکردن نەبێ ◊ **الكُفْيَةُ**: بژێوی تەواو، بژێوی کیفایەت ◊ **كَوْكَبَ الحديدُ**: ئاسنەکە بریسکەی دا ◊ **كوكب الحصى**: بەردە وردەکان لەکێشتەنگاو دا بریسکەیان دا ◊ **الكَوْكَبُ**: بریسکەی ئاسن، یان بریسکەی بەردو ئاگر لێ بوونەوەیان ◊ پیاو کە چەك لەخۆی دەبەستێ ◊ گەنجی تازە پێگەیشتوو ◊ دەگوترێ: (غلام كوكب) گەنجێکی ڕوخسار جوانە ◊ زۆرینەی شت ◊ **الكَوْكَبُ**: لەبواری ئاسمانشوناسی دا قەبارەیەکی ئاسمانییەو بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوەو ڕوناکی لەخۆر وەردەگرێ ◊ **الكَوْكَبَةُ**: ئەستێرە ◊ یان ئەستێرەی زوهرە بەتایبەتی

**كَلأ** الدينُ كَلْئاً: قەرزەکە دواکەوت.

**كَلأ** بَصَرَهُ في الشَّيْءِ: چاوی بەشتەکەدا گێڕاو چەند جارێك چاوی لێ لاداو سەیری کردەوە.

**كَلأ** الله فلاناً: خودا پارێزگاریی فلانکەسی کرد.

**كَلأ** فلان القومَ: فلانکەس چاودێری گەلەکەی کردو سەرو کاری نیشەکانیانی گرتە ئەستۆ ◊ **اكلأت الأرضُ**: زەوییەکە لەوەڕی زۆر بوو ◊ **اكلأ في الدَّيْنِ**: قەرزەکەی دواخست ◊ **اكلأ عَيْنَهُ**: چاوی ماندوو کرد ◊ **كالأهُ**: موراقەبەی کرد ◊ **كَلَّأ فلان**: پێشەکی (عەربونی) وەرگرت ◊ **كَلَّأ في الأمر**: بەسەرسامییەوە سەیری کرد ◊ **كَلَّأ إليه في الأمر**: فەرمانی پێ کرد بەئەنجامدانی کارەکە ◊ **كَلَّأ فلاناً**: فلانکەسی بەند کرد ◊ **كَلَّأ السفينةَ**: کەشتییەکەی لەکەنار نزیك کردەوە

**إكْتَلَأتْ** عَيْنُهُ: چاوی نەچوونە خەو ◊ **إكْتَلَأ منه**: پارێزگاری لێ کرد ◊ **إكْتَلَأت الكُلاةَ**: عەرەبوونی وەرگرت ◊ **تَكَلَّأ**: عەرەبوونی

وەرگـرت ◊ إسْـتَكْلأَ فـلان: فلانكـەس داوای دواخستنی قەرزەکەی کرد ◊ إسْتَكْلأت الأرضُ: زەوییەکە لەوەڕی زۆر بـوو ◊ الكَـلأ: لـەوەڕ چ تـەڕ چ وشـك ◊ الكُلْـأةُ: عـەرەبوون ◊ قـەرز ◊ الكلأءُ: بەندەری وەستاندنی کەشتی ◊ المَكْلَـأةُ: شوێنێکە کەشتی تێدا ڕادەگیرێن و پەناو لاپایە

**كَلَبَ الفرسَ كَلْباً**: ئاوزەنگی لەئەسپەکە دان..

**كَلِـبَ الرجـلُ وغيره**: پیاوەکـە سـەگ گەسـتی ◊ زۆری خواردو تێرنەبوو ◊ زۆری تینو بوو.

**كَلِبَ الشجَرُ**: درەختەکە تینوی بوو.

**كَلِبَ الـشَّيرُ على الأسيرِ**: ڕۆیـشتنەکە کاریگـەری زۆری لەسـەر دیلەکـە هـەبوو زۆری شـەکەت و ماندو کرد.

**كَلِبَ الدَّهرُ على اهله**: ڕۆژگار زۆر توندو تیژ بوو لەگەڵ خەڵکەکە.

**كَلِـبَ علـى الـشَّيئِ**: زۆر سـور بـوو لەسـەر وەدەستهێنانی شتەکە.

**كَلِبَ عليه**: ڕقی لێ هەڵسا.

**كُلِـبَ كَلاباً**: بـەهۆی نەخۆشـی هاریـەوە عـەقڵی لەدەسـت دا ◊ كالَبَـهُ: دژایـەتی کـرد ◊ كَلَّـبَ الأسيرَ: دیلەکەی کەلەبچە کرد ◊ كَلَّبَ الكَلْبَ: سـەگەکەی ڕاهێنـا لەسـەر ڕاوکـردن ◊ تكالَـبَ القـومُ: خەڵکەکـە بەئاشـکرا دژایـەتی خۆیـان ڕاگەیاند ◊ تكالَبَ على الأمرِ: لەسەر کارەکەی سوربوو دەستی لێ بەرنەدا ◊ تكالَبَ القومُ علـى الـشَّيِ: خەڵکەکـە عـەمبازی شـتەکە بـوون و گەلەکۆمەکێیان لەسەر کـرد ◊ إستَكْلَبَ الرجـلُ: پیاوەکە لوراندی بۆئـەوەی سـەگەکان ببیـسن و بەو بۆنەوە شوێنی خێڵ و ئاوەدانیەکانی خاوەن سەگەکان بدۆزێتەوە ◊ الكالِـبُ: خـاوەن سـەگی ڕامکراو بۆ ڕاوکردن ◊ کۆمەڵە سەگ ◊ الكَلْـبُ: سـەگ ◊ سـەگ جـۆری زۆرە ◊ الكَلَـبُ: نەخۆشـییەکی پێـوە چـوو گواسـتراوەیە فایرۆسەکەی لەڕێگەی گەستن و لیکەوە لەپێڕی سـەگەوە دەگوازرێتـەوە بـۆ مـرۆڤ و گیانلەبـەری تـر ◊ الكَلْبَـةُ: دێڵە سـەگ ◊ چقڵ بەسـەر لق و پۆپی درەختـەوە ◊ الكلبتـان: پلایـسی گـەورە ◊ الكُلْبَةُ: توندوتیژی لەهەر شتێك بێ ◊ الكَلْبِيَـةُ: مەزهـەب و ڕاو بۆچـونێکە بـەگوێرەی سروشـت هەڵس و کەوت دەکاو گوێ بەداب و نەریت نادا ◊ الكَلْبِيـون: ڕێڕەوانـی کەلبیـەن: کـە کۆمـەڵێك فەیلەسوفی یۆنانین ◊ الكَلاّبُ: خاوەنی سـەگی ڕامکـراو بـۆ ڕاو ◊ الكُـلاّبُ: نوکـە ئاسـن کـە بەپاژنـــەی قۆنـــدەرەو کلاشـــی ئەســـپ ڕامکەرەکەوەن و کەسواری ئەسپەکە دەبێ ئـەو نوکـە ئاسـنە لەلاقـە برغـەی وڵاغەکـە دەدا بۆئـەوەی غاربـدا ◊ الكليـب: کۆمەڵـە سـەگ (ڕەوەسەگ) ◊ المكالِبُ: ئازاو چاو نەترس.

**كَلَتَ الشَّيئَ كَلْتاً**: شتەکەی کۆکردەوە.

**كَلَتَ الفَرَسَ**: ئەسپەکەی تاودا ◊ الكَلْتَةُ: شتی کەم ◊ بەشـە خـۆراك و شـتی وا ◊ كَلْـثَمَ وَجْهُـهُ: دەم و چاوی گۆشتن بـوون ◊ الكلثومُ: کوڵم خڕو گۆشتن.

**كَلَـحَ فـلان كُلوحاً**: فلانکـەس ڕوگرژبـوو، زۆر ڕوگرژبـوو ◊ أكْلَحَـهُ الهَـمُّ: خـەم و خەفـەت ڕوخـساری پوکانـدەوە ◊ كالَحَـهُ: بەکێـشەو ڕوگرژییـەوە بـەرەو ڕوی بۆوە ◊ كَلَّـحَ وَجْهَـهُ: ڕوی خـۆی گـرژ کـرد ◊ كَلَّـحَ في وجـه الـصَّبيِّ: منداڵەکەی ترساند ◊ تَكَلَّحَ: بەمانا (كَلَحَ) دێ ◊ الكالِحُ: دەگوترێ: (دَهْرٌ كالِحٌ) ڕۆژگاری تونـدو تیژ ◊ كَلاح: ناوی ساڵی گرانـی و قات و قڕییە.

**كَلَدَ الشَّيْءَ كَلْداً**: شتەكەی كۆكردەوەو خستیە سەریەك ٥ **كَلَّدَ الشَّيْءَ**: بەمانا (كَلَدَهُ) دێ ٥ **تَكَلَّدَ الشَّيْءُ**: شتەكە كۆبۆوە ٥ **تَكَلَّدَ فلان**: فلانكەس گۆشتی پتەو بوو ٥ **الكَلَدُ**: شوێنی توندو پتەو، زەوی پتەو ٥ **كَلَّدَ البازي**: هەڵۆكە خۆی لول كردو خۆی وێكهێنایەوە بۆ پەلاماردانی نێچیرەكەو فراندی.

**كَلَزَ الشَّيْءَ كَلْزاً**: شتەكەی كۆكردەوە ٥ **كَلَّزَ الشَّيْءَ**: بۆ زێدەڕۆوی لەمانای (كَلَزَ) دا دێ.

**كَلَسَ البناءَ كَلْساً**: بەمادەی كەلس دیواری باڵەخانەكەی ڕوكەش كرد.

**كَلِسَ كَلَساً**: ڕەنگی تەپوتۆزاوی بوو ٥ **كَلَّسَ**: بۆ زێدەڕۆوی لەمانای (كَلَسَ)دا دێ ٥ **كَلَّسَ على قرنه**: هەڵمەتی بۆ ڕكابەرەكەی بردو پەلاماری دا ٥ **كَلَّسَ عنه**: لێی ترساو لەبەری هەڵات ٥ **الكِلسُ**: جیری بەرد؛ ئەو مادە ماوەی دوای گەرمكردنی بەردی جیری دەمێنێتەوە ٥ **الكلاّسُ**: فرۆشیاری مادەی كەلس ٥ وەستای كەلسكاری ٥ **الكلاسَةُ**: ئەو شوێنەی كلسی لێ دروست دەكرێ ٥ **التَّكَلُّسُ**: لەبواری كیمیادا ڕەقبون و كۆبوونەوەی خوێی كالیسیۆمە كە ناتوێتەوە ٥ **الكلسيت**: مەعدەنێكە لەكاربۆناتی كالیسیۆمی بلوری پێك دێ.

**كَلْسَمَ**: قونگگرانی كرد لەدانەوەی مافەكان بەخاوەنەكەیان ٥ **الكلسيوم**: عونصورێكی فلزیو جیرییە تێكەڵاوی هەندێ پێكهاتەی جەستە دەبێ، بەتایبەتی هی ئێسقان.

**كَلِعَ الوسخ عليه كَلَعاً**: چڵكەكەی بەسەرەوە كۆبۆوەو ڕەق بوو ٥ **اكْلَعَهُ الوَسَخُ**: چڵكی لەسەر كۆبۆوە ٥ **الكُلاعُ**: وشكبوونەوەی چڵك و گەمڕەبەستنی ٥ **الكلاعِيُّ**: ئازاو چاونەترس ٥ **الكَلَعُ**: گرویی زۆر ٥ **الكِلَعُ**: شێوە وشكو مڕو مۆچ.

**كَلِفَ الماشيةَ كَلَفاً**: ئاڵفی دا بەوڵاغو ئاژەڵەكان.

**كَلِفَ وَجْهُهُ كَلَفاً**: دەمو چاوی پەڵەی تێدا پەیدا بوو ٥ **كَلِفَ الشَّيْءَ وبه**: حەزی لەشتەكە بوو ٥ **كَلَّفَ الأمْرَ**: بەزۆرەملێو ناچاری چووە ژێر كارەكەو لە ئەستۆی گرت ٥ **اكْلَفَهُ به**: وای لێ كرد وەگری بێ ٥ **كَلَّفَهُ امْراً**: ئەنجامدانی كارەكەی لەسەر پێویست كرد ٥ **كَلَّفَ على اسمه ارضاً**: زەوییەكی لەسەر تۆمار كرد ٥ **كَلَّفَ بالأمر**: كارەكەی خستە ئەستۆی ٥ **تَكَلَّفَ**: خۆی بەكاری لاوەكی خەریك كرد، كارێكی خستە ئەستۆی خۆی كە ئیشی ئەو نیە ٥ **تَكَلَّفَ الأمْرَ**: بەزۆرە ملێو ناچاری كارەكەی لەئەستۆ گرت ٥ **تَكَلَّفَ الشَّيْءَ**: شتەكەی خستە سەر شانی خۆی ٥ **التَّكليفُ بالأمر**: كارخستنە ئەستۆی كەسێك كەبتوانێ ئەو كارە ئەنجام بدا ٥ **التُّكْلِفَةُ**: ئەركو ماندوبوون ٥ **الكَلَفُ**: پەڵەو خاڵو شتی وا كەلەسەر ڕوخسار دەردەكەون ٥ **الكِلْفُ**: پیاوی عاشقو شەیداو دێوانە ٥ **الكُلْفَةُ**: ڕەنگێكە لەنێوان ڕەنگی ڕەشو سوردایە ٥ **الكلاّفُ**: كەسێكە ئەركی ئاڵفدانی ئاژەڵی لەئەستۆ بێ ٥ **الكلوف**: كاری قورسو گران ٥ **المُتَكَلِّفُ**: كەسێك بەشێوەی ناواقیعی خۆی نمایش بكا ٥ **المِكلافُ**: دڵدار، كەسێك ڕەگەزی مێینەی زۆر خۆش بوێ ٥ **المكلّفُ**: مرۆڤێك باڵغو ڕەشید بێ ٥ **الكُلاكِلُ**: كورتە باڵای چوارشانە ٥ **الكلكال والكَلْكَلُ**: سنگ.

**الكِلْكِلَةُ**: تاقمو پێڕو كۆمەڵ.

**كَلَّ كلولاً وكلالةً**: ماندوبوو، لاواز بوو.

**كَلَّ فلان**: فلانكەس ماندوبوو.

**كَلَّ** عن الأمر: شتەکەی لەسەر شان قورس بوو.

**كَلَّ** وكَلالَةً: بنەچەو نەوەی میراتگری لەدواجێ نەما ◊ **اكَلَّ فلان**: فلانکەس ئەسپەکەی ماندوبوو.

اكَلَّ غَيْرَهُ: غەیری خۆی ماندو و لاواز کرد ◊ **كَلَّلَ السيف**: شمشێرەکەی زۆر کولو نەبڕ کرد ◊ **كَلَّلَ فلان**: فلانکەس ڕۆیی‌و ماڵو منداڵی خۆی لەشوێنی نەگونجاو جێ هێشت ◊ **كَلَّلَ في الأمر**: لەکارەکەدا دڵسۆزی نواند ◊ **كَلَّلَ عن الأمر**: لەکارەکەدا دەغەڵی کردو نەیکرد ◊ **كَلَّلَ عليه بالسيف**: بەشمشێر هەڵی کوتایە سەر ◊ **كَلَّلَ فلاناً**: تاجی خستە سەر سەری فلانکەس ◊ **كَلَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەگەوهەرو شتی وا ڕازاندەوە ◊ **إِنْكَلَّ الغَمامُ بالبرق**: هەورەکە بروسکەی دا ◊ **إنْكَلَّ السيف**: شمشێرەکە تیژایی نەما ◊ **إنْكَلَّ فلان**: فلانکەس پێکەنی‌و زەردەخەنەی هاتێ ◊ **إنْكَلَّ البرقُ**: بروسکەی هەورەکە هێواش بوو ◊ **تَكَلَّلَ الشَّيْءَ بالشيء**: شتەکە بەدەوری شتەکە خەرمانەی دا ◊ **الإكْلِيلُ**: تاج ◊ شتێکە دەورەی سەر دەداو بەگەوهەرو شتی وا دەڕازێندرێتەوە ◊ دەوران دەوری نینۆک ◊ کۆمەڵێك گوڵی ڕەنگاوڕەنگ لەسەر شێوەی تاج ڕێك دەخرێن‌و دەخرێنە سەر سەر بۆ جوانی‌و ڕازاندنەوە ◊ **إكليل الجبل**: ڕوەکێکی گیاییە ◊ **الكلالَةُ**: ئەوەیە مرۆڤێك بمرێ نەباوکی لەدوا جێ مابێ نە منداڵ.

**كُلّ**: هەموو ◊ **الكَلّ**: کەسێك نەباوکی لەژیان دا مابێ نەمنداڵی هەبێ ◊ **الكليلُ**: زەعیفو ماندوبوو ◊ **المُكَلَّلُ**: (غمامٌ مُكَلَّلٌ) هەورێکی باراناوی کەچەند هەورێکی تر بەدەوریەوە بن ◊ **المكلَّلَةُ**: (روضة مُكَلَّلَة) باخێکە دەورە دراوە بە گوڵو غونچە ◊ **كَلَمَهُ كَلْماً**: بریندارى کرد ◊ **كالَمَهُ**: قسەی لەگەڵ دا کرد.

**كَلَّمَهُ**: ئاخاوتنی ئاراستە کرد ◊ **تَكَلَّمَ**: قسەی کرد ◊ **التَّكْلامُ والتِّكْلامَةُ**: قسەی بەنرخ‌و چاك‌و زۆر ◊ **الكلام**: دەنگێکی مانا بەخش‌و موفید ◊ **الكَلْمُ**: برین ◊ **الكَلِمَةُ**: وشە، کە مانایەکی تاك بگەیەنێ ◊ **الكَليمُ**: ئەو کەسەی قسەت لەگەل بکا ◊ نازناوێکی حەزرەتی موسایە سەلامی خودای لێ بێ ◊ **الكِلِيمُ**: لباد؛ ڕاخەرێکی ئەستوورە لە خوری دروست دەکرێ ◊ **المُتَكَلَّمُ**: شوێنی قسە لەسەر کردن ◊ **كَلاهُ كَلْياً**: گورچیلەی توشی ئازار بوو.

**كَلِيَ** كلىً: گورچیلەی تووشی ئازار بوو ◊ **إكْتلى الرجلُ**: پیاوەکە گورچیلەی هێشا ◊ **الكُلْيَةُ**: گورچیلە.

**كُلى** الطائر: چوار پەڕن بە تەنیشتی باڵندەوە کەوتونەتە کۆتایی باڵەکانی.

**كَلاَّ**: نەخێر وانیە ئیشەکە بەشێوەیەکی ترە.

**كَمْ**: چەند؟ یان زۆر.

**كَما القومَ كَمْناً**: قاچکی دەرخواردی خەڵکەکە دا.

**كَمِيَ كَمْناً**: پێ خاوس بوو ◊ **كَمِئَتْ يده ورِجلُهُ من البرد**: دەست‌و قاچی بەسەرماو بەفر قەڵشان.

**كَمِئَ** عن الأخبار: لەهەواڵەکە بێ ئاگا بوو ◊ **اكْمَأ المكانُ**: شوێنەکە قارچکی زۆر بوو کارگاویی بوو ◊ **اكْمَأ القومَ**: کارگی دەرخواردی خەڵکەکە دا ◊ **اكْمَأتِ السنُّ فلاناً**: ڕۆژگار فلانی پیر کرد ◊ **تَكَمَّأت عليه الأرضُ**: زەوی دایپۆشی ◊ **الكَمْءُ**: قاچك، کارگ، جۆرە فیتریاتێکە لەزەوی دەدرێ پاك دەکرێ‌و دەکوڵێندرێ‌و دەخورێ ◊ **الكَمّاءُ**:

قاچك فرۆش ◊ قاچك چن ◊ **الْمَكْمَأُ**: شوێنێك كارگى زۆر بێ ◊ **الكُمْبيالَةُ**: كومپياله (قەواڵە) ◊ **كَمَتَ الفَرَسُ**: ئەسپەكە ڕەنگى شێ بوو ◊ **اكمت الفرسُ**: ئەسپەكە ڕەنگى شێ بوو ◊ **كَمَّتَ الثَّوبَ**: قوماشەكەى بەڕەنگى سوورى مەيلەو ڕەش ڕەنگ كرد.

**إكْمَتَّ الفَرَسُ**: بەمانا (أكمت) دێ ◊ **الكُمْتَةُ**: ڕەنگى ڕەش ڕەنگى سووری تێكەڵاو بووبێ ◊ **الكُمَيتُ**: ئەسپێكە ڕەنگى لەنێوان ڕەش و سوردايە ◊ **كَمْثَرَ**: بەشێوەی شەقاو هاويشتنى كورت ڕۆيشت ◊ **كَمْثَرَ الشيءَ**: شتەكەى پڕكرد ◊ **كَمْثَرَ القِرْبَةَ**: دەمى كوندەكەى بەبەنەكە بەست ◊ **الكُمَّثْرى**: درەختێكى بەردارو گوڵداره

**كَمَحَ الدَّابَّةَ باللجام كَمْحاً**: جڵەوكێشى وڵاخەكەى كرد ◊ **اكْمَحَ الكَرْمُ**: دارمێوەكە پۆخى كرد ◊ **اكْمَحَ الدَّابَّةَ**: جڵەوكێشى وڵاخەكەى كرد ◊ **اُكْمِحَ فلان**: فلانكەس بەهۆى تەردەماخييەوه سەرى بەرزكردەوه ◊ **الكامِحُ**: ئەو كەسەى ئەسپ و وڵاخە بەرزە ڕام دەكا ◊ **الكَوْمَحُ**: كەسێكە ددانى دەمى پڕ دەكەن، بەجۆرێك ناتوانێ لەسەر خۆ قسە بكاو بدوێ.

**كَمَخَ بانفه**: لوتبەرزى نواند، فيزى كرد.

**كَمَخَ الفَرَسَ باللجام**: جڵەوكێشى ئەسپەكەى كرد ◊ **اكْمَخَ الرجلُ**: پياوەكە لوتبەرزى نواند ◊ **اكْمَخَ الكرمُ**: دارمێوەكە پۆخى كردو خەريكە گەڵا بكا.

**الكامَخُ**: پێخۆر، يان ترشو زەڵاتەو شتى وا كە ئيشتيهاى خواردن دەكەنەوه.

**كَمَدَ لونه**: ڕەنگى گۆڕاو ڕەونەقى نەما.

**كَمَدَ القَصَّارُ الثوبَ كَمداً وكموداً**: جل شۆرەكە كراسەكەى بەكوتكى جل شۆرين كوتا.

**كَمَدَ فلاناً**: پەڕۆى گەرمى لەسەر شوێنى هاوساوى فلانكەس دانا

**كَمِدَ الشَّيئُ كَمَداً**: شتەكە ڕەنگى گۆڕا.

**كَمِدَ الرجلُ**: پياوەكە خەم و خەفەتى خۆى شاردەوه ◊ **اكْمَدَ العُضْوَ**: ئەندامى جەستەى بەپەڕۆى گەرمكراو داخ كرد ◊ **الكِمادُ والكِمادَةُ**: پەڕۆيەكە گەرم دەكرێ و لەسەر شوێنى هاوساو دادەنرێ ◊ **الكُمْدَةُ**: گۆڕانى ڕەنگ و نەمانى ڕەونەقى ◊ **الكِمْرُ من البسر**: خورمايەكە بەدارەكەيەوە شيرين نەبوبێ بەڵكوو كەوتبێتە خوارەوەو لەسەر گڵ شيرين بووبێ.

**كَمَزَ الشَّيئَ**: شتەكەى لەناو دەستى دا خڕهەڵدا ◊ **الكُمْزَةُ**: هەرشتێك بەسەرى پەنجە هەڵبگيرێ ◊ پارچە خورماى پێكەوە نووساو، گرمۆڵە كراو.

**كَمِسَ**: گرژ بوو.

**كَمَشَ الزاد**: تێشوەكە تەواو بوو.

**كَمَشَ فلاناً بالسيف**: ئەندامى فلانكەسى بەشمشێر بڕين.

**كَمِشَ في امره**: لەكردنى كارەكەيدا پەلەى كرد

**كَمُشَ في السير**: لە ڕۆيشتن دا پەلەى كرد.

**كَمُشَ الرجلُ**: پياوەكە ئازاو چاونەترس بوو ◊ **كَمُشَت المرأةُ**: ئافرەتەكە مەمكى بچوك بوون ◊ **اكْمَشَ في السير**: لە ڕۆيشتن دا پەلەى كرد ◊ **كَمَّشَ فلاناً**: پەلەى لەفلانكەس كرد ◊ **كَمَّشَ ذَيْلَهُ**: داوێنى هەڵكردن ◊ **إنْكَمَشَ الفَرَسُ في سَيْرِه**: ئەسپەكە لە ڕۆيشتن دا پەلەى كرد ◊ **إنْكَمَشَ الجلدُ**: پێستەكەى گرژ بوو وێكهاتەوه

○ **تَكَمَّشَ**: بەمانا (إنكَمَشَ) دێ ○ **الأكْمَشُ**: کەسێك چاوی نەبینێ ○ قاچ کورت ○ **الإنكِماش**: کەمبوونی پارە لەناو بازاڕدا ○ **الكَمْشُ**: گوانی بچوك و کورت ○ **الكَمْشَةُ من الإناث**: مێینەی گوان بچوك ○ **الكَمّاشَةُ**: گاز کە بزمارو شتی وای پێ دەردەهێندرێ ○ **الكميشُ (رجل كميش الإزار)**: پیاوێکی داوێن هەڵکراو

**كَمَعَ في الإناء كَمْعاً**: دەمی خستە ناو قاپە ئاوەکە

**كَمَعَ الرجلُ في الماء**: پیاوەکە چووە ناو ئاوەکە ○ **كَمَعَتْ الدابَّةُ**: وڵاخەکە بەهێواشی و لاوازیی ڕۆیی.

**كَمَعَ قوائمَ الدابة**: قاچی وڵاخەکەی بڕیەوە ○ **كامَعَ المرأةَ**: ئافرەتەکەی خستە لای خۆی و پاراستی ○ **الكِمْعُ**: ڕاکشاوو پاڵکەوتوو ○ **الكمِعُ**: پیاوی بێ هەڵوێست ○ **الكميعُ**: ڕاکشاوو پاڵکەوتوو ○ **المُكامِعُ**: کەسێك زۆر لێت نزیك بێ ○ **كَمْكَمَ الشَّيْءَ**: شتەکەی شاردەوە ○ **تَكَمْكَمَ في ثيابه**: بەپۆشاکی خۆی خۆی داپۆشی ○ **الكَمْكامُ**: پیاوی کورتەباڵای تێکسمڕاو.

**كَمَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی تەواو کرد ○ **إكْتَمَلَ الشَّيْءُ**: شتەکە تەواو بوو ○ **تكامَلَ الشَّيْءُ**: وردە وردە شتەکە تەواو بوو ○ **إستَكْمَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی تەواو کرد ○ **التكامُلُ في الأقتصاد**: بریتییە لە کۆبوونەوەی چەند جۆرە بوارێکی ئابوری لە وڵاتێك دا و تەواوکەرو هاریکاری یەکتر بن بۆ مەبەستی سەرەکی ئەو وڵاتە ○ **التَّكْمِلَةُ**: تەواوکەری شتی تر ○ **الكامِلُ من الرجال**: کەسێکە ڕەوشتی بەرزی تێدابن ○ **المِكْمَلُ**: پیاوێك ڕەوشتی خێر یان هی شەڕی زۆر تێدابن.

**كَمَّ الناسُ**: خەڵکەکە کۆبونەوە.

**كَمَّ الشَّيْءُ**: شتەکەی داپۆشی پەردەی پێدا دا.

**كَمَّ الدنَّ**: سەری کوپەکەی بەست، گرتی.

**كَمَّ الشهادَةَ**: شایەتییەکەی شاردەوە.

**كَمَّ البَعيرَ**: دەمی حوشترەکەی بەست ○ **اكَمَّت النخلةُ**: دارخورماکە پۆخی کردو خەریکە بەرسیلەی دەربکەوێ ○ **اكَمَّ قَميصَهُ**: دوو قۆڵی بۆ قوماشەکە دروست کرد ○ **كَمَّمَ النَّخلَةُ**: بەمانا (أكَمَّت) دێ ○ **كَمَّمَ الشَّيْءَ**: شتەکەی داپۆشی، زارکی بەست ○ **كَمَّمَ النخلةَ**: خورماکەی داپۆشی بۆئەوەی پێ بگاو شیرین بێ ○ **كَمَّمَ الدَّن**: کوپەکەی داپۆشی، زارکی هاختنی ○ **كَمَّمَ فَمَ الحيوان**: دەمبێنی کردە دەمی ئاژەڵەکە ○ **كَمَّمَ القميصَ**: قۆڵو فەقیانەی بۆ کراسەکە دروست کرد ○ **تكَمَّمَ بثيابه**: بەپۆشاکەکەی خۆی داپۆشی ○ **الكِمامُ**: ئەو شتەیە دەکرێتە دەمی حوشتر وەکوو لغاو و دەمبێن ○ **الكِمامَةُ**: بەمانا (الكِمامُ) دێ ○ پۆخی هێشوە خورما ○ پەردەی غونچە ○ ئەو مێش ڕەتێنەی دەکرێتە سەروی لوتی گوێدرێژو حوشتر بۆئەوەی مێش و مەگەز نەتوانن ئازاریان بدەن ○ **الكُمُّ**: قۆڵی کراس و کەواو پاڵتۆ ○ **الكِمُّ**: چرۆو تەرزەی داری بەردار ○ **الكُمَّةُ**: هەرشتێك شتێکی تر داپۆشێ **الكَمِّيَةُ**: چەندییەت ○ **المِكَمُّ**: ماڵماڵو شتی وا کە دوای کێڵان زەوی پێ تەخت دەکرێ.

**كَمَنَ في المكان**: لەشوێنەکەدا خۆی حەشاردا.

**كَمَنَ لە**: لەحەشارگەیەك دا خۆی حەشار دا کەکەس پێی نەزانێ ○ **كَمِنَتْ عَيْنُهُ كَمْنَةً**: چاوی بەهۆی نەخۆشییەوە تاریك بوو ○

**اكْتَمَنَ**: خۆی شاردەوە ◊ **الكَمُون**: ڕوەكێكی كشتوكاڵیو ساڵانەیە تۆومكەی دەكرێ بەداو و دەرمانی كێشت ◊ **الكُمْنَةُ**: تاریكییەكە بەسەر چاودا دێ ◊ **الكَمِينُ**: كۆمەڵێك لە شەڕكەرو پێشمەرگە خۆ حەشار دەدەن بەهیوای ئەوەی فرسەت لە دوژمن بێنن ◊ **المَكْمَنُ**: حەشارگە كە خۆی تێدا حەشار بدەی ◊ **الكَمَنْجَةُ**: كەمانچە.

**كَمِهَ النهارُ كَمَهاً**: ڕۆژێكی تەمو تۆزاویی بوو ◊ **كَمِهَتِ الشمسُ**: خۆر بەری گیرا تەمو تۆز بەری گرتو دیار نەما.

**كَمِهَ الرجلُ**: پیاوەكە كوێر بوو شەو كوێر بوو.

**كَمِهَ**: عەقڵی نەما ◊ ڕەنگی گۆڕا ◊ سەرسام بوو ◊ ڕاڕا بوو ◊ **تَكَمَّهَ فِي الأرض**: بەناو زەوی دا وێڵو سەرگەردان بوو ◊ **الكامِهُ**: كەسێك سەری هەڵگرێو بێ مەبەست بكەوێتە گەڕان ◊ **الكَمَهُ**: كوێری زكماك ◊ **المُكَمَّهُ**: كەسێك چاوی پێكەوە نووسابنو نەكرێنەوە ◊ **إكْمَهَدَّ الرَّجُلُ**: پیاوەكە بەهۆی پیریو كەنەفتییەوە لەرزی ◊ **إكْمَهَدَّ الفرخُ**: بێچووەكە شێوە لەرزینو شەپلەیەكی تووش بوو ◊ **كَمْهَلَ**: جلو پێداویستی خۆی پێچایەوە و خۆی ئامادە كرد بۆ سەفەر ◊ **كَمْهَلَ علینا**: مافی خۆمانی لێ زەوت كردین ◊ **كَمْهَلَ الحدیثَ**: قسەكەی شاردەوە ◊ **المُكَمْهَلُ**: لۆكە لەو كاتەدا تۆومكەی تێدایە.

**كَمَى إليه كَمْياً**: لێی چووە پێش.

**كَمَى نَفْسَهُ**: بەزرێ خۆی پاراست زرێی لەبەر كردو كڵاو حوزەی خستە سەر سەری.

**كَمَى الشهادَةَ**: شایەتیەكەی خۆی شاردەوە.

**كَمَى فلاناً ما في ضميره**: ئەوەی لەدڵی دا بوو ئاشكرای نەكرد ◊ **اكْمَى فلانٌ**: پاڵەوانی سوپای كوشت ◊ **اكْمَى مَنْزِلَهُ**: ماڵو مەنزڵی خۆی لەخەڵكی شاردەوە.

**اكْمَى الشهادةَ**: شایەتی شاردەوە ◊ **اكْمَى على الأمر**: سوربوو لەسەر كارەكە ◊ **إكْتَمَى**: خۆی شاردەوە ◊ **إنْكَمَى**: خۆی شاردەوە ◊ **تَكَمَّى في سلاحه**: بەچەكو زرێ خۆی پۆشی ◊ **تَكَمَّى الشَّيْئَ**: شتەكەی داپۆشی ◊ **تَكَمَّى الفِتَنُ القَوْمَ**: فیتنەو ئاشوب هەموو خەڵكەكەی داگرت ◊ **تَكَمَّى قِرْنَهُ**: چوو بەرەو ڕوی ڕكابەرەكەی ◊ **تَكَمَّى البطلُ القومَ**: پاڵەوانەكە زرێپۆشی ئەوانی كوشت ◊ **الكَمِيُّ**: چەك پۆش چەك لەخۆبەست ◊ پیاوی ئازاو چاو نەترس.

**كَنَبَ فلان كنوباً**: دوای هەژاری دەوڵەمەند بوو.

**كَنَبَ الشَّيْئَ**: شتەكە پتەو بوو.

**كَنَبَ الشَّيْئَ في جرابه**: شتەكەی كۆكردەوەو خستیە هەمبانەكەیەوە ◊ **كَنَبَتْ يده من العمل كَنْباً**: دەستی پتەو و زبر بوو ◊ **اكْنَبَ الشَّيْئُ**: شتەكە پتەو بوو ◊ **اكْنَبَ عليه بطنُهُ**: گەدەی توندبوو ◊ **اكْنَبَ عليه لسانه**: زمانی گیرا ◊ **الكانِبُ**: كەسێك تێرو پڕ بێ ◊ **الكِناب**: لقە دارخورما ◊ **الكَنْبَةُ**: سەكۆیەكە، قەنەفەیەكە دۆشەكو شتی وای لەسەر ڕادەخرێو جێگای زیاد لەنەفەرێك دەبێتەوە.

**الكَنِيبُ**: داری وشك یان ئەو وشكەڵو چقڵو چاڵەی لەدرەخت دەكەوێتە خوار ◊ **الكِنْبارُ**: حەبلی دروستكراو لەتوێكڵی دار نەرجیل ◊ **الكِنْبَرَةُ**: نەرمایی لوتی گەورە.

**كَنَتَ فلان في خلقه**: فلانكەس لەجەستەو قەبارەدا زەلامو كەتەبوو.

**كَنَتَ** السقاءُ كَنْتاً: مەشكەكە یان تەنكییەكە چڵكی ماستو شتی وای پێوە بوو پێیەوە ڕەق بوو بۆنی كرد ◊ **إكتَنَتَ الرَّجلُ**: پیاوەكە ملكەچ بوو ◊ **الكُنْتِيُّ**: بەهێزو بەتوانا ◊ پیاوی پیرو بەساڵاچوو ◊ **الكَنْتِيْنُ**: شوێنێكە شەرابو خۆراكی تێدا دەفرۆشرێ

[illegible] الشَّيئَ: شتەكەی بڕیەوە.

**كَنَدَ** النِّعْمةَ: بڕوای بەنازو نیعمەتە جۆراو جۆرەكانی خودا نەبوو ◊ **الكِنْدَةُ**: پارچەیەك لەكێو ◊ **الكنود**: سپڵەو پێنەزان بەرامبەر نیعمەتەكانی خودا ◊ **الكَنَادِرُ من الرجال**: پیاوی كولەبنەو خەپەتۆڵە ◊ كەرەكێوی بەهێزو قەڵەو و بەخۆوە ◊ **الكِنْدارَةُ**: جۆرە ماسییەكە دوگی هەیە ◊ **الكُنْدُرُ**: بەمانا (الكَنادِرُ) دێ ◊ **الكُنْدورَةُ**: زەوی ڕەقو پتەو و بەرزەوەبوو ◊ هێلانەی بازو هەڵۆ كەلەدارو چیلكە دروست دەكرێ.

**كَنَرَ** فلان: فلانكەس كەتەو ناقۆڵابوو.

**الكُنَّارُ**: درەختی سیدر؛ درەختی نەبگ ◊ **الكَنَّاريّ**: كەناری؛ جۆرە چۆلەكەیەكە ◊ **الكِنَّارَةُ**: عود یان دەفو تەپڵ.

**كَنَزَ** المالَ: ماڵو پارەوپولەكەی ژێر خاك كرد.

**كَنَزَ** الشَّيئَ: شتەكەی پێچایەوە

**كَنَزَ** الإناءَ: قاپەكەی پڕكرد ◊ **إكْتَنَزَ الشَّيئُ**: شتەكە كۆبۆوە ◊ **إكْتَنَزَ المالَ**: ماڵەكەی پەزمەندە كرد ◊ **تَكَنَّزَ اللَّحمُ**: گۆشتی كۆبۆوەو پتەو بوو ◊ **الكَنازُ**: كاتی خورما هەڵگرتنو كەبسكردنی ◊ **الكِنازُ**: كۆبوونەوەی گۆشتو قەڵەو بوون ◊ **الكَنْزُ**: ماڵو سامانی شاردراوە لەژێر گڵ دا.

**كَنَسَ** الظَبْيُ كَنْساً: ئاسكەكە چووە كۆزو لانەی خۆیەوە ◊ **كَنَسَت النجومُ كنوساً**: ئەستێرەكان بەردەوامبون لەگەڕانو سوڕانەوەی خۆیان.

**كَنَسَ** المكانَ: شوێنەكەیماڵی.

**كَنَسَ** في وجه فلان: گاڵتەی بەفلانكەس كرد ◊ **إكْتَنَسَ الظبيُ**: ئاسكەكە چووە كۆزو لانەی خۆیەوە ◊ **تَكَنَّسَ الرجلُ**: پیاوەكە خۆی شاردەوە ◊ **تَكَنَّسَت المرأةُ**: ئافرەتەكە چووە كەژاوەوە ◊ **تَكَنَّسَ الظبيُ**: ئاسكەكە چووە كۆزەوە.

الكِناسُ: شوێنی چونە ناو درەخت كە ئاسك خۆی تێدا حەشار دەداو دەیكاتە كۆزو لانەی خۆی ◊ **الكُنَاسَةُ**: شوێنی فڕێدانی پیسی ◊ **الكَنَّاسُ**: كەسێك پیشەی شوێن ماڵینو شەقامو كۆڵان پاككردنەوە بێ ◊ **الَكنيسُ**: پەرستگای جولەكە ◊ **الكَنيسةُ**: كەنیشتە، عیبادەتگای جولەكەو گاور ◊ جۆرە كەژاوەیەكە ◊ **المَكْنَسُ**: مۆڵگەو كۆزو لانەی حەیوانە كێویو ئاسكو گاكێوی لەكاتی گەرما ◊ **المِكْنَسَةُ**: گەسكە؛ ئامێری شت ماڵین.

**كَنَشَ** الكِساءَ: قەراخو بێجاخی قوماشەكەی هەڵپێچان.

**كَنَشَ** السِّواك الخَشِنَ: سەری سیواكە زبرەكەی نەرم كرد ◊ **الكِنْشاءُ**: پیاوی موگرژی ڕوخسار ناشیرین ◊ **الكُنَّاشَةُ**: بنكی شتێك كە لقو پۆپی لێ ببنەوە ◊ كۆمەڵە پەڕەكاغەز كە پێكەوە دەبەسترێنو وردە زانیاری جیاجیایان تێدا تۆمار دەكرێ ◊ **كَنَظَهُ الأمرُ**: كارەكە ناڕەحەتی كرد تا گەیاندیە گیانەڵاو ◊ **الكُنْظَةُ**: تەنگەبەری.

**كَنَعَ** الشَّيئَ: شتەكە وێكهاتەوە چرچو لۆچ بوو.

**كَنَعَ العُقابُ**: دالاشەكە بالى شوش كردن بۆ پەلاماردانو پردانى نێچیر.
**كَنَعَ النجمُ**: ئەستێرەكە مەیلی ئاوابوونی كرد.
**كَنَعَ الأمرُ**: كارەكە نزیك بوو.
**كَنَعَ فلان**: فلانكەس سەری شۆڕكرد.
**كَنَعَ عن الأمر**: لەكارەكە ترساو لێی ڕاكرد.
**كَنَعَ عن الطريق**: لە ڕێگاكە لای دا.
**كَنَعَ في الشَّيئِ**: تەماعی كردە شتەكە.
**كَنَعَ المِسكُ بالثوب**: میسكەكە بە قوماشەكەوە نووسا یان لەسەری كۆبۆوە.
**كَنِعَ الشَّيئُ**: شتەكە پێوەی نووساو دەوامی كرد.
**كَنِعَ فلان**: بەرەو دەم بەسەر چەناگەی دا كەوت ◊ **اكْنَعَت العُقابُ**: دالاشەكە بالى شوشكردن بۆ پەلاماردانو پردانى نێچیر ◊ **اكنَعَ فلان**: فلانكەس بۆ شتەكە زۆر خۆی زەلیلو داماو كردو ملكەچی نواند ◊ یان سوالى شتەكەی كرد ◊ **اكْنَعَ الإبلَ إليه**: حوشترەكانى لەخۆی نزیك كردنەوە ◊ **اكْنَعَ اصابِعَهُ او يَدَهُ**: لەپەنجەی دا یان لەدەستى دا ◊ **كَنَّعَ عن الشَّيئِ**: لەشتەكە لای دا ◊ **كَنَّعَ اصابعه او يده**: بەمانا (أكنعها) دێ ◊ **كَنَّعَ فلاناً**: لەسەری فلانكەسی دا.
كَنَّعَ فلاناً بالسيف: بە شمشێر لە فلانكەسی دا تامەچەكی خوار بوون ◊ **إكْتَنَعَ القومُ**: خەلكەكە گردبوونەوە ◊ **إكْتَنَعَ الليلُ**: شەو نزیك بۆوە ◊ **إكْتَنَعَ عليه**: بەزمیی پێدا هاتەوە ◊ **تَكَنَّعَ فلان**: فلانكەس خۆی قایم كرد چووە ناو قەلاو شوراو دژەوە ◊ **تَكَنَّعَت يداه ورجلاه**: دەستو قاچی بەهۆی برینو شتی واوە گرژ بوون و وشك هەلاتن ◊ **تَكَنَّعَ مني**: لێم نزیك بۆوە ◊ **تَكَنَّعَ به**: خۆی پێوە هەلواسی ◊ **تَكَنَّعَ الأسيرُ**: دیلەكە خۆی گرمۆلە كردو خۆی وێكهێنایەوە ◊ **الأكْنَعُ**: كەسێك هەردوو دەستی براین ◊ **الكانِعُ**: كەسێك خۆی ملكەچو زەلیل بكاو ڕێزی خۆی نەگرێ ◊ **الكَنِعُ**: ئەو ئاوەی لەدامێنی كێو لە گۆماودا بمێنێتەوە ◊ **الكنيع**: كەسێك لە ڕێبازێكەوە لابدا بۆ ڕێبازێكی تر ◊ دەست شكاو ◊ **المكنوع**: دەست قرتاو، دوودەست براو.

**كَنَفَ الكيَّالُ**: پێوەرەكە دەستی بەسەر ئامێری پێوانەكە دا گرت بۆئەوەی شتە پێوراوەكە نەكەوێتە خوار.
**كَنَفَ القومُ**: خەلكەكە مالو سامانی خۆیان شاردەوەو هەلیان گرت لەترسی قاتو قڕی.
**كَنَفَ عن الشَّيئِ**: لەشتەكە لای دا ◊ (فهو كانف)
كَنَفَه عنه: لێی گرتەوە، لێی قەدەغە كرد.
**كَنَفَ الشَّيئَ**: شتەكەی پاراستو پارێزگاریی كرد.
**كَنَفَ فلان وبفلان**: فلانكەسی لە خۆگرتو كردی بەیەكێك لەمالو مندالى خۆی.
**كَنَفَ يَدَهُ**: دەستی خۆی كردە لوێچ
**كَنَفَ الكنيفَ**: كۆختەو حەشارگەی دروست كرد.
**كَنَفَ الدارَ**: ئاودەستی بۆ خانووەكە دروست كرد.
**كَنَفَ الإبلَ والغَنَمَ**: تەویلەو گەورو ئاغەلى بۆ حوشترو مەڕو بزنەكان دروست كرد
**كَنَفَ لإبله**: ئاغەلى بۆ حوشترەكان دروست كرد ◊ **اكْنَفَ الشَّيئَ**: شتەكەی پاراست ◊ **اكْنَفَ فلاناً**: یارمەتی فلانكەسی دا ◊ **اكْنَفَه الصَّيْدَ والطَّيْرَ**: یارمەتی فلانی دا بۆ نێچیر كردنی نێچیر ◊ **كانَفَهُ**: یارمەتی دا ◊ **كَنَّفَ الشَّيئَ**: دەوران دەوری شتەكەی دا ◊ **تَكَنَّفَهُ**: بەمانا (إكْتَنَفَهُ) دێ.

**الكانِفَة**: پەردەو پەناگەو حەشارگە ٥ **الكُنَافَةُ**: جۆرە حەڵوایەکە لەهەویری گەنم دروست دەکرێ ٥ **الكَنَفُ**: پەنا شت ٥ سێبەر ٥ **كَنَفَا الرَّجُل**: باوەش‌و كۆشی پیاو چ لە ڕاستەوە چ لەچەپەوە.

**كَنَفَ الطائر**: باڵی باڵندە ٥ **الكِنْفُ**: هەر كیفو پەردەیەك پارێزگاری شتی تر بكا.

**كِنْف الراعي والصانع والتاجر**: ئەو مەخزەن‌و گەنجینەی پیشەوەرو بازرگان شتی خۆیانی تێدا هەڵدەگرن ٥ **الكَنَفَاني**: حەڵواچی ٥ **الكَنُوفُ**: حوشتر كە خۆ بخاتە ناو حوشتری ترەوە لەسەرما ٥ حوشترێك لە حوشتری تر كەنارگیر ببێ‌و بەتەنیا لە ئاغەڵی خۆی دا پاڵ بكەوێ ٥ مەڕو بزنی تار بوو لەڕانە مەڕ ٥ **الكنيف**: پەردە ٥ مەتاڵ‌و دیوجامە ٥ **المُكَنَّفُ**: (رجل مُكَنَّف اللحية) پیاوێكی ڕیش پان‌و زلە ٥ **كَنْفَشَ**: كابرا لەماڵی خۆی دانیشت لە ڕۆژانی شەڕو هەراو فیتنەو ئاشوب دا ٥ لاشەویلەی هاوسا ٥ **كَنْكَنَ فلان**: فلانكەس هەلاَت ٥ تەمبەڵ‌و تەوەزەل بوو لەماڵی خۆی دانیشت ٥ **الكُنْكانُ**: كۆنكەن، جۆرە یارییەكی كاغەزە.

**كَنَّ الشَّيْئُ**: خۆی حەشاردا.

**كَنَّ الشَّيْئَ**: شتەكەی پەردەپۆش كرد ٥ **كَنَّنَ الشَّيْئَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (كَنَّ) دا دێ ٥ **إكْتَنَّ الشَّيْئُ**: شتەكەی خۆی حەشاردا ٥ خۆی داپۆشی ٥ چووە پەردەوە ٥ **إكْتَنَّ الشَّيْئَ**: شتەكەی پەردەپۆش كرد ٥ **إسْتَكَنَّ**: شتەكەی خۆی داپۆشی، چووە پەردەوە خۆی حەشاردا ٥ **الكانُون**: ئاگردان ٥ پیاوی كەتەو ڕەزاگران‌و ورگ زل ٥ **كانُون الأول**: مانگی دیسەمبەرە ٥ (مانگی دوانزە) ٥ **كانُون الثاني**: مانگی یەنایەرە ٥ (مانگی یەك) ٥ **الكِنان**: پەردە ٥ هەرشتێك شتێكی تر داپۆشێ‌و پارێزگاریی بكا ٥ **الكِنانَةُ**: تورەكە چەرمێكە تیری تێدا هەڵدەگیرێ ٥ (تیردان) ٥ **الكِنُّ**: بەمانا (الكِنان) دێ ٥ هەرشتێك گەرماو سەرما لەخانو و خێمەو كەپرو سابات بگێڕێتەوە ٥ **الكَنَّةُ**: كەنی؛ ژنی كوڕ یان ژنی برا **الكُنَّةُ**: سوێبان، دیكۆر كەلە دیواری خانو دەردەچێ ٥ **الكَنينة**: ژنی پیاو ٥ **المُسْتَكَنَّةُ**: ڕق‌و كینە ٥ **المَكْنُون**: شاردراوەو پارێزراو

**كَنَهَ الأمْرَ كَنْهاً**: ڕاستی شتەكەی زانی ٥ حەقیقەتی كارەكەی بۆ دەركەوت ٥ **اكنَهَ الأمْرَ**: بەمانا (كَنَهَهُ) دێ ٥ **إكْتَنَهَ الأمْرَ**: بەمانا (كَنَهَهُ) دێ.

**الكُنْهُ**: كرۆك‌و جەوهەری شت ٥ **الكَنَهْوَرُ من السحاب**: هەوری گەورەی وەكوو كێو ٥ یان هەوری سپی گەورە ٥ **كَنهف**: بڕوانە (كَهَفَ) ٥ **كَنَّى عن كذا كناية**: بەكنایەو دركە لەو شتە دوا ٥ **اكْنَاهُ وكَنَّاهُ بكذا**: بەشێوەی كونیە ناوی هێنا، بانگی كرد ٥ **إكْتَنَى بكذا**: بەو ناوە ناوی نا ٥ **تَكَنَّى فلان**: فلانكەس لەكاتی شەڕدا كونیەو ناو و عینوانی خۆی ئاشكرا كرد بۆئەوەی بناسرێ ٥ **تَكَنَّى**: خۆی داپۆشی، خۆی حەشاردا ٥ **تَكَنَّى بكذا**: بەو ناوە ناوی نا ٥ **الكناية**: لە بواری زانستی بەیان دا بریتییە لە گوتنی وشەو ڕستەیەك دیاردەو تایبەتمەندی شتێكت مەبەست بێ بشتوانی مانای ئەصلیش بەرچاو بگرێ لەم ڕووەوە قەرینەیەك نەبێ مانیع بێ لەوە ٥ بۆنمونە بڵێی: **امة الدولار**: مەبەستت ئەمریكا بێ ٥ **الناطقين بالضاد**:

دەرزییەکە کونەکەی گیرا ٥ التَحَصَ فلاناً الی الأمر: فلانکەسی ناچار کرد بۆ کارەکە ٥ التَحَصَ فلاناً عن کذا: فلانکەسی لە فلان شت پشت سارد کردەوە ٥ التَحَصَ الشَّئُ فلاناً: شتەکە بەفلانکەس دا چوو، شتەکە چووە ناو جەستەیەوە ٥ إلتَحَصَ البیضةَ ونحوها: ئەوەی ناو هێلکەکەی هەلقوڕاند ٥ لَحَاص: ناخۆشیو بەلاو کارەسات ٥ ساڵی قاتو قڕی.

المَلحَص: پەناگاو شوێنی تێداحەوانەوە.

لَحَظَ المکانَ لَحظاً: شوێنەکەی ماڵیو بەناورشاندیو پاکی کردەوە ٥ التَحَظَ: رقی هەڵسا ٥ لَحَظَهُ بالعین والیه: بەتیلەی چاو سەیری کرد ٥ لاحَظَه: چاودێری کردو سەرنجی لێ دا ٥ لاحظَ علیه کذا: رەخنەی لێ گرت ٥ تلاحَظا: هەریەکە لەودوانە تێبینیان لەسەر یەکتر هەبوو ٥ اللِحاظ: قولینچکی چاو، تیلەی چاو ٥ اللَحظَةُ: چاوتروکاندنێك ٥ الملاحَظَةُ: سەرنجدانی شت بە تیلەی چاو ٥ سەرنجو ڕاوبۆچوون لەسەر شت ٥ المَلحَظ: بەمانا (اللَحظ)دێ ٥ الملحوظة: وشەیەکە دادەنرێ لەپەراوێزی قەراخی نوسراوی سەرکتێب بەمەبەستی ئاگادار کردنەوەی نووسەر لەهەڵەو کەمو کوڕییەکانی.

لَحَفَ القمرُ: مانگ چووە حاڵەتی مەحاقەوە ٥ نالی دەڵێ:

لەدەوری تۆیە ئەمی خورشیدی پرتەو بەخشی سەوکەردان
کە نالی وا لە حاڵەتی مەحاقی ماهی نەو دایە

لَحَفَ فلاناً: فلانکەسی بەلیفە داپۆشی.

لَحَفَ فلاناً الثوبَ: کراسی لەبەر فلانکەس کرد.

لَحَفَ النار الحَطَبَ: داری خستنە سەر ئاگرەکە.

لَحَفَ اللحمَ عن الحیوان: حەیوانەکەی گرو، گۆشتەکەی دەرخست.

لَحَفَ فلاناً بجُمعِ کفه: بەهەموو دەستی لەفلانکەسی دا، مستەکوڵەی پێ کێشا.

لَحَفَ فلاناً سهماً وبه: تیری لەفلانکەس دا تیری پێوەناو هەنگاوتی ٥ اللَحظَةُ: چاوتروکاندنێك.

لَحَفَ اللحافَ: لێفەی دروست کرد ٥ لێفەی درو ٥ ألحَفَ السائلُ: سوالکەرەکە ئیلحاحی کرد بۆ شت وەرگرتن یان سواڵی کردو پێویستیشی پێی نەبوو چونکە دەوڵەمەند بوو ٥ ألحَفَ فلان: فلانکەس داوێنی بەسەر زەوی دا راکێشاو فیزو تەکەببوری کرد ٥ ألحَفَ به: زیانی پێ گەیاند ٥ ألحَفَ فلاناً: لێفەی بۆ فلانکەس کڕی ٥ ألحَفَ ضَیفَهُ: میوانەکەی پێش خۆی خست ٥ ألحَفَ شاربَهُ: سمێڵی زۆر کورت کردنەوە ٥ ألحَفَ فلاناً الثوبَ: کراسی لەبەر فلانکەس کرد ٥ لاحَفَهُ: چووە بن باڵیو وەگری بوو لَحَّفَ فلان: فلانکەس داوێنی لەزەوی خشاند بەسەر زەوی دا رایکێشا ٥ التَحَفَ لحافاً: لێفەی بۆ خۆی درو ٥ التَحَفَ باللحاف: لێفەی بەخۆی دادا ٥ تَلَحَّفَ لحافاً: لێفەی بەخۆی دا دا.

اللِحاف: هەرشتێك بەخۆدا بدرێو خۆی پێ داپۆشی لەکاتی نوستن دا ٥ پۆشاکی سەر پۆشاك، وەکوو جبەو عەباو پاڵتو ٥ پارچە قوماشێکی ئاواخن کراو بە لۆکە لەکاتی نوستنو پاڵکەوتن دا بەخۆدادەدرێ ٥ اللَحفُ: دامێنی کێو، بنی کێو ٥ المِلحَفُ: پۆشاکێك کەلەسەر هەموو پۆشاکێکەوە لەبەر بکرێ وەکوو جوبەو عەباو شتی وا ٥ المِلحَفَةُ: بەمانا (المِلحَفُ) دێ ٥ عەبای ئافرەت، کە ئافرەت

لەسەر هەموو پۆشاكێكەوە لەبەری دەكاو خۆی پێ بالاپۆش دەكا.

**لَحِقَ الفَرَسُ لَحوقاً:** ئەسپەكەی كزو لاواز بوو.

**لَحِقَ الثَمَنُ أو اليَمينُ فلاناً:** نرخەكەی كەوتە سەر، سوێندی كەوتە سەر.

**لَحِقَ به:** پێی گەیی ٥ **أَلْحَقَ به:** پێی گەیی ٥ **ألحقَ فلاناً به:** فلانكەسی شوێن ئەو خست ٥ **الحَقَ فلاناً فلاناً:** فلانكەسی كردە كوڕی فلان ٥ فلانكەسی والێ كرد بگاتە فلان ٥ **التَحَقَ به:** پێی گەیی ٥ پێوەی نووسا، چووە پەنای ئەوو پالی پێوەی دا ٥ **تلاحَقَتْ المطايا ولحوها:** كاروانەكان یەك بەدوا یەك دا هاتن و بەیەك گەیشتن ٥ **تلاحَقَتْ الأخبار وأحوال القوم:** هەواڵەكان و رووداوەكان یەك بەدوو یەك دا هاتن ٥ **استَلْحَقَ فلاناً:** فلانكەسی بەكوڕی خۆی داناو پالّ خۆی دا ٥ **أللاّحق:** (أبو لاحق): بازو هەلۆ ٥ **اللاّحِقَةُ:** میوە چینی دووەمجاری ٥ **اللَّحَقُ:** ئەوەی دوای شتێكی تر دێ ٥ پاشكۆی كتێب و شتی وا ٥ **المُلحَقُ:** لەبواری قانونی نێودەوڵەتی دا فەرمانبەرێكە لەسەفارەتی دەوڵەتێك دا دادەمەزرێ لەكارێكی تایبەتی دا ٥ وەكوو مولحەقی عەسكەری مولحەقی سەقافی مولحەقی رۆژنامە نووسی ٥ پەرێك یان زیاتر لە رۆژنامە یان گۆڤارێك دوای دەرچوونی ژمارەكە پاشكۆكەی چاپ و پەخش دەكرێ ئەمەش بەهۆی هەواڵێكی گرنگ كە پێویست دەكا زوو بلاوبكرێتەوە.

**لَحَكَ الشَيْئَ بالشَيْئِ لَحْكاً:** شتەكەی بەشتەكەوە نووساند ٥ **تلاحَكَ الشَّيْئُ:** شتەكان چوونە ناویەكەوە ٥ دەگوترێ: (تلاحك البنيانُ): دیوارەكە چووە ناویەكەوەو تێكەلّ كێش بوو ٥

**لَخْلَعَ القومُ:** خەلكەكە لەشوێنی خۆیان جێگیر بوون و مانەوە

**تَلَخْلَعَ القوم:** خەلكەكە لەزێدی خۆیان جێگیر بون و جێیان نەهێشت ٥ **تَلَخْلَعَ فلان عن المكان:** فلانكەس ئەو شوێنەی بەجێ هێشت ٥ **اللَّخْلَخُ:** شوێنی تەنگەبەر ٥ (خبزة لَخلَخ): نانی وشك.

**لَحَمَ الشَيْئَ لَحْماً:** شتەكەی پێكەوە نووساند، جۆشی دا.

**لَحَمَ الأمرَ:** كارەكەی بناوان شێل كرد بەرێك و پێكی ئەنجامی دا.

**لَحَمَ العَظْمَ:** گۆشتی لەئێسقەكە دامالّی.

**لَحَمَ القومَ:** گۆشتی دەرخواردی قەومەكە دا.

**لَحِمَ بالمكان لَحَماً:** چووە ناو شوێنەكە.

**لَحِمَ الرجُلُ:** پیاوەكە حەزی لەگۆشت بوو ٥ زۆری گۆشت خواردو پێی توشی نەخۆشی بوو ٥ **لَحِمَ الرَّجُلَ:** زەبری ناڕاستەی پیاوەكە كرد گۆشتی هەنگاوت ٥ لەپیاوەكە نزیك بۆوە چووە پەنایەوە شانی بەشانییەوە نا.

**لَحُمَ فلان لَحامَةً:** فلانكەس گۆشتن، قەلەو بوو ٥ **لَحُمَت الدابَةُ:** ولاخەكە گۆشتی زۆر بوو قەلەو بوو ٥ **ألحَمَ الرجلُ:** پیاوەكە بوو بەخاوەن گۆشت ٥ لەمالّی دا گۆشت زۆر بوو ٥ **ألحَمَ الزَرْعُ:** كشتوكالەكە دانەوێلەی تێدا پەیدابوو، هاتە بەر. ٥ **ألحَمَ بالمكان:** لەشوێنەكە مایەوەو دلّی پێوەی نووسا ٥ **ألحَمَ الشَّيْئَ:** شتەكەی پێكەوە لكاند ٥ **ألحَمَ الثوبَ:** قوماشەكەی چنی ٥ **ألحَمَ القومَ:** گۆشتی دەرخواردی خەلكەكە دا ٥ **ألحَمَ بَصَرَهُ كذا:** چاوی تێ بڕی و بەچاو هەنگاوتی ٥ **ألحَمَ بين بني فلان شراً:** شەڕو ئاژاوەی بۆ خێلّی فلان نایەوە ٥ **لاحَمَ الصَّدْعَ:** درزەكەی پڕكردەوە

٥ **لاحَمَ الشَّيْءَ بالشَيْءِ**: شتەکەی بەشتەکەوە نووساند ٥ **التَحَمَ الجرحُ**: برینەکە وێکهاتەوە چاکبۆوە، گۆشتەوە زونی هێنایەوە ٥ **التَحَمَتْ الحربُ**: شەڕەکە گەرم بوو پەرەی ساند ٥ **تلاحَمَتْ الأشياء**: شتەکان پێکەوە لکان‌و پێکەوە چەسپان ٥ **تلاحَمَتِ الأشياءُ**: شتەکان پێکەوە لکانەوە ٥ **تَلاَحَمَتِ الشَجَّةُ**: برینەکە گۆشتەوەزونی هێنایەوە ٥ **اسْتَلْحَمَ الطريقُ**: ڕێگاکە بەرفراوان بوو ٥ **اسْتَلْحَمَ الزرعُ**: کشتوکاڵەکە تێک چرژا ٥ **اسْتَلْحَمَ الشَيْءَ**: شوێن شتەکە کەوت ٥ **اسْتَلْحَمَ الرجلُ الطريقَ**: پیاوەکە ملی ڕێگاکەی گرت‌و پێیدا ڕۆیی بەری نەدا ٥ یان بەپانایی ڕێگاکەدا ڕۆیی، ڕێگا پانەکەی گرتەبەر. ٥ **اسْتُلْحِمَ فلان**: فلانکەس لەشەڕدا دوژمن دەوری گرت ٥ **الإلتحام**: لەبواری زانستی (الأحياء)دا بریتییە لە یەکگرتنی چەند ئەندامێك کەئەوعەکانیان جیابێ ٥ **اللاحِمُ**: گۆشت خۆر چ ئادەمیزاد بێ یان گیانلەبەری تر ٥ **اللِّحام**: مادەیەك شتی پێ لەحیم بکرێ ٥ **اللِّحَامَةُ**: پیشەی شت لەحیم کردن ٥ **اللَّحَّامُ**: گۆشت فرۆش ٥ یان کەسێك پیشەی شت پێکەوە لەحیم کردن بێ ٥ **اللَّحْمُ**: گۆشت ٥ ئەومادە ماسولکەیی‌و نەرمەی نێوان پێست‌و ئێسقان ٥ **اللُّحْمَةُ**: کوتە گۆشت ٥ ئەوەی بازو هەڵۆ لەنێچیرەکەیان دەیخۆن ٥ لەبواری قوماش دا ناوە بۆ ئەو هەودایانەی دەکرێن بەتێوەدان‌و پۆ ٥ هەروا ناوە بۆ خزمایەتی ٥ **اللُّحْمَةُ**: کوتە گۆشت ٥ ئەوەی بازو هەڵۆ لەگۆشتی نێچیرەکەیان دەیخۆن ٥ **لُحْمَةُ جلدة الرأس**: ئەو پەردە تەنکەی ژێر پێستی سەر ٥ لەبواری قوماش‌و شتی وا ناوە بۆ تێوەدان‌و پۆ ٥ هەروا ناوە بۆ خزمایەتی ٥ دەگوترێ: (بينهما لُحْمَةُ نسب): لەنێوانیان دا خزمایەتی نەسەب‌و نەژاد هەیە ٥ **المتلاحِمَةُ**: برینێك گۆشتی سەرەوەی بڕی‌و ئێسقانی نەشکاندبێ‌و دوایی وێکهاتبێتەوە ٥ **المُلْتَحِمُ**: لەبواری زانستی (الأحياء)دا بریتییە لە یەکگرتنی دو ئەندام یان زیاتر بەبێ ئەوەی یەك جۆربن ٥ **المُلْتَحِمَةُ**: پەردەی ناوەوەی پێڵوی چاو ٥ **المُلْحَمُ**: هەر قوماشێك ڕایەڵ‌و تێوەدانی لێك جیابن، یان بەم شێوە ڕایەڵی خوری بێ‌و تێوەدان‌و پۆی لۆکەبێ یان بەشێوەی تر ڕایەڵ ئاوریشم بێ‌و تێوەدان ناپلۆن بێ ٥ **المَلْحَمَةُ**: شەڕو کوشتاری سامناك ٥ گۆڕەپانی شەڕەکە بەرهەمێکی چیرۆك ئامێزە داب‌و نەریتی تایبەتی‌و یاساو ڕێسای خۆی هەیەو تێیدا بەرێزەوە باسی پاڵەوان‌و پاشاو خوداوەندەکانیان دەکرێ‌و بەشێوەی ئەفسانەو خورافاتی سەر سوڕهێنەر، وادەبێ بەشیعر ئەدا دەکرێ وەکوو ئەلیازەی ئیغریقیەکان‌و شانامەی فارسی ٥ وایش دەبێ بەپەخشان دەگوترێ وەکوو ژینامەی عەنتەرە.

**لَحَنَ في کلامه**: لەقسەکانیدا زمانخواریی‌و هەڵەکردن دیاربوو.

**لَحَنَ الرجلُ**: پیاوەکە بەزمانی زگماکی خۆی ئاخاوتنی ئەنجام دا.

**لَحَنَ لَحْناً**: قسەیەکی لەگەڵ دا کرد، ئەو لێی حاڵی بوو جگە لەو خەڵکی تر تێی نەگەیشتن.

**لَحَنَ فلان لَحْناً**: فلانکەس زیرەك بوو لە بەڵگە هێنانەوەدا.

**لَحِنَ لَه**: لەقسەکەی حاڵی بوو ٥ **الْحَنَ في کلامه**: لەقسەکانی دا هەڵەی کرد ٥ **الْحَنَ فلاناً القَوْلَ**: قسەکەی لەفلانکەس گەیاند ٥ **لاَحَنَه**: بەشێوە زاراوەیەك قسەی لەگەڵ دا کرد ئەو

لێی حاڵی بن‌و کەسانی کە تێی نەگەن ◊ **لَحَنَ فِي قِرَائَتِهِ**: بەدەنگی مۆسیقای بۆ گۆرانییەکە دانا ◊ لَحَـنَ فلانــاً: فلانکەســی بەهەڵــە دانــا لەقسەکردنەکەی دا ◊ اللَّحْنُ: شێوەزاراوە.

**لَحْـنُ** القـول: مانـای قسەکەو ئـەوەی بیسەر بـە تێفکـرین‌و سـەرنجدان لێـی حـاڵی دەبـێ ◊ لەبواری مۆسیقادا وشەی (لَحْـن) بـەمانا دەنگی مۆسیقی کە دانراوە بۆ گۆرانی‌و سرودەکە دێ ◊ اللَّحْنُ: زمان، شێوە زاراوە ◊ اللَّحَنَة: کەسێك زۆر لەحن‌و شێوە زاراوە بزانێ ◊ الملاحِنُ: لەغـەزو موعەمما.

**لَحَـا** الـشَجَرَةَ والعَـصَا لَحْـواً: تـوێکڵی درەختـەی داماڵی.

**لحا** فلاناً: لۆمەو سەر زەنشتی فلانی کـرد ◊ لَحَـى الـشجرة والعـصا لَحْيـاً: دارەکـە یـان عەصاکەی داماڵی توێکڵەکەی لێ کردەوە ◊ لَحَّى اللهُ فلانـاً: خـودا نـەفرینی لـەفلان کـرد ◊ أُلْحَـى العـودُ: شورکەدرەختەکە کاتی ئـەوەی هاتووە تـوێکڵی لـێ بکرێتـەوە ◊ أُلْحـى فـلان: فلانکـەس کـاری ناشـیرینی ئـەنجام دا ◊ لاحَـاهُ: کێشەی لەگـەڵ نایـەوە سەرزەنـشتی کـرد ◊ اُلْتَحَـى: دەگـوترێ: (إِلْتَحَى الرجلُ): پیاوەکە بوو بە ریشدار ◊ إِلْتَحَى الغلامُ: کوڕەکە ریشی ڕوا، ریشی هـات ◊ إِلْتَحَـى العـودَ ونحـوه: تـوێکڵی لەشـوڕکەکە کـردەوە ◊ تلاحَـى الـرجلان: دوپیاوەکـە کێـشەیان کەوتـە نـاوەوەو جنێویـان بەیـەکتر دا ◊ تَلَحَّـى فـلان: فلانکـەس بەشـێك لـەمێزەرو جامانەکـەی بەبەرچەناگەی خۆی داهێنایەوە سەرو بەشێك لـە روخـساری خـۆی داپۆشـی ◊ الألْحَـى (رجـل ألحـى): پیـاوێکی ریـش درێـژە، ریـش پانـە ◊ اللِحَاءُ: توێکڵی هەرشتێك ◊ لحاء التمرة: تـوێکڵی دەوران دەوری دەنکـە خورمـا ◊ هـەروا وشـەی (اللَّحـاء) نـاوە بـۆ پـەردەی دەمـاغ‌و پـەردەی گورچیلە ◊ اللِحْيُ: شوێنی لـێ ڕوانی مـو لـەلا ڕومەت ◊ لِحْيَا الغـدير: ئەمبـەرەو بـەری زەلکاو کارێز ◊ اللِّحْياني: (رجـل لحيـاني): پیـاوی ریـش درێـژو ریـش پـان ◊ اللِّحيَـةُ: مـوی لا ڕومـەت‌و چەناگە ◊ لِحيـة التـيس: ڕوەکێکی کشتوکاڵییە ڕەگـەکانی دەکوڵێنـدرێن‌و دەخـورێن ◊ المِلْحَـاءُ: ئەوەی توێکڵی پێ دادەماڵدرێ.

**لَخَّ** في كلامه: قسەکەی بەتێکەڵی‌و پێکەڵی هێناو بەزمانێکی خوارو خێچ قسەکانی کردن.

**لَخَّ** الخَبَرَ: هەواڵەکەی زانی

**لَخَّ** فلاناً: شەپلاغەی لەفلانکەسدا ◊ لَخَخَـتْ عينـه لَخَخا: چاوی بەهۆی ریپۆقەوە پێکدانوسانون ◊ التَخَ العُشْبُ: گیاوگژەکـە تێکهاڵان ◊ دەگوترێ: (سكرانٌ مُلْتخ): سەرخۆشێکە لەهیچ حاڵی نابێ ◊ تَلاَخَّ الوادي: شیوەکە تەنگەبەر بوو، درەختی زۆرو چڕو پڕ بوو ◊ اللَّخَة: لوت ◊ (إمرأة لَخَّةٌ): نافرەتێکی چڵکن‌و بۆگەنـە ◊ اللّخوخ: عەیبـدار ◊ لَخِصَتْ عينـه: پێڵوی چاوی ئەستور بـوون ◊ لَخَّـصَ الـشَّيْءَ: شتەکەی پوختـە کـرد ◊ لَخَّـصَ القولَ: قسەکەی کورت‌و پوخت کردەوە ◊ لَخَّصَ الشَّيْءَ: شتەکەی رونکـردەوە ◊ اللَّخِصُ (ضـرع لَخِـــصٌ): گوانـــدێنێکی قەڵـــەوو گۆشـــتنە بەناخۆشـی شـیری لـێ دەدۆشـرێ ◊ اللَّخَـصَةُ: بەزی چاو پێڵوی سەرو خوارەوەی چاو.

**لَخَفَ** فلاناً لَخْفاً: بەتوندی لە فلانی دا

**لَخَفَ** عَيْنَهُ: لەچاوی خۆی دا ◊ اللَّخافَةُ: بـەردێکی تەنکی تیژە ◊ اللَّخْفُ: کـەفی تـەنك ◊ اللَّخْفَةُ: بـەردێکی سـپی درێـژو تەنکـە ◊ اللَّخلَخـانِيّ: پیاوێـك نـەتوانێ مەبەسـتی خـۆی دەربـبڕێ.

**لَخَمَ الشَيْئَ لَخماً**: شتەكەی بڕی

**لَخَمَ وَجْهَهُ**: شەپلاغەی لەدەمو چاودا.

**لَخَّمَ فلاناً**: بەنەرکی قورس مەشغولی کرد ٥ لاخَمَهُ: شەپلاغەی لی دا ٥ التَخَمَ: بەکاری قورس مەشغولْ بوو ٥ اللُّخْمُ: جۆرێکە لەماسی دەریا ٥ اللَّخَمَةُ: سەردەم ٥ نەفس قورسی.

**لَخِنَ السِّقاءُ وغيره لَخَناً**: کوندەکە بۆگەن بوو.

**لَخِنَ الرجل ولَخِنَت المرأةُ**: پیاوەکە، ئافرەتەکە بنهەنگڵو بن ڕەفیسكو شوێنی تێدا کۆبونەوەی چڵكو شتی وا لەجەستەیان دا بۆگەن بوو ٥ اللُّخْنُ: ئەو سپیاییەی بەسەری چوکی کوڕەوەیە پێش خەتەنەکردنی ٥ لَخاهُ لَخواً: دەرمانی کردە لوتیەوە ٥ یان دەمیەوە.

**لَخِيَ لَخاً**: قسەی پڕو پوچی زۆر گوتن.

**لَخِيَ الشَيْئُ**: شتەکە خوار بوو.

**لَخِيَ البَطْنُ**: ورگەکە لای خواروی داچۆڕا

**لَخِيَ العُقابُ**: داڵاشەکە دەندوکی سەرەوە لەهی خواروی درێژ تر بوو.

**لَخِيَ البعيرُ**: حوشترەکە ئەژنۆیەکی لەوی تری ئەستور تر بوو ٥ الْخاهُ: هەوای کردە لوتیەوە یان دەمیەوە ٥ التَخى فلان: فلانکەس دەرمانی کردە لوتیەوە ٥ التَخى الصَّبِيُّ: منداڵەکە نانی تەرکردو خواردی ٥ اللَّخا واللَّخاءُ: ئامێری شت هەڵمژین ٥ اللِّخاء: بژێوی منداڵ جگە لەشیر.

**لَدَّ فلاناً**: دوژمنایەتیەکەی فلانکەسی توند کرد ٥ لَدَّهُ: کێشەی لەگەڵ نایەوەو بەسەری دا زاڵ بوو.

**لَدَّ المريضَ**: نەخۆشەکە زمانی خستە لایەکی دەمیەوەو دەرمانی کردە لایەکی تریەوە.

**لَدَّ فلاناً عن الأمر**: فلانکەسی لەکارەکە حەبس کرد.

**لَدَّ لَدَداً**: کێشەو دوژمنایەتیەکەی زۆر توند کرد ٥ اَلَدَّ: دژایەتی کرد ٥ دەگوترێ: (أَلَدَّ بِهِ): لەکێشەو دژایەتی کردنی دا توند ڕەو بوو ٥ پاشگوێی خست ٥ بەترومپاو شتی وا دەرمانی کردە ناو دەمیەوە.

**لادَّهُ**: لەکێشەو نیزاع لەگەڵ کردنی دا توند ڕەوی نواند ٥ لَدَّهُ: سەرسامی کرد ٥ لَدَّهُ بِهِ: هەڕەشەی لێ کرد ٥ اِلْتَدَّ فلان: فلانکەس بەترومپاو شتی وا دەرمانی خوارد ٥ التدَّ عنه: لێی لادا، مەیلی لای تری کرد ٥ تلدَّدَ: بەسەر سامی سەیری ئەم لاو ئەولای خۆی کرد، مایەوە، حەوق بوو ٥ الألَدُّ: دوژمنی کێشەکارو ئاشتی نەویست ٥ اللَّدَدُ: کێشەو جەدەلی زۆرو ملنەدان بۆ حەقو ڕاستی ٥ ئەو دەرمانەی بە ترومپا دەکرێتە دەمی نەخۆشەوە ٥ نەخۆشییەکە توشی ناو دەمو قورگ دەبێ ٥ اللَّدِيدُ: بەمانا (اللَّدودُ)دێ ٥ دیوی دەرەوەی ئەستۆ ٥ (لديدا الفم): ئەملاو ئەولای هەرشتێك بێ ٥ اللَّديدة: باخچەی سەوزی پرگوڵو گوڵزار ٥ المُتَلَدَّدُ: مل ٥ لدَسَه بيده لَدْساً: بەدەستی لێیدا ٥ اَلْدَسَتِ الأرض: زەوییەکە کەمێك لەڕوەکەی دەرخست ٥ اللَّديس: چروزەی ڕوەك ٥ گیاوگژ لەسەرەتای سەر دەرهێنانی لەزەوی ٥ المِلْدَسُ: دەسکە سندۆڵ ٥ لَدَغَتْهُ الحَيَّةُ: مار پێوەی دا، گەستی.

**لَدَغَ فلاناً بكلمة**: قسەی توانجو تانەو تەشەری ئاراستەی فلان کرد ٥ الْدَغَ فلاناً: مارێکی لەفلان بەردا پێوەی بدا ٥ اللَّداغة من الرجال: کەسێك تانەو تەشەر لەناموسی خەڵك بدا ٥

المِلْــدَغُ: پیاوێــك داب‌و ڕەوشــتی وابــێ تانــە لەناموسی خەڵك بدا.

لَدَمَ الشَّيْءَ لَدْماً: لەشتەکەی دا.

لَدَمَ فلاناً: شەپلاغەی لەفلان دا

لَدَمَ الثوبَ: کراسەکەی پینەکرد ٥ اُلْدِمَت علیه الحُمّی: لەرزو تای بەردەوام بوو ٥ لَدَّمَ الثوب والخُفَّ: قوماشەکە یان خوفەکەی پینەکرد ٥ التدم الرجلُ: پیاوەکە تێك چوو، شڵەژا ٥ اِلْتَدَمَت المرأةُ: ئافرەتەکە لەسنگی خۆی دا، لەدەم‌و چاوی خۆی دا ٥ التدم فلاناً: لەفلانکەسی داو پاڵی پێوەنا ٥ تَلَدَّمَ الثوبُ: کراسەکە ڕزی‌و کۆن بوو ٥ تَلَدَّمَ الرجلُ الثوبَ: پیاوەکە کراسەکەی پینەکرد ٥ اللِدامُ: پینە کەکراس‌و شتی وای پێ پینە بکرێ ٥ اللَدْمُ: دەنگی بەرد کە لەبەرزاییەوە بەزەوی دەکەوێ ٥ اللَدْمُ: وشەیەکە عەرەب لەکاتی سوێند خواردن‌و پەیمانبەستن دا دەیڵێن ٥ اللَدیمُ: قوماشی کۆن‌و ڕزیو، پینەکراو ٥ المِلْدامُ: بەردێکە دانەوێڵەو شتی وای پێ دەهاڕدرێ ٥ المُلَدَّمُ: (ثوب مُلَدَّم): قوماشە کۆن ٥ المِلْدَمُ: بەمانا (الملدامُ) دێ ٥ گێلی گۆشتن‌و قەڵەو ٥ (أم مِلْدَم): نازناوی لەرزو تایە.

لَدُنَ الشَّيْءُ: شتەکە نەرم بوو ٥ (فهو لَدْن وهي لَدْنة) ٥ دەگوترێ: (إمرأة لَدْنة): ئافرەتێکی نەرم‌و نیان‌و گەنج‌و تازە پێگەیشتووە.

لَدُنَ أخلاقه: ڕەوشتی نەرم‌و نیان بوو ٥ لَدَّنَ الشَّيْءَ: شتەکەی نەرم کرد ٥ لَدَّنَ قَوْسَهُ: قوماشەکەی ڕشاند، تەڕی کرد ٥ لَدَّنَ فلاناً بالأمر: فلانی بەشتەکەوە هێشتەوە ٥ تَلَدَّنَ في الأمر: لەکارەکەدا مایەوە ٥ تَلَدَّنَ في حاجته: لەنیشەکەی دا تەمبەڵی کرد ٥ تَلَدَّنَتْ عليَّ راحلتي: وڵاخەکەم وەستاو نەڕۆیی ٥ تَلَدَّنَ: هەڵوێستەی کردو وەستا ٥ تَلَدَّنَ بالمكان: لەشوێنەکە جێگیر بوو ٥ اللَدْنُ: خواردەمەنیەك نانەکەی باش نەبێ یان باش نەکوڵابێ ٥ اللُدْنَةُ: پێویستی.

لَدُنْ: زەرفی زەمان‌و مەکانە بەمانای (عِنْدَ)دێ ٥ اللَّدینة: مادەیەکی هەویری نەرمەو چەند شکڵ‌و قەبارەیەکی لێ دروست دەکرێ ٥ الدی فلان: فلانکەس هاوشانی زۆر بوون ٥ اللِدَةُ: کەسێك لەگەڵ تۆ لەدایك بوو هاوتەمەنت بێ.

لدی: زەرفی مەکانە بەمانا (عِنْدَ)یە.

لَذَجَ الماء في حلقه: ئاوەکەی قوت دا.

لَذَّ الشَّيْءُ: شتەکە بەتام بوو

لَذَّ بالشيئ: شتەکەی بەتام هاتە دەست ٥ لَذَّذَهُ: وای لێکرد تامی خۆشی لێ بکا، بەلایەوە بەتام بێ ٥ اِلْتَذَّ الشَّيْءَ وبه: بەتام‌و لەزەت هاتە بەردەستی ٥ تَلاذَّ الرجلُ والمرأةُ: هەریەك لەژن‌و پیاوەکە لەزەت‌و خۆشییان لەیەکتر دی ٥ تَلَذَّذَ الشَّيْءَ وبه: شتەکەی بەتام‌و لەزەت هاتە بەردەست ٥ اسْتَلَذَّ الشَّيْءَ: شتەکەی بەلەزەت‌و بەتام دەسکەوت ٥ اللَذُّ: قسە خۆش ٥ اللَذَّةُ: هەستکردن بەشتێك گونجاو بێ لەگەڵ جەستەو دەرون‌و زەوقی دا ٥ المَلَذُّ: شوێنی لەزەت‌و خۆشی ٥ المَلَذَّةُ: شەهوەت‌و ئارەزو.

لَذَعَ الطائرُ لَذْعاً: باڵندەکە باڵی ڕێك کردن‌و دوایی بەهێواشی جوڵاندنی ٥ لَذَعَت النارُ برأيه وذكائه: فلانکەس بەخێرایی لەشتەکە حاڵی بوو ٥ لذعت النارُ الشَّيْءَ: ئاگرەکە ڕێی کەوت‌و سوتاندی.

**لَـذَعَ الحُـبُّ قَلْبَـهُ**: خۆشەویـستیو دڵـداری دڵـی سوتاندو ئازاری دا.

**لَذَعَ** فلاناً بلسانه: بەزوبانی ئەزیـەتی بەفلانکەس گەیاند ٥ **التذع**: داخ بوو ئازاری پێ گەیاند.

تلَذّعت النـارُ: ئاگرەکـە هەڵگیرسا ٥ **تَلَـذَّعَ فـلان**: فلانکـەس زەینـی هەڵایساو شـتی زانـی ٥ **تَلَـذَّعَ الغـلام**: گەنجەکـە بەشـێوەیەکی جـوانو خێـرا ڕۆیی ٥ **اللّذّاعُ**: بۆ زێـدە ڕۆیـی لـەمانای (لاذِع) دا دێ ٥ **اللَّذّعُ**: (نبیذ یلْذَعُ): سرکەیەکی تیـژە ٥ **اللّوْذع واللوذعي**: گورجو گۆڵو زیـرەکو زەیـن تیژ ٥ **لَذْلَذَ فلان**: فلانکەس پەلەی کردو گورجو گۆڵ بـوو لـە ڕاپەڕانـدنی کارەکـانی دا ٥ **لَذِمـه بالمکان**: وەگری شوێنەکە بوو تێیدا مایەوە.

**لَـذِمَ** بالـشَّيْئِ: دڵـی پێـوەی نووسـاو سـور بـوو لەسـەریو وازی لـێ نـەهێنا ٥ **الـتَمَ بالمکـان**: لەشوێنەکە جێ گیر بوو ٥ **الْتَمَ فلاناً الشَّيْئَ وبه**: فلانکەسی بەوشتەوە پەیوەست کـرد ٥ **الـلاّذَنُ**: ڕەگـەزی (جەنبەیـە) لـەپێری (اللاّذنیـة)یـە صەمغی ڕاتینجی لـێ دەردەهێنـدرێ، دەکرێتـە بنێشتی جوینو عەترو دەرمان.

**لَذِيَ** بالأمر لَذىً: بەکارەکـەوە هەڵەوگیر بـوو لێـی جیـا نـەبوەوە ٥ **الَّـذي**: ئیـسمی مەوصـوولە مـەبنیو مەعریفەیە ٥ **اللّذان**: بـۆ دووکەسـی نێرە ٥ **الّذِين**: بۆ سێ کەسو زیاترە لەنێرینە.

**لَزَبَ الشَّيْئَ** لَزوباً: شتەکە جێگیر بوو

**لَزَبَ الشيئُ**: شتەکە پتەو بوو.

**لَزَبَ الطين**: قوڕەکە لینج بوو

**لَزَبَ بالشَّيْئِ**: بەشتەکەوە نووسا ٥ **لَزَبت العَقْرَبُ فلاناً لَزْباً**: دوپشك بەفلانکەسیەوە دا.

**لَزِبَ الطينُ** لَزَباً: بەمانا (لَزَبَ)دێ.

**لَزِبَ الشَّيْئُ**: شتەکە تەنگ بۆوە ٥ کەم بۆوە.

**لَزُبَ الشَّيْئُ** لزباً ولزوباً: شـتەکە هەنـدێکی چـووە نـاو هەنـدێکیـەوەو تێکـەڵکێش بـوو ٥ **تـلاَزَبَ الشَّيْئُ**: شتەکە کەوتە سەریەك ٥ **اللَّزْبُ**: ڕێگای تەنگ ٥ **اللَّزْبَةُ**: تەنگانەو جورتمو قاتو قڕیو گرانی.

**لَزَجَ الشَّيْئُ**: شتەکە لینجو لێك کشاوەو مـەطاطی بوو

**لَـزِجَ** بالـشَّيْئِ: بەشـتەکەوە نووسـا وەگـری بـوو حەزی لـێ کرد ٥ **تَلَزَّجَ الشَّيْئُ**: شتەکە هەندێکی بەهەندێکیەوە نووسا ٥ **تَلَـزَّجَ الطعـامُ أوالطیـبُ**: خواردنەکە یان بۆنەکە لینـجو مـەطاطی تێـك هـاڵابوو ٥ **تَلَـزَّجَ البقـلُ**: گیـاو گژەکـە نـەرم بـوو لێـك هـاڵابوو ٥ **تَلَـزَّجَ شـعر الـرأس**: قـژی سـەر شۆڕابوو باش پاك نـەکرابۆوەو تێك هـاڵابوو ٥ **اللَّزِجَـةُ**: لەزگـە ٥ دەگـوترێ: (رجـل لزجـة): پیـاوێکی لەزگەیـیـە بـەو شـوێنە دا نووسـاوەو جێـی ناهێڵـێ ٥ **اللُّزوجَـةُ**: لینجـیو پێکـەوە نوسانو پەکگرتنی مادەیە، بەجۆرێك بەئاسانی شێوەکەی تێك نەچێو نەگۆڕێ وەکوو قەترانو هـەنگوینو شـتی وا ٥ **لَـزَّهُ**: شـەتەکی دا پێـوەی نووساند.

**لَزَّ الشَّيْئَ** بالشَّيْئِ: شتەکەی بەشتەکەوە پەیوەست کرد.

**لَزَّ الـشَّيْئَ**: پارچە شتەکەی لێـك نزیـك کردنـەوە پێکەوەی نووساندن.

**لَزَّ البعيرين**: دوو حوشترەکەی خستنە پـەنا یـەكو جوتی کردن ٥ (لَزَّ البـابَ): دەرگاکـەی پێوەدا، دایخست.

**لَـزَّ** فلانـاً بـالرمح: بـەڕمب لەفلانکەسـی دا.

**لَزَّ فلاناً الى كذا:** فلانكەسی ناچارکرد بۆئەوە ٥ **الَزَّ الشَّيْءَ:** شتەکەی شەتەك دا پێوەی نوساند ٥ **لازَّه:** پێوەی نووساند چەسپاندی ٥ **لَزَّه الله:** خودا بەتەواویی دروستی کرد، هەموو ئەندامەکانی جەستەی هەمئاهەنگی یەکترن و چ کەم و کوڕی تێدا نییە ٥ **التَزَّ بالشَّيْءِ:** بەشتەکەوە نووسا ٥ **تَلَزَّزَ الشَّيْءُ:** شتەکە کۆبوەو پێکەوە نووساو یەکتری گرت ٥ **اللِزَازُ:** پاشکۆڵ و کیلۆنی دەرگا ٥ شمشێری دەرگا ٥ دەگوترێ: (فلان لِزاز خصومة): فلانکەس کان و بنکەی کێشەو نیزاعەو باش دەتوانێ ئیدارەی بکا ٥ **اللُّزُّ:** ئەڵقەی دەرگا ٥ یان شوشەی مەرمەکەب و شتی وا ٥ **اللِزُّ:** لەزگەو نووساوو چەسپاو بەشتەوە ٥ **اللِزَزُ:** کیلۆن و پاشکۆڵی دەرگا ٥ **المِلَزُّ:** کەسێك زۆر توندڕەو بێ لەکێشەو نیزاع دا ٥ دەست قوچاو بێ بەزەحمەت شتێکی لەدەست بێتەوە.

**لَزِقَ الشَّيْءَ:** بەشتەکەوە نووسا ٥ **الْزَقَه بالشَّيْءِ:** لکاندی بەشتەکەوە، پێوەی چەسپاند ٥ **لازَقَه:** پێوەی نووسا ٥ کارەکەی ئەنجام دا بەبێ ڕێك و پێکی و توندو تۆڵی ٥ **التَزَقَ الشَّيْءُ بالشَّيْءِ:** شتەکە بەشتەکەوە نووسا ٥ **تلازَقَ الشَّيْئان:** دوو شتەکە بەیەکترەوە نووسان ٥ **اللَّزُوق:** دەرمانێکە بۆ چاککردنەوەی برین، برینەکە دەگرێ تاچاك نەبێتەوە بەری نادا ٥ قوماشێکی شاش چنراوە یان قوماشێکی موشەممەعە دەخرێتە سەر برین بۆئەوەی برینەکە پیس نەبێ ٥ **اللِزَاق:** ئەوەی شتی پێ بلکێندرێ بەشتی ترەوە ٥ **اللَّزَاق:** تیپی کاغەزی لەزگە ٥ جۆرە کاغەزێکە مادەیەکی لەزگەیی پێوەیە دەلکێ بەشتی ترەوە ٥ **اللِزْقُ:** بەمانا (اللازِق)دێ ٥ دەگوترێ: (هذا لِزْق هذا): ئەمە نووساوە بەمەوەوە لێی نابێتەوە.

**اللَّزْقاءُ:** (أذن لزقاء): گوێچکەکە قەراخەکەی بەسەرەوە نووساوە ٥ **اللُّزَقَة:** لەزگە

**لَزِمَ الشَّيْءُ لُزوماً:** شتەکە جێگیر

**لَزِمَ كذا من كذا:** ئەمە لەوە پەیدا بوو.

**لَزِمَ الشَّيْءُ فلاناً:** شتەکەی لەسەر فلان پێویست بوو

**لَزِمَ العملَ:** بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی.

**لَزِمَ المريض السريرَ:** نەخۆشەکە لەسەر جێگا کەوت

**لَزَمَ الغريمَ:** قەرزدارەکەی گرت و مۆڵەتی نەدا ٥ **الْزَمَ الشَّيْءَ:** شتەکەی چەسپاند ٥ **الْزَمَ فلاناً الشَّيْءَ:** شتەکەی لەسەر فلانکەس پێویست کرد ٥ **لازَمه:** بەردەوام بوو، یەخەی گرت و بەری نەدا ٥ **لازَمَ فلاناً:** لەگەڵ فلان دا ماچ و مۆچ و چاك و چۆنی کرد ٥ **إلْتَزَمَ الأمرَ او الشَّيْءَ:** کارەکە یان شتەکەی لەسەر خۆی پێویست کرد ٥ **إلْتَزَمَ فلان للدولة:** فلانکەس بڕیاری دا وادەی دا بڕێك پارە بدا بەدەوڵەت لەپای بەکارهێنانی پارچەیەك زەوی دەوڵەت بۆ بەرژەوەندی خۆی ٥ **اسْتَلْزَمَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بەپێویست زانی ٥ داخوازی شتەکە بوو ٥ **اللِزامُ:** شتی زۆر پێویست ٥ **اللُّزَمةُ:** دەگوترێ: (رجل لُزَمَةٌ): پیاوێکە خوبەشتێکەوە دەگرێ و وازی لێ ناهێنێ ٥ **المُلازِمُ:** پلەیەکە لەناو پیاوانی سوپاو پۆلیس دا ٥ **الملازِم الأول:** پلەیەکی سوپایە یان پۆلیسییە ٥ **المُلْتَزِم:** سەپان و مەرزێر لەسەر زەوی حکومەت ٥ **المِلْزَمُ:** جەڕو مەنگەنە چ لەئاسن یا لەدار بێ ٥ **المَلْزَمَة:** مەلزەمە؛ بەشێکە لەکتێب هەشت پەڕەیان یان زیاتر.

**لَـزَنَ القـومُ لَزنـاً**: خەڵکەکە قەرەباڵغییان کـردو پاڵەپەسـتۆیان کـرد ◊ **تـلازن القـومُ**: بـەمانا (لَزنَ)دێ ◊ **الألزن من الزمان**: ڕۆژگاری سەخت ◊ **اللَّـزْن**: تەنگانـەو چـورتم ◊ **لَـسَبَتْهُ العقـربُ ولعوها**: دوپشك پێوەی دا، گەستی

**لَسِبَ به لَسَباً**: پێوەی نووسا.

**لَسِبَ العَسَلَ**: هـەنگوینی خـوارد هـەڵی قوڕانـد ◊ **اَلـسَبَهُ عقربـاً**: دوپـشکی ناڕاسـتەکرد بۆنـەوەی پێوەی بدا ◊ **اللَّسوب**: دەگوترێ: (ماترك لَسُوباً): هیچی نەهێشتەوە.

**لَسَدَ الفصيلُ امه لَسْداً**: بێچووەکە هەموو شیری ناو گوانی دایکەکەی خوارد.

**لَسَدَ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵقوڕاند

**[illegible]دَ العَسَلَ**: هـەنگوینی لـستەوە ◊ **اَلمِلْسَدُ**: بێچووە ناژەڵێك زۆر شیر بخوا.

**لَسَّ الشَّيْءَ لَسّاً**: شتەکەی لـستەوە ◊ **اَلَسَّتِ الأرضُ**: زەوی یەکەم جار ڕوەکی لـێ ڕوا ◊ **اَلَسَّ النباتُ**: ڕووەکەکـە کـاتی ئـەوەی هـات بدورێتـەوە ◊ **اللُّـسَاسُ**: گیـاو گـژ کـەتازە سـەری لـەزەوی دەرهێنابـێ ◊ **اللَّـسُّ**: یەکـەمجار کەلـەوەڕ پـێ دەگـاو بـەردەمی ئـاژەڵ دەکـەوێ ◊ **اللُّـسُسُ**: کۆلبـەرو حـەماڵی لێـزان ◊ **لَـسَعَتْهُ العَقْـرَبُ**: دوپشك پێوەی دا.

**لَسَعَ فلاناً بلسانه**: بـەزمانی خـەڵکی ئەزیـەت دا غەیبـەتی کـردن ◊ **اَلْـسَعَهُ عقربـاً**: دوپـشکی ناڕاستەکرد بۆ ئـەوەی پێوەی بـدا ◊ **اَلْسَعَ بين الناس**: ناکۆکی خستە ناو خەڵکەکەوە ◊ **اللَّسَّاعُ**: زمـان پـیس، دەم درێـژ ◊ **اللَّـسْعَةُ**: بـەمانا (اللَّسَّـاع)دێ ◊ **اللَّـسُوع**: ئافرەتێـك مێردەکـەی نـاخۆش بـوێ ◊ **المِلْـسَعُ**: شـارەزاو چاوسـاغی لێهاتوو ◊ **لَسِقَ**: بڕوانـە مـادەی (لَـزق ولـصق) ◊ **اللَّسُوقُ**: لەزگەیە بەشوێنی برینـەوە دەنـرێ تـا چاك نەبێتەوە بەری نادا.

**لَسَنَ فلاناً لَسْناً**: غەیبەتی فلانی کرد

**لَسَنَ اللِّيفَ**: توێکڵەکەی شیتاڵ کردەوە

**لَسِنَ فلان لَسِناً**: فلان زمان ڕەوان‌و فەصیح‌و قسە شـیرن بـوو ◊ **اَلْـسَنَ فـلان**: فلانکـەس فەصـیح‌و زمان ڕەوان بـوو ◊ **اَلْسَنَ فلانـاً قولـه أو رسـالته**: قسەکەی بە فلانکەس ڕاگەیاند ◊ **لاسَنَهُ**: قسەی لەگەڵ دا کرد ◊ **لَـسُنَ فـلان**: فلانکـەس زمـانی خـۆی گەسـت‌و سەرسـام بـوو لەکارەکـە ◊ **لَـسَّنَ الشَّيْءَ**: شتەکەی وەکوو زوبان لـێ کـرد ◊ **تَلَـسَّنَ الجَمْرُ**: پشکۆ ئاگرەکە بڵێسەی لـێ هەڵسا وەکوو زوبـان سـەرەوەی خـۆی باریـك نوانـد ◊ **تَلَـسَّنَ عليّ**: درۆی لەگەڵ دا کـردم ◊ **اللِّسان**: زوبـان ◊ **ذو اللسانين**: فیتنەو دوو زمـان، دوو ڕوو ◊ **لسان الحذاء**: ئەو زیادۆکەی دەکەوێتە ئاستی پشتەپێ ◊ (لـسان الميـزان): زوبانـەی تـەرازو ◊ (لـسان النار): بڵێسەی ئـاگر ◊ دەگوترێ: (طفي لـسان النار): ئاوە بۆ ئەو پارچە غوضروفەیەی بەبنی زمانەوەیـەو لـەکاتی شـت قوتـدان دا بـۆری هەناسە دەگرێ بۆنەوەی خواردنی تێ نەچێ ◊ **لسان الثور**: ڕوەکێکی ساڵانەیە ◊ **لِسان الحمل**: ڕوەکێکی کێوی پزیشکییە تەمەن درێژە ◊ **لِسان العصافير**: جۆرە درەختێکە ◊ (لسان العصفور): جـۆرە مەعکەرۆنەیەکـە پارچـەکانی بـچوکن وەکوو زمانـە چۆلەکە وەهـان ◊ **اللِّسْنُ**: قسەو ئاخـاوتن ◊ زمـان‌و زاراوە ◊ **اللِّسنُ**: هەرشـتێك قەراخەکانی وەکوو قەراخی زمانی لێ کرابێ ◊ **المَلْسُون**: (رجل ملـسون): پیـاوی زمـان شـیرین ◊ قـسە خۆشـی بـێ کـردەوە ◊ **لَـشْلَشَ فـلان**:

فلأنكەس لەكاتی ترس وەفرەی لێ هەڵگیرا ٥ **اللَّشْلَشُ**: پیاوی گورج و گۆڵ و جەستە بچوك.

**لَشَأَ** فلان: فلأنكەس دوای پلە بەرزبونەوەی نزم كرایەوە ٥ **لاشاء الله**: خودا لەناوی برد.

**لَصِبَ** الجلدُ باللحم: پێستی بە ئێسقانەوە نووسا لەبەر كزو كۆڵەواری گۆشتی پێوەنەما.

**لَصِبَ** الخاتمُ في الأصبع: ئەنگوستیلەكە لەپەنجەدا جێگیر بوو، دەرنایە.

**لَصِبَ** السيفُ في الغمد: شمشێرەكە لەكالان دا ئاخێ بوو ٥ **إلْتَصَبَ الشَّيْئُ**: شتەكە تەنگ بوو ٥ **اللأصِبَةُ**: بیری تەنگەبەرو قوڵ ٥ **اللِّصْبُ**: تەنگەڵان و رێگەی تەنگەبەر ٥ **اللِّصِبُ**: پیاوی رژدو رەوشت نالەبار.

**لَصَّ** الشَيْئَ: شتەكەی دزی ٥ بەدزی كارەكەی كرد.

**لَصَّ** البابَ: دەرگاكەی داخست، پێوەی دا.

**لَصَّ** فلان: فلأنكەس ناوشانی تەسك بوون ٥ یان ددانەكانی جوت بون

لصّت المرأةُ: ئافرەتەكە رانی لێك نزیك بوونەوە ٥ **لَصَّت الجبهةُ**: ناوچاوانی تەسك بوو ٥ **لَصِقَت الشاة**: مەرەكە شاخێكی بۆ پێشەوەو شاخێكی بۆ دواوە بوو ٥ **تَلَصَّصَ فلان**: فلأنكەس دزی كردنی دوبارەو سێبارە كردووە ٥ **اللِّصُّ**: دز ٥ **المَلَصَّة**: (أرض مَلَصَّة): وڵاتێكە دزی زۆرە.

**لَصَغَ** الجلدُ: پێستی بەئێسقانەوە نووساو وشك بۆوە بەهۆی كزی و لاوازی.

**لَصَفَ** لونه: رەنگی درەوشایەوە.

**لَصَفَ** البعيرُ: حوشترەكە دروی خوارد رومكی چقلاوی خوارد ٥ **اللاّصِفُ**: كلی لەچاو رادراو ٥ **اللَّصَفُ**: درەختێكە چقلاوی لەوڵاتانی دەوروبەری دەریای سپی ناوەڕاست گەشەدەكا، گوڵەكانی سپین.

**لَصِقَ** الشَيْئُ بغيره: شتەكە بەشتی ترەوە نووسا ٥ **ألصَقَ الشَيْئَ بالشَّيْئ**: شتەكەی بەشتەكەی ترەوە نووساند ٥ **لاصَقَه**: پێوەی نووسا ٥ ئەویش بەئەمەوە نووسا ٥ **إلْتَصَقَ بە**: پێوەی نووسا ٥ **تلاصَقا**: بەیەكەوە نووسان ٥ **الإلصاق**: پیتی (الإلصاق): پیتی (ب)ی یە ٥ **الإلْتِصاق**: لەبواری ئەندازیاری دا جۆشخواردن و پێوەلكانی قەبارەیەكە بەقەبارەیەكی تر.ß **الإلْتِصاقية**: (اللغة الإلتصاقية): ئەو زمان و شێوە ئاخاوتنەیە كەبەهۆی وشەی زیادەوە پەیوەندی قسەكان ئەدا بكرێ وەكوو لوغەی ئاجەری و بۆڵۆنی و توركی ٥ **اللاّصوق**: ئەو دەرمان و لەفاف و لەزگە پزیشكییانەی دەخرێنە سەربرین ٥ **اللَّصْقُ**: (هو لَصْقي وبَلصْقي): ئەو بەتەنیشتمەوەیە ٥ هەروا دەگوترێ: (هو بلصق الحائط): ئەو لەپەنا دیوارەكەوەیە ٥ **اللَّصُوقُ**: بەمانا (اللاّصوق)دێ ٥ **اللَّصيق**: مرۆڤی باوك نادیار، هەڵگیراوە ٥ **جارٍ لَصيق**: جیرانی وا كەماڵی بەماڵی تۆوەبێ ٥ **المُلْصَقُ**: مرۆڤی باوك نادیار ٥ باوك نەزاندراو ٥

**لَصْلَصَ الشَيْئَ**: شتەكەی لەقاند بۆئەوەی دەری بێنێ ٥ **لَصْلَصَ**: زۆری بەمەلاو بەولای خۆی دا روانی ٥ **اللَّصْلاَصُ**: چاوساغی شارەزاو لێهاتوو ٥ **لَصْمَهُ**: توندو تیژی لەگەڵ نواند.

**لَطَأَ** بالشَيْئ لَطْأً: بەشتەكەوە نووسا ٥ **لَطَأَ فلاناً بالعصا**: بەگۆچان لەفلأنی دا.

**لَطِئَ** بالأرض: بەزەوییەكەوە نووسا ٥ **لَطِئَت لِسَانُهُ**: زوبانی وشك بوو ٥ **اللاّطِئة**: برینێك ئەوەندە قوڵ بێ بگاتە توێكڵەتەنكەی سەر ئێسقان.

لَطَثَ الشَيْئ: شتەکە خراپ بوو

لَطَثَ فلاناً: شەپلاغەی لەفلان دا.

لَطَثَ فلاناً بحجر: بەردی لەفلانکەس گرت.

لَطَثَ الأمرُ فلاناً: کارەکە لەسەر فلانکەس زۆر گران ٥ تلاطَث القَومُ: خەڵکەکە شەڕە شمشێریان کـرد ٥ بەشمـشێر لەیـەکیان دا ٥ یـان بەمستەکۆڵەو شەپازلە کەوتنەو وێزەی یەکتری ٥ تلاطَثَ الموجُ: شەپۆلەکان تێکیانەوە هاویشت ٥ المَلاَطِثُ: شوێنی جەستە کە زەبری لـێ دەدرێ‌و بـەو هۆیـەوە ئـازاری لـێ پەیـدا دەبـێ ٥ لَطْخَةٌ بكذا: ئەوەی تێهەڵسو.

لَطَخَ فلاناً بسوء: بوختـانی بـۆ فلانکـەس کـرد ٥ لَطَخْتُ فلاناً بأمر قبيح: فلانکەسم تاوانبار کرد بـەکارێکی ناشـیرین ٥ لَطْخَـةٌ: بـۆ زێـدەڕۆیی لەمانای (لَطَخَةُ)دێ ٥ تَلَطَّخَ الشَيْئ بكذا: شـتەکە بـەوە پـیس بـوو ٥ تَلَطَّـخَ فـلان بـأمر قبـيح: فلانکەس بەکارێکی ناشیرینەوە تۆمەتبار کرا ٥ اللَّطْـخُ: شـتی کـەم لەهەرشـتێك بـێ ٥ اللَّطِـخُ: خواردنی پیس (پیسخۆر) ٥ اللُّطْخَةُ: دەگـوترێ: (رجـلٌ لُطخَـةٌ): پیـاوێکی ئەحمـەق‌و گێلـە ٥ اللَّطِـيخُ: ئەحمـەق‌و گێـل ٥ اللَّطـوخ: ئـەوەی لەشتی تر هەڵدەسورێ‌و ڕەنگی دەگۆڕێ.

لَطَسَهُ لَطْساً: بەتەختە دارێکی پان لێی دا

لَطَسَ فلاناً بالحجر: بەردی بەفلان دادا.

لَطَسَ الشَيْئ: شتەکەی وردو هاڕ کرد ٥ شتەکەی پـان‌و پلـیش کـردەوە ٥ لاَطَـسَهُ: تێـی هەڵسو ٥ پێـی ڕەنـگ کـرد. ٥ المِلْطَـاسُ: کـوێن، پێـك، چەکوچـی گـەورە بـۆ شـکاندنی بـەرد ٥ بـەردی گەورە بۆ هاڕینی دانەوێڵە ٥ بەرداش.

لَطَّ الامر: خەریکی کارەکە بوو خۆی پێوە گرت.

لَطَّ بفلان: کەوتە گەڵ فلان.

لَطَّ الشَيْئ: شتەکەی شاردەوە داپۆشی.

لَطَّ الحَقَّ بالباطل: حـەق‌و بـەتاڵی تێکـەڵاو بەیـەك کرد.

لَطَّ عنه الخَبَرَ: هەواڵەی لـێ شاردەوە.

لَطَّ عليه الخَبَرَ: هەواڵەکەی لـێ شاردەوە

لَطَّ السِتْرَ أو الحِجابَ: پەردەکەی دادایەوە

لَطَّ حَقَّهُ وعن حقه: ئینکاریی مافی ئەوی کرد

لَطَّ البابَ: دەرگاکەی داخست.

لَطَّ الشَيْئ: شتەکەی پێوە لکاند.

لَطَّ فلاناً بالعصا: بەگۆچان لەفلانکەسی دا.

لَطَّ فلان: فلانکـەس دەدانـی کـەوتن ٥ أَلَـطَّ الرجـلُ: پیاوەکە توندو تیژ بوو لەکارەکەدا.

الطَّ الأمرَ عليه: کارەکەی لـێ شاردەوە ٥ أَلَطَّ القَبْرَ: گۆڕەکەی بەزەوییەوە تەخت کرد ٥ أَلَطَّ فلانـاً: یارمـەتی فلانکەسـی دا ٥ إلْتَطَّـت المـرأة: ئافرەتەکە خۆی داپۆشی ٥ الْتَطَّتِ المرأةُ بالمسك: ئافرەتەکە بۆنی میسکی لـەخۆدا ٥ تَلَطَّـطَ حَقّـهُ: ئینکاری مافی فلانی کرد ٥ دەشـگوترێ: (تَلَطّـى حَقَّـهُ): بۆئـەوەی پیتـی (ط) سـێ جـار بەپەنایەکەوە نەیەن ٥ اللاَّطّ: پیس ٥ المِلْطـاط: سەرانـسەری کێـو ٥ قـەراخی کێـو ٥ ئـاش ٥ چەقەنەی ئاش ٥ لێواری شیو ٥ قەراخ‌و دەریا ٥ یان ڕێگا بەقەراخ دەریادا ٥ بەربێلاّی خـانوو ٥ ماڵەی سواخکردن‌و گەچکاریی ٥ برینێك بگاتـە مۆخی سەر.

لَطَعَ الشَيْئ لَطْعاً: شتەکەی لستەوە

لَطَعَ الكلبُ أو الذئبُ الماءَ: سـەگەکە یـان گورگەکـە ئاوی خواردەوە.

**لَطَعَ فلاناً**: شەقی لەپاشەوەی فلانکەس هەڵدا.

**لَطَعَ فلاناً بالعصا**: بەگۆچان لەفلانکەسی دا.

**لَطَـعَ عينـه**: مستەکۆڵەی لەچاوی دا ◊ **لَطِعَـتِ الأسْنانُ لَطَعاً**: ددانەکانی داخوران.

**لَطِعَـت شـفة الزنجـي**: دیـوی نـاوەوەی لێـوی ڕەش پێستەکە (قوله ڕەشەکە) سپی دەنوێنێ.

**لَطِعَ الشَيْئَ**: شتەکە کزو لاواز بوو.

**لِطَعَ الشَيْئَ**: شتەکەی لستەوە، خواردی.

**لَطَعَ فلاناً**: شەقی لەپاشەوەی فلانکەس هەڵدا ◊ **إلْتَطَـعَ الـشَيْئَ**: شـتەکەی لـستەوە، خـواردی ◊ **اللِطْـعُ**: مەلاشو ◊ **اللُطَـعُ**: (رجـل لُطَـعٌ): پیـاوی خوێڕی **اللُطْمَةُ**: هێلکەی کرمی لۆکەیە لەسەر بـەری پەلکـە گـەلا ڕۆی دەکـا ◊ **لَطَـفَ بـه ولـه**: لەگەڵی دا هێواش‌و لەسەرە خۆ بوو.

**لَطُفَ الشَيْئُ**: شتەکە ناسک‌و جوان‌و لەسەرە خۆ بوو ◊ تـەنک‌و نـەرم بـوو پێچەوانەی ئەستورو خەسـتی ◊ **ألْطَـفَ لـه في القـول**: پرسـیاری لەسـەرەخۆی ناڕاستەکرد ◊ **ألْطَفَ فلانـاً بكـذا**: چاکەی لەگـەڵ فـلان کـرد بـەفلان کـردەوە ◊ **ألْطَـفَ الـشَيْئَ بِجنبِـه**: شـتەکەی بەتەنیـشتیەوە لکانـد ◊ **لاَطَفَـهُ**: چاکەی لەگـەڵ دا کـرد ◊ **لَطَّـفَ الكتابَ**: کتێبەکـەی سوک‌و ئاسان کـرد شوێنە گرانـەکانی ڕون کردنــەوە ◊ **تلاطَــفَ القــومُ**: خەڵکەکە چاکەیان لەگەڵ یەکتر کـرد ◊ **تلاطَـفَ القـومُ في الأمـر**: خەڵکەکـە لەکارەکـەدا لەگـەڵ یەکتر هێدی‌و لەسەرە خۆ بوون ◊ **تَلَطَّفَ للأمر**: بۆکارەکـە هێـدی‌و لەسـەرە خـۆ بـوو ◊ **تَلَطَّـفَ بفـلان**: لەگـەڵ فـلان دا بەهێـدی‌و لەسـەرەخۆ جولایەوە بۆئەوەی نهێنیەکانی لـێ دەربێنـێ ◊ **تَلَطَّـفَ فـلان**: فلانکـەس خوشوعو ترسی پێـوە دیاربوو ◊ **اسـتَلْطَفَ الـشَيْئَ**: شـتەکەی لـەخۆی نزیـك کـردەوە، بەتەنیـشتی خۆیـەوە نوسـاند ◊ **اللُطْفُ**: هێدی و هێمنی، دیاری ◊ **اللُطْفُ**: لوتـف لەلایــەن خــوداوە توفیقــدان‌و پاراســتنی بەندەکانییــەتی لەتێــشکان‌و هەڵخلیــسکان ◊ **اللُطْـفُ في العمـل**: بەهێـدی‌و لەسـەرە خـۆیی ئەنجامـدانی کـار ◊ **اللُطَفَـةُ**: دیـاری ◊ **اللَطيـف**: یەکێکـە لـەناوە جوانـەکانی پـەروەردگار ◊ **اللُطيفَـةُ**: مێینـەی (اللَطيـف) ◊ نـاوە بـۆ قـسەی ناسك‌و عەنتیکە ◊ **اللَواطِف مـن الأضـلاع**: ئـەو پەراســوانەی بــەلای ســنگەوەن ◊ **لَطَمَــهُ**: شەبلاغەی لەکوڵمی دا.

**لَطَــمَ الــشَيْئَ بالــشَيْئ**: شــتەکەی بەشــتەکەوە نووسـاند، شـتەکەی تێکـەڵاوی شـتەکە کـرد ◊ **لاطَمَـهُ ملاطمـة**: ئـەو دوکەسـە چـەپەوانەیان لەیـەکتر دا، مشتەکۆڵەیان ناڕاستەی ڕوخساری یـەکتر کـرد ◊ **لَطَّمَـهُ**: زۆری مـستەکۆڵە لێـدان ◊ **لَطَّمَ الكتاب**: کتێبەکەی تـەواو کـرد ◊ **إلتطمت الأمواج**: شـەپۆلەکان لێکیـان دا ◊ **الـتَطَمَ القـومُ**: خەڵکەکـە بەمـستەکۆڵە لێکیـان دا ◊ **تلاطمـت الامواجُ**: شـەپۆلەکان لێکیـان دا ◊ **تلاطَـمَ القـومُ**: خەڵکەکە بەمستەکۆڵە لێکیان دا ◊ **تَلَطَّـمَ وجهُـهُ**: دەم‌و چــاوی تــۆزاوی بــوون ◊ **اللَطِيــمُ**: بەمـستەکۆڵە لێـدراو ◊ کەسـێك منـداڵ بـێ‌و بـاوك‌و دایکـی بمـرن‌و هـەتیو بـێ ◊ **اللَطيمـةُ**: قوتوی میسك ◊ هەروا وشەی (اللَطيمة): ناوە بۆ کـاروانی بازرگـانی کـە بارەکانیـان میـسك‌و ئاوریـشم‌و کـاڵای لـەو جـۆرە بـێ ◊ **المُلَطَّـمُ**: خوێڕی‌و خاڵی لەڕەوشتی بەرز ◊ **المَلْطَمُ**: کوڵم، ڕومەت.

**لَطَا لَطْواً**: پەنای بردە بەر ئەشکەوت‌و بن بـەردو پەناگای کێو.

**لَطَى لَطْياً**: بەزموییەکەوە نووسا ◊ تَلَطَّى علی العدوّ: چاوەڕوانی پێشەتای دوژمنی کرد ◊ اللَّطَاةُ: زەوی ◊ شوێن ◊ ناوچاوان یان ناوەڕاستی ناوچاوان ◊ دزو جەردە کەلێتەوە نزیك بن ◊ بارگرانیو قورسایی ◊ اللَّطَاةُ: دزو جەردە کەلێت نزیك ببنەوە ◊ المِلْطی والمِلْطاء والمِلْطاةُ: ئەو پەردە تەنکەی نێوان ئێسقانی کاپێژەی سەرو گۆشتەکەیەتی.

**لَظَّ** بە: لەگەڵی کەوتو لێی جیانەبووەوە.

**لَظَّ** علیە: پێکێشی لێ کرد.

**لَظَّ** فلانٌ: فلانکەس دەری کرد ◊ اَلَظَّ بە: بەمانا (لَظَّ)دێ ◊ لەحەدیس دا هاتووە دەفەرموێ: (أَلِظُّوا بیاذاالجلال والإکرام): خۆ بەخوێندنی دوعاو پارانەوەی (یا ذاالجلال والإکرام) بگرنو هەمیشە ئەم ڕستەیە بڵێنو بڵێینەوە ◊ **أَلَظَّ بالمکان**: لەشوێنەکە جێگیر بوو ◊ (أَلَظَّ بفلان): لەگەڵ فلانکەس کەوتو لێی جیانەبوونەوە ◊ أَلَظَّ المَطَرُ: بارانەکە بەردەوام بوو ◊ **لاظَّ فی الحرب** ملاظَّةً ولظاظاً: بەردەوام بوو لەسەر شەڕو وازی لێ نەهێنا ◊ تلاظّوا فی الحرب: سوارەکان یەکتریان ڕاونا یەکتریان هێناو برد ◊ تَلَظْظَتِ الحیّةُ: مارەکە لەبەر زۆر ڕق هەڵسانی سەری خۆی بادا ◊ اللِّظُّ: پیاوی وشکە تەبیاتو توندڕەو ◊ المِلْظَاظُ: بەمانا (المِلْحَاحُ)دێ ◊ واتە کەسێك زۆر پێکێشیو ئیلحاح بکا بۆ شت ◊ المِلَظُّ: تەنگە تاو ◊ المُلِظَّةُ: نامەی پێکێشیو زۆر ئیلحاح تێداکردن ◊ لَظْلَظَتِ الحیّةُ رأسها: مارەکە لەڕق هەڵساویو توڕەیی زۆر سەری هەڵسوڕاند ◊ تَلَظْلَظَتِ الحیّةُ رأسَها: مارەکە لەڕق هەڵساوی خۆی سەری هەڵسوڕاند ◊ اللَّظْلاظُ: پیاوی توند تەبیاتو توند ڕەو ◊ زمان ڕەوانو قسەزان ◊ لَظَیَت النارُ: ئاگرەکە بڵێسەی دا ◊ لَظِیَ النارَ: ئاگرەکەی هەڵگیرساند ◊ إلتظّ فلان: فلانکەس ڕقی هەڵساو وەکوو پشکۆ ئاگر سور هەڵگەڕا ◊ تَلَظَّتِ النارُ: ئاگرەکە هەڵگیرسا بڵێسەی کرد ◊ اللَّظَی: بڵێسەی ئاگر بەبێ دوکەڵ.

**لَظَى**: ناوێکە لەناوەکانی دۆزەخو (دو بزوێنی ناچنە سەر) هەمیشە دەبێ بێ تەنوین بێ.

**لَعَبَ الصَّبِيّ لَعْباً**: منداڵەکە لیك لەدەمی هاتە خوار.

**لَعِبَ لَعِباً ولِعْباً**: منداڵەکە یاری کرد.

**لَعِبَ بالشَّيءِ**: یاری بەشتەکە کرد.

**لَعِبَ في الدين**: ئایینی کردە گاڵتەو گرنگی پێ نەدا ◊ لَعِبَتِ الریحُ بالمنزل: ڕەشەباکە مەنزڵو نشینگەکەی سڕیەوە ◊ کوێری کردەوەو ئاسەواری نەهێشت ◊ ألعَبَ الصَّبِيَ: منداڵەکەی والێ کرد یاری بکا ◊ لاعَبَهُ مُلاعَبَةً ولِعاباً: یاری لەگەڵ دا کرد ◊ لَعَّبَ الرَّجُلُ: بەمانا (لَعِبَ)دێ ◊ لَعَّبَ القِرْدَ: یاری بەمەیمونەکە کرد ◊ هەڵی پەڕاند ◊ تَلَعَّبَ فلان: فلانکەس جار دواجار یاری کرد ◊ الأُلْعُبان: کەسێك زۆر یاریی بکا ◊ فێڵ زانو بەپێچو پەنا ◊ الأُلْعُوبَةُ: یاریی ◊ اللُّعَابُ: تف ◊ (لعاب النحل): هەنگوینی هەنگ ◊ (لُعابُ الحَیَّةِ): ژەهری مار ◊ اللُّعْبَةُ: هەرشتێك یاریی پێ بکرێ ◊ نەحمەقو گێل کە گاڵتەچی کەسانی دیکەبێ ◊ نۆرە یاریی ◊ اللُّعَبَةُ: کەسێك زۆر یاریی بکا ◊ اللُّعّابُ: بەمانا (اللُّعْبَةُ)دێ ◊ هەر ئاژەڵو گیانلەبەرێك پیشەی هەڵپەڕینو سەمابێ وەکوو مەیمون ◊ اللَّعُوبُ (إمرأة لَعُوب): ئافرەتێکی دەلالو لارو لەنجەکەرو سوعبەتچییە ◊ المُلاعِبُ: (ملاعب ظلە): باڵندەیەکە لەسارا یاریی لەگەڵ سێبەری خۆی

دەکا ◊ اَلْمَلْعَبُ: یاریگا ◊ ملاعِب الریاح: ئەو شوێنانەی بایان لێوە دێ ◊ المِلْعَبَةُ: کراسی بێقۆڵ منداڵ یاری پێوە دەکا ◊ (فانیلەو شۆرت).

**لَعْثَمَ** في الأمر: لەکارەکە وەستا ◊ هەڵوێستەی لەسەرکردو لێی وردبۆوە ◊ بەهێواشی ئەنجامی دا.

**لَعَجَ** الضربُ فلاناً: لێدانەکە ئازاری بەفلانکەس گەیاند ◊ پێستی سوتاند.

**لَعَجَ** الحُبُّ والشوقُ فؤادَه: سۆزو دڵداری دڵی فلانکەسی پرژاند.

**لَعَجَ** الهَمُّ في الصدر: خەم لەدەروونی دا تێکیانەوە هاویشت ◊ **العَجَ النارَ في الحَطَبِ**: ئاگری لەدارەکان بەرْدا ◊ **لاَعِجَةُ الأمْرِ**: کارەکەی لەسەر قورس بوو ◊ توشی دڵەڕاوکێی کرد ◊ **العَجَ الرجلُ**: پیاوەکە بەهۆی خەمو خەفەتەوە نەخۆش کەوت ◊ **اللاّعِجُ**: عیشقو سۆزی سوتێنەری ناو دەروون ◊ **لَعَسَهُ لَعْساً**: گەستی ◊ **لَعِسَت الشَفَةُ**: لێوەکە دیوی ناوەوەی ڕەش هەڵگەڕا بوو ◊ **لَعِسَت النَباةُ**: گیاو گژەکە پڕو چڕ بووتێکهاڵاو بەهۆی تیر ئاوییەو ڕەش هەڵگەڕا ◊ **تَلَعَّسَ فلان**: فلانکەس خواردنی خێرا خێراو بەهەڵپە بوو ◊ **اللَّعَسُ**: ڕەشییەکە بەدیوی ناوەوەی لێومیەوەیە ◊ **اللُّعْسَة**: ڕەنگی ڕەش ◊ دەگوترێ: (في شَفَتَيْها لُعْسَةٌ): دیوی ناوەوەی لێوی ڕەشایی هەیە ◊ **اللَّعُوسُ**: دەگوترێ: (ماذقتُ لَعُوساً): هیچ شتێکم نەچەشتووە ◊ **اللَّعْوَسُ**: زۆر خۆرو چڵێس، هەڵپەکەر ◊ **المَلْعوسُ**: (لَحْمٌ مَلْعوسٌ): گۆشتی سوری نەکوڵاو.

**لَعَصَ** علينا: شتەکەی گرانو ئەستەم کرد لەسەرمان ◊ **تَلَعَّصَ**: بەمانا (لَعِصَ)دێ ◊ **لَعَطَهُ بالنار**: پانەو یان ملی داخ کرد

**لَعَطَ** فلاناً بحقه: مافی فلانی پاش خست ◊ **مَرَّ لاعِطاً**: ڕوێی بەشێوەی دزە هەڵوێستو خۆی خستە پەنا دیوار یان پەناکێو ◊ **الْعَطَ فلان**: فلانکەس بەبناری کێومکەدا ڕوێی ◊ **اللُّعْطُ**: تاکی (الألْعاط) کە بریتییە لەو هێڵانەی حەبەشەییەکان لەسەر ڕوخساری خۆیان دروستی دەکەن ◊ **اللُّعْطُ**: شوێنی بناغەی خانوو یان بناری کێو ◊ **اللُّعْطاءُ**: مەڕێك کە دەوران دەوری ملی ڕەش بێو باقی جەستەی سپی بێ ◊ **اللُّعْطَةُ**: ڕەشایی کە سوری تێکەڵ بووبێ.

**لَعْ**: وشەیەکە ناڕاستەی مرۆڤی هەڵەنگوتو دەکرێ ◊ **اَلْعَتِ الأرضُ**: زەوییەکە ڕوەکی هیندوبای رواند ◊ **تَلَعَى العَسَلُ**: هەنگوینە کە پارچەیەکی لێ هەڵدەبری لەبەر لینجییەکەی شۆڕابەکەی درێژ دەبێتەوەو لێك نابێتەوە ◊ (تَلَعَى اللُّعاعَ): هیندوبای خوارد ◊ **اللُّعَاعَةُ**: تاکی (اللُّعاع)ە ◊ لەحەدیس دا هاتووە (إنما الدنيا ساعة، ومتاعها لُعاعة): دونیا ساتێکەو کاڵاکانی تەمەن کورتنو وەکوو ڕوەکی هیندوبا وایە ◊ **اللُّعَاعَةُ**: کەسێك بەنەزانی لەحن دا دادەنێ بۆ گۆرانی ◊ **اللَّعَّةُ**: ئافرەتی خانو مانی داوێنپاکی ناسكو جوانو قسە خۆش.

**لَعِقَ** العَسَلَ: هەنگوینەکەی لستەوە.

لَعُوق في عمله: لەکارەکەی دا پەلەی کردو گورجو گۆڵ بوو ◊ **اَلْعَقَهُ العَسَلَ**: وای لێ کرد هەنگوینەکە بلێسێتەوە ◊ **اَلْعَقَ النَّسَّاجُ**: جۆلاکە ریسەکەی خاو ڕست زۆری گشت نەڕست ◊ **لَعْقَةُ العَسَلَ**: بەمانا (الْعَقَهُ)دێ ◊ **التَّعِقَ لَوْنُهُ**: ڕەنگی

گۆڕا ◊ **اللُّعَاقُ**: پاشماوەی خواردن لەدەمی خۆراك خۆرەکەدا ◊ **اللَّعْقَةُ**: دەگوترێ: (في الأرض لعقة من ربيع): لەزەوی دا کەمێك تەڕایی هەیە ◊ **اللُّعْقَةُ**: شتی کەم بەئەندازەی پێوانەی کەوچکێك یان لویچێك ◊ **اللَّعْوَقُ**: مرۆڤی کەم عەقڵ، عەقڵ سوك ◊ **اللَّعُوقُ**: هەرشتێك هەڵقوڕێندرێ، بخورێتەوە ◊ **المِلْعَقَةُ**: ئامێرێکە خواردنی پێ دەکرێتە ناو دەم (کەوچك) ◊ **لَعَلَّ**: پیتێکە لەو پیتانەی پێیان دەگوترێ (حرف مشبه بالفعل) بۆ ڕەجاو تەمەنناو مانای تریش دێ ◊ **لَعْلَعَ السَّرابُ**: تراویلکەکە درەوشایەوە ◊ **لَعْلَعَ الرعدُ**: هەور گوڵاندی ◊ **لَعْلَعَ فلان من كل شيئ**: فلانکەس لەهەموو شتێك دەرەنجێ ◊ **لَعْلَعَ العَظْمَ**: ئێسقانەکەی شکاند ◊ **تَلَعْلَعَ من الجوع**: لەبرسان سکی قوڕە قوڕی دێ.

**تَلَعْلَعَ في كلأ ضعيف**: حوشترەکە لەلەوەڕگای کەم لەوەڕدا سەرە خولەی بوو، بۆئەوەی شتێکی دەست بکەوێ ◊ **تَلَعْلَعَ السرابُ**: تراویلکەکە درەوشایەوە ◊ **تَلَعْلَعَ الكَلْبُ**: سەگەکە لەتینوان زمانی دەرکێشا ◊ **تَلَعْلَعَ العسلُ**: هەنگوینەکە بەهۆی لینجییەوە کەپارچەیەکی لێ هەڵگرت درێژ بۆوەو لێك نەپچڕا ◊ **اللَّعْلاَعُ**: ترسنۆك ◊ **اللَّعْلَعُ**: تراویلکە ◊ گورگ ◊ درەختێکی وڵاتی حیجازە ◊ **اللُّعْلَعَةُ من السراب**: بریسکەی تراویلکە ◊ **لَعْمَظَ اللَّحْمَ**: گۆشتەکەی لەئێسقانەکە بەددانی پێشەوەی پچڕی ◊ **لَعْمَظَ فلان**: فلانکەس چڵێسو خۆرا بوو ◊ **اللَّعْمَاظُ**: کەسێك هەواڵی بێ بناغەو ناڕاستت پێ بڵێ ◊ **اللَّعْمَظُ**: چڵێسو بەهەڵپە بۆ خواردن ◊ **لَعَنَه الله**: خودا لەڕەحمەتی خۆی نائومێدی کرد

**لَعَنَ فلاناً**: فلانکەسی ڕیسوا کرد ◊ **لاعَنَ الرجل زوجته ملاعنة ولعاناً**: پیاوەکە خۆی لەسزای بوختانکردنی بەژنەکەی ڕزگار کرد بەهۆی لیعانەوە ◊ **لاعَنَ الحاكم بينهما**: دادوەر بڕیاری لیعانی دا لەنێوان ژنو مێردەکەدا ◊ **لَعَّنَهُ**: زۆری لەعنەت لێ کرد.

**اِلْتَعَنَ القومُ**: خەڵکەکە هەندێکیان لەعنەتیان لەهەندێکیان کرد ◊ **اِلْتَعَنَ فلان**: فلانکەس لەعنەتی لەخۆی کرد ◊ **تلاعنا**: دو مرۆڤەکە هەریەکەیان لەعنەتی لەوی تریان کرد ◊ **تلاعن القومُ**: خەڵکەکە تفو لەعنەتی یەکتریان کرد ◊ **تلاعن الزوجان**: ژنو مێردەکە بەشێوە لیعان ڕاستی داوای خۆیان چەسپاندو داوای ئەوی تری ڕەت کردەوە ◊ **تَلَعَّنَ القَوْمُ**: خەڵکەکە یەکتریان تفو لەعنەت کرد ◊ **اللاَّعِنُ**: دەگوترێ: (أمر لاعِن): ئەمە کارێکە نەفرین ئامێزە دەبێتە هۆی نەفرین کردن ◊ **اللِّعَانُ**: لەشەریعەتی ئیسلام دا ئەوەیە مێرد چوار جار سوێند بخوا کە ڕاستگۆیە لەوەدا کەدەڵێ ژنەکەم داوێن پیسی کردوەو جاری پێنجەم بڵێ نەفرینی خودا لەسەرم بێ ئەگەر درۆبکەم ئەمجا ژنەکە ڕەدی بداتەوەو چوار جار سوێند بخوا کە مێردەکەی بوختانی بۆدەکاو ڕاست ناکا لەداواکەی دا جاری پێنجەم بڵێ نەفرینی خودام لەسەر بێ ئەگەر مێردەکەم ڕاست بکا، بەمەش ژنەکە سزای داوێن پیسی لەسەر لادەدرێو بۆ هەتا هەتایە ئەم ژنو مێردە لەیەکتر حەرام دەبن ◊ **اللَّعْنُ**: (أبيتَ اللَّعْنَ): وشەیەکە کاتی خۆی عەرەب بۆ سڵاو کردن لەپاشاو سەرەك خێڵەکانیان بەکاریان هێناوە ◊ **اللَّعْنَةُ**: بەمانا سزا دێ ◊ دەگوترێ: (أصابته لعنة من السماء): سزای ئاسمان لێی دا ◊ **اللُّعْنَةُ**:

کەسێك ئەوەندە خراپو شەڕانی بێ خەڵك تفو لەعنەتی بکا ٥ **اللَّعِينُ**: شەیتان، نەفرین لێکراو ٥ داوەڵ؛ کەلەناو باخو کشتوکاڵدا هەڵدەدرێ ٥ **المَلْعَنَةُ**: کارێك ببێتە هۆکاری نەفرین کردن لەبکەرەکەی ٥ **أَلْعَى ثدي الأنثى**: مەمکی مێینەکە گۆڕانی بەسەردا هات گەورە بوون شیریان تێدا پەیدابوو ٥ **الأَلْعَاءُ**: جومگەی قامکەکان ٥ **اللاّعِي**: ئەوکەسەی لەهەموو شتێك دەترسێ ٥ **اللاّعِيَةُ**: درەختۆکێکە لەبناری کێودا دەڕوێ گوڵێکی زەردی هەیە ٥ **اللَّعَا**: چڵێسو بەچەپو گوپ ٥ **اللَّعْوُ**: بەدڕەوشت ٥ چڵێسی بەچەپو گوپ ٥ **اللَّعْوَةُ**: سەگ، چڵێسو بەچەپو گوپ ٥ ڕەشایی دەورو بەری گۆی مەمکی ئافرەت ٥ **لَعْوَةُ الجوع**: برسیایەتی زۆر کوشندە. ٥ **كَلْبَةٌ لَعْوَةٌ**: سەگێکە شەڕ لەسەر لاك دەکا ٥ **لَعْوَق**: بڕوانە مادەی (لَعَقَ) ٥ **اللَّعْوَقُ**: بڕوانە مادەی (لَعَقَ).

**لَغَبَ فلان**: فلانکەس ماندوبوو.

**لَغَبَ على القوم**: خەڵکەکەی تێك بەردا ومزعی شێواندن.

**لَغَبَ القومَ**: قسەی ناڕاستی بۆ خەڵکەکە گێڕایەوە.

**لَغِبَ لَغباً**: ماندوو بوو ٥ **أَلْغَبَهُ**: ماندوی کرد ٥ (أَلْغَبَه السَّيْرُ): ڕۆیشتن ولاخەکەی ماندو کرد ٥ **لَغَّبَتْهُ السَّيْرُ**: ڕۆیشتن ماندوی کرد ٥ **لَغَّبَ الحيوانَ**: ئاژەڵەکەی ڕەتاندو دوری خستەوە تا ماندوی کرد ٥ **لَغَّبَ الأَمْرَ**: سەروکاری ئیشەکەی کردو باش ئەنجامی دا ٥ **اللَّغْبُ**: قسەی پڕو پوچو بێ بنەما ٥ **اللَّغوبُ**: مرۆڤی گێلو نەفامو بێ دەسەڵات ٥ **لَغَدَهُ لَغْداً**: زمانە بچکۆلەی هەنگاوت.

**لَغَدَ فلاناً عن حاجته**: فلانکەسی لەپێداویستییەکانی مەنع کرد.

**لَغَدَ أُذُنَهُ**: گوێچکەی ڕاکێشا بۆئەوەی ڕێك بن ٥ **لاغَدَهُ**: دەستی گرتو نەیهێشت بەئامانجی خۆی بگا ٥ **إلْتَغَدَهُ**: بەمانا (لاغَدَهُ)دێ ٥ **تَلَغَّدَ فلان**: فلانکەس رقی هەڵسا ٥ **اللُّغْدُ**: گۆشتوکەی نێوان مەلاشوو لامل.

**لَغَزَ اليربوع أجحارَهُ لَغزاً**: یەربوعەکە کونەکەی پێچاو پێچ هەڵکۆڵی بۆئەوەی کەدەرپەندیەکی دژی خۆی هێرشی کردەسەر لەلانەکەی دا بتوانێ خۆی رزگار بکا.

**لَغَزَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لەڕوخساری خۆی گۆڕی ٥ **أَلْغَزَ اليربوعُ أجحارَهُ**: بەمانا (لغزها)دێ ٥ **أَلْغَزَ كلامَهُ وفيه**: قسەکەی خۆی پێچاو پێچ کرد ٥ **أَلْغَزَ في يمينه**: لەسوێند خواردنەکەی فێڵی کرد، لەسەر شتێك سوێندی خواردو مەبەستی شتێکی تر بوو ٥ **لاغَزَهُ**: قسەی بەتوێکڵو موعەممای لەگەڵ دا کرد ٥ **لَغَّزَ كلامَهُ**: بەمانا (أَلْغَزَهُ)دێ ٥ (لَغَّزَ في يمينه): لە سوێند خواردنەکەی فێڵی لەکابرای سوێند بۆخوراو کرد ٥ **الأُلْغُوزَةُ**: مەتەڵو موعەمما ٥ **اللُّغَزُ**: کونە زیشك، کونە مشك، کونە یەربوع ٥ مەتەڵو قسەی موعەمما ٥ **اللُّغَّازُ**: ئەوکەسەیە بەخراپە لەخەڵك دەدوێ ٥ **لَغْوَسَ في الأكل**: پەلە پەلی کرد لەخواردن دا ٥ **لَغْوَسَ الطعامُ**: خواردنەکە کاڵو نەکوڵیو بوو پێنەگەیشتبوو ٥ **اللَّغْوَسُ**: کەسێکە خێرا نان بخوا پەلە پەل بکا لەخواردن دا.

**لَغَطَ القومُ لَغطاً ولغاطاً**: خەڵکەکە کردیانە هاتو هاوارو قیڕەو هەرا.

**لَغَطَ** القط أو الحمامُ لغيطاً: كوڕ كوڕەكە (قەتێكە) یان كۆترەكە خوێندی ◊ **ألْغَطَ القومُ**: خەڵكەكە هاتو هاوارو قیڕەو هەرایان كرد ◊ **ألْغَطَ القطا أو الحمام**: قەتێكە یان كۆترەكە خوێندی ◊ **لَغَّطَ القومُ**: خەڵكەكە هاتو هاواریان كرد ◊ **اللَّغطُ**: دەنگە دەنگو قیڕەو هەرا.

**لَغَفَ** فلان لَغفاً: فلانكەس ستەمی كرد ◊ چاوی تێ بڕی.◊ **لَغَفَ الإناءَ**: قاپەكەی لستەوە.

**لَغِفَ** ما في الإناء: ئەوەی لەقاپەكەدا بوو لستیەوە.

**لَغِفَ** الطعامَ: خواردنەكەی خێرا خوارد ◊ **الْغَفَ** فلان: بەمانا (لَغَفَ فلان)دێ ◊ **الْغَفَ في السَّيرِ**: لەڕۆیشتن دا پەلەی كرد ◊ بوو بە شەریكە دز ◊ **ألْغَفَ بعينه**: چاوی تێ بڕی ◊ **ألْغَفَ على الرجل**: زۆری قسەی ناشیرین بەپیاوەكە گوت ◊ **ألْغَفَ الصَّبِيُّ لُغَمَةً**: پارویەكی خستە دەمی منداڵەكەوە ◊ **لاغَفَهُ**: هاوڕێیەتی ئەوی كرد ◊ **لاغَفَ المرأةَ**: ئافرەتەكەی ماچ كرد ◊ **تَلَغَّفَ الطعامَ**: بەچنگ خواردنی كردە دەمیەوە ◊ **اللُّغفَةُ**: پارو ◊ **اللَّغيفُ**: تایبەتمەندیی پیاوو دەستو پێوەندەكانی ◊ **اللَّغيفةُ**: پەڵو، حەڵوا، ئاردو ڕۆن تێكەڵ بەیەك بكرێو بكوڵێندرێ ◊ **المُلغفَةُ**: هۆزو بنەماڵەیەك دابو نەریتی دزییان تێدا باو بێ ◊ **لَغْلَغَ طعامَهُ**: خواردنەكەی كردە خواردنی بەپێخۆر ◊ نانی بەڕۆنو پیو و شتی وا خوارد ◊ **اللَّغْلَغَةُ**: ئاخاوتنی ناعەرەبێ قسەو ئاخاوتنێك بەزوبانی عەرەبی نەبێ.

**لَغَمَ** فلان لَغماً: هەواڵی ناڕاستی دا بە هەڤاڵەكەی.

**لَغَمَ** المرأةَ: دەمی ئافرەتەكەی ماچ كرد، دەورو بەری دەمی ماچ كرد.

**لَغَمَ** الجملُ لُغامَهُ: حوشترەكە كەفی چاند.

**لَغَمَ** فلان لَغماً: هەواڵی لەشتێك دا كەلێی دڵنیا نەبوو.

**لُغِمَ** بالطيب: بۆنی خۆشی لەدەمو لێوی دا ◊ **ألْغَمَ الذهبَ وما شابَهه**: جیوەو شتی وای تێكەڵ بەئاڵتونەكە كرد ◊ **لَغَّمَهُ بالطيب ونحوه**: بۆنی خۆشی لەدەمو لوتی دا ◊ **لَغَّمَ المكانَ**: شوێنەكەی مین ڕێژ كرد ◊ **تَلَغَّمَ القوم بالكلام**: خەڵكەكە كەوتنە قسەو باسو دەم بادان ◊ **اللُّغام**: كەفی دەمی حوشتر ◊ **اللَّغْمُ**: بۆنی كەم، بۆنی خۆشی كەمو كوڕ ◊ قەصەبەی زوبان ◊ دەماری زوبان ◊ لەرزینی بەتەوژم ◊ شتێكە وەكوو صندوق وایە مادەی تەقینەوەی تێدەكرێو ژێرخاك دەكرێ بۆئەوەی كەسێك بەسەریدا بڕوا بتەقێتەوە ◊ **اللَّغيمُ**: نهێنی ◊ **المَلْغَمُ**: دەمو لوتو دەوروبەری ◊ **إلْغانَّ النَّبْتُ**: ڕوەكەكە درێژ بوو تێكهالا ◊ **الغانَّت الأرض**: زەوی لەوەڕی زۆر بوو ◊ **اللَّغَنُ**: هەڕمتی گەنجی ◊ **اللُّغنُ**: لایەكی ئاڵو كەبەسەر گەرودا دەڕوانێ ◊ **اللَّغْنُونُ**: بەمانا (اللُّغَنُ)دێ ◊ كۆتایی لوت نزیك مەڵاشو.

**لَغَا** في القول لَغواً: لەقسەكردن دا هەڵەی كرد ◊ دەگوترێ: (لغا فلان لغواً) فلانكەس قسەی پڕو پوچی كردن.

**لغا** عَنْ الصواب: لەڕێگای ڕاست لای دا.

**لغا** عَنْ الطريق: لەڕێگە لای دا.

**لَغَا** الشَّيْئُ: شتەكە پوچ بوو.

**لَغِيَ** في القولِ لغاً: بەمانا (لغا)دێ.

**لَغِيَ** بالأمر: حەزی لەئیشەكە بوو.

**لَغِيَ** بالشَّيْئِ: وەگری شتەكە بوو پێوە لكا

**لَغِيَ** بالماء والشراب: زۆری خواردو خواردەوە تینوایەتی نەشكا، تێراو نەبوو.

**لَغِيَ** الطائر بصوته: بالنده‌كه خوێندی ◊ **ألغی الشَّيْءَ**: شته‌كه‌ی پوچ كردەوه ◊ **الإلغاء في النحو**: ئه‌وه‌یه عه‌مه‌لی عامیل لەئه‌فعال القلوب دا پوچ بكه‌یه‌وه دو مه‌فعوله‌كانی مه‌نصوب نه‌كرێن، بۆ نمونه له‌جیاتی ئه‌وه‌ی بڵێی (علمت العلمَ نافعاً) بڵێی (العِلْمُ نافع علمت) ◊ **اللاَغِيَة**: شتێك گرنگی پێ نه‌درێ‌و سودی لێ نه‌بیندرێ ◊ **اللَّغا**: شتێك كه ئیعتباری پێ نه‌كرێ ◊ **اللُّغة**: زمان‌و زاراوه كه گه‌لو نه‌ته‌وه‌یه‌ك مه‌به‌سته‌كانی خۆی پێ ده‌ردەبڕێ ◊ **اللَّغْو**: قسه‌یه‌ك بڕوای پێ نه‌كرێ ◊ **لَغْوَسَ**: بڕوانه (لَغَسَ). ◊ **لَفَأَ** العودَ: شوركه‌كه‌ی سپی كرد.

**لَفَأَ** اللَّحْمَ عَنْ العظم: گۆشتی له‌ئێسقانه‌كه داماڵی ◊ **لَفأت الريحُ السحاب عَنْ وجه السماء**: ڕه‌شه‌با هه‌وری به ئاسمانه‌وه نه‌هێشت هه‌مووی ڕاماڵی

**لَفَأَ** فلاناً: غه‌یبه‌تی فلاَنكه‌سی كرد.

**لَفَأَ** فلاناً حقه: مافی فلاَنكه‌سی دا

**لَفَأَ** فلاناً بالعصا: به‌گۆچان له‌فلاَنكه‌سی دا.

**لَفِيَ** الشَّيْءُ لَفَاً: شته‌كه مایه‌وه ◊ **ألفا الشَّيْءَ**: شته‌كه‌ی هێشته‌وه ◊ **إلْتَفَا العودَ**: شوركه دارەكه‌ی سپی كرد ◊ **اللَّفاءُ**: شتی كه‌م ◊ **اللَّفاةُ**: پارچه گۆشت ◊ **اللَّفيئة**: نه‌رمه گۆشت به‌بێ ئێسقان.

**لَفَتَ** الشَّيْءَ لَفْتاً: شته‌كه‌ی لول دا به‌ڕاست‌و چه‌پ دا بای دا به‌م لاو به‌ولای دادا.

**لفت** فلاناً عَنْ الشَّيْءِ: فلاَنكه‌سی له‌شته‌كه لادا.

**لفت** رداءهُ عُنُقَه: چاكی عه‌باكه‌ی هه‌ڵدایه‌و بۆسه‌ر شان‌و ملی.

**لَفَتَ** الكلامَ: قسه‌كه‌ی له‌زمانی عه‌ره‌بی لادا بۆسه‌ر زمانی ناعه‌ره‌بی.

**لَفَتَ** الشَّيْءَ: شته‌كه‌ی تێك هه‌ڵدا وه‌كوو چۆن ئاردو ڕۆن تێك هه‌ڵده‌درێ.

**لَفَتَ** الراعي الماشية: شوانه‌كه كوێرانه له‌ئاژه‌ڵه‌كانی داو لێدانه‌كه‌ی ئاڕاسته‌ی ئاژه‌ڵێكی تایبه‌تی نه‌كرد ◊ زه‌بره‌كه‌ی هاویشت بۆ هه‌موانیان‌و مه‌به‌ستی نه‌بوو ڕێی كامه‌یان ده‌كه‌وێ.

**لَفَتَ** الريش على السهم: په‌ڕه‌كه‌ی كێزری له‌تیره‌كه شه‌ته‌ك دا.

**لَفَتَ** الكلامَ: قسه‌ی فڕێ داو مه‌به‌ستی نه‌بوو كێ ده‌گرێته‌وه

**لَفَتَ** اللحاءَ عَنْ العود: توێكڵه‌كه‌ی له‌شوركه‌كه كردەوه.

**لَفَتَ** الشَّيْءَ: شته‌كه‌ی فڕێ دایه ته‌نیشتی خۆی.

**لَفَتَ** فلاناً بالشَّيْءِ: شته‌كه‌ی ڕادەستی فلاَن كرد.

**لَفِتَ** الرجلُ: پیاوەكه گێل‌و ئه‌حمه‌ق بوو ◊ به‌ده‌ستی چه‌پی كاری كرد نه‌ك به‌ده‌ستی ڕاستی ◊ پیاوەكه ده‌ست‌و مه‌چه‌كی به‌هێزو پته‌و بون ده‌ستی بگاته هه‌رشتێك بای ده‌داو خواری ده‌كاته‌وه.

**لَفِتَ** التيسُ: نێریه قه‌ره‌كه شاخه‌كانی خوارو خێچ بون ◊ **لَفَّتَ الشَّيْءَ**: شته‌كه‌ی خوار كردەوه ◊ **إلْتَفَتَ الى الشَّيْءِ**: ڕوی وه‌رگێڕا بۆلای شته‌كه ◊ **إلتَفت عنه**: ڕوی لێ وه‌رگێڕا ◊ **تَلَفَّت الى الشَّيْءِ**: به‌مانا (إلتفت)دێ ◊ **اللاَّفِتة**: دروشم، له‌وحه‌یه‌كه له‌دار یان شتی تر یان پارچه قوماشێكه ناوێك یان هه‌ڵوێستێكی له‌سه‌ر ده‌نووسرێ بۆئه‌وه‌ی سه‌رنجی لێ بدرێ ◊ **اللَّفْتُ**: ڕوه‌كێكی كشتوكاڵییه، به‌كاڵی‌و به‌كوڵاوی ده‌خورێ ◊ قه‌راخ‌و ته‌نیشتی شت ◊ **اللَّفوت من النساء**: ئافره‌تێك زۆر به‌ملاو

دڵداری دڵی برژاند ◊ **إلتاعَ فؤاده**: دڵی بەهۆی عیشق و دڵدارییەوە برژا ◊ **اللاَّعَةُ**: ئەو سۆزو ئەوینەیە کە مرۆڤ بەرامبەر منداڵ و کەس و کاری خۆی هەیەتی ◊ **اللوعـةُ**: ئازارو هەڵقرچان و سوتاوییەکە مرۆڤ لەناکامی خۆشەویستی یان خەم و خەفەت و شتی وا لەناخی دا هەستی پێ دەکا ◊ رەشایی دەوری گۆی مەمك.

**لاف** الطعامَ لَوْفاً: خواردنەکەی خوارد، ◊ یان خواردنەکەی جو ◊ **لافت الدّابةُ الكلأ**: ولاخەکە لەوەڕەکەی بەوشکی خوارد ◊ **اللُّوفُ**: روەکێکە بەدارو دیوار هەڵدەگەڕێ و لەلق و پۆپی شت دەهاڵێ چەند جۆرێکی هەیە خۆڕسك و روێندراو ◊ **اللُّوفَةُ**: لەلەوەڕی ئاژەڵ و خواردنی مرۆڤ بەو جۆرەیان دەگوترێ: کەناخۆشەو حەزی لێ ناکرێ ◊ **اللَّوَّافُ**: تەونکەر ئەوکەسەی مافورو بەرەو قاڵی تەون دەکا ◊ **اللِّيفُ**: وشکە لەوەڕ ◊ **المَلُوفُ**: دەگوترێ: (كـلأ ملـوف) لەوەڕێکە باران شۆر بۆوە.

**لاقَ** الشَّيْءَ لَوْقاً: شتەکەی نەرم کرد ◊ **هو لا يَلُوقُ عندك**: ئەو لای تۆ داناسەکنێ و جێگیر نابێ.

**لَـوِقَ**: ئەحمەق و گێل بوو ◊ **لَـوَّقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی نەرم کردەوە ◊ **لَـوَّقَ الطعامَ**: خواردنەکەی بەرۆن چاك کرد ◊ **اللُّـوقُ**: هەرشتێك نەرم کرابێتەوە لەخواردن و شتی وا ◊ **اللَّوْقَةُ**: سەعات.

**اللُّوَقَةُ**: رونەکەرە ◊ رۆنەکەرەو خورما ◊ **لاکە لوکاً**: شتەکەی لەدەمی دا هێناو بردو جوی.

**لاك** اللُّقمةَ: پاروەکەی جو.

**لاك** الفرسُ اللِّجامَ: ئەسپەکە لغاوەکەی گەست، جوی.

**لولا**: پیتێکە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە فلان شت نابێ لەبەر بوونی فلان شت ◊ **اللُّولَبُ**: ئاوی زۆر کەبەفیچقەو تەوژم لەزارکی گۆزەو بۆری و شتی واوە دێتە دەر.

**اللَّولَبِيُّ**: ئەو شتەیە لەسەر شێوەی لەولەب بێ ◊ دەگوترێ: (سلم لولبي) پەیژەو قالدرمەیەکی حەلەزۆنییە ◊ **الحركة اللَّولَبيّة**: سوارنەوەی قەبارەیەکە بەدەوری سەنتەرێکی چەسپاودا وێڕای جوڵەیەکی گواسراوە بەرەو ئەوسەنتەرە ◊ **لامَهُ على كذا**: سەرزەنشتی کرد.

**لِـيمَ** بالرجل: لەمبەر خرایە نێوان پیاوەکەو مەبەستەکەی ◊ **ألام فلان**: فلانکەس کارێکی کرد سەرزەنشتی بکرێ ◊ یان فلانکەس بوو بەلۆمەکار ◊ **ألام فلاناً**: سەرزەنشتی فلانکەسی کرد ◊ **لاومَهُ**: هەریەك لەوانە سەرزەنشتی ئەوی تریانی کرد ◊ **لَوَّمَهُ**: زۆری سەرزەنشت کرد ◊ **إلتامَ**: قبوڵی سەرزەنشتی کرد ◊ **تَلاوَموا**: خەڵکەکە هەریەکەیان لەئاستی خۆیەوە لۆمەی ئەوی تری کرد ◊ **تَلَوَّمَ على الأمر**: لەسەرکارەکە مایەوە ◊ هەڵوێستەی لەسەر کارەکە کرد ◊ **إستلام**: شیاوی لۆمەکردن بوو ◊ **إستلام الى ضيفه**: باش خزمەتی میوانەکەی نەکرد ◊ **اللائمة**: سەرزەنشتکار ◊ **اللاَّمُ**: دەنگێکە لەدەنگەکانی هیجا واتە پیتی (لام) ◊ بەهێزو پتەو لەهەر شتێك بێ ◊ کارەسات و بەلا ◊ کەسایەتی مرۆڤ ◊ **اللاّمة**: بەلاو کارەسات ◊ کارێك جێگای سەرزەنشت بێ ◊ **اللَّوامَةُ**: پێداویستی ◊ **اللَّوْمُ**: بەلاو چورتم ◊ **اللَّومى واللوماء**: ئافرەتی سەرزەنشتکار ◊ **اللَّوْمة**: هەڵە ◊ دەگوترێ: (جـاء بلومـة) تاوانی ئەنجام دا ◊ **اللُّوَمَةُ**: (رجلٌ لُوَمة) پیاوێکە زۆر سەرزەنشت دەکرێ ◊ **المُتَلَوِّم**: کەسێك خۆ بخاتە حاڵەتێکەوە

لۆمە بکرێ ◊ کەسێك چاوەڕوان بێ کاری بۆ جێبەجێ بکرێ ◊ المَلامُ والمَلامَةُ: سەرزەنشت ◊ لَوْمــا: وشـەیەکە وەکـوو وشـەی (لـولا)وایـە دەچـێتە سـەر ڕسـتەی ئیـسمیو فیعلـی ئـەوە دەگەیەنێ کە ڕستەی دووەم نابێ لەبەر بوونی ڕستەی یەکەم ◊ وادەبێ مانای هەڵنانی تێدایە.

لَوَّنَ: ڕەنگی لێ پەیدا بوو ◊ لَوَّنَ الـشیبُ فیـه: مـوی سەروریشی سپی بوون ◊ لَوَّنَ الـشَّیْءَ: شتەکەی ڕەنگ کرد ◊ تَلَوَّنَ الشَّیْءُ: شتەکە ڕەنگی گرت ◊ تَلَوَّنَ فلانٌ: فلانکەس لەسەر ڕەوشتێك بەردەوام نـەبوو ◊ إلْـوَنَّ: بـەمانا (تَلَـوَّن) دێ ◊ التَّلْـوینُ: پێشکەشکردنی جۆرەها خواردەمەنی بۆ لـەزەت وەرگرتن، گۆڕانکاری لەئوسلوبی قسەکردن دا ◊ اللَّوْنُ: ڕەنگ: کە دیاردەیەکە بەقـەبارەوە، یـان بلـێ: عەرەزێکـە بەجیـسمەوە ◊ المَلَوَّنـون مـن الناس: بەو خەڵکانە دەگوترێ کە سپی پێست نین.

لاهَ السَّرابُ: تراویلکەکە شەپۆلی داو بریسکایەوە ◊ تَلَوَّهَ الـسَّرابُ: بـەمانا (لاهَ) دێ ◊ اللَّهَـةُ: مـار ◊ أَلْوی فـلان: فلانـکەس زۆری خۆزگـە خواسـتنو زۆرجـار وشـەی (لَـوْ)ی دوبـارەکردەوە ◊ الأَلْـوَّةُ: ڕەگەزی ڕوەکی (الزنبقیة)یە لەوڵاتی گەرمە سێر دەڕوێ ◊ الأُلُــوَّةُ: درەختــی (ألمارزبونیــة)یــە ◊ نـەمامی درەختـی (الألنجوجیـة) کەبـسوتێندرێ بۆنێکی خۆشی لێ دێ ◊ پێشی دەگوترێ: (العود الهندي) ◊ اللَّوُّ: ئاخاوتنی بەئەسپایی ◊ پـوچو بـەتاڵ ◊ اللَّوَّةُ: خـراپو ناشیرین ◊ اللُّوَّةُ: بخور سوتاندن.

لَوى عَلَیْهِ: لای لێ کردەوە ◊ چاوەڕوانی کرد.

لَوى الشَّیْءَ: شتەکەی باداو دوولای کردەوە.

لَــوى الثـوب: قوماشـەکەی گوشـیو هـەڵیگلۆفت بۆئەوەی ئاوی پێوەنەمێنێ.

لَوى رأسَهُ وبرأسه: سەری خۆی ڕاوەشاند ◊ جاری وایش دەبێ مانای ڕو لێوەرگێڕان دەگەیەنێ.

لَــوى الحـزنُ قلبـه: خـەمو خەفـەت دڵـی ناسـك کردۆتەوە.

لَوى فلاناً دینَهُ وبدینه: قەرزی فلانی دواخست.

لَوى فلاناً حَقَّهُ: ئینکاری حەقی فلانکەسی کرد

لَوى أمرَهُ: کارەکەی شاردەوە

لَوى عنه الخَبَرَ هەواڵەکەی بەناڕاست پێ ڕاگەیاند.

لَوى سِرَّهُ نهێنیەکەی شاردەوە.

لَوى فلاناً علی فـلان لَیّـاً: فلانکەسـی پـێش فـلان خست

لَوِيَ الفرسُ: ئەسپەکە پشتی خوار بوو.

لَوِيَ الطریقُ: ڕێگاکە دووربوو، نەزاندراو بوو.

لَوِيَ الکلأ: لەوەڕەکە وشك بوو، یـان وشـكو تـەڕە ◊ أَلْوی برأسه: سەری خۆی خوارکردەوە ◊ أَلْـوی الإنـسان: مرۆڤەکـە ڕۆیـشت بـۆ لەبەلانەکـە ◊ مرۆڤەکـە زۆر وتـەی خۆزگـەو کاشـکێو بریـای دوبارە کـردەوە ◊ أَلْوی فـلان: فلانـکەس کشتو کاڵەکەی وشك بۆوە ◊ أَلْوی البقلُ: گیـاو گژەکە ڕوتایەوەو وشك بوو ◊ أَلْـوی بالـشيء: شتەکەی بـرد ◊ أَلْـوی بیـده أو بثوبـه: بەدەسـتی یـان بەدەستەسڕو شتی وا ئاماژەی کرد ◊ أَلْوی بحقه: ئینکـاری مـافی ئـەوی کـرد ◊ أَلْـوی بهـم الـدهر: ڕۆژگار لـەناوی بـردن ◊ أَلْـوی العقـابُ بالـشيء: داڵاشەکە شتەکەی فڕاندو بردی ◊ أَلْوی اللِّـواءَ: ئاڵای دروستکرد یان ئـاڵای بـەرزکردەوە ◊ لاوَتِ الحیـةُ الحیـةَ مـلاواة: مارەکـە خـۆی لەمارەکـە

باهەلدا ٥ لَوَّى عَلَيْهِ الأمْرَ: کارەکەی لێ قوڵ کردەوە ٥ لَوَّى أعناق الرجال في الجدال: بەسەر پیاوەکاندا زاڵ بوو ٥ إلْتَوى الشَّيْئُ: شتەکە بادراو دوولا هاتەوە ٥ إلْتَوى الأمْرُ: کارەکە قورس و نەستەم بوو ٥ إلْتَوَت على حاجتي: کارەکەم لەسەرم گران وەستا ٥ إلْتَوى عَنْ الأمر: لەکارەکەدا قونگرانی کرد ٥ تلاووا عَلَيْهِ: لێی کۆبوونەوە ٥ تَلَوَّى الشَّيْئُ: شتەکە بادراو دوولا بۆوە ٥ تَلَوَّتْ الحيَّةُ: مارەکە پاپۆکەی بەست ٥ تَلَوَّى البرقُ في السحاب: هەورە بروسکەکە چەخماخەی داو بەچەند لایەک دا بروسکەکە روناکی دا ٥ إسْتلوى بهم الدهرُ: رۆژگار لەناوی بردن ٥ الإلْتِواء: لەزاراوەی ئەندازیاریی دا بریتییە لەحاڵەتێکی قەبارە کەلایەکی بچەسپێ و لاکەی تر لەسوچێکەوە باهەڵبدرێ ٥ اللاوِياء: ئامێری داخکردن. ٥ اللَّوِيَ: لەبەلاّن کەبەرزونزمی تێبکەوێ ٥ یان کۆتایی لەبەلاّن ٥ اللِّواءُ: ئالاّ: ئەمە ئالاّیەکە لەئالاّی فەرمی بچوکترە، ئالاّی رەسمی پێی دەگوترێ: (الراية) ٥ لەزاراوەی عەسکەریدا (اللِّواء) پلەیەکی سەربازییە لەژوور پلەی عەقیدەو لەخوار پلەی فەریقەوەیە ٥ اللّوّاءُ: بالَندەیەکە لەولاّتی شام ناسراوە ٥ اللِّوِيُّ: لەوەری وشك ٥ یان لەوەری تێکەڵ بوو لەتەرو پوش ٥ اللَّوِيَّةُ: ئەو خواردنەی لەخەڵکی تری دەشاریەوە ٥ اللِّيّانُ: بەندکردن پێچەوانەی بەرەڵلاّیی و رەهابوون ٥ اللَّيَّةُ: خزمی نزیك و نزیکتر ٥ داری عودو بخورد ٥ الملاوي: رێگەی خوارو خێچ ٥ لەزاراوەی مۆسیقادا بریتییە لەپارچە دارێك بۆ پێکەوەبەستنی ژێیەکان ٥ ملتوى الوادي: چاڵی و قۆرت و پێچی شیو ٥ لاتهُ عَنْ الأمر: مەنعی کرد لەکارەکەو لای دا.

لات فلاناً حقه: حەقی فلاّنکەسی کەم کردەوە.

لات فلاناً: هەواڵی ناراستی دا بەفلاّن ٥ اللّيْتُ: لامل.

لَيْتَ: حەرفی موشەبەهـ بەفیعلەو تەمەنناو خۆزگە دەگەیەنێ ٥ لايَثَهُ: بازی بۆدا، شانازی کرد بە خۆ شوبهاندنی بەشێر ٥ لَيِّثَ فلان: فلاّنکەس وەکوو شێری لێ هات ٥ خۆی بەیەکێك لەهۆزی (بنی لیث) لەقەڵەم دا ٥ تَلَيَّثَ فلان: بەمانا (لَيِّثَ) دێ ٥ إسْتَلْيَثَ فلان: فلاّنکەس وەکوو شێری لێ هات لەئازایەتی دا ٥ الأليَثُ: ئازاو چاونەترس ٥ دەگوترێ: (هو أليَثُ أصحابه) ئەو ئازاترینی هاوەڵەکانیەتی.

اللاّئث: شێر ٥ اللّيْثُ: بەهێزو توانا ٥ شێر ٥ ئازاو چاونەترس ٥ زمانڕەوان.

لَيْث عِفْرين: پیرۆیەکە وەکوو جانەوەری حەرباو وایە ٥ اللَّيثةُ: دێڵە شێر ٥ المِلْيَثُ: بەهێزو تواناو بەهەڵمەت ٥ المُلَيَّثُ: قەڵەو (فَحْلُ مُلَيَّثٌ) کەڵێکی بەهێزو توانایە دەڵێی شێرە.

لَيِسَ فلان: فلاّن ئازا بوو ٥ لەماڵ دانیشت و نەهاتەدەر.

لَيِسَ عنه: لێی بێ ئاگابوو ٥ تلايَسَ فلان: فلاّنکەس رەوشت بەرز بوو ٥ تلايَسَ عَنْ كذا: چاوی لەو شتە نوقاند ٥ الألْيَسُ: ئەو کەسەیە لەماڵی خۆی دەرنەچێ و لەچوار دیواری ماڵی خۆی دانیشێ ٥ شێر ٥ حوشتر کەباری لێ دەنرێ و مل درێژ دەکا جینگە جینگ ناکا ٥ المُلايِسُ: تەمبەڵ و قونگران.

لَيْسَ: وشەیەکە نەفی ومزع و حاڵ دەکا ٥ ئەمە فیعلێکی نەگۆڕەو یەك شێوەی هەیە ٥ ئیسم مەرفوع دەکاو خەبەر مەنصوب دەکا.

**لاصَ** عنه لَيْصاً: ليّى كلابوو ليّى لاداو ليّى دووركەوتەوە.

**لاصَ** الشَّيْءَ: شتەكەى لەقاندو جولاندى بۆئەوەى دەربهێنىێ ◊ ألاصَ الشَّيْءَ: بەمانا (لاصَهُ) دێ ◊ ألاصَ فلاناً عَنْ كذا: فلانكەس چاو و ڕاوى كرد

**لاطَ** بالشيئ لَيْطاً: بەشتەكەوە نووسا.

**لاطَ** الشَّيْءُ بقلبه: شتەكە بەدڵيەوە نووساو لاى خۆشەويست بوو.

**لاطَ** القاضي فلاناً بفلان: دادوەر فلانكەسى كردە كوڕى فلانو بەوەچەو نەوەى ئەوى دانا.

**لاطَ** اللّهُ فلاناً: خودا نەفرينى لەفلانكەس كرد ◊ ألاطَهُ: پاڵ ئەوى دا، كرديە كوڕى ئەو ◊ اللَّياط: ڕەنگ ◊ كلسو گەچ ◊ اللِّيطُ: تويكڵى هەرشتێك ◊ پێست ◊ اللِّيطَةُ: تويكڵى قەصەب ◊ كەوان ◊ هەرشتێك پتەوبێ.

**لاعَ**: هاتو هاوارى كرد ◊ غەمبار بوو.

**لاعَ** الجوعُ فلاناً: برسايەتى فلانكەسى برژاند.

**لاعَ** لَيْعَةً: نارەحەت بوو هاوارى كرد ◊ ألاعَ: نارازى بوو ◊ اللَّياع: (ريح لياع) ڕەشەباى بەهێز يان گەرم ◊ لَيْعَة الجوع: ناوسك چوزانەوەو هەڵقرچانى گەدە ◊ المِلْياع: حوشترێك زوو تينوى بێ ◊ لاغَهُ الشَّيْءَ: داواى شتەكەى لێ كرد بۆئەوەى ليّى بستێنێ ◊ تَلَيَّغَ: ئەحمەق بوو ◊ الألْيَغُ: ئەو كەسەى لەقسەو ئاخاوتنى دا زۆر پيتى (ى) بەكاربێنێ ◊ اللائغ: (طعام سائغ لائغ) خواردنێكە بەئاسانى قوت دەچێ. ◊ **لافَ** الطعام: خواردنەكەى خوارد ◊ لَيَّفَتِ الفسيلة: نەمامەكە پتەو بوو ◊ لَيَّفَ الشَّيْءَ: شتەكەى بە (ليفه= پرزو پاڵى درەخت) شت ◊ لَيَّف اللِّيفَ: ليفەى كردن ◊ اللِّيفُ: تويكڵى دارخورما كە بەتەنيشت لقەكانيەوەيە ◊ اللِّيفاني: ڕيش پروپانو درێژ.

لاقت الدواةُ لَيْقاً: مەرەكەبەكە بەليقەكەوە نووسا.

**لاقَ** الدَّواةَ: بۆ قەڵەمو ئوچەكەى ليقەى باشى دانا

**لاقَ** الشَّيْءُ به: شتەكە پێوەى نووسا ◊ (فلان ما يلق بكفه درهم) فلانكەس پارە بەدەستيەوە نامێنێ ◊ التاق له: لەگەڵى كەوت وەگرى بوو ◊ التاق فلان بفلان: فلانكەس بەفلانكەسەوە نووسا ◊ دەگوترێ: (إلتاق قلبي بفلان) دڵم بەفلانكەسەوە نووساوە خۆشم دەوێ ◊ التاق بالشيئ: فينايەتى بەشتەكە كرد

إستلاقه به: پێوەى نووساند ◊ شتەكەى لكاند بەشتێكى ترەوە ◊ اللَّياق: پاوانو لەوڕگا ◊ دەگوترێ: (مافي الأرض لياق) لەوڵات دا پاوان لەوەڕ نەماوە ◊ جێگير بوونو بەردەوامبوون لەسەركار ◊ اللِّياق: بلێسەى ئاگر ◊ اللِّياقَةُ: سولوكو ڕەوشتى جوان ◊ ألْيَقُ: شتێكى ڕەشە دەكرێتە كلەوە ◊ اللَّيَقُ: پارچە هەورى بچوك بچوكو پەرتەوازە بەئاسمانەوە ◊ اللِّقَةُ: ليقەى ناو شوشە مەرەكەب ◊ پەرۆيەكە دەخرێتە ناو شوشە مەرەكەبەوە مەرەكەبەكە هەڵدەمژێ بۆئەوەى كە ئوچەكە دەخاتە ناويەوە زۆر مەرەكەب هەڵنەگرێ ◊ المُلْتاقُ: دەمو چاو جوان، ڕوخسارى تەڕو تازە ◊ ألالَ القومُ وألْيَلُوا: خەڵكەكە كەوتنە شەوەوە ◊ لايَلَهُ ملايَلَةً وليالاً: بۆ شەوێك بەكرێى گرت ◊ شەوەو شەو مامەڵەى لەگەڵ كرد ◊ وەكوو چۆن وشەى (مشاهرة) بۆ مامەڵەى مانگەو مانگو (مُياوَمَة) بۆ مامەڵەى ڕۆژو بەڕۆژ بەكار دەهێندرێ ◊ الأَلْيَلُ: (ليل أَلْيَلُ): شەوى زۆر تاريك.

**اللاَّئِلُ**: (ليل لائل): شەوی زۆر تاریك ٥ **اللَّيْلُ**: شەو: کەبەشوێن ڕۆژی دا دێ لەخۆرئاوابوونەوە تا دەرکەوتنی خۆر لەخۆر هەڵاتەوە سەرلەنوێ ٥ لەزاراوەی شەرع دا لەخۆرئاوابوونەوە دەست پێدەکات تا دەرکەوتنی بەیانیو ڕوناکی ئاسۆ لەلای خۆرهەڵاتەوە ٥ **اللَّيلة**: یەك شەو ٥ **ليلى الخمر**: سەرەتای سەرخۆشیو لەزەتو خۆشی مەستی ٥ (أم ليلي) شەرابو مەی ٥ **ليلة ليلى**: شەوی زۆر تاریكو درێژ ٥ **اللَّيْلاءُ**: (ليلة ليلاء) شەوی زۆر تاریك ٥ یان شەوی سییەمو كۆتایی مانگ ٥ **المُلَيَّلُ**: (ليلٌ مُلَيَّلٌ) شەوی زۆر تاریك ٥ **اللَّيمُ**: بڕوانە مادەی (لأمَ) ٥ **اللَّيْمون**: دەرەختی لیمۆ ٥ **الليمونيت**: لەبواری زەوی ناسی دا بریتییە لەكانی ئۆكسیدی ئاستی ئاوی.

**لان الشَّيْءُ**: شتەکە نەرم بوو، ئاسانو بەیدەست بوو ٥ **ألانَ الشَّيْءَ وألْيَنَهُ**: شتەکەی نەرمو نیان کرد ٥ دەشگوترێ: (ألان للقوم جناحَهُ) بەهێدیو هێمنی لەگەڵ خەڵکەکەدا جوڵایەوە ٥ **لايَنَهُ ملايَنَةً**: نەرمی لەگەڵ دا نواند ٥ **لَيَّنَ الشَّيْءَ**: شتەکەی نەرم کرد.

**تَلَيَّنَ الشَّيْءُ**: شتەکە نەرم بوو ٥ **تَلَيَّنَ لفلان**: ماستاو چیەتی بۆ فلانکەس کرد ٥ **إستلانَ العَيْشَ**: ژیانی بەنەرمو نیان هاتە بەرچاو ٥ **الألْيَنُ**: نەرم ٥ **اللَّيَّان**: نەرم ٥ دەگوترێ: (نزلوا بليان الأرض) لەنەرمەڵانی زەوی دا جێگیر بوون.

**اللِّينُ**: نەرم ٥ **حروف اللين**: (أ، و، ي)ن هەروا وشەی (اللِّينُ) ناوە بۆ هەموو جۆرێك لەجۆرەکانی دارخورما جگە لەدارخورمای عەجوە ٥ **اللِّيْنَةُ**: پشتیو سەرین ٥ **اللَّيَّانُ**: بڕوانە مادەی (لَوَى) ٥ **المَلْيَنَةُ**: دەگوترێ: (إنه لذو مَلْيَنة) ئەو خاوەنی ڕەوشتی نەرمو نیانە ٥ **المُلَيِّن**: دەرمانێکە بەکاردێ بۆ ڕەوانی.

**لاه لَيْهاً**: خۆی شاردەوە ٥ بەرزبۆوە ٥ **اللَّيَّاءُ**: شتێکە وەکوو نۆك وایە، زۆر سپییە، لەوڵاتی حیجاز زۆرەو دەخورێ ٥ **اللَّيَّاءُ**: زەوی دوورە ئاو.



**المِيم**: پیتی بیستو چوارەمینی هیجایە، شوێنی هاتنە دەرەوەی نێوانی دولێوە، لەگەڵ گوتنی دا هەوا لەلوتەوە دەچێتە ناو جەستەوە.

**مَاجَ مَاجاً**: شەڕی کرد.

**مَوَّجَ مُوَجَةً**: شێوا، تێکچوو.

**مَوَّجَ الماءُ**: ئاوەکە سوێر بوو.

**مَادَ النباتُ والشَّجَرُ**: ڕووەکەو درەختەکە گەشەی کرد ئاوی تێکەڕا ◊ **أمادَ الريُّ او الربيعُ النباتَ**: ئاوەکە یان هەوا بەهاریەکە روەکەکەی نەرمو ناسك كرد ◊ **امْتَادَ خَيْراً**: خێرو بێری پەیدا كرد ◊ **المَادُ**: هەرشتێك نەرمو نیانو ناسك بێ.

**مَارَ بين القوم**: نێوانی خەڵکەکەی تێك دا، فیتنەیی خستە نێوانیانەوە.

**مَئِرَ الجُرحُ**: برینەکە هەڵتەقیەوە.

**مَئِرَ على فلان**: پێی وابوو فلانكەس دوژمنیەتی ◊ **أمأَرَ مَالَهُ**: ماڵو سامانەکەی تێك دا ◊ **المَئِرُ**: نێوان تێکدەرو فیتنەو دوزوبان ◊ **المِئرَةُ**: تۆڵە ◊ دوژمنایەتی.

**مَئِسَ الدباغُ الجلدَ**: دەباغچیەکە پێستەکەی پاك كردەوە.

**مَئِسَ الجرحُ مَاساً**: برینەکە گەورە بوو ◊ **المَاسُ**: فیتنەو دوزبان.

**مَاشَ المطرُ الأرضَ**: بارانەکە زەوییەکەی شۆردەوە.

**مَئِقَ الصَّبِيُّ مَاقاً**: منداڵەکە گڕوی گرت.

**مَئِقَ الرجلُ**: پیاوەکە لەڕق هەڵساوی خۆی خەریکە بگری ◊ **أمأَقَ فلان**: فلانكەس چووە ناو رقو کینەوە ◊ **امْتَأَقَ الصَّبِيُّ**: بەمانا (مَئِقَ) دێ ◊ **إمْتَأَقَ غَضَبُ فلان**: رقی فلانكەس زۆر توند بوو ◊ **إمْتَأَقَ إليَّ بالبكاء**: لەبەرچاوی من لەپڕمەی گریانی دا ◊ **المَأقُ والمَاقُ**: قلینچکی چاو بەلای لوتەوە ◊ **المُؤقُ والمُوقُ**: قلینچکی چاوی بەلای لوتەوە ◊ **المُؤقُ والمُوقُ من الأرض**: قەراخو بیجاغی زەوی ◊ **المَأقَةُ**: جۆرە لرخەو پرخەیەکە توشی مرۆڤ دەبێ ◊ رەق هەڵسانو تورە بوونی زۆر ◊ **مَامَات الشاةُ او الظبيةُ**: مەڕەکە درێژەی بە بارەبارِی خۆی دا.

**مَأَنَ القومَ مَأْناً**: ئەرکی بژێوی خەڵکەکەی خستە ئەستۆی خۆی.

**مَأَنَ الرجُلَ**: خۆی لەپیاوەکە پاراست ◊ زەبری لەناوکی پیاوەکەدا.

**مَأَنَ في الأمر**: لەکارەکە ورد بۆوە بیری لێ كردەوە.

**مَأَنَ فلاناً**: فلانكەسی فێركرد.

**مَأَنَ الشَّيئَ**: شتەکەی ئامادەکرد ◊ **المَأْنُ**: دارێکە ناسنێکی بەسەرەوە زەوی پێ دەکێڵدرێ ◊ **المَأنَةُ**: ناوكو دەوروبەری ◊ **المَيْئَنَةُ**: نیشانەی شت ◊ ئارمی شت ◊ **المُؤْنَةُ**: بژێو ◊ **المَؤُونَةُ**: بەمانا (المُؤْنَة)دێ ◊ **المَمْأَنَةُ**: شیاوو لایەق.

**مَأَى الشَجَرُ مَأْياً**: درەختەکە گەڵای کرد ◊ **مَأى فِي الشَيْئِ**: زێدەڕۆیی لەشتەکە دا کردو تێیدا قوڵبووە.

**مَأَى السقاءَ**: کوندەکەی پانو پۆڕکرد

**مَأَى بين القوم**: فیتنەو ئاشوبی خستە نێوان خەڵکەکە. ◊ **مَأَى القومَ**: خۆی بوو بە تەواوکەری سەد ◊ (فهم مَمْيون) ئەوانە سەدی تەواون ◊ **أمأى القومُ**: خەڵکەکە بون بەسەد ◊ **أمأت الدراهمُ**: دیرهەمەکان بون بەسەد ◊ **أمأى فلانٌ القومَ**: فلانکەس خەڵکەکەی بەکەسانی دی کردە سەد ◊ **تمأى الجلدُ**: پێستەکە کشاو فراوان بوو ◊ **الماة**: دەجار دە.

**مَتَّ اليه بقرابة ونحوها**: هانای بۆ برد.

**مَتَّ الحبْلَ**: حەبلەکەی لەبیرەکە هێنایە دەر بەبێ ئەوە چەرخو فەلەك بەکاربێنێ ◊ **ماتَّة**: خزمایەتی ومبیر هێنایەوە ◊ **تَمَتَّى فِي الحبل**: ویستی حەبلەکە بقرتێنێ ◊ **المَاتَّة**: حورمەتو هۆکار ◊ **المَتَّاتُ**: ئەوەی هانای پێ دەبرێ

**مَتَحَ النهار مَتْحاً**: ڕۆژگار درێژ بۆوە.

**مَتَحَ الجرادُ**: کوللەکە کلکی لەزەوی چەقاند بۆئەوەی هێلکە بکا.

**مَتَحَ الشَيْئ**: شتەکەی هەڵکەند ◊ دەگوترێ: (مَتَحَ فلاناً): فلانکەسی خستە سەرزەوی تڕێلی کرد.

**مَتَحَ الدَلْوَ**: پەتی دۆڵچەکەی ڕاکێشا.

**مَتَحَ الماءَ**: ئاوی دەرهێنا ◊ **إمْتَتَحَ الشَيْئ**: شتەکەی لەشوێنی خۆی دەرهێنا ◊ **تَمَتَّحَت المَطِية بايديها في السير**: وڵاخەکە قاچەکانی بەتەمبەڵی هەڵێنا لەڕۆیشتنەکەی دا ◊ **المَتُوحَ**: کەسێك بەتوانابێ بۆ ئاو هەڵکێشان لەبیر.

**مَتَخَ الشَيْئ**: شتەکەی لەشوێنی خۆی هەڵکەند.

**مَتَخَ فلاناً**: لەفلانکەسی دا.

**مَتَرَ الشَيْئ**: شتەکەی بڕیەوە.

**مَتَرَ الحَبْلَ**: حەبلەکەی درێژکردەوە.

**مَتَرَ الشَيْئ**: بەمەتر مەزندەی شتەکەی کرد ◊ **تماترت النار من الزند**: ئاگر لەچەرخەکە کەوتە خوار ◊ **تماتر القومُ الشَيْئ**: خەڵکەکە شتەکەیان لێك کێشایەوە هەریەکەیان لەلای خۆیەوە بۆلای خۆی کێش کرد ◊ **إمْتَرَ الحبل إمْتاراً**: حەبلەکە درێژ بوو ◊ **المِتْرُ**: مەتر ئامێری پێوان ◊ ئامێری ئەندازەگرتن ◊ **مَتَشَهُ الشَيْئ مَتْشاً**: شتەکەی کۆکردەوە ◊ بەپەنجەکانی بڵاوی کردەوە ◊ **مَتَشَت عينه مَتْشاً**: چاوی کز بوون باش نەیان بینی ◊ **المَتْشُ**: سپیاییەکە لەسەر نینۆکی زارۆکان دەردەکەوێ.

**مَتَعَ الشَيْئ**: شتەکە لەباشی دا گەیشتە ئەوپەڕ ◊ شتەکە درێژبۆوە، بەرزبۆوە.

**مَتَعَ فلان**: فلانکەس لەڕەوشتی بەرز دا پێشکەوت.

**مَتَعَ الحبلُ**: حەبلەکە گشت بوو.

**مَتَعَ النبيذُ**: سرکەکە زۆر سور بوو.

**مَتَعَ بالشيئ**: شتەکەی برد.

**مَتَعَ الله فلاناً بكذا**: خودا جڵەوی بۆ فلانکەس درێژکرد بۆئەوەی درێژە بەسود مەندبوون لەوشتە بدا.

**مَتُعَ الشَيْئ متاعَةً**: شتەکە باش بوو، ساغ بوو ◊ **أمْتَعَ بالشيئ**: شتەکەی بۆ پایەدار بوو لێی سود مەند بوو ◊ **امتع الله فلاناً**: خودا تەمەنی فلانکەسی درێژ کرد ◊ دەگوترێ: (أمتعه الله

بكـذا): خـودا هێشتیەوە بۆئـەوەی بەوشـتە سودمەند بێو بەشوێنی ئەو کەیف خۆش بێ ٥ أَمْتَعَ بِمالِه: لەزەتو خۆشی لەماڵو سامانی خۆی بینی ٥ أَمْتِعْنِي بِفِراقِهِ: بەجودا بونەوە لەو سودی پێ گەیانـدم ٥ أَسْتَعْنِي عـن کـذا: لەوشـتە بـێ ئاتـاجی کـردم ٥ مَتَّـعَ الـشَّيْ: شـتەکەی درێـژکردەوە ٥ مَتَّـعَ اللهُ فلانـاً: خـودا تەمـەنی فلانکەسی درێـژ کـرد ٥ مَتَّـعَ الرجـلُ مُطَلَّقَـةُ: پیاوەکـە لـەدوای تەڵاقـدانی ژنەکـەی هەنـدێ پێداویستی ژیانی پێدا ٥ تَمَتَّـعَ بکـذا: لـەزەتو خۆشی بەوشتە بۆدەستە بەر بوو ٥ تَمَتَّعَ العمرةَ الی الحج: لەنیەتو پۆشاکی عەمرەدا مایـەوە تـا ئەرکـەکانی حەجیـشی ئـەنجام دان ٥ اسـتمتع بکذا: لەزەتو خۆشی لەوشتە وەرگرت ٥ المَاتِعُ: شتی باشو بێ غەش لەهەر شتێك بێ ٥ المَتاع: لـەزەتو خۆشـی ٥ هەرشتێـك سـودی لـێ ببینـدرێو هـەوڵ بـدرێ بەزەمەنـدە بکـرێ ٥ وەکوو خۆراكو کاڵای ناوماڵو کەرەستەی تـر ٥ المُتعَةُ: هەرشتێك لەزەتو خۆشی لێ دەستەبەر بـێ وەکـوو راوەشـکارو یـاریو پیاسـە ٥ ئەنجامـدانی حـەجو عـەمرە بەیەکـەوە ٥ ژن مـارەکردنی کاتی وەکوو لـەلای هەنـدێ پێـڕی شـیعە بـاوە ٥ ئـەو مـاڵو سـامانەی پیـاو دەیـدا بەژنی تەڵاقدراوی.

مَتَكَ الشَّيْ مَتْكاً: شـتەکەی بڕیـەوە ٥ مالکـە في البیع: لەمامەڵەکەدا زاڵبـوو بەسـەریدا ٥ تَمَتَّـكَ الشرابَ: وردە وردە شلەمەنییەکەی خواردەوە ٥ المُتْـكُ: لـوتی مێشو مێشولە ٥ بـەروبوومی نارنج. ٥ مَتَلَ الشَّيْ: شتەکەی جوڵاند

مَـتَنَ بالمکـان مَتْنـاً: لەشـوێنەکە جێـگیربوو مایەوە.

مَتَنَ فلان: فلانکەس سوێندی خوارد.

مَـتَنَ بفـلان: هـەموو رۆژەکـە بەرێـگادا بـردیو رەوی پێ کرد.

مَتَنَ الشَّيْ: شتەکەی درێژ کردەوە.

مَتَنَ فلاناً: زەبری لەپشتی فلانکەس دا.

مَـتَنَ الکـبْشَ: لەرەگـەوە گـونی بەرانەکـەی دەرهێنان.

مَـتُنَ الـشَّيْ: شـتەکە رەقو پتـەو بـوو ٥ المتین: صیفەتێکی پەروەردگارە ٥ أَمْتَنَ فلانـاً: زەبـری لەپشتی فلانکەس دا ٥ ماتَنَه: کێ برکێی لەگـەڵ دا کـــردو لەمەبەســـت دوری خـــستەوە ٥ بەربـەرەکانی کـردو دژی وەسـتا ٥ مَتَّنَ الـشَّيَ: شتەکەی توندو پتەو کـرد ٥ تَماتَنَ الـشاعران في الـشعر: دوو شـاعیرەکە شـەڕە شـیعریان کـردو بەرپەرچـی یـەکتریان دایـەوە ٥ المِتْنـان: ئـەو پەتەی باقە قەسەڵو شتی وای پێ دەبەسترێ ٥ المَاتن: لەزاراوەی نوسەراندا ئەو کەسەیە بناغەو مەتنی کتێبەکە دەنووسێ ٥ المَتْنُ: پشت.

مَتْن الأرض: تەپۆڵکەو شوێنی پتەوی ناو زەوی.

مَــتْن الکتـاب: دەقـە سـەرەکیو ئەصـڵییەکانی کتێب.

مَتْن النهـار: تـەواوی رۆژ ٥ هـەموو مـاوەی رۆژ ٥ المتنــان: ئـەملاو ئـەولای موراغـەی پـشت لەراسـتو چـەپەوە ٥ المتنـة: ئـەوەی لـەزەوی پتـەوو رەقەڵانـە ٥ تەپۆڵکـەو تمبـار ٥ لایـەکی پشتە چ راست یان چەپ.

مَتِهَ فلان مَتْهاً: فلان گومڕا بوو، سەری لێ شێوا ٥ تَماتَهَ عنه: خـۆی لـێ گێـل کـرد ٥ تَماتَهَ القـومُ: خەڵکەکە دوور کەوتنـەوە ٥ تَمَتَّهَ: سەرسام بـوو

٥ خۆی گێل‌و ئەحمەق کرد ٥ دورکەوتەوە ٥ **تَمَتَّعَ في الشيء**: زێدەڕۆیی لەشتەکەدا کرد.

**مَتَا الحبلَ وغيره مَتْواً**: حەبلەکەی درێژ کردەوە.

**مَتَا فلاناً بالعصا**: بەگۆچان لەفلانکەسی دا.

**مَتَا في الأرض**: لەزەوی دا کۆشش کردو پەلەی کرد ٥ **امتى**: تەمەنی درێژ بوو ٥ رزق‌و رۆژی زۆرو هەمە جۆر بوو ٥ **تَمَتّى**: بەمانا (تَمَطّى)دێ.

**مَتى**: زەرفی زەمانەو بۆ پرسیار لەڕۆژگارو کات دێ.

**مَثَّ الرجلُ**: پیاوەکە ئارەقی کرد.

**مَثَّ السِّقاءُ**: کوندە ئاوەکە، گۆزە ئاوە کە ئاوی لێ چو

**مَثَّ العَظمُ**: ئێسقانەکە هەرچی مۆخی تێیدا بوو هاتە دەر.

**مَثَّ يَدَهُ واصابعه بالمنديل**: دەست‌و پەنجەی بەدەستە سڕ سڕینەوە.

**مَثَّ شارِبَه**: سمێڵی چەوربون‌و بەدەستی سڕینی بەلام شوێنەواری چەورییان پێوەیە.

**مَثَّ الجُرحَ**: کێم‌و زوخاوی ناو برینەکەی دەرکردو پاکی کردەوە.

**المِثاثُ**: (نبت مَثاث)، ڕوەکی شێدار.

**مَثَجَ الشيءَ**: شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**مَثَجَ فلاناً**: خواردنی دەرخواردی فلان دا.

**مَثَدَ بين الحجارة**: لەنێوان دو بەرددا خۆی مەلاس داو لەوێوە سەیری جم‌و جۆڵی دوژمنی کرد.

**مَثَدَ فلاناً**: فلانکەسی کردە حەشارگە.

**المَاثِدُ**: ڕەبیەو سەنگەر.

**مَثَلَ الرجلُ بين يدي فلان**: پیاوەکە لای فلان دەستەو ئەزەر ڕاوەستا، ئامادە باشی خۆی بۆ خزمەت نیشان دا.

**مَثَّلَ فلان فلاناً**: فلانکەس تەمثیلی فلانی کردو لەحیاتی ئەو کارەکانی ئەنجام دان ٥ **مَثَّلَ التماثيل**: پەیکەرەکەی تاشی ٥ **مَثَّلَ بفلان مَثْلاً ومُثْلَةً**: سوکایەتی بەفلان کرد دەم‌و لوتی برین‌و ئەتکی کرد.

**مَثُلَ فلان بين يدي الوالي**: فلانکەس لەبەردەم پاشا ڕاوەستا.

**مَثُلَ الرجلُ مَثالَةً**: پیاوەکە ڕێزدارو شکۆمەند بوو ٥ **أمْثَلَ فلاناً**: فلانکەسی ئەتك کرد ٥ لەتۆڵەی کوژراوی خۆی کوشتیەوە ٥ **ماثَلَ الشيءَ**: وەکوو ئەوشتەی بوو لەو دەچوو ٥ **مَثَّلَ بفلان**: سوکایەتی بەفلان کرد ٥ **مَثَّلَ الشيءَ بالشيءِ**: شتەکەی بەشتەکە شوبهاند ٥ **مَثَّلَ الشيءَ لفلان**: شتەکەی بۆ فلانکەس وێناکردو ڕاینواند.

**مَثَّلَ المسرحية**: شانۆگەرییەکەی ڕانواند ٥ **مَثَّلَ التماثيلَ**: پەیکەرەکانی ڕانواند ٥ **إمتَثَلَ امره**: فەرمانبەرداری فەرمانەکانی بوو، پابەندی فەرمان‌و ئامۆژگارییەکانی کرد ٥ شوێن ڕێبازی ئەو کەوت‌و لای نەدا ٥ **إمْتَثَلَ المَثَلَ**: پەندو مەسەلەکەی تەصەور کرد ٥ **إمْتَثَلَ من فلان**: تۆڵەی لەفلانکەس ستاند ٥ **امتَثَلَ عندهم مثلاً حسناً**: دێڕە شیعرێکی خوێندەوە ئەمجار بەدو ئەودا شیعرێکی تری خوێندەوە ٥ **تَمَاثَلَ الشيئان**: دوشتەکە لێك چون ٥ **تَمَاثَلَ العليل من علته**: نەخۆشەکە خەریکە چاك بێتەوە ٥ **تَمَثَّلَ الشيءَ**: وێنەی شتەکەی کێشا.

**تَمَثَّلَ بين يديه**: لەپێش دەمی دا ڕاوەستاو ئامادەباشی نواند ◊ **تَمَثَّلَ بالشَّیْءِ**: شتەکەی بەنمونە هێنایەوە ◊ **الأمثَل (اسم تفضيل)**: باشتر ◊ **الأمثولة**: ئەو جۆرە شیعرانەن کە بەنمونە دەهێندرێنەوە ◊ **التِّمثَالُ**: پەیکەری لەبەرد داتاشراو یان لەمس و شتی وا داڕێژراو ◊ **التمثيلية**: کارێکی فەننی و ئاوازەییە بەپەخشان یان بەشیعر ئەنجام دەدرێ وێنای شتێکی حەقیقی و ڕوداو یان هەڵبەستراو دەکێشێ ◊ **المِثالُ**: نمونەو قاڵب کەشتی تری لەسەر وێنا دەکرێت ◊ **المِثالِيّ**: نمونەیی ◊ شتێک لەبوارو جۆری خۆی دا تەواو بێ ◊ **المَثَّالُ**: پەیکەر تاش ◊ **المِثْلُ**: هاوشێوەو هاو وێنەو هاوشان ◊ **المَثَلُ**: هاوشێوە ◊ پەندو عیبرەت ◊ ڕستەیەکە لەدەقێک دەردەهێندرێ و بۆنمونەو پەند دەهێندرێتەوە بەبێ ئەوەی گۆڕانکاری تێدابکرێ ◊ **المَثُلَةُ**: تۆڵەو سزاو ئەتکردن ◊ **المُثْلَةُ**: تۆڵەو سزاو ئەتکردن ◊ **المَثِيلُ**: هاوشێوە، هاو وێنە ◊ بەمانا شکۆدارو ڕێزدار دێ.

**المُمَثِّلُ**: ئەکتەر؛ ئەوکەسەی لەسەر شانۆ کاربکا ◊ **مَثْمَثَ زِقّ السمنَ**: هیزەکە ڕۆنی لێچوو ◊ **مَثْمَثَ فلان الشَّیْءَ**: شتەکەی لەناو دا نقوم کرد ◊ **مَثْمَثَ الفتيلة**: ڕۆن یان نەوتی لەچراکە کرد ◊ **مَثْمَثَ الشَّیْءَ**: شتەکەی جوڵاند ◊ دەگوترێ: (أخذه فَمَثْمَثَهُ): شتەکەی گرت و ئەمدیو ئەودیوی کرد ◊

**مَثَنَهُ**: میزەڵدانی هەنگاوت ◊ **مَثِنَ مَثَناً**: میزە چرکەی بوو، میزەڵدانی ئازاری بوو ◊ **المَثَانَةُ**: میزەڵدان.

**مَجَّ الماءَ او الشرابَ من فيه**: ئاوەکەی تف دایەوە.

**مَجَّ شَدقا الهرِم**: هەردو لاشەویلەی پیرەکە شل بوون.

**مَجَجَ العِنَبُ**: ترێیەکە پێگەیشت و شیرین بوو ◊ **إنمَجَّت نقطة من القلم**: پرژێک لەقەڵەم پرژا ◊ **المَجَاجُ**: هەرشتێک لەدەم تفی دەیەوە ◊ **مجاج الفم**: تفی ناودەم ◊ **مَجَاجُ النحل**: هەنگوین ◊ **مَجَاجُ العِنَب**: شیلەی ترێ ◊ **مَجَاجُ المزن**: بارانی هەور ◊ **المُجَاجَةُ**: تف ◊ (مجاجة الشَّیْء): گوشراوی شت ◊ **المَجَّاجُ**: کەسێک زۆر ئاو لەدەم ڕادا.

**مَجَدَ فلان مَجْداً**: فلانکەس خاوەن مەجدو شکۆ بوو.

**مَجَدَ فلاناً**: لەشکۆداری دا بەسەر فلان دا زاڵ بوو ◊ دەگوترێ: (ماجَدَهُ فَمَجَدَهُ).

**مَجُدَ فلان مجادة**: فلانکەس خاوەن شکۆ بوو ◊ **أمْجَدَهُ**: بەگەورەو شکۆمەندی لەقەڵەم دا ◊ وەسپی دا ◊ **أمْجَدَ العَطَاءَ**: بەخششەکەی زۆر کرد ◊ **ماجَدَهُ**: لەشکۆداری دا پێشبڕکێی لەگەڵ دا کرد ◊ **مَجَّدَهُ**: وەسپی کردو بەگەورەی زانی ◊ **مَجَّدَ العَطَاءَ**: بەخششەکەی زۆر کرد ◊ **تماجدوا**: شانازییان بەسەر یەکتر دا کرد ◊ **تَمَجَّدَ**: شکۆدار بوو ◊ **استَمْجَدَ**: بوو بە خاوەن مەجدو شکۆمەند ◊ **استَمْجَدَ المرخ والعفارُ**: درەختی مەرخ و عەفار بڵێسەی ئاگرەکەیان خۆش کرد ◊ **الماجِدُ**: ڕێزدارو خاوەن شکۆ ◊ **المَجْدُ**: ڕێزو شکۆمەندی و وەجاخزادەیی ◊ **المَجِيدُ**: خاوەنی زۆر ڕەوشتی بەرزو شکۆمەندی ◊ ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار.

**مَجَرَ من الماء**: وەرگی پڕ بوو لەئاوو تینوایەتی نەشکا ◊ **مَجِرَت الشاةُ**: مەڕەکە بێچووەکەی

لەورگی دا گەورە بوو بۆخۆشی لاواز بوو ٥ أَمْجَرَت الشاةُ: بەمانا (مَجِرَت)دێ ٥ الأَمْجَرُ: ورگ زل‌و جەستە لاواز ٥ المَجْرُ: هەرشتێك زۆر بێ ٥ سوپای زۆرو بێ شومار ٥ المَجَرُ: عەیارێکی ئاڵتونە سەرمتا لەولاتی مەجەر داهاتووە لەبواری خشڵی ئافرەتان داو بۆ بەهادانان‌و دیاری کردنی نرخ کاری پێ دەکرێ ٥ هەردانە مەجەرێك نرخەکەی بیست‌و هەشت قیراتە ٥ یان سێ بەش لەچواربەشی مسقاڵێکە ٥ المُمْجِرُ من النساء: ئەو ئافرەتەیە بەسکێك دوو منداڵی ببن ٥ مەرێکی ئاوس کەورگی گەورە بێ‌و نەخۆش بێ‌و جەستەی لاواز بێ بەناخۆشی بێچوی ببێ ٥ حوشترێکە لەسك وەستابێتەوە.٥ مَجَسَّهُ: کردی بە مەجوسی‌و ئاگر پەرست ٥ تَمَجَّسَ: چووە پێری مەجوسیانەوە ٥ المَجُوسُ: گەل‌و هۆزێك یان چەند هۆزو نەتەوەن کە رۆژیان پەرستووە یان مانگ‌و ئاگریان پەرستووە لەسەدەی سێیەمی پێش زایینەوە ئەم ناوەیان بەسەردا براوە ٥ المجوسيّ: کاهین‌و کولەومنانی لای ئاشورییەکان‌و فارسە کۆنەکان ٥ المجوسية: بیرو باوەڕی ئاگرپەرستەکان لەبەرێز راگرتنی ئەستێرەو ئاگر ٥ یان دەگوترێ: (مەجوسیەت) ئایینێکی کۆنە زەرادەشت تازەی کردەوەو لێی زیاد کرد ٥ المِجَسْطي: کتێبێکی کۆنە لەبواری ئەندازیاری‌و ئاسمانشوناسی بەطلیموسی فەلەکی ساڵی ١٤٠ زایینی دایناوە لەسەردەمی خەلیفە مەئمون دا وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی‌و لەبواری خۆی دا سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو بوو.

**مَجَعَ مَجْعاً**: شیرو خورمای بەیەکەوە کردە پێخورو خواردی.

**مَجَعَ مجاعةً**: قسەی راست‌و گاڵتەی تێکەڵ بەیەك کرد.

**مَجُعَ مَجَاعَةً**: بەمانا (مَجَعَ)دێ ٥ **ماجَعَهُ**: قسەی گاڵتەو گەپی ئاراستە کرد ٥ **إمْتَجَعَ**: شیرو خورمای کردە پێخۆرو خواردی ٥ **تماجَعا**: قسەی گاڵتەو سەیریان ئاراستەی یەکتر کرد ٥ **تَمَجَّعَ**: شیرو خورمای خوارد ٥ **المَجَاعة**: پاشماوەی پێخوری شیرو خورما ٥ **المَجَّاعُ**:کەسێك هەوەسی لەقسەی گاڵتەو سەیربێ کەسێك حەزی لەکێشتی خورماو شیربێ واتە خورماو شیر بکاتە پێخۆرو حەزی لێ بێ ٥ **المَجْعَةُ**: ئافرەتی بێ حەیا ٥ **المَجِيعُ**: جۆرێکە لەپێخۆر لەشیرو خورما دروست دەکرێ ٥ **مَجَلَتْ يدُه**: دەستی بلۆقی کرد ٥ پێستی دەستی پتەو زبر بوو.

**مَجَلَ الحافِرُ**: سمی وڵاخەکە سواو رەق‌و پتەو بوو. **مَجِلَتْ يدُهُ**: بەمانا (مَجَلَتْ)دێ.

**أمْجَلَ العملُ يدَه**: ئیشکردن بلۆقی لەپێستی دەستی دا پەیدا کرد ٥ **تَمَجَّلَ الجِلْدُ قَيْحاً ودماً**: پێستی بلۆقی کردو کێم‌و زوخاوی تێدا پەیدا بوو ٥ **المَجْلُ**: کرانەوەو شل بوونی رەگی پاشوی وڵاخە ٥ **المَجْلَةُ**: توێکڵێکی تەنکە ژێرەوەی دەبێتە بلۆق‌و ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە ٥ **مَجْمَجَ فلان في خبرٍ**: فلانکەس لەهەواڵ گێڕانەوەکەدا منجە منجی کردو شتەکەی باش رون نەکردەوە ٥ **مَجْمَجَ الكتابَ**: نوسینی کتێبەکەی تێکەڵ‌و پێکەڵ کرد بەقەڵەم شێواندی ٥ **تَمَجْمَجَ الكفلُ**: سمتی لەقەڵەوی‌و بەختەوەری دا دەلەرێنەوە ٥ **المَجْمَاجُ**: شل‌و شێواو تەمبەڵ.

**مَجَنَ الشَّيْئُ**: شتەکە رەق‌و پتەو بوو.

**مَجَنَ فلان**: فلانكەس بێ حەیاو بێ چاوو ڕو بوو ٥ فلانكەس راستو درۆی تێكەڵ كردو هەڵەوەر بوو ٥ **ماجَنَهُ**: سوعبەتو یاری لەگەڵ كردو راستو درۆی تێكەڵ كرد ٥ **تَماجَنا**: سوعبەتو گاڵتەو گەپیان بەیەكەوە كرد ٥ **المجان**: بەخۆڕایی بەبێ بەها ٥ هەروا وشەی المجان بەمانا زۆر وزەبەندە دێ ٥ دەگوترێ: (ماء مجان وتمر مجان) ٥ **المُمَجَّنُ**: دەگوترێ: (طريق مُمَجَّنٌ): ڕێگای راستو ڕێكخراوو تەخت كراو ٥ **مَجْنَق اللومُ**: خەڵكەكە بەقۆچەقانی بەردیان هاویشت ٥ **المَنْجَنيق**: ئامێرێك بووە كاتی خۆی بەردیان پێ هاویشتووە وەكوو قۆچەقانیی بۆ روخاندنو گرتنی قەڵاو شورە.

مَحَتَه مَحْتاً: پری كرد لەرقو كینە.

**مَحُتَ اليوم**: ڕۆژەكەی زۆر گەرم بوو ٥ **المَحْتُ**: پتەوو توندو تیژ لەهەرشتێك دا بێ.

**مَجَحَ الشَّيْءَ مَجْحاً**: شتەكەی ماڵیو كراندی ئامادەسەرەكییەكەی دەركەوت ٥ **مَحَجت الريح الأرضَ**: ڕەشەباكە گڵو خۆڵی سەر ڕوی زەوی ڕامالی.

**مَحَجَ العودَ**: شوڕكە دارەكەی سپی كرد

**مَحَجَ الجلدَ**: پێستەكەی شێلا هەڵی گلۆفت بۆئەوەی نەرم بێ.

**مَحَجَ اللبنَ**: ماستەكەی هەژاند بۆئەوەی بیكاتە دۆ.

**مَحَجَ الدَّلْوَ**: دۆڵچەكەی ڕاوەشاند.

مَاحِجه: دوای خست ماتڵی كرد.

**مَحَّ الثوبُ**: قوماشەكە ڕزیو كۆن بوو ٥ **أمَحَّ الثوبُ**: بەمانا (مَحَّ)دێ ٥ **المُحُّ**: پاڵفتەی شت ٥ زەردێنەو سپێنەی ناو قاوغە هێلكە ٥ **المَحَاحُ**: درۆزن ٥ كەسێك قسەی هەبێو كردەوەی نەبێ.

**المَحَارَة**: بڕوانە مادەی (حَوَرَ).

**مَحَشَ الجلدَ مَحْشاً**: پێستەكەی لەگۆشتەكە دامالی ٥ **مَحَشَتْ النارُ جلدَه**: ئاگر پێستی سوتاند ٥ **المُحَاشُ**: سوتێنەر.

**مَحَصَ**: هەڵات.

**مَحَصَ الظَّبْيُ**: ئاسكەكە بازێكی توندی هاویشت.

**مَحَصَ الثوبُ**: قوماشەكە توكەكەی روتایەوە.

**مَحَصَ الله مابه**: خودا نازو نیعمەتی لێ ستاند.

**مَحَصَ الشَّيْءَ**: شتەكەی لەعەیبو لەككە پاك كردەوە.

**مَحَصَ المعدِنَ بالنار**: مەعدەنەكەی بەئاگر پوختە كرد.

**مَحَصَ السيف**: شمشێرەكەی مشتو ماڵ كرد ٥ **أمحصت الشمسُ**: خۆر دوای گیرانی دەركەوتەوە ٥ **أمْحَصَ المريضُ**: نەخۆشەكە چاك بۆوە ٥ **مَحَّصَ الشَّيْءَ**: شتەكەی لەعەیبو خەوش پاك كردەوە ٥ دەگوترێ: (مَحَّصَ الذهب بالنار): ئاڵتونەكەی بەئاگر پاك كردەوە ٥ **مَحَّصَ الله التائبَ من الذنوب**: خودا تۆبەكارەكەی لەتاوان پاك كردەوە ٥ **مَحَّصَ فلاناً**: فلانكەسی بەتاقی كردەوە.

**تَمَحَّصَت الظلماءُ**: تاریكییەكە ڕەویەوە ٥ **الأمْحَصُ**: كەسێك پاساوی راستو درۆ قبوڵ بكا ٥ **المَحيصُ**: گشت بادراو، دەمار گشتو توند ٥ **المُمَحَّصُ**: پاڵفتەكراو لەعەیبو عار.

**مَحَضَ فلاناً**: ماستی خاڵصی دەرخوارد دا.

**مَحَضَ فلاناً الوُدَّ**: بەدڵسۆزی ئامۆژگاری كرد.

**مَحِضَ مَحضاً**: ماستی خاڵصی خوارد.

**مَحُصَ** فلان في نسبه: فلانكەس نەژادی پاكو خاوێن بوو ◊ **أمْحَصَ الرجلَ**: بەدڵسۆزی ئامۆژگاری پیاوەكەی كرد ◊ **امْتَحَصَ فلان**: فلانكەس ماستی خاڵصی خواردەوە ◊ **الأمْحُوصَةُ**: ئامۆژگاری دڵسۆزانە ◊ **المَحْصُ**: شتی بێ خەوش و لەككە ◊ **مَحَّطَ الوَتَرَ**: دەستی بەژێی كەمانەكەدا هێنا بۆئەوەی چاكی بكا.

**مَحَقَ** الشَيْءَ **مَحْقاً**: شتەكەی كەم كردەوە ◊ فەوتاندی لەناوی برد ◊ دەگوترێ: (مَحَقَ الله العملَ): خودا پیتو بەرەكەتی كارەكەی برد فەوتاندی ◊ كارەكەی بەتاڵ كردەوە.

**مَحَقَ الحَرُّ الشَيْءَ**: گەرما شتەكەی سوتاند ◊ **أمْحَقَ الشَيْءُ او المالُ**: شتەكە فەوتا مرد ◊ **أمْحَقَ القمرُ**: مانگ چووە حاڵەتی مەحاقەوە ◊ **مَحَّقَ الشَيْءَ**: شتەكەی بەتاڵ كردەوە.

**امْتَحَقَ الشَيْءُ**: شتەكە كەم بوو بەرەكەتی نەما ◊ **امْتَحَقَ القمرُ**: مانگ روناكی كەم بوو ◊ **إمَّحَقَ القمرُ**: مانگ گوم بوو چووە حاڵەتی مەحاقەوە ◊ **تَمَحَّقَ الشَيْءُ**: شتەكە هێدی هێدی كەم بۆوە بەرەو نەمان رۆیی ◊ **المُحَاقُ**: بچوكبونەوەی مانگ لەدوای كامڵ بوونی تادەگاتە كۆتایی مانگو ئەمجار تازە بوو نەوەی ◊ **ليالي المَحَاق**: ئەو شەوانەی مانگ دەكەوێتە حاڵەتی مەحاقەوە ◊ **المَحَقَةُ**: فەوتان ◊ حوشترێك هەربێچوە نێرەی ببن ◊ **المَحِيقُ**: (نصل محيق)؛ سەرە تیری تیژە.

**مَحَكَ مَحْكاً**: توندو تیژی نواند لەكێشەو نیزاع دا.

**مَحِكَ**: بەمانا (مَحَكَ)دێ ◊ **أمْحَكَهُ الغَضَبُ**: رق هەڵسان وای لێ كرد لەكێشەو نیزاع دا سەرسەخت بێ‌و بەئاسانی مل بۆ ئاشتی نەدا ◊ ماحَكَهُ: كێشەی لەگەڵ نایەوە ◊ **تَماحَكَ البيعان**: كڕیارو فرۆشیار زۆریان منجە منجو دانو سان كرد ◊ **تَمَحَّكَ**: لەكێشەو نیزاع دا زۆری قیرەو گیرە گیری كرد ◊ **المِحْكانُ**: كەسێك زۆر گیرە گیر بكا.

**مَحَلَ** بالأمر: ویستی بەفرتو فێڵ كارەكە ئەنجام بدا.

**مَحَلَ** المكانُ: شوێنەكە بێ بژێوو بەرو بووم بوو.

**مَحَلَ** به الى ذي سلطان **مَحْلاً**: لەلای دەسەڵاتدار فیتنەیی لەدژی كرد.

**مَحِلَ** المكانُ: شوێنەكە بێ پیتو بەرەكەت بوو.

**مَحُلَ** المكانُ: بەمانا (مَحَلَ)دێ ◊ دەشگوترێ: (امحل الزمان)؛ رۆژگارەكە قاتو قڕی بوو ◊ **أمْحَلَ القومُ**: خەڵكە توشی ساڵی بێ بارانیو قاتو قڕی بون ◊ **أمْحَلَ الله الأرضَ**: خودا زەوییەكەی كردە زەوی سوتەمەڕۆو بی بژێوو بێ بەروبووم ◊ **ماحَلَهُ**: كێشەی لەگەڵ نایەوە ◊ فێڵی لێ كرد ◊ **مَحَّلَ فلاناً**: فلانكەسی بەهێز كرد ◊ **تماحَلَ المكانُ**: شوێنەكە دوور كەوتەوە ◊ دەشگوترێ: (فلاة متماحلة)، دەشتێكی كاكی بەكاكیو بەرفراوانە ◊ (فتنة متماحلة)؛ فیتنەو ئاشوبێكی درێژخایەنو نەبڕاوەیە ◊ **تَمَحَّلَ**: فێڵی كرد ◊ دەشگوترێ: (تَمَحَّلَ خيراً)؛ داوای خێرو بێری كرد ◊ **الماحِلُ**: وڵاتی سوتەمەڕۆو بێ بژێو ◊ بەرهەڵستكارو ركابەری سەر سەخت ◊ **المَحَالُ**؛ فێڵو هێزو توانا ◊ دەسەڵاتی تۆڵە سەندن ◊ تەگبیرو پلان ◊ **المَحْلُ**: نەبونی باران، وشكە ساڵی ◊ زەوی بێ گیاو گژو لەوەڕ ◊ دەشگوترێ: (رجل مَحْلٌ)؛ پیاوێكی بێ خێرو بێرە ◊ **المِحِلُ**: كەسێك دەربكرێ‌و بڕە تێندرێ تاماندو دەبێ ◊ **المِمْحَالُ من الأرض**: زەوی سوتەمەڕۆ.

المُمَحَّلُ: قاپی شیر ◊ مەنجەڵی شیر.

مَحَنَ فلاناً: فلانکەسی بەتاقی کردەوە ◊ سزای دا ◊ زۆری ئەزیەت دا.

مَحَنَ الفِضَّةَ: زیوەکەی قاڵ کردو پاڵفتەی کرد بەئاگر.

مَحَنَ الأديمَ: چەرمەکەی نەرم کردو لێکی کێشایەوە.

مُحِنَ فلان: فلانکەس کەوتە چەورتەو ناخۆشییەوە ◊ مَحَّنَ الأديمَ: بەمانا (مَحَنَهُ)دێ ◊ إمْتَحَنَ فلاناً: فلانکەسی بەتاقی کردەوە ◊ إمْتَحَنَ الشَّيْءَ: لەشتەکە وردبۆوە ◊ إمْتَحَنَ الفِضَّةَ: زیوەکەی قاڵ کرد پوختەی کرد ◊ الإمتحان: تاقیکردنەوە ◊ توشبونی بەڵاو کارەسات ◊ المِحْنَةُ: بەڵاو چەورتم.

مَحَا الشَّيْءَ: شتەکەی سڕیەوە شوێنەواری کوژاندەوە ◊ دەگوترێ: (مَحَت الريحُ السحابَ): ڕەشەباکە هەورەکەی ڕاماڵی ◊ (مَحَا المطرُ الجَدْبَ): باران‌و وشکە ساڵی نەهێشت ◊ (محا الصبحُ الليلَ): گزنگی بەیانی تاریکی شەوی لابرد ◊ إمْحى الشَّيْءُ: شوێنەواری شتەکە کوژایەوە.

تَمَحَّى من القوم: داوای لەخەڵکەکە کرد کە لەخراپەکانی خۆش بن ◊ المَحْوُ: تەڵخایی ناو مانگ ◊ المِمْحَاةُ: پەڕوی شت سڕینەوە، پەڕوی کاشی سڕینەوە یان لاسیکی خەتکوژانەوە.

مَخَّى الشَّيْءَ: شوێنەواری شتەکەی نەهێشت ◊ أَمَخَّ العظمُ: ئێسقانەکە مۆخی تێدا پەیدا بوو ◊ أَمَخَّت الدابة: وڵاخەکە قەڵەو بوو ◊ أَمَخَّ العودُ: ئەمامە درەختەکە ئاوی تێکەڕا ◊ أَمَخَّ حبُّ الزرع: دانەوێڵەکە ئاردی تێدا پەیدا بوو ◊ مَخَّخَ العظمَ: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا ◊ إمْتَخَّ العظمَ: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا ◊ المُخَاخَةُ: ئەوەی لەئێسقان دەردێ بەهۆی هەڵمژینەوە ◊ المُخُّ: مۆخ مێشك ◊ ئەو مادە مۆخەی لەناو سەردایە ◊ پاڵفتەی شت‌و کرۆکی شت ◊ المُخَّةُ: پارچەیەك لەمۆخ ◊ دەشگوترێ: (هذه مُخَّةُ الشَّيْءِ): ئەمە باشترینی شتەکەیە ◊ المَخيخُ: دەگوترێ: (عظم مَخيخٌ): ئێسقانێکە مۆخی تێدایە ◊ المُخَيْخُ: بەشێك لەدەماخ کە مەرکەزی هاوکێشەیی ئەندامەکانی جەستەیە ◊ المُمِخُّ: دەگوترێ: (له لسان مُمِخٌّ): زمانێ تیژو ڕەوانی هەیە ◊ مَخَرَت السفينةُ: کەشتییەکە کەوتە ڕۆیین‌و ئاوی دەریای دڕدا.

مَخَرَ السابحُ: مەلەوانەکە بەدەستی ئاوی دڕدا.

مَخَرَ الزارعُ الأرضَ: کشتیارە زەوییەکەی کێڵا بۆ کشتوکاڵ.

مَخَرَ المحور مدارَهُ: قەراخی شتەکە لێی خوراو فراوان بوو ◊ امْتَخَرَ العَظْمَ: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا ◊ امْتَخَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵبژارد ◊ امتَخَرَ القومَ: پیاوی پیاوانەی لەخەڵکەکە هەڵبژارد ◊ الماخِرَةُ: کەشتی ◊ الماخور: خانوی خراپەکاریی ◊ قومار خانە ◊ المَخْرُ: (بنات مَخر): هەوری تەنکی سپی کەپێش وەرزی هاوین بەئاسمانەوە دەردەکەون ◊ اليَمْخُورُ: (رجل يمخور، وعنق يمخور): پیاوی درێژ ملی درێژ.

مَخَضَ الشَّيْءَ: بەتوندی شتەکەی ڕاوەشاند.

مَخَضَ اللَّبَنَ: ماستەکەی هەژاندو ڕۆنەکەی لێ دەرهێنا.

مَخَضَ البئر بالدلو: بەدۆڵچەکە بیرەکەی شڵەقاندو زۆری ئاو لی هەڵێنجا.

**مَخَضَ الرأيَ**: راوو بۆچوونەکەی سەرەو ناو کردو زۆر لێی ورد بووەوە ئاکامەکەی لێك دایەوە ◊ **مَخِـضَت الحامِـلُ**: ژنە سك پڕەکە ژانی منداڵبوونی هاتێو خەریکە منداڵی ببێ.

**اَمْخَضَ اللَّبَنُ**: ماستەکە لەناو مەشکەکەدا هەژا ◊ **اِمْتَخَضَ الولدُ**: زارۆکەکە لەناو سکی دایکی دا جوڵایەوەو کاتی لەدایکبوونی هات ◊ **تَمَخَّضَ اللبن والولد**: بەمانا (امْتَخَضَ)دێ ◊ **تَمَخَّضَ السماءُ**: ئاسمان خەریکە باران ببارێنێ ◊ **تَمَخَّضَ الحامِلُ**: بەمانا (مَخِضَتْ)دێ ◊ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (تَمَخَّضَ الجبلُ فولد فأراً): کێو ژانی هاتێو مشکێکی بوو ◊ هەروا دەگوترێ: (تَمَخَّضَت الليلة عَنْ يوم سوء): شەوەکە بەیانیەکی ناخۆشی بەدو دا هات ◊ **المَخَاضُ**: ژانی منداڵبون ◊ هەروا وشەی (المخاض): ناوە بۆ حوشترێك دەمانگ بەسەر ئاوسبوونی دا تێپەڕیبێ ◊ هەروا ناوە بۆ بێچوە حوشتر کە دایکی کەڵ درابێ ◊ یان بۆ گۆلکە حوشترێك ساڵی تەواو کردبێو چوبێتە ساڵی دووەمی تەمەنیەوە ◊ **المِمْخَضَة**: ئامێری هەژاندنی ماست بۆ جیاکردنەوەی ڕۆنەکەرەکەی.

**مَخَطَ السَّهْمُ**: تیرەکە چووە ناو جەستەکەوە ئەمدیواو دیوی کرد.

**مَخَطَ المرأُ في الأرض**: پیاوەکە بەناو زەوی دا ڕۆیی بەخێرایی.

**مَخَطَ الشَّيْءَ**: بەتوندی شتەکەی کێش کرد.

**مَخَطَ السَّيْفَ**: شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا.

**مَخَطَ المُخَاطَ**: چڵمی لەلوتی هێنایە دەر ◊ **امْخَطَ السَّهْمَ**: تیرەکەی هاویشتو لەجەستەکەی دا ◊ **مَخَّطَ الصَّبِيَّ**: چڵمی لەلوتی منداڵەکە دەرهێنا ◊ **إِمْتَخَطَ فلان**: فلانکەس چی لەلوتی دا بوو دەری هاویشت ◊ **إِمْتَخَطَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ڕفاند ◊ **إِمْتَخَطَ مافي يده**: ئەوەی لەدەستی دا بوو لێی دزی ◊ **إِمْتَخَطَ السيف**: شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا ◊ **تَمَخَّطَ فلان**: بەمانا (إِمْتَخَطَ)دێ ◊ لەڕۆیشتن دا بەشێواوی و لارە لار ڕۆیی ◊ **المُخَاط**: چڵم ◊ صمغی درەختو ڕوەك ◊ **المُخَاطَة**: درەختێکە لەپێری (المخاطیة) بەرێکی هەیەکاتی خۆی بەکارهاتووە بۆ نەرم کردنەوەی سنگ، ئەمڕۆ بۆ باڵندە گرتن بەکاردێ ◊ **المُخَيْط**: بەمانا (المخاطة)دێ ◊ **المُخْطَةُ**: ئەو چڵمو جۆرە شلەمەنییەیە کە مرۆڤ لەلوتیەوە فڕێی دەداتە دەر ◊ **مَخْمَخَ العَظْمَ**: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا.

**مَخَنَ مَخْناً**: گریا.

**مَخَنَ الأديمَ**: پێستەکەی پاك کردەوەو سپی کرد توکی لێ کردەوە.

**مَخَنَ البئرَ**: ئاوی بیرەکەی هەڵێنجا ◊ **المَخْنُ**: درێژ ◊ **المَخِنُ**: بەمانا (المِخِنُ)دێ ◊ پیاوی مەیلەو کورتی جەستە سوك ◊ **المِخْنَةُ**: بەردەرگا، حەوشەی خانوو ◊ **المُمَخَّنُ**: دەگوترێ: (طريق مُمَخَّن): ڕێگایەکە خەڵکی زۆر پێدا ڕۆیشتووە خۆش بووە ◊ **مَخَى الرجلَ عَنْ الأمر**: پیاوەکەی لەکارەکە دوورخستەوە ◊ **تَمَخَّى العظمَ**: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا ◊ **مَدَحَهُ**: مەدحی کرد ڕەوشتە جوانەکانی باس کردن ◊ **مَدَّحَهُ**: زۆری مەدح کرد ◊ **امْتَدَحَ المكانُ**: شوێنەکە فراوان بوو ◊ دەگوترێ: (إِمْتَدَحت خاصرة الماشية): کەلەکەی وڵاخەکە کشا بەهۆی تێریو زۆر خواردنەوە ◊ **امْتَدَحَ فلاناً**: مەدحی فلانکەسی کرد ◊ **تمادحا**: هەریەك لەو دووکەسە مەدحی یەکتریان کرد ◊

**تَمَدَّحَتْ خاصرة الماشية:** بەمانا (إمتدحَتْ)دێ ٥
**تَمَدَّحَ فلان:** بەزۆر حاڵەتی وای بەسەر خۆی دا
هێنا مەدح بکرێ ٥ **إمتدح فلاناً:** مەدحی
فلانکەسی کرد ٥ **المَدیح:** بەمانا (الأمدوحة)دێ ٥
**المَمادحُ:** ئەو ڕەوشتە جوانانەن کە لەمەدح
کردن دا دەگوترێن.

**مَدَخَ** مَدْخاً: گەورە بوو.

**مَدَخَ فلاناً:** باش یارمەتی فلانکەسی دا، چاك
مەدحی کرد ٥ **مادَخَهُ:** یارمەتی دا بۆچاکە یان
بۆ خراپە ٥ **امْتَدَخَ عَلَیْهِ:** ستەمی لێ کرد ٥
**المدیخ:** گەورەو خۆشەویست.

**مدَّ** النهارُ مداً: روناکایی رۆژ بڵاو بووەوە.

**مَدَّ** فلان في سیرِه: فلانکەس درێژەی بەرۆیشتنی دا.

**مَدَّ الشَّیْءَ:** لەشتەکەی زیاد کرد ٥ دەگوترێ: (مدّ
النهرُ النهرَ): روبارە بچوکەکە ئاوی روبارەکەی
زیاد کرد.

**مَدَّ الجَیْشَ:** سوپاکەی بەهێز کرد.

**مَدَّ القومُ الجَیْشَ:** خەڵکەکە پشتیوانی سوپایان کردو
سوپایان بەهێز کرد.

**مَدَّ الدَّوَاةَ:** مەرەکەبی قەڵەمەکەی زیاد کرد.

**مَدَّ القَلَمَ:** قەڵەمەکەی خستە ناو مەرەکەبەکە.

**مَدَّ الله الأرضَ:** خودا زەوی ڕاخست پانی کردەوە.

**مَدَّ الأجَلَ:** ماوەکەی درێژ کردەوە.

**مَدَّ المدینَ:** مۆڵەتی قەرزدارەکەی دا.

**مَدَّ الحَبْلَ:** حەبلەکەی کێش کرد.

**مَدَّ الحرفَ:** پیتەکەی بەدرێژی خوێندەوە ٥ یان
لەنوسین دا بەشێوەی درێژ نوسی.

**مَدَّ** بَصَرَهُ الی کذا: چاوی لەشتەکە بڕی ٥ تەماعی
تێکرد.

**مَدَّ الرَّجُلَ في غَیِّهِ:** پیاوەکەی دەنە دەنەدا بۆ گومڕا
بوونی ٥ **أمَدَّ الجرحُ:** برینەکە کێمو زوخاوی
تێدا پەیدا بوو ٥ **أمَدَّ النهرَ:** روبارەکەی زۆر
کرد ٥ **أمَدَّ الدواةَ:** لیقەکە مەرەکەبەکەی زیاد
کرد ٥ **أمَدَّ الأرْضَ:** زەوی پان کرد، ڕایخست ٥
**أمَدَّ له في الأجل:** ماوەکەی بۆ زیادکرد ٥ **أمَدَّ
فلاناً:** یارمەتی فلانکەسی دا ٥ مۆڵەتی دا ٥ **مادَّهُ
مداداً ومادّةً:** ماتڵی کرد ٥ **مادَّ فلاناً الثوبَ:**
قوماشەکەی بۆ فلانکەس کێش کرد ٥ **مَدَّدَ
الشَّیْءَ:** شتەکەی پان کردەوەو درێژی کردەوە ٥
**امْتَدَّ الشَّیْءُ:** شتەکە فراوان بوو، ڕاخرا ٥ **إمْتَدَّ
الحبلُ:** حەبلەکە درێژ بوو ٥ دەگوترێ: (امتدّ
الظِلُّ والنهارُ، وامتدّ عمُرُهُ، وامتدت العِلَّة، وامتد
بهم السَّیْرُ) ٥ **تَمادَّا الثوبَ:** هەریەکە لەلای
خۆیەوە قوماشەکەی ڕاکێشا ٥ **تَمَدَّدَ الشَّیْءُ:**
شتەکە بڵاو بۆوە، پان بۆوە ٥ دەگوترێ: (تَمَدَّدَ
الأدیمُ): چەرمەکە لێك کشاو پان بوو ٥ **تَمَدَّدَ
الجسمُ بالحرارة:** قەبارەکە بەهۆی گەرمبوونەوە
لێك کشا ٥ **تَمَدَّدَ القومُ الشَّیْءَ بینهم:** خەڵکەکە
لەناو خۆیان دا شتەکەیان لێك کێشایەوە،
درێژو پانیان کرد.

**تَمَدَّدَ** فلان: فلانکەس خۆی لێك کێشایەوە ٥ **اسْتَمَدَّ
القَومُ الأمیرَ:** خەڵکەکە داوایان لەفەرمانڕەوا
کرد یارمەتییان بدا ٥ **الإمدادُ:** جەمو جوڵ ٥
**الأمِدَّةُ:** ریسی تەشی ٥ **الأُمْدُودُ:** دابو نەریت ٥
**التَّمَدُّدُ:** لێك کشانەوەو گەورە بوونی قەبارە ٥
**المادَّةُ:** مادەو قەبارە ٥ هەرشتێك بۆشاییەك
پربکا ٥ **مادة الشَّيْءِ:** بنەماو پێکهاتەی شت ٥
**مادة الخشب:** پێکهاتەی دار ٥ **مادة البحث
العلمي:** ئەو بابەتانەی باسە زانستییەکەی لێ
پێکهاتووە ٥ **مواد اللغة:** وشەکانی زوبان ٥ **مواد**

القانون: ئەو ڕستانەی بڕیارەکەیان لەخۆ گرتووە ◊ المادّية: بیرو باوەڕو مەزهەبێکە تەنها بڕوای بەمادە هەیە ◊ هەموو شتێک بەمادە تەفسیر دەکا ◊ المِداد: مەرەکەب ◊ نەوتو ڕۆنی فتیلەو چرا ◊ میشالو ڕێبازو پرۆگرام ◊ دەشگوترێ: (سبحان الله مِداد السموات): بەئەندازەی بەرفراوانی ئاسمان سوپاسو تەقدیس بۆ پەروەردگار ◊ المَدُّ: لافاو ◊ ناوی زۆر ◊ مەسافەو مەودا ◊ المُدُّ: پێوەرێکی کۆنە بۆ پێوانەکردنی دانەوێڵەو شتی وا.

المَدَدُ: ئەوەیە شتی تری پێ زۆربکەی.

**مَدَدُ الجیش**: ئەو کۆمەڵە سەربازو کەرەستەیە دەخرێتە پاڵ سوپا بۆبەهێزکردنی ◊ المِدان: ئاوی زۆر سوێر ◊ المَدَّة: نیشانەیەکە دەخرێتە سەرپیتی هەمزەی درێژ کراوە ◊ المُدَّة: ماوەیەکە لەکات ئەندازەیەکی زەمەند چ زۆرو چ کەم ◊ المِدّة: کێمو زوخاو ◊ المَدید: درێژ ◊ دەگوترێ: (قدّ مدید ورجل مدید الجسم) ◊ هەروا ناوە بۆ بەحرێکی عەروز لەبواری کێشی شیعردا کێشەکەی دوجار (فاعلاتن فاعلن فاعلاتن) ◊ المَمْدودُ: دەگوترێ: (مال ممدود) ماڵی زۆر ◊ لەزاراوەی زانستی صەرف دا وشەی (ممدود) ناوە بۆ نیسمێکی موعرەب کە کۆتایی بە هەمزە بێ‌و لەپێشیەوە ئەلفێکی زیادە هەبێ ◊ وەکوو (سمراء، صحراء).

**مَدَرَ الحَوضَ**: درزو کەلێنی دیواری حەوزەکەی بەنکەشی کرد.

**مَدِرَ مَدَراً**: گەدەی زل بوو لاکەلەکەی فش بوون.

**مَدِرَ الصَّبِيُّ رغبی**: منداڵەکە پیسایی کردە ناو دەرپێ‌و جلەکانیەوە.

**مَدِرَ الضَّبُعُ**: کەمتیارەکە لاتەنیشتی خوڵاوی بوو ◊ أمْدَرَ الحوضَ: کەلێنو درزی دیواری حەوزەکەی پڕکردنەوە. ◊ مَدَّرَ الحَوضَ: بەمانا (مَدَرَه)دێ ◊ الأَمْدَرُ: ئەوکەسەی گرنگی بەپاکو خاوێنی جەستەو پۆشاکی نادا ◊ المَدَرُ: قوڕی لینجو تۆپەڵ بوو ◊ أهلُ المَدَر: خانوو نشین پێچەوانەی دەوار نشینەکان ◊ المَدْراءُ: (بنو مدراء)؛ شارەستانیو گوندنشین ◊ المَدَرَةُ: گوندێک خانوەکانی بەقوڕو خشتی گڵ دروست کرابێ ◊ المَديرُ: (مکان مَديرٌ): شوێنێکە بەقوڕ تەخت کراوە ◊ المِمدَرُ والمَمْدَرُ: شوێنێک قوڕی لێ بێ بکرێ بەدیوار.

**مَدَشَ** لفلان من العطاء: بەخششی لەفلان کەم کردەوە.

**مَدِشَ** فلان: فلانکەس لاواز بوو ◊ مَدِشت العينُ: چاوەکە بینینی کەم بوو.

**مَدِشَ** عَصَبُ اليد: ڕەگی دەست شل بوو ◊ مَدِشَت الرِّجْلُ: قاچەکە قەڵشا

**مَدِشَ** باطن رسغي الفرس: دوقاچی ئەسپەکە لێک خشان ◊ فەیزەن بوو.

**مَدَقَ** الصَّخْرَةَ: بەردەکەی شکاند ◊ تَمَدَّلَ بالمنديل: بەدەسە سڕەکە دەمو چاوی سڕینەوە ◊ پارچە قوماشەکەی لەسەری بەستو کردی بەمێزەر.

**مَدَنَ** فلان: فلانکەس هاتە شارو بوو بەشارەستانی ◊ تَمَدَّنَ: بەژیانی شارەستانیانە فێربوو. تَمَدْيَنَ: بەشێوەی ژیانی شارەستانیانە ژیاو کالاو کەرەستەی شارەستانیانەی بەکارهێنان ◊ المدنية: شارەستانیەتو پێشکەوتنی باری ژیان ◊ المدينة: شار، گەورە شار ◊ ناوی مەدینەی منەوەرەشە ◊ أمدى فلان: فلانکەس پیر بوو ◊ أمدى فلاناً: مۆڵەتی فلانکەسی دا ◊ ماداه مماداةً: بۆماوەیەک

هاوسێی کرد ◊ تمادی في الأمر: گەیشتە ئەوپەڕ لەکارەکەدا ◊ تمادی في غيّه: لەگومڕایی دا ڕۆچوو. ◊ المدی: مەسافە ◊ ئامانج.

**مَدَى** البصر: مەسافەی دیتنی چاو تاچاو بڕبکا ◊ **المُدْيَةُ**: کێرد، چەقۆ ◊ **المَدِيُّ**: جۆگایەکی بچوکە ئەو ئاوەی لەحەوز یان لەبیر دەڕژێ بەهۆی ئەو جۆگەلەوە ئاوەکە لە بیرەکە دوور دەکەوێتەوە ◊ **المِیداءُ**: ئامانجو کۆتایی شت ئەندازەو قەبارەی شت.

**مَذِحَ** الشَّيْءُ بالشَّيْءِ مَذَحاً: شتەکە لەشتەکە خشاو شەق بوو درزی برد ◊ دەشگوترێ: (مَذِح فلان): فلانکەس ڕانی لێك دەخشێن ◊ **تَمَذَّحت خاصرته**: کەلەکەی فش بوو ◊ **تَمَذَّحَ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵملیست، هەڵمژی ◊ **الأمْذَحُ**: کەسێکە لەڕۆیشتن دا دوڕانی لێك بخشێن لەبەر قەڵەوی ◊ **مَذِرَت البیضة مَذَراً**: هێلکەکە پیس بوو.

مَذِرَت مَعدَتُهُ: مەعیدەی پیس بوو.

**مَذِرَ** فلان: فلانکەس زۆر چوو بۆ سەرئاو ◊ **أمذرت الدجاجةُ البیضَة**: مریشکەکە هێلکەکەی پیس کرد ◊ **مَذَّرَ الشيَ**: شتەکەی بڵاو کردەوە ◊ **تَمَذَّرَت مَعِدَتُهُ**: بەمانا (مَذِرَت)دێ ◊ **تَمَذَّرَ الشَّيْءُ**: شتەکە بڵاو بۆوە ◊ **تَمَذَّرَ اللَّبَنُ**: ماستەکە لەناو مەشکەکەدا بڵاو بۆوە ◊ **المَذَرُ**: دەگوترێ: (ذهب القوم شذر مَذَر): خەڵکەکە پەرتەوازە بوون ◊ **مَذْرَقَ بە**: فڕێی دا ◊ **المَاذَرْیُونُ**: درەختێکە گەڵاکەی وەکوو گەڵای زەیتون وایە، گوڵەکەی مەیلەو سپییە ◊ دەشگوترێ: (المازریون).

**مَذَعَ** فلان مَذْعاً: فلان درۆی کرد لافو گەزافی لێ دا.

**مَذَعَ** المیاهُ: ئاو لەسەر کێوەکانەوە بوو بەلافاو.

**مَذَعَ** یمیناً: سوێندی خوارد.

**مَذَعَ** لي الخبرَ: هەندێکی لەهەواڵەکە بۆ گێڕامەوەو هەندێکی شاردەوە ◊ یان هەواڵەکەی لەنیوە دابڕیو چووە سەر باسێکی تر.

**مَذَعَ** الضَرعُ: نیوە گوانەکەی دۆشی نیوەی هێشتەوە ◊ **تَمَذَّعَ الشرابَ**: شەرابەکەی وردە وردە خواردەوە ◊ **المَذَّاعُ**: درۆزن ◊ کەسێك وەفاو ئەمەکی نەبێ ◊ پاشملە باسی کەسانی دی بکا بەخراپە

**مَذَقَ** اللَّبَنَ والشرابَ بالماء مَذقاً: شیرو شەرابەکەی تێکەڵ بەئاو کرد.

**مَذَقَ** فلاناً: شیری ئاو تێکەڵکراوی دەرخواردی فلان دا.

**مَذَقَ** الوُدَّ: خۆشەویستییەکەی بێ خەوش نەبوو ◊ **ماذق فلاناً في الوُدُّ**: خۆشەویستییەکەی بێ خەوش نەبوو ◊ بەڕاستی فلانکەسی خۆش نەویست ◊ **إمتَذَق الشرابُ أو اللَّبَنُ بالماء**: شەراب یان شیرەکەی تێکەڵ بەئاو کرد ◊ **إمَّذَق الشراب أو اللبن بالماء**: بەمانا (إمتَذَق)دێ ◊ **المَذّاق**: درۆزن، زۆر درۆزن ◊ غەمبارو خەمۆك ◊ **المَذِقُ**: (لبن مَذِقٌ): شیری ئاو تێکەڵکراو ◊ (رجل مَذِق): پیاوی خەمۆك ◊ **المَذقَة**: شیری ئاوتێکراو ◊ (أبو مذقة): گورگ.

**مَذَلَ** بسرِّه: نهێنییەکەی بۆ هەڵنەگیراو ناچار درکاندی ◊ **مَذَلَت نفسه بالشيء**: نەفسی شتەکەی قبوڵ بوو.

**مَذِلَ** فلان: فلانكەس نارەحەت بوو توشی قەلەق‌و دلەڕاوکێ بوو ◊ بەهەڵگرتنی نهێنییەکە توشی دلەڕاوکێ بوو بۆیە درکاندی.

**مَذِلَ** بِمضجَعِه: بەشوێنی نوستنەکەی نارەحەت بوو بۆیە لەو شوێنە گواستییەوە.

**مَذِلَ** بِمالِه: بەمانەوەی ماڵ‌و سامانەکەی لەدەستی دا نارەحەت بوو بۆیە بەخشی

**مَذِلَ** علی فراشِهِ: لەسەر جێگاکەی هەدای نەداو ناچار گواستییەوە ◊ مَذِلَت رجلُه: قاچی تەزی قاچی شل بوو ◊ **أَمْذَلَ فلاناً:** فلانکەسی جاڕس کرد، توشی دلەڕاوکێی کرد ◊ **إِمَّذَلَ فلان:** بەمانا (أَمْذَلَ)دێ ◊ **إِمَّذَلَ مَفاصِلُه:** جومگەکانی شل بوون ◊ **المُذْلَةُ:** شوێنکەو نوختە لەسەر بەردو شاخ ◊ دەنکە خورما ◊ **المَذِيلُ:** نەخۆشێک کە حەجمینی نەبێ ◊ ئاسنێک بەئاسانی بشکێ ◊ **المِذْلُ:** کەسێک نەتوانێ نهێنی بپارێزێ‌و ناچاربێ بیدرکێنێ ◊ کەسێک زۆرجار قاچی توشی تەزین ببێ ◊ **مَذْمَذَ فلان:** فلانکەس درۆی کرد ◊ **المَذْماذُ:** کەسێک زۆر قیژەو قاڕەو قیرە بکا دەم بەهاوار بێ ◊ **المَذْمَذِيُّ:** بەمانا (المَذْماذُ)دێ ◊ مرۆڤی فێڵبازو قسە خۆش.

**مَذَى** الرجلُ مذياً: پیاوەکە لەکاتی یاریکردن‌و شتی وا لەگەڵ ئافرەت دا مەزی هاتەوە.

**مَذَى** الفَرَسَ: ئەسپەکەی بەرەڵای پاوان کرد ◊ **أَمذَى الرجُلُ:** بەمانا (مذی)دێ ◊ **امذَى شرابَهُ:** شەرابەکەی زۆر ڕون کردەوە ◊ **أمذَى الفَرَسَ:** ئەسپەکەی بەرەڵای لەوەڕگا کرد ◊ **الماذِي:** هەنگوینی سپی ◊ ئاسنی بێ خەوش‌و چاک ◊ **الماذِيَّةُ:** شەراب‌و عەرەق ◊ زرێی نەرم ◊ **المذاءُ:** نەرم‌و شلەپەتە ◊ **المَذِيُّ:** ئاوێکی ڕونە لەڕێڕەوی میزەوە دێتەدەر لەکاتی یاری کردن لەگەڵ ئافرەت دا ◊ **المَذْيُ:** بەمانا (المَذِيُ)دێ ◊ **المَذِيَّةُ:** ئاوێنەی ڕومالکراو ◊ **المَذِيَّةُ:** بەمانا (المَذِيَّةُ) دێ.

**مَرَأَ** الطعامُ مراءةً: خۆراکەکە بەلەزەت‌و گونجاو بوو.

**مَرَأَ** فلان: فلانکەس خواردنی خوارد.

**مَرِءَ** مَرَأً: پیاوەکە لەشێوەدا یان لەگفت‌و گۆدا ژنانە بوو.

**مَرِءَ** الطعامَ: خۆراکەکەی پێکەوت بەلایەوە بەلەزەت بوو ◊ **مَرُءَتِ الأرضُ:** زەوییەکە کەش‌و هەوای خۆش بوو.

**مَرُءَ** فلان مروءة: فلانکەس بوو بەخاوەن پیاوەتی

**مَرُءَ** الطعام: خۆراکەکە بەلەزەت‌و گونجاو بوو ◊ **أَمْرَءَ الطعامَ:** خواردنەکەی بەلەزەت کرد ◊ **أَمْرَأَ الطعامُ فلاناً:** خواردنەکە سودی باشی بەفلانکەس گەیاند ◊ **تَمَرَّأَ فلان:** فلانکەس بوو بەخاوەن شکۆمەندی‌و ڕێز ◊ بەتەکەللوف شکۆمەندی بەسەر خۆی دا هێنا ◊ **تَمَرَّأَ بالقوم:** هەوڵی دا خەڵکەکە بەخاوەن شکۆو ڕێزداری وەصف بکەن ◊ **إِسْتَمْرَأَ الطعامَ:** خواردنەکەی بەخۆش‌و بەلەزەت هاتە دەست ◊ **المَرْءُ:** مرۆڤ پیاو ◊ ئەگەر (ال) بەوشەکەوە نەبوو دەگوترێ: (إِمْرُءُ) ◊ بۆ مێیینە دەگوترێ: (مراه) ◊ **المُروءةُ:** ئادابی نەفسانی‌و هەڵس‌وکەوتێکە کەلەبەر چاوگرتنی ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ پابەندبوون بەڕەوشتی جوان‌و داب‌و نەریتی پەسەند ◊ **المَرِيءُ:** گەرو، ڕێڕەوی خواردن بەناو گەرودا بۆ مەعیدە ◊ (طعام مَرِئٌ): خواردنی خۆش‌و بەلەزەت‌و بەسود ◊ (کلام مَرِئٌ): قسەیەک کەلەکردنی دا پەشیمان نەبی.

**مَرَتَ** الشَّيْءَ: شتەکەی تاس‌و لوس کرد.

مـــاروت: هــاورێی (هــاروت)؛ کـــه دووفریـــشتەن لەقورئان دا ناویـان هـاتووە ◊ المَرْتُ: دەشتێـکی بێ گژوگیایە ◊ (رجـل مَـرْتُ الجـسدِ)، پیاوێـکە جەستەی موی لـێ نەهاتووە ◊ المُرُوتُ: سارای بێ گیاو گژو درەخت.

مَرَثَ الـشَّيْءَ في المـاءِ: شتەکەی لـەناو هەڵکێشا ◊ دەشـگوترێ: (مَرَثَ الشعرَ وغـيره بيـده)، دەسـتی بەقـژی دا هێنـاو لـەناو ئـاودا هـەڵیگلۆفت بۆئەوەی باش تەڕببن.

مَرَثَ الشَّيْءَ: شتەکەی مژی.

مَرَثَ به الأرضَ: بەزەوی کێشا.

مَـرِثَ علـى الخِـصام: پـشوو درێـژبوو بـۆ کێـشەو ململانێ لەگەڵ ناحەزانی دا.

مَرِثَه: بەمانا (مَرَثَهُ)دێ ◊ مَرَّثَ الماءَ: ئاوەکەی پیس کرد ◊ المِمْرَث: پشو درێژو بەصەبرو بار قوڵ بۆ کێشەو ململانێ لەگەڵ رکابەرەکەی دا ◊ المُمَرَّثةُ (أرض ممرثـة): زەوییەکـە بارانێـکی کـەمی لـێ باری.

مَرَجَ اللهبُ مروجاً: بڵێسەکە بەرز بۆوە.

مَرَجَ الخاتمُ في اليد: هەنگوستیلەکە لەپەنجەدا شل بوو.

مَرَجَ الشَّيْءَ مرجاً: شتەکەی تێکەڵاو کرد.

مَـرَجَ لـسانَهُ في أعـراض النـاس: پاشملە بەخراپە باسی خەڵکی کرد.

مَــرَجَ الدابَّــةَ: وڵاخەکـەی بـەرەڵڵاکرد بۆئـەوەی بلەوەڕێ.

مَرَجَ السلطانُ رعيَّتَـهُ: پاشا خەڵکەکەی لەفەسادو گەندەڵی نەگێڕایەوە.

مَرَجَ الكذبَ: کەوتە درۆکردن.

مَرَجَ أمرَهُ: ئیشی خۆی فەوتاند شێواندی.

مَـرِجُ النـاسُ: خەڵکەکە تێـکەڵاو بـوون، ئیشەکە تێکەڵو پێکەڵ بوون.

مَرِجَ الدينُ او العهدُ: ئاییـنەکە شێوا وادەو بـەڵێن تێـك چـونو خـەڵك پـەیڕەوییان ناکـا ◊ امْـرَجَ الشيءَ: شتەکەی تێکەڵو پێکەڵ کـرد ◊ أمْـرَجَ لسانه في اعراض الناس: غەیبەتی خەڵکی کـردو دەمـی خـستە نـاموسو کەسـایەتی خـەڵکانی ترەوە ◊ أمْـرَجَ الدابَّـةَ: وڵاخەکەی بـەرەڵای نـاو لـەوەڕگا کـرد ◊ أمْـرَجَ فـلان عهـده: فڵانکـەس پابەندی پەیمانی خۆی نـەبوو ◊ المارج: بڵێـسەی ئاگر کە بەرزدەبێتەوە ◊ یان ئەو بڵێسە ئاگرەی کەلەگەڵ دوکـەڵ تێـکەڵە ◊ دەشـگوترێ: (رجـل مـارِج) پیـاوی ڕەوانـەکراو کەلـەهیچ لەمپـەڕو سەیتەرە دا مەنع نەکرێ ◊ المَرْجُ: زەوی پانو پڕ گژوگیا بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ ◊ المَرَجُ: گەندەڵی ◊ فیتنـەو ئاشـوب ◊ تەنگـژەو چـورتم ◊ المَرْجـان: ڕەگـــەزی حـــەیواناتی دەریاییـــە، لـــەپێڕی (المرجانيات)ە پەیکەرو کلسی هەیـە بەباشـترین بـەردی گرانبـەها دەژمێـردرێ، مـادەی مـەرجان لـەدەریای سـوردا زۆرە ◊ جۆرێـــکە لەماســـی کەپەڕو پۆلەکانی سورن ◊ ڕوەکێـکی بەهارییـە بەئەندازەی نیو مەترێـك بەرز دەبێتەوە ◊ لقو پـۆپی سـورن، گەڵاکـەی پـانو نـەرمو ئـاودارە ◊ المـريج: (أمـــر مـــريج)، کارێـــکی چەواشـــەکارو پشێوییە

المِمْراجُ: کەسێـك ئیشەکانی ڕێـكو پێـك نەبن.

مَرِحَ فلانٌ: فلانکەس زۆر کەیفخۆش بـوو زەوقو نیشاتی زۆر بـوو ◊ لارو لەنجـەی کـرد ◊ مَرِحَت الأرض بالنبات: زەوی ڕوەکی ڕواند.

مَــــرِحَ الـــزرعُ: کـــشتوکاڵەکە گـــوڵی کـــرد.

**مَلَكَ فلان إمْرَأةً**: فلانكەس ئافرەتێكی مارە كردو كردی بە هاسەری خۆی ◇ **أمْلَكَهُ الشَّيْءَ**: شتەكەی كردە ملكی ئەو ◇ **أمْلَكَ فلاناً أمْرَهُ**: كاروباری خۆی دایە دەست فلانكەس ◇ **أُمْلِكَتْ فلانَةُ أمرها**: فلان ئافرەت تەلاق درا، یان تەلاقی درایە دەس خۆیو خۆی خاوەنی تەلاقی خۆیەتی ◇ **أمْلَكَ فلاناً المرأةَ**: ئافرەتەكەی لەفلانكەس مارە كرد.

**مَلَّكَ القومُ فلاناً عليهم**: خەلكەكە فلانكەسیان كردە پاشاو مەلیكی خۆیان ◇ **مَلَّكَ فلاناً الشَّيْءَ**: شتەكەی كردە ملكی فلان ◇ **إمْتَلَكَ الشَّيْءَ**: بوو بەخاوەنی فلان شت شتەكەی كردە ملكی خۆی ◇ **تمالَكَ عَنْ الشَّيْءِ**: جلەوی نەفسی خۆی گرتو دەستی بۆ شتەكە نەبرد ◇ **تَمَلَّكَ الشَّيْءَ**: بووە خاوەنی شتەكە، شتەكەی كردە ملكی خۆی ◇ (أبو مالك) نازناوی برسیەتییە ◇ (مالك الحزين) ناوی باڵندەیەكی ئاوییە، بۆیە ئەم ناوەی لێ نراوە چونكە لە نزیك جۆگاو كانیاوەكان دەژی هەركە دەبینێ ئاوێك وشك دەبێ غەمبار دەبێ ◇ **المَلاكُ**: فریشتە ◇ **مـلاك الأمر**: پوختەی كار، عونصوری سەرەكی كارو شت ◇ **المِلاكُ**: (مِلاك الأمر) ڕاگرو پایەی سەرەكی كارو شت ◇ **المَلِكُ**: مەلیكو پاشا ◇ ئەوشتەی كە دەكرێتە ماڵو سامان دێتە ژێر دەستەوە ◇ ویستو ئیرادەی سەربەست ◇ **المُلْكُ**: موڵكو سامان ◇ **المَلَكُ**: تاكی (الملائكة)یە ◇ **المَلِيكُ**: پەروەردگار كەهەر ئەو بەڕاستی مەلیكو خاوەن دەسەلاتە ◇ **المَلَكَةُ**: صیفەتێكە لەنەفس دا پەیدا دەبێ، یان ئامادەباشییەكی عەقلی تایبەتییە بۆ ئەنجامدانی كارێكی تایبەتی بەلێهاتوییو دەست ڕەنگینی ◇ وەكوو مەلەكەی ژمارە ژماردن، مەلەكەی زمانەوانیو شتی وا ◇

**المَلَكُوتُ**: جیهانی غەیبو نادیار لەئێمەو تایبەت بەگیانەكانو نەفسەكانو شتە عەجیبەكان ◇ **مَلَكوت الله**: دەسەلاتو عیززەتی پەروەردگارو شكۆمەندی ◇ ملكی تایبەتی پەروەردگار ◇ **المَلَكية**: شتی پاڵدراو بۆ پاشایەتی ◇ دەگوترێ: (الحكومة المَلَكية) ئەو دەسەلاتو ڕژێمەی مەلیك سەروكاریی دەكا بەیاسای بنەماڵەیی یەك لەدوای یەك ئەو پۆستە لەلایەن یەكێك لەبنەماڵەی مەلیكەوە وەردەگیرێ ◇ **المِلكيَّةُ**: ملكو بەماڵكردنو مافی تەصەروف كردن تێیدا ◇ (قانون تحديد الملكية الزراعية) یاسای دیاریكردنی ئەوەی بۆ هەرتاكێكی كۆمەڵ چەند ڕەوایە زەوی كشتو كاڵی بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە ◇ (الملكية الخاصة) ملكی تایبەت بەتاكێكی كۆمەڵ ◇ (الملكية العامة) ملكی گشتیو كۆیایەتی، ئەوەی كە دەوڵەت خاوەنداریەتی ◇ **المليك**: خاوەن موڵكو دارای سامان ◇ **مليك الخلق**: خاوەنو بەڕێوەبەرو بەخێوكاری دروستكراوان.

**المَمْلَكَةُ**: دەسەلاتی مەلیك لەناو ڕەعیەتو دانیشتوانی وڵاتی دا ◇ هەروا ناوە بۆ دەسەلاتو فەرمانڕەوایەك كە مەلیك بەڕێوەی بەرێ ◇ **مملكة الطريق**: ناوەڕاستی ڕێگا ◇ زۆربەی ڕێگا ◇ **المَمْلوكُ**: كۆیلە.

**مـلَّ فـلان مَـلاً**: فلانكەس خەمۆكی توش بوو ◇ لەناو غەمو نەخۆشی دا تلایەوە.

**مَلَّ نعلي فلان السفرُ**: سەفەری فلان درێژەی كێشا.

**مَلَّ في المشي**: لەڕۆیشتن پەلەی كرد.

**مَلَّ الشَّيْءَ**: شتەكەی ئەمدیواو دیو كرد، هەڵی گێرایەوە.

**مَـلَّ الـشَّيْئَ فِي الجَمْرِ**:شـتـەکەی خـسـتە نـاو کورەخانەکەوە.

**مَلَّ الخبزَ أو اللحْمَ فِي النار**:نانەکە یـان گۆشـتـەکەی خستە سەرئاگر.

**مَـلَّ القـوس أو الـسَّهْمَ فِي الـنـار**:کەوانەکـە یـان تیرەکەی بە ئاگر چارسەر کرد.

**مَلَّ الثوبَ**:یەکەمجار قوماشەکەی دوری.

**مَلَّ فلان الـشَّيْئَ**:فلانکەس لەشتەکە وەرز بـوو ٥ دڵی لێی هەڵەنگوت ٥ **أمَلَّهُ وأمَـلَّ عَلَيْهِ**: زۆری داوا لێ کرد تا وەرزی کرد ٥ **أمَـلَّ الـشَّيْئُ فلانـاً**: شتەکە فلانکەسی وەرز کرد. ٥ **أمَلَّ عَلَيْهِ السَّفَرُ**: سەفەرەکەی درێژ بۆوە ٥ **أمَلَّ عَلَيْهِ المَلَوانُ**: شەو و رۆژ جیاوازییـان زۆر بـوو ئـەمیان زۆر درێـژو ئەویان زۆر کورت ٥ **أمَلَّ الـشَّيْئَ**: شـتـەکەی شی کـردەوە و نووسـرایەوە ٥ **مَلَّـلَ فـلان الـشَّيْئَ**: فلانکەس شتەکەی ئەمدیواو و دیو کرد ٥ **إمْتَلَّ مِلَّةَ الإسلام**: چووە سەر ئایینی ئیسلام ٥ **تَمَلْمَلَ**: وەزعو حـاڵی گـۆڕا لـەم نەخۆشـی بـۆ ئـەو نەخۆشیو هەردەمـە توشـی بـەڵاو چورتمێـك بوو ٥ **تَمَلَّلَ فِي المشي**: لەرۆیشتن دا پەلەی کرد ٥ **تَمَلَّلَ اللحْمُ على النار**: گۆشتەکە لەسەر ئاگرەکە هەڵبەزو دابەزی کرد ٥ **تَمَلَّلَ مِلَّةَ الإسلام**: چووە سـەر ئـایینی ئیـسلام ٥ **إسْـتَمَلَّهُ**: جـاڕزی کـرد، وەرزی کرد ٥ **الأمْلُولَةُ**: بەمانا مەلەلو خەمۆکی دێ ٥ **المالُولَةُ**: کەسێك جاڕز بێ ٥ **المَـلالُ**: خـەمو وەرزبونێـکە توشـی ئـادەمیزاد دەبـێ لـەناکامی بـەردەوام بـوون لەسـەر کارێـکو ماندویـەتیو وەرزبـوونی بـۆ پەیـدا دەبـێ ٥ **المُـلالُ**: گـۆڕانو ئەمـدیواو ئـەو دیـو کـردن لـەناو نەخۆشـیو ئێشو ئـازاردا ٥ دەگـوترێ: (أخـذ فلانـاً المَـلالُ) خەمۆکیو بـەڵاو کارەساتی جۆراوجۆر بەسـەر فـلان دا هـاتن ٥ پـشت ئێـشە ٥ ئـارەقی تـاو نەخۆشـی ٥ ئـەو گەرمایـەی لـەناو ئێـسقانی جەستەدا پەیدا دەبێ لەناکامی تاو نەخۆشی دا ٥ **المَلَـــلُ**: نیـــشانەیەکە بەئێـــسقانی پـــاش گوێچکەوەیە ٥ **المُلِّي**: نانی برژاوی ناو تەندور ٥ **المَلالَةُ**: جاڕزبوون وەرزبوون ٥ **المَلَّـةُ**: گڵی گەرم، خۆڵەمێـشی گـەرم یـان پـشکۆئاگر کـە کێـشتی لەسـەر گـەرم بکـرێ، یـان نـانو کولێرەی تێـدا ببرژێنـدرێ ٥ عـارەقی تـاو نەخۆشی ٥ کەسێـك زۆر لەهاوەڵـەکانی وەرزبـێ ٥ **خُبْـزُ المَلَّـةِ**: نـانی تەنـدورو ئـاگردان ٥ ئـەو شـتەی نـانی تێـدا دەبرژێنـدرێ ٥ **المِلَّةُ**: شەریعەتو یاسا ٥ ئایین ٥ ئـــاینی ئاسمـــانی کـــە خـــودا بـــەهۆی پێغەمبەرەکانیـەوە گەیاندویەتیـە بەنـدەکانیو فـەرمانی پێـکردوون کـە بـەو رێبـازەدا بـڕۆنو ئەو شەریعەتە پەیڕەو بکەن بۆئەوەی لەدونیاو قیامـەت دا بەختـەوەر بـن ٥ هـەروا نـاوە بـۆ خوێنبـایی کـوژراو یـان برینـدارکراو ٥ **المُلَّـةُ**: دورونـــی جـــاری یەکـــەم ٥ ئـــەو تەختـــەوە مەعدەنـەی لەسـەر سیـسەم لـەژێر دۆشـەکەوە دادەنرێ. ٥ **المَلُولُ**:کەسێك زوو وەرزبێ ٥ **المَلولةُ**: بەمانا (الملول) دێ ٥ **المَليلُ**: نـان یـان گۆشـت کـە دەخرێتە تەندورو ئاگردانـەوە بۆئـەوەی بـبرژێ ٥ دەگـوترێ: (أطعمنا خبـزاً مليـلاً) نـانی بـرژاوی دەرخـوارد دایـن ٥ **رجـلٌ مليـلٌ**: پیاوێـکە خـۆر سـوتاندویەتی ٥ (طريـق مليـلٌ) رێـگای تـەخت کـراو و ئاشکرا ٥ **المَليلَـةُ**: گـەرمی تـاو شـتی وا کەلـەناخی ئێـسقان دا پەیـدا دەبـێ ٥ تەشـەنە سەندنی گەرمی تا لەناو مۆخ دا ٥ **المُمَلُّ**: (حيوان مُمَـلٌّ) گیانلەبەرێـکە مانـدوکراوە، زۆر سـواری بـوون ٥ (طريـــق مُمَـــلٌّ) رێـــگای تـــەختکراو و خۆشکراو و زۆری خەڵك پێدا رۆیشتوو ٥ **المِلِّيمُ**:

جۆره پارمیەكی ولاتی میصره بەشێكه لەهەزار بەشی جونەیهی میصری ◊ مَلْمَلَ الرجلُ: پیاوەكه خێرا ڕۆیی ◊ مَلْمَلَ فلاناً: فلانكەسی ئەمدیواو دیو كرد ◊ تَمَلْمَلَ: لەسەر جێگای نووستن حەجمینی لێ هەڵگیرا شەو تا بەیانی ئەمدیواو دیوی كرد ◊ المُلامِلُ: ولاخی خۆشڕۆ و خێرا ڕۆ (المُلَمَلَی) بەهەمان مانا دێ ◊ المُلْمُولُ: كلچێوك بۆ چاو ڕشتن ◊ ناسنێكه شتی پێ دەنووسرێ، یان نەخش و شتی وای پێ ئەنجام دەدرێ ◊ المَلَنخولیا: بەڕای پزیشكه كۆنەكان نەخۆشییەكی عەقڵییه لەئاكامی فەسادی بیركردنەوەوە سەرهەڵدەدا كه ئەمیش بەهۆی زاڵبونی یەكێك لەچوار عونصورەكه بەسەر ئەوانی تردا دێته دی ◊ به بیرو باوەڕی پزیشكی تازه نەخۆشییەكی عەقڵییه هەندێ لەدیاردەكانی تێكچونی ویژدان و زاڵبوونی خەم و دڵەڕاوكێیه بەسەر مرۆڤەكەداو توشبوونیەتی بەحاڵەتی ڕەشبینی و بەرچاو تاریكی: كه ئەمیش بەهۆی تێكچونی جەستەیی و سستی كاركردنی غودەدە كەرەكانه.

**مَلا** فلان مَلواً: فلانكەس بازی دا ◊ أَمْلاهُ الله العَیْشَ: خودا مۆڵەتی دایه زۆر بژی ◊ (أملى عَلَيْهِ الزمان) ڕۆژگاری زۆری بەسەردا تێپەڕی و تەمەنی درێژ بوو ◊ أملى عَلَيْهِ الكتابَ: كتێبەكەی بۆ خوێندەوە بۆئەوەی ئەویش بینووسێتەوە ◊ بەسەری دا خوێندەوە ◊ مَلَّاهُ الله العَیْشَ: خودا زۆری ژیاندو تەمەنی درێژی پێدا ◊ مَلّاكَ الله حَبیبَكَ: خودا ژیانت لەگەڵ خۆشەویستەكەت درێژ بكاتەوە ◊ تَمَلّى عُمْرَهُ: تەمەنی بەخۆشی بەسەر برد. ◊ تَمَلّى إخوانه: خۆشی و لەززەتی لەبراكانی بینی ◊ تَمَلّى العیشَ: ژیانی بۆ درێژ بۆوه ◊ إسْتَمْلاهُ الكتابَ: داوای كرد كتێبەكەی بەسەردا بخوێنێتەوه ◊ المَلاَ: ساراو دەشت و چۆڵەوانی ◊ پارچەیەك لەزەمەن ◊ دەگوترێ: (مَرّ مَلاً من اللیل) بەشێك لەشەو ڕۆیی ◊ المَلَوان: شەو و ڕۆژ ◊ یان بەیانی و ئێواره ◊ المَلاةُ: چۆڵەوانی بەردەڵان و خڕاوی و گەرمەڵان ◊ المُلی: خۆڵی گەرم ◊ ماوەیەك لەزەمەن ◊ المُلاوَةُ: ماوەی ژیان ◊ المَلْوَةُ: بەمانا (المَلاوَةُ) دێ ◊ دەگوترێ: (أقام عنده مَلْوةً من الدهر) ماوەیەك لەڕۆژگار لای مایەوه ◊ هەروا وشەی (المَلْوَةُ) ناوه بۆ ئامێرێكی پێوانەی دانەوێڵە لەولاتی میصر باوه، ئەندازەكەی چواریەكه كێلەیەكە، یان سێ كیلۆگرامه ◊ یان دوو ئوقیەو نیوه ◊ المُلْوَةُ: بەمانا (المَلاوَةُ) دێ ◊ المَلِيُّ: ماوەی درێژ ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاهْجُرْنِي مَلِيًّا﴾ ◊ دەشگوترێ: (فَضَ مَلِيٌّ من النهار او اللیل) بەشێكی زۆری شەو تێپەڕی ◊ الملیون: هەزار جار هەزار.

**مَنْ**: بۆ چەند مانایەك دێ: (شرطیة، إستفهامیة، موصولة، نكرة موصوفة).

**مِنْ**: حەرفی جەڕه بۆ چەند مانایەك بەكار دێ لەكتێبه نەحوییەكان دا دیاریكراون.

**مَنَأ** الجِلْدَ: پێستەكەی لەدەباغ هەڵكێشا ◊ المَنیئَةُ: پێست لەسەرەتای كه لەدەباغ دەردەهێندرێ ◊ دەباغخانه ◊ المناورة: مانۆڕی سەربازی ◊ فێڵ و تەڵەكه ◊ المِنْبارُ: گیپەو سەروپێ ◊ خواردنێكه لەكوته گۆشتی هەنجندراو و برنج لەڕیخۆڵەو ورگی پاككراوی ئاژەڵ دا خڕ هەڵدەدرێ و دەكوڵێندرێ ◊ المَنْجنیق: بڕوانه مادەی (مَجَنَق) ◊ المَنْجَةُ والمَنْجو: ڕەگەزی درەختی بەردار

لەپێڕی قەزوانی، بەرەکەی دەنکە دەنکەیەو بەتامەو دەخورێ‌و دەکرێتە مرەبا، دەکرێتە سرکە، ئەم جۆرە درەختە لەولاتی گەرمەسێردا دەڕوێ‌و بەردەگرێ، لەولاتی میسر زۆرە ◊ **المَنْجَمُ**: بڕوانە مادەی (نَجَمَ) ◊ **مَنَحَهُ الشَّيْءَ مَنْحاً**: پێی بەخشی ◊ **مَنَحَهُ الدَّابَّةَ**: ولاخەکەی پێدا بۆئەوەی ئیشی خۆی پێ بکاو دوایی بۆی بهێنێتەوە ◊ **مانَحَهُ مِناحاً ومُمانَحَةً**: بەخششی دایە ◊ **أمْنَحَتْ النّاقَةُ**: حوشترەکە نزیکە بەری ببێ‌و زاو و زێ بکا.

**مانَحَه مِناحاً ومُمانَحَةً**: دیاری‌و بەخششیان دا بەیەکتر ◊ **مانَحَت الناقةُ**: حوشترەکە شیری هاتەوە دوای ئەوەی حوشترەکان شیریان وشکی کرد ◊ **مانَحَت العينُ**: فلانکەس بەخششی وەرگرت ◊ **أمْتَنِحَ مالاً**: ماڵ‌و سامانی پێ درا ◊ **تَمَنَّحَ المالَ**: ماڵی دەرخواردی یەکێکی تر دا ◊ **إسْتَمْنَحَهُ**: داوای مینحەو بەخششی لێ کرد ◊ **المِنْحَةُ**: عەتاو بەخشش ◊ ولاخێکە، ئامێرێکە، پارچە زەوییەکە یەکێک دەیدا بە یەکێکی تر بۆئەوەی ماوەیەک کەڵکی لێ وەربگرێ‌و دوایی بۆی بگێڕێتەوە ◊ **المَنوحُ**: ئاژەڵێکی شیر دەرە کەدرەنگ شیری وشک بکا هاوچەشنەکانی شیریان نەمێنێ‌و ئەو هەر شیر بدا ◊ **المَنيحُ**: تیرێکە لەچوار تیرەکانی قومار کەنەقازانج نەزەرەر هیچی لەسەر نەنووسراوە.

**مُنذ ومُذ**: دوو وشەن دەچنە سەر ئیسمی زەمان‌و ئەگەر زەمانەکە زەمانی ڕابردو بوو مانای (مِنْ) دەگەیەنن، ئەگەر چونە سەر زەمانی حاڵ‌و حازر مانای (فِي) دەگەیەنن.

**مَنَعَهُ الشَّيْءَ**: شتەکەی لێ قەدەغەکرد، نەیهێشت سودی لێ وەربگرێ.

**مَنَعَ الجارَ**: پەنای جیرانەکەی داو داڵدەی دا.

**مَنُعَ فلانٌ مَناعةً**: فلانکەس بوو بەپارێزەرو داکۆکیکەر.

**مَنُعَ الشَّيْءُ**: شتەکە ناوازەو قورس‌و گران بوو ◊ **مانَعَهُ الشَّيْءَ**: کێشەی لەگەڵ نایەوە دەربارەی شتەکە ◊ **مَنَّعَهُ كذا**: بەمانا (مَنَعَهُ) دێ ◊ **إمْتَنَعَ الشَّيْءُ**: شتەکە پەیدابوونی زەحمەت بوو ◊ **إمْتَنَعَ عَنْ الشَّيْءِ**: لەشتەکە کشایەوە، وازی لێ هێنا ◊ **إمْتَنَعَ بالشيءِ**: خۆی بەشتەکە پاراست‌و پەنای بۆ برد ◊ **تَمانَعا**: داکۆکیان کرد ◊ **تَمانَعا عَنْ أنفسهما**: پارێزگارییان لەخۆیان کرد ◊ **تَمَنَّعَ الشَّيْءُ**: شتەکە یاساخ بوو ◊ **تَمَنَّعَ بالشيءِ**: خۆی بەشتەکە پاراست ◊ **تَمَنَّعَ عنه**: لێی تەکییەوە وازی لێ هێنا ◊ **المانِعُ**: ڕژدو چروک‌و دەست قوچاو ◊ هەرشتێک ببێتە لەمپەرو کۆسپ‌و نەهێڵێ شتێک بێتەدی ◊ **المناعة**: پارێزگارو پەرزین لەشت، لەنەخۆشی‌و شتی وا ◊ **المَنَعَةُ**: هێزو تواناو دەسەڵات ◊ **المَنّاعُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (مَنَعَ) دێ ◊ **المَنوعُ**: کەسێک یەکێکی تر مەنع بکا لەشتێک ◊ **المَنيعُ**: خاوەن هێزو توانا.

**مَنَّ عَلَيه مَنّاً**: نازونیعمەتی بەسەردا ڕشت.

**مَنَّ الشَّيْءُ**: شتەکە کەمی کرد.

**مَنَّ الأمْرُ فلاناً**: کارەکە فلانی ماندو کرد، لاوازی کرد.

**مَنَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕیەوە ◊ دەگوترێ: (مَنَّ الحَبْلَ) حەبلەکەی بڕیەوە ◊ دەشگوترێ: (مَنَّتْهُ المنونُ) مرد، مردن لەناوی برد ◊ **أمَنَّهُ الجهدُ**: ماندویەتی لاوازی کرد ◊ **مانَّهُ**: کەوتە هاتوچۆ بۆ ئەنجامدانی کارەکەی ◊ **مَنَّنَهُ**: لاوازی کرد ماندووی کرد بەهۆی سەفەرەوە ◊ **إمْتَنَّ على فلان**: فلانکەسی بەمنەت بەسەرداکردن ئەزیەت دا ◊ **إمْتَنَّ فلاناً**: چووە بنج‌و بناوانی

فلانكەس ٥ **المَنون:** بەهێز ٥ ئەو پەڕی ئەوەی لای یەكێك دەست بكەوێ ٥ دەگوترێ: (بلغت مُنونـە) گەیشتمە بنچ و بناوانی ئەو ٥ **المَنُّ:** گەزۆ: مادەیەكی شیرینە هەندێ درەخت دەری دەدا ٥ یان شەونمێكە لەئاسمانەوە دەبارێتە سەر درەخت و بەردو وشك دەبێتەوەو دەخورێ و شیرینە ٥ هەروا وشەی (مَنّ) ناوە بۆ ئامێرێكی پێوانەی دانەوێڵەو خورماو شتی وا ئەندازەكەی دوو ڕیتڵی بەغدادییە ٥ ڕیتڵیش دوانزە ئوقییەیە ٥ **المُنَّةُ:** هێزو توانا ٥ **المِنَّةُ:** چاكەو پیاوەتی و نیعمەت ٥ زۆر باسكردنی پیاوەتی و چاكەو منەتنان بەسەر خەڵك دا تا بایەخی نەمێنێ ٥ **المَنّانُ:** كەسێك شانازیی بكا بەسەر ئەو كەسانەدا كە پیاوەتیان لەگەڵ دەكا تا پیاوەتیەكەی پوچ دەبێ و بایەخی نامێنێ ٥ زۆر بەخشندەو دڵفراوان ٥ ناوێكە لەناوە جوانەكانی خودای گەورە ٥ **المَنونُ:** كەسێك زۆری گەزۆ هەبێ ٥ ئافرەتێك مێردەكەی لەبەرخاتری سامانداریی مارەی كردبێ و هەمیشە شانازیی بەسەر مێردەكەی دا بكاو بەماڵ و سامانی بنازێ ٥ ڕۆژگارو زەمانە ٥ مردن ٥ **المنين:** زەعیف و لاواز ٥ دەگوترێ: (حبل منين) حەبلی لاواز ٥ (ثوب منين) قوماشی تەنك و شاش و لاواز ٥ تەپ و تۆزی كەم و پچڕپچڕ ٥ **مَناهُ بكذا مَنواً:** بەو شتەوە توشی بەلابوو ٥ بەو شتە بەتاقی كرایەوە.

**مَنـا فلانـاً:** فلانكەسی بەتاقی كردەوە ٥ **المَنـا:** پێوەرێكی كۆنە لەڕۆژگاری كۆن دا شتی پێ پێوراوە یان پێی كێشراوە.

**مَنَّى الله الأمـرَ مَنْیاً:** خودا كارەكەی بڕیارداوە، مەزەندەی كردووە.

**منى الله فلاناً بكذا:** خودا فلانكەسی بەو شتە بەتاقی كردەوە.

**مُنِيَ لِكذا:** كۆمەگی پێ كرا بۆ ئەوشتە.

**مُنِيَ بكذا:** بەو شتە بەتاقی كرایەوە ٥ **أمنى الحاجُ:** حاجی هاتە مینا ٥ **أمنى الرجلُ:** پیاوەكە تۆماوی هاتەوە ٥ **أمنى النطفة:** دڵۆپە مەنی خستە ناو منداڵدانی ئافرەتەكەوە ٥ **أمنى الدِّماء:** خوێنی ڕژاند ٥ **ماناه:** پاداشتی دایەوە.

**مانى الرفيق:** نۆبەی لەگەڵ هاوەڵەكەی كرد لە سواربوونی وڵاخ و شتی وادا ٥ **مَنّى الرجلَ الشَّيْءَ وبالشيءِ:** وای لە پیاوەكە كرد ئاواتەخوازی شتەكە بێ ٥ **تَمَنَّى الشَّيْءَ:** شتەكەی خۆشویست و حەزی لێ بوو بۆ ئەوبێ ٥ **تَمَنَّى الحديثَ:** حەدیسەكەی هەڵبەست ٥ **إمتنى الحاجُ:** حاجی دابەزییە سارای مینا ٥ **الأمنية:** حەزو ئارەزو و داواخوازی.

**مِنى:** شارۆچكەیەكە لەنزیك مەككە حاجییەكان لەسێ ڕۆژەی جەژنی قوربان دا لەوێ دەمێننەوە ٥ **المَنى:** مردن ٥ ئەندازەو چەندییەت ٥ **المُنْيَةُ:** بەمانا (الأمنيةُ) دێ ٥ **المَنِيُّ:** تۆماوی نێرینە ٥ **المَنِيَّةُ:** مەرگ.

**مَهْ:** ئیسمی فیعل ئەمرە ٥ واتە وازبێنە، ئەو شتە مەكە.

**مَهَجَ فلان مَهْجاً:** فلانكەس چاكبۆوە، هاتەوە سەر حاڵەتی سروشتی خۆی و تەڕو تازەیی لێ دیاركەوتەوە.

**مَهَجَ الوَلَدُ أمَّهُ:** منداڵەكە شیری دایكی خۆی مژی ٥ **أمتُهِجَ فلان:** فلانكەس گیانی كێشرا ٥ **الأمْهَجُ:** شیری پاڵفتەو خاڵص و ئاوی تێكەڵ نەكراو ٥ بەزی تەنك و كەم ٥ **الأمْهُوجُ:** شیرێك: كەتامی نەگۆڕابێ ٥ **المُهْجَةُ:** خوێنی دڵ ٥ گیان.

**مَهَدَ الفِراشَ مَهْداً:** فەرشەکەی ڕاخستو چووە سەری

**مَهَدَ لنفسه خيراً:** خێرو خۆشی بۆخۆی ئامادەکرد ٥ **مَهَّدَ الفِراشَ:** بەمانا (مَهَدَهُ) دێ ٥ **مَهَّدَ الأمْرَ:** کارەکەی ئاسان کرد ٥ **إمْتَهَدَ السَّنامَ:** دوگەکە لەلای سەروویەوە پان بۆوە ٥ **إمْتَهَدَ لنفسه:** ئیشی بۆخۆی کرد ٥ **إمْتَهَدَ الخيرَ:** خێرو بێری بۆخۆی دەستەبەر کرد ٥ **تَمَهَّدَ لـه الأمْرُ:** کارەکەی بۆ ئاسان بوو ٥ **تَمَهَّدَ الرجلُ:** پیاوەکە دەستی لێی گیربوو ٥ **إسْتَمْهَدَ فراشاً:** فەرشی ڕاخست ٥ **المِهادُ:** جێگە خەو و حەسانەوە ٥ زەوی چاڵو تەخت ٥ بنکی دەریاو بنکی ڕووبار ٥ **المَهْدُ:** لانکەی منداڵ، جۆلانە شوێنی تایبەتی نوستنی منداڵی ساوا ٥ زەوی تەختو نەرمەلاّن ٥ **المَهْدَةُ من الأرض:** زەوییەك دەشتو نزم بێ ٥ **المُمَهَّدُ:** شتی تەخت کراو و ڕێکخراو ٥ (ماء مُمَهَّدٌ) ئاوی شلەتێن.

**مَهَرَ المرأةَ مَهْراً:** مارەیی بۆ ژنەکە دانا.

**مَهَرَ الشيْءَ وفيه وبه مَهارَةً:** شتەکەی توندو تۆڵ کرد، لەشتەکەدا کارامەو دەست ڕەنگین بوو ٥ **أمْهَرَ الفَرسُ:** ماینەکە جوانووی دواکەوت ٥ **أمْهَرَ المرأةَ:** مارەیی بۆ ژنەکە دیاریی کرد ٥ یان مارەیی پێدا ٥ **مَهَّرَ الرجلُ:** پیاوەکە جوانوە ماینێکی بۆخۆی هەڵبژارد یان جاشە کەرێکی بۆخۆی دانا ٥ **تَمَهَّرَ:** مەلەی کرد ٥ **تَمَهَّرَ في كذا:** لەو شتەدا دەست ڕەنگین بوو ٥ (فهو مُتَمَهِرٌ) ٥ **المَهْرُ:** مارەیی ئافرەت ٥ **المُهْرُ:** جوانوە ماین یان جاشولکە لەسەرەتای لەدایکبونیان دا ٥ کاڵەکە مارانە ٥ تۆوی کاڵەکە مارانە ٥ **المُهَرُ:** شیو و دۆڵی پەراسو کە بەقەفەزی سنگەوە دەلکێن ٥ **المَهيرة:** ئافرەتێك مارەیی زۆر بێ ٥ **المِهْرَجانُ:** فیستیڤاڵ، ئاهەنگی جەماوەریی ٥ وشەیەکی فارسییە تەعریب کراوە پێك هاتووە لە دوو وشە:- (مِهْر) واتە: خۆر ٥ (جان) واتە: گیان بەبۆنەی نیشتمانیو نەتەوەییو شتی وا سازدەکرێ وەکوو (میهرەجانی نەورۆز) ٥ **المُهْرَقُ:** صەحیفەو لاپەڕەی بەڵگە تێدا نووسین ٥ **مَهَزَهُ مَهْزاً:** پاڵی پێوە نا.

**مَهِقَ مَهَقاً:** ڕەنگی سپی زۆر سپی خاڵص، ئەم جۆرە ڕەنگە بۆ ئادەمیزاد پەسەند نیە.

**مَهَقَ العينُ:** چاوی سەوز بوو.

**تَمَهَّقَ الشرابَ:** شەرابەکەی سات دوای سات خواردەوە.

**مَهَكَ الشيْءَ مَهْكاً:** شتەکەی هاڕی ٥ سفتی کرد.

**مَهَكْتُ السَّهْمَ:** تیرەکەم تاشی.

**مَهَكَ في المشي:** لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد.

**مَهِكَ صُلْبُهُ مَهَكاً:** پشتی زەعیفو لاواز بوو ٥ **مَهَّكَ الشيْءَ:** شتەکەی زۆر هاڕی، پلیشاندییەوە ٥ **تَماهَكوا:** لێك خشان، کەوتنە چەمبەرەو خۆ چەسپاندن.

**مَهَلَ في فعله مَهْلاً:** بەهێواشی دەستی بۆ بردو پەلەی لێ نەکرد ٥ **أمْهَلَهُ:** مۆڵەتی دا ٥ پەلەی لێ نەکرد ٥ **مَهَّلَهُ:** دوای خستو مۆڵەتی دا ٥ پێی گوت لەسەرەخۆبە ٥ **تَمَهَّلَ في عمله:** لەئیشەکەیدا لەسەرەخۆبوو ٥ **إسْتَمْهَلَهُ:** چاوەڕوانی کرد مۆڵەتی دایە ٥ **المَهَلُ:** لەسەرخۆیی و مۆڵەت پێدان ٥ دەڵێی: (مَهْلاً یافلان) فلانکەس لەسەرەخۆبەو پەلە مەکە ٥ **المَهَلُ:** بەمانا (المَهْلُ) دێ ٥ پێشکەوتن لەبواری پێشکەوتنو خێرو خۆشی دا ٥ ڕێنومایی و پلان دانان بۆ ئیش پێش دەست پێکردنی.

المُهْلُ: مەعدەنی تـواوە ۵ وەکـوو زیـو، ئاسن، مس، زێڕ ۵ قەترانی کەم ۵ کەفو ڕەوغەنی زەیت ۵ کێمو زوخاو ۵ المُهْلَةُ: هێواشیو لەسەرەخۆیی ۵ المَهْلَـةُ: کـێمو زوخـاوی مـردو ۵ مَهْمـا: ئیسمی شـەرتەو دوو فیعـل مـەجزوم دەکـا ۵ وادەبـێ مانـای ئیستفهام دەگەیـەنێ ۵ مَهْمَـهَ فلانـاً وبـه: بەفلانکەسـی گـوت (مَـهْ مَـهْ) وازبێنـە ۵ لێـی تورەبوو دەری کـرد ۵ تَمَهْمَـهَ عَـنْ الـشَّيْئِ: وازی لەشـتەکە هێنـا ۵ المَهْمَهَـةُ: سـارای پـانو پـۆڕ ۵ وڵاتی سوتەمەڕۆ.

**مَهَنَ** الرجلُ مَهْناً ومَهْنَةً ومِهْنَـةً: لـەبواری تایبـەتی خۆی دا کاری کرد.

**مَهَنَ** فلاناً: فلانکەسی ماندو کرد.

**مَهَنَ** الثوبَ: قوماشی کۆن کرد، بێ نرخی کرد.

**مَهُـنَ** مَهانَـةً: لاواز بـوو ۵ أمْهَنَـهُ: لاوازی کـرد ۵ بـەکاری هێنـا ۵ إمْتَهَنَ: پیـشەی بۆخـۆی پەیـدا کـرد ۵ إمْتَهَنَ الشَّيْئَ: شـتەکەی بـێ نـرخ کـرد ۵ المِهْنَةُ: کاروپیشە ۵ پیشەو کارێـك پێویـستی بـە دەست ڕەنگینـی هـەبێو پێویـستی بەئـەزمونو مومارەسە هەبێ.

**مَهَا** الإبِلَ: لەگەڵ حوشترەکەدا لەسەرەخۆ بوو.

**مَهُوَ** الـسائِلُ مهارَةً: شلەمەنیەکە زۆر شل بوو ئـاوی زۆر بوو ۵ دەگوترێ: (مَهُوَ اللبنُ والسَّمنُ).

**مَهي** الشفْرَةَ مَهْياً: کێردەکەی تیژ کـرد شفرەکەی تەنك کرد.

**مَهي** الشَّيْئَ: شتەکەی بەزێڕو زیو ڕوکـەش کـرد ۵ أمْهى الشرابَ: ئـاوی شلەمەنیەکەی زۆر کـرد ۵ أمْهى القِدْرَ: ئاوی زۆری کردە ناو مەنجەڵەکەوە ۵ أمْهى الحديدَ: ئاسنەکەی ئـاودا ۵ أمْهى الشَّفْرَةَ: شفرەکەی تـەنك کـرد ۵ تیـژی کـرد ۵ إسْتَمْهى القومُ: خەڵکەکە سەفی دوژمنیان دڕداو تێـکیان شـکاندن ۵ إسْتَمْهى الفـرسَ: تـا تـوانی وڵاخـە بەرزەکـەی هـەلینگ داو ئـەو پـەڕی توانـای غـاردانی بـەکارهێنا ۵ المَهـاةُ: گـاکێوی ۵ مانگـا کێوی ۵ خۆر ۵ بلور ۵ المَهْـوُ: مـرواری ۵ بلور ۵ تەرزە ۵ ماستاوی ڕون ۵ قوماشی تـەنكو شـاش ۵ شمشێری تـەنك ۵ مَهْيَمَ: وشـەیەکی پرسـیارە واتە: حاڵو وەزعت چۆنە؟ کاروبارت چیە؟

**ماءَ** القِطُّ مواءً: پشیلەکە میاواندی. المُواءُ: دەنگی پشیلە.

**مات** الحيُّ مَوتاً: زیندووەکە گیانی لەدەست دا.

**مات** الشَّيْئُ: شتەکە خپ بوو جوڵەی نەما ۵ ماتت الـريحُ: ڕەشـەباکە کـەوت، نـەما ۵ وەسـتایەوە ۵ ماتت النارُ: ئاگرەکە کوژایەوە.

**مـات** الطريـقُ: ڕێـگاکە کـوێر بـۆوە کـەس پێیـدا نەڕۆیی.

**مات** فـلان: فلانکـەس خـەوی لێ کـەوت و غـەرقی خەو بوو ۵ ماتتِ الأرضُ مواتاً: زەوییەکە وێران بوو ئـاوەدانیو دانیـشتوانی تێدا نـەما ۵ أمـاتَ فلان: فلانکەس منداڵەکەی مرد ۵ أمـاتَ القـومُ: خەڵکەکە نەخۆشی کەوتـە نـاو ئاژەڵەکانیانـەوە زۆریـان لێ فـەوتان ۵ أمـاتَ فلانـاً: فلانکەسـی قەلاچـۆ کـرد فەوتانـدی ۵ مـاوَتَ صـاحِبَهُ: هاوەڵەکەی هەڵنا بۆ خۆ ڕاگریو بشو درێـژی ۵ مَوَّتَـتِ الـدَّوابُ: مردارەوەبوونو فـەوتان لـەناو ئاژەڵـەکان دا بـەرەی سـەند ۵ مَوَّمَـتَ فلانـاً: فلانکەسی مراند ۵ تَماوَتَ: خۆی بەمردو نیشان دا ۵ خۆی بـەخودا پەرسـتو دونیـا نەویـستو بـەڕۆژو خـاوەن عیبـادەت خـستە بەرچـاوی خەڵك ۵ إستمات: ئاواتـە خـوازی مـردن بـوو ۵ لـەپێناو بەدەسـتهێنانی ویـستەکانی هـەموو

هەوڵو تەقەلایەکی خستە گەڕ ٥ خۆی بە ویقارو لەسەرخۆ و هێدی ڕەوشت لەقەڵەم داو وایش نەبوو.٥ إستمات للأمر: بۆ کارەکەی کەوتە قسەکردنو نەی بڕیەوە ٥ المَمَاتُ: مردن ٥ المُوَاتُ: شتێك بێ گیان بێ، وێران بێ ٥ زەوییەك کشتو کاڵی تێدا نەکرێو ئاوەدان نەکرابێتەوەو نەبووبێتە ملکی کەس ٥ المُواتُ: مردنو فەوتان کە بکەوێتە ناو ئاژەڵەوە ٥ المَوْتُ: مردن ٥ پێچەوانەی ژیان ٥ المَوَتانُ: پێچەوانەی (الحَيَوَانُ)ە ٥ المُوْتانُ: ئافاتو لەناوچوونێکە تووشی ئاژەڵ دەبێ ٥ (رجل موتان الفؤاد) پیاوێکی گێلو کەودەنە ٥ الميت: کەسێك گیانی لەدەست دابێ ٥ المَيْتُ: بەمانا (المَيِّتُ) دێ ٥ شتێك لەحوکمی مردودا بێ ٥ المَيْتَةُ: منداره‌وەبوو (مردارەوەبوو) ٥ یان ئاژەڵێك بەشێوەی ناشەرعی گیانی دەرچووبێ ٥ المِيتَةُ: حاڵو وەزعێکە لەشێوەکانی مردن.

**ماثَ الشَّيْءَ** مَرثاً رموثاناً: بەدەستی خۆی شتەکەی هێناو برد تابەتەواوی پێکهاتەکانی لێك بوونەوە.

**ماثَ** في الماء: شتەکەی لەناوەکەدا تواندەوە، تێکەڵاوی ناوی کرد ٥ إنماثَ الشَّيْءُ في الماء: شتەکە تێکەڵاوی ناو بوو توایەوە.

**ماجَ البَحْرُ** موجاً ومَوجاناً: دەریاکە کەوتە جنبوشو شەپۆلەکانی تێکیانەوە هاویشت ٥ دەگوترێ: (ماج القومُ) خەڵکەکە کاروباریان شێوا ٥ تَموَّجَ البحرُ: بەمانا (ماجَ) دێ ٥ المَوْجُ: شەپۆل ٥ شەپۆلی دەریا ٥ المَوجة: شەپۆلێك ٥ (موجة البرد) سەرمای زۆر ٥ المِمْواجُ: (کیموغراف) ئامێرێکە بۆ تۆمارکردنی جمو جوڵی هەناو و ڕیخۆڵەو ئەو شتانە ٥ الماذ: ڕەوشت جوان ٥ قسەخۆش، دەروونپاك ٥ الماذيُّ: هەنگوینی چاك ٥ چەکێك هەمووی لەئاسن دروست کرابێ ٥ وەکوو شمشێرو زرێو کڵاو خوزە.٥ الماذِيَةُ: زرێی نەرمو سوك ٥ شەراب.

**مارَ الشَّيْءُ** موراً: شتەکە کەوتە جمو جوڵو پاڵەپەستۆ.

**مارَ** السائلُ على وجه الأرض: شلەمەنیەکە بەسەر زەوی دا کەوتە جمو جوڵو هاتو چۆ.

**مارَ البحرُ**: دەریا کەوتە جمو جوڵو جۆشو خرۆش.

**مار** فلان: فلانکەس کەوتە هاتوچۆو پەلەپەل.

**مار** الترابُ: گڵو خۆڵەکە بوو بەتەپو تۆزو کەوتە حەوا.

**مارَ** السِنانُ في المطعون: سەرە ڕمبو سەرە شمشێرەکان لەجەستەی برینداره‌کەدا جێگۆڕکێیان کرد ٥ مارَت الريحُ الترابَ: ڕەشەباکە گڵەکەی کردە تەپوتۆزو خستیە حەوا ٥ أمارت الريحُ الترابَ: ڕەشەباکە گڵەکەی بەرزکردەوە بۆ حەوا ٥ أمارَ الدمَ: خوێنی ڕەوانکرد ٥ امار الدُهنَ على رأسِه: ڕۆنی لەسەر هەڵسو ٥ أمار السِنَانَ في المطعون: سەرەنێزەو سەرە ڕمبەکان لە جەستەی بریندارەکەدا جێگۆڕکێیان کرد ٥ أمار الصوف أو الوبرَ: خورییەکە یان کوڵکەکەی ڕنیەوە ٥ هەڵی کەند ٥ تَمَوَّرَ الشَّيْءُ: شتەکە کەوتە جمو جوڵو هەڵبەزو دابەز ٥ تَمَوَّرَ الرجلُ: پیاوەکە بەپەلە هاتو چوو ٥ تَمَوَّرَ الوبَرُ ونحوه عَنْ الدابة: کوڵکەکە بەری داو کەوتە خوار ٥ المَورُ: تێکرو تێکوشیوی و شڵەژان ٥ شەپۆلی ئاو ٥ شتی نەرمو نیان ٥ ڕێگای خۆشکراو و تەختکراو ٥ المُورُ: تەپو تۆزی هەڵچو بەحەوادا ٥ المُوَارَةُ:

(ريح مَوّارَة): رەشەبایەکی تەپو تۆز هەڵکەرە ◊ المَوْزُ: گیایەکی زەبەلاحو گەورەیە لەولاتی گەرمەسێردا دەروێندرێ ◊ المَوّازُ: مۆز فرۆش ◊ الماسُ: بڕوانە مادەی (الألماس) ◊ المُوسى: گوێزان تەراش ◊ ئامێرێکە موی پێ دەتاشرێ ◊ الموسيقى: وشەیەکی یۆنانیە بەهەموو لێزانیو کارامایی لەبواری زەنینی مۆسیقادا دەگوترێ ◊ المُوسِيقِيُّ: مۆسیقار ئەو کەسەی لەپێڕی مۆسیقاژەنانە ◊ الموسيقار: کەسێک پیشەی ژەنینی مۆسیقا بێ.

**ماشَ** كَرْمَهُ موشاً: جارێکی تر دوای هەڵپاچینو بڕینی پڕژی مێوەکان پێیان داچوەوە هەندێ تولەی ترێ لێ بڕین ◊ الماشُ: کاڵای کەم نرخ و بێ کەڵکی ناوماڵ ◊ جۆرە ڕوەکێکە لەڕوەکی (القرنية) دەنکێکی سەوزی خڕی بچوکی هەیە لەولاتی شامو هیندوستان دەروێ.

**ماصَ** الثوبَ: قوماشەکەی بەهێواشی شُشت.

**مــاصَ** فــاهُ أو أســنانه بالســواك: دەمو ددانــەکانی بەسیواك شُشت.

**ماصَ** الشَّيْئَ: شتەکەی بەدست شێلا ◊ مَوْصَ ثيابه: کراسەکەی شتو پاکی کردەوە ◊ المُواصَةُ: غەسالەی جل شتن.

**ماقَ** الرجلُ: پیاوەکە گێلو ئەحمەق بوو ◊ تَماوَقَ: گێلایەتی کرد ◊ المائِقُ: گێل ◊ گرینۆك ◊ خۆنەگرو ورەنزم ◊ المُوقُ: ئەحمەقیو گێلو نەفام ◊ گلێنەی چاو ◊ مێروی باڵدار ◊ المُوقانُ: خوفێکی ئەستوورە لەسەر خوف لەپێ دەکرێ.

**مالَ** مَوْلاً و مُؤولاً: ماڵو سامانی زۆر بوو.

**مالَ** فلاناً: ماڵو سامانی پێدا.

مَوَّلــهُ: پێویستیاتی بۆ دابین کرد ◊ تَمَوَّلَ: ماڵی گەشەی کرد، دەوڵەمەند بوو ◊ تَمَوَّلَ مالاً: ماڵو سامانی پەزمەندە کرد ◊ المالُ: هەرشتێك بکرێتە ماڵو سامان بەماڵ حسێب بکرێ جا کاڵای بازرگانی یان زەوی و زارە یان پارەو شتی وا یان ئاژەڵو کانو کانزابێ ◊ المُمَوِّلُ: کەسێك ماڵ خەرج بکا لەکارێك دا ◊ باجو گومرك دەر ◊ المَيِّلُ: کەسێك خاوەنی ماڵو سامانی زۆر بێ ◊ المَيِّلَةُ: مێینەی خاوەن ماڵ ◊ المَوْماءُ: دەشتی کاکی بەکاکی ◊ پانو پۆڕ ◊ المَوْماةُ: بەمانا (المَوْماءُ) دێ ◊ الموميــاء: جەستەی مۆمیا کراو لەگۆڕە کۆنەکانی وڵاتی میصرو شوێنی تردا ◊ مانَهُ موناً: بژێوی ئەوی خستە سەرشانی خۆی ◊ دەگوترێ: (مان الرجلُ أهْلَـهُ) پیاوەکە بژێوی بۆ ماڵو منداڵی خۆی دابین کرد ◊ بژێوی زۆری پەزمەندە کرد ◊ التموين: یاسایەکە دەوڵەت دایدەنێ بۆ دابینکردنی بژێو بۆ هاوڵاتیانی لەبڕی کاتو زوروفی تایبەتیدا ◊ المؤونة: بژێو ◊ ئەو بژێوەی پەزمەندە دەکرێ ◊

**ماهت** البئرُ: بیرەکە ئاوەکەی دەرکەوت.

**ماهت** السفينة: کەشتیەکە ئاوی تێچو.

**ماهَ** فلاناً مَوْهاً: ئاوی دا بەفلان بیخواتەوە.

**مــاهَ** الشَّيْئَ بالشيئ: شتەکەی تێکەڵاو بەیەك کردن.

**مــاه** فلان في كلامــه: فلانکەس قسەی تێکەڵو پێکەڵ کردن ◊ أماهت الأرضُ: زەوییەکە ئاوی زۆر بوو ◊ أماهَ الشَّيْئَ بالشيئ: شتەکەی تێکەڵ بەشتەکەی تر کرد ◊ أمــاهَ فلانــاً: ئاوی دا بەفلانکەس ◊ أمــاهَ الحَــوْضَ ونحــوه: ئاوی لەحەوزەکەدا کۆکردەوە ◊ مَوَّهَ الموضعُ: شوێنەکە ئاوی تێدا پەیدا بوو ◊ مَوَّهَ السماءُ: ئاسمان ئاوی زۆری باراند ◊ مَوَّهَ الشَّيْئَ: شتەکەی بەزێڕو زیو ڕوکەش کرد ◊ مَوَّهَ الحَقَ: حەقی تێکەڵاوی بەتاڵ

کرد ◊ دەگوترێ: (مَوَّهَ الحدیثَ) قسەکەی ڕازاندەوە حەق و بەتاڵی تێکەڵاو بەیەك کرد ◊ **مَوَّهَ عَلَیْهِ الخَبَرَ**: هەواڵەکەی لێ چەواشە کرد ◊ پێچەوانەی پرسیارەکە وەڵامی دایەوە ◊ **تَمَوَّهَ**: بۆ موتاوەعەی (مَوَّهَ) دێ ◊ **تَمَوَّهَ الثَمَرُ**: میوەکە ئاوی تێ چزاو گەیی و کاتی چنینی هات ◊ **الماءُ**: ئاو ◊ شلەمەنیەکی گرنگە بۆ ژیان و بەبێ ئەو ژیان نابێ کۆڵەکەی ژیانە لەسەر زەوی لەبەیەك گەیشتنی هایدرۆجین و ئۆکسجین پەیدا دەبێ ◊ ئاو بۆ خۆی بێ ڕەنگ و بێ بۆن و بێ تامە ◊ ئاو چەند جۆرێکی هەیە: (ئاوی شیرین، ئاوی سوێر، ئاوی کانزایی، ئاوی موقەتەر، ئاوی گوڵ کەبەهۆی ئامێرێکەوە بەناوەچۆڕی هەڵمی لەگوڵە تەڕەکان ئاو دەردەهێندرێ) ◊ دەشگوترێ: (ما احسن ماء وجهه) ڕەونەق و گەشەی ڕوخساری چەند جوانە ◊ (ذهبَ ماء شبابه) گەشەو نیشاتی سەردەمی گەنجی بەسەرچوو ◊ **الماهُ**: بەمانا (الماءُ) دێ ◊ دەشگوترێ: (رجل ماهُ الفؤاد) پیاوێکە ترسنۆك و ورەنزمە ◊ **الماهیة**: (ماهیة الشَیْئِ) کرۆکی شت و حەقیقەتی شت ◊ مانگانە، موچەی مانگانە ◊ **الماوِیّة**: ئاوێنە ◊ مانگای سپی ڕەنگ ◊ **المُمَوَّهُ**: ڕوکەشکراو بەزێڕ یان بەزیو ◊ شتی ڕوکەشکراو بە بەتاڵ ◊ جوانکراو و ڕازێندراوە ◊ چاو کەپارچە پێستێکی تێدابێ و نەهێڵێ ببینێ ◊ **المُوهَةُ**: ڕەونەق و گەشەی دەم و چاو ◊ دەگوترێ: (کلام عَلَیْهِ موهةٌ) قسەیەکی ڕازێندراوەو جوانکراوە ◊ **المَیْهَةُ**: (بئر مَیِّهَةٌ) بیرێکە ئاوی زۆرە ◊ **ماثت الأرضُ مَیْثاً**: زەوییەکە نەرم و تەخت بوو.

**ماثَ الشَیْئَ**: شتەکەی تواندەوە.

**مَیَّثَ الشَیْئَ**: بەمانا (ماثَهُ) دێ ◊ **مَیَّثَ فلاناً**: فلانکەسی زەلیل و ژێردەستە کرد ◊ **مَیَّثَ الدهْرُ فلاناً**: ڕۆژگار فلانکەسی قاڵ کرد ◊ **تَمَیَّثَ فلان**: فلانکەس زەلیل و لەش شێواو بوو ◊ **تَمَیَّثت الأرضُ**: زەوییەکە ئاودراو نەرم بوو و فێنك بوو ◊ **المَیْثاءُ**: (أرض میثاء) زەوییەکی نەرم و تەخت و خۆشکراوە ◊ تەپۆڵکەی باش و بەپیت ◊ **المَیِّثُ**: نەرم ◊ (رجلٌ مَیِّثُ القلب) پیاوێکی دڵنەرمە.

**ماحَ في مِشیته**: لەڕۆیشتن دا لارو لەنجەی کردو خۆی بادا.

**ماحَ مَیْحاً**: چووە خوار بۆ بنکی بیرەکە بۆئەوەی دۆڵچەکەی پڕبکا لەئاو چونکە ئاوی کەمی تێدا بوو ◊ ئاوی دەرهێنا، ئاوی بۆ هاوەڵەکانی هەڵێنجا ◊ **ماحَت الریحُ الشجرةَ**: ڕەشەباکە درەختەکەی ڕاژاند.

**ماحَ فلاناً مَیْحاً**: بەخششی دا بەفلانکەس ◊ **إمتاحَ**: ئاوی هەڵێنجا ◊ **إمْتاحَ فلاناً**: هاتە لای فلانکەس داوای بەخششی لێ دەکا ◊ **إمتاحت الشمسُ أو العملُ فلاناً**: خۆر یان ئیشکردن و ماندوبوون عەرەقی لەجەستەی فلانکەس دەرهێنا ◊ **تَمایَحَ الغُصْنُ**: لقەدرەختەکە ڕەشەبا هەژاندی.

**تَمایَحَ الماشي**: ڕۆیشتووەکە لەڕۆیشتنی دا لارو لەنجەی کرد ◊ **تَمایَحَ السکرانُ**: سەرخۆشەکە لارەلاری بوو خوارو خێچ ڕۆیی ◊ **تَمَیَّحَ**: بەمانا (تَمایَح) دێ ◊ **إسْتماحَهُ**: داوای لێ کرد کە بەخششی بداتێ یان تکای بۆ بکا ◊ **الماحُ**: زەردێنەی هێلکە ◊ سپێنەی هێلکە توێکڵی هێلکە ◊ **المَیْحُ**: ڕۆیشتنی مراوییانە.

**مادَ الشَیْئُ**: شتەکە کەوتە جەم و جوڵ و پەلەکوتە.

**مادَ الغُصْنُ**: لقەدرەختەکە هەژا ◊ ڕاژا.

**مادَ فلان**: فلانكەس سوڕی داو لارو لەنجەی کرد ٥ توشی سەر سوڕان‌و سەر لێ تێکچون بوو بەهۆی سەرخۆشی یان ڕۆیشتن بەناو دەریادا ٥ **مادت بـه الأرض**: زەوی لەبەرچاوی خولایەوەو وای دی کەزەوی کەوتۆتە شلەژان‌و هەڵخولان.

**مادَ السَّرابُ**: تراویلکەکە شەپۆلی داو لەبەرچاو کەوتە جونبوش ٥ **أمـادَهُ**: بەخششی پێدا ٥ **إمتادَهُ**: داوای لێ کرد بەخششی پێ بدا ٥ **المائدَة**: سفرەی نانخواردن، مێزی نانخواردن ٥ **المُمْتادُ**: داواکاری بەخشش ٥ داوالێکراو بۆ بەخشش.

**مَيْدَ**: دەگوترێ: (فعلته مَيْدَ ذلك) ئەوەم لەبەر ئەوە کرد ٥ وشەی (مَيْدَ) لۆغەتێکە لە (بَيْدَ) ٥ پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: (أنا أفصح العرب مَيْدَ اني من قريش) ٥ **مَيْدى**: بەمانا بەرامبەر دێ ٥ دەگوترێ: (داری بمَيْدى داره) خانوەکەم بەرامبەر خانوەکەیەتی ٥ **مَيْداءُ الشَّيْئِ**: ئەوپەڕی شت‌و ئەندازەی شتەکە ٥ **ميداء الطريق**: ناوەڕاستی ڕێگا ٥ دەشگوترێ: (بنوا بيوتهم على ميداء واحد) خانوەکانیان بەرامبەر بەیەك بنیات ناون ٥ هەروا وشەی (ميداء) ناوە بۆ گۆڕەپانی شەڕو گۆڕەپانی یاری تۆپێن ٥ **المِيدان**: لۆغەتێکە لە (المَيْدان) ٥ **المَيْدَةُ**: لۆغەتێکە لە (المائدة) ٥ **المِيدَةُ**: چینێکە لەشیشی موسەلەح بۆ هەڵاشی خانو.

**مارَ أهْلَهُ ميراً**: پێداویستی ژیانی بۆ ماڵ‌و منداڵی خۆی دابین کرد.

**مارَ الدواء**: دەرمانەکەی تواندەوە ٥ دەشگوترێ: (أمار الزعفران) ئاوی کردە ناو زەعفەرانەکەوەو چەشتی ٥ **أمـارَ أوداجَـه**: سروچکی هەڵبڕی، قۆرتەمەی بڕی ٥ **امتـار لأهلـه أو لنفسـه**: پێداویستی ژیانی بۆ ماڵ‌و منداڵی یان بۆ خۆی دەستەبەر کرد ٥ **المِيرَةُ**: تێشو کە کۆدەکرێتەوە بۆ سەفەر ٥ **المَيّارُ**: ئەو کەسەی تێشو کۆدەکاتەوە.

**مازَ الشَّيْئَ ميزاً**: شتەکەی جیاکردەوە ٥ (ماز الشَّيْئَ عنه) شتەکەی لێ دوورخستەوە ٥ دەگوترێ: (ماز الأذى عَنْ الطريق) کۆسپ‌و ئەزیەتی لەسەر ڕێگا دوورخستەوە.

**مـازَ فلانـاً عَلَيْـهِ**: فلانکەسی بەسەر ئەودا پاساودایەوە ٥ **أماز الشَّيْئَ**: بەمانا (مـازَهُ) دێ ٥ **مَيَّزَ الشَّيْئَ**: بەمانا (مازَهُ) دێ ٥ **إمتـازَ الشَّيْئُ**: شتەکە چاکی و ڕەسەنی بەسەر شتی تردا دەرکەوت ٥ شتەکە لەشتەکانی تر جیابۆوە ٥ **إنْمازَ الشَّيْئُ**: بەمانا (إمتاز) دێ ٥ **تمايَزَ القومُ**: خەڵکەکە گردبوونەوە، گەلەکۆمەکێیان کرد ٥ بڵاوەیان لێ کرد ٥ **تَمَيَّزَ الشَّيْئُ**: بەمانا (إمتاز) دێ ٥ دەگوترێ: (تَمَيَّزَ القوم) خەڵکەکە بەلایەك دا ڕۆیشتن، یان جیابوونەوە ٥ **تَمَيَّزَ من الغيظ**: خەریکە لەڕق هەڵساوی خۆی لێك ببێتەوە ٥ **إستماز الشَّيْئُ**: بەمانا (إمتاز) دێ ٥ دەگوترێ: (إستماز عَنْ الشَّيْئ) لەشتەکە دوورکەوتەوە ٥ (إستماز القوم) خەڵکەکە کۆمەڵێکیان لێ جیابوونەوەو یاخی بوون ٥ **التمييز**: لەزاراوەی نەحویەکان دا ئیسمێکە تەم‌و مژو ناڕاشکرایی لەشتێکی پێشەوەی لادەبا ٥ وەکوو دەڵێ: (لَبِسَ ثوبين حريراً) ٥ (ما أعدلـه حاكماً) ٥ **المَيْزُ**: بەرزبوونەوەو شکۆداریی ٥ **المِيزَةُ**: بەمانا (المَيْزُ) دێ.

**ماسَ فلانٌ**: فلانکەس لارو لەنجەی کردو خۆی بادا ٥ قسەی دڵداری‌و پڕوپوچی کردن ٥ **مَيَّسَ الثوبَ**: داوێنی بۆ کراسەکە دروست کرد ٥ **تَمَيَّسَ فلان**: فلانکەس لارو لەنجەی کردو خۆی

بادا ٥ المَيْسُ: درەختێكی گەورەیە بۆ جوانی دەروێندرێ بەرێكی ڕەشی بچوكی شیرینی هەیە باڵندە دەیخواو زۆری حەز لێیە، لەتوێكڵو ڕەگەكانی دا مادەیەكی صمغی هەیە، دارەكەی ڕەقو سەختە، بۆ كەرەسەی دارتاشی لەبارە ٥ هەروا ناوە بۆ نیری جوتكردن بەحەیوان كەدەخرێتە سەر ملی دوو ڕەشەوڵاخو مژانو هەوجاری پێوە قایم دەكرێو ڕادەكێشرێ ٥ المَيْسانُ: لارو لەنجەكەرو خۆبادەر لەڕۆیشتن دا هەموو ئەستێرەیەكی درەوشاوە ٥ المَيّاسُ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (ماس) دێ ٥ هەروا ناوە بۆ شێر چونكە ئەو لەڕۆیشتن دا خۆی بادەداو فیز دەكا ٥ المَيْسُونُ من الغلمان: گەنجی قەدو بالآجوانو ڕوخسار گەشاوە.

**ماشَ** الشَّيْءَ بالشيءِ: شتەكەی تێكەڵ بەشتەكە كرد.

**ماط** مَيْطاً: دووركەوتەوە، گۆشەگیر بوو.

**ماط** بە: بردی دوری خستەوە، وەلای نا.

**ماط** عنە: لێی دووركەوتەوە.

**ماط** عَلَيْهِ في حكمە: لەبڕیارەكەی دا ستەمی كرد.

**ماط** الشَّيْءَ: شتەكەی دوورخستەوە.

**ماط** الأذی: شتی زیانبەخشو كۆسپو تەگەرەی دوورخستەوە ٥ لەسەر ڕێگا ڕایماڵی.

**ماط** فلاناً: فلانكەسی دەركرد پاڵی پێونا ٥ أماطَهُ: دووری خستەوە، لای دا، ڕایماڵی ٥ أماط الأذی: شتی زیانبەخشی دوورخستەوە ٥ تمایط القوم: خەڵكەكە نێوانیان تێك چوو ٥ المِیاط: دەركردنو لێ توڕەبوونو پاڵ پێونان ٥ مەیل كردن ٥ تێكرو تێكوشیو ٥ المَیّاطُ: یاریكەری بێ بەرنامەو دەستكەوت.

**ماع** الجسمُ مَیْعاً: جەستەكە، قەبارەكە توایەوە ڕەوان بوو ٥ بوخاری ناوی هەڵمژی لەهەواداو توایەوە.

**ماعَ** المِلْحُ: خوێیەكە توایەوە.

**ماع** السائلُ: شلەمەنیەكە بەسەر ڕوی زەوی دا جاریی بوو بەهێواشی بلاّو بۆوە.

**ماع** السَّرابُ: تراویلكەكە لەسەر زەوی لەپێش چاو واهاتە دیتن شەپۆل بهاوێ.

**ماعَ** الرجلُ: پیاوەكە ئەحمەقو ناكەس بەچەبوو ٥ أماعَ الجسمَ: قەبارەكەی تواندەوەو كردیە سائیلو ڕشتی، ڕۆیاندی، بلاوی كردەوە ٥ إمّاعَ السَّمْنُ: ڕۆنەكە توایەوە ٥ الإماعَة: گۆڕینی شتی ڕەقە بۆ شتی ڕون یان غاز ٥ المائِعَة: ناوە بۆ عەترێكی زۆر بۆنخۆش ٥ صمغێكە لەدرەخت دەردێ ٥ جەمو جوڵی شتی ڕون كە دەكرێتە ناو قاڵبەوە ٥ میعة الشَّيْء: سەرەتای شت ٥ میعة الشباب: سەرەتای گەنجی ٥ هەروا (میعة السكر) ناوە بۆ سەرەتای سەرخۆشی.

**مالَ** میلاً ومیلاناً: خوار بوو، لەشێوەی ڕاستی خۆی دەرچوو ٥ مالت الشمسُ: خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لای دا تێپەڕی.

**مالَ** القوامُ: بالآكە باریك بوو، ڕاگرەكەی باریك بوو.

**مال** عنە: لێی لادا ٥ دەگوترێ: (مال عَنْ الطریق) لەڕێگا لای دا ٥ لەحەقو ڕاستی لای دا ٥ مالَ إلیە: خۆشی ویست ٥ پاڵی بەو دا، لایەنگیری ئەوی كرد.

**مال** عَلَيْهِ: ستەمی لێ كرد ٥ زۆری بەلاو كارەسات بە سەردادا.

**مَيِلَ الشَّيْئُ**: شتەکە بەسروشت خوار بوو ٥ **أَمالَ قارئي القرآن**: قورئان خوێنەکە یاسای ئیمالەی لەخوێندنەکەی دا پەیرەو کرد ٥ **أَمالَ الشَّيْءَ**: شتەکەی خوار کرد ٥ **أَمالَ بالفرس يَدَهُ**: هەوساری ئەسپەکەی شل کرد بۆ ئەوەی دەست کراوە بێ ٥ **مَيَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی خوار کرد ٥ **مَيَّلَ بين الأمرين**: لەنێوان دووشتەکە ڕاڕا بوو ٥ **تمايل في مشيته**: لەڕۆیشتن دا لارو لەنجەی کرد ٥ **تمايَلَ الجُلّ عَنْ الفرس**: زینەکە لەسەر پشتی ئەسپەکە خوار بوو ٥ **تَمَيَّلَ في مشيته**: لەڕۆیشتن دا لارەلاری بوو ٥ دەگوترێ: (فلان يُتَمَيَّلُ في ظلاله ويُتَفَيّا) فلانکەس خاوەن قوناغو سفرەو خوانە لەژێر سێبەری ماڵەکەی دا ئاتاجو هەژار دەحەسێنەوەو تێر دەخۆن ٥ **إسْتمالَ**: مەیلی کرد ٥ دەگوترێ: (مَيَّلَهُ فاستمال) خواری کردو ئەویش خواربوو ٥ **إستمالَ فلاناً وبقلبه**: فلانکەسی بۆلای خۆی کێش کرد دڵی بۆلای خۆی هێنایەوە ٥ **الإمالَة**: گوتنی پیتی ئەلفە لەنێوان واوو یادا ٥ یان گوتنی فەتحەیە لەشێوەی ژێر ٥ **المِيْلُ**: میل: کەڵەکە بەرد یان دیوارێکی باریکە لەسەر ڕێگا دروست دەکرێ بۆ شارەزایی کردنی ڕێبواران ٥ هەروا ناوە بۆ پێوەرێکی زەویوڕێگا ئەندازەکەی چوار هەزار زیراعە ٥ میل دوو جۆری هەیە وشکانیو دەریایی ٥ ئەندازەی میلی وشکانی یەکسانە بە ١٦٠٩ مەتر ٥ ئەندازەی میلی دەریایی یەکسانە بە ١٨٥٢ مەتر ٥ هەروا وشەی (میل) ناوە بۆ کلچێوك کە چاوی پێ دەرێژرێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئامێرێك پزیشك قوڵایی برینی پێ مەزندە دەکا ٥ **المَيْلاءُ**: (شجرة مَيْلاء) درەختی لقو پۆپ زۆر.

**مانَ فلان مَيْناً**: فلانکەس درۆی کرد ٥ **تماين القومُ**: خەڵکەکە درۆیان بۆیەکتر کرد ٥ **المَيْنُ**: درۆ ٥ **المِيناءُ**: بڕوانە مادەی (ونی) ٥ **المِينى**: بڕوانە مادەی (ونی) ٥ **ماهت البئرُ مَيهاً**: بیرەکە ئاوی زۆر بوو.

**ماهَ فلاناً**: فلانکەسی تێراو کرد.

**ماهَ السيف بالذهب ونحوه**: شمشێرەکەی بەئاڵتونو شتی وا روکەش کرد ٥ **مَيَّهَ السَّيْفَ**: شمشێرەکەی لەبەر خۆر دانا بۆئەوەی ئاوی بڕوا.



**النون:** پیتی بیستو پێنجەمە لە پیتەکانی هیجا ٥ شوێنی هاتنەدەرەوەی سەری زوبان، بنکی ددانی پێشینەی لای سەرەوەن.

ئەم پیتە چوار جۆرە:

١- نون التوكيد
٢- نون الإناث
٣- نون الوقاية
٤- النون الزائدة.

**نَأتَ** نَأتاً ونئيتاً: ناڵاندی ٥ لەسەرە خۆ کارەکەی کرد.

**نَأثَ** عنه نَأثاً: لێی دوورکەوتەوە ٥ تەمبەڵی نواند ٥ **أنأثَهُ**: دووری خستەوە.

**نَأجَ** البومُ: کوندە بووەکە گماندی قڕاندی ٥ **نَأجَت الريحُ**: بایەکە بەتوندیی هەڵبوو هاشەو وژەی زۆری بەرپاکرد.

**نَأجَ** الإنسان: ئادەمیزادەکە بەخوشوعو حەزینەوە کەوتە پاڕانەوە و لالانەوە.

**نَأجَ** في الأرض نؤوجاً: بەناو زەوی دا ڕۆیی.

**نَـأجَ الخَبَـرُ**: هەواڵەکە بەناو وڵات دا بلاو بۆوە ٥ **النّئيجُ**: دەگوترێ: (للريح نيج) بایەکە ڕۆیشتنی خێراو هاژەو وژەی هەیە ٥ **نَـأدتِ الأرضُ نَـأداً**: زەوی کەوتە جمەو جوڵو فشەڵ بوون ٥ **نَـأدت الداهِيـةُ فلانـاً**: بـەڵاو کارەساتەکە فلانکەسی گرتەوە زەبری خۆی پێگەیاند ٥ **النَّـؤودُ**: بـەلاو کارەسات ٥ **نأرت نـائرةٌ في النـاس نـأراً**: پشێویو چەواشـەکاری لـەناو خـەڵك دا پەیـدا بـوو ٥ **النُّؤورُ**: دوکەڵی پیو و بەزی برژاو ٥ **الناسوت**: سروشـتی ئـادەمیزادیی ٥ بەرامبەرەکـەی (اللاهوت)ە ٥ واتە سروشتی خودایی.

**نَـأشَ الـشيْءَ نَأشـاً**: بەتونـدیو لـەناکاو پـڕی بەشـتەکەدا کـرد ٥ شـتەکەی دوورخـستەوە ٥ دەشگوترێ: (نَـأشَ الأمْـرَ) کارەکەی دواخـست ٥ **إنْتَأَشَ الشيءَ**: شتەکە دواکەوتو دوورکەوتـەوە ٥ **إنْتَـأشَ الله فلانـاً**: خـودا فلانکەسـی دەرهێنـاو ڕزگاری کـرد ٥ **تَناءَشَ**: دواکەوت، دوورکەوتـەوە ٥ **تَنَـاءَشَ الـشيءَ**: لـەدوورەوە شـتەکەی گـرت کۆنترۆڵی کرد ٥ **النُّؤوش**: بەهێزو هەڵمەت.

**نَأفَ** نَأفاً: کۆششی کرد.

**نَئِفَ** الطعامَ نَأفاً: باشترینی ماڵەکەی خوارد.

**نَئِفَ** من الشراب: لەشەرابەکە تێراو بوو.

**نَألَ**: ڕۆیی ٥ سەری بەرەو حەوا هەڵبڕی.

**نَألَ الفَرَسُ** وغيره: ئەسپەکە لەڕۆیشتن دا خۆی بادا تەکەتەکی کرد ٥ **نأمتِ القَوْسُ** نئيماً: قەوسـەکە دەنگی لێ هات.

**نَأمَ** الرجلُ: پیاوەکە بەهێواشی ناڵاندی ٥ **النّأمَـةُ**: دەنگی قەوس ٥ دەنگی نزم هی هەرشتێك بێ ٥ ئـاوازی گـۆرانی ٥ **النّئيمُ**: بـەمانا (النّأمَـةُ) دێ ٥ **نَأنـأ في الـرأي نَأنـأةً**: ڕاو بۆچـونەکە تێکـەڵو پێکەڵ بوو هیچی بەسەر هیچەوە نـەبوو ٥ **نَأنـأَ عنه**: نەیگەیشتێو نەیتوانی بیگاتێ.

**نَأى** بجانبه: لوتبەرزی نواند، خۆی بەزل زانی.

**نَأى النُّؤيَ**: بـەدەوری خێمەکـەدا جۆگـەی ڕاکێشا بۆئـەوەی ئـاو سـەر چادرەکەی نەگـرێ ٥ **أنـأى**

الشَّيْئَ : شتەکەی دوورخستەوە ٥ أَنْأَى الخِباءَ: جۆگەی بەدەوری خێوەتەکەدا لێدا بۆئەوەی ئاوەڕۆی لێ دوور بخاتەوە ٥ إنْتَأَى نُؤياً: جۆگەلەی دەوری خێوەتی دروست کرد ٥ تَناءوا: دوورکەوتنەوە ٥ المُنْتَأَى: شوێنی دوور ٥ النُّؤيُ: جۆگایەکە بەدەوری خێمەدا لێ دەدرێ بۆئەوەی ئاوی لافاو نەچێتە ژێر خێمەکە ٥ النّايُ: ئامێرێکی مۆسیقایە ٥ بلوێرو شمشاڵ ٥ کەدەنگی حەزینی هەیە مەولانای ڕۆمی دەڵێ: (بشنو أز ني چون حيكايت ميكند وزجدايها شكايت ميكند)

**نَبَأَ الشَّيْئُ:** شتەکە بەرز بۆوە، دەرکەوت.

**نَبَأَ من أرض الى أرض أخرى:** لە وڵاتێکەوە چوو بۆ وڵاتێکی تر.

**نَبَـأَ على القوم:** هاتە سەر خەڵکەکەو هێرشی کردنە سەر.

**نَبَأَ نَبْأً:** بەهێواشی دەنگی لێ هات.

**نَبَأَ الرجلُ نَبْأً:** پیاوەکە هەواڵی پێ بوو خەبەری لێ دا ٥ أنْبَأَ الخَبَرَ: هەواڵی دا ٥ نابأه مُنابأةً: هەریەك لەو دووانە هەواڵیان بەیەکتری دا ٥ نابَأَ القومَ: وازی لە خەڵکەکە هێناو لێیان دوورکەوتەوە ٥ نَبَّأهُ الخبرَ وبالخبر: هەواڵی پێدا ٥ نَبَّأتُ زيداً عمراً خارجاً: هەواڵم بەزەید دا کە عەمر چووەتە دەر ٥ تَنَبَّأَ: لافی پێغەمبەرێتی لێ دا ٥ تَنَبَّأَ بالأمر: پێشبینی بەرەوداوی کارەکەی کرد ٥ إسْتَنْبَأَ الرجلَ: داوای هەواڵی لە پیاوەکە کرد ٥ إسْتَنْبَأَ النَبَأَ: لە هەواڵەکەی کۆڵیەوە ٥ النَّبْأةُ: دەنگ کە زۆر گەورە نەبێ ٥ سمعت نَبْأةً: گوێم لە دەنگێك بوو ٥ هەروا ناوە بۆ تەپۆڵکەو بەرزایی کێو ٥ النُّبُوءةُ: پێغەمبەرێتی: پلەو پایەیەکە خودا دەیبەخشێ بەهەندێك لە بەندە هەڵبژاردەکانی خۆی، نیگایان بۆ دەنێرێو دەیانکاتە پەیامبەری خۆی بۆ سەر بەندەکانی ٥ هەندێك جار پەیامەکە هەر بۆ پێغەمبەرەکان خۆیانەو بەس ٥ هەوڵدان لە شتو مەزەندەکردنی پەیدابوونی ٥ النَّبِيءُ: پێغەمبەر ٥ پەیام هێنەر لە خوداوە، پەیام بۆ نێردراو ٥ شوێنی بەرزو تەپۆڵکەی پانەوەبوو بەزەوی دا.

**نَبَّ التَّيْسُ:** نێرەیە کە مرقاندی، باڕاندی ٥ نَبَّبَ النباتُ: ڕووەکەکە پەلو قەدو لاسکی کلۆری هەبوو. ٥ تَنَبَّبَ الماءُ: ئاوەکە بەناو بۆری دا ڕۆیی، چووە ناو بۆرییەوە ٥ الأنبُوبُ و الأُنْبُوبَةُ: نێوان دوو گرێ لە لاسکو پەلی ڕووەك دا ٥ لە قەفەزاژدا ٥ هەرشتێك لولو ناوبۆش بێ وەکوو قەفەزاژو بۆری ناو و بۆری پلاستیكو شتی وا ٥ أنابيب الرئة: بۆری هەناسە.

**نَبَتَ الزَرْعُ نَبْتاً ونباتاً:** ڕووەکەکە ڕواو دەرکەوتو لەزەوی بەرز بۆوە ٥ نَبَتَت الأرضُ: زەوییەکە ڕووەکی لێ پەیدا بوو ٥ نَبَتَت ثدی الجارية: مەمکی کچۆڵەکە بناغەیان داناو قیت بوون ٥ أنبَتَت الأرضُ: زەوی ڕووەکی دەرهێنا ٥ أنْبَتَ اللهُ البَقْلَ: خودا ڕووەکی ڕواند، لەزەوی ڕووەکی دەرهێنا ٥ نَبَّتَ الزرعُ: کشتو کاڵەکە بۆ یەکەم جار لەزەوی سەری دەرهێنا ٥ نَبَّتَ الشجرَ: درەختەکەی ڕواند، چەقاندی ٥ نَبَّتَ الصَّبِيَّ: منداڵەکەی باش پەروەردە کردو سەرپەرشتیاریی بوو ٥ تَنَبَّتَ الشَّيْئُ: بەمانا (نَبَتَ) دێ ٥ المَنْبِتُ: شوێنی ڕوانی ڕووەكو درەخت ٥ بنەماو نەصڵ ٥ النابتة: کوڕو کچ کە لەتەمەنی منداڵی تێپەڕنو هێشتا باش قاڵ نەبووبن ٥ النَّباتُ: ڕووەك کە ڕەگو ڕیشاڵی هەبێو تەڕ بێ لەزەوی دابێو ئاو بدرێ یان

لەناو ئاودا بێ ٥ یان درەخت و ڕووەك بەگشتی ٥ **علم النبات**: زانیاری ڕووەکناسی و جۆنیەتی گەشەکردنی و جۆرەکانی ٥ **النَّبَاتِيُّ**: کەسێك خەریکی زانیاری ڕووەکناسی بێ ٥ **رجل نباتيٌّ**: پیاوێکە خواردنی ڕووەکە، بژێوی ڕووەکەو بەس ٥ **دهن النباتيُّ**: ڕۆنێکە ڕاستەوخۆ لە ڕووەك دەرهێنراوە ٥ **النَّبْتُ**: بەمانا (النَّبات) دێ ٥ **النِّبْتَةُ**: حاڵەت و وەزعی ڕووەك و جۆنیەتییەکانی ٥ **النَّبُوتُ**: لق و پۆپی درەخت ئەو لقانەی لەسەر قەدی درەخت سەر هەڵدەدەن ٥ بەگۆچان و عەصای درێژیش دەگوترێ ٥ **اليَنبوتُ**: چڵە درەختێکە لەپێڕی (القرنية) گەڵاکەی و گوڵەکەی دەبنە هۆکاری ڕشاندنەوە.

**نَبَثَ عَنْ الأمر**: لەکارەکەی کۆڵیەوە.

**نَبَثَ الأرضَ**: گڵی زەوییەکەی کێڵایەوەو هەڵیکۆڵی.

**نَبَثَ الترابَ**: گڵەکەی دەردا ٥ **إنْتَبَثَ الترابَ**: گڵەکەی لەبیرەکە یان لەچاڵەکە دەردا ٥ **تنابَثَ القومُ**: خەڵکەکە هەر یەکەیان دەیەویست نهێنی ئەوی تریان دەربخاو بڵاوی بکاتەوە ٥ **الأنبوثةُ**: یارییەکە منداڵ شتێك دەشارنەوە لەناو گڵداو دوایی دەست دەکەن بە گەڕان بەدوی دا هەرکەسێ بیدۆزێتەوە براوەیە.

**النَّبِيثُ**: دەگوترێ: (ما رَأيتُ بالأرض نبيثاً) لە زەوییەکەدا هیچ شوێن پێ و ئەسەرێکم نەبینی ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان نبيث خبيث) فلانکەس شەڕانی و پیسە ٥ **النَّبِيثةُ**: گڵی بیرو ڕووبار ٥ نهێنی.

**نَبَجَ نَبجاً**: بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (نَبَجَ الجُرحُ) برینەکە هاوسا ٥ (نَبَجَ العظمُ) ئێسقانەکە هاوسا.

**نُبَحَ صوته نَبيجاً**: دەنگی زۆر بەهێز بوو ٥ **نَبَحَ الكلبُ**: سەگەکە لوراندی.

**نَبَحَ الكلبُ فلاناً وعليه**: سەگەکە بەفلانکەس وەڕی بەسەریا لوراند ٥ **أنْبَحَ الكَلْبَ**: سەگەکەی هێنایە وەڕین و لوراندن ٥ **إسْتَنْبَحَ الكلبَ**: سەگەکەی هێنایە وەڕین و لوراندن ٥ **النُّباحُ**: وەڕین و لوراندنی سەگ ٥ **النَّبّاحُ**: بۆ موبالەغەو زێدەڕۆیی لەمانای (نَبَحَ) دێ ٥ دەگوترێ: (کلب نَبّاح) سەگێکە زۆر دەوەڕێ زۆر دەلورێنێ ٥ دەنگی زۆر گەورەیە.

**نَبَخَ العَجين نبوخاً**: هەویرەکە هەڵات و گورا فشەڵ بوو ٥ **النُّبْخَةُ**: بلۆق و زیبکە: کە پڕدەبن لەناو لەسەر ڕوخسارو پەیدا دەبن جا یا لەناکامی گەرمی یان کارکردن.

**نَبَذَ نَبْذاً و نَبْذاناً**: تەکەتەکی کرد، هەڵبەزو دابەزی کرد ٥ فرکە فرکی کرد لێی دا ٥ دەگوترێ: (نَبَذَ عِرقُهُ) ٥ (و نَبَذَ قلبُهُ) دڵی لێی دا.

**نَبَذَ التَمْرُ**: خورماکە بوو بە نەبیز، بووبە سرکە.

**نَبَذَ الشَّيْءَ**: شتەکەی فڕێ دا.

**نَبَذَ الأمْرَ**: ئیشەکەی ئیهمال کرد، پاشگوێی خست.

**نَبَذَ العهدَ**: وادەو پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە.

**نَبَذَ التَمْرَ**: خورماکەی کرد بەسرکە ٥ **نابَذَهُ الحَرْبَ**: بەئاشکرا شەڕی لەگەڵ دا دەست پێ کرد ٥ **نابَذَ فلاناً**: بەهۆی جیاوازی بیرو باوەڕەوە لە فلانکەس جیا بۆوە ٥ **نَبِّذَ التمرَ أو العنبَ**: سرکەی لەخورما یان لە ترێ دروست کرد ٥ **إنْتَبَذَ فلان**: فلانکەس لەلایەکەوە گۆشەگیر بوو ٥ **إنْتَبَذَ عَنْ القوم**: لەخەڵکەکە گۆشەگیر بوو ٥ **إنْتَبَذَ التَمْرَ**: خورماکەی کرد بە سرکە ٥ بەبیرە ٥ **إنْتَبَذَ ناحية**: گۆشەگیر بوو، تەرە بوو، دابڕا.

لەخەڵکەکە دوورکەوتەوە ٥ **تنابَذَ القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە کێشەو ڕکەبەری لەگەڵ یەکتر، دژایەتی یەکتریان کرد ٥ **المِنْبَذَةُ**: سەرین، پالیف ٥ **المنبوذُ**: فڕێ دراو، فێز لێ کراو ٥ دەگوترێ: (إلتَقَطَ فلان مَنْبوذاً) فلانکەس فڕێدراوێکی هەڵگرتەوە ٥ **المنبوذون**: پیرێکن لە هیندوستان کۆمەڵگای هیندی بەچاوی سوك سەیریان دەکا، هەژارو ژێردەستەو چەوساوەن ٥ **النَّبّاذُ**: سرکە دروستکەر (بیرە دروستکەر) ٥ **النَّبْذُ**: شتی کەم ٥ دەگوترێ: (فِي رأسه نبذ من شيب) سەری کەمێك موی سپی تێکەوتوون ٥ **النَّبْذَةُ**: ناحیەو دەڤەر ٥ **النُّبْذَةُ**: پارچەیەك، نمونەیەك لەشت ٥ دەگوترێ: (نُبْذَة من كتاب) ٥ (نُبْذَة من رواية) ٥ **النَّبِيذُ**: فڕێدراو ٥ بیرە ٥ شەرابێك لەترێو خورما دروست بکرێو سەرخۆشکەر بێ.

**نَبَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەرز کردەوە ٥ دەگوترێ: (نَبَرَ فِي قرائته، أو غنائه) لە خوێندنەوەکەی دا یان لە گۆرانی وتنەکەی دا دەنگی بەرز کردەوە.

**نَبَرَ الحرف**: هەمزەی خستە سەر ئاخری وشەکە.

**نَبَرَ القُرَادُ الدَّابةَ**: گەنەکە وڵاخەکەی گەست ٥ **إنْتَبَرَ الشَّيْءُ**: شتەکە بەرز بۆوە ٥ **إنْتَبَرَ الجُرحُ**: برینەکە هاوسا ٥ **إنْتَبَرَ الخطيبُ**: وتارخوێن چووە سەر دوانگە ٥ **الأنبارُ**: عەنبار خانوێکە بازرگان کاڵای تێدا کۆدەکاتەوە، عەنبارێکە دانەوێڵەی تێدا هەڵدەگیرێ ٥ کۆمەڵە گەنم.

**المِنْبَرُ**: دوانگە ٥ شوێنی وتار خوێندنەوەی وتارخوێن ٥ **النَّبْرُ فِي النطق**: جیاکردنەوەو دەرخستنی بڕگەیەکی وشەیە لەکاتی وتنی دا ٥ **النَّبْرُ**: گەنە ٥ **النَّبْرَةُ**: بەرزایی لەهەر شتێك دا بێ هاوسان، ناوەڕاستی چاڵی دەرەوەی لێو ٥ پیتی هەمزە ٥ دەنگ بەرزکردنەوە لەکاتی وتنی وشەیەكو بە پشتیوانی پیتێك لە پیتەکانی ٥ بە گوێرەی گۆڕانی شوێنی دەنگ هەڵبڕینەکە لە وشەکەدا زاراوەکان لێك جیادەکرێنەوە ٥ **النِّبْراسُ**: چرا ٥ سەرە ڕمبی پان ٥ **نَبَزَهُ نَبْزاً**: ڕەخنەی لێ گرت ٥ (نَبَزَهُ بكذا) نازناوی ئەوەی لێ نا ٥ **نَبَّزَهُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَبَزَهُ) دێ ٥ **تنابَزوا بالألقاب**: بە نازناوی ناشیرین یەکتریان لەکەدار کرد: حوسەکوێر، حەمە کەچەڵ، خولە شەل ٥ سەلیم جاش، جەلال گونەگا، عەلە ورگە، ڤالە دز ٥ **النَّبَزُ**: نازناوێك لەکەدار کردنی تێدا بێ ٥ **النُّبَزَةُ**: کەسێك زۆر نازناوی لەکەدار کردن بەخەڵك بڵێو هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدا بێ ناو و ناتۆرەی ناشیرینیان بۆ بدۆزێتەوە.

**النُّبْزَةُ**: کەسێك نازناوی ناشیرین بۆ خەڵك دابنێ.

**نَبَسَ نَبْساً ونُبْسةً**: لەبەر خۆیەوە لێوی جوڵاندنو ورتە ورتی بوو ٥ بەزۆری بۆ نەفی بەکاردێ دەگوترێ: (ما نَبَسَ بنت شفة) ٥ **أنْبَسَ**: لەبەر بێ دەسەڵاتی بێدەنگ بوو ٥ **نَبَّسَ**: بەمانا (نَبَسَ) دێ ٥ **نَبَشَهُ نَبْشاً**: هەڵیکۆڵیو شی کردەوە بۆئەوەی بزانێ چی تێدایە دەری بێنێ.

**نبش المستور**: شاردراوەکەی دەرخست.

**نبش الأسرار**: نهێنیەکانی ئاشکرا کردن.

**نبش الحديث و عَن الحديث**: لە فەرموودەکەی کۆڵیەوە ٥ **إنْتَبَشَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لە پەنا پاسارو ڤوژبنی خۆی هێنایە دەرەوە ٥ **الأنبوشُ**: ئەوەی هەڵدرابێتەوە، شەند کرابێتەوە ٥ درەختی چەقێندراوی هەڵکەندراو بە ڕەگو ڕیشەوە ٥ **أنابيش الكلأ**: ئەو لەوەڕو گژوگیایەی لەزەوی بەرزبۆتەوەو پەڵەپەڵەیە ٥ **النَّبّاش**:

گۆڕهەڵدەرەوە بۆ کفن دزین ◊ النَّبَّاشَةُ: پیشەی گۆڕهەڵدانەوەو کفن دزین.

**نَبَصَ الغلام بالطائر والكلب وغوهما**: کوڕەکە فیکەی بۆ باڵندەکە یان سەگەکە کرد بانگی کرد بێتەوە ◊ بگەڕێتەوە.

**نَبَصَ بالكلمة**: وشەکەی بەنقەنق دەربەڕاند، ڕەوان نەبوو.

**نَبَضَ الشَّيْئُ**: لە شوێنی خۆی جوڵا ◊ فرکە فرکی کرد، پەلەپەلی کرد.

**نَبَضَ الماءُ**: ئاوەکە بەرز بۆوە سەر ڕێژی کردو ڕەوان بوو ◊ أنبَضَهُ: خستیە جەمو جوڵ ◊ دەگوترێ: (أَنْبَضَ القوسَ وأنبضَ الوَتَر) کەوانەکە یان ژێیەکەی لەراندەوە ◊ أنبضته الحمى: لەرزوتا وەشەقە توڵەی هێنا ◊ نَبْضَهُ: بەمانا (أنبضه) دێ ◊ المَنْبِضُ: ئەو خشپەو خشەو ترپەو سیکەو زیکەو شتە کە دەبیسترێ لە شتی جوڵاو و هەستی پێ دەکرێ ◊ دەگوترێ: (جَسَّ الطبيبُ مَنْبضَهُ) ◊ المِنْبَضُ: کەوانی هەلاجە کە لۆکەی پێ شی دەکاتەوەو پاکی دەکاتەوەو خاشاکی لێ دوور دەخاتەوە ◊ النَّبْضُ: لێدانی شاڕەگە خوێنبەرەکانە بەهۆی وێکهاتنەوەی دڵو کرانەوەی، کە دەکرێتە نیشانە بۆ چۆنیەتی جەستە لەڕوی تەندروستیەوە ◊ دەگوترێ: (جَسَّ الطبيب نَبْضَهُ) ◊ **نَبَطَ الشَّيْئُ**: شتەکە دوای ونبوون و دیارنەمانی دەرکەوتەوە، هاتەوە بەرچاو ◊ دەگوترێ: (حَفَرَ الأرض حتى نبط الماء): زەوییەکەی هەڵکۆڵی تا ئاوەکەی دەرخستەوە ◊ (جَدَّ في التنقيب حتى نَبَطَ المَعْدِنُ): زەوی دۆزی کرد تا مەعدەن و کانەکە دەرکەوت.

**نَبَطَ الشَّيْئَ نَبْطاً**: شتەکەی دەرخست ◊ خستیە ڕوو.

**نَبَطَ العِلْمَ والحِكْمَةَ**: زانیاری و حیکمەتی دەرهێناو بەناو خەڵك دا بڵاوی کردەوە ◊ أَنْبَطَ الحافر: سمەکە چەقی (سمی وڵاخەکە ڕۆچوو) ◊ أنْبَطَ الشَّيْئَ: بەمانا (نَبَطَهُ) دێ ◊ أَنْبَطَ جواب السؤال: وەڵامی پرسیارەکەی دەرهێنا ◊ أنبَطَ حكم القضية: بڕیاری پێویستی دەربارەی ڕوداوەکە دەرهێناو ڕونی کردەوە ◊ تَنَبَّطَ: خۆی بەنەتەوەی (نەبەتی) شوبهاند ◊ خۆی پاڵ ئەوان دا ◊ تَنَبَّطَ الشَّيْئَ: شتەکەی دەرخست ◊ إنْتَبَطَ الكلام: قسەکەی دەرهێنا ◊ إسْتَنْبَطَ فلان: فڵانکەس بوو بە هۆزی (نەبەتی) ◊ إسْتَنْبَطَ الشَّيْئَ: بە کۆشش و ماندوو بوون شتەکەی دەرهێنا ◊ دەگوترێ: (إسْتَنْبَطَ الفقيه الحكم) شەرع زانەکە حوکمی ڕوداوەکەی دەرهێنا ◊ إسْتَنْبَطَ الجواب: لە شێوەی پرسیارەکە وەڵامەکەی دەرهێنا ◊ إسْتَنْبَطَ من فلان خبراً: هەواڵەکەی لەفڵان دەرهێنا بە ماندوبوونی زۆرو تێکۆشانی بێ وچان.◊ الأنْباطُ: گەلێکی سامی نژادن، حکومەت و فەرمانڕەواییەکیان هەبوو لە شیمالی نیوە دورگەی عەرەب و پایتەختەکەیان (سلع) بوو ئێستا ناوەکەی گۆڕاوەو ناویان ناوە (البتراء) ◊ هەروا ناوە بۆ کۆمەڵێك خەڵکی تێکەڵاو و هەمەجۆر: کە عەرەب نژاد نەبن ◊ النَّبَطُ: بەمانا (الأنباط) دێ ◊ ناوی بیر کە دەردەکەوێ یەکەمجار لەکاتی هەڵکەندنی دا ◊ دەشگوترێ: (فلان لايدرك نَبَطُهُ) فڵانکەس کەس لەناخی حاڵی نابێ و زانیاری و حیکمەتی هێندە زۆرە دەرك ناکرێ ◊ النُّبْطَةُ: ئاوی بیر کە یەکەمجار دەردەکەوێ.

**نَبَعَ الماءُ من الأرض نَبْعاً**: ئاوەکە لەزەوی هەڵقوڵا.

**نَبَعَ العَرَقُ من البدن:** ئارەق لە جەستە دەرچوو ٥ جۆرایە خوار ٥ **أنْبَعَ الماءَ ونحوه:** ئاوی هەڵقوڵاند (هەڵی هێنجا) ٥ **تَنَبَّعَ الماءُ ونحوه:** ئاوەکە کەم کەم هاتەدەر ٥ **المَنْبَعُ:** سەرچاوەی ئاو ٥ سەرچاوە و کان ٥ **النّابِعَةُ:** ڕێڕەوی عەرەق لە جەستەدا ٥ دەگوترێ: (نَضَحَت النوابعُ بالعرق) ٥ **النَّبْعُ:** درەختێکە لەبەرزایی کێو و کەژ دەڕوێ ٥ لە چیلکەکانی سەرەتیر دروست دەکرێن ٥ **النَّبيعُ:** بەمانا (النابعُ) دێ ٥ بەمانا (عەرەق) دێ ٥ **اليَنْبوعُ:** سەرچاوەی ئاو، کانیو کارێزی ئاو.

**نَبَغَ المرأ في العلم:** مرۆڤەکە لەبواری زانیاری دا سەرکەوتوو هەڵکەوتوو بوو.

**نَبَغَ الشَّيْئُ من الشَّيْئِ:** شتەکە لەشتەکەوە دەرکەوت ٥ **نَبَّغَ النخلَ:** تۆزی تۆوە نێرەکەی بە خورماکە کرد بۆ ئەوەی تەلقیح ببێو بەربگرێو هەڵی پێچێ ٥ **النّابِغُ والنّابِغَةُ:** هەڵکەوتو داهێنەر لەبواری زانیاریو فەن دا ٥ **النُّباغُ:** تەپو تۆزی شت ٥ دەگوترێ: (نباغ الدقيق) تەپو تۆزی ئارد ٥ (نباغ الطريق) تەپو تۆزی ڕێگا ٥ **النُّباغُ والنُّباغَةُ:** پێستی سەر و ئەوەی پەیوەندی بە بنکی قژی سەرەوە هەیە ٥ **النَّبْغُ:** بەمانا (النُّباغ) دێ ٥ **النَّبيغُ:** هەڵکەوتە، مرۆڤی ناوازەو نائاسایی ٥ **النَّبْقُ:** بەری درەختی سیدر ٥ درەختێکە لە پێری (السَّدرية) زۆر بەرز نابێتەوە، لقەکانی سپیو لوسن گوڵی بچکۆلەی هەیە، میوەکەی شیرینە و دەخورێ، لە وڵاتی میسرو ئەفریقیا دەڕوێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئاردەلۆکەیەك لە مۆخی لقەدار خورما دێتە دەرو لە دروستکردنی نەبیزدا بەکاردێ.

**نَبَكَ المكانُ نبوكاً:** شوێنەکە بەرز بۆوە ٥ **النَّبْكَةُ:** زەوییەك بەرزو نزمی تێدابێ توركە تورکە بێ ٥ کۆمەڵە گلێك لای سەروی تیژ بێ ٥ **أنْبَكَ المكانُ:** بەمانا (نَبَكَ) دێ ٥ **أنْبَكَ القومُ:** خەڵکەکە کۆك بوون لەسەر شەڕکردن.

**نَبَلَ النَّبْلَ نَبْلاً:** سەرەتیری باشی دروستکردن.

**نَبَلَ الهدفَ:** تیری ئاراستەی نیشانەکە کرد، تیربارانی شتەکەی کرد.

**نَبَلَ على فريقه في القتال:** لە شەڕدا تیری دابەش کرد بەسەر تاقمەکەی دا.

**نَبَلَ أقرانَه:** لەتیر هاویشتن دا بەسەر بەرامبەرەکانی بەسەر هاوەڵەکانی دا زاڵ بوو.

**نَبُلَ نُبْلاً ونَبالَةً:** گەورەو شکۆدار بوو ٥ دەگوترێ: (أجاد غذاءها حتى نَبُلَ جِسْمُها) بژێوی چاکی پێدا باشی پەروەردە کرد هەتا جەستەی گەورە بوو تێکسمڕا ٥ جوانی پەروەردە کرد تا ڕەوشتی جوانی تێدا ڕواندن ٥ ڕەوشت بەرز دەرچوو.

**نَبُلَ فلانٌ:** فلانکەس خانەدانو وەجاغزادە دەرچوو ٥ خەڵکی مەدحی دەکاو خۆشیان دەوێ ٥ **أنْبَلَ فلانٌ:** فلانکەس مندالێکی عاقڵو ڕەوشت بەرزی بوو ٥ **أنْبَلَ فلاناً:** سەرەتیری دا بە فلانکەس ٥ **أنبلَ السهامَ:** سەرەتیرەکانی ئەستوور کردن ٥ **نابَلَهُ:** لەتیر ئەندازی دا یان لەوەجاغزادەیی دا پێشی ئەو کەوتو بەسەری دا زاڵ بوو ٥ **نَبَّلَهُ:** سەرەتیری دایە بۆئەوەی بیهاوێ ٥ **نَبَّلَ القوسَ:** تیری خستە ناو کەوانەکەوە ٥ **تَنابَلَ القومُ:** خەڵکەکە کێشەیان تێکەوت ئاخۆ کامەیان ڕەسەنترو خانەدان ترە لەم بارەوە کەوتنە مقۆمقۆ ٥ یان کێیان باشتر دەزانێ تیر دروست بکا ٥ **تَنَبَّلَ فلانٌ:** فلانکەس

گەورە بوو ٥ خۆی شوبهاند بە عاقڵمەندان ڕاپەسندان ٥ تیری لەگەڵ خۆی هەڵگرتن ٥ تَنَبَّلَ الشَّیْئَ: شتەکەی چاك ئەنجام دا ٥ شتە باشەکەی گرتەوە ٥ إِنْتَبَلَ النَّبْلَ: سەرە تیری ئامادە کردن ٥ إِنْتَبَلَ للأمر نَبْلَهُ: خۆی بۆ کارەکە ئامادە کرد ٥ ئامێری پێویستی بۆ کارەکە ڕەخساندن ٥ إِسْتَنْبَلَهُ: داوای تیری لە فلان کرد ٥ إِسْتَنْبَلَ الشَّیْئَ: لە شتەکە ئەوی باش و بەکەڵك بێ بردی ٥ النَّابِلُ: لێزان و کارامە لە دروستکردنی چەك دا ٥ تیر هاوێژ ٥ تیر فرۆش، خاوەن تیر ٥ دەشگوترێ: (إختلط الحابل بالنابل) شتەکان تێکەڵ و پێکەڵ بوون، نازاندرێ کێ ڕاوچی بەداوەوەو، کێ ڕاوچی بە تیرو کەوانە ٥ النَّبَالة: زیرەکی و وەجاغزادەیی و شەرەف و شکۆمەندیی ٥ النِّبَالة: تیرگەری، تیرسازی ٥ تیر دروستکەر ٥ النَّبَّالُ: وەستای تیر دروستکردن ٥ النَّبْلُ: تیر ٥ النُّبْلَةُ: بەردە وردە، شتی بچوك و ناوازە ٥ النَّبِیلُ: شەریف و ڕەسەن و وەجاغزادە.

**نبه** نباهةً: شەریف بوو ٥ مەشهور بوو.

**نَبِهَ** للأمر نَبَهاً: شتەکەی زانی عەقڵ و ڕای بۆ شتەکە چوو ناوبانگی پێ دەرکرد.

**نَبُهَ** نُباهةً: شەریف بوو ٥ ناوبانگی پیاوەتی و ڕەوشت بەرزی بڵاو بۆوە ٥ نَبَّهَ بإسمه: ئاماژەی بەناوەکەی کرد، ناوی هێنا ٥ أَنْبَهَهُ من النوم: لە خەو ڕاستی کردەوە ٥ هەڵیستاند ٥ نَبَّهَ فلاناً: فلانکەسی بەرز کردەوە ناو و ناوبانگی پیاوەتی بەناو خەڵك دا بڵاو کردەوە ٥ إِنْتَبَهَ للأمر: کارەکەی زانی تێی گەیشت ٥ إِنْتَبَهَ من النوم: بەخەبەر هات، لەخەو هەڵسا ٥ تَنَبَّهَ للأمر: لەکارەکە حاڵی بوو، بۆی ڕون بۆوە ٥ تَنَبَّهَ علی الشَّیْئِ: بەسەرشتەکە دا ئاگادار بوو ٥ إِسْتَنْبَهَ: عاقڵ و لێزان بوو ٥ لەخەو هەڵسا.

الْمُنَبِّه: ئاگادار کەرەوە، سەعات و مۆبایل کەجەرەس لێ بدەن دەخرێنە سەر کاتێکی دیاریکراو و مەبەست بۆ ئەوەی لەو کاتەدا جەرەس لێ بداو کابرا بەئاگا بێنن ٥ الْمَنْبَهَةُ: ئەوەی هەڵنەمر بێ بۆ زیرەکی و بەئاگایی و لێزەانی بۆ ناو و شۆرەت ٥ الْمَنْبُوه: دەگوترێ: (رجل منبوه الأسم) پیاوێکی ناسراوەو ناو و ناوبانگی جیهانی گرتۆتەوە ٥ النَّابِهُ: شەریف و ڕەسەن و وەجاغزادە ٥ خاوەن ناو و ناوبانگی پیاوەتی ٥ پێچەوانەی مانای (الخامِلُ)ە ٥ دەشگوترێ: (أمر نابه) کارێکی گەورەیە ٥ النَّبَاهَةُ: شەرەف و ڕێزداریی ٥ بەناوبانگ و ناسراو ٥ زیرەکی ٥ النَّبیه: بەمانا (النَّابه) دێ ٥ النَّبَهُ: شتێك بەبێ چاوەڕوانی و خواست هاتبێتە کایەوە ٥ دەگوترێ: (أمر نَبَهٌ) ٥ بەناوبانگ ٥ أنباه النحاة: نەحوزانە بەناوبانگەکان ٥ النُّبْهُ: زیرەکی ٥ لەخەو ڕابوون.

**نبی** الشَّیْئُ نُبُواً ونُبِیّاً: شتەکە نەچوە شوێنی گونجاوی خۆی ٥ کلمة نابیة: وشەیەکی نەگونجاوە بۆ ئەم ڕستەیەو لەم شوێنەدا.

**نبا** البصر عَنْ الشَّیْئِ: چاوەکە لێی لاداو نەیویست بیبینێ.

**نبا** السیفُ نَبْواً: شمشێرەکە نەی هەنگاوت.

**نبا** السَّهمُ عَنْ الغرض: تیرەکە سەری کرد ٥ نەی هەنگاوت، لای کرد.

**نبا** جَنْبُهُ عَنْ الفراش: تەنیشتی لەسەر نوێن و جێگای نووستنەکە ئارامگرنەبوو ٥ أنْبَی الشَّیْئَ: شتەکەی نەگونجاو کرد ٥ تَنَبَّی: لافی پێغەمبەرێتی لێ دا ٥ النُّبْوَةُ: ستەمی ڕۆژگار ٥

سورانی ڕۆژگار بە پێچەوانەی ویستو ئارەزوو ◊ **النُّبُوَّة**: بڕوانە مادەی (نَبَأ) ◊ **النَّبِيُّ**: پێغەمبەر.

**نَتَأَ الشَّيْءُ**: شتەکە هەڵتۆقیەوە، بەرزبووە ◊ **نَتَأَت الصَّخْرَةُ فِي الجَبَل**: دەرکە شاخەکە لە کێوەکەدا بەرز بۆوە ◊ **نَتَأَت القرحة**: برینەکە هاوسا ◊ **نَتَأَت الثَّدْيُ**: مەمکەکە خڕبوو ◊ **النُّتُوء**: دەرکەوتنو بەرزبوونەوە ◊ شتی ئاشکراو بەدەرەوە ◊ دەگوترێ: (جلسنا على نتوء في الجبل) ◊ **نَتَّت القِدْرُ ونحوها نَتّاً ونَتِيتاً**: مەنجەڵەکە کوڵی.

**نَتَّ من المرض**: بەهۆی نەخۆشییەوە ناڵاندی ◊ **النُّتَّةُ**: بەرداوی بچکۆلە، چاڵایی لەبەردو شاخ دا، کە ئاوی بارانی تێدا کۆبێتەوە.

**نَتَجَ النَّاقَةَ نَتْجاً**: وایکرد حوشترەکە بزێ.

**نَتَجَ الشَّيْءَ**: سەروکاری شتەکەی کرد تا بەرهەمی هێناو بەروبوومی پەیدا کرد ◊ **أَنْتَجَت النَّاقَةُ**: حوشترەکە کاتی ئەوەی هات بەروبوومی هەبێ ◊ **أَنْتَجَ الشَّيْءُ**: شتەکە بەروبوومی دەرکەوت ◊ **أَنْتَجَ فلان الشَّيْءَ**: فلانکەس سەروکاری شتەکەی کرد تا بەروبوومی پەیدا کرد ◊ **تناتَجت الماشية**: ئاژەڵەکان زاو و زەیان کرد ◊ **إسْتَنْتَجَ الشَّيْءَ**: هەوڵی دا شتەکە بێنێتە بەرهەم ◊ لەشتەکەی هەڵکڕاندو وای لێ حاڵی بوو ◊ **إسْتَنْتَجَ الحكمَ من أدلته**: بڕیارەکەی لەبەڵگەکانی دەرهێنا ◊ **المَنْتَجُ**: کاتی بەروبووم ◊ **المنتوجة**: بەروبووم ◊ شتی وەبەرهەم هاتوو ◊ **النَّتوج**: وەبەرهاتوو ◊ **النِّتاج**: بەروبوومی شت ◊ **النُّتوجُ**: شتی بەردار ◊ **النَّتيجة**: ئەنجامو بەرهەم ◊ سەرەنجامی پێشەکیو بەڵگەی حوکم ◊ تەقویمی ساڵانەی حیسابی فەلەکی.

**نَتَحَ نَتْحاً ونتوحاً**: تەڕشوحی کرد ◊ **نَتَحَ الإناءُ بمافيه**: گۆزەکە یان قاپەکە شتی هێنایەوە بەوەی تێدایە، ئاوەدزی کرد ◊ **تَنَتَّحَ**: تەڕشوحی پەیدا کرد ◊ **المَنْتَحُ**: شوێنی تکانو لێ چۆڕانی شلەمەنی ◊ **النَّتْحُ**: عارەق، هەر شلەمەنییەك دزە بکا لە جەستەیەکەوە بۆ دەرەوە ◊ صەمغو جەوی‌و بنێشتو شلەمەنی تر کەلە درەخت دێتە دەر.

**نَتَخَ الشَّيْءَ نَتْخاً**: شتەکەی داڕنی، هەڵیکەند ◊ هەڵیکێشا ◊ دەگوترێ: (نَتَخَ الضرْس) ددانە خڕێیەکەی هەڵکەند ◊ **نَتَرَهُ نَتْراً**: قسەکەی گوشی‌و بەدەنگی زل گوتی ◊ **ناتَرَهُ**: دەگوترێ: (کلمه مناترة) بەئاشکراو بەدەنگی بەرز قسەم لەگەڵ کرد ◊ **إنْتَتَرَ الشَّيْءَ**: بۆ موتاوەعەی (نَتَرَهُ) دێ ◊ **النَّتْرُ**: دەگوترێ: (طعن نتر) زەبرێکە زەیدەڕۆیی تێدا کراوە ◊ **النتروجين**: زۆرینەی ئەو عونصورانەیە کە هەوایان لێ پێکهاتووە ◊ چواربەش لە پێنج بەشی هەوا نایترۆجینە.

**نَتَشَ الشَّيْءَ نَتْشاً**: شتەکەی کێش کرد، ڕای تەکاند.

**نَتَشَ الشوكةَ بالمنتاش**: بە موکێش چقڵەکەی دەرهێنا.

**نَتَشَ الشَّعْرَ**: مووەکەی هەڵکێشا ◊ دەشگوترێ: (ما نتش منه شيئاً) هیچی لێ هەڵنەگرت.

**نَتَشَ اللحمَ ونحوه**: گۆشتەکەی کوت کوت هەڵپچڕی.

**نَتَشَ فلاناً نَتْشاً**: بە نهێنی ڕەخنەی لە فلانکەس گرت.

**نَتَشَ الشَّيْءَ برجله**: بەقاچی پاڵی بە شتەکەوە ناو دووری خستەوە (نتش الدابَّةَ بالعصا) بەگۆچان لە ولاخەکەی دا ◊ **أنتش الثوبَ**: قوماشەکەی

كۆن كرد ◊ أنْتَشَ الحَبُّ: دانەوێڵە چەكەرەكەی بەزەوی دا ڕۆچوو ◊ أنتش النبـاتُ: ڕوەكەكە پێش ئەوەی ڕەگەكانی لە زەوی دا پتەو بن سەری دەرهێناو چوزەرەی كرد ◊ النَّـتَشُ: چروزەی ڕوەك ◊ چروزەی ڕوەك كە یەكەمجار سەر دەردێنێ ◊ ئەو سپیایەتییەی لەبنكی نینۆك دا دەردەكەوێ.

**نَتَعَ السـائل نَتْعاً ونتوعاً:** شلەمەنیەكە كەم كەم هاتە دەر.

**أنتع القَيْئُ:** ڕشانەوەكە كۆتایی نەهات.

**نَتَفَ الشعْرَ والريشَ:** مووەكەی هەڵكێشا یان پەڕو پۆڵی هەڵكەند ◊ **أنتف الكـلأ ونحوه:** لەوەڕەكە (گیایەكە) بەرز بۆوە تاوای لێ هات بەردەست دەكەوت و دەتوانرا هەڵی بكەنی ◊ **نَتَّـفَ:** بۆ موبالغە لەمانای (نَتَفَ)دا دێ ◊ **إنْتَتَفَ الشَّعْرُ:** مووەكە هەڵكەندرا ◊ **إنْتَتَفَ الشَّعْرَ:** مووەكەی هەڵكەند ◊ **تناتف:** بەمانا (إنْتَتَفَ) دێ ◊ **تَنَتَّفَ:** بەمانا (إنْتَتَفَ) دێ ◊ **المِنْتـافُ:** موهەڵكێش ◊ **النُّتافَـةُ:** ئەو موانەی لەكاتی موهەڵكێشاندا بەردەبنەوە.

**النَّتَفُ:** ئەوەی دەقرتێندرێ لەدەوراندەوری نینۆك ◊ **النُّتْفَـةُ:** پارچەی هەڵوەری و، پارچە نان و گوێچكە نان ◊ دەگوترێ: (نُتْفَةٌ من طعام ونُتْفَةٌ من علم) پارچە خواردنێك، بڕە زانیارییەك ◊ **النُّتَفَةُ:** ئەوەی لە هەر شتێك لایەك دەگرێ و زۆر تیایاندا قوڵ نابێتەوە ◊ **النُّتوف:** بەمانا (النّاتِفُ) دێ ◊ **النَّتيفُ:** بەمانا هەڵكەندراو دێ.

**نَتَقَ الميزانُ:** ئاژەڵەكە ورگی زل بوو پڕبوو لەبەز ◊ **نَتَقَتِ الأنثى:** مێینەكە زاوو زێی كردو وەچەی زۆر بوو.

**نَتَقَ الشَّيئَ نَتْقاً:** شتەكەی بەرزكردەوە بۆنەوەی ببهاوێژێ.

**نَتَقَ:** ڕایوەشاند، تەكاندی.

**نَتَقَ الوعـاءَ:** تورەكەكەی ڕاوەشاند بۆنەوەی چی تێدایە بێتە دەرەوە ◊ گونیەكەی تەكاند ◊ **نتقت الدَّابَّةُ راكبها:** وڵاخەكە هەڵتەك هەڵتەكی بەسوارەكە كرد ◊ دەشگوترێ: (نتق الزُّبدُ) بەهەژاندن ڕۆنەكەرەكەی دەرهێنا.

**نَتَقَ الشيئَ:** شتەكەی لێك كردەوە، قەڵاشتی ◊ **أنْتَقَ الرجلُ:** پیاوێك ژنێكی منداڵ زۆری مارەكرد، ژنێكی مارەكرد ڕەوێكی منداڵ لەمێردێكی تر هەبوون ◊ **أنْتَقَ الشَّيْئَ:** شتەكەی بەرز كردەوە ◊ **إنْتَتَقَ الشَّيْئُ:** شتەكە هەڵچو لێك بۆوە ◊ **المِنْتاقُ:** ئافرەتێ زۆری منداڵ هەبن ◊ **المَنْتَـقُ:** ئەو حەبلەی بەبەرسنگی ئەسپ دا دەهێندرێ و هەر دولای بەزینەكەوە شەتەك دەدرێ ◊ **النِّتـاقُ:** بەرامبەر، دەگوترێ: (داری نتاق داره) خانووەكەم بەرامبەر خانوی ئەوە.

**نَتَلَ الرجلُ من بين القوم:** پیاوەكە لەناو گەل و نەتەوەكەدا پێشكەوت و پلەو پایەی كۆمەڵایەتی بەرز بۆوە.

**نَتَلَ الشَّيْئَ نتلاً:** شتەكەی بەرەو پێشەوە كێش كرد.

**نَتَلَ فلاناً:** فلانكەسی دەركرد.

**نَتَلَ الوعاءَ:** زەرفەكەی بەتاڵ كرد چی تێدا بوو دەری هێنا ◊ **إنْتَتَلَ:** پێش كەوت ◊ دەگوترێ: (إنْتَتَلَ للأمر) خۆی بۆ كارەكە ئامادە كرد ◊ **تناتلَ النَّبْتُ:** ڕوەكەكە تێك هاڵا ◊ یان وەكوو لاولاو لەشتەكە هاڵا ◊ **النَّتيلَةُ:** وەسیلەو هۆكار.

**نَـتِنَ نَتْناً:** بۆگەنی ناخۆش بوو.

نَثَنَ الشَّيْئُ: شتەکە بۆگەن بوو ٥ أَنْتَنَ: بەمانا (نَثَنَ) دێ ٥ نَثَّنَ الشَّيْئَ: شتەکەی بۆگەن کرد ٥ المُنْتَنُ: شوێنی گەنیو ٥ شوێنی گەناندن.

نَثَا الشَّيْئُ نُثُواً: شتەکە بەرزبۆوە دەرکەوت ٥ (فهو ناتٍ) ٥ أنتى فلانٌ فلاناً: شکڵو شێوەی فلانکەس وەکوو فلان چوو ٥ تَنَثَّى عليه: بازی بەسەردا دا.

نَثَّ نَثيثاً، ئاوی دزی، تەڕایی دا.

نَثَّ الوعاءُ، ونثّ العَرَقُ: گۆزەکە تەڕایی دا

نَثَّ الخَبَرَ: هەواڵەکەی بڵاو کردەوە دەبوایە بڵاو نەبێتەوە.

نَثَّ فلاناً: لۆمەی فلانی کرد.

نَثَّ الجُرحَ، برینەکەی چەورکرد، هەنوی ٥ تَناثَّ القومُ الأخبار: خەڵکەکە هەواڵەکانیان بۆ یەکتر گێڕایەوە ٥ المِنَثُّ: دەگوترێ: (فلان مِنَثٌّ) فلانکەس هەواڵ بڵاوکەرەوەو نهێنی درکێنە ٥ المِنَثَّةُ: پارچە خورییەکە یان پارچە لۆکەیەکە چەوری دەکرێتە سەرو برینی پێ چەور دەکرێ ٥ النَّثاثُ: ڕۆنو چەوری برینی پێ چەور دەکرێ ٥ النَّثُّ: دەگوترێ: (شيئ نَثٌّ) شتێکە تەڕشوحی هەیە ٥ النَّثيثةُ: ئاوێك تەڕاییەك لەگۆزەو شتی وا دەرکەوێ.

نَثَجَ الشَّيْئُ نَثْجاً: شتەکە شل بۆوە، شی بۆوە ئەوەی لە گەدەی دابوو شل بۆوە و هاتەدەر ٥ نَثَجَ بَطْنَهُ: ورگی شەق کرد ٥ إِسْتَنْثَجَ الشَّيْئُ: شتەکە شل بۆوە ٥ نَثَرَتْ الدَّابَّةُ: وڵاخەکە پژمی.

نَثَرَ الشَّيْئَ نَثْراً ونِثاراً: شتەکەی بەپەرتەوازەیی هەڵدا ٥ دەگوترێ: (نثر الحَبَّ) ٥ (ونثرت الشجرة حملها) درەختەکە بەروبوومی خۆی بڵاو کردەوە.

نَثَرَ الكلامَ: قسەکەی بەپەخشان داڕشت ٥ نَثَرَت المرأة بَطْنها: ئافرەتەکە منداڵی زۆری بوون.

نَثَرَ السِّرَّ: نهێنییەکەی درکاند بڵاوی کردەوە ٥ أنْثَرَهُ، بەسەر لوتی دادا ٥ ناثَرَهُ: لەپەخشان دارشتن دا پێشبڕکێی کرد ٥ نَثَّرَهُ: بەمانا (نَثَرَهُ) دێ ٥ إِنْتَثَرَ: بڵاو بۆوە ٥ تَناثَرَ: بڵاو بۆوە ٥ تَنَثَّرَ: بلاو بۆوە ٥ إِسْتَنْثَرَ: ئاوی لەلوت وەرداو دوایی فمی کرد بۆ ئەوەی چی لە لوتی دا هەیە بێتە دەر ٥ المِنْثار: کەسێك هەواڵو نهێنی بڵاو بکاتەوە ٥ درەختێك بەرەکەی هەڵئەپێچێ بەناکامڵی بیوەرێنێ ٥ المُنْتَثِرُ: دەگوترێ: (رجل مُنَثَّرٌ) پیاوێکی بێ خێرو بێرە، لاوازو بێ کەڵکە ٥ المنثور: پەخشان، دەقێك شیعر نەبێ ٥ سەرەواشی نەبێ ٥ ناوە بۆ جۆرە گوڵێك لە پێڕی (الصلبية) بۆنێکی خۆشی هەیە لەوڵاتی میصر زۆرە ٥ النّاثِرُ: کەسێك بتوانێ پەخشانی ڕەوانو جوان بنوسێ ٥ النَّثارُ: ئەو نوقڵو چەرەساتو شتەیە لەناهەنگو بۆنە خۆشییەکان دا بڵاو دەکرێتەوە ٥ النُّثارُ والنُّثارَةُ: ئەو پارچە گوێچكو شتەی هەڵدەوەرێ ٥ النَّثْرُ: قسەو نوسینی ڕەوان: کە پەخشان بێ، شیعر نەبێو سەرواشی نەبێ، واتە ئەوەزنی هەبێ نە قافیە ٥ النَّثْرُ: ئەو شیرینیەو پارەو شتەیە لەناهەنگو بۆنە خۆشەکان دا دەبەخشرێتەوە ٥ النَّثِرُ: دەگوترێ: (رجل نَثِرٌ) پیاوێکە بڵاوکەرەوەی هەواڵو نهێنی، هەرگیز نهێنی لا نامێنێ ٥ یان پیاوێکی خۆگرو پشودرێژ نیەو زوو ورە بەردەدا ٥ النَّثْرَةُ: لوتو دەوروبەری، کۆمەڵە ئەستێرەیەکن وەکوو هێشوە ترێ (لەشێوەی سەرەتان، قرژاڵ دەچێ) هەشتەم قۆناغی مانگە ٥ النَّثورُ: دەگوترێ:

(رجل نثورٌ) و (إمرأة نثور) واتە: پیاوی منداڵ زۆرو، ئافرەتی منداڵ زۆر ◊ **النَثيُّ**: بلاو بۆوە.

**نَثَطَ النباتُ**: ڕووەكەكە دەركەوتو زەوی قەڵاشتەوە لەكاتی سەردەرهێنانی لەزەوی ◊ **النَّـثْطُ**: ڕووەك ئەو كاتە چرۆزەیەو سەر لەزەوی دەردێنێ ◊ **أَنْثَعَ الدَمُ والقيءُ**: خوێنو ڕشاندنەوەكە بەشوێن یەك دا هاتنە دەر ◊ **أَنْثَـعَ فـلان**: فلانكەس هێڵنجوی هاتنێ خوێنی هێنایەوە.

**نَثَلَ ذو الحافر**: گیانلەبەرە سمدارەكە ڕیخی كرد، پیسایی دەردا.

**نَثَـلَ اللَحْـمَ في القِـدر**: گۆشتەكەی كوتكوت كردو حستیە ناو مەنجەڵەكەوە ◊ **أنْثَلَهُ**: بەمانا (نَثَلَه) دێ ◊ **إنْتَثَلَهُ**: بەمانا (نَثَلَهُ) دێ ◊ **تناثَـلَ القومُ الى فلان**: خەڵكەكە لای فلان كۆبۆوە ◊ لە هەموو لایەكەوە لێی كردبوونەوە ◊ **إسْـتَنْثَلَ الـشَّيْءَ**: بەمانا (نَثَلَهُ) دێ ◊ **النُثالَةُ**: شتی دەرهاتوو و جیاكراوە لەشتی تر ◊ **النُّثْلَةُ**: چاڵایی نێوان جووت سمێڵ ◊ **النَّثيلَةُ**: بەمانا (النُثالَةُ) دێ ◊ پاشماوەی بەزو پیو ◊ گۆشتی قەڵەو.

**نَثا الحديثَ نثواً**: قسەكەی بلاوكردەوە.

**نَثا فلاناً**: غەیبەتی فلانكەسی كرد ◊ **ناثاه الحديثَ والخبرَ**: هەواڵو قسەو باسەكەیان وەبیر یەكتر هێنایەوە ◊ **تناثوا الأشياء**: شتەكانیان یاد كردەوە ◊ **تناثوا الأخبار والأحاديث**: هەواڵو قسەو باسەكانیان بلاو كردەوە.

**نَجا الشَيْءَ**: چاوی لەشتەكە بڕی ورد سەیری كرد بەچاو هەنگاوتی ◊ چاوەزاری لێ كرد ◊ **النَّجوء**: دەگوترێ: (هـو نجوء العين) چاوپیسە بەهەرشتێك هەڵگاڵێ دەیخەوتێنێ.

**نَجَبَ الشجرةَ نَجْباً**: توێكڵەكەی لەقەدی دارەكە كردەوە.

**نَجُبَ نَجابَةً**: عاقڵو زیرەكو لێهاتوو بوو، پیاوەتیو ڕەوشت بەرزی بەسەر هاوەڵاكانیدا هەبوو ◊ **أنْجَبَ**: منداڵی نەجیبی بوون ◊ دەگوترێ: (أنجبه والداه) باوكو دایكی بەنەجیبی بەوەلەدیان هێنا ◊ **أنْجَبَ من الشجرة فرعاً**: لقی دارەكەی لێ كردەوە ◊ **نَجَّبَ الشجرةَ**: توێكڵی قەدی درەختەكەی داماڵی ◊ **إنْتَجَبَ الشَّيْءَ**: شتەكەی هەڵبژارد ◊ **إسْتَنْجَبَ**: داوای شتی بەنرخو ڕەسەنو پەسەندی كرد ◊ شتی بەنرخی هەڵبژارد ◊ **المِنْجابُ**: دەگوترێ: (رجل أو إمرأة منجاب) پیاوێكە یان ئافرەتێكە منداڵی نەجیبی دەبن ◊ كۆڵەوەژی ئاگر تێكوەردان ◊ تیری دادراو و تیژ بەبێ پەڕو سەرەتیر ◊ **النَّجابَةُ**: زیرەكیو لێهاتویی بالادەستی بەسەر بەرامبەردا لەڕەوشتو ئاكاردا ◊ **النَّجَبُ**: توێكڵی قەدی دار ◊ **النَجيبُ**: ئەوەی ڕێزی بەسەر هاو وێنەی خۆی دا هەبێو خاوەنی ڕەوشتی بەرزو ئاكاری پەسەند بێ ◊ **النَّجيبَةُ**: مێینەی (النجيب) ◊ **نجائب الإبل**: حوشتری باشو ڕەسەن ◊ **نجائب الأشياء**: هەڵبژاردەی شتو پوختەو كاكڵەی شت.

**نَجَثَ عنه نَجْثاً**: لێی كۆڵییەوە باسو خواسی تێدا كرد.

**نَجَثَ الشَّيْءَ**: شتەكەی دەرهێنا ◊ **إنْتَجَثَ الشَّيْءَ**: بەمانا (نَجَثَهُ) دێ ◊ **تناجَثَ القومُ**: خەڵكەكە لێكۆڵینەوەیان ئەنجام دا، هەواڵەكانیان بلاو كردنەوە ◊ **تَنَجَّثَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نجث) دا دێ ◊ **النَّجْثُ**: زرێ ◊ پەردەی دڵ ◊ **النَّجاثُ**: كەسێك بەشوێن هەواڵ دا بگەڕێ بۆئەوەی

بلاوى بكاتەوە ٥ النَجِيثُ: دەگوترێ: (بدا نجيث القوم) كارە شاراوەكانى خەڵكەكە دەركەوت ٥ هەروا دەگوترێ: (أمر له نجيث) كارێكە سەرەنجامى خراپى هەيە ٥ ئامانج و مەبەست ٥ النَّجِيثَةُ: شتێك لێى بكۆڵدرێتەوەو پەردەى لەسەر هەڵماڵدرێ ٥ هەواڵى ناشيرين كە ڕون دەبێتەوە چيەو چى نيە.

**نَجَحَ** فلان نَجْحاً ونَجاحاً: فلانكەس سەركەوت، دەرچوو، بەمراز گەيشت ٥ بەمەبەستى خۆى شاد بوو.

**نَجَحَ الأمْرُ**: كارەكە ئاسان بوو، بەرەو تەواوبوون دەڕوا ٥ أنْجَحَ: بوو بە براوەو سەركەوتوو ٥ أنجحت الحاجَةُ: كارەكە ئەنجام درا، جێبەجێ بوو ٥ أنجَحَ الله طَلِبَتَهُ: خودا گەياندیە ئامانجى خۆى.

تناجحت الأمور: ئەنجامدانى كارەكان بەشوێن يەكدا هاتن ٥ تَنَجَّحَ الحاجة: كارەكەى ئەنجام دا، كارەكەى سەرخست ٥ إسْتَنْجَحَهُ الحاجة: داواى كرد نيشەكەى جێبەجێ بكرێ ٥ النَّجاحُ: سەركەوتن ٥ ڕزگاربوون، تەواوكردن ٥ بەمراز گەيشتن ٥ النُّجْحُ: بەمانا (النجاح) دێ ٥ النَّجِيحُ: دەگوترێ: (رأي نجيح) ڕاو بۆچوونێكى ڕاست و دروستە ٥ (رجل نجيح) پياوێكى صابيرو پشو درێژە.

**نَجَخَ** نَجْخاً و نَجِيخاً: پەشۆكاو و چەواشەبوو.

**نَجَخَ المَوجُ**: شەپۆلەكە بەرز بۆوە تێكيانەوە هاويشت.

**نَجَخَ السَّيلُ**: لافاوەكە بەهێزبوو هەموو شتێكى ڕادا.

**نَجَخَ فلان**: فلانكەس دەنگى گرببوو بەهۆى كۆكەوە هەڵامەتەوە.

**نَجَخَ الحيوانُ**: حەيوانەكە پژمى ٥ تَناجَخَ السَّيلُ: لافاوەكە هەڵساو كەوتە كڵەو و شت ڕادان و ڕاپێچكردنى هەرچى هاتە بەرى ٥ النّاجِخُ: دەگوترێ: (سيل ناجخ) لافاوێكى بەهێزو شت ڕادەرە ٥ زەوى دەدڕێ و قەبرغەى تێ دەخا ٥ دەنگى ئاو لەكەنارى ڕوبارو دەريا ٥ الناجِخَة: دەنگى تێكەوە هاويشتنى ئاو لەقەراغ دەريا ٥ النُّجاخ: دەنگى كەسێك قورگى هەوى كردبێ گرپى لەدەنگى دا پەيدا بوو ٥ النَّجِخُ من الحيوان: ئاژەڵێك تووشى پژمين بووبێ ٥ النَّجْخَةُ: شەپۆل هاويشتنى دەريايە بۆ قەراغ ٥ كڵەو فرێدان و هاتنە جونبوش ٥ النَّجوخُ: دەگوترێ: (بحر نجوخ) دەريايەكى پشێو و پڕ شەپۆل و جونبوشە.

**نَجَدَ الشَّيْءُ** نُجوداً: شتەكە بەرز بۆوە.

**نَجَدَ الأمرُ**: كارەكە ئاشكرا بوو دەركەوت.

**نَجَدَ الطريقُ**: ڕێگاكە ڕون بۆوە دەزاندرێ بەرەو كوێ دەڕوا.

**نَجَدَ فلاناً** نَجْداً: يارمەتى فلانكەسىداو هاوكاريى كرد.

**نَجَدَ العَدُوَّ**: بەسەر دوژمن دا زاڵ بوو.

**نَجَدَ الأمْرُ فلاناً**: كارەكە فلانكەسى نارەحەت كرد ٥ أنْجَدَ العَرَقُ نَجْداً: عارەق لەجەستەى ڕەوان بوو ٥ أنْجَدَ الرجلُ: پياوەكە: بەهۆى ئيشكردنەوە يان خەفەت و شەرمكردنەوە عارەقى كرد.

**نَجُدَ** نَجدةً ونَجادةً: ئازا بوو (فهو نَجِدٌ ونَجِيد).

**نَجُدَ الأمرُ** نُجوداً: كارەكە ئاشكرا بوو دەركەوت ٥ (فهو ناجد ونَجِد) ٥ أنْجَدَ: بەرز بۆوە ٥ هاتە هەرێمى نەجد، چووە وڵاتى نەجد كەبەشێكە

له حكومەتی (سعودیة) ◊ أَنْجَدَ فلاناً: یارمەتی فلاّنكەسی دا كۆمەكی پێ كرد ◊ أَنْجَدَ الدَّعْوَةَ: جوابی بانگەوازییەكەی دایەوە ◊ ناجَدَهُ: یارمەتی دا هاوكاریی كرد ◊ بۆی هاتە مەیدانو بەرامبەری وەسا بۆ شەڕ ◊ نَجَّدَ البیتَ: ماڵەكەی ڕازاندەوە بە پەردەو ڕاخەرو شتی وا ◊ نَجَّدَ الوسائدَ ونحوها: بالیفو سەرینەكانی دوورین ◊ دەشگوترێ: (نَجَّدَهُ الدهرُ) ڕۆژگار لەبۆتەی داو فێری زۆر شتی كرد ◊ تَنَجَّدَ الشَّیْئُ: شتەكە بەرز بۆوە ◊ إِسْتَنْجَدَ: دوای زەعیف بوونو لاوازیی بەهێز بۆوە ◊ دەگوترێ: (كان جباناً فاستنجد) ترسنۆك بوو دوایی ئازاو چاونەترس بوو ◊ (إِسْتَنْجَدَ علی فلان) سامی لەكابرا شكاو بەگژیدا چۆوە دوا ئەوەی لەوە پێش لێی دەترسا ◊ إِسْتَنْجَدَ فلاناً: داوای كۆمەكیو یارمەتی لەفلاّن كرد ◊ المُناجِدُ: یارمەتی دەر، پاڵپشت ◊ جەنگاوەر ◊ المِنجادُ: دەگوترێ: (رجل مِنجاد) پیاوێكە زۆر بەهانای لێقەوماوەوە دەچێ زوو فریای دەكەوێ ◊ زۆر دێتە ولاّتی نەجد، زۆر هاموشۆی هەرێمی نەجد دەكا.

المُنَجِّدُ: كەسێك ناوماڵ بەڕاخەرو پەردەو شتی وا بڕازێنێتەوە، بالیفو پشتیو شتی وا بدورێو ڕێكیان بخا ◊ المِنْجَدَةُ: دارێكە هەلاج بەكاری دەهێنێ بۆ شیكردنەوەی خوریو لۆكە ◊ المنجود: كارەسات بەسەر هاتوو، بەلاّ تووش هاتوو ◊ النّاجودُ: شەراب ◊ قاپێكە شەرابی تێدا دەپاڵێوێ ◊ زەعفەران ◊ خوێن ◊ النِّجادُ: حەمایەڵی شمشێر ◊ (قایشی شمشێر) ◊ دەگوترێ: (هو طویل النجاد) قایشی شمشێرەكەی درێژە واتە: كابرا بۆخۆی بالاّبەرزە ◊ المُنَجِّدُ: پیشەی خوریو لۆكە شیكردنەوە ◊ یاسایەكە بۆ گەنجو تازە پێگەیشتوان كۆیان دەكاتەوەو ڕایان دێنێو بێ ئیشیان ناهێڵێ ◊ النَّجادُ: بەمانا (المُنَجِّدُ) دێ ◊ النَّجْدُ: بانو، زەوی بەرزەوە بوو وەكوو (بانووی مەقانی نێوان شاری كەركوك و چەمچەماڵ) كالای ناوماڵ.

نَجْدُ: بەشێكە لەنیوە دوورگەی عەرەبی، كەوتۆتە نێوان ولاّتی حیجازو عێراقەوە ◊ شاعیرە عەرەبەكان زۆریان پێدا هەڵداوەو ئامازەیان بەپاكو خاوێنی ئاو و هەوای كردووە.

النَّجَدُ: عارەق ◊ هەر كالاّیەك ناوماڵی پێ بڕازێندرێتەوە ◊ النَّجُدُ: دەگوترێ: (رجل نَجُدٌ) پیاوێكی ئیش لەدەست هاتووە كاری وا ئەنجام دەدا بەكەسانی دی ناكرێ ◊ النَّجْدَةُ: ئازایەتی لەشەڕ دا ◊ (شرطة النجدة) بەشێكی هێزی پۆلیسە كەرەستەی بێتەلو ئوتۆمبێلو پێداویستی فریاكەوتنیان هەیە بەزوترین كات بەهانای لێقەوماو و تین بۆ هاتوانەوە دەچن ◊ چورتەو كارەساتو ترسو بیم ◊ النَّجُودُ: دەگوترێ: (إمرأة نَجود) ئافرەتێكی عاقڵو خانو مانە ◊ النَّجید: شێر ◊ پیاوی ئازاو چاو نەترسو ئیش لەدەست هاتوو كاری وادەكا بەكەسانی دیكە ئەنجام نادرێ ◊ غەمبارو كۆست كەوتوو. ◊ نَجَدَهُ نَجْداً: بەددان گەستی، گرتی، قەپی پێدا گرد ◊ زۆر ویرە ویری بەسەردا كرد ◊ نُجِّذَهُ: بەمانا (نَجَذَهُ) دێ ◊ دەشگوترێ: (نَجَّذَتهُ التجارب) ئەزموونو ڕوداوەكانی ڕۆژگار لە بۆتەیان داوە ◊ (تناجَذَ القومُ علی كذا) خەڵكەكە لەسەر ئەوە كۆبوونەوە. ◊ الأَنجُذانُ: ڕوەكێكی پزیشكییە لەپێری (الخیمیات)ە صمغێكی لێ دەردەهێندرێ، پێی دەگوترێ: (الحِلتیت) ◊ المُنَجَّذُ: دەگوترێ: (رجل منجَّذ) پیاوێكی خاوەن ئەزموونو قاڵبو و

لــه بۆتــەدراوە ◊ النّاجِــذ: ددان، کاکیلــە ◊ دەگوترێ: (ضَحِكَ حتى بدت نواجِذه) قاقا پێکەنی تا هەموو ددانی دەرکەوتن ◊ (عضّ على ناجِذه) دانی بەخۆیاگرت و لەبەردەم کێشەو تەنگژەکان دا پشوو درێژ و بەصەبر بوو ◊ النَّجذُ: قسەی ڕەق.

**نَجَرَ فلان:** فلانکەس هەلاشی تەختەی بۆ خانوەکە کرد.

**نَجَرَ اليومُ:** ڕۆژە کە زۆر گەرم بوو.

**نَجَرَ الخشبَ:** دارەکەی تاشی و تەختی کرد.

**نَجَرَ الماءَ:** ئاوەکەی بەبەردی سورەوەبوو گەرم کرد.

**نَجَرَ نَجْراً:** بەهۆی زۆر خواردنەوە تینوی بوو ◊ أنْجَرَ: کەوتە مانگە گەرمەکانەوە ◊ أنْجَرَ فلاناً: ئاوی گەرمی پێشکەشی فلانکەس کرد بۆ خواردنەوە ◊ نَجَّرَ الكلامَ: قسەکەی ئاراستە کرد ◊ الأنْجَرُ: بڕوانە مادەی (أنجر) لە پیتی هەمزەدا ◊ المَنْجَرُ: دارتاشخانە ◊ شوێنی دارتاشی ◊ المِنْجَرُ: ئامێرێکە داری پێ لە ڕنە دەدرێ ◊ ڕەندەی دارتاشی ◊ لێخوڕینی جەڵەبە حوشتر بەخێرایی ◊ المِنْجَرَةُ: بەردی سورکراوە کە ئاوی پێ گەرم بکرێ ◊ المَنْجورُ: خولخلۆکەیەکی گەورەیە ئاوی پێ دەردەهێندرێ لەبیر ◊ چەرخ و فەلەك ◊ النَّاجِرُ: ئەو مانگانەی هەوایان تێدا گەرمە ◊ مانگەکانی جەنگەی گەرما ◊ النِّجارُ: بن و بنیچە ◊ النُّجارَةُ: ئەو توێکڵ و وردە دارانەی لەمەکینەو ڕەندەی دارتاش دەکەوێتە خوار ◊ النِّجارةُ: پیشەی دارتاشی ◊ النَّجّارُ: دارتاش ◊ النجرانُ: گرێژەنەی دەرگا ◊ ئەو دوندە خڕەی دەرگای لەسەر دەسوڕێتەوە ◊ تینو ◊ النَّجْرُ: وردەی داری تاشراو ◊ بنیچە ◊ گەرما ◊ النَّجَرُ: تینوایەتی زۆر بەهۆی زۆر خواردنەوە یان بەهۆی خواردنی ئاوکێشەوە، ئەم جۆرە تینوایەتیە توشی ئادەمیزادو گیانلەبەری تریش دەبێ ◊ النَّجِيرةُ: هەلاشە تەختە؛ سەقفی ماڵ بەتەختە دار ◊ ئاوی گەرمکراو بەبەردی سورەوەبوو ◊ جۆرە خواردنێکە لەشیرو ئاردو ڕۆن و دروست دەکرێ.

**نَجَزَ الشَّيْءُ نَجْزاً:** شتەکەی تەواو بوو ئەنجام درا.

**نَجَزَ الشَّيْءَ:** شتەکەی تەواو کردو ئەنجامی دا.

**نَجِزَ الشَّيْءُ نَجَزاً:** شتەکە هاتە دی و ئەنجام درا ◊ نَجِزَ الكلامُ: قسەکە بڕا ◊ أنْجَزَ الشَّيْءَ: شتەکەی ئەنجام دا ◊ أنْجَزَ القتيلَ: زەبری کوشندەی ئاراستە کردو زوو گیانی دەرچوواند ◊ ناجَزَهُ الشَّيْءَ: پەلەی لە شتەکەدا کردو خێرا ئەنجامی دا ◊ ناجَزَهُ الحربَ: شەڕی لەگەڵدا کردو دژی وەستا ◊ نَجَّزَ الشَّيْءَ: بۆ زەێدەڕۆیی لەمانای (أنجزه) دێ ◊ تناجَزَ القومُ: خەڵکەکە شەڕیان بوو بەگژ یەکدا چون و خوێنی یەکتریان ڕشت ◊ تَنَجَّزَ الشَّيْءَ: هەوڵی ئەنجامدانی شتەکەی دا ◊ تَنَجَّزَ الشرابَ: زێدەڕۆیی کرد لە خواردنەوەی شەرابەکەدا ◊ إسْتَنْجَزَ الشَّيْءَ: بەمانا (تَنَجَّزَهُ) دێ ◊ الناجِزُ: حازر بەدەست و خێرا ◊ (لا يباع غائب بناجز) قەرز بەحازر نافرۆشرێ ◊ (وعد ناجز) بەڵێنێکە هاتۆتە دی ◊ النُّجْزُ: بەمانا (النَّجْزُ) دێ ◊ النَّجِيزُ: دەگوترێ: (وعد نَجِيز) وادەیەکە جێبەجێ کراوە ◊ النَّجِيزَةُ: پاداش ◊ دەگوترێ: (لأُنْجِزَنَّكَ نَجِيزتك) بەڵێن بێ چاکەو پاداشی چاکەکردنەکەت بدەمەوە.

**نَجِسَ الشَّيْءُ نَجَساً:** شتەکە پیس بوو، یان هەر خۆی پیسە ◊ دەگوترێ: (نَجِسَ الثوب) قوماشەکە پیس بوو (نَجِسَ فلان) فلانکەس

بەدڕەوشتو بەد ڕەفتار بوو ٥ نَجُسَ نَجاسَةً: بەمانا (نَجِسَ) دێ ٥ أَنْجَسَهُ: پیسی کرد، قێزەونی کرد ٥ نَجَّسَهُ: بەمانا (أنجسه) دێ ٥ یان پاکی کردەوەو پیسایی پێوە نەهێشت ٥ دەشگوترێ: (نَجَّسَ الصَّبِيَّ) نوشتەو دووعای بە منداڵەکەوە هەڵواسی بۆئەوەی چاوەزارو جندۆکە کاری لێ نەکەن ٥ تَنَجَّسَ الشَّيْئُ: شتەکە پیس بوو، پیسی پێوە نووسا، پیسی تێکەڵاو بوو ٥ تَنَجَّسَ فلان: فلاّنکەس خۆی لە پیسیو شوێنی پیس پاراست ٥ النَّاجِسُ: پیسایی، پیس ٥ دەگوترێ: (داء ناجس) دەردێکی پیسەو دەرمانی نیە ٥ النَّجاسَةُ: پیسی ٥ بەزاراوەی شەرع ئەندازەیەك پیسیە دەبێتە هۆکاری نادروست بوونی نوێژ ٥ النَّجَسُ: بەمانا (النَّجاسة) دێ ٥ دەگوترێ: (فلان نَجَسٌ) فلاّنکەس دڵ پیسو تاوانکارو بەدڕەوشتە ٥ النَّجِسُ: دەگوترێ: (فلان نَجِسُ السراويل) فلاّنکەس شرواڵ پیسە ٥ (داء نَجِسٌ) دەردێکی پیسە دەرمانی نیە ٥ النَّجِيسُ: بۆ موبالەغە لەمانای (النَّجِسُ) دێ.

**نَجَشَ الشَّيْئَ الخبيئَ نَجْشاً**:شتە شاراوەکەی وروژاندو دەری هێنا.

**نَجَشَ الحديث**:قسەکەی بڵاو کردەوە.

**نَجَشَ الدَّابَّةَ**:وڵاخەکەی دنەدنە دا بۆئەوەی بێتە دەر یان تێوەی ژەنیو دنەدنەی دا بۆئەوەی هەموو هێزی خۆی بەکاربێنێ بۆ خێرا ڕۆیشتن.

**نَجَشَ فلان في البيع ونحوه**:فلاّنکەس لەنرخی کاڵاکەی زیاد کردو زەمو زەمکاریی ئەنجام دا ٥ لە موزایەدەکردندا نرخی زیادی کرد.

**نَجَشَ النار**:ئاگرەکەی هەڵگیرساند ٥ تناجش القوم في البيع ونحوه: خەڵکەکە بەنەزانی یان بۆ مەبەستو چاو بەستەکێی کەسانی دیکە نرخی کاڵاکانیان بەرزکردەوە ٥ إِسْتَنْجَشَ الشَّيْئَ: بەمانا (نَجَشَهُ) دێ ٥ المِنْجاشُ: ڕەخنەگرو عەیب دۆزەرەوە لەشت ٥ سیرمەیەکە دەیخەنە نێوان دوو پێستەوەو پێکیانەوە دەدروێ ٥ المِنْجَشُ: بەمانا (المِنجاشُ) دێ ٥ المَنْجوشُ: دەگوترێ: (قول منجوش) قسەیەکی درۆو هەڵبەستراوە ٥ النَّاجِشُ: ئەو کەسەیە نێچیر ڕادەپەڕێنێ یان هەڵی دەفڕێنێ بۆئەوەی بەنزێك ڕاوکەرەکەدا بڕۆنو فرسەتیان لێ بێنێ ٥ النَّجاشُ: تیلمە سیرمەیەکە دوو پێستی پێوە لێك دەدرون.

**النَّجاشِيُّ**:نازناوی پاشای حەبەشەیە ٥ النَّجّاشُ: دەگوترێ: (رجل نَجّاش) پیاوێکی بەتوانایە بۆ شیکردنەوەی شتە شاراوەکانو دەرخستنیان ٥ النَّجوش: بەمانا (المِنْجاش) دێ.

**نَجَعَ الشَّيْئُ نُجوعاً**:شتەکە سوود بەخش بوو کاریگەریەکەی دەرکەوت.

**نَجَعَ الكلأَ نَجعاً ونُجوعاً**:لەشوێنی شیاوی خۆی دا هەوڵی لەوەڕی دا.

**نَجَعَ المكانَ**:هاتە شوێنەکەو تێیدا نیشتەجێ بوو.

**نَجَعَ الصَّبِيَّ اللبنَ**:شیری دا بە منداڵەکەو بەو شیرە پەروەردەی کرد.

**نَجَعَ نَجْعاً**:بەدوی لەوەڕدا گەڕا بۆ ئاژەڵەکانی ٥ أَنْجَعَ الشَّيْئُ: بەمانا (نَجَعَ) دێ ٥ إِنْتَجَعَ القومُ: خەڵکەکە ڕۆیشتن گەڕان بەدو لەوەڕدا بۆ ئاژەڵەکانیان ٥ إِنْتَجَعَ فلاناً: چوو بۆلای فلاّنکەس بەمەبەستی ئەوەی شتێکی دەستبکەوێ لێی ٥ تَنَجَّعَ فلان بالدم: فلاّنکەس خوێناوی بوو ٥ إِسْتَنْجَعَ بالشيئ: سوودی لەشتەکە بینی ٥ إِسْتَنْجَعَ المكانَ أو الكلأَ: لە شوێنەکەدا نیشتەجێ بوو ٥ لەلەوەڕ گەڕا

لەشوێنی شیاوی خۆی دا ◊ **المَنْجَعُ**: شوێنێك لەوەڕو ئاوی هەبێو ئاژەڵدار بۆی بچێ ◊ دەشگوترێ: (فلان منجع الطالبين) فلانكەس جێگاو ئومێدی ئاتاجانەو پێداویستییەكانیان جێبەجێ دەكا ◊ **النّاجِعُ**: دەگوترێ: (طعام ناجع) خواردنێكە باش بەجەستە دەگەوێو بەئاسانی هەزم دەبێ ◊ (دواء ناجع) دەرمانێكی سودبەخشە، شیفاهێنە ◊ **النّجْعَةُ**: شوێنی نیشتەجێ بوونی خێڵ، هۆبەی خێڵ ◊ **النّجْعَةُ**: گەڕان بەدوا لەوەڕو ئاودا بۆئاژەڵ ◊ چوون بۆلای مرۆڤی سەخیو بەخشندە بەمەبەستی دەستكەوت ◊ دەوترێ: (هو نجعتي) ئەو جێگای هیوامە ◊ (هذه ليست بدار نجعة) ئەم ماڵو هۆبەیە بەكەڵكی ئەوە نایە بۆی بگوێزیەوە ◊ **النّجوع**: هەر خواردنو خواردنەوەیەك سود بەخش بێ ◊ **النَّجِيعُ**: بەمانا (النجوع) دێ ◊ هەروا ناوە بۆ خوێن لەناو جەستەدا ◊ خوێنی جەرگو دڵ.

**نَجَفَ الشَّيْءَ نَجْفاً**، شتەكەی هەڵكۆڵیو ناوەوەی پانو پۆڕ كرد.

**نَجَفَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بڕیەوە ◊ دەگوترێ: (نَجَفَ الشجرة).

**نَجَفَ العَنَزَ**: گوانی بزنەكەی بەست بۆئەوەی شیری وشك بكا ◊ **أَنْجَفَ الشاةَ**: شیر وشك كەری بەگوانی مەڕەكەوە هەڵواسی.

**نَجَّفَ**: بۆ موبالەغە لەمانای (نَجَفَ) دێ ◊ **نَجَّفَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بەرز كردەوە ◊ **نَجَّفَ لە مِن الشَّيْءِ**: لەشتەكە هەندێكی بۆ جیاكردەوە بۆی وەلانا ◊ **إِنْتَجَفَ الشَّيْءَ**: شتەكەی لەبێخ دەرهێنا ◊ دەگوترێ: (إِنْتَجَفَ ما في الضرع) دوا تنۆكی شیری ناو گوانەكەی دادۆشی ◊ هەروا دەگوترێ: (إِنْتَجَفَ الريحُ السحابة) ڕەشەبایەكە هەورەكەی بەتاڵ كرد ◊ **إِسْتَنْجَفَ الشَّيْءَ**: بەمانا (إِنْتَجفه) دێ ◊ **المِنْجافُ**: سوكانی كەشتی، سەوڵی كەشتی ئەوەی ڕوی كەشتیو بەلەمی پێ ئاراستە دەكرێ ◊ **المِنجوف**: دەگوترێ: (رجل منجوف) پیاوێكی ترسنۆكە ◊ **النَّجافُ**: شتێك بەرز بێتەوەو بەسەر شتی تردا بڕوانێ ◊ دەگوترێ: (نجاف الغار ونجاف الباب) ◊ هەروا ناوە بۆ ئەو شتەی لەسەر گوانی ئاژەڵ دەبەسترێ بۆئەوەی شیرەكە وشك بكا ◊ **النَّجَفُ**: تەپۆڵكەو بانو ◊ **النَّجَفَةُ**: شوێنێكی درێژەوەبووە لەناو شیودا بەوێنەی ڕاستە دیوار ئاوی سەرناكەوێ ◊ هەروا ناوە بۆ كۆمەڵێك گڵۆپی كارەبایی بەشێوەیەكی جوان لێكدراونو دیمەنیان جوانەو ڕوناكی باش پەخش دەكەن پێیان دەگوترێ: (سورەییا) بەناوی كۆمەڵە ئەستێرەی سورەییای ئاسمان ناونراون ◊ **النُّجْفَةُ**: كەمێك شت ◊ دەگوترێ: (أعطه نجفةً من اللبن) قومە شیرێكی بدەرێ ◊ **النَّجوفُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (النّاجِف) دێ ◊ **النَّجِيفُ**: بەمانا (النجوف) دێ ◊ تیرێك كە سەرەتیرەكەی درێژ بێ.

**نَجَلَ الحيوانُ نَجْلاً**: گیانلەبەرەكە بەخێرایی ڕۆیی، تیژ تێپەڕی ◊ **نَجَلَتِ الأرضُ**: زەوی سەوز بوو، ڕوەكی نەجیلی ڕواند.

**نَجَلَ الوَلَدَ**: منداڵەكەی كرد بە ئەوەو وەچەی خۆی.

**نَجَلَ الأرضَ للزراعة**: زەوییەكەی كێڵا بۆ كشتو كاڵ.

**نَجَلَ المرعى**: لەوەڕەكەی گردەوە كرد بەداس ◊ بەداسو ماراغان لەوەڕەكەی دوریەوە.

**نَجَلَ عَدُوَّهُ بالرمح**: بەرمب لەدوژمنەکەی دا، ڕمبی ئاراستەی دوژمنەکەی کرد ◊ دەشگوترێ: (فلان ینجل الناسَ) فلانکەس عەیبو ڕەخنە لەخەڵك دەگرێ.

**نَجَـــلَ الرجـــلَ**: شـەقێکی لەپیاوەکـە هەڵـدا خولاندیەوە، پەڕاندی.

**نَجِلَ نَجْلاً**: چاوی گەورە بوو جوان بوو ◊ چاو پیاڵە بوو ◊ **نَجِلَت الشَجَّةُ**: برینەکە گەورەو پان بوو قەوارە بوو ◊ **أنْجَلَ الـوادي**: دۆڵەکە ڕوەکی نەجیلی ڕواند ◊ **أنْجَـلَ الدّابَّةَ**: ڕوەکی نـەجیلی کردە لەوەڕی وڵاخەکە ◊ **إنْتَجَلَ فلان**: فلانکەس بـۆ ئافرەتەکـەی خزمـی پیـاوێکی هەڵبـژارد منـداڵی لێـی بـبن ◊ یـان فـەحلێکی ڕەســەنی هەڵبژارد بۆ چاککردنی ماینەکەی لێی ◊ **تناجَلَ القـوم**: خەڵکەکـە زاوزێیـان کـرد ◊ یـان کێـشەو نیزاعیـان لێ پەیـدا بـوو ◊ **إسْـتَنْجَلَ الـوادي**: دۆڵەکە ڕوەکی نەجیلی لێ پەیدا بوو ◊ **إسْتَنْجَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دەرهێنا ◊ **الإنجیل**: بڕوانـە ئـەم مادەیە لە پیتی (هەمزە)دا ◊ **المِنْجَلُ**: دەگوترێ: (رجـل مِنْجَـلُ) پیـاوێکی منـداڵ زۆرە ◊ سـنان مِنجل: سەرە ڕمبێکی وەهایە برین گەورە دەکا قەوارەی گەورە دەخاتە جەستەوە ◊ **هـو مِنْجَـلُ هذا الأمر**: ئەو پیاوی ئەم کارەیەو لێی دەزانێ ◊ هەروا وشـەی (مِنْجَـلُ) نـاوە بـۆ داسـی گیـادروون داسـی دروێنــە ◊ **المِنْجَلَـةُ**: ئـامێرێکی دوفاقـە لایەکی چەسپاوە لایەکی هاتوچۆی پێ دەکرێ وەکوو گیرە بەکاردێ بۆ گرتنی شت، کورد پێـی دەڵـێن: جـەڕەو مەنگەنـە ◊ **النَّجْـلُ**: منـداڵ ◊ دەشگوترێ: (هو کریم النَّجل) ئـەو وەجاخزادەو ڕەوشت بـەرزە ◊ ئـاوی نـاو زەلکاو ◊ چاڵاویی و زلکـاو ◊ **الـنَّجلاء**: دەگـوترێ: (طعنـة نجـلاء) زەبرێکـە برینەکـەی گەورەیـە ◊ (لیلـة نجـلاء) شـەوێکی درێـژە ◊ **النَّجیـل**: ڕوەکێکـە لـەپێڕی (النجیلیـة)یـە تەمـەن درێـژە ◊ گەڵاکـەی وەکوو گەڵای گەنم وایەو لەو کورتترە بەسـەر زەوی دا بڵاو دەبێتـەوە پەلـەکانی زۆر گرێ گرێیـاوییین گرێکانی لێـك نـزیکن لـەزەویو زارێـك دا زۆر دەڕوێ ئاوبـدرێ، بـە کـوردی پێـی دەگـوترێ: (فریزو).

**نَجَـمَ الـشَّيْءُ نَجْمـاً ونُجومـاً**: شـتەکە دەرکـەوتو هەڵات.

**نَجَمَ له رأي**: ڕاو بۆچوونێکی بۆ پەیدابوو ◊ (نَجَـمَ فیهم شاعر) شاعیرێکیان تێدا هەڵکەوت.

**نَجَمَ المالَ**: ماڵەکەی وەجبە وەجبە دایـەوە ◊ **أنْجَمَ الشَّيْءُ**: شتەکە دەرکەوت هـەڵات ◊ **أنجمت المطر**: بارانەکـە وەسـتایەوە ◊ **أنجمـت عنـه الحُمّـى**: لەرزوتاکەی لەکۆڵ بۆوە ◊ **نَجَّمَ فـلان**: فلانکـەس چاودێری ئەستێرەکانی کـرد بـەگوێرەی کـاتو شێوەی ڕۆیشتنیان و لافی ئـەوەی لێ دا کـە بـەو هۆیـەوە هـەواڵی نهێنـی داهاتوو دەزانـێ ◊ **نَجَّمَ الـشَّيْءَ**: شـتەکەی کـردە وەجبـە وەجبـە ◊ **نَجَّمَ علیـە الـدین**: قەرزەکـەی بـۆ کـرد بـە قیـستو وەجبـە ◊ **إنْـتَجَمَ**: وازی هێنـا ◊ کۆتـایی هـات ◊ دەگوترێ: (إنْتَجَمَ الشتاءَ) زستان کۆتـایی هـات ◊ **تَنَجَّمَ**: بەشوێن گیا بێ ڕەگو ڕیشاڵەکەدا ڕۆیی و عەرزی بۆ هەڵکەنـد ◊ چاودێری ئەستێرەکانی کـردو لەگـەڵیان دا شـەوبێدار بـوو ◊ **المَـنْجَمُ**: دەراوی لێ ڕزگاربوون کـەلێنی لێ قوتار بـوون ◊ ڕێبـازی لێ چـوونەدەرەوە ◊ مەعـدەنو کـان ◊ کانـەزێڕو زیـو و شـتی لـەو جـۆرە ◊ **المِـنْجَمُ**: هەرشتێك لەجەستەو قەبارەیەك دا هـەڵتۆقێ و بەرزبێتەوە ◊ هەرشتێك سینگی پێ داکوترێ،

وەکوو چەکوش ٥ المُنَجِّمُ: ئەستێرەناس؛ کەسێك چاودێری ئەستێرە بکا ٥ بەدیاردەی هاتوچۆی ئەســـتێرەکان ڕوداوە نهێنـــیو داهاتوەکـــانی سەرزەوی دیاریی بکاو لافی غـەیبزانی لێ بدا ٥ النَّجّامُ: بەمانا (المُنَجِّمُ) دێ ٥ النَّجْمُ: ئەستێرە، قـەبارەو جەستـەیی ئاسمـانی کـە ڕونـاکی پێـوە دیاربێو تـا ئەندازەیـەك شـوێنی لـەئاسمان دا دیـاری کرابێ، بـۆ نمونـە وەکـوو خـۆر ٥ کـراوە بەناو بـۆ کۆمەڵـە ئەستێرەی سورەییا ٥ کـاتی دیاریکراو بۆ دانەوەی قەرز یان ئەنجامدانی کار ٥ ڕوەکێك قەدو لاسکی نەبێ ٥ شتی بێ بناغـە ٥ دەگوترێ: (لیس هذا الأمر نَجْم) ئەم ئیشە بێ بنەمایە ٥ النَّجْمَـةُ: هـەر ڕوەکێـك قـەدو لاسـکی نـەبن ٥ بـەزۆری بـەڕوەکی نـەجیل دەگـوترێ ٥ النَّجـیم مـــن النبـــات: ڕوەك کەچـروزە دەکـاو یەکـەمجار سـەر دەردێنــێ ٥ نَجْنَجَـهُ: جولانـدی، وەری سـوڕاند هەڵـەو گێـری کـرد ٥ دەگـوترێ: (تَنَجْنَجَ في أمره) لەکاری خۆی دا سەری سوڕما ٥ چەواشە بوو نەیزانی چی بکاو چۆن بکا.

**نَجَهَ فلاناً نَجْهاً**:فلانکەسی بەناشیرین تـرین شـێوە گەڕاندەوە.

**نَجَأ منه نجاءً ونجاةً**:لەئەزیەتو گێژاوی ئەو ڕزگاری بوو

**نَجَا نجاءً**:پەلەی کرد.

**نَجَا الغُصْنَ**:لقە درەختەکەی بڕی.

**نَجَا الجلد عَنْ الجزور**:پێستی ئاژەڵـە سـەربڕاوەکانی کەوڵ کرد ٥ پێستەکەیانی دارنی.

**نَجَا فلاناً نجواً**:بەئەسپاییو بەسرتە قسەی لەگەڵ فـلان کـرد ٥ أنجی فـلان: فلانکـەس هاتـە سـەر تەپۆڵکە زەوییەك، هاتە سەر گردێك ٥ ئاوسکی خـۆی خـاڵی کـردەوە، تـرو تـسی کەنـدن ٥ أنجی فلانـاً: فلانکەسـی لـەو چـورتەو نارەحەتییـەی هـەبو ڕزگـاری کـرد ٥ نَجّـی الـشَّيْئَ: شـتەکە بەسەر گردو تەپۆڵکەکەوە بەجێ هێشت ٥ نَجّی فلانـاً: فلانکەسـی ڕزگـار کـرد ٥ نَجّـی أرضـه: زەوییەکـەی بـەرز کـردەوە لەترسـی ئـەوە نەوەکوو ئاو دایپۆشی ٥ ناجاه مناجاةً: بەسـرتەو لـەدڵی خۆیـا قـسەی لەگـەڵ کـرد ٥ دەشگوترێ: (بـات الهَـمُّ ینـاجیـه) خـەمو خەفـەت شانو ملی گـرتو شـەو بێـداری کـرد ٥ إنْتَجـی: لەسـەر تەپۆڵکەیەك دانیشت ٥ إنْتَجَی القـومُ: خەڵکەکـە هەنـدێکیان سرتە سـرتیان لەگـەڵ یـەك کـرد ٥ دەشـگوترێ: (الهمـوم تنجـی في صـدره) خـەمو خەفەت دێنە دڵیەوە سەرەتاتکە لـەدڵی دەکـەن سـرتە سـرتیانە لەگـەڵی دا ٥ إنْتَجـی فلانـاً: فلانکەسـی کـردە هـاوڕێی خـۆیو سرتەسـرتی لەگـەڵ دا کـرد ٥ تَنَجّـی: هـەوڵی دا تەپۆڵکـەو گردۆڵکەیـەکی دەسـت بکـەوێ ٥ إنْتَجَـی: خـۆی لەپەنا تەپۆڵکەیەك دا حەشاردا ٥ خۆی خزاندە پەنا تەپۆڵکەیەك بۆئەوەی خۆی خاڵی بکاتـەوە ٥ إسْتَنْجی المحدثُ: کابرای بێ دەستنوێژ بـەئاو یان بەشتی تر خۆی پاك کردەوە.

**إسْتَنْجی الرجلُ**:پیاوەکە هـەوڵی ڕزگاربوونی دا ٥ إسْتَنْجی مـن الـشَّيْئِ: لەشـتەکە ڕزگـاری بـوو ٥ إسْتَنْجی الشَّيْئَ: شتەکەی ڕزگار کـرد ٥ المَنْجی: شـوێنی ڕزگـار بـوون ٥ هـەر تەپۆڵکـەو گردێـك لەزەوی تەخت بەرز بووبێتەوە ٥ المَنْجاةُ: ڕزگار بـوون ٥ شـوێنی ڕزگـاربوون ٥ هۆکـاری ڕزگـار بوون ٥ الناجیة: حوشـتری خێـرا ڕۆ، خۆشـڕۆ ٥ النَّجـاءُ: سکچوون ٥ یـان نەخۆشـییەك ببێتـە هۆکـاری سکچوون ٥ النَّجـا: هەرشـتێك بڕابـێو فڕێ درابێ ٥ مێولاك ٥ پرژو پـاڵی درەخـت کـە لێکرابێتـــــەوەو فـــــڕێ درابـــــێ.

**نجا الذبيحة**:پێستو ڕیخۆڵەو شتی وای ئاژەڵی سەربڕاو.

**نجا الرجلَ**:پۆشاکی داکەندراو و فڕێدراوی پیاو ٥ **النَّجاةُ**: دەگوترێ: (ناقة نجاة) حوشترێکی خۆشڕۆیە ٥ تەپۆڵکە، گرد ٥ **النَّجاوةُ**: دەشتایی ٥ مەزرا ٥ مەودا ٥ **النَّجوةُ**: هەرشتێك لە ورگ بێتە دەرەوە لە ترو تسو پیسایی ٥ هەور بارانی خۆی باراندبێ‌و ڕۆیشتبێ ٥ **النَّجْوَةُ**: تەپۆڵکەو گردۆڵکە ٥ دەشگوترێ: (هو بنجوة من هذا الأمر) ئەو لەم کارە دوورە.

**النجوى**:سرتەو قسەکردنی بە ئەسپایی ٥ خەڵکانێك قسەی بەئەسپایی بکەن‌و کەس قسەکەیان نەبیستێ ٥ **النَّجِيُّ**: بانگکەرو قسە لەگەڵ کەر ٥ دەگوترێ: (هو نجي فلان) ٥ نهێنی پەنامەکی ٥ خۆشڕۆ، دەگوترێ: (بعير نجيٌّ) ٥ **النَّجِيَّةُ**: بانگکەر ٥ ئەوەی دەکەوێتە ناو دڵی ئادەمیزادەوە لەخەم‌و خەفەت‌و چورتم.

**نَحَبَ فلان نحباً**:فلانکەس فۆتۆی لەخۆ گرت.

**نَحَبَ في العمل**:لەکارەکەدا زۆری هەوڵ دا، کۆششی کرد.

**نَحَبَ عليه**:خۆی بەسەردا دا.

**نَحَبَ بكذا**:گرەوی کرد بەوە.

**نَحَبَ الباكي نحباً ونحيباً**:بەپرمەی گریانی دا، دەنگی گریانی لێ بەرز بۆوە.

**نَحَبَ الإنسان نحباً**:مرۆڤەکە هەلامەت‌و کۆکەی تووش بوو ٥ **نَحَّبَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَحَبَ) دا دێ ٥ **ناحَبَ فلاناً**: گرەوی لەگەڵ فلان کرد ٥ **ناحب الى فلان**: دادگایی کردنەکەی بردە لای فلان ٥ **إنْتَحَبَ الباكي**: خەفەتبارەکە لەپرمەی گریانی دا ٥ دەستی کرد بەگریان.

**تناحَبَ القومُ**: خەڵکەکە وادەیان بەیەکتری دا بۆ ئەنجامدانی کارێك‌و بۆ ماوەیەك ٥ **النُّحابُ**: کۆکە ٥ **النَّحْبُ**: فۆتۆو نەزر ٥ گریانی بەکوڵ‌و بەدەنگ ٥ ئەو شتەی گرەوی لەسەر دەکرێ‌و دەبێتە گرەو لەسەر کراو ٥ کاتی گرەو و ماوەکەی ٥ دەشگوترێ: (قضى فلان نحبه) فلانکەس مرد ٥ **النَّحْبَةُ**: پشك، قورعە.

**نَحَتَ نَحْتاً ونحيتاً**:نالاندی، نرکاندی.

**نَحَتَ الشَّيْئَ نَحتاً**:شتەکەی تاشی توێکڵی لێ کردەوە ٥ دەگوترێ: (نَحِتَ الحَجَرَ) بەردەکەی تاشی ٥ **نحته السَّفَرُ**: سەفەر کزو لاوازی کرد.

**نُحِتَ فلان على الكرم**:فلانکەس لەسەر سەخاوەتی دروست بووە، سەخاوەت تێکەڵاوی پێکهاتەی بووە.

**نَحَتَ الجبلَ**:کێوەکەی تاشی.

**نَحَتَ فلاناً**:یان (نحت عِرضه) عەیبی لێ گرت، غەیبەتی کرد.

**نَحَتَ فلاناً بالعصا**:بەگۆچان لەفلانکەسی دا.

**نَحَتَ الكلمة**:وشەکەی تاشی لەدوو وشە وەکوو (بَسمَلَ) واتە (بسم الله الرحمن الرحيم) (حَنَفَشَه) اته: حەنەفی‌و شافیعی. ٥ **إنْتَحَتَ الشَّيْئَ**:شتەکە داتاشرا ٥ دەگوترێ: (نَحَتَهُ فأنتحَتَ) ٥ **إنْتَحَتَ الشَّيْئَ**: بە تەشوێ‌و ڕەندەو شتی وا لەشتەکەی گرت لێی تاشی ٥ **المِنْحاتُ**: ئامێری تاشین وەکوو تەشوێ‌و ڕەندە ٥ **المَنْحَتُ**: ئەصڵ‌و بنەما ٥ دەگوترێ: (هو من مَنْحَتِ صدق) ئەو لە ئەصڵ‌و بنەمای ڕاستگۆیی پەیدا بووە ٥ **المِنْحَتُ**: بەمانا (المِنحاتُ) دێ. **النُحاتُ**:سروشت ٥ **النُّحاتَةُ**: ئەو توێکڵ‌و پرژو پاڵەی لەدار دەتاشرێ ٥ **النَّحْتُ**: تەبیعەت‌و سروشتی شت ٥ **النَّحيتُ**: تاشراو ٥

(جمل نخيت) حوشتری کزو لاواز ٥ (حافر نخيت) سمی ولاخ کەبەهۆی ڕۆیشتن بەشوێنی زبردا سوابێ ٥ شتی بێ نرخو هیچو پوچ لەهەر جۆرە شتێك بێ ٥ ناڵەو دادو فیغان ٥ **النَّحِيتَةُ**: سروشت ٥ کۆلەسە هەنگ؛ قەدی داری کلۆر بوو ناوەکەی بەئاگرو شتی تر لوس دەکرێو هەنگی تێدا بەخێو دەکرێ ٥ بەکوردی پێی دەگوترێ: (کۆلەس).

**نَحَّ نحيحاً**: ناڵاندی، نرکاندی ٥ **النَّحيحُ**: دەنگێکە لەناو بۆشایی جەستەی خۆی دووبارەی دەکاتەوە.٥ نحره نَحْراً: لەگەردنی دا، سەری بڕی.

**نَحَرَ العَمَلَ**: کارەکەی لەسەرەتادا جێبەجێ کرد، زوو ئەنجامی دا.

**نَحَرَ الشَّيْئَ**: ڕوی لەشتەکە کرد ٥ دەگوترێ: (داري تَنْحَرُ داره) خانوەکەم ڕوی لەخانوەکەیەتی ٥ (دارهم تنحر الطريق) خانوەکەیان ڕوی لە ڕێگەکەیە ٥ **ناحَرَهُ**: شەڕی لەگەڵ دا کرد ٥ **ناحَرَهُ على الأمر**: لەسەر کارەکە دەمەدەمێو کێشەی لەگەڵ نایەوە، بەرەوڕوی بۆوە ٥ **نَحَّر الإبلَ**: حوشترەکەی سەربڕی ٥ **إنْتَحَرَ الرجلُ**: پیاوەکە بەهۆیەك لە هۆیەکان خۆی کوشت ٥ **إنْتَحَرَ السحابُ**: هەورەکە بارانی هەڵڕشت ٥ **إنْتَحَرَ القومُ على الأمر**: خەڵکەکە لەسەر کارەکە سوور بوون ٥ **تناحَرَ القومُ في القتال**: خەڵکەکە شەڕی باشیان کرد ٥ **تناحَرَ القوم على الشَّيْئ**: خەڵکەکە لەسەر شتەکە سووربوون ٥ دەشگوترێ: (تَناحَرَتْ منازِلُ القوم) مەنزڵو بارەگای خەڵکەکە بەرامبەر بەیەك بوون ٥ **المِنْحارُ**: کەسێك زۆر ئاژەڵ سەر بڕێ.

**المَنْحَرُ**: شوێنی سەربڕینی ئاژەڵ ٥ قۆرتەمەی مل ٥ **الناحِرَةُ**: قۆرتەمەی مل، ئەو شوێنەی لە قورگ دا بەرزبۆتەوە ٥ دوو ئێسقانی کەوانەیی جومگە ناسان شەپیلکی شانو قەفەسی پێشەوە پێکەوە دەبەستنەوە ٥ **النَّحارُ**: بۆ موبالەغە لەمانای (الناحِر) دێ ٥ **النَّحْرُ**: لای ژوروی سنگ، خوار قوڵکەی گەردن ٥ دەشگوترێ: (جلس في نحر فلان) لەبەرامبەر فلان دا دانیشت.

**نَحْرُ الشهر**: سەرەتای مانگ ٥ (عيد النحر) جەژنی قوربان ٥ **النَّحرير**: زانای لێهاتو لەزانینی خۆی دا ٥ **النَّحور**: بۆ موبالەغە لەمانای (الناحر) دا دێ ٥ **النَّحِيُ**: سەربڕاو، کوژراو ٥ **النَّحِيرَةُ**: سەربڕاو.

**نَحَزَ الشَّيْئَ نَحزاً**: شتەکەی پاڵ پێوەنا، هەلینگی دا دەنەدەنەی دا ٥ دەگوترێ: (نَحَزَ الدَّابَّةَ) بەپاژنە پێی دەنەدەنەی ولاخەکەی دا ٥ لێی خوڕی ٥ ئاوزەنگی لە ولاخەکە دا ٥ شتەکەی وردوهاڕ کرد لەناو دەسکەوان دا کوتای.

**نَحَزَ في صدره**: مستەکۆڵەی لەسنگی دا.

**نَحِزَ نَحَزاً**: کۆکەی گرت.

**نَحُزَ الحيوانُ نَحَزاً**: گیانلەبەرەکە دەردێکی توشبوو زۆر بەتوندی دەکۆکێ ٥ **المِنْحازُ**: شتێکە وەکوو سندوڵو هاوەن شتی تێدا دەکوترێ ٥ **النُّحازُ**: نەخۆشییەکە تووشی گیانلەبەران دەبێ زۆر بەتوندی کۆکەیان لێ دەپڕژێ.٥ **النُّحازَةُ**: پارچە گۆشت ٥ **النَّحيزَةُ**: لێدراو ٥ باریکایی زوور سمی ولاخ، واتە: زەنگی دەستی ٥ هەروا ناوە بۆ کەمەر بەندو قایش پشتێن ٥ بەعادەت لەسەر جزداشەو شتی وا دەبەسترێ ٥ دەماری زەوی کەتوندو پتەو بێ ٥ سروشتو تەبیعەت ٥

**نَحَسَهُ نَحْساً**: ماندوی کردو زیانی پێ گەیاند ٥ دەشگوترێ: (نَحَسَتْهُ الدَّابَّةُ، ونَحَسَهُ الجَدْبُ).

**نُحِسَ**: بەدو شوم توشی هات، نەگبەتی گرتی.

**نَحِسَ**: شوم بوو.

**نَحُسَ**: شوم بوو نەگبەتی گرتی ٥ **أنْحَسَتِ النارُ**: ئاگرەکە دووکەڵی زۆر بوو ٥ **نَحَّسَ الأخبارَ**: لە هەواڵەکەی کۆڵیەوە ٥ **إنْتَحَسَ**: تێشکاو توشی نەگبەتی بوو ٥ **تناحَسَ**: تێشکا ٥ **تَنَحَّسَ**: برسی بوو، خۆی برسی کرد ٥ دەگوترێ: (تَنَحَّسَ لشُرْبِ الدواءِ) خۆی برسی کرد بۆئەوەی دەرمان بخواتەوەو کاریگەر بێ ٥ **تَنَحَّسَ الأخبارَ وعنه**: بەدوادا چوونی بۆ هەواڵەکە کردو لەهەواڵەکەی کۆڵیەوە ٥ **إسْتَنْحَسَ الأخبارَ**: بەدوادا چوونی بۆ هەواڵەکە کرد ٥ **المَنْحَسُ**: ئەوەی دەبێتە هۆکاری پەیدابوونی شومو نەگبەتی ٥ **المُنَحَّسُ**: غەمبارو خەفۆك ٥ **النُّحاسُ**: مس: عونصورێکی فلزییە بە زۆری ڕەنگی سوورە ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو وردەو پارچانەی لەئاسن دەبێتەوە لەکاتی کوتانی دا ٥ دوکەڵی بێ بڵێسە ئاگر ٥ **النَّحاسُ**: مسگەر، مس فرۆش ٥ **النَّحاسَةُ**: پیشەی مسگەریی ٥ **النَحْسُ**: ماندوو بوونو زیان پێگەیشتن ٥ دەگوترێ: (أمر نَحْسٌ) کارێکی چەواشەو ناخۆشە ٥ (یوم نَحْسٌ) ڕۆژی ناخۆشو پڕ بەڵاو کارەسات ٥ کەخێرو خۆشی تێدا نەبێ ٥ **النحیسُ**: دەگوترێ: (عام نَحِیس) ساڵی گرانیو قاتو قڕی ٥ **نَحُصَتِ الأتانُ**: دێڵەکەرەکە ئەوەندە قەڵەو بوو ئاوس نابێ ٥ یان باری لێ نانرێ.

**نَحَضَ لَحْمُهُ نَحْضاً**: گۆشتەکەی کەمی کرد.

**نَحَضَ فلان**: فلانکەس کز بوو.

**نَحَضَ الشَّیْءَ**: توێکڵی لەشتەکە داماڵی؛ سپی کرد.

**نَحَضَ فلاناً**: پێکێشی لەفلان کردو زۆری داوا لێ کرد.

**نَحَضَ السِّنانَ**: نووکی شمشێرەکەی تیژو باریك کرد.

**نَحَضَهُ الدَّهْرُ**: ڕۆژگار زیانی پێ گەیاند.

**نَحُضَ نَحاضَةً**: قەڵەو بوو، گۆشتی گرت ٥ **ناحَضَهُ**: پێکێشی لێ کرد ٥ **إنْتَحَضَ الشَّیْءَ**: بەمانا (نَحَضَهُ) دێ ٥ **النَّحْضُ**: گۆشتی کۆبۆوەو سواری یەکبوو ٥ **النَّحْضَةُ**: پارچەگۆشتی گەورە.

**نَحَطَ نَحْطاً**: لرفەو گفەی کرد لەبەر ماندووبوون یان بەهۆی ڕق هەڵسان دەنگی گریان لەسنگی دا دەنگی دایەوە.

**نَحَطَ العامِلُ**: کرێکارەکە جەختی لەخۆی کرد بۆئەوەی ئیش زیاتر بکا.

**نَحَطَ السَّائِلَ**: سوالکەرەکەی دەرکرد.

**نُحِطَ الفرسُ**: ئەسپەکە توشی نەخۆشی سی بوو پێی تۆپی ٥ **النَّحْطَةُ**: نەخۆشییەکە توشی سیو جگەری وڵاخبەرزەو حوشتر دەبێ کەم وا هەیە چاك بێتەوە ٥ **النَّحِیطُ**: نرکە ناڵاندن، کوڵی گریان کەلەناخ دابێو بچێو دەرنەبڕدرێ.

**نَحُفَ نَحافَةً**: کزو لاواز بوو بەسروشت گۆشتن نەبوو ڕەقەڵەو داڵگۆشت بوو ٥ **نَحِفَ نَحَفاً**: ڕەقەڵەو داڵگۆشت بوو ٥ **أنْحَفَهُ المرضُ أو الهمُّ**: خەمو خەفەت بێ هێزو لاوازی کرد ٥ **النَّحِیفُ**: کزو لاواز ٥ دەگوترێ: (نَحِیفُ الدینِ) و (نَحِیفُ الأمانةِ) ئایین لاواز، ئەمانەت نەپارێز.

**نَحَلَ نُحولاً**: باریك بوو، لاواز بوو ٥ دەگوترێ: (نَحَلَ جسمه) (فهو ناحِلٌ ونَحِیلٌ).

**نَحَلَ فلاناً نَحْلاً**: شتێکی بەدیاریی دا بەفلانکەس.

**نَحَلَ المرأةَ**: مارەیی دا بەژنەکە.

**نَحَلَ فلاناً القَولَ نَحلاً**:قسەکەی پاڵ فلان داو نەشی گوتبوو.

**نَحَلَ فلاناً المرضُ**:نەخۆشی فلانکەسی لاواز کرد ٥ **نُحِلَ نُحولاً**: بەمانا (نَحَلَ) دێ.٥ **نَحُلَ نُحولاً**: بەمانا (نَحَلَ) دێ ٥ **أنحَلَهُ المرضُ**: نەخۆشی لاوازی کرد ٥ **أنحَلَهُ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەدیاری پێدا ٥ **نَحّله شَيْئاً من مالـه**: شتێکی لەماڵو سامانی خۆی پێدا ٥ **إنتَحَلَ الشَّيْءَ**: لافی ئەوەی لێ دا ئەو شتە هی ئەوە، هی ئەویش نەبوو درۆی کرد ٥ **إنتَحَلَ مذهب كذا**: خۆی پاڵ فلان رێبازو مەزهەب داو پابەندی رێنماییەکانی بوو ٥ **تَنَحَّلَ الشَّيْءَ**: لافی هەبوونی ئەو شتەی لە خۆی دا لێدا ٥ **النَّحّال**: هەنگ بەخێوکەر (هەنگدار) ٥ **النِّحالَةُ**: پیشەی هەنگداری ٥ کەسێك هەنگ بەخێو بکا بەمەبەستی سودوەرگرتن لەهەنگوینو مێوەکەی ٥ **النُّحْلُ**: بەخششو عەتا ٥ مێشەهەنگ.٥ **النِّحْلُ**: بەخشش ٥ شتی بەخۆڕایی بەخشراو ٥ **النُّحْلُ**: بەخشش ٥ **النِّحْلَةُ**: بەخشش ٥ فەرزو واجبو پێویست ٥ ئایینو بیروباوەڕ ٥ داوای بێ بناغە ٥ **النَّحيلُ**: کزو کۆڵەوار.٥ **نَحَمَ نَحماً**:کۆکی، ناڵاندی، نرکاندی.

**نَحَمَ السَّبُعُ**:درندەکە نەڕاندی، دەنگی بەهێزی لێ هات ٥ **النَّحامُ**: باڵندەیەکە لەشێوەی قازو مراوی ٥ ملی درێژو قاچی درێژو دەندوکی کەوانەیی هەیە ٥ ئەوانەی جەستەیان گەورەیە ڕەنگیان وەردییە، بچوکەکانیان ڕەنگیان سپیو قەراخی باڵیان ڕەشە، لەقەراخ دەریاو شوێنی گەرم دەژی ٥ **النَّحّامُ**: بۆ موبالەغە لەمانای (الناحِم) دێ ٥ دەشگوترێ: (رجل نَحّام) پیاوێکە لەبەر کۆکە کۆك گوێی لەقسەی هاوڵەکەی نییە.

**نحن**:ئێمە ٥ **نَحْنَحَ**: نرکەنرکی کرد ٥ ناڵاندی ٥ کۆکەکۆکی بوو ٥ **تَنَحْنَحَ**: بەمانا (نَحْنَحَ) دێ ٥ **النَّحْنَحُ**: پیاوی بەخیلو ڕژد کە داوایان لێ کرد بۆ بەخشش کۆکە دێنێتە خۆی.

**نحا الى الشَّيْءِ نحواً**:مەیلی بۆلای شتەکە کرد.

**نحا الشَّيْءَ**:قەصدی شتەکەی کرد.

**نحا الشَّيْءَ عنه**:شتەکەی لێ دوورخستەوە.

**نحى اللبنَ نحياً**:ماستەکەی هەژاند ٥ **أنحى في سيره**: لە ڕۆیشتنی دا لایەکی ڕێگای گرت ٥ **أنحى عليه**: ڕوی تێکرد ٥ **أنحى لـه بالشيءِ**: شتەکەی بۆ ڕانواند ٥ **ناحاه**: هەریەك لەو دوانە بەرەو ڕوی یەك ڕۆیشتن ٥ **نَحّى عليه بالشيءِ**: شتەکەی بۆ ڕانواند ٥ **نَحّى الشَّيْءَ**: شتەکەی دوورخستەوە، لەشوێنی خۆی لای دا ٥ **إنتَحَى**: مەیلی لایەکی کرد ٥ **إنتَحَى لـه**: بۆی ڕانواند ٥ **إنتَحَى عليـه**: پشتی پێ بەست ٥ **إنتَحَى في الأمـر**: دڵسۆزی لەئیشەکەدا نەنجام دا، تینی دایە خۆیو هێزی تەواوی بەکارهێنا ٥ **إنتَحى الشَّيْءَ**: قەصدی شتەکەی کرد ٥ **تَنَحّى**: خۆی گۆشەگیر کرد، کەوتە فوژبنێکەوە ٥ لاچوو دوورکەوتەوە ٥ **تَنَحّى لـه**: قەصدی کردو پشتی پێ بەست ٥ **المَنحاةُ**: ڕێڕەوی ئاو کە فورتو پێچ بێ ٥ دەشگوترێ: (هو من أهل المنحا) ئەو کابرایە بێگانەیەو خزمی نزیك نییە ٥ **المُنحاةُ من القِسِيِّ**: تیری ئەستوورو گەورە ٥ ئەگەر بۆ حوشتر بوو مەبەست حوشتری دوگ زلە ٥ **النّاحي**: زاناو شارەزا لەزانستی نەحودا ٥ **الناحية**: دەفەرو لای شت ٥ دەگوترێ: (جلس ناحية الدار) لەلای خانوەکە دانیشتووە ٥ **النُّحَواءُ**: هەڵلەرزین، شەپلە ٥ خۆکێشانەوە، خۆ لێکێشانەوە ٥ **النَّحْـوُ**: قەصدو مەبەست ٥

دهگوترێ: (نَحَـوْتُ نَحْـوَهُ) ٥ ڕێگـا ٥ دهفـهرو جیهمت ٥ هاوشێوه ٥ ئهندازه ٥ جۆر ٥ هـهروا نـاوه بـۆ زانییاریـیـهك: كهحالـهتو چـۆنیـهتی ئـاخری وشـهی پـێ دهزانـدرێ لـهڕوی ئیعـرابو بینـاوه پێـی دهگـوترێ: (نـهحو) ٥ **النَّحْـوِيُّ**: نـهحوزان، شارهزا لهزانـستی نـهحودا ٥ **النَّحْيُّ**: هێزی ڕۆن ٥ جۆرێكه له خورمـای تـازه گـهییو ٥ تیرێكـه سـهرهتیرهكهی پـان بـێ ٥ **النَّحِيَّـةُ**: دهگوترێ: (هـو نَحِيَّـة الـشدائد) ئـهو هـهدهفـو ئامانجی بهڵاو كارهساته.

**نَخَبَ نَخْباً**: پالفتـهی شـتهكهی وهرگـرت ٥ كاكڵـهی شتهكهی برد.

**نَخَبَ الـصَّيدَ**: دڵـی نێـچیرهكهی دهرهێنـا ٥ **نَخَبَـت الحربُ فلاناً**: شهڕ فلانكهسـی ترسـنۆك كـردووهو لاوازو بێ هێزی كردووه.

**نَخِبَ قَلْبُـهُ نَخْبـاً**: ترسـنۆك بـوو ٥ **أَنْخَبَ**: منـداڵی ترسـنۆكی بـوون ٥ **إِنْتَخَبَـهُ**: هـهڵی بـژارد، پهسهندی كرد ٥ لهههڵبژاردن دا دهنگی پێـدا ٥ **الإِنْتِخابُ**: ههڵبژاردن ٥ یاساو ڕێسایهكه شێوهو كـاتو شـوێنی بهدهسـتور یـان بـه لائیحـهیـهكی قـانوونی دهسـت نیـشان دهكـرێ بـۆ مهبهسـتی ههڵبژاردنی نوێنهرانی گهل لهپهرلـهمان دا یـان بۆ ههڵبـژاردنی سـهرۆكی وڵات ٥ **المُنْتَخِبُ**: ئـهو كهسهی مـافی دهنگدانی ههیـهو هاوبهشـی ئـهو پرۆسـهیه دهكـا ٥ **المُنْتَخَـبُ**: ههڵبـژێراو: ئـهو كهسـهی لـه ههڵبـژاردن دا دهنگـی پـێ دهدرێ ٥ **المِنْخـابُ**: دهگـوترێ: (رجـل مِنْخـاب) پیـاوێكی هیچو پوچو بێ خێـره زهعیفـو وره ڕوخـاوه ٥ **المنخـوبُ**: كـزولاواز بـوو، لـهڕ بـوو گۆشـت پێوهنـهماو ٥ **النّاخِـبُ**: بـهمانا (المُنْتَخِـبُ) دێ ٥ **النُّخَابُ**: پهردهیهكه بهدهوری دڵهوهیه ٥ **النُّخبُ**: دهگـوترێ: (رجـل نُخَـبٌ) پیـاوێكی ترسـنۆكه ٥ شـهربه نـاوی گـهوره ٥ قومـه شـهرابێك مـرۆڤ دهیخواتـــهوه بـــۆ تهندروســـتیو میانـــهی برادهرایـهتی ٥ **النُّخْبَـةُ**: كۆمـهڵێك ههڵبـژاردهبن لهههر جۆرو ڕهگهزێك بن ٥ دهگوترێ: (جـاء في نخبـة أصـحابه) ٥ **النُّخَبَـةُ**: ترسـنۆك ٥ **النَّخِيـبُ**: دهگـوترێ: (قلـب نَخِيـبٌ) دڵـی داوهشـاو، داڕزاو (رجل نخيب) پیاوی عهقڵ تۆراو، بێ عهقڵ.

**نَخَجَ السِّقاءَ**: كوندهكه یان شهربه ناوی لێ چوو.

**نَخَـجَ الـسيلُ الـواديَ**: لافاوهكـه لـهم لاو ئـهولای شیوهكهی داو دهنگی لێ هات.

**نَخَـجَ القِرْبَـةَ**: كوندهكـهی هـهژانـد ٥ ڕاپوهشـاند ٥ هێنایی‌و بردی.

**نَخَجَ الـدَّلْوَ في البئـرِ**: دۆڵچهكهی لـهناو بیرهكـهدا جوڵاند بۆئهوهی پڕ بێ لـهئاو ٥ **إِسْتَنْخَجَ**: دوای ڕهقبون نهرم بوو ٥ **النُّخاجَةُ**: تهڕایی، تهڕمشوح.

**نَخَّ نَخّاً**: بهگورجیو بهتهوژم ڕۆیی.

**نَخَّ الإبلَ نَخّاً**: حوشترهكهی تاوداو تێیهوه ژهنی بۆ ئـهوهی خێـرا بـڕوا ٥ دهنگـی دا بۆئـهوهی یـیخ بخواو پالكهوێ ٥ **الـنُّخُّ**: نـاخی دڵ، قـوڵایی دڵ ٥ دهگوترێ: (هذا من نُخِّ قلبي) ٥ هـهروا نـاوه بـۆ فـهرشو ڕاخـهری درێـژ ٥ لاكێـشی ٥ **النُّخَّـةُ**: تـاودان لێخوڕینی یـهكجار ٥ هـهواڵێك ڕاستیو درۆی لێـك جیانـهكرێتـهوه ٥ ورده بـاران نمـه باران ٥ **النَّخَّةُ**: حوشتری بارهبـهر یـان حوشـتری نـاو ههڵكێـشان بـهناعور و شـتی وا ٥ **النّاخُـذاةُ**: كهشتییهوان، خاوهن كهشتی.

**نَخَرَ نَخْراً وَنَخِيراً**: بهلوتی قسهی كرد.

**نَخَـرَ الحالِـبُ النّاقـةَ نَخْـراً**: شیردۆشـهكه لبـۆزی حوشـترهكهی خوڕانـد بۆئـهوهی شـیر بـداو بهخۆشی بدۆشرێ ٥ **المَنْخِرُ**: كونه لوت ٥ **المَنخور**:

بەمانا (المَنخِر) دێ ٥ النّاخِرُ: ئەو کەسەی بەکونەلوتی دەفیشکێنێ ٥ دەشگوترێ: (ما بالدار ناخر) کەس لەخانومکەدا نیە ٥ هەروا ناوە بۆ بەرازی زێنەخرۆ ٥ گوێدرێژ.

الناخِرة من العظام: ئێسقانێك مۆخی تێدابێ، واتە ئێسقانی کلۆر ٥ هەروا وشەی (الناخرة) ناوە بۆ ئەسپ، بۆ گوێدرێژ ٥ النُّخرَةُ: پێشەوەی لوت ٥ یەکێك لەکونە لوت ٥ النُّخوارُ: وەجاخزادەی بەفیزو خۆبەزلزان ٥ ترسنۆك ٥ لاواز ٥ النُّخُورُ: حوشترێکە تا لبۆزی نەخورێنی شیرنادا ٥ النَّخيُ: فیشکە ٥ فینگە ٥ دەنگ دەربڕین بەلوت ٥ نَخرَبَ الشَّيْئَ: شتەکەی کون کرد ٥ النّخروب: کونی بچوك ٥ نخاريب النحل: خانەی شانە هەنگوین؛ ئەو کونە بچوکانەی هەنگ لە مێو دروستیان دەکا بۆئەوەی هەنگوینیان تێدا کۆبێتەوە ٥ نَخَزَهُ بحديدة نَخزاً: بەنەقیزە تێوەی ژەنی ٥ نَخَزَهُ بكلمة: بەقسە دڵی ئازاردا.

**نَخَسَ** الدابةَ نَخساً: لەسمتی ولاخەکەیەوە ژەنی یان لەکەلەکەیەوە ژەنی بۆئەوەی باش بڕوا.

**نَخَسَ** الرجلَ وبه: پیاوەکەی دەنەدەنە دا، ئیزعاجی کرد، دەری کرد.

**نَخَسَ** البكرة: کونی بەکرەکەی بەپوازو شتی وا تەنگ کردەوە ٥ دوای ئەوەی فراوان بوو ٥ (فهي منخوسة ونخيس).

**نُخِسَ** البعيرُ ونحوه نَخساً: حوشترەکە توشی نەخۆشی ورگ شۆڕیو زۆربوونی گۆشتی بندەستی بوو ٥ یان توشی گرۆنی بن کلکی بوو ٥ تناخست الغَنَمُ: مەڕو بزنەکان لەسەرما خڕبوونەوەو پاڵیان لەیەك دا ٥ تناخَسَ الغدرانُ: زلکاوەکان ئاوی هەندێکیان چووە ناو هەندێکیانەوە ٥ المِنخَسُ والمِنخاسُ: نەقیزە یان هەر دارو ئاسنێك ولاخی پێ لێ بخوڕدرێ ٥ النّاخِسُ: دەردێکە توشی بندەستی حوشتر دەبێ ٥ هەروا گرۆنی توشی بنکلکی ئاژەڵ دەبێ ٥ کەڵەکێوی گەنج ٥ النَّخاسُ: ئەوەی کونی بەکرەو شتی وای پێ تەسك دەکرێتەوە ٥ کۆڵەکەیەکە لەمبەرو ئەوبەری دیوەخانی ماڵ دەچەقێندرێ ٥ النُّخاسَة: ئەو پوازو شتانەی کونی بەکرەی پێ تەسك دەکرێتەوە ٥ پیشەی تەسك کردنەوەی کونی بەکرە ٥ النَّخّاس: فرۆشیاری ئاژەڵو کۆیلە ٥ جەڵەبچی ٥ النّخوسُ: کەڵەکێوی گەنج ٥ النَّخيسُ: شوێنی لێ بەستنی قەیاسەو حەبل لەکەژاوەی بچوك بەسەر پشتی حوشترەوە ٥ النّخيسةُ: ماستی مەڕو بزن بەتێکەڵاوی ٥ تامی مزر کە لەشیرینیو مزری تێکەڵ بووبێ ٥ ڕۆنەکەرە.

**نَخَشَ** الرجلُ نَخشاً: پیاوەکە لاواز بوو.

**نَخَشَ** فلاناً: ئازاری فلانکەسی دا ٥ هەڵیناو خستیە جمو جۆڵ.

**نَخَشَ** الشَّيْئَ: توێکڵی لەشتەکە کردەوە ٥ کاکڵەی شتەکەی گرت.

**نَخِشَ** الشَّيْئُ نَخَشاً: شتەکە لای خواروی ڕزی کەلکی نەما.

**نُخِشَ** الرجلُ: پیاوەکە کزو لاواز بوو.

تَنَخَّشَ إلى كذا: چوو بۆلای فلان شت.

**نَخَصَ** نَخصةً: کزو لاواز بوو پێستی چرچی تێکەوت.

**نَخَصَ** الكِبَرُ أو المرض الحيوانَ: پیری یان نەخۆشی حەیوانەکەی لاواز کرد.

**نَخَصَ** لَحمُهُ نَخصاً: گۆشتی نەما، کزو لاواز بوو ٥ أنخَصَهُ الكِبَرُ أو المرض: پیری یان نەخۆشی لاوازی کرد ٥ إنتَخَصَ لَحمُهُ: بەمانا (نَخِصَ) دێ

٥ **النَّاخِصُ**: ئەو کەسەی پیری کرزو کۆڵەواریی کردبێ ٥ دەگوترێ: (عجوز ناخص) پیرێکە پیری کرزو لاوازی کردوە و پێستی چرچو لوێچ کرد.

**نَخَطَ الى القوم نَخطاً**: لەنکاوێك هاتەدەر بۆناو خەڵکەکە.

**نخط عليه**: تەکەببوری کرد بەسەریا.

**نَخَطَ بە**: قسەی ناشیرینی ئاراستە کرد، جوێنی پێدا ٥ **النُّخطُ**: مۆخ ٥ ئەو ئاوەی لە وێڵداش دایە.

**نَخَعَ بالحق نخوعاً**: ددانی بەحەقو ڕاستی دا نا.

**نَخَعَ الذبيحة نَخعاً**: زێدەڕەوی کرد لەسەربڕینی کوشتییەکەدا نوخاعی شەوکیشی هەڵبڕی.

**نَخِعَ العودُ نَخعاً**: چڵەدارەکە ئاوی تێ تزا، ئاوی تێکەڕا ٥ **إنْتَخَعَ عَنْ أرضه**: لەزەوی‌و زێدی خۆی دوورکەوتەوە ٥ **تَنَخَّعَ السحابُ**: بەمانا (إنْتَخعَ) دێ ٥ **تَنَخَّعَ فلان**: فلانکەس بەڵغەمی فڕێ دا ٥ **المَنْخَعُ**: شوێنی بڕینەوەی نوخاع لەنێوان مل‌و سەردا ٥ **النُّخاع**: دەزوە دەمارێکە لەناو عەمودی فەقەرەی پشت دایەو پەیوەستە بە مێشکەوە ٥ **النُّخاعة**: بەڵغەم کە لەقوڕگەوە دێتە دەر.

**نَخَفَ نَخفاً ونخيفاً**: فیشکاندی، دەنگی خۆی بەلوت دەربڕی ٥ پرماندی لوتی خۆی پاك کردەوە ٥ پژمی ٥ **أنْخَفَ**: زۆری مشەمش‌و گنەگنە کرد ٥ **النُّخافُ**: گۆرەوی، خوف، کاڵە ٥ **النَّخْفَةُ**: چاڵایی لەسەر کێو.

**نَخَلَ الشَّيْءَ نَخلاً**: شتەکەی بێژایەوە.

**نَخَلَ الدقيق**: ئاردەکەی بێژا.

**نَخَلَ السحابُ المَطَرَ**: هەور بارانی باراند ٥ **نَخَلَ الشَّيْءَ**: بۆژێدەڕۆیی لەماناى (نَخَلَهُ) دێ ٥ دەگوترێ: (نَخَلَ السحابُ المَطَرَ) هەورەکە زۆری باران باراند.٥ **إنْتَخَلَ الشَّيْءَ**: لەشتەکە باشەکەی هەڵبژارد ٥ **إنْتَخَلَ السحابُ المطر**: هەور بارانی باراند ٥ **تَنَخَّلَ الشَّيْءَ**: بەمانا (إنْتَخَلَ) دێ ٥ **المُنْخُلُ**: بێژنگ ٥ **النُّخالة**: سەرکوێزر، سۆ ٥ ئەوەی دەمێنێتەوە لە بێژنگەکەدا دوای لەبێژنگ دان ٥ **النَّخْلَةِ**: دارخورما ٥ **النَّخيلة**: شتی لەبێژنگ دراو و پاڵفتە کراو ٥ دەشگوترێ: (بذل لە نخيلة قلبە) پاڵفتەی دڵی پێدا. ( **نَخَمَ نَخماً**: گۆرانی باشی گوت.

**نَخِمَ نَخماً**: زمانی گیراو قسەی پێ نەکرا.

**نَخِمَ نَخماً**: بەڵغەمی فڕێ دا ٥ **النُّخامَةُ**: بەڵغەم ٥ **نَخْنَخَ**: بەپەلە ڕۆیی ٥ **نَخْنَخَ الإبلَ**: حوشترەکەی ییخ دا ٥ دەشگوترێ: (نَخنخ بالإبل) ٥ **نَخْنَخَ فلاناً**: فلانکەسی ترۆ کرد، دەری کرد ٥ **تَنَخْنَخَتِ الإبلُ**: حوشترەکە ییخی خوارد؛ پاڵکەوت.

**نخا نخوةً**: شانازی کردو خۆی بەزل زانی.

**نخا فلاناً نخواً**: مەدحی فلانکەسی کرد.

**نُخِيَ نخوةً**: شانازی کردو خۆی بەگەورە زانی ٥ **أنْخى**: پیاوەتی و ڕەوشتی بەرزی زیادییان کرد ٥ **إنْتَخى**: شانازی کرد لوتبەرزی نواند ٥ **إنْتَخى علينا**: شانازی بەسەردا کردین ٥ **إنْتَخى من كذا**: خۆی لەو شتە پاراست‌و بێزی لێ کردەوە ٥ **إسْتَنْخى منه**: خۆی لێ پاراست‌و بیری لێ کردەوە ٥ **النَّخْوَةُ**: پیاوەتی‌و مەردایەتی ٥ فیزو خۆبەزلزانی.

**نَدَأ اللَّحْمَ نَدْءاً**: گۆشتەکەی برژاند پیشاندی بەوە: کە خستیە ناو ئاگرەوەو ژێر پشکۆو ژیلی خست.

**نَدَأ المَلَّةَ**: قوڵکە ئاگردانی دروست کرد تەندوری داناو ئاگری تێدا کردەوە بۆ نان برژاندن‌و شتی

وا ٥ النَــدّاَةُ: ســوراییی دەوری خــۆر لــەکاتی هەڵاتن‌و ئاوابوونی دا ٥ النَدّاَةُ: توێژێکی گۆشت کە ڕەنگی لەوی تری نەچێ ٥ پارچە ڕومکێك کە بەجیاو دوور لـەوی تـر ڕوابێ ٥ النَّـدِيّ: سوراییی خۆر لەکاتی هەڵاتن‌و ئاوا بوونی دا ٥ النَّدِيءُ: هەر خواردنێك بە پێشاندن لەژێر ئاگردا یان بەبرژاندن بەکەڵکی خواردن بێ ٥ دەگوترێ: (لحم نديءٌ).

**نَدَبَ فلاناً الى الأمر ندباً:** فلانکەسی بانگ کرد بۆ ئەنجامدانی کارەکە.

**نَدَبَ الميتَ:** مردووەکەی لاواندەوە وایە شیوەنی بۆ کرد.

**نَدِبَ الجُرْحُ نَدَباً:** برینەکە شوێنەکەی ڕەق هەڵات ٥ قەتماغەی کرد.

**نَدِبَ جِسْمُهُ:** جەستەی شوێنی برینی پێوە دیارن.

**نَدُبَ ندابَةً:** چوست‌و چالاك بوو ٥ گورج‌و گۆڵ ڕاپەڕی ٥ أنْدَبَ جِسْمَهُ: شوێنکەی بەجەستەوە جێ هێشت.

**نَــدَّبَ بــه للأمــر:** ناردی بۆ ئەنجامدانی کارەکە ٥ کارەکەی خستە ئەستۆی خۆی ٥ إنْتَدَبَ الشَّيْءُ: شتەکە ئاسان‌و بەدەست بوو ٥ ئاشکرا بوو ٥ إنْتَدَبَ للأمـر: خۆی بۆ کارەکە تەرخان کردو هەوڵی ئەنجامدانی داو پەلەی کرد بۆ جێبەجێ کردنی ٥ إنْتَدَبَ فلاناً للأمـر: بـانگی فلانکەسی کـرد بـۆ گرتنـە ئەسـتۆی کـارو ئەنجامـدانی ٥ المنـدوب: بـەزمانی دانیـشتوانی مەککـە واتـە: پێغەمبـەرو ڕەوانـەکراو ٥ کەسـێك لـەجیاتی یەکێکی تر کارەکە ئەنجام بدا جێگرو وەکیـل ٥ کرداری سوننەت‌و پەسەند لای خواو لای شـەرع ٥ النادِبَةُ: ئافرەتێك شین بگێڕێ‌و وایەشیوەن بکا ٥ بـەپیاوی مـردو دا هـەڵبڵێ‌و ڕەوشـتە جوانـەکانی بـیر شـینگێڕو دانیـشتوانی ماتەمینەکـە بینێتـەوە ٥ النَّـدْبُ: چوسـت‌و چـالاك‌و خێـرا گـورج‌و گـۆڵ ٥ ئـادەمیزادی نـەجیب‌و ڕەوشـت بـەرز ٥ ئەسـپی ڕەسـەن ٥ النَّـدَبُ: شـوێنکەی بـرین ٥ شـوێنی پاشمـاوەی برین ٥ شتێك گرەوی لەسەر بکرێ ٥ کەوانێك تیرەکـە تیـژ بهاوێـژێ ٥ النُدْبَـةُ: لـەزاراوەی نـەحوییان دا بـەمانا بـانگکردن‌و هـاوار لێکـراو دێ، دەگوترێ: (وا محمداه) (وا معتصماه).

**نَدَحَ الشَّيْءَ نَدْحاً:** شتەکەی فراوان کـرد ٥ إنْتَـدَحَت الغَنَمُ في مرابضها: مـەڕو بزنـەکان لـە حەوشـەو کۆزو ئاغەڵەکانیان دا بڵاو بوونەوەو پەرتەوازە بـوون ٥ تَنَـدَّحت الغـنم في مرابـضها: بـەمانا (إنْتَـدحت) دێ ٥ المندوحـة: دەگـوترێ: (أرض مندوحـة) زەوییـەکی فراوانـە ٥ دوورە ٥ هـەروا دەگـوترێ: (ولـك عَـنْ هـذا الأمـر مندوحـة) لەکارەکـەدا ئـەتۆ مـەودای فراوانـت هەیـەو دەسـتت کراوەیـە ٥ النِـدْحُ: بـەرفراوان ٥ زۆر ٥ النَّـدْحُ: قـورس ٥ تارمـایی، شـتێك لـەدوورەوە ببیینی ٥ النُدْحَةُ: زەوی بەرفراوان ٥ دەشتایی ٥ دەگوترێ: (إنك لفي ندحة مـن الأمـر) ئـەتۆ لـەم کـارەدا مـەودای فراوانـت لەبـەردەم دایـە ٥ مەجالت کراوەیە ٥

**نَدَخَهُ نَدْخاً:** بەرەو ڕوی بوو، خۆی پێ کێشا ٥ أنْدَخَهُ: بەمانا (نَدَخَهُ) دێ ٥ تَنَدَّخَ: زۆر خۆی هەڵکێشا، زۆری کاری سەروەری پاڵ خۆی دان‌و هیچیانی نـەکردبوون ٥ المِنْـدَخُ: کەسێك خوێڕی‌و هیچ‌و پوچ بێ گوێ نەدا بەوەی چ بەخەڵکی دەڵێ یان خەڵك چی پێ دەڵێن لەقسەی ناشیرین.

**نَدَّ البعيرُ وغيره نَدّاً ونُدوداً:** حوشترەکە بەلەسە بوو ٥ دەشگوترێ: (نَدَّت الفكرة عني) فکرم تـەرەبوو بیرم ڕۆیشت ٥ نَدَّت الكلمة: وشەکە نایەتـە زێـر

کـۆنترۆڵی یاسـاو ڕێـسای زەمانـەوە، قاعیـدە نایگرێتـەوە ٥ نَـدَّدَ بفـلان: عـەیبو عـاری فلانکەسی ئاشکراکردن ٥ نَدَّدَ القطیعَ: جەڵەبە ئاژەڵەکەی پەرتەوازە کردن ٥ نَدَّدَ صَوْتَه: دەنگی ئاوازی بەرز کردەوە ٥ تَنادّ القوم: خەڵکەکە پەرتـەوازە بـوون ٥ النّـادُّ: رزق و رۆزی ٥ دەگوترێ: (لیس لهم نادّ) ئەوانە ڕزقیان نیە ٥ النَّدُّ: جۆرە ڕوەکێکە لاسکەکەی دەکرێ بەبخور ٥ النِّدُّ: هاوشان و ڕکابەر ٥ النّدیدُ: بەمانا (النِّدُّ) دێ.

**نَدَرَ الشَّیْئُ ندوراً:** شتەکە بەربۆوە هەڵوەری ٥ هَزَّ الغُصْنُ فندرت منه الثمار: لقەکەی ڕاوەشاند میوەی لێ هەڵوەری ٥ دەشگوترێ: (ندر العظم عَـنْ موضـعه) ئێـسقانەکە لەشـوێنی خـۆی دەرچوو.

**نَدَرَ فلان في العلم والفضل:** فلانکەس لە عیلم و زانیاری دا پێش کەوت و هاو وێنەی کەمە.

**نَدَرَ الكلام ندارة:** قسەکە ڕەوان و کاریگەر بوو ٥ أندر: شتی ئاوازەی هێنا ٥ قسەی عەنتیکەی کردن کاری کەس نەکردووی ئەنجام دا ٥ أَنْدَرَ الشَّیْئَ: شتەکەی داشکاند ٥ دەگوترێ: (أندر التاجِرُ من حسابي كذا) بازرگانەکە لەحیسابی من ئەوەندەی داشکاند ٥ أندر العظم من وضعه: ئێسقانەکەی لە شوێنی خۆی جوڵاند ٥ تنادر: قسەی عەنتیکەو خۆشی گێڕانەوە ٥ تنادر على فلان: گاڵتەی بەفلانکەس کرد ٥ تنادر علینا: جار جار دەهاتە لامان ٥ إسْتَنْدَرَ: شتەکەی بەئاوازەو نادر زانی ٥ إسْتَنْدَرَ القوم أثر فلان: خەڵکەکـە شـوێن ڕێبـازی فـلان کـەوتن و کاریگەریی ئەویان بەسەرەوە دیارە ٥ إسْتَنْدَرَ الحیوانُ الرَّطْبَ: حەیوانەکە لە لەوەڕی تازە گەڕا ٥ النادِرَة: قسەی گاڵتەو گەپ ٥ دەشگوترێ: (هو نـادرة زمانـه) ئـەو مرۆڤـە تاقانـەی ڕۆژگـاریی خۆیـەتی ٥ النَّـدَرى: دەگوترێ: (لَقِیْتُهُ النَّدرَى) کەم کەم توشی بووم ٥ النَّـدْرَةُ: پارچەی زێـڕو زیـو کـە لـەکان دا دەردەهێنـدرێ ٥ النُـدْرَةُ: دەگوترێ: (لایکون ذلك إلا نُدْرَة) ئەو شتە کەمجار وادەبێ، وارێ دەکەوێ.

**نَدَسَ فلاناً بالشيئ نَدْساً:** زەبرێکی سوکی لەفلان دا.

**نَـدَسَ الأرض برجله:** بەقاچی پێهڕکەی لەزەوی کرد.٥ نَدَسَه بكلمة: بەهێواشی جنێوی پێ دا.

**نَـدَسَ بفـلان الأرض:** فلانکەسـی بـەزەوی دا دا خستی.

**نَـدَسَ الـشَّیْئَ عَـنْ الطریـق:** شـتەکەی لـەڕێگا دوورخستەوە.

**نَدِسَ نَدَساً:** زیرەك بوو، زۆر بەوردی لە ئیشەکان ورد بـۆوە ٥ دەنگـی بەئەسـپایی و نزمـی زوو بیـست ٥ نادَسَـهُ: زەبـری لێ دا ٥ نـاو و نـاتۆرەی ناشیرینی لێنا ٥ تَنَدَّسَ ماءُ البئر: ئـاوی بیرەکە لەهـەر چوار لایـەوە سـەر ڕێـژی کـرد ٥ تَنَـدَّسَ الرجلُ: پیاوەکە بەزەوی دا دراو کـەوت، کوژرا ٥ تَنَـدَّسَ الخَبَـرَ وعنـه: لەهەواڵەکـەی کۆڵیـەوەو هـەوڵی دا پـێش هـەموو کـەس ئـەو بیزانـێ ٥ النادس من الرماح: ڕمبی وەشاو و بەکارهاتوو لـە لێـدان دا ٥ النِـدْسُ: دەنگـی نـزم ٥ النَّـدَسُ: عەقڵ و لێزانی ٥ النُّدُسُ: ئەو کەسەی تێکەڵاوی خەڵك دەبێ و ئەرکی خۆی ناخاتە سەریان.

**نَـدَشَ عَـنْ الـشَّیْئ نَدْشـاً:** باسـی شـتەکەی کـرد، لەشتەکەی کۆڵیەوە.

**نَدَشَ القُطْنَ:** لۆکەکەی شی کردەوە هەلاجی کرد.

**نَدَصَ الشَّيْئُ من الشَّيْئِ:** شتەكە لەشتەكە دەرچوو هاتە دەر ٥ دەگوترێ: (نَدَصَت النواةُ من التمرة) ناوكە خورماكە لە خورماكە هاتەدەر ٥ **ندصت العينُ:** چاوەكە زەق‌و دەرپەڕیو بوو.

**نَدَصَ البَثْرَةَ:** دومەڵەكەی گوشی كێم‌و زوخاوی لێ دەرهات.

**نَدَصَ القَوْمَ:** شەڕی توشی خەڵكەكە كرد ٥ **المِنْدَاصُ:** دەگوترێ: (رجل منداص) پیاوێكی شەڕانی‌و بەد ڕەوشتە هەر هەوڵی ئەوەیەتی كاری وابكا خەڵك ئەززیەت دا ٥ (إمْرأة مِنداص) ئافرەتێكی عەقڵ سوك‌و چەقەچەناوە.

**نَدَغَ فلاناً نَدْغاً:** لە فلانكەسیەوە ژەنی،

**نَدَغَ المرأةَ:** دڵداری لەگەڵ ئافرەتەكە كرد.

**نَدَغَ العَقْرَبُ فلاناً:** دوپشك بەفلانكەسیەوە دا.

**نَدَغَ فلان فلاناً:** فلانكەس جنێوی بە فلان دا ٥ **أنْدَغَ بفلان:** خراپەی لەگەڵ فلانكەس كرد ٥ **نَدَّغَ العجين:** ئاردی بە هەویرەكە كرد ٥ **نادَغَ المرأةَ:** دڵداری لەگەڵ ئافرەتەكە كرد ٥ **إنْتَدَغَ:** پێكەنینەكەی هێواش كرد ٥ **المِنْدَغ:** ڕەب وەشێن ٥ جنێو دەر، زمان پیس ٥ **النُّدْغَةُ:** سپیایی بنكی نینۆك ٥ **ندفت الدَّابَّةُ:** وڵاخەكە لە ڕۆیشتن دا پەلەی كرد، خۆشڕۆ بوو ٥ **ندفت السماء بالمطر وبالثلج:** ئاسمان بارانی باراند، بەفری باراند ٥ بەفری تێ كرد.

**نَدَفَ القطن:** بە ئامێری هەلاجی لۆكەكەی شی كردەوە ٥ **أنْدَفَ:** حەزی لەدەنگی عودو كەمان بوو ٥ **أنْدَفَ الدابةَ:** بەخێرایی‌و بەزەخت وڵاخەكەی لێ خوڕی ٥ **نَدَّفَ القُطْنَ:** لۆكەكەی زۆر شی كردەوە ٥ **المِنْدَفُ والمِنْدَفَةُ:** ئەو دارو ژێ‌و حەبلەی هەلاج لۆكەی پێ شی دەكاتەوە ٥ **النِّدافَةُ:** پیشەی هەلاجی ٥ **النُّدافة:** ئەو وردە خشت‌و خاشاكەی لە لۆكە دەكەوێتە خوار لەكاتی هەلاجی كردنی دا ٥ **النَّدَّاف:** هەلاج؛ ئەو كەسەی لۆكەكە شی دەكاتەوە یان ئەو ئامێرەی لۆكەكەی پێ شی دەكرێتەوە ٥ **النُّدْفَة:** شتی كەم، جۆرێك.

**نَدَلَ الشَّيْئَ نَدْلاً:** شتەكەی بەخێرایی گواستەوە ٥ شتەكەی دزی ٥ بەدەستی خۆی شتەكەی لە شوێنی خۆی دەرهێنا.

**نَدِلَ نَدَلاً:** چڵكن بوو ٥ **إنْتَدَلَ الشَّيْئَ:** شتەكەی هەڵگرت توانی هەڵی بگرێ ٥ **تَنَدَّلَ بالمنديل:** بەپەڕۆ سەری شتەكەی سڕی ٥ **نَرْدَلَ:** لە بەرپێری شەپڵە لێی دا، توشی لەرزین بووە ٥ **المَنْدَلُ:** لقەدرەختی بۆنخۆش ٥ جۆرێكە لە فالگرتنەوەو كوڵەوەنانی كاهین‌و دەست بڕ بەكاری دێنن بۆ دۆزینەوەی شتی ونبوو ٥ **المِنْديل:** پارچە قوماشێكی بچوكی چوارگۆشەیە بەكوردی پێی دەگوترێ دەسمسڕ دەم‌و چاو و دەستی پێ وشك دەكرێتەوە ٥ **النَّادِلُ:** كەسێك خواردن‌و خواردنەوە پێشكەش بە خەڵك بكا ٥

**نَدِمَ على الأمر نَدَماً:** لەكارەكە پەشیمان بۆوە، خەفەتی پێ خوارد ٥ **أنْدَمَهُ:** پەشیمانی كردەوە ٥ **نادَمَهُ منادمةً ونِداماً:** هاوكاری كردو هاونشینی بوو لەخواردنەوەدا ٥ **نَدَّمَ عليه:** بەمانا (أنْدَمَهُ) دێ ٥ **تنادم القومُ:** خەڵكەكە دانیشتن بۆ خواردنەوە ٥ **تَنَدَّمَ على الأمر:** خەفەتی خوارد لەسەر ئەوەی ئەو كارەی كردووە ٥ **إنْتَدَمَ الأمرُ:** كارەكە ئاسان بوو ٥ **المَنْدَمُ:** پەشیمانی ٥ **المَنْدَمَةُ:** هەرشتێك مرۆڤ هەڵنێ بۆ پەشیمان بوونەوە ٥ **النَّديم :** هاو ڕێی سەرمێزو شەرابخواردنەوە.

**نَدَهَ الرجلُ نَدْهاً:** پیاوەكە هاواری كرد.

**نَـدَهَ** الإبـلَ: حوشـترەکانی بەکۆمـەڵ لێخـوڕین ٥ **إسـتَنْدَهَ الأمـرُ**: کارەکـە جـێگیر بـوو ٥ **المِنْـدَهُ**: دەگوترێ: (رجل مِنْدَهٌ) پیاوێکە زۆر هاوار دەکاو دەقیڕێنێ ٥ **النَّدْهَةُ**: دەنگ ٥ **النُّوادِهُ**: داکۆکیکارو مەنع کەرو لەمپەرو پەرژین.

**ندا** القومُ نَدْواً: خەڵکەکە لە یانە کۆبوونەوە.

**نَـدا** القَـوْمَ: خەڵکەکـەی لەیانـە کـۆکردەوە ٥ دەشگوترێ: (ما ینـدوهم النـادي) یانـە بەشیان ناکا ئەوەندە زۆرن جێگایان نابێتەوە.

**نَـدِيَ** الـشَّيْءُ نَـدیً ونـدارةً: شـتەکە تـەڕبوو شـەی هەڵێنایـەوە ٥ **نـدِیت الأرض**: زەوییەکـە شـەونم لێی دا.

**نَدِي** فـلان: فلانکـەس بەخـشندە بـوو سـەخاوەتی زۆر کەسـی گرتـەوە ٥ دەنگـی خـۆش کـە درێـژ بکرێتـەوەو بەبـەرزی بگـوترێ ٥ **أنـدی فـلان**: فلانکەس بەخشش‌و پیاوەتی زۆر بوو ٥ دەنگ‌و صەدای خۆش بوو ٥ **أندی الشَّيْءَ**: شتەکەی واڵێ کرد تەڕو شێدار بێ ٥ **نادی الشَّيْءُ مناداةً ونِداءً**: شـتەکە دەرکـەوت ٥ **نـادی النَّبْـتُ**: ڕووەکەکـە پێگەیی‌و تێکهاڵا ٥ **نادي فلاناً**: بانگی فلانکەسی کرد بەدەنگی بەرز ٥ لەیانە دا لەگەڵی دانیشت: ڕاوێژی پێ کرد ٥ شانازی بەسەردا کرد ٥ **نـادی بِسِرِّهِ**: نهێنییەکەی ئاشکرا کرد.

**نَدَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی تەڕو شێدار کرد.

**ندی الفَرَسَ**: ئەسپەکەی هەلینگ دا تا عارەقی پێ کرد ٥ **إنْتَدَی فـلان**: فلانکـەس عـەتاو بەخششی زۆر بوو ٥ **تنـادی القـومُ**: خەڵکەکە هەنـدێکیان بانگی هەندێکیان کرد ٥ لـە یانـە دا کۆبوونـەوە ٥ **المُنْتَـدی**: یانـەی گـەل‌و هـۆزو دیوەخانـەی عەشرەت‌و شوێنی ڕاوێژو قسە گۆڕینـەوەی نـاو خۆیان ٥ **تَنَدّی المكانُ**: شوێنەکە تـەڕبوو تـەڕایی شـێی لێ پەیـدا بـوو ٥ **المُنْدِیـة**: وشـەیەك یـان کردەوەیـەك ئەوەنـدە ناشـیرین بـێ عـەرەق بـەمرۆڤ بکا ٥ کـردارو گوفتـاری شـەرم ئـاوەر ٥ **النّـادي**: یانـەو ئەنجومـەن ٥ دیوەخـان‌و شـوێنی کۆبوونـەوەی گـەل‌و هـۆز ٥ یـان شـوێنی کۆبونـەوەی چـینێکی تایبـەتی خـەڵك وەکـوو یانەی مامۆستایان، یانەی ئەفسەران ٥ **النادِیة**: لایەن‌و دەڤەر ٥ (نادیات الشَّيْ) سەرەتای شت ٥ نۆنەخشەی شت ٥ **النَّدی**: شەونم ٥ هەڵمی ئـاوە بـەرز دەبێتـەوە بـۆ حـەوا لەچینە ساردەکانی هـەوادا خەسـت دەبێتـەوەو لەشـەودا لەشێوەی دڵۆپە بارانی زۆر ورد دا دەبارێتـە سـەر زەوی ٥ هـەروا ئـاوە بـۆ بـاران ٥ بـۆ سـەخاوەت‌و بەخشندەیی‌و خێرو بێر ٥ **النَّدْوةُ**: یەکجار واتە: (إسـم مـرة) یـە ٥ یانـەو ئەنجومـەن ٥ کۆمەڵـە مرۆڤێـك لەیانەیـەك دا کۆببنـەوە بـۆ ڕاوێژکردن‌و باس‌و لێکۆڵینەوە دەربارەی کارێك ٥ (دار الندوة) هەر خانو و باڵەخانەیەك خەڵك تێیدا کۆببنەوە بۆ باس‌و ڕاوێـژو لێکۆڵینـەوە ٥ قورەیشییە عەرەبەکان لە پـێش هاتنی ئیسلام ئـەم جۆرە یانـەو ئەنجومەنـەیان هـەبوو تێیدا کۆدەبوونەوە (قصي کوڕی کیلاب) کە یەکێکە لـە باپیرە گـەورەکانی پێغەمبـەر لـە ڕۆژگـاری خۆی دا بنیاتی نابوو دوایی پشتاو پشت بۆ ئەو بەرەبابە مایەوە ٥ موعاوییە لە ڕۆژگاری خـۆی دا کرێ‌و کردی بـە (دار الإمارة) ٥ **النَّدِي**، تـەڕ ٥ **النَّدِيّ**: بەمانا (النّدِي) دێ ٥ یانەی گەل‌و هـۆزو شوێنی کۆبوونەوەیان بۆ باس‌و ڕاوێژ دەربـارەی کـاری گـرنگ ٥ دەشـگوترێ: (هـم نـدی الكـفّ) ئەوانـــــە ســـــەخی سروشـــــتن.

**نَـدِيَ** الصوتُ: دەنـگ خـۆش ٥ يـان دەنگـی بـاش دەرواو پشوو درێژە بۆ دەنگ هەڵدان ٥ **النَّدْيانُ**: تەڕبوو، شێدار.

**نَذَرَ الشَّيْءَ**: شتەكەی لەسەرخۆی پێویست كرد.

**نَذِرَ** بالـشيئ نَـذْراً ونـذارةً: بەشتەكەی زانـیو لێـی بـەئاگا بـوو ٥ دەگـوترێ: (نَـذِروا بالعَـدُوِّ) بەدوژمنەكـەیان زانـیو چـاودێری هـەڵسو كەوتو جمو جوڵی ئەویان كرد.

**أنْذَرَهُ الشَّيْءَ**: شتەكەی پێ زانانـدو هۆشداری دایـە كـە وریـای بـێ ٥ **تنـاذر القـومُ**: خەڵكەكـە هەندێكیان هەنـدێكیانیان لەشەڕو خراپەكاری ترساند ٥ **النَّـذارَةُ**: ترساندن، هۆشدار كـردن ٥ **النَّذْرُ**: فۆتۆ، ئەوەی بەندە لەسەر خۆی پێویست دەكا بـۆ پـەروەردگاری لـە بەخـشینی مـاڵ یـان لەئەنجامـدانی تاعـەت ٥ **النَّـذِيرُ**: ترسـاندن، ترسـێنەر ٥ **النَّـذيرةُ**: ئـەوەی مـرۆڤ بەشـێوەی نەزرو فۆتۆ دەیبەخشێ ٥ **نُذيرةُ الجيش**: پێشەتای سوپا، ئـەو بەشـە سـوپایەی دەبنـە ڕەصـەدو چاودێری بەسەر دوژمنەوە سات بەسات هەواڵی جمو جـوڵی سـوپای دوژمـن بەسـوپای لەمـەڕ خۆیان دەگەیەنن.

**نَذَعَ** الماءُ أو العرقُ: ئـاو یـان عـارەق دڵـۆپ دڵـۆپ هاتەدەر ٥ **النَّذْعَةُ**: قەترە ئاو و شتی لەو جۆرە.

**نَذُلَ** نذالة ونُذولة: خوێری بوو هیچو پوچ كەوتـە دەشـتێ ٥ **النـرْجِسُ**: نێـرگس ٥ چـەند جـۆرێكی هەیە بـۆ جوانیو ڕازاندنـەوەی باخچەو بـۆنی خۆش دەروێندرێ، هەروا خۆرسكیش دەڕوێ ٥ **النرجسية**: جۆرە شزوزێكی جنسییە مرۆڤەكە حەزی لەخۆیەتی.

**النارجيل**: ڕەگـەزی درەختـی خورمـایی، فرەجـۆرە دەروێندرێ بۆ جوانی، هەنـدێكی بەرداره، ئـەم جۆرە بۆ سود وەرگرتن لەبەرەكەی دەروێنـدرێ بەرەكەیشی گوێزی هیندیە، ڕۆنێكی لێ بەرهەم دەهێندرێ باشترین ڕۆنە ٥ **النارجيلة**: نێرگەلـە، ئـامێرێكی تـوتن كێـشانە لـەجیاتی سـەبیلەو قەڵنەو جگەرە دەخورێ، لەسـەرەتادا قاعیـدەی ئەم ئامێرە لەداری گوێزی هینـدی دروسـتكراوە دوایـی لەشوشـە دروسـت كـراوە ٥ **النَّـرْدُ**: یـاری تاوڵە ٥ (صندوقێكو چەند داشێكن) ٥ **النَّـرْدِنُ**: ڕوەكێكـی بـچوكی بۆنخۆشـە پەلكـە گـەڵاكانی درێژن ڕەنگی زەردی مەیلەو شلەیە ٥ **النـاردين**: بــەمانا (النَــرْدِن) دێ ٥ **النَّــارنج**: نــارنج؛ درەختێكـی بـەرداره هەمیـشە سـەوزە چـەند مـەترێك بـەرز دەبێـتەوە بـۆنی خۆشـە، گوڵی سپی دەردەدا، گوڵەكەشـی بـۆنێكی زۆر خۆشـی هەیـە، لـەوەرزی بـەهاردا گـوڵ دەكـا، بەرەكـەی لەشـێوەی پرتـەقاڵ دایـە تـامی زۆر تـرشو مەیلـەو تاڵـە ٥ لـە گوڵەكـەی گـوڵاو دروسـت دەكرێ عەترو شتی وا شی لێ دروست دەكرێ ٥ توێكڵەكەشــی بــڕی دەرمــانی لێ بەرهــەم دەهێندرێ.

**نَزَأَ** بين القوم نَـزْءاً ونـزوءاً: دژایـەتی خـستە نێـوان خەڵكەكەوە ٥ دەگـوترێ: (نزأ الشيطان بينهم).

**نَزَأَ** عليه نزءاً: سواری بوو، چووە كۆڵی.

**نَزَأَ** فلاناً وعليه: سواری فلان بوو چووە كۆڵی.

**نَزَأَ** فلاناً عَنْ الشَّيْئِ: فلانكەسی لەو شتە گێڕایەوە.

**نُـزِئَ** بـه: خۆشـی ویـست، عاشـقی بـوو ٥ **النّـزاءُ**: دەگـوترێ: (رجـل نـزّاءٌ بكـذا) پیاوێكـە شـێتو شەیدای ئەو شتەیە ٥ **النُّزيءُ**: دەگوترێ: (فـلان نـزِئٌ) فلانكـەس فیتنـەو ئاشـوبگێڕە دژایـەتی دەخاتـە نێـوان خەڵكـەوە ٥ گونـدەی بـچوك، دێمكەی بچوك.

**نَـزَحَ نَزحـاً ونزوحـاً:** دووركەوتـەوە ٥ دەگـوترێ: (نزحت الدار) خانوەكەی دوورە ٥ (نَزَحَت البئرُ) بیرەكـە ئـاوی داكـەوت، كـەم بـوو، ئاوەكـەی دووركەوتەوە.

**نَزَحَ البِئرَ ونحوها نَزْحاً:** بیرەكەی دەردا تـا ئاوەكەی كەم بوو یان هەرئاوی تێدا نەما.

**نُزِحَ بفلان:** فلانكەس لەولاتی خۆی دووركەوتـەوە و دیار نەماو دیار نەبوونەكەی درێژەی كێشا.

**أنزحَ الشَّيْئَ:** شتەكەی دوور خستەوە ٥ **أنزَحَ البِئرَ:** بیرەكەی دەردا ٥ **إنْتَزَحَ:** دووركەوتەوە ٥ **المِنْزاحُ:** كەسـێك زۆر سـەفەر بـۆ ولاتـی دوور بكـا ٥ **المِنْزَحَة:** ئامێری ئاو هەلێنجان ٥ وەكوو دۆلچەو شتی وا ٥ **النازح:** دەگوترێ: (بلد نازح) ولاتی دوور (بئر نـازح) بـیری كـەم ئـاو ٥ **النَزَحُ:** ئـاوی لیل ٥ (والبئر النَّزَحُ) بیرێك ئـاوی تێدا نـەبێ ٥ **النَّزوح:** بیری كەم ئاو ٥ بیرێك ئاوەكەی زۆر لیل بێ ٥ **النَّزيحُ:** دوور.

**نَزَرَ الشَّيْئَ:** شتەكەی كەم كردەوە.

**نَـزَرَ فلانـاً:** فلانكەسـی بـەهیچو پـوچ زانـیو سوكایەتی پـێ كـرد ٥ پەلـەی لێ كـرد، هـەلێنا ٥ وردە وردە چی لابوو هەمووی لێ وەرگرت.

**نَزَرَ الشرابُ فلاناً:** شەرابەكە فلانكەسی سـەرخۆش كرد.

**نَزُرَ الشَّيْئُ نزارةً ونزورةً:** شتەكە كەم بوو ٥ **نَزُرَ فلان:** فلانكەس خێرو بێری كەم بـوو ٥ **نَزُرَت الأنثى:** مێینە شیردەرەكە شیری كەم بوو ٥ **أنْزَرَ العَطاء:** بەخشـشەكەی كـەم كـردەوە ٥ **نَـزَّرَ العَطـاءَ:** بەخششەكەی كەم كردەوە ٥ **تَنَـزَّرَ مِـن الشَّيْئِ:** لەشتەكەی كەم كردەوە.٥ **تَنَزَّرَ:** خۆی پاڵ هـۆزی نزارە دا ٥ یان خۆی شوبهاند بەیەكێ لەو هـۆزە ٥ **المنزور:** دەگـوترێ: (شيئ منزور) شتی كەمو بێ نـرخ ٥ (أعطـاه عطـاء منـزوراً) بەپێكێـشیو ئیلحاحی سوالكەرەكە بەخششی دا ٥ (عطاء غـیر منزور) بەخششی بێ ئیلحاح و پێكێشی ٥ **النَّـزْرُ:** دەگوترێ: (شيئ نزرٌ) شتی كەمو بێ نـرخ ٥ **رجل نَـزْرٌ:** پیاوی بـێ خێـرو بێـر ٥ دەشـگوترێ: (مـا جئـت إلا نـزراً) بەتەمبـەلی هـاتم ٥ **النَّـزْرَةُ مـن الإناث:** مێینەی كەم بێچوو كـەم شـیر ٥ **النَّزورُ:** هەر شتێك كەم ببێ ٥ دەگوترێ: (رجـل نـزور) پیاوێكی كەم قسەیە ٥ **النَّزيرُ:** كـەمو بـێ نـرخ ٥ دەگوترێ: (عطاء نزير) بەخششێكی كەم.

**نَزَّ المكانُ نَزّاً ونزيزاً:** شـوێنەكە بـوو بـە قوڕەلیتـە ٥ بوو بەزۆنگاو ٥ شوێنەكە زۆنگاوی زۆر بوو.

**نَزَّ الفؤادُ نَزّاً:** دڵەكە زۆر وریاو زیرەك بوو.

**نَـزَّ الظَّبـيُ:** ئاسكەكە بـازی داو باڕانـدی ٥ **نَـزَّ وتـر السهم:** ژێـی كەوانەكـە لـەكاتی تـیر هاویـشتن دا تێكچوو.

**نَـزَّ فـلان عـني:** فلانكـەس لـێم دووركەوتـەوەو گۆشەگیر بوو لێم. ٥ **أنَزَّ المكانُ:** شوێنەكە زۆنگاو و شـێدارییەكەی درێـژەی كێـشا ٥ **أنَـزَّ الرجـل:** پیاوەكە زێدەڕۆیی كردو توندو تیژ بـوو ٥ **نـازَّ فلانـاً:** ڕكابـەری فلانكەسـی كـردو لەگـەلی دا كەوتە كێشەوە ٥ **نَزَّزَهُ عَنْ كـذا:** بـەدووری گـرت لەو شتە، بەپاكو خاوێنی دایە قەڵەمو لەشتی خـراپ بـەپاكی ڕاگـرت ٥ **نَـزَّزَت الظبيـة ولـدها:** ئاسـكەكە بێـچوەكەی پـەروەردە كـرد ٥ **المِنَـزُّ:** دەگـوترێ: (رجـل مِنَـزٌّ) پیـاوێكی جـمو جـوڵ كـەرەو لـەهیچ شـوێنێ ناحـەجمێ ٥ لانكـەی منداڵ ٥ **النَّزازُ:** دەگوترێ: (هـو نِـزازُ شـرّ) ئـەو شـەڕانییە واز لەشـەڕ كـردن ناهێنـێ ٥ **النَّـزُّ:** ئەوەی لەزەوی دا بەهۆی ئاوەوە دەبێتە زۆنگاو و شێدارو قوڕو لیتـەی زۆر دەبـێ ٥ (رجـل نَـزٌّ)

پیاوێکی دڵ وریایە ٥ یان سەخی سروشتە ٥ یان زۆر جمو جوڵ دەکاو لەجێگایەك ناسرەوێ ٥ (مکان نَزٌ) شوێنێکی زۆنگاو و شێدارە ٥ **النَّزَةُ**: نارەزوو شەهوەتی زۆر ٥ چڵێسی ٥ **النَّزِیزُ**: دەگوترێ: (رجل نزیز) پیاوێکی زەریف و ڕۆح سوکە ٥ یان زۆر جمو جوڵکەرەو هارو هاجە ٥ یان چڵێس و شەهوانییە ٥ (نزیز شرّ) شەڕانییەو واز لەشەڕکردن ناهێنێ.

**نَزَعَ المریضُ**: نەخۆشەکە کەوتە حاڵەتی گیانەڵاوە ٥ **نَزَعَت الشمسُ**: خۆر ئاوابوون نزیك بۆوە.

**نَزَعَ إلی أهله**: نارەزووی لای ماڵو منداڵی خۆی کردو کەوتە ناڵەو فیغان بۆلایان.

**نَزَعَ عَنْ الأمر**: وازی لەشتەکە هێنا.

**نَزَعَ أباه**: شێوەی چووە سەر باوکی.

**نَزَعَ الشَّیْئَ من مکانه نزعاً**: شتەکەی لەشوێنی خۆی دەرهێناو هەڵی کەند.

**نَزَعَ یده من جیبه**: دەستی لەباخەڵی دەرهێنا.

**نَزَعَ یده من الطاعة**: لەرێو ڕەسمی فەرمانبەرداری چووە دەرو کەوتە سەرپێچی کردنو یاخی بوون.

**نَزَعَ معنی جیداً من الآیة**: مانایەکی جوانی لەئایەتەکە دەرهێنا.

**نَزِعَ نَزَعاً**: قژی ئەملاو ئەولای پێشەسەری هەڵوەرین ٥ **نازَعَ المریض**: نەخۆشەکە لەکاتی گیانەڵاودا زۆری هاتو و هاوار کردو ئازاری زۆر بوو ٥ **نازَعَ نفسه إلی أهله**: دڵی کورکاندی بۆلای ماڵو منداڵی ٥ **نازَعَ فلاناً**: بەربەرەکانی فلانکەسی کرد، کێشەی لەگەڵ نایەوە ٥ **نازع الشَّیْئُ غَیْرَهُ**: شتەکە بەوی ترەوە لکا ٥ **نازَعَ فلاناً الشَّیْئَ**: شتەکەی بۆ ئەو کێش کرد ٥ نازع الرجلُ غَیْرَهُ الکأسَ: پیاوەکە پیاڵە شەرابەکەی دا بە یەکێکی تر ٥ **نَزَّعَهُ من مکانه**: لەشوێنی خۆی هەڵی کەند ٥ **إنْتَزَعَ الشَّیْئُ**: شتەکە هەڵکەندرا ٥ **إنْتَزَعَ عَنْ الشَّیْئِ**: لەشتەکەی دابڕنی، لێی هەڵکێشا ٥ **إنْتَزَعَ الشَّیْئَ**: شتەکەی هەڵکەند ٥ **إنْتَزَعَ للصید سهماً**: تیرێکی بە نێچیرەکەوە نا ٥ **تَنَزَّعَ الی الشَّیْئِ**: پەلەی کرد بۆ شتەکە ٥ **تَنَزَّعَ الشَّیْئَ**: شتەکەی هەڵکەند ٥ **تنازع القومُ**: خەڵکەکە کێشەیان تێکەوت ٥ **تنازع القوم الشَّیْئَ**: خەڵکەکە شتەکەیان بۆلای خۆیان کێش کرد ٥ **إسْتَنْزَعَ فلاناً عَنْ الشَّیْئِ**: داوای کرد لەفلان کە شتەکەی لێ دابڕنێ، لێی وەربگرێ ٥ **المَنْزَعُ**: شوێنی جل داکەندن، شوێنی لێ داڕنین ٥ **المِنْزَعُ**: تیرێك دوور بهاوێژرێ ٥ دەشگوترێ: (رجل مِنْزَع) پیاوێکە بەناخۆشی گیانی دەدا ٥ **المَنْزَعَة**: کێشەو دژایەتی ٥ شوێنی داکەندنی شت ٥ ورەبەرزی و دڵقایمی ٥ **المِنْزَعَة**: کێشەو نیزاع ٥ **النازع**: غەریبو بیانی ٥ **النَّزَاعة**: کێشەو نیزاع.

**النَّزْع**: گیانەڵاو ٥ حاڵەتی گیان دەرچوون ٥ **النَّزَعة**: شوێنی ڕوتانەوەی مو لەملاو لەو لای ناوچەوان ڕوتایی بەنا لاجانگ ٥ ڕێگای ناو کێو ٥ **النُّزعاء من الجباه**: ڕوخسارێك قژی پێشەسەری هاتبنە پێشەوە ٥ موی لاجانگی بەرز بووبنەوە ٥ **النُّزوع**: ئەو کەسەی دەکورکێنێ بۆ وڵاتو بیری زێدو نیشتمانی دەکاتەوە ٥ دەشگوترێ: (بئر نَزوع) بیرێکە پڕە لەئاو بەدەست دەتواندرێ ئاوی لێ دەربێندرێ ٥ (فلاة نَزوع) دەشتێکی دورو درێژە ٥ **النَّزیع**: هەڵکەندراو ٥ لێکراوە، چندراو ٥ دەگوترێ: (ثَمر نزیع) میوەیەکی چندراوە ٥ پیاوی دوور کەوتە لەوڵاتو نیشتمانی خۆی کەیادی وڵات بکاتەوەو بۆی بکورکێنێ ٥ (مکان نزیع) شوێنێکی دوور (فرس

نزيـع) ئەسپی ڕەسـەن ٥ **النَّزيعـة مـن النسـاء:** ئافرەتێـك شـوبكا بـە بێگانـە، بـەپیاوێك لەعەشیرەتی خۆی نەبێ ٥ ڕەشەبای وێرانكار ٥ ئەوەی لەبێگانە ستێندرابێ.

**نَزَغَ** بين القوم: نێوانی خەڵكەكەی تێك دا، ئاژاوەی خـستە نێوانیانـەوە ٥ هەنـدێكیان هـەڵنان بۆئەوەی ستەم لەوانی تر بكەن.

**نَـزَغَ** فلانـاً: زەبـری لەفلانكـەس دا بەدەسـت یـان بەڕمب ٥ لە پاشملە بەخراپی باسی فلانـی كـرد ٥ **النَّـزاغ:** پیـاوی فیتنـەو ئاشـوبگێڕ ٥ **النَّـزغُ:** قسەیەك كە بە مەبەستی فیتنەیی‌و دووزمـانی بگوترێ ٥ (نزغ الشیطان) وەسوەسەو ختوكـەی شـەیتان كـە مـرۆڤ هەڵـدەنێ بـۆ تـاوانكردن ٥ **النَّزغَـةُ:** زەبـر ٥ نقورچـك ٥ **النَّزیغَـة:** قـسەی ناشیرین ٥ دەگوترێ: (نزغـە بنزیغـة) قـسەیەكی ناشیرینی ئاراستەكرد.

**نَزَفَ الشَّيْئَ:** شتەكە بڕایەوە فەوتا، لەناوچوو، تـێ شكا.

**نَـزَفَ** فـلان في الخـصومة: فلانكـەس لەكێـشەو نیزاعەكەدا بۆڕی خواردو تێ شكا ٥ **نَزَفَ الـدَّمْعَ أو المالَ:** فرمێسكی نـەمان، ماڵ‌و سامانی لـەناو برد ٥ **نَزَفَه الفَزَعُ:** ترسی لەلا نەهێشت.

**نَزَفَ الدمُ:** خوێنی كەم بوو بەهۆی زۆر لێ هاتنـە دەرەوەی.

**نُزِفَ** فلان نزفـاً: فلانكەس خوێنی لەبـەر ڕۆیـی‌و بێهێز بوو.

**نُزِفَ عقلـه:** بـەهۆی سەرخۆشی یان شتی تـرەوە عەقڵی نەما ٥ **أنْزَفَ فلان:** فلانكەس هیچی نەما ٥ دەشـگوترێ: (جادلتـە حتـی أنـزف) لەگـەڵی پێـداهاتم‌و چـووم تاهیـچی بەدەسـتەوە نـەما بـۆڕدرا ٥ دەشـگوترێ: (شـرب خمـراً فـأنزف) شـەرابی خـواردەوەو سـەرخۆش بـوو ٥ **أنـزَفَ الـشَّيْئَ:** شـتەكەی بڕانـدەوە تـەواوی كـرد ٥ **المِنْزاف:** دەگـوترێ: (معـز مِـنـزاف) بزنێكـە زوو شیری هەبوو ئێستا شیرەكەی وشكی كردووە ٥ **المِنْزَفَـةُ:** ئـەو شـتەی ئـاوی پـێ هەڵـدەهێنجی ٥ **النـازِف:** دەگـوترێ: (عـرق نـازف) دەمارێكـە خوێنی پێدا نایە ٥ **نَـزافِ:** (إسـم فیعلـە) بـەمانا (إنْـزَف) دێ ٥ **النُّـزْف:** ئـاوی هەڵێنجنـدراو ٥ زەعیفـی‌و لاوازییـەك بـەهۆی زۆر خـوێن لێ هاتنـەوە پەیـدا بووبـێ ٥ برینێـك خـوێنی نەوەسـتێ ٥ **النُّزْفَـةُ:** ئـاوی كـەم ٥ چۆڕە ئـاو ٥ **النَّزُوف:** دەگوترێ: (بئر نزوف) بیرێكە ئاوی كەم تێدایە ٥ **النَّزیف:** تـادار ٥ دەشگوترێ: (سكران نزیف) سەرخۆشێكە عـەقڵی لەلانـەماوە ٥ (بئـر نزیف) بیرێكە كەم ئاوە ٥ (رجل نزیف) پیاوێكە تینویـەتی هـەموو ڕەگـی جەسـتەی وشـك بوونـەوە، زەمـانی وشـك بـووە ٥ كەسێك زۆری خوێن لەبـەر ڕۆیشتبێ‌و لاواز بووبـێ ٥ هـەروا وشەی (النَّزیف) ناوە بۆ بەربوونی خوێنی لوت، یان هاتنەدەرەوەی خوێن لەدەم‌و پوك‌و شوێنی وا ٥ بـــەهۆی نەخۆشـــییەكەوە ٥ یـــان بریندارِبوونەوە.

**نَـزَقَ** الفـرسُ: ئەسـپەكە بـازی داو بـەگورجی پێشكەوت.

**نَزَقَ** الإناءُ والغديرُ: زەرفەكە یـان زلكاوەكە پڕبوو لەئاو.

**نَزِقَ** الإناءُ: قاپەكە لێوان لێو پڕبوو.

**نَـزَقَ الرَّجـلُ:** پیاوەكـە هەڵچوو و تـوڕە بـوو ٥ چوسـت‌و چـالاك بـوو ٥ **أنْـزَقَ فـلان:** فلانكـەس دوای ئـەوەی لەسـەرەخۆو پـشو درێـژ بـوو حەوسەڵەی نەماو توڕەبوو ٥ **أنْـزَقَ في الـضَّحْك:**

زۆر پێکەنی ٥ **أنزقَ الفرسَ**: ئاوزەنگی لە ئەسپەکەدا بۆئەوەی غاربکا ٥ **أنْزَقَ النعيمُ فلاناً**: نازونیعمەت فلانکەسی چوستو تەڕدەماغ کرد ٥ **مازَقَهُ مُنازَقَةً ونِزاقاً**: جوێنی پێدا ٥ **نَزَّقَهُ**: بەمانا (أنْزَقَه) دێ ٥ **تنازق الرجلان**: دووپیاوەکە جنێویان بەیەکتر دا ٥ **المُنازِق**: زۆربڵێ چەقەچەناو ٥ **النَّزاق من الحيوان**: حەیوانی سەر ڕەق و چەموش ٥ خۆشڕۆ ٥ **النَّزَقُ**: چوستو چالاك لەهەموو کارێك دا ٥ دەگوترێ: (في كلامه نَزَق) لەقسەکردن دا پەلە دەکا ٥ پەلەکردن لەئیش دا بەشێوەی بێ عەقڵیو گێلانە ٥ شوێنی نزیك ٥ **النَزِقَةُ من الحيوان**: ئاژەڵو وڵاخی چەموشو سەر ڕەق.

**نزك فلاناً**: بەنەیزەك لەفلانی دا ٥ ڕەخنەی لێ گرتو بەناڕەوا تانەو تەشەری لێ دا ٥ **النَّزاك**: ڕەخنەگرو تانەو تەشەر دەر لە خەڵك ٥ **النَّزك**: بەمانا (النَّزاك) دێ ٥ **النَّزيك**: عەیبدار ٥ **النَّيْزَك**: ڕمبی کورت ٥ قەبارەیەکی ئاسمانییە، لەبۆشایی دا هاتوچۆ دەکا، کەنزیك بەزەوی بۆوە گڕدەگرێو دەسوتێ، وادەزانی ئەستێرەیەو دەکەوێتە خوار.

**نزل نزولاً**: لەبەرزاییەوە دابەزی بۆ نزمایی ٥ دەگوترێ: (نزل فلان عَنْ الأمر والحق) فلانکەس وازی لەعەدالەتو حەق هێنا.

**نزل بالمكان وفيه**: لەشوێنەکە دابەزیو تێیدا مایەوە.

**نَزَلَ على القوم**: بوو بەمیوانی خەڵکەکە.

**نَزَلَ به مكروه**: ناخۆشی توش بوو.

**نَزَلَ الحاجُ**: حاجیەکان لەعەرەفاتەوە هاتنە مینا.

**نَزَلَ على إرادة زميله**: چووە سەر ڕای هاوەڵەکەیو بەگوێی کرد.

**نَزِلَ فلان نِزالةً**: فلانکەس سەفەری کرد.

**نَزِلَ نَزْلَةً**: کۆکەو هەلامەتی توش بوو.

**نَزِلَ الزرْعُ**: کشتوکاڵەکە گەشەو نیمای کرد.

**نَزِلَ المكانُ**: شوێنەکە بەهۆی پتەوی گڵەکەیەوە بە بارانێکی کەم ئاوی لەسەر ڕۆیی ٥ **أنزَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دابەزاند، ناردیە خوارەوە ٥ دەگوترێ: (أنزل الله كلامه على أنبيائه) خودا سروشی خۆی دابەزاندوە بۆسەر پێغەمبەرەکانی ٥ **أنزل حاجته على كريم**: هیوای خستە سەر پیاوی مەردو سەخی سروشت بۆ دابین کردنی پێویستییەکانی خۆی ٥ **أنزل الضَّيْفَ**: میوانەکەی دامەزراندو پێداویستی بۆ جێبەجێ کرد ٥ **نازله في الحرب**: لەشەڕدا ڕوبەڕوی بۆوە بۆئەوەی لەگەڵی دا بجەنگێ ٥ **نازَل فلان الناس في سفره وحضره**: فلانکەس لەگەڵ خەڵکەکە دابەزی، بووبە میوان ٥ **نَزَّل الشَّيْءَ**: شتەکەی دابەزاند ٥ دەق بەمانا (أنزل) دێ ٥ **نَزَّلَ القوم**: خەڵکەکەی لەمەنزڵو خانوودا نیشتەجێ کرد ٥ **نَزَّلَ الشَّيْ**: شتەکەی خستە شوێنی تایبەتی خۆی ٥ دەشگوترێ: (نَزَّل هذا مكان هذا) ئەوەی لەشوێنی ئەم دانا ٥ **تنازَلَ القوم**: خەڵکەکە هەرتاقمەیان چووە بەرامبەر تاقمێکی دوژمنو شەڕیان لەگەڵ دا کردن ٥ **تنازل القوم في السفر**: خەڵکەکە لەسەفەردا هەر ژەمەو لای یەکێك نانیان خوارد. ٥ **تنازل عَنْ الحق**: وازی لە حەقو ڕاستی هێنا ٥ **تَنَزَّلَ**: بەهێواشی دابەزی ٥ **إسْتَنْزَلَه**: بەمانا (أنزله) دێ ٥ **إسْتَنْزَلَ فلاناً**: داوای دابەزینی لەفلانکەس کرد ٥ **إسْتَنْزَلَ فلاناً عَنْ حقه أو رأيه**: داوای کرد فلانکەس واز لە حەقی خۆی بێنێ ٥ دەشگوترێ: (أُستُنْزِلَ فلان) فلانکەس لەپلەو پایەی خۆی هێنرایە خوار ٥

المَنْزَلُ: دابەزین، دابەزاندن ◊ المَنْزِلُ: شوێنی لێ هەڵێنجان ◊ خانوو مەنزڵ ◊ مەدارو شوێن ڕێگەی مانگ، ڕێڕەوی مانگ کە پێیان دا دەڕواو بەدەوری زەوی دا دەخولێتەوە، هەرشەوە لە ڕێڕەوییەکیان دایەو هەڵە ناکاو بەمو لە ڕێڕەوی خۆی لانادا ◊ مانگ بیست مەنزڵی هەیە هەر مەنزڵەو ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە وەکوو: (السّرطان، البطین، الثریا، الدّبران....) ◊ ساڵ چواروەرزەو هەر وەرزەی هەشت مەنزڵی هەیە ◊ المُنْزَلُ: نازڵکردن ◊ ئەو شوێنەی شتەکەی تێدا دادەبەزێ ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا﴾ ◊ المَنْزِلَةُ: خانو و مەنزڵ ◊ پلەو پایە ◊ دەگوترێ: (لە منزلة عند الأمیر) (وهو رفیع المنازل) ◊ النّازِلَةُ: بەڵاو کارەساتی گەورە ◊ النُّزالَةُ: ڕەوانبوونی ئاو بەسەر زەوی دا بەهۆی کەمترین بارینی بارانەوە لەبەر ئەوەی زەوییەکەی توندو پتەوە ◊ النُّزالَةُ: میوانداریی ◊ دەشگوترێ: (هو من نزالة سوء) ئەو لەنزادو ڕەچەڵەکێکی نارەسەنە ◊ النَّزّالُ: کەسێك زۆر دابەزێ زوزوو دابەزێ ◊ زۆر ببێتە میوانی خەڵك ◊ یان زۆر شەڕو بەربەرەکانی بکا ◊ النَّزَلُ: شوێنێك خەڵك لێی دابەزێ ◊ دەگوترێ: (موضعٌ نَزَلٌ) ◊ هەروا دەگوترێ: (رجل ذو نزل) پیاوێکی خاوەن ڕێزو بەخشش ◊ هەروا دەگوترێ: (فلان لیس بذي طعم ولیس بذي نَزَل) فلانکەس نەعەقڵی هەس نەزانستو نەدەب ◊ هەروەها دەگوترێ: (سحاب ذو نزل) هەورێکی باراناوییە ◊ (طعام کثیر النزل) خواردنێکە بەرەکەت ئامێزە ◊ النَّزِلُ: شوێنێك خەڵك زۆر لێی دابەزێ ◊ دەشگوترێ: (سَحاب نَزِلٌ) هەورێکە بارانی زۆر پێیە ◊ النُّزُلُ: مەنزڵو دیوەخان؛ شوێنێك ئامادەکرابێ بۆ میوان نانی لێ بخواو تێیدا بنوێ ◊ عەتاو بەخشش ◊ خێرو بەرەکەت ◊ النُّزْلَةُ: ئیلتیهابو هەوکردنی لوتو بۆری هەناسە ◊ دەشگوترێ: (أرض نزلة) زەوییەکە کشتوکاڵی باشی تێدا دەڕوێ ◊ النُّزْلَةُ: خواردن کە دروست بکرێ بۆ دۆستو ناسیاو ◊ النزیل: میوان ◊ یان نیشتمەنی لەماڵ دا یان لەنیشتمان دا ◊ دەگوترێ: (فلان نزیلي) فلانکەس لەگەڵم دا لەخانوەکەدایە بەیەکەوە لەخانوێکداین ◊ دەشگوترێ: (طعام نزیل) خواردنێکی بەرەکەت ئامێزە ◊ (ثوب نزیل) کراسێکی تەواوە هیچ کەمو کورتی تێدا نیە ◊ نَزْنَزَ: سەری خۆی بادا ◊ نَزْنَزَ المکانَ: شوێنەکە بەردەوام زۆنگاو بوو ◊ نَزْنَزَ الأمُ صَبِیَّها: دایکەکە منداڵەکەی هەڵپەڕاند.

نَزَهَ الدَّوابَ؛ ولاخەکەی لەئاوەکە دوور خستەوە.

نَزِهَ المکانُ: شوێنەکە ئاو و هەوای خاوێن بوو.

نَزِهَ فلان: فلانکەس لەهەموو خراپیو بەد ڕەوشتییەك دوورە ◊ نَزِهَت الأرضُ: زەوی بەگیاو گژو گوڵو گوڵزار خۆی ئارایش دا ◊ نَزَّهَهُ عَنْ الشَیْئِ: ئەوی لەشتەکە دوورخستەوە.

تَنَزَّهَ عَنْ الشَیْئِ؛ لەشتەکە دوور کەوتەوە، خۆی بەدوور گرت لە شتەکە ◊ تَنَزَّهَ فلان: فلانکەس ڕۆیشتە دەرەوە بۆ سارا بەمەبەستی پیاسەو کەیفو صەفا ◊ إسْتَنْزَهَ عَنْ الشَیْئِ: لەشتە خراپو ناپەسەندەکە خۆی بەدوور گرت ◊ یان هەوڵی دا بڕوا بۆ پیاسەو سەیران ◊ المُتَنَزَّهُ: شوێنی پیاسەو سەیران ◊ المُنْتَزَهُ: بەمانا (المُتَنَزَّه) دێ ◊ المَنْزَهُ: شوێنی دوور ◊ النّازِهُ: دەگوترێ: (فلان نازه النفس) فلانکەس دڵو دەروون پاکە ◊ النَّزاهَةُ: دوورکەوتنەوە لەگوفتاری خراپ

ڕەوشتی ناپەسەندو شتی گوماناوی ٥ النَّزْهُ: دەگوترێ: (هو نزه الخُلُقِ) ئەو ڕەوشت بەرزو دەرون خاوێنە ٥ النُّزْهَة: پیاسە ٥ شوێنی دوور ٥ دەگوترێ: (هو يَنْزَهُ عَنْ كذا أو منه) ئەو لەو شتە دوورە ٥ النُّزَهي: دەگوترێ: (رجل نزهي) پیاوێکە زۆر دەچێ بۆ دەرەوە بۆسەیرانو پیاسە.

**نَزَا الفَحْلُ**: کەڵەکە خۆی هاویشتە سەر مێینەکە ٥ هەروا دەگوترێ: (نزا به قلبه الى الشَّيْ) دڵی بۆ لای شتەکە چوو حەزی لێ کرد ٥ (نزا بە الشرّ) شەڕ رایپەڕاندو خستیە جەمو جوڵ.٥ أنْزاهُ: وای لێکرد هەڵپەڕێ ٥ نَزّاه: بەمانا (أنزاه) دێ ٥ تَنَزّى إليه: بازی بۆداو هەڵمەتی بردێ ٥ إنْتَزى على الشَّيْ: سواری شتەکە بوو ٥ النازية: توندو تیژیو چوستو چالاکی ٥ أكمة نازية: تەپۆڵکەیەکە لەتەپۆڵکەکانی تر بەرزترە ٥ (نوازي الخمر) ئەو بڵقو کەفو شتەیە کەدەکەوێتە سەر پیاڵە شەراب دوای ئەوەی ئاوی تێکەڵ دەکرێ ٥ النّازية: ڕژێمێك بوو وەکوو فاشیزم لەئەڵمانیا سەری هەڵداو ساڵی (١٩٣٣ز) هیتلەری گەیاندە تروپکی دەسەڵاتو توندڕەویو فاشیەتی هیتلەر جەنگی جیهانی دووەمی لێ کەوتەوە ٥ النَّزّاء: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نزا) دێ. دەگوترێ: (إنّه لنَزّاءٌ الى الشرّ) ئەو کابرایە شەڕەنگێزەو هەمیشە منەی شەڕیەتی ٥ النَّزَوان: هەڵچونو توندو تیژی ٥ النَّزيُّ: بەمانا (النزاء) دێ ٥ النُّزية: بارانی لەناکاو ٥ یان هەرکارو ڕوداوێکی چاوەڕوان نەکراو ٥ نَسَأَت الماشية نَسْأً ومَنْسَأً: ئاژەڵەکە قەڵەو بوو یان قەڵەوی لێ دیاریی دا.

**نَسَأَ الشَّيْ أو الأمرَ**: شتەکەی دواخست.

**نَسَأَ الدينَ**: قەرزەکەی دواخست (نَسَأَ البيعَ) مامەڵەی کڕینو فرۆشتنەکەی دواخست.

**نَسَأَ الإبلَ عَنْ الحوض**: حوشترەکانی لەبردن بۆسەر ئاو دواخست.

**نَسَأَ الدّابَّةَ بالمنسأة**: بەدار عەصا لەوڵاخەکەی دا.

**نَسَأَ اللَّبَنَ**: شیرەکە یان ماستەکەی تێکەڵاوی ئاو کرد بۆئەوەی زۆر ببێ، یان کەمێك تامی ترشی لێ کەم بێتەوە.

**نَسَأَ فلاناً**: شەرابی کەسکونی دا بە فلانکەس ٥ نَسِئَت المرأةُ: ئافرەتەکە عادەی مانگانەی لەکاتی خۆی دواکەوت گومانی ئەوەی لێ دەکرێ سکی هەبێ ٥ أنْسَأَ عنه: دواکەوت دوورکەوتەوە ٥ أنْسَأَ الشَّيْءَ: بەمانا (نَسَأَهُ) دێ ٥ إنْتَسَأَ: دواکەوت دوورکەوتەوە ٥ إسْتَنْسَأَهُ: داوای مۆڵەتو دواخستنی کرد ٥ إسْتَنْسَأَهُ الدين: داوای دواخستنی قەرزەکەی کرد ٥ المِنْسَأَة: دارعەصای قایمو پتەو ٥ گۆچانی شوان ٥ النَّسَاءُ: دواخستن ٥ النَّسْءُ: شەرابی کەسکون کە زۆر سەرخۆشکەر بێ ٥ ماستاوی ڕون یان شیر کەمزۆری ئاو تێکەڵ کرابێ ٥ قەڵەوی.٥ النَّسْءُ: دەگوترێ: (هو نِسْءُ نساء) ئەو پیاوە ژنانییە هەمیشە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ژن دایە تێکەڵاوی ئافرەتە ٥ النُّسْأَةُ: دواخستن ٥ دەگوترێ: (باعە بِنُسْأَة) شتەکەی بەقەرز فرۆشت ٥ النُّسُوءُ: شیر کە بمێنێتەوەو بترشێ ئەمجار ئاوی تێ بکرێ بۆئەوەی ترشییەکەی کەم بێتەوە ٥ النَّسِيءُ: دواخستن ٥ لەسەردەمی پێش ئیسلام دا عەرەبەکان ڕێزو شکۆی مانگی موحەرەمیان دواخست بۆ مانگی سەفەر بەم جۆرە دواخستنەیان دەگوت (نَسِيء) ٥ النسيئة: قەرزی دواخراو ٥ دەگوترێ: (باعە بنسيئة)

بەقەرز فرۆشتن ٥ (ربا النسيئة) زيادەو سودێك بەهۆی دواخستنی قیمەتی كالآكەوە دەست خاوەن كالآ بكەوێ.

نَسَبَ الشاعر بفلانة نسيباً: شاعیرەكە گێڕۆدەی دڵداریی فلآن ئافرەت بوو.

نَسَبَ الشَّيْءَ: شتەكەی وەصف كردو رەنگو ڕیشەی شی كردەوە.

نَسَبَ فلاناً: داوای لە فلآن كرد نژادی خۆی ڕونبكاتەوە.

نَسَبَ الشَّيْءَ الى فلان: شتەكەی پاڵ فلآن دا.

أنسَبَت الريحُ: ڕەشەباكە بەهێز بوو گڵو زیخی ڕادا ٥ ناسَبَ فلاناً: لە نژاد دا هاوبەشی فلآن بوو ٥ لەگەڵ فلآن دا گونجا، پێكەوە هەڵیان كرد ٥ إنتَسَبَ: نژادی باس كرد ڕەچەڵەكی شی كردەوە ٥ إنتَسَبَ الى فلان: خۆی نیسبەت دا بۆلای فلآن ٥ تَناسَبَ الشيئان: دوو شتەكە هاوشێوە بوون ٥ تَناسَبَ القوم الى أحسابهم: خەڵكەكە خۆیان بردەوە سەر نەسەبو حەسەبی خۆیان ٥ تَنَسَّبَ الى كذا: خۆی پاڵدا بۆلای ئەو شتە ٥ إستَنسَبَ فلاناً: داوای لەفلآن كرد نژادو ڕەچەڵەكی خۆی ڕون بكاتەوە ٥ التَّناسُب: لێكچوون ٥ المَنسوبُ: پاڵدراو، ئیسمی مەفعولە لەمادەی (نَسَبَ) وەكوو (كوردستانی، ئێرانی، توركی) ٥ دەشگوترێ: (شعر منسوب) شیعرێكە سۆزی دڵداری تێدایە ٥ (خط منسوب) خەتێكە قاعیدەی هەس ٥ منسوب الماء في النهر: ئەو شوێنەی لەڕوباردا ئاو دەیگاتێ ٥ ئەو ئاستەی كە ئاوەكە لەكاتی بەرزبوونەوەی دا دەیگاتێ ٥ النَّسّاب: شارەزا لە نژادو ڕەچەڵەكی هۆزو گەلو نەتەوەدا ٥ النَّسّابَةُ: بەمانا زۆر شارەزا لەبواری نژادو ڕەچەڵەك ٥ النَّسَبُ: خزمایەتی ٥ دەگوترێ: (نسبه في بني فلان) خزمایەتی لەگەڵ هۆزی فلآن دا هەیە، یەكێكە لەو هۆزە ٥ النِّسْبَةُ: خزمایەتیو پەیوەندی ٥ النِّسْبِيَّةُ: ڕێژەیی ٥ النَّسيبُ: موناسیب ٥ شیعری دڵداری ٥ دەشگوترێ: (رجل نسيب) پیاوێكی شەریفو وەجاخزادەیە ٥ نَسَجَت الناقة نَسجاً: حوشترەكە خێرا خێرا هەنگاوی نا.

نَسَجَ الثوبَ: قوماشەكەی چنی.

نَسَجَ الغيثُ النباتَ: باران گژوگیاكەی ڕواندو گەشەی پێ كرد تا تێكهاڵاو چڕو پڕ بوو.

نَسَجَ الشاعر الشِّعْرَ: شاعیرەكە شیعرەكەی هۆنیەوە.

نَسَجَ الزور: درۆو دەلەسەی هەڵبەست.

نَسَجَ الكلامَ: قسەكەی پوخت كرد، داڕشتەوە ٥ إنْتَسَجَ الثوبُ: قوماشەكە چندرا ٥ المَنسَجُ: شوێنی چنین ٥ المِنسَجُ: مەكوك ٥ النِّساجَةُ: پیشەی جۆلآیی ٥ النَّسّاجُ: جۆلآ ٥ ئەوەی قوماش دەچنێ ٥ النَّسيجُ: چندراو ٥ دەشگوترێ: (هو نسيج وحْدِهِ) ئەو پیاوە وێنەی نیە لە عیلمو زانیاری دا، یان لەشتی تردا.

نَسَحَ التراب نَسحاً: گڵو خۆڵەكەی بەربادا، یان بەرزی كردەوە.

نَسِحَ فلان نَسْحاً: فلآنكەس تەماعی بوو ٥ المِنْساحُ: شتێكە گڵی پێ دەردەدرێ ٥ گڵی پێ هەڵدەدرێتەوە ٥ النُّسَاحُ: ئەوەی لەخورما هەڵدەوەرێ لە توێكڵو شكەڵ ٥ النُّسْحُ: بەمانا (النُّسَاحُ) دێ.

نَسَخَ الشَّيْءَ نَسْخاً: شتەكەی سڕیەوە لایبرد ٥ دەگوترێ: (نَسَخَت الريح آثار الديار) ڕەشەبا شوێنەواری كاولە ڕوخاوەكانی پڕكردەوە،

كوێری كردنەوە ٥ (نَسَخَت الشمسُ الظِلَّ) خۆر سێبەرەكەی لابرد ٥ (نَسَخَ الشیبُ الشَبابَ) پیری دیمەنی گەنجیەتی لابرد.

**نَسَخَ اللهُ الآیَةَ:** خودا حوكمی ئایەتەكەی هەڵگرت، سڕیەوە.

**نَسَخَ الحاكِمُ القانونَ أو الحُكْمَ:** دادوەر یان فەرمانڕەوا قانونەكەی هەڵوەشاندەوە، حوكمەكەی هەڵوەشاندەوە.

**نَسَخَ الكاتِبُ الكتابَ:** نووسەرەكە كتێبەكەی نووسیەوە ٥ نوسخەیەكی تری لە كتێبەكە گرتەوە ٥ **ناسَخَهُ:** لەنووسینەوەدا كێبڕكێی فلانی كرد ٥ بەسەر فلان دا زاڵ بوو ٥ **إنْتَسَخَ الشَیْئَ:** شتەكەی نەسخ كردەوە، پوچەڵی كردەوە.٥ **إنْتَسَخَ الكتابَ:** كتێبەكەی نووسیەوە ٥ **تَناسَخَ الشَیْئان:** یەكێك لەو دوو شتە ئەوی تری سڕیەوە نەسخی كردەوە ٥ **تَناسَخَت الأرواح:** گیانەكان لەچەند جیسمو قەبارەیەكەوە گواستیانەوە بۆ جیسمی تر ٥ **إسْتَنْسَخَ الشَیْئَ:** داوای لابردنی شتەكەی كرد ٥ یان داوای نووسینەوەی شتەكەی كرد ٥ **التناسخ:** (تناسخ الروح) بیرو باوەڕێكە لەناو هیندیو هەندێ نەتەوەی تردا بڵاوبۆتەوە ناوەڕۆكی ئەم بیروباوەڕە ئەوەیە گوایە ئادەمیزاد كەدەمرێ گیانەكەی دەگوازرێتەوە بۆلاشەی زیندەوەرێكی تر لەخۆی پلەو پایە بەرزتر یان نزمتر بۆئەوەی گیانەكە خۆشی بنۆشێ یان سزا بكێشێ لەپاداشو سزای كردەوەی مردوە خاوەن گیانەكە ٥ هەڵگرانی ئەم بیروباوەڕە بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیە ٥ **النّاسِخُ:** ئەو كەسەی پیشەی نووسینەوەی كتێب بێ ٥ **النسخة:** وێنە لە كتێبە نووسراوەكە یان لەنامە نووسراوەكە ٥ **التناسخیة:** تاقمو پێڕێكن بڕوایان بەتەناسوخ هەیەو پێیان وایە زیندوبوونەوە نیە.

**نَسَرَ الطائرُ اللحمَ نَسْراً:** باڵندە گۆشتخۆرەكە گۆشتەكەی لێك هەڵبچڕیو پارچە پارچەی كرد.

**نَسَرَ فلان الشَیْئَ:** فلانكەس شتەكەی پارچە پارچە كرد ٥ گڕوی، سپی كرد ٥ هەڵیوەشاند ٥ دەگوترێ: (نَسَرَ الحَبْلَ) حەبلەكەی هەڵوەشاندەوە ٥ (نَسَرَ الجرحَ) برینەكەی هەڵوەشاندەوە ٥ هەڵی تەقاندەوە.

**نَسَرَ فلاناً:** فلانكەسی شی كردەوە زۆری ڕەخنە لێ گرتو عەیبو عاری لێ دۆزینەوە ٥ **نَسَّرَ الشَیْئَ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَسَرَه) دێ ٥ **إنْتَسَرَ الشَیْئُ:** شتەكە هەڵوەشایەوە ٥ **تَنَسَّرَ الشَیْئُ:** بەمانا (إنْتَسَرَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَنَسَّرَ الجرحُ) برینەكە بەهۆی هەڵتەقینەوەو هەڵپچڕانەوە دەمەكەی فراوان بوو ٥ **تَنَسَّرَ الثوبُ أو القرطاسُ:** قوماشەكە یان كاغەزەكە وردە وردە لێی ڕۆیی‌و كەم بۆوە ٥ دەشگوترێ: (تَنَسَّرَت النعمة عَنْ فلان) نازو نیعمەت لەفلان وردە وردە لاچوو ٥ **إسْتَنْسَرَ الطائِرُ:** باڵندەكە وەكوو هەڵۆی لێ هات لەهێزو توانادا ٥ **المِنْسَرُ:** ئەوەی باڵندە گۆشتو شتی وای پێ لێك دەپچڕێ ٥ یان ناوە بۆ چنگو نینۆكی دەعبای گۆشت خۆر: كە بەنینۆكی گۆشت لێك دەپچڕێ ٥ ڕەوە نەسپ ٥ كۆمەڵێك سوپا وەكوو پێشەنگ لەپێش سوپاوە دەڕۆن.٥ **المُنَسِّرُ:** كۆمەڵە دز ٥ **الناسور:** مایەسیری ٥ **النَّسْرُ:** هەڵۆ، یان باز دەعبایەكی گۆشت خۆرە لەهەموو باڵندە گۆشتخۆرەكان گەورەترە ٥ دەندوكێكی خواری هەیە قەراخی دەندوكی برگە برگەی تیژی هەیە چنگی كورت باڵەكانی درێژن، بەزۆری حەزی لەلاكە تۆپیوە، زۆری

برسی نەبێ پەلاماری حەیوانی زیندو نادا ٥ لەناوچەی گەرمەسێرو ئاو و هەوا مامناوەندی دا دەژی ٥ **النَّسْر الطائر**: کۆمەڵە ئەستێرەیەکن دەشوبهێنە باز ٥ **النَّسِيكَةُ**: پارچە گۆشتی بچوك کە کولابێ ٥ **النَّسْرِينُ**: جۆرە گوڵێکی سپی بۆنخۆشی کەسکونە.

**نَسَّ الشَّيْءُ**: شتەکە وشك بوو ٥ دەگوترێ: (نَسَّ الخبز في التنور) نانەکە بەتەندورەکەوە وشك بۆوە.

**نَسَّ فلان**: فلانکەس زۆری تینو بوو.

**نَسَّ فلان**: فلانکەس تاوداتە هەر ئیشێك تا تەواوی نەکا وازی لێ ناهێنێ

**نَسَّ الحطبُ** نسِيساً: دارەکە بە ئاگرەوە نراو لەسەرەوەی کەفی دەردا ٥ دەشگوترێ: (نَسَّ لفلان) بۆ فلانکەسی هەڵبژێرە.

**نَسَّ بين القوم**: نێوانی خەڵکەکەی تێك دا فیتنەجۆیی لەناویان دا بەرپا کرد.

**نَسَّ الدابة نَساً**: وڵاخەکەی لێ خوڕیو تێی ڕاخوڕی ٥ **أَنَسَّ الشَّيْءُ**: شتەکە ئەوپەڕی هێزی کەوتەسەر ٥ **أَنَسَّ الدابةُ**: وڵاخەکەی تینو کرد.

**نَسْنَسَ الصَّبِيَّ**: بەمنداڵەکەی گوت (اس اس) بۆئەوەی میز بکا یان پیسایی ٥ **تَنَسْنَسَ منه خبراً**: تکای لێ کرد هەواڵی بداتێ ٥ **المِنَسَّةُ**: عەصاو گۆچانی ئەستوور ٥ **المنسوس**: دەرکراو، ڕەتێندراو ٥ **النَّسَّاسُ**: فیتنە ٥ **النَّسِيسُ**: بەمانا (المنسوس) دێ ٥ ئەوپەڕی توانا ٥ کەفی داری تەڕ کە بەئاگرەوە دەنرێ لەسەریەوە کەف دێتە دەر ٥ پاشماوەی گیان ٥ دەگوترێ: (بَلَغَ الرجلُ نَسِيسَهُ) پیاوەکە کەوتە گیانەڵاوەوە هەندێکی گیان تیاماوە ٥ **النَّسِيسَةُ**: فیتنەیی ٥ ئاژاوە نانەوە ٥ کەفی دار کە سەرێکی لەناو ئاگردایەو سەرەکەی تری کەفی لێ دێتەدەر.

**نَسَغَ الشَّيْءُ**: شتەکە درێژ بوو ٥ **نَسَغَت الأسنانُ**: ددانەکە پوك جوان لەخۆی نەگرت و لەقی.

**نَسَغَ فلانٌ في الأرض**: فلانکەس بەزەوی دا ڕۆیشت ٥ **أَنْسَغَ فلان**: فلانکەس زیانی بۆ هاوسێکانی هەبوو ٥ **نَسَّغَت الأسنان**: بۆ مانای زێدە دێ لەمادەی (نَسَغَ) ٥ **إِنْتَسَغَت الإبلُ ونحوها**: حوشترەکانی لە لەوەڕگاکەیان دا بڵاو بوونەوە ٥ **المِنْسَغَة**: زەوییەك ڕووەکی زۆر درێژ ببێ ٥ **النَّاسِغُ**: دەگوترێ: (عنق ناسِغ) ملی درێژ گەردنی بەرز ٥ **الناسِغَة**: دەگوترێ: (إمرأة ناسِغة) ئافرەتێکە پشتی درێژە یان ددانی درێژن ٥ **النَّسْغُ**: جومگەی دەست (نێوان بەری دەست و مەچەك) ٥ حەبلێکی درێژە، تیلمە چەرمێکی درێژە بوخچەو جانتاو بارو بارگەنەی پێ شەتەك دەدرێ ٥ **النَّسْغَةُ**: پارچەیەك لە تیلمە چەرم یان حەبل ٥ **نَسَغَتْ أسنانُه نَسْغاً**: بنکی ددانەکانی شل بوون پوکی نەرم بوو.

**نَسَغَ فلان في الأرض**: فلانکەس بەوڵاتان دا گەڕا.

**نَسَغَ فلاناً بشيءٍ**: بەشتەکە لەفلانکەسیەوە ژەنی ٥ **نَسَغَت الواشمة الذراع بالأبرة**: خاڵکوتەکە بەدەرزی باسکی کوتا دەرزی هاژنی کرد.

**نَسَغَ فلاناً بكلمة**: بەقسەی ناشیرین تانەی لەفلانکەس دا.

**نَسَغَ اللبنُ بالماء**: شیرەکەی تێکەڵ ئاو کرد ٥ ئاوی تێکەڵاوی شیرەکە کرد ٥ **أَنْسَغَتِ النَّخْلَةُ ونحوها**: دار خورماکە بەرەکەی خراپ بوو ٥ یان دار خورماکە دوای بڕینی هەڵی دایەوە ٥ **أَنْسَغَ فلاناً**: تانەو تەشەری ناڕاستەی فلان کرد ٥

إنتَسَغَ البعير ونحوه: حوشترەکە شوێنی گەستنی زەردەواڵەکەی بەقاچی خوراندی یان کوتای ٥ إنتَسَغَ فلان: فلانکەس کەوتە پشکنین و لێکۆڵینەوە ٥ إنتَسَغَت الإبلُ: حوشترەکان لە لەوەڕگاکەدا بلاو بوونەوە ٥ المِنسَغَةُ: گورزەیەک دەرزی و شتی وا خالکوت بەکاری دەهێنێ بۆ خالکوتان و شتی وا ٥ گورزەیەک لەپەڕی باڵندەو شیشی باریکی ئاسن کەنانکەر کولێرەو نانی پێ کونچ کونچ دەکا ٥ النَّاسِغُ: لێزان و دەست ڕاست لەئاراستە کردنی تیرو گوللەو ڕمب دا ٥ النَّسغُ: ئەو ئاوەی لەدرەخت دێتە دەر کە دەیبڕن و وەرزەکە وەرزی ژیانەوەیەتی کە برینداری دەبێ ئاوی لێدێتەدەر ٥ النَّسِيغُ: عەرەق.

**نَسَفَ** الإناء نَسْفاً: قاپەکە پڕ بوو لەسەریەوە ڕژا.

**نَسَفَ** الماشيُ: ڕێکەرەکە (بەرێدا ڕۆییەوەکە) پەلەی کرد.

**نَسَفَ** الشَّيْءَ: شتەکەی ڕیشەکێش کرد ٥ لەرەگەوە هەڵی کەند ٥ نَسَفَت الدوابُّ الكلأ: ولاخەکە لەوەڕەکەی هەموو خوارد.

**نَسَفَ** الشَّيْءَ: شتەکەی تەفرو تونا کرد ٥ نَسَفَت الريحُ التُّرابَ: ڕەشەبایەکە گڵ و خۆڵەکەی بلاو کردەوە.

**نَسَفَ** الحافِرُ الأرضَ: سمی ولاخەکە زەوییەکەی هەڵکۆڵی.

**نَسَفَ** الشَّيْءَ: شتەکەی لە بێژنگ دا.

**نَسَفَ** الحبَّ بالمِنسَفِ: بەگڵ گیرەکە دانەوێڵەکەی پاک کرد.

**نَسَفَ** الطائرُ اللحمَ بمخلبه: باڵندەکە بەچنگ و نینۆکی گۆشتەکەی لێک هەڵپچڕی.

**نَسَفَ** الحملُ أو الركضُ جَنْبَ الدابةِ: بار یان زین و ئاوزەنگی تووکی لاقەبرغەی ولاخەکەی ڕوتاندەوە.

**نَسَفَ** الحمارُ الأتانَ: نێرەکەرەکە دێڵەکەرەکەی گەست ٥ أنسَفَت الريحُ: ڕەشەبایەکە بەتوندی هەڵبوو زیخ و گڵ و خۆڵی ڕادا ٥ تناسَفَ الرجلان الكلامَ: دووپیاوەکە بەسرتەو ئەسپایی قسەیان لەگەڵ یەکتردا کرد ٥ إنتَسَفَ الكلامَ: قسەی بەهێواشی و لەسەر خۆ کردن ٥ المِنسَفُ: شەنە ٥ بێژەنگ و گڵ گیر ٥ (مِنسَف الحمار) دەمی گوێدرێژ ٥ المِنسَفَةُ: ئامێرێکە بیناو شتی وای پێ لەبێخ دەردەهێندرێ ٥ بێژنگ و گڵ گیر ٥ النُّسافة: ئەو خشت و خاشاکەی لەکاتی ڕوخاندن و دەرهێنانی دیواردا دەکەوێتە خوار ٥ تەپ و تۆزی بەرزەوەبووی ڕێگا ٥ چڵك و ژەنگ کەدەکەوێتە سەر قاپ و قاچاخ و شتی وا ٥ النُّسافة: کەشتییەکی جەنگییە قەلاو شورا دەروخێنی ٥ النُّسفانُ: قاپێك پربێ لە ئاو و لەسەریەوە بڕژێ ٥ النُّسفَةُ: بەردێکی ڕەشی زبرو کونکوناوییە لە حەمام دا بەکاردەهێندرێ بۆ لابردنی چڵکی بەرەپێ ٥ النَّسَفَةُ: بەمانا (النُّسفة) دێ ٥ النَّسوف: دەگوترێ: (بعير نسوف) حوشترێکە بەپێشەوەی دەمی لەوەڕ دەخوا ٥ (فرس نسوف) ئەسپێکی هەنگاو پان و فراوانە ٥ النَّسيفُ: دانەوێڵەی لەبێژنگ دراو ٥ دەشگوترێ: (كلام نسيف) قسەی بەئەسپایی ٥ (ترك فيه نَسِيفاً) شوێنەواری لەسەر جێ هێشت، شوێنی گەستن یان کەوتنی تووك و شتی وای پێوە دیارە ٥ النَّسِيفة: بەردە ڕەشەی گەرماو.

**نَسَقَ** الشَّيْءَ نَسْقاً: شتەکەی ڕێك خست.

**نَسَقَ** الدُّرَّ: گەوهەرەکەی هۆنیەوە.

**نَسَقَ الكُتُبَ:** كتێبەکانی ڕیزکردن.

**نَسَقَ الکَلامَ:** قسەکانی ڕێك کردنو پەیوەندی لەنێوان ڕستەکانی دا دروست کرد ٥ **أَنْسَقَ فلان:** فلانکەس بەشێوەی سەجع ئاخاوت ٥ **ناسَقَ بینَ الأمرین:** دوو کارەکەی پێکەوە گونجاند ٥ **نَسَّقَهُ:** شتەکەی ڕێك خست ٥ **إِتَّسَقَتِ الأشیاءُ:** شتەکانی کەوتنە پاڵ یەکترو پێکەوە گونجان.

تناسَقتِ الأشیاء: بەمانا (إِتَّسَقَت) دێ ٥ دەگوترێ: (تَناسَقَ کَلامُهُ) ڕستەی قسەکانی پێکەوە گونجاو بوون ٥ **تَنَسَّقَتِ الأشیاءُ:** بەمانا (إِتَّسَقَتْ) دێ ٥ **النَّسَقُ:** (حروف النَّسَق) حوروفی عەتف ٥ ئەو پیتانەی کەلام دەخەنەوە سەریەكو ڕستەکان پێکەوە دەبەستنەوە ٥ **النَّسَقُ:** هەرشتێك لەسەر یەك یاساو تەوەرە دامەزرابێو بڕوا بەڕێوە ٥ **النَّسِیقُ:** ڕێکخراو، گونجاو ٥ ڕێك کراو.

**نَسَكَ** فلان: فلانکەس دونیا نەویست بوو، ڕوی لەخودا پەرستی کرد ٥ کوشتی سەربڕی بۆ ڕەزامەندیی پەروەردگار.

**نَسَكَ الثَّوْبَ نَسْكاً:** قوماشەکەی بەئاو شتو پاکی کردەوە.

**نَسَكَ الأرضَ:** زەوییەکەی پاك کردەوە بژاری کرد ٥ زبڵی کیمیاوی پێوە کرد.

**نَسَكَ البَیْتَ:** هاتە ناو خانوەکە.

**نَسَكَ الى طریقة جمیلة:** ڕوی کردە ڕێبازێکی ڕاستو جوانو خودا پەرستی پاك ٥ **إِتَّسَكَ:** دونیا نەویستی ڕەچاو کردو سەرگەرمی خوا پەرستی بوو ٥ **تَنَسَّكَ:** بەمانا (إِتَّسَكَ) دێ ٥ **المَنْسِك:** ڕێبازی دونیا نەویستیو خودا پەرستی ٥ هەروا وشەی (المَنْسِكُ) ناوە بۆ شوێنی قوربانی سەربڕین ٥ **مناسك الحج:** عیباداتو ڕێو ڕەسمەکانی ئەنجامدانی حەج ٥ **المَنْسوكة:** دەگوترێ: (فرس مَنْسوكة) ئەسپێکی ڕوتو بێ توکە ٥ **النّاسِك:** خودا پەرستو دونیا نەویست ٥ دەشگوترێ: (عشب ناسك) ڕوەکێکی زۆر سەوزە ٥ **النّاسِكَةُ:** ئافرەتی خودا پەرستو دونیا نەویست ٥ دەشگوترێ: (أرض ناسكة) زەوییەکی سەوزو تازە باران لێ باریوە ٥ **النُّسْكُ:** هەر مافێکی خودا بەسەر بەندەکانیەوە ٥ قوربانی کوشتی ٥ **النُّسُكُ:** بەمانا (النُّسْكُ) دێ ٥ **النَّسِیکَةُ:** قاڵبە زیوی خاڵیص ٥ قوربانی کوشتی.

**نَسَلَ الشَّیْئُ نَسولاً:** شتەکە جیابۆوە، لێ بۆوە ٥ کەوتە خوار ٥ دەگوترێ: (نَسَلَ ریش الطائر) پەڕی باڵندەکە کەوتە خوار.

**نَسَلَ الثوبُ عَنْ الإنسان:** پۆشاکەکە لەمرۆڤەکە بۆوە.

**نَسَلَ** فلان **نَسْلاً:** فلان وەچەو نەوەی زۆر بوو.

**نَسَلَ** الماشي: ڕێکەرەکە خێرا ڕۆیی.

**نَسَلَ الوَلَدَ:** منداڵی بوو ٥ دەشگوترێ: (نَسَلَ بوالد).

**نَسَلَ الحیوانُ نَسْلاً:** ئاژەڵەکانی وەبەرهێنان، ڕایگرتنو بەخێوی کردن بۆ زاو و زێو بەروبووم.

**نَسَلَ الشَّیْئَ:** شتەکەی لێ کردەوە، جیای کردەوە ٥ دەگوترێ: (نَسَلَ ریش الطائر) پەڕی باڵندەکەی دەرکێشا ٥ (نَسَلَ الصوفَ) خورییەکەی بڕییەوە لەمەڕەکە ٥ **أَنْسَلَ الشَّیْئُ:** بەمانا (نَسَلَ) دێ ٥ **أَنْسَلَ الحیوانُ:** حەیوانەکە بێچوی بوو ٥ **أَنْسَلَ فلان:** فلانکەس ئاژەڵەکانی کاتی زاو و زێیان هات نزیکە بێچویان ببن ٥ **أَنْسَلَتِ الدابة:** وڵاخەکە، حوشترەکە کاتی ئەوەی هاتووە توك بەربدا، کوڵکەکەی لێ ببێتەوە ٥ **أَنْسَلَ في عدوه:**

لەبازدان و ڕاکردنی دا پەلەی کرد ٥ أَنسَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی لێ کردەوە جیای کردەوە ٥ إِنْتَسَلَ الشَّيْءُ: بەمانا (نَسَلَ) دێ ٥ تناسَلَ القوم: خەڵکەکە زاو و زێیان کردو زۆربوون ٥ تناسَلَ بنو فلان: فلان هۆزو بنەماڵە وەچەو نەوەیان زۆر بوون ٥ الناسِلُ: خێراو بەپەلە ٥ النَّسالُ: ئەوەی هەڵدەوەرێ لەخوری و موو کوڵك لەکاتی برینەوەو لێکردنەوەی دا ٥ النَّسَلان: خێرا ڕیشتنی گورگ ٥ النَّسْلُ: منداڵ و نەوە ٥ النَّسَلُ: شیر کەلەهەنجیری کاڵ دێتەدەر لەکاتی لێکردنەوەی دا ٥ النُّسُولُ: خێرا و گورج لەڕاکردن و بازدان دا ٥ النُّسُولَةُ من الماشية: ئەو ئاژەڵەی ڕابگیرێ بۆ زاو و زێ بۆ بەرهەمهێنان ٥ النَّسِيلُ: بەمانا (النُّسالُ) دێ ٥ ڕاوی هەنگوین کە لەکەرەشانەکەی جیابکرێتەوە ٥ النَّسِيلَة: تاکی وشەی (النَّسِيل)ە واتە: ئەوەی لەکاتی برینەوەی خوری و مودا هەڵدەوەرێ ٥ منداڵ ٥ پلیتە ٥ ڕاوە هەنگوین کە کەرەشانەکەی لێ جیا کرابێتەوە ٥ نَسَمَت الريح: بایەکە هەڵبوو، شنە بایەکە هەڵبوو.

**نَسِمَ الشَّيْءُ**: شتەکە تامی گۆڕا.

**نَسَمَ البعيرُ الأرض بِمَنسِمِهِ** حوشترەکە بەسمی لە زەوی دا و پێکۆڵی کرد، شوێنکەی لەزەوییەکە کرد.

**نَسَمَ لي خَبَرٌ أو أثرٌ** هەواڵێکم لێ دەست کەوت یان شوێن پێیەکم هەڵگرتووە ٥ سۆراخێکم کردووە.

**نَسِمَ البعيرُ نَسَماً** حوشترەکە سمی کون بوو ٥ ناسَمَهُ مناسَمَةً ونِساماً: لێی نزیك بۆوەو بۆنی کرد ٥ قسەی لەگەڵ دا کرد ٥ سرتەی لەگەڵ دا کرد ٥ نَسَّمَ في الأمر: دەستی بەکارەکە کرد بەڵام زۆر نەچۆتە ناوی ٥ نَسَّمَ النَّسَمَةَ: ئادەمیزادی بوژاندنەوە لەمردن ڕزگاری کردن ٥ تَنَسَّمت الريحُ: بایەکە بەهێواشی هەڵی کرد ٥ تَنَسَّمَ المكانُ بالطيب: شوێنەکە بۆنی خۆش بوو ٥ تَنَسَّمَ فلان: فلانکەس هەوای خاوێنی هەڵمژی ٥ تَنَسَّمَ الجنينُ: کۆرپەلەکە لەسکی دایکیا ئەندامەکانی جەستەی ڕێك بوون شکڵی ئادەمی وەرگرت ٥ تَنَسَّمَ الريحَ: بۆنەکەی هەڵمژی و هەستی بەخۆشی کرد ٥ تَنَسَّمَ فلان العِلْمَ أو الخبرَ: فلانکەس وردە وردە لەسەرەخۆ زانیاری فێربوو زانستی بەدەست هێنا ٥ یان وردە وردە هەواڵەکەی بەدەست هێنا ٥ تَنَسَّمْتُ أثرَهُ حتى تَبَيَّنْتُهُ: سۆراخم کردو بەشوێنیا ڕۆیشتم و شوێن پێیم هەڵگرت تا ئاشکرام کرد ٥ المَنْسِمُ: لایەکی سمی حوشتر ٥ ڕێگا ٥ دەگوترێ: (قد إستبان المَنْسِمُ) لایەکی سمی حوشترەکە دەرکەوت ٥ النَّاسِمُ: نەخۆشێك بگاتە حاڵەتی گیانەڵاو ٥ النَّسَمُ: خەڵك و ئادەمیزاد ٥ هەناسەی گیان ٥ کزەبا ٥ سەرەتای هەڵبوونی با بەهێواشی ٥ ڕێگای کوێرەبوو ٥ بۆنی شیر یان بۆنی چەوری ٥ باڵندەی تیژ ڕۆی وەکوو واشە، کەرەنگیان سەوز بنوێنێ ٥ النَّسْمَةُ: عەرەقکردنی ناو گەرماو یان عەرەق بەگشتی ٥ النَّسَمَةُ: زیندەوەر گیانەوەر هەرشتێك گیانی تێدا بێ ٥ تەنگەنەفەسی (هەناسە بڕکە) ٥ النَّسِيمُ: شنەبا (کزەبا) کە درەخت نەهەژێنێ و گڵ و خۆڵ ڕانەدا ٥ گیان ٥ عەرەق ٥ هێزو تواناو خۆگری ٥ نَسْنَسَ الرجلُ: پیاوەکە زەعیف و لاواز بوو ٥ نَسْنَسَ الطائرُ: باڵندەکە تیژ فڕی ٥ نَسْنَسَتِ الريحُ: بایەکە هەڵبوو بەشێوەی سارد کزەبای سارد هەڵبوو ٥ نَسْنَسَ الدابَّة: وڵاخەکەی تاوداو خێرا لێی خوڕی ٥ النَّسْناسُ: جۆرە مەیمونێکی

جەستە بچوکەو کلکی درێژە ٥ برسیایەتی زۆر ٥ دەگوترێ: (جوع نـسناس) برسیایەتی برست برو بەشیدەت.

**نَسَأ الشَّيْءَ نَسْوةً:** وازی لەشتەکە هێنا ٥ دەگوترێ: (نَسا العَمَلَ) وازی لەکارەکەی هێنا.

**نَسَأ فلاناً نَسْأً:** زەبری لەڕەگی وەریکی دا.

**نَسِيَ فلان نَسىً:** فلانکەس لەڕەگی وەریکی دا ٥ ئازار پەیدا بوو.

**نَسِيَ الشَّيْءَ:** شتەکەی واز لێ هێنا، لەبیری چوو ٥ **أنساه الشَّيْءَ:** شتەکەی لەبیر بردەوە ٥ **ناساه العداوة:** دوژمنایەتی لەبیر بردەوە ٥ **نَسَّاه الشَّيْءَ:** بەمانا (أنساه) دێ ٥ **تناسى الشَّيْءَ:** هەوڵی دا شتەکەی لەبیر بچێتەوە ٥ وای خۆ نیشان دا کەشتەکەی لەبیر چۆتەوە.

**الأَنْسى:** ڕەگێکە لەبەلەکی مرۆڤ دایە ٥ **النَّسا:** ڕەگی وەرکییە، ڕەگێکە لەسمتەوە درێژ بۆتەوە بۆ پاژنەی ٥ لەتەسنیەکەی دا دەگوترێ: (نَسَوان) یان (نَسَيان) ٥ **النِّسَاء:** کۆمەڵێك ئافرەت ٥ **النِّسْوَة:** قومە شەرابێك ٥ **النِّسْوَةُ:** کۆمەڵێك ئافرەت ٥ **النِّسوان:** ئافرەت ٥ **النَّسْيانُ:** کەسێك زۆری شت لەبیر بچێ ٥ **النِّسْيانُ:** نەخۆشی لەبیرچوونەوە کەزوو شتیان لەبیر دەچێ ٥ **النَّسْيُ:** شتی لەبیرەوە چوو ٥ شتی بێ نرخ، کەمبایەخ ٥ **النَّسِيُّ:** شتی لەبیرەوەچوو ٥ دەگوترێ: (هو نَسِيُّ قومِه).

**نَشَأ الشَّيْءُ نَشْئاً ونشوءاً ونَشْأَةً:** شتەکە پەیدا بوو ٥ دروست بوو، هاتە کایەوە.

**نَشَأ الصَّبِيُّ:** منداڵەکە گەشەی کردو پێگەیی ٥ دەگوترێ: (نَشَأْتُ في بني فلان)و (نَشَأ فلان نَشْأة حسنة).

**نَشَأ الشَّيْءُ عَنْ غيره:** شتەکە لەشتی ترەوە پەیدا بوو ٥ **تَنَشَّأ لحاجته:** بۆ ئەنجامدانی کاری خۆی ڕاساو هەوڵی دا ٥ **إسْتَنْشَأ الشَّيْءَ:** داوای دروستکردنی شتەکەی کرد ٥ دەگوترێ: (إسْتَنْشَأْتُهُ قصيدة في الزهد) داوام لێ کرد پارچە شیعرێکم بۆ دابنێ لەبارەی دونیا نەویستییەوە ٥ **إسْتَنْشَأ الأخبار:** بەدوا هەواڵەکەدا چوو توێژینەوەی تێدا کرد ٥ **الإنشاء:** (لەزاراوەی زانستی بەلاغەدا) بریتیە لەقسەو ڕستەیەك لەخاریج دا مانای نەهاتبێتە کایەوە ٥ واتە: لەواقیعو دەرەوەدا مانایەکی هەبوو بەرامبەری نەبێ، لەزاراوەی ئەدیبو هەستیاران دا (الإنشاء) فەنو بەهرەیەکی خودا دادە، بەهۆیەوە دەتواندرێ مانای جۆراو جۆر کۆبکرێنەوە لێك بدرێن ڕێك بخرێن و مانای جوانو سەرەنج ڕاکێش دەربڕدرێ ٥ **المَنْشَأ:** شوێنی دروستکردن ٥ شوێنی دروستبوون ٥ دەگوترێ: (هذا مَنْشَؤُهُ يابان) و (هذا منشؤه أربيل) ڕەگو ڕیشەو بنەما ٥ **المُنْشِئُ:** ئەو نووسەرەی باش دەزانێ پەخشان دابڕێژێو قسەکانی شیرینو ڕەوان بن ٥ **المُنْشأة:** شوێنی کارکردنو پیشەسازیو کۆکردنەوەی پارچەی ئامێرو لێکدانو لێك بەستنیان ٥ **الناشئ:** کوڕێك لەتەمەنی بچوکی تێپەڕی کردبێو گەیشتبێتە تەمەنی گەنجی ٥ **النَّاشِئة:** کچۆڵە لەتەمەنی منداڵی تێپەڕی کردبێو چوبێتە حاڵەتی گەنجی ٥ شەو بەخەبەر هاتنو نوێژو تاعەتکردن.٥ **النَّشْءُ:** سەرەتای پەیدابوونی هەور ٥ منداڵ لە سەرەتای ساڵانی خوێندنی دا ٥ ئاژەڵو حەیوانات لەکاتی ڕامکردنو ژێربارکردنی دا ٥ زرویت وەچە ٥ دەگوترێ: (هو نَشْءُ سوء) ئەو کابرایە وەچەو دەرئەنجامی

خراپەکارییە ٥ النَشْأةُ: وەدی هێنان و پەروەردەکردن ٥ النَّشِينَة: دەگوترێ: (حوض نَشِينَة) حەوزێکە ئاوی تێدا نەماوەو بنکی دەرکەوتووە.

**نَشِبَ في الشَّيْئِ:** لەشتەکە هەڵچەقی و پێوەی نووسا ٥ پێیدا ڕۆیشتە خوار ٥ دەگوترێ: (نشبت مخالب السبع في الصيد) چنگی درندەکە چووە جەستەی نێچیرەکەوە.

**نَشِبَ فلان فيما يكرهه:** فلانکەس توشی ئەوە بوو کەپێی ناخۆشە.

**نَشَبَ الشرُّ أو الحرب بين البلدين:** شەڕو ئاژاوە لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا بەرپا بوو.

**نشب الأمر فلاناً:** کارەکە یەخەی فلانی گرت ٥ أنشب الصائدُ: داوی نێچیرەوانەکە لەنێچیرەکەوە هاڵا ٥ أنشبت الريحُ: ڕەشەبایەکە بەتوندی هەڵی کردو زیخ و گڵ و خۆڵی ڕادا ٥ أنْشَبَ الشَّيْئَ في غيره: شتەکەی لەشتێکی تر گیر کرد ٥ دەگوترێ: (أنْشَبَ فيه مَخالِبه) چنگی لێ گیرکرد ٥ ناشَبَهُ الحربَ: شەڕی لەگەڵ هەڵگیرساند ٥ نَشَّبَ الشَّيْئَ في غيره: بەمانا (أنْشَبَهُ) دێ ٥ نَشَّبَ الثوبَ: قوماشەکەی بەوێنەکردن تێیدا ڕازاندەوە ٥ إنْتَشَبَ القوم: خەڵکەکە یەکیان گرت و هەندێکیان بە هەندێکیانەوە گیرۆدە بوون وەگری یەکتری بوون ٥ تَنَشَّبَ في الشَّيْئِ: بەمانا (نَشِبَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَنَشَّبَ في قلبي حُبُّها) خۆشەویستی ئەو چووە دڵمەوە ٥ المَنْشَبَةُ: ماڵ و سامان، مەنقولەو غەیرە مەنقولە ٥ النَّاشِبُ: تیرهاوێژ ٥ النَّشَبُ: ماڵ و سامان ٥ زەوی و زار ٥ خانو و بەرە ٥ النُّشَبَةُ: (رجل نُشَبَةٌ) پیاوێکە کەدەستی دایە کارێك وازی لێ ناهێنێ تا تەواوی نەکا ٥ النُّشابُ: تیر، سەرە تیر ٥ دەگوترێ: (ترامـوا بالنشاشيب) یەکتریان تیرباران کرد ٥ النُّشَّابُ: شتێك کە زۆر بەناو شتی تردا ڕۆبچێ ٥ تیر دروستکەر ئەو کەسەی تیر دروست بکا.

**نَشَجَ الباكي نَشْجاً ونشيجاً:** مرۆڤە گریاوەکە گریانی لەسنگی دا دەکوڵی و گریانەکەی دەرنەبڕی.

**نَشَجَ الحِمارُ:** گوێدرێژەکە زەڕینەکەی لەقوڕگی خۆی دا خواردەوە.

**نَشَجَ الضفدع:** بۆقەکە قڕاندی ٥ (نَشَجَ القِدْرُ) مەنجەڵەکە کەوتە گیزە گیز.

**نَشَجَ نَشْجاً ونشوجاً:** ئاو و شتی وای خواردەوە بەڵام تێراو نەبوو.

**نَشَجَ السقاء والجِلدُ:** پێستەکە یان کوندەکە ئاوی دەڵاند، ئاوی لێ چوو.

**نَشَجَ الدَّابَّة:** ئەوەندەی ئاودا بە وڵاخەکە کە گری تینوایەتی دابمرکێنێ و بەس بەتەواوی تێر ئاوی نەکرد ٥ إنْتَشَجَ: بەمانا (نَشَجَ) دێ ٥ النَّشَّاجُ: صيغەی موبالەغەیە و لەمادەی (نَشَجَ) دەرهێنراوە ٥ النَّشوج: ئاوی کەم.

**نَشَدَ فلان نَشْداً ونِشداناً:** فلانکەس یادی کەوتەوە، هاتەوە بیری.

**نَشَدَ الضالَّةَ:** هەوڵی دۆزینەوەی گومبووەکەی دا.

**نَشَدَ فلاناً:** هەوڵی دیتنی فلانی داو چو بۆلای.

**نَشَدَ فلاناً بكذا:** فیسارە شتی بیری فلانکەس هێنایەوە ٥ دەگوترێ: (نشدتك الرحم) داوات لێ دەکەم بیری خزمایەتی نێوانمان بکەیەوەو ڕێزی لێ بگری ٥ (نَشَدْتك الله) خوداوەندت بیردێنمەوە، خودا دەکەم بەگژتا ٥ أنْشَدَ فلاناً: وەڵامی فلانی دایەوە ٥ أنْشَدَ الشِّعْرَ: بەدەنگی

بەرز شیعرەکەی خوێندەوە.٥ ناشَدَ فلاناً الأمرَ وفيه مناشدة: داوای کارەکەی لە فلانکەس کرد ٥ ناشَدَ فلاناً الله: خودای کرد بەگژیاو وتی بۆخاتری خودا ئەوەم بدەرێ یان سوێندی دا بەخودا کەئەوەی بۆ بکا ٥ تناشدوا الأشعار: خەڵکەکە شیعریان بۆیەکتری بەدەنگی بەرز خوێندەوە ٥ تَنَشَّدَ الأخبار: هەوڵی بەدەستهێنانی هەواڵەکانی دا بۆئەوەی پێش کەسانی دیکە پێیان بزانێ ٥ إسْتَنْشَدَ فلاناً شعراً: داوای لەفلانکەس کرد شیعرێکی بۆ بڵێ ٥ إسْتَنْشَدَ فلاناً الضّالّةَ: داوای لە فلانکەس کرد بانگی بۆ هەڵدا بۆ دۆزینەوەی گومبوەکەی ٥ الأنشودة: نەشید شیعرێك بكرێتە نەشیدی نیشتمانی وەکوو شیعرەکەی دڵدار: (ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی کورد زووبان......) ٥ المُنْشِدُ: کەسێك بەدەنگی بەرز شیعر بخوێنێتەوە ٥ النَّشّادُ: کەسێك پیشەی بانگ هەڵدان بێ بۆ شتی گومبوو ٥ النَّشيدُ: دەنگو صەدا ٥ دەنگ بەرزکردنەوە بەلەحنەوە ٥ شیعرێك بکرێتە نەشیدی نیشتمانی ٥ پارچە شیعرێك یان پارچە زەحەلێك بەحەماسەتەوە کۆمەڵێك بەدەنگی بەرز بیخوێننەوە.

النشيدة: بەمانا (النشيد) دێ ٥ نَشَرَت الأرض نشوراً: زەوییەکە بەهاری لێ هاتو گیاو گژی رواند.

نَشَرَ الشجرُ: درەختەکە گەڵای کرد.

نَشَرَ الشَّيْئَ نَشراً: شتەکەی بڵاو کردەوە.

نَشَرَ الراعي غَنَمَهُ في المرعى: شوانەکە مەڕەکانی بەناو لەوەڕگاکەدا بڵاو کردنەوە.

نَشَرَ الكتابَ أو الثوبَ أو نحوهما: کتێبەکە یان قوماشەکەی بڵاو کردەوە.

نَشَرَ الخَبَرَ أو المقال: هەواڵەکە یان مەقالەکەی پەخش کرد.

نَشَرَ الكتابَ أو الصحيفة: کتێبەکە یان رۆژنامەکەی بەچاپ گەیاندو پەخشی کرد.

نَشَرَ الخَشَبَةَ: دارەکەی راهێنا، برییەوە تاشی.

نَشَرَ الله الموتى: خودا مردووەکانی زیندوو کردنەوە.

نَشَرَ الشَّيْئُ نَشراً: شتەکە بڵاو بۆوە ٥ نَشَرَ الثوبَ أو الكتابَ: قوماشەکە یان کتێبەکەی کردەوە، لێکی کردەوە ٥ أنشَرَ الله الموتى: خودا مردووەکانی زیندو کردنەوە ٥ أنشَرَ الأرضَ: زەوییەکەی بەئاو زیندو کردەوە ٥ أنشَرَ الرياحَ: بایەکەی هەڵکرد ٥ إنْتَشَرَ الشَّيْئُ: شتەکە کرایەوە، بڵاو بۆوە.٥ إنتَشَرَ الخبرُ: هەواڵەکە بڵاو بۆوە ٥ إنْتَشَرَ الشَّيْئُ: شتەکە پەرتەوازە بوو، بڵاو بۆوە ٥ إنْتَشَرَ العَصَبُ: رەگەکە هاوسا ٥ ئەستور بوو ٥ تناشروا الشَّيْئَ: هاریکاری یەکتریان کرد بۆ بڵاو بوونەوەی شتەکە ٥ تَنَشَّرَ الشَّيْئُ: شتەکە کرایەوە، پان بۆوە ٥ پەرتەوازە بوو ٥ إسْتَنْشَرَ الشَّيْئُ: داوای کرد شتەکە بڵاو بکرێتەوە ٥ التناشيرُ: نووسینی منداڵ کە سەرەتا فێری نووسین دەبێ ٥ دەگوترێ: (ما أشبه خطه بتناشير الصبيان) ٥ المِنْشارُ: مشار ٥ المَنْشَرُ: شوێنی نەشرو بڵاو بوونەوە ٥ المنشورُ: کارێکی بڵاو کراوە ٥ بەیانێکی بڵاو کراوە بەناو فەرمانگەو خەڵك دا بۆئەوەی زۆر کەس بیزانن ٥ النّاشِرُ: ئەو کەسەی پیشەی لەچاپدانو پەخش کردنی کتێب بێ ٥ پیشەی کتێب فرۆشی بکا ٥ جۆرە مارێکە ژەهراوی سەری پان دەکاتەوە وەکوو ئەسکوێ ٥ النّاشِرَةُ: دەمارێکی خوێنبەرە لەژێر پێستی دیوی ناوەوەی باسك و

قۆڵە ٥ **النُّشارة:** پیشەی شەقکردنی دار ٥ **النُّشارَةُ:** ئەو وردە دارەی لەکاتی شەقکردن‌و ڕاهێنانی داردا دەکەوێتە خوار ٥ **النَّشْرُ:** بۆنی خۆش ٥ نەتەوەیەکی پەرتەوازە کە سەرۆکێکیان نەبێ کۆیان بکاتەوە ٥ دەگوترێ: (جاء القوم نشراً) خەڵکەکە بەپەرتەوازەیی هاتن ٥ چاپکردنی کتێب‌و ڕۆژنامەو گۆڤارو فرۆشتنیان ٥ **النَشْرَةُ:** بای نەسیم ٥ بەیانێك دەنووسرێ‌و بەخش دەکرێ بۆئەوەی بزاندرێ هەڵوێستی لایەنێك یان دەسەڵات لەبارەی ڕوداوێکی تایبەتییەوە چۆنە ٥ **النُّشْرَةُ:** هەندێ دوعاو نوشتەو شتی وان بەکاردەهێندرێن بۆ چارەسەری نەخۆش ٥ **النَّشّارُ:** کەسێك پیشەی دار برینەوە بێ ٥ **النَّشورُ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (النَّاشِرُ) دێ ٥ **النُّشُورُ:** زیندوو کردنەوەی مردوو، ڕۆژی قیامەت ٥ **النُّشِيُّ:** بلاوکراوە.

**نَشَزَ الشَّيْئُ نَشزاً ونشوزاً:** بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (نَشَزَ المكانُ) (وَ نَشَزَ العِرقُ) ٥ شوێنەکە بەرز بوو، دەمارەکە هەڵسا ٥ هەروا دەگوترێ: (نَشَزَت إليَّ نَفْسي) دڵم ترساو ناڕەحەت بوو.

**نَشَزَ فلان:** فلانکەس چووە سەر بەرزاییەکی زەوی.

**نَشَزَ من مكانه رفيه:** لەشوێنی خۆی هەڵساو ڕاساو جوڵا ٥ بەرز بۆوە ٥ دەشگوترێ: (نَشَزَت النغمة عَنْ مثيلاتها) لەحن و گۆرانیەکە لەپاسای خۆی دەرچوو ٥ **نَشَزت المرأةُ:** نافرتەکە لەمێردەکەی یاخی بوو، داب‌و نەریتی ژن‌و مێردایەتی بەپرەو نەکرد.

**نَشَزَ الرجلُ:** پیاوەکە پابەندی داب‌و نەریتی هاوسەرایەتی نەبوو.

**نَشَزَ بقرنه نَشزاً:** بەقۆچ هەڵی گرت‌و بەزەوی دا دا ٥ **أنشَزَ الشَّيْئَ:** شتەکەی لەشوێنی خۆی بەرز کردوەوە ٥ **أنشَزَ الله عظام الميت:** خودا ئێسك‌و پروسکی مردووەکەی لەشوێنی خۆی بەرز کردوەوە پێکیەوە نانەوەو ڕێکی خستنەوە بۆئەوەی سەرلەنوێ بەگۆشت دایان پۆشێ‌و گیانیان بەبەردا بکاتەوە ٥ **تَنَشَّزَ لكذا:** خۆی بۆ هەڵدا ٥ **النَّاشِزُ:** دەگوترێ: (فلان ناشز الجبهة) فلانکەس ناوچەوان دەرپەڕیوە ٥ (قلب ناشِزُ) دڵێکە لەترسان کەوتوەتە پەلەپەل ٥ **النَّاشِزَةُ:** دەگوترێ: (لحمة ناشِزة) پارچە گۆشتێکە لەجەستە بەرزبۆتەوە هەڵتۆقیوەتەوە ٥ **النُّشاز:** بەمانا (النَّشَزُ) دێ واتە: شتی نارێك‌و پێك نەگونجاو شتێك لەناستی شتەکانی پەنا خۆی نەبێ لەپاسای هاو وێنەی خۆی دەرچووبێ ٥ **هذه النَّغمة نشاز:** ئەم هەوای گۆرانییە لەوانی تر ناچێ ٥ **النَّشْزُ:** ئەوەی لەزەوی بەرزبێتەوە وەکوو تەپۆڵکەو گردۆڵکە ٥ **النَّشَزُ:** بەمانا (النَّشْز) دێ.

**نَشَّ الشَّيْئُ:** شتەکە وشك بۆوە ناوەکەی نەما ٥ دەگوترێ: (نَشَّ الرطب) خورماکە وشك بۆوە ناوی تێدا نەما ٥ (وأشتدّ الحرُّ فَنَشَّ الحوضُ) گەرما تاوی سەندو حەوزەکە وشك بوو.

**نَشَّ اللَّحمُ:** گۆشتەکە لەسەر ئاگرەکە جزەی هات ٥ **نَشَّت الجرةُ الجديدةُ:** جەڕە تازەکە کەئاوی تێکرا کزەکزی لێ هات.

**نَشَّ الشَّيْئَ نَشّاً:** شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**نَشَّ الدابة:** وڵاخەکەی بەهێواشی لێخوڕی.

**نَشَّ الذُّبابَ وغيره:** مێشەکەی دەرکرد ٥ **المِنَشُّ:** ئەو گۆماو و زۆنگاوانەی لە قەراخ ڕووبارو دەریا ئاویان تێدا دەمێنێتەوە ٥ **المِنَشَّة:** مێش کوژ ٥

میش دەرکەر گورزێکی سەر پرژاوییە مێشی پێ دەرەتێندرێ ٥ **المنشوش**: دەگوترێ: (دهن منشوش) رۆنێکە بۆنی خۆشی تێکەڵ کراوە ٥ **النَّشاشُ**: بۆ زێدەرۆیی لەماناى (نَشَّ) دێ ٥ دەشگوترێ: (سبخة نَشَّاشَة) زەوییەکە گڵەکەی وشك نابێتەوە و لەوەڕیشی لێ ناڕوێ ٥ **النَّشُّ**: نیوەی شت ٥ هەرشتێك بێ ٥ دەگوترێ: (نَشُّ أوقية) نیوەی حوقەیەك ٥ سەنگێکی کێشانەیە کێشەکەی کێشی بیست دیرهەمە ٥ **النَّشیشُ**: دەنگی ئاو و شتی تر کە گەیشتە ئاستی کوڵین ٥ **النَّشیشَةُ**: زەوییەك وشك نەبێتەوە و گیای لێ نەڕوێ.

**نَشَصَ** نشوصاً: بەرز بۆوە ٥ هەڵتۆقی.

**نَشَصَ الشَّیْءَ**: شتەکەی دەرهێنا ٥ لێی کردەوە ٥ دەگوترێ: (أقام القوم ما یَنشِصون وتداً) خێڵەکە لەو شوێنە دایانکوتاو نیازی مانەوەیان هەیە سنگی داکوتراوی ڕەشماڵیان هەڵناکەنن.

**نَشَصَ فلاناً بالرمح**: بەرمب زەبری لەفلان دا ٥ **أَنْشَصَهُ**: دەری هێنا ٥ دەگوترێ: (أنْشَصَ فلاناً من بیته) فلانکەسی لەماڵی خۆی هێنایە دەر ٥ (أنْشَصَ الجَدْبُ الناس عَنْ مواضعهم) گرانیو قاتو قڕی خەڵکەکەی ناچار کرد زێدی خۆیان جێ بێڵن ٥ **إنْتَشَصَ الشَّیْءَ**: شتەکەی هەڵکەند ٥ **إنْتَشَصَ الشجرةَ**: درەختەکەی هەڵکەند ٥ **المِنْشاصُ**: ئافرەتێك لەمێردەکەی زیز بووبێو لەگەڵی نەخەوێ ٥ **النَّشاصُ**: هەوری پڕو چین لەسەر چین ٥ **النُّشُوصُ من الرماح**: ڕمبی بەرز کراوەو ئامادە بۆ شەڕ.

**نَشِطَ من المكان نَشَطاً**: لەشوێنەکە چووە دەر.

**نَشَطَ السیلُ**: لافاوەکە لە ڕێڕەوی خۆی لای داو کەوتە قۆرتو پێچ کردن ٥ **نَشَطَت به الهموم**: خەمو خەفەت سەریان لێ تێك داوە.

**نَشَطَ الحَبْلَ**: حەبلەکەی واگرێ داوە بەئاسانی بکرێتەوە.

**نَشَطَ الشَّیْءَ**: شتەکەی دەرهێناو ڕایتەکاند.

**نَشِطَ الدَّلْوَ**: دۆڵچەکەی دەرهێناو تەکاندی.

**نَشَطَ فلاناً**: زەبری لەفلانکەس دا.

نَشَطَتْهُ الحیّة: مار گەستی، پێوەی دا.

**نَشِطَ إلیه وله نشاطاً**: بەچوستو چالاکی دەستی دایە.

**نَشِطَ في العمل**: ئیشەکەی پێ خۆش بوو بەدڵسۆزی تاوی دایە ٥ **أنْشَطَ فلاناً**: فلانکەسی چوستو چالاك کرد ٥ **أنْشَطَ العُقدةَ**: گرێیەکەی کردەوە، شلی کردەوە ٥ **إنْتَشَطَ الشَّیْءَ**: شتەکەی ڕاتەکاندو دەری هێنا ٥ **إنْتَشَطَ النَشیطة**: دەسکەوتی پێش جەنگی گرتو ڕایماڵی ٥ **تَنَشَّطَ**: نیشاتی پەیدا کرد ٥ **تَنَشَّطَ للعمل**: خۆی بۆ کارەکە حازر کردو دەستی پێ کرد ٥ **تَنَشَّطَ الطریق**: بەچوستو چالاکی ڕێگاکەی بڕی ٥ **إسْتَنْشَطَ الجِلدُ**: پێستەکە وێکهاتەوەو کۆبۆوە ٥ **المَنْشَطُ**: شتێك بەتامەزرۆوە بۆی بچێو کردنەکەی کاریگەر بێ ٥ **المِنْشَطُ**: کەسێك نیشاتی زۆر بێ ٥ **النَّشاطُ**: کارکردنی دڵسۆزانە لەبوارێك لەبوارەکانی ئیش دا ٥ **الأنشوطة**: گرێیەکە بەئاسانی بکرێتەوە ٥ **النَّاشِط**: ئەو کەسەی حەبل شی دەکاتەوە بۆئەوەی سەر لەنوێ بیکاتەوە بەحەبل ٥ **النَّشْطُ**: گەستنی خێرا، داخکردنی خێرا بەم جۆرە ئاسنە گەرمەکە بەخێرایی بگەیەنیە گۆشتەکەو لایبەی نەهێڵی زۆری داخ بکا ٥ **النَّشْطَةُ**:

دەگوترێ: (بئـر نـشـوط) بیرێکـه بەناخۆشـی دۆڵـچەکەی لێ دێتــه دەر ٥ النُّـشيطة: ئــەو غەنیمەو دەستکەوتەیە کە جەنگاوەرەکان پێش ئــەوەی بگەنــه گۆڕەپــانی جــەنگ دەســتیان دەکەوێ.

نَـشَعَ نَـشْعاً: پرخەیـەکی تونـدی کـرد ٥ نَـشَعَتِ الأرضُ: زەوییەکە ئاوێکی تام ناخۆشی دەردا.

نَـشَعَ الـشَّيْءَ: شـتەکەی بـەزەختو ڕاتەکانـدن دەرهێنا.

نَشَعَ المريضَ الدواءَ نَشْعاً: دەرمانەکەی دەرخواردی نەخۆشەکە دا.

نَشَعَ فلاناً الكلامَ: قسەی فێری فلان کرد پێی گوت ئاواو ئاوا بڵێ.

نَشَعَ فلاناً بشربة: فریا فلانکەس کەوت بـەوەقتومی ئـاوی دایـەو ڕزگـاری کـرد لـەخنکان ٥ إنْتَـشَعَ: بۆنی کـرد ٥ المِشْنَعُ: پاکەتو کیفی ئـەو بۆنو بەرامـەی هەڵدەمـژرێ ٥ النُّـشاعة: ئـەو شـتەی بەدەست هەڵدەکەندرێو فـڕێ دەدرێ ٥ النَّـشُعُ: ئەو ئاوەی تامی ناخۆشو تفتە ٥ النَّـشوعُ: ئـەو دەرمـانو شـتە بۆنـدارەی دەکرێتـە نـاو کـونی لوتەوە ٥ دەرمانێك دەکرێتە دەمی نەخۆشەوە.

نَشَعَ الماءُ نَشْعاً: ئاوەکە ڕەوان بوو.

نَشَعَ فلان: فلانکەس لرخەو پرخەی کرد، خەریك بوو لەسەر خۆ بچێ ٥ هەناسەی قوڵ و تـەنگی هەڵکێشا.

نَشَعَ بالشيئ: قوڕگی بەشتەکە گیرا.

نَشَعَ الطريقَ بالقوم: ڕێگاکە بەقەرەباڵغی خەڵکەکە تەنگ بوو.

نَشَعَ الماءَ: ئاوی خواردەوە ٥ أنْشَعَ فـلان: فلانـکەس دورکەوتـەوە، کـەنارگیر کـەوت ٥ أنـشَعَ الـصَّبِيَّ الدواءَ: دەرمانەکەی دەرخـواردی منداڵەکـە دا ٥ دەشـگوترێ: (أَنْـشَعَهُ الكـلامَ) قـسەی فێـر کـرد، دەرزی دا دا چۆن قسەکانی بکا ٥ إنْتَشَعَ الـدواءَ: قوم قوم دەرمانەکەی خواردەوە ٥ إنْتَشَعَ الكلامَ: قسەی فێر کرد، پێی گوت ئـاوا بڵێو ئـاوا وەڵام بدەرەوە.

تَشَنَّعَ فلان: فلانکەس لرخەو پرخەی بەهێزی کرد ٥ خەریك بوو گیـانی دەرچێ ٥ المِنْشَفَةُ: گوڵاو پرژێن شتێك بۆنی خۆشی پێ بڵاو بکرێتەوە ٥ النَّاشِـفَةُ: ڕێـڕەوی ئـاو بۆنـاو شـیو و دۆڵ ٥ النَّـشْفَةُ: هەناسـە سـواریی ٥ هەناسـە برکـێ ٥ تێکـچونو لنگـەفرتێو شـڵە ژانێکـە لـەکاتی گیانەڵاو دا توشی ئادەمیزاد دەبێ.

نَشَفَ الشَّيْءُ نَشْفاً: شتەکە وشك بوو.

نَشَفَ الشَّيْءَ: شتەکەی وشـك کـردەوە ٥ دەگوترێ: (نَـشَفَ الثـوبُ العـرقَ) قوماشـەکە ئارەقەکـەی وشك کردەوە.

نَشِفَ الشَّيْءُ: شـتەکە وشـك بـۆوە ٥ نَشِفَتِ الأرض: زەوییەکـە وشـك بـۆوە ٥ نَـشِفَتِ الأرضُ المـاءَ: زەوییەکـە ئاوەکـەی هەڵمـژی ٥ أنْـشَفَتِ الدابـة: ئاژەڵەکـە (وڵاخەکـە) لـەدوای بێـچوی مێینـە بێچوی نێرینەی بوو ٥ أنْشَفَ الـشَّيْءَ: شتەکەی وشك کردەوە ٥ أنْشَفَ فلاناً: سـەر توێـژی شیری دەرخـوادی فلانکـەس دا ٥ نَـشَّفَتِ الحلـوب: حەیوانـە شـیردەرەکە جارێـك گـوانی پڕبـوون لەشیرو جارێکی تر هیچیان تێدا نەبوو ٥ نَـشَّفَ اللبنُ: شیرەکە سـەرتوێژی پەیـدا کـرد ٥ نَـشَّفَ الـشَّيْءَ: شـتەکەی وشـك کـردەوە ٥ نَـشَّفَ المـاءَ: بەپـەڕۆو ئیـسفنجو شـتی وا ئاوەکـەی وشـك کردەوە ٥ إنْتَشَفَ فـلان: فلانکـەس سـەر توێـژی شـیری خـواردەوە ٥ إنْتَـشَفَ فـلان المـاءَ ونحـوهُ:

فلانكەس ئاوەكەی وشك كردەوە بەپەڕۆو ئیسفنجو شتی وا ◊ **إنْتَشَفَ النشافة**: سەرتوێژی شیرەكەی گرت ◊ **أُنْتُشِفَ لونُهُ**: ڕەنگی گۆڕا ◊ **تَنَشَّفَ الرجلُ**: پیاوەكە بە خاولیو شتی وا ئاوی لەجەستەی سڕی، خۆی وشك كردەوە ◊ **تَنَشَّفَ الشَّيْءَ**: شتەكەی وشك كردەوە ◊ **المِنْشاف**: حەیوانی شیردەر كەجارێك گوانی پڕبن لەشیرو جاری وایش هەبێ هیچیان تێدا نەبێ ◊ **المِنْشَفَةُ**: خاولیو قوماشو شتی وا كەئاوی پێ وشك بكرێتەوە ◊ دەسەسڕو شتی وا كەئاوی سەر دەمو چاو و دەستو مەچەكی پێ بسڕدرێتەوە ◊ **النُّشَافَةُ**: ئەو توێژو كەفو شتەی دەكەوێتە سەر مەنجەڵە شیر ◊ ئەو ئاو و عارەقو چەوریيەی بە پەڕۆو شتی وا دەسڕدرێتەوە ◊ **النَّشَاف**: كاغەزی شاش كە نەپەستێورابێو صەقل نەكرابێو مەرەكەب زۆر هەڵمژێو وشكی بكاتەوە ◊ **النَّشَّافَةُ**: خاولیو دەستە سڕ ◊ **النَّشَفُ**: بەردی گەرماو (بەردێكی ڕەشی كونكونو گڕن گڕنە بەرمپێی پێ دەشۆرێو پێی پاك دەكرێتەوە).◊ **النَّشْفَةُ**: پارچە پەڕۆیەكە شتی تەڕبوی پێ دەسڕێو پێی وشك دەكرێتەوەو هەموو جارێ پەڕۆ تەڕەكە لەناو قاپێك دا دەگوشیو ئاوەكەی لێ دەچۆڕێنیەوە ◊ **النَّشِفَةُ (أرض نَشِفَة)**: زەویيەكە ئاو زۆر هەڵدەمژێ ◊ **النُّشْفَةُ**: شتی كەم كەلەبنكی قاپو شتی وادا دەمێنێتەوە ◊ ئەو تۆزە خواردنەی بەكەوچكو كەوگیر بەگەرمی لەمەنجەڵ دەردێندرێو بۆ تاقیكردنەوەو تام كردن دەخورێ ◊ توێژی سەر شیرو ماست.

**نَشِقَ فِي الحِبالَةِ نَشَقاً**: كەوتە ناو داوەكە.

**نَشِقَ** فلان في حبالة فلان: فلانكەس كەوتە داوی فلانكەسەوە.

**نَشِقَ الرائحة**: عەترەكەی بۆنكرد.

**نَشِقَ النُّشوقَ**: دەرمانەكەی هەڵمژی بۆ كونەلوتی ◊ **أنْشَقَ الصائِدُ**: نێچیرەوانەكە داوەكەی بە نێچیرەكەیەوە نووسا ◊ **أنْشَقَ الصَّيْدَ**: داوەكەی بە نێچیرەكەوە كرد پێوەی هەڵواسی ◊ **أنْشَقَ فلاناً النُّشُوقَ**: دەرمانەكەی بە فلانكەس هەڵمژی ◊ **إنْتَشَقَ الماءَ وغيه**: ئاوەكەی بەلوتی هەڵمژی ◊ یان ئاوی لە لوتی ڕادا ◊ **تَنَشَّقَ الماء وغيه**: ئاوەكەی بەلوتی هەڵمژی.

**تَنَشَّقَ الرائحة**: عەترەكەی بۆن كرد، بۆنەكەی هەڵمژی ◊ **إسْتَنْشَقَ**: بەمانا (تَنَشَّقَ) دێ ◊ **المَنْشَقُ**: لوت ◊ ئەندامی بۆنكردنو شت هەڵمژین ◊ **المَنْشَقَة**: ئەو شتەی دەرمانی لوتی تێدەكرێ ◊ **النَّشِقُ**: دەگوترێ: (رجل نَشِقٌ) پیاوێكە گیرۆدە بووە، چووەتە ناو كارێكەوە لێی ڕزگار نابێ ◊ **النُّشْقَةُ**: قلێتەو مل بێن كەدەكرێتە ملی ئاژەڵو شتی واوە ◊ **النُّشُوقُ**: دەرمانی لوت، هەرشتێك بەلوت هەڵمژرێ ◊ بۆن بكرێ ◊ **النُّشاقى من الصيد**: نێچیرێكە قولاپی ڕاوكەرەكەی چوبێتە قورگیەوە.

**نَشَلَ الحيوانُ** نشولاً: حەیوانەكە لەڕبوو داڵگۆشت بوو (فهو ناشل وهي ناشلة) ◊ دەگوترێ: (فخِذ ناشلة) ڕانێكی لەڕو كەم گۆشتە.

**نَشَلَ الشَّيْءَ**: نَشْلاً: بەپەلەو خێرا شتەكەی داڕنی، لێی كردەوە، لێی دەرهێنا ◊ **نَشَلَت الحيّة فلاناً**: مارەكە فلانكەسی گەست، پێوەی دا ◊ **أنْشَلَ الشَّيْءَ**: بەمانا (نَشَلَه) دێ ◊ **نَشَّلَ الأضياف**: بەركولێكی بۆ میوانەكانی دانا ◊ **المِنْشالُ**: پارچە مەعدەنێكە لای سەرەوەی قولاپێكی پێوەیە پارچە گۆشتی پێ لەمەنجەڵ و شتی وا دەردەهێندرێ ◊ **النَّشّالُ**: كەسێك زۆر شت

دەرێنێ، خێرا خێرا بە كەوگیرو شتی وا گۆشت لەمەنجەڵو شتی وا دەربێنێ ٥ دزی گیرفان بڕو دەست سوك ٥ دزی چوستو چالاك كەبەخێرایی شت بدزێو هەڵبێ ٥ النَّشِيلُ: شتی دەرهێندراو ٥ شتی فڕێندراو و دزراو.

**نَشِمَ الشَّيْءُ نَشَماً**: شتەكە بۆنی گۆڕا (فهو نَشِمٌ) ٥ دەگوترێ: (يده نَشِمة) دەستی بۆنێكی ناخۆشی گرتووە، بۆنێكی ناخۆشی لەدەست دێ.

**نَشِمَ الثورُ**: گایەكە ڕەنگی بەڵەك بوو، پەڵە پەڵەی سپیو پەڵە پەڵەی ڕەش بوو ٥ (فهو نَشِمٌ وهي نَشِمة) ٥ نَشَّمَ الطعام: خواردنەكە گۆڕاوەو بۆنێكی ناخۆشی لێ دێ ٥ نَشَّمَت الأرضُ: زەوییەكە فش بوو، بەرز بۆوە ٥ نَشَّمَ في الأمر: دەستی بەكارەكە كرد ٥ تَنَشَّمَ في الأمر: بەمانا (نَشَّمَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَنَشَّمَ منه علماً) زانیاری لێ وەرگرت ٥ لەو فێری زانست بوو ٥ (فلان يَتَنَشَّمَ العِلمَ) فلانكەس بەشێوەیەكی لەسەرە خۆیی خەریكی خوێندنو بەدەستهێنانی زانستە ٥ المَنْشِمُ: مادەیەكی بۆنخۆشە بەزەحمەت ورد دەكرێ ٥ لەپەندی پێشینان دا دەڵێ:(دقّوا بينهم عِطر مَنْشِم) واتە: شەڕو هەرا لەنێوانیان دا گەرم بوو ٥ النَّشَمُ: درەختێكە لە پێری (ألزيزفونية) یە كاتی خۆی تیریان لێ دەتاشی، بەرێكی خڕی وەكوو پرتەقاڵی هەیە ٥ نَشْنَشَتِ القِدر: مەنجەڵەكە دەنگی كوڵینی لێ هات ٥ نَشْنَشَ فلان: فلانكەس خێرا دەستی بەكارەكەی كردو خەریكی نەنجامدانیەتی ٥ نَشْنَشَ الطائر: باڵندەكە پەڕی لەخۆی دەركێشاو فڕێی دا ٥ نَشْنَشَ الشَّيْءَ: شتەكەی پاڵ پێوەناو ڕایتەكاند ٥ نَشْنَشَ الدابةَ: وڵاخەكەی بەخێرایی لێ خوڕیو دەنگی دا ٥ نَشْنَشَ الوعاءَ: زەرفەكەی هەڵڕشتو ئەوەی تێیدا بوو تەكاندیو بڵاوی كردەوە ٥ نَشْنَشَ الجِلْدَ: پێستەكەی گرو گۆشتییەكەی كەوڵ كرد ٥ تَنَشْنَشَ: بۆ موتاوەعەی (نَشْنَش) دێ ٥ تَنَشْنَشَ الشَّجَرَ: توێكڵی درەختەكەی لێ كردەوە ٥ النَّشْناشُ: دەگوترێ: (رجل نشناش) پیاوێكی چوستو چالاكە لەسەفەردا ٥ النَّشْناشَةُ: دەگوترێ: (أرض نشناشة) زەوییەكی شۆرەخاكەو هیچ ناڕوێنێ، هیچی لێ ناڕوێ ٥ النَّشْنَشُ: دەگوترێ: (غلام نشنش) كوڕێكە گورجو گۆڵە لەخزمەتكردنو ئیش دا (نَشْنَشِيُّ الذراع) دەست گەرمو دەست ڕەنگینە ٥ النَّشْنَشَةُ: دەنگی لێك خشانی زرێو كاغەزو قوماشی تازەو شتی وا.

**نَشِيَ نَشواً**: زوو سەرخۆش بوو هەر كەنارەقەكەی خواردەوە خێرا سەرخۆش بوو ٥ دەگوترێ: (نَشِيَ من الشراب).

**نَشِيَ بالشيء**: ناشقی شتەكە بوو بەلایەوە خۆش بوو ٥ جار دواجار دوبارەی كردەوە.

**نَشِيَ الريحَ**: بۆنی هەوایەكەی كرد، بە لوت هەواكەی هەڵمژی ٥ دەگوترێ: (نَشَيْتُ منه رائحة طيّبة) بۆنێكی خۆشم لێ هەڵمژی.

**نَشِيَ الخَبَرَ**: چووە بنجو بناوانی هەواڵەكەو ڕوداوەكەی ڕون كردەوە ٥ أنْشَى الشَّيْءَ: خۆشیو لەزەتی شتەكەی هەست پێ كرد ٥ إنْتَشَى فلان: فلانكەس سەرخۆشی لێ دیاری دا ٥ إنْتَشَى الريحَ: بەلوت هەواكەی هەڵمژی ٥ تَنَشَّى: بەمانا (إنْتَشَى) دێ ٥ إسْتَنْشَى: بەمانا (إنْتَشَى) دێ ٥ دەشگوترێ: (إسْتَنْشَى الخَبَرَ) لەهەواڵەكەی كۆڵیەوە ٥ النَّشا: هیدرات كاربۆنە؛ هاڕدراوێكی سپییە ٥ شنەبای بۆنخۆش ٥ یان بۆنو بەرام بەگشتی ٥ النَّشاءُ: بەمانا (النَّشا) دێ.٥ النَّشاةُ: درەختی وشك ٥ بۆنو بەرام ٥ النَّشْوانُ:

سەرخۆشی ٥ سەرەتای سەرخۆشی بوونی ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (نـشوی) ٥ هەروا بەکەسێك دەگوترێ کەدەست پێشخەری هەیە بۆ وەرگرتنی هەواڵ ٥ **النَّشْوَةُ**: هەواڵ لەسەرەتای پەیدابوونی دا ٥ **النَّشْوِيُّ**: هەرشتێك نیسبەت بدرێ بۆلای (النَّشا).

**نَصَبَ الحادي**: گۆرانی بێژو حودیە خوێنەکە بەستەیەکی سوکی چڕاند، بەدەنگێکی نەرمو لەسەرەخۆ گۆرانی گوت ٥ فرتو فێڵی کرد ٥ **نَصَبَ علیه**: فرتو فێڵی لێ کرد.

**نَصَبَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بەرز کردەوە ٥ (نَصَبَ لە حرباً) شەڕی هاویشتی شەڕی پێ فرۆشت ٥ (نصب الأميرُ فلاناً) پاشا پلەو پایەی دا بەفلانکەس ٥ (نَصَبَ الكلمة) بزوێنی فەتحەی دا بە وشەکە ٥ (نَصَبَ الشَّيْئُ أو الأمر فلاناً) ئیشەکە فلانکەسی ماندو کرد ٥ دەگوترێ: (نَصَبَه المرضُ ونَصَبَه الهمُّ).

**نَصِبَ** نَصَباً: ماندوبوو ٥ هەوڵی دا، کۆششی کرد.

**نَصَبَ ذو القرن**: شاخدارەکە شاخەکانی ڕاست هەڵچون ٥ دەشگوترێ: (ناقة نصباء) حوشترێکە سنگی بەرزە ٥ هەروا دەگوترێ: (أنصب الحديث) فەرموودەکەی بەرزکردەوە بۆسەر خاوەنەکەی ٥ **ناصَبَهُ العداوةَ أو الحربَ**: دوژمنایەتی بۆ ئاشکرا کرد، بانگی شەڕی لەگەڵ دا ٥ **نَصَّبَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بەرز کردەوە هەڵیساندەوە ٥ **نَصَّبَ الأميرُ فلاناً**: پاشا پلەو پایەی ئیداری دا بەفلان ٥ **إنْتَصَبَ**: بۆ موتاوەعەی (نَصَبَ) دێ ٥ دەگوترێ: (نَصَبَهُ فانتصب) ٥ **إنْتَصَبَ للحكم**: بۆ فەرمانڕەوایی خۆی ئامادە کرد ٥ **تناصبوا الشَّيْئَ**: شتەکەیان بەش کرد ٥ **تَنَصَّبَ**: بۆ موتاوەعەی (نَصَبَ) دێ ٥ دەگوترێ: (نَصَبَهُ فَتَنَصَّبَ) ٥ هەروا دەگوترێ: (تَنَصَبَ الطائِرُ) باڵندەکە بەرز بۆوە ٥ **تَنَصَّبَ الثَّغرُ**: ددانەکان ڕێكو پێك بوون (پوکەکە ددانەکانی ڕێك بوون) ٥ **تَنَصَّبَ لفلان**: دوژمنایەتی فلانکەسی کرد ٥ **الأنْصوبة**: نیشانەیەکە لەسەر ڕێگا دادەنرێ بۆ شارەزایی کردنی خەڵك ٥ **المَنْصِبُ**: پلەو پایەی کارگێڕی یان زانستی یان ئایینی یان ڕامیاری ٥ یان کۆمەڵایەتی ٥ ئەصڵو بنەما ٥ شکۆمەندی ڕێزداری.

**المِنصَبُ**: سەرئاگرە، یان هەرشتێك بخرێتە نێوان ئاگرو بنکی مەنجەڵو تاوە.

**المَنصَبَةُ**: هەوڵو تەقەلاو ماندوبوون.

**المُنَصَّبُ**: دەگوترێ: (ثَغرٌ مُنَصَّبٌ) پوکێکە ددانەکانی تێیدا جوان ڕاوەن ٥ **المنصوبُ**: لەبواری زانیاری نەحودا بەئیسمێك دەگوترێ بەکاریگەری وشەیەکی تر بزوێنی نەصبەی بۆ پەیدا ببێ ٥ **المنصوبة**: فێڵو تەڵەکەو داو نانەوە ٥ **النّاصِبُ**: دەگوترێ: (هم ناصِبٌ) خەمو خەفەتێکی ماندو و شەکەتکەرە ٥ (عیش ناصِب) ژیانی کولەمەرگی ٥ ژیانی زبر ٥ **النِّصابُ**: بنەماو ئەصڵی شت ٥ دەگوترێ: (رجع الأمر الی نصابه) ئیشەکە وەکوو خۆی لێ هاتەوە ٥ کارەکە چووە سەر ئەصڵی خۆی ٥ دەسکی کێردو چەقۆ ٥ ماڵو سامانێك بگاتە ئەندازەی ئەوەی زەکاتی لێ بکەوێ ٥ لەبواری ئەنجومەنو لیژنەو شتی وادا ئەو ژمارەیەیە دانیشتنەکە بکاتە کۆبوونەوەو دانیشتنی یاسایی ٥ **النَّصّاب**: بۆ موبالەغە و زێدەڕۆیی لەمانای (نَصَبَ) دێ ٥ کەسێك خۆی بەسەر شتێك دا بسەپێنێو بەبێ ئەوەی داوای لێ بکرێ کاری سەربەخۆ ئەنجام بدا ٥ ئوێن بازو فێڵکەرو تەڵەکەچی.

**النَّصْبُ**: نیشانەی دانراو لەسەر ڕێگا بۆ شارەزایی کردنی ڕێبواران ◊ ئاڵای بەرزەوەکراو (بت‌و صەنەم کە دانرابن بۆ ئەوەی لەجیاتی خودا پەرستشیان بۆ بکرێ) ◊ فێڵ‌و تەڵەکەبازی، نۆین بازی ◊ بزوێنی نەصبە بۆ نیسم‌و فیعل بەهۆی کاریگەریی وشەیەکی ترەوە ◊ **النُّصْبُ**: بەرزکراوە ◊ کێڵ‌و پەیکەرو میل‌و شتی وا کە بۆ یادەوەری شتێك دروست دەکرێ‌و ڕوداوێك یادی دانیشتوان دەخاتەوە ◊ دەشگوترێ: (هذا نُصْبُ عيني) ئەوە لەبەر چاوم دایەو دەیبینم ◊ شەڕو نەگبەتی ◊ بت‌و صەنەم کەلەجیاتی خودا بەندایەتییان بۆدەکرێ ◊ **النُّصُبُ**: شتی بەرزکراوە ◊ چەقێندراو ◊ **النُّصْبَةُ**: یەکجار بەرزکردنەوە ◊ جۆرە بزوێنێکە دەخرێتە سەر هەندێ وشە ◊ **النَّصِيبُ**: بەش‌و بار لەهەرشتێك دابێ ◊ حەوز ◊ شتی بەرزکراوەو چەقێندراو ◊ برێ بەرد کەبەدەوری حەوزدا ڕیز دەکرێن وەکوو لێوار ◊ هەرشتێك دابکوترێ، بەرزبکرێتەوە وەکوو نیشانەو عەلامەت بۆ شتێکی تر.

**نَصَتَ** لە نَصْتاً: بێدەنگ بوو گوێی ڕاگرت.

**أَنصَتَ**: گوێی گرت ◊ بەجوانی گوێی بۆ گێڕانەوەی حەدیسەکە ڕاگرت ◊ **أَنصَتَ فلاناً**: فلانکەسی بێدەنگ کرد ◊ **أَنصَتَ المحدِّثُ القومَ**: حەدیس گێڕەوەکە، قسەکەرەکە خەڵکەکەی وای کرد بێدەنگ بن‌و گوێی بۆ ڕابگرن ◊ **أَنصَتَ لِلَّهو**: حەزی لەگاڵتەو گەپ‌و ڕابواردنە ◊ **إِنْتَصَتَ** لە: بەمانا (نَصَتَ) دێ ◊ **تَنَصَّتَ**: گوێی گرت، گوێی خۆی کلۆر کرد بۆئەوەی شتەکە ببیستێ ◊ زۆری هەوڵ دا گوێی لەقسەکە بێ ◊ **إِسْتَنْصَتَ**: ڕاوەستاو گوێی خۆی کلۆر کرد بۆ بیستن ◊ **إِسْتَنْصَتَ فلاناً**: داوای لەفلانکەس کرد قسەی بۆ بدزێ ◊ **النُّصْتَةُ**: هەواڵگریی ◊ قسە دزین‌و چونە ناو ڕوداوی حەساس‌و کاریگەرەوە.

**نَصَحَ الشَّيْءُ**: شتەکە پاڵفتەو خاوێن بوو ◊ دەگوترێ: (نَصَحَ المعدِنُ) مەعدەنەکە پاڵفتەو خاوێن بوو ◊ (نَصَحَتْ تَوبَتُهُ) تۆبەکردنەکەی خاڵص‌و ڕاستاڵانەبوو ◊ (نَصَحَ قلبُهُ) دڵی بێ غەش بوو هیچ دیاردەی دو ڕویی‌و ڕاڕایی تێدا نیە.

**نَصَحَ الشَّيْءَ**: شتەکەی پاڵفتە کرد.

**نَصَحَ فلاناً**: فلانکەسی ڕێنمونی کرد بۆ کاری سودبەخش‌و ڕێگای باشی نیشان دا.

**نَصَحَ الثوبَ**: قوماشەکەی باش دوری، دورینەکەی تەواو کرد.

**نَصَحَ الشَّرابَ**: لەشەرابەکەی خواردەوە تا تێراو بوو ◊ **أَنصَحَهُ**: تێراوی کرد ◊ **ناصَحَ فلاناً**: ئامۆژگاری فلانی کردو ئەویش ئامۆژگاری ئەوی کرد ◊ **ناصح فلان نَفْسَهُ في التوبة**: فلانکەس لەتۆبەکردن‌و گەڕانەوەکەی بۆلای خودا دڵسۆزی نواندو ڕاستاڵانە ڕەفتاری کرد ◊ **إِنْتَصَحَ**: ئامۆژگاریکردنەکەی قبوڵ کردو گوێ بیست بوو ◊ **إِنْتَصَحَ فلاناً**: فلانکەسی کرد بە ئامۆژگاریکەری خۆی ◊ دەگوترێ: (إِنْتَصِحْنِي فاني لك ناصح) بمکە بەئامۆژگاریکەریی خۆت من بۆتۆ ئامۆژگاریکەرم‌و ڕێگای باشت نیشان دەدەم ◊ **تَنَصَّحَ**: خۆی شوبهاند بە ئامۆژگاریکەران‌و لاسایی ئەوانی کردەوە ◊ زۆری ئامۆژگاری کرد ◊ **تَنَصَّحَ الثوبَ**: دورینی قوماشەکەی تەواو کرد ◊ **إِسْتَنْصَحَهُ**: بەئامۆژگاریکەری لەقەڵەم دا ◊ **المِنصَحُ**: دەرزی، هەرشتێك قوماشی پێ بدورێ ◊ **المِنصَحَةُ**: بەمانا (المِنصَحُ) دێ ◊ **الناصِحُ**: پاڵفتە لەهەرشتێك بێ

٥ هەروا وشەی (الناصِح) بەمانا بەرگدرو دێ ٥ **النَّصّاحُ**: كندرو دەزو و شتی وا (پەتی شت دروون) ٥ دەگوترێ: (صَلُبَ نصاحَك) دەزوەكەت قایمو پتەوە ٥ **النَّصَّاحُ**: كەسێك زۆر ئامۆژگاری خەڵك بكا ٥ بەرگدرو ٥ **النَّصوحُ**: كەسێك زۆر ئامۆژگاری خەڵك بكا ٥ دەشگوترێ: (توبة نصوح) تۆبەی خاڵصو راستاڵ ٥ **النَّصيحُ**: بەمانا (الناصِح) دێ ٥ **النَّصيحة**: ئامۆژگاری ٥ **نَصَرَهُ على عدوه**: یارمەتی دا بۆئەوەی بەسەر دوژمنەكەی دا سەربكەوێ ٥ رزگاری كرد لەناخۆشیو چورتم ٥ **ناصَرَهُ**: یارمەتی ئەوی دا، ئەویش یارمەتی ئەمی دا ٥ **نَصَّرَهُ**: كردی بەفەلە (بەمەسیحی) ٥ **إنْتَصَرَ**: ملی بۆ ستەمكارەكە نەدا، سەرپێچی زاڵمەكەی كرد ٥ **إنْتَصَرَ على خصمه**: بەسەر ركابەرەكەی دا باڵادەست بوو ٥ **إنْتَصَرَ من خصمه**: تۆڵەی لەركابەرەكەی كردەوە ٥ **تناصَرَ القومُ**: خەڵكەكە یارمەتی یەكتریان دا ٥ **تَنَاصَرَت الأخبار**: هەواڵەكان یەكتریان پشت راست كردەوە ٥ **تَنَصَّرَ**: بوو بەمەسیحی ٥ **إسْتَنْصَرَ بفلان**: هاواری بۆ فلانكەس برد ٥ **إسْتَنْصَرَ فلاناً**: داوای یارمەتی لەفلانكەس كرد ٥ **إسْتَنْصَرَ فلاناً على فلان**: داوای لەفلانكەس كرد یارمەتی بدا بۆئەوەی بەسەر فلانكەس دا سەربكەوێ ٥ **الأنصار**: دانیشتوانی شاری مەدینە كە موسوڵمان بوونو یارمەتی پێغەمبەریان دا ٥ **الأنْصَرُ**: خەتمنە نەكراو ٥ **النّاصِرُ**: رێڕەوی ناو بۆ ناو شیو ٥ **النّاصِرَة**: شارێكە لەوڵاتی فەڵەستین گوایە حەزرەتی عیسا لەوێ لەدایك بۆوە ٥ **النّاصور**: بەمانا (النّاسور) دێ ٥ **النَّصْرُ**: یارمەتیو كۆمەكی ٥ دەشگوترێ: (رجل نصر) پیاوێكی یارمەتیدەرە ٥ **النصراني**: فەلەو گاور، مەسیحی ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (نصرانیة) ٥ **النَّصرانیة**: مەسیحی، شوێنكەوتوانی حەزرەتی عیسا ٥ درودی خودای لەسەربێ ٥ **النُّصْرَةُ**: یارمەتیو كۆمەك ٥ **النُّصور**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (النّاصِرُ) دێ ٥ **النّصيرُ**: بەمانا (النّصور) دێ واتە: زۆر كۆمەكیكارو یارمەتیدەر ٥ **النَّصيرَةُ**: مێینەی (النّصیر) ٥ بەخششو دیاریی.

**نَصَّ على الشَّیْئِ نَصّاً**: شتەكەی دیاری كردو رونی كردەوەو سنووری بۆ دانا ٥ دەگوترێ: (نصّوا فلاناً سیِّداً) فلانكەسیان دیاری كرد بەسەرۆكو رێش سپی خۆیان.

**نَصَّ الشَّیْئَ**: شتەكەی بەرز كردەوە، دەری خست ٥ دەگوترێ: (نَصَّت الظَّبْیَةُ جیدها) ئاسكەكە گەردنی خۆی بەرزكردەوە، دەری خست ٥ دەشگوترێ: (نَصَّ الحدیث) فەرموودەكەی بەرزكردەوەو پاڵی دایە حەدیس گێڕەوەكەی كەلێیەوە ڕیوایەت كردووە.

**نَصَّ المتاعَ**: كاڵاكانی خستنە سەر یەك.

**نَصَّ فلاناً**: فلانكەسی لەسەر كورسی دانیشاند.

**نَصَّ الشَّیْئَ**: شتەكەی جوڵاند، هێنایی‌و بردی.

**نَصَّ الدابة**: وڵاخەكەی دنە دنەدا بۆئەوەی خێرا بڕوا ٥ هەروا دەگوترێ: (نَصَّ فلاناً) لە فلانەسی كۆڵیەوەو چووە بن كلێشەیەوە هەتا چی لابوو لێی دەرهێنا ٥ **ناصَّ غریمه**: لێكۆڵینەوە و چەندو چونی لەگەڵ قەرزدارەكەی كرد ٥ **نَصَّصَ المتاعَ**: كاڵاكانی خستنە سەریەك ٥ **إنْتَصَّ الشَّیْئُ**: شتەكە بەرزبۆوەو رێك وەستا ٥ **إنْتَصَّت العروس**: بوكەكە لەسەر كورسی دانیشت ٥ **تناصَّ القومُ**: خەڵكەكە پاڵەپەستۆیان كرد ٥ **المِنَصَّةُ**: كورسییەكی بەرزە یان تەختەیەكی بەرزە ئامادە دەكرێ بۆ وتارخوێن بچێتە

سەری وتاربدا یان بوك بچێتە سەری خۆی نیشانی نامادەبوان بدا ◊ وایش دەبێ ئەو كورسیو تەختە بەقوماشی جوانو ناوریشمو شتی وا دەڕازێندرێتەوە ◊ دەشگوترێ: (وضع فلان على المنصة) فلانكەس ڕانوێندراو حەپایان بردو فەزح بوو ◊ المَنصوصُ علیه: شتی رونو ئاشكرا ◊ النَّصُّ: دەق ◊ خودی قسەی دانەر چۆنی لێ بیستراوە بەبێ دەستكاری كردن ◊ ڕشتەو وشەیەك تەنها یەك مانای هەبێ ◊ یان تەئویل كردن هەڵنەگرێ ◊ بەلای زانایانی ئوصولی فیقهەوە ئاوە بۆ دەقەكانی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) ◊ هەروا وشەی (النَّصّ) بەمانا كۆتاییو ئەو پەڕی شت دێ ◊ دەگوترێ: (بلغ الشَّیْئُ نَصَّهُ) شتەكە گەیشتە كۆتایی ◊ یان گەیشتە ئەستوراییو جەنگەو كوشندەی شتەكە ◊ النَّصَّةُ: كاكۆڵ؛ قژی پێشەسەر كە بۆلای ناوچەوان شۆڕ دەبنەوە ◊ النَّصیصُ: دەگوترێ: (أمر نصیص) كارێكی گرنگو جدییە.

**نَصَعَ الشَّیْئُ:** شتەكە دەركەوت ڕون بۆوە صاف بوو ◊ دەگوترێ: (نَصَعَ لونُهُ) و (نَصَعَ الأمرُ) (نَصَعَ الحقُ) حەقو ڕاستی دەركەوت (نَصَعَ فلان) فلانكەس حی لابوو دەركەوت ◊ (نصع بالحق) دانی بەحەق دا نا ◊ أنْصَعَ بالحق: ددانی بەحەقو ڕاستی دا نا.◊ أنْصَعَ للشرّ: بەرەنگاریی شەڕو ئاژاوە بۆوە ◊ أنْصَعَ الرجلُ: پیاوەكە ئەوەی لەدەروونی دا بوو دەری خست ◊ پێستی گرژ بوو تێكچوو ◊ ناصَعَهُ الخَبَرَ: هەواڵەكەی بەڕاستی بۆ گێڕایەوە ◊ النَّاصِعُ: پاڵفتەو ساغ ◊ دەگوترێ: (أبیض ناصِع) سپی تەواو سپی ◊ (أحمر ناصع) سوری تەواو سور ◊ (حق ناصِع) حەقی ڕونو ئاشكرا ◊ (حسب ناصع) نژادو بنەچەی پاكو خاوێنو پاڵفتە لەهەموو عەیبو لەككەیەك ◊ النَّصّاعُ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (الناصِع) دا دێ ◊ دەگوترێ: (أحمر نصّاع) ◊ (حمرة نَصّاعة) ◊ النُّصْعُ: هەر پێستو قوماشێك سپی بێ زۆر سپی بێ ◊ النِّصَعُ: ڕاخەرێك لەپێست دروست كرابێ ◊ النَّصیعُ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانا (الناصِعُ) دێ ◊ پاڵفتە لەڕەنگی خۆی داو تەواو كامڵ لەو ڕەنگەدا (سپی تەواو سوری تۆخ) ◊ صافو ڕونو بێ گەرد ◊ دەگوترێ: (شربنا ماءً نصیعاً) ئاوێكی پاكی ڕونی پاڵفتەكراومان خواردەوە.

**نَصَفَ الشَّیْئُ:** شتەكە بوو بەنیوە ◊ دەگوترێ: (نَصَفَ النهار ونَصَفَ اللیلُ) ڕۆژ بوو بەنیوەڕۆ ◊ شەو بوو بەنیوە شەو ◊ دەشگوترێ: (نَصَفَ البُسْرُ والثمرُ) هێشوە خورماكە، میوەكە نیوەگەیی بوو، ئاڵو بۆڵەكەی بووبە نیوە.

**نَصَفَ الشَّیْئَ:** گەییشتە نیوەی شتەكە.

**نَصَفَ الإزارُ ساقَهُ:** دەرپێیەكە گەیشتە نیوە گۆزینگی.

**نَصَفَ الشیبُ رأسَهُ:** نیوەی سەری سپی بوو.

**نَصَفَ الكتابَ:** كتێبەكەی كرد بە دووبەش.

**نَصَفَ القومَ:** نیوەی ماڵی لەخەڵكەكە ستاند.

**نَصَفَ فلاناً:** خزمەتی فلانكەسی كرد ◊ أنْصَفَ الشَّیْئُ: شتەكە بووبەنیوە ◊ أنْصَفَ فلان: فلانكەس عادڵ بوو ◊ أنْصَفَ الشَّیْئَ: شتەكەی كرد بەنیوە ◊ دەگوترێ: (أنْصَفَ الماءُ الإناءَ) ئاوەكە گەیشتە نیوەی قاپەكە ◊ أنْصَفَ فلاناً: بەشێوەی عادلانە مامەڵەی لەگەڵ فلان دا كرد ◊ أنْصَفَ فلاناً من فلان: مافی فلانكەسی لەفلانكەس وەرگرت ◊ ناصَفَهُ الشَّیْئَ: شتەكەی

لەگەڵ کرد بەنیوە ٥ **نَصَّفَ الشَّيْءَ**: شتەکە بوو بەدووبەش ٥ **نَصَّفَ البُسْرُ**: بەرسیلە خورماکە نیوەی شیرین بوو ٥ **نَصَّفَ رأسُهُ**: سەری نیوەی سپی بوو (سەری بوو بەماش‌و برنج) ٥ **نَصَّفَ فلانٌ**: فلانکەس پیر بوو ٥ **نَصَّفَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کرد بە دوو بەش ٥ شتەکەی پەردە پۆش کرد، داپۆشی ٥ **إنْتَصَفَ الشَّيْءُ**: شتەکە گەیشتە نیوەی ٥ **إنْتَصَفَ النهار**: ڕۆژەکە گەیشتە کاتی نیوەڕۆ ٥ **إنْتَصَفَ فلان**: فلانکەس داوای بەکارهێنانی ویژدانی کرد ٥ **إنْتَصَفَت الجارية**: کچەکە بەپارچە قوماش سەری خۆی داپۆشی ٥ **إنْتَصَفَ مِنْ فلان**: مافی خۆی بەتەواوی لەفلانکەس وەرگرت ٥ تۆڵەی لێ ساندەوە ٥ **إنْتَصَفَ الشَّيْءَ**: نیوەی شتەکەی هەڵگرت ٥ **تناصَفَ القومُ**: خەڵکەکە ویژدانیان لەگەڵ یەکتر بەکارهێنا ٥ مافی خۆیان لەیەکتر وەرگرت ٥ دەشگوترێ: (تناصف وَجهُها حسناً) دەم‌و چاوی ڕێك‌و پێك‌و جوان بوو ٥ **تَنَصَّفَت الجارية**: کچۆڵەکە پارچە قوماشی کرد بەسەر پۆش‌و ڕووبەندی خۆی ٥ دەشگوترێ: (تَنَصَّفَه الشيبُ) موی سەرو ڕیشی بەنیوەیی سپی بوون (ماش‌و برنج بوون) ٥ (تَنَصَّف من فلان) مافی خۆی لەفلان ستاند ٥ (تَنَصَّفَ الشَّيْءَ) نیوەی شتەکەی برد ٥ **تَنَصَّفَ السلطان**: داوای لەفەرمانڕەوا کرد ویژدانی لەگەڵ دا بەکاربێنێ ٥ **تَنَصَّفَ فلاناً**: خزمەتی فلانکەسی کرد ٥ (تَنَصَّفَه) داوای پیاوەتی‌و پارمەتی فلانکەسی کرد ٥ **إسْتَنْصَفَ**: داوای بەکارهێنانی ویژدانی لەگەڵ دا کرد ٥ **إسْتَنْصَفَ منه**: بەمانا (أنصف منه) دێ ٥ **إسْتَنْصَفَ السلطان**: داوای لەپاشا کرد ویژدانی لەگەڵ دا بەکاربێنێ ٥ **الأنْصَفُ**: (إسم تفضيل) واتە بە ویژدانتر ٥ **المتناصِفُ من الأمكنة**: شوێنی تەخت‌و ڕێك‌و جوان ٥ **المنتصَفُ من كل شيئ**: ناوەڕاستی شت ٥ **المَنْصِفُ**: بەمانا (المنتصف) دێ ٥ دەگوترێ: (بلغ مَنْصِفَ الطريق) گەیشتە نیوەی ڕێگا ٥ **المُنَصَّفُ**: شەرابێکە ئەوەندە کوڵابێ نیوەی ڕۆیی بێ ٥ **المُنَصَّفُ**: پیاوێکە بەمێزەر سەری داپۆشیبێ ٥ **النّاصِف**: خزمەتکار ٥ **النّاصِفَةُ**: ڕێڕەوی ناو لەناو شیو و دۆڵ دا ٥ **النَّصْفُ**: ویژدان ٥ دەگوترێ: (ما جعلوا بيني وبينهم نِصْفاً) لەدادگاییکردنی من‌و ئەوان دا دادوەرەکان ویژدانیان بەکارنەهێنا ٥ هەروا بەمانای نیوەی شت دێ ٥ **النَّصَفُ**: پیر ٥ دەگوترێ: (رجل نَصَفٌ) پیاوێکی پیرە کەوتۆتە ساڵەوە ٥ **النَّصْفان**: تا نیوە پڕ بوو ٥ (إناء نَصْفان) قاپێکە تا نیوەی پڕبووە ٥ **النَّصِفَةُ**: ویژدان ٥ **النَّصيفُ**: نیوەی شت ٥ هەرشتێك سەرداپۆشێ لەمێزەرو چارۆکەو گۆترەو شتی وا ٥ هەروا بەمانا خزمەتکار دێ.

**نَصَلَ اللونُ**: ڕەنگەکەی نەما ٥ دەگوترێ: (نَصَلَ الخضابُ) خەنەکە ڕەنگی چۆوە نەما.

**نَصَلَ الشَّعْرُ أو الثَّوبُ**: قژەکە یان قوماشەکە ڕەنگی نەما ٥ ڕەنگەکەی چۆوە کاڵ بۆوە.

**نَصَلَ السيفُ من قرابه**: شمشێرەکە لەکالانی دەرچوو.٥ **نَصَلَ الخيلُ من الغبار**: ڕەوە ئەسپەکە لەتەپ‌و تۆز دەرچوون.

**نَصَلَ الدُّرُّ من السِلْك**: دەنکە مرواریيەکە لەڕیز دەرچوو.

**نَصَلَ بِحَقِّي صاغراً**: بەناچاری حەقی خۆمی دا مافی خۆمی دەرکرد.

**نَصَلَ السَّهْمَ والرُّمْحَ**: نوکی تیژی خستە سەر تیرو ڕمبەکە ٥ **أنْصَلَ الشَّيْءَ من الشَّيْءِ**: شتەکەی

لەشتەکە دەرهێناو لای برد ٥ **أنصَلَ السَّهْمَ والرُّمْحَ:** سەرە تیرو سەرە رمبەکەی لابرد ٥ **نَصَّلَهُ:** سەرەتیرەکەی لەتیرەکە شەتەك دا ٥ **إنْتَصَلَ السَّهْمُ ونَحْوهُ:** سەرەتیرەکە دەرهات (تیرەکە سەرەتیژەکەی لێ بۆوە) ٥ **تناصَلَ الشَّيْءُ:** شتەکە دەرکەوت، هاتەدەر ٥ دەگوترێ: (تناصَلَتْ أسنانه) ددانی دەرهاتن ٥ **تَنَصَّلَ اللونُ:** بەمانا (نَصَلَ) دێ ٥ واتە: رەنگی چۆوە ٥ **تَنَصَّلَ كَمَدُ فلان:** نارەحەتی فلانکەس نەما ٥ **تَنَصَّلَ من الشَّيْءِ:** لەشتەکە قوتار بوو ٥ **تَنَصَّلَ من ذنبه:** لەتاوان رزگاری بوو ٥ **تَنَصَّلَ الشَّيْءَ:** شتەکەی دەرهێنا ٥ هەڵی بژارد ٥ **تَنَصَّلَ فلاناً:** هەرچی بەفلان بوو لێی ساند ٥ **إسْتَنْصَلَ الشَّيْءَ:** هەوڵی دا شتەکە دەربێنێ، دەری هێنا ٥ دەگوترێ: (إسْتَنْصَلَت الريحُ اليَبْسَ) رەشەباکە هەموو روەکە وشکبووەکانی لەبێخ هەڵکەند ٥ **المِنْصالُ:** دەسکە سندۆڵ (بەردێکە درێژو چاککراو ساوەرو شتی وای پێ دەکوترێ) ٥ **المُنْصُلُ:** شمشێر ٥ **النّاصِلُ:** دەگوترێ: (حية ناصل) ریشێکە خەنەکەی چۆتەوە رەنگی نەماوە ٥ (سهم ناصل) تیرێکە سەرەکەی لێ بۆتەوە ٥ **النَّصْلُ:** سەرەتیر، سەرە رمب، نوکی چەقۆو کێرد ٥ هەروا ناوە بۆ گلۆلە ریسی رێسراو کەلە تەشیەکە داماڵدرابێ ٥ **النَّصِيلُ:** پاچ، قولینگ ٥ جومگەی نێوان ملو سەر ٥ دەگوترێ: (ضرب نصيلَهُ) لەگێزەرەی ملی دا ٥ گەنمی پاککراو لەهەموو خشتو خۆڵ گوێزرو مرۆرو شتی وا ٥ **نصيل الحجر:** روی بەرد ٥ (نصيل الرأس) تۆقەسەر ٥ **نَصْنَصَ البعيرُ:** حوشترەکە ئەژنۆی لەزەوی گیر کرد بۆئەوەی هەڵسێ ٥ **نَصْنَصَ في مَشْيِهِ:** لەرۆیشتن دا خۆی بادا ٥ **نَصْنَصَ الشَّيْءَ:** شتەکەی جوڵاند لەقاندی ٥ **النَّصْناصُ:** دەگوترێ: (حية نصناص) مارێکی جمو جوڵ کەرەو زۆر دێ و دەچێ هەداداني نیە ٥ **نَصاه نَصْواً:** ناوچاوانی گرت قژی پێشەسەری گرت ٥ **أنْصى المكانُ:** شوێنەکە گیا (سەبتی) زۆر بوو لەوەری باشی زۆر بوو ٥ **ناصى فلاناً:** هەریەك لەو دووانە کاکۆڵی یەکتریان گرتو دەستیان لەقژی یەکتر وەرهێناو قژی یەکتریان راتەکاند ٥ دەشگوترێ: (فلان يناصي فلاناً) فلانکەس کێشەو نیزاعی لەگەڵ فلان دا هەیە ٥ **ناصى الشَّيْءُ الشَّيْءَ:** شتەکە بەشتەکەوە نووسا ٥ دەگوترێ: (هذه الفلاة تناصي أرض كذا) ئەم ساراچۆڵە لکاوە بەزەوی فلانەوە ٥ **إنْتَصى الشَّيْءُ:** شتەکە درێژ بۆوە، دەگوترێ: (إنتصى شعره) قژی درێژ بوو ٥ **إنتصى الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵبژارد ٥ **تناصى القومُ:** خەڵکەکە چنگیان لەقژی یەکتروەرهێناو یەکتریان هێناو بردو شەریان بوو ٥ **تناصت الأشياءُ:** شتەکان وێك کەوتن ٥ دەگوترێ: (هَبَّت الريحُ فتناصت الأغصان) با هەڵی کردو لقە درەختەکان پێکەوە نووسان ٥ لێکدران ٥ **المُنْتَصى:** شوێنی نزیکبوونەوەی دووشتو پێك گەیشتنیان ٥ **النّاصِيَةُ:** پێشەسەر، قژی پێشەسەر کەدرێژ بێو ببێتە کاکۆڵ٥ دەگوترێ: (أذلّ فلان ناصية فلان) فلانکەس سوکایەتی بەفلانکەس کردو رێزی شکاند ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان ناصية قومه) فلانکەس پیاو ماقوڵی گەلەکەیەتی ٥ کۆتایی شەقام کەلەشەقامێکی تر بدا ٥ **النَّصِيُّ:** روەکی (سەبط) کە باشترین لەوەرە بۆ ئاژەڵ ٥ **النَّصِيَّةُ:** تاکی (النَّصِي)یە ٥ باشماوە.

**نَضَبَ الماءُ نُضُوباً:** ئاوەکە رۆچوو ٥ دەگوترێ: (نَضَبَ خيرُهُ) خێرو بێری کەم بوو ٥ (نَضَبَ ماء وجهه) بێ حەیا بوو، شەرمی نەما ٥ (نَضَبَ

عمرُه) تەمەنی بەسەرچوو، کۆتایی بەژیانی هات.

**نَضَبَ عنه**: لێی گیرا، تێیدا ئاخێ بوو.

**نَضَبَ المکانُ**: شوێنەکە دوور بوو.

**نَضَبَ الماءُ نضوباً**: ئاوەکە ڕۆچوو بەناخی زەوی دا ٥ **نَضَبَت الحلوب**: شیردەرەکە شیری کەم بوو بەناخۆشی شیری لێ دۆشرا.

**التَّنْضُبُ**: ڕوەکێکی دەشتەکی تەمەن درێژە لەپەنددا هاتووە دەڵێ: (کأنه حِرْباء تنضبة) واتە بەڵاو نەگبەتی.

**نَضِجَ**: پێگەیی و کاتی خواردنی هات ٥ دەگوترێ: (نَضِجَ الرأيُ و نَضِجَ الأمر) ٥ **نَضِجَت الحامِل بولدها**: ژنە سکپڕەکە کاتی منداڵبوونی هاتو زۆری بەسەردا تێپەڕی منداڵەکەی نەبوو ٥ **أنْضَجَهُ**: پێی گەیاند ٥ دەگوترێ: (أنضَجَ الرأيَ والأمْرَ) ڕاو بۆچوون و کارەکەی پوختەو ڕاستەو پاستە کرد ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان لا يُنضِجُ کراعاً) فلانکەس لاوازو بێ دەسەلاتە هیچی پێ جێبەجێ ناکرێ ٥ **نَضَّجَهُ**: وای لێ کرد پێ بگاو بەکەڵکی سود لێ وەرگرتن بێ ٥ **إسْتَنْضَجَ الطعامَ**: خواردنەکەی پێگەیاند ٥ **المِنْضاجُ**: شیشی گۆشت برژاندن ٥ **النَّضيجُ**: (تمر نضيج) خورمای پێگەیشتوو گەییو ٥ دەگوترێ: (فلان نضيج الرأي) فلانکەس ڕاو بۆچوونی ڕێک و پێک و مەحکەمی هەیە.

**نَضَحَ نَضْحاً**: ئاوی لێ چوو، دەڵاندی، تەڕایی دا.

**نَضَحَ الإناءُ بما فيه**: گۆزەکە چی تێدا بوو ئەوەی لێ هاتەدەر.

**نَضَحَ الجِلْدُ بالعرق**: ئارەق لەپێستی هاتەدەر، پێستی ئارەقی دەردا.

**نَضَحَ العينُ**: چاو فرمێسکی ڕژاندن.

**نَضَحَ الشجَرُ**: درەختەکە پۆخی کرد بۆئەوەی بپشکوێ.

**نَضَحَ الثوبَ ونَحوَهُ**: بەئاو یان بەبۆنی خۆش قوماشەکەی ڕشاند ٥ دەگوترێ: (نَضَحَه بالغبار) خۆڵبارانی کرد ٥ دەگوترێ: (نَضَحَتنا السماء) ئاسمان بارانی بۆ باراندین.

**نَضَحَ القوم بالنبل**: خەڵکەکەی تیرباران کردو پەرتەوازەی کردن ٥ (فلان ينضح عَنْ نفسه) فلانکەس بەرگری لەخۆی دەکا ٥ نەفسی خۆی دامرکاند، ڕامی کرد.

**نَضَّحَ الزرعَ**: کشت و کاڵەکەی ئاودا ٥ **نَضَحَت الدابة الماءَ**: ولاغەکە ئاوەکەی هەڵێنجا بۆئەوەی ئاودێری پێ بکرێ ٥ **أنْضَحَ الزرعُ**: بەمانا (نَضَحَ) دێ ٥ **أنضَحَ عِرضَ فلان**: ناموسی فلانکەسی شکاندو لەککەداری کرد ٥ **ناضَحَهُ مناضَحَة ونِضاحاً**: هەریەک لەو دوانە حەیای یەکتریان برد، ئابڕوی یەکتریان تکاند ٥ دەگوترێ: (ناضَحَ عنه) داکۆکی لێ کرد ٥ **إنْتَضَحَت العينُ**: بەمانا (نَضَحَ) دێ ٥ **إنْتَضَحَ الماءُ**: ئاوەکە پرژا بەسەر شتەکەداو تەڕی کرد ٥ **إنْضَحَّ عليه الماءُ**: بڕوانە مادەی (ضَخَخَ).٥ **المِنْضَحَةُ**: ئامێری ئاو پرژاندن ٥ یان بەخاخی بۆن پرژاندن ٥ **تَنَضَّحَت العينُ**: چاوەکە فرمێسکی ڕژاند ٥ ڕیپۆقی لێ کەوتە خوار ڕیپۆقی لێ دەرهات ٥ **النّاضِحُ**: ولاخی ئاو گواستنەوەو ئاوکێشان ٥ باران ٥ **النَّضْحُ**: ئاوی پرژێندراو ٥ کشت و کاڵ ٥ عەترو بۆنی شل کەمکوو ئاو وابێ ٥ **النَّضَحُ**: ئەو پرژو دڵۆپانەی دەپرژێندرێن ٥ حەوزی ئاو ٥ **النَّضْحَةُ**: بارانی کەمۆ پچڕ پچڕ ٥ **النَّضّاحة**: دەگوترێ: (قوسٌ نَضّاحة) کەوانێکە زۆر بەهێزە تیر دوور دەهاوێ ٥ **النَّضوحُ**: دەگوترێ: (مزادة

نضوح) کوندیەکە ئاو دزە دەکا ٥ (قوس نضوح) کەوانێکە تیر بەتەوژم دەهاوێ ٥ هەروا وشەی (نضوح) ناوە بۆ جۆرە عەترێك بۆنەکەی زوو بڵاو دەبێتەوە ٥ **النَّضیحُ**: حەوز ٥ عەرەق.

**نَضَخَ الماءُ**: ئاوەکە بەتەوژم لەسەرچاوەکەی هەڵقوڵاو فوارەی کرد.

**نَضَخَ الشَّیْءَ**: شتەکەی تەڕکردو بەئاو ڕشاندی یان عەتری پێ کرد ٥ دەشگوترێ: (نَضَخَ القوم بالنبل) خەڵکەکەی تیرباران کرد.

**أنْضَخَ الزَّرْعُ**: دانەوێڵەکە دەنکەکەی پێگەیی‌و هەر تەڕە، وشك نەبوو ٥ **ناضَخَهُ مناضَخةً ونِضاخاً**: هەریەکەیان ئەوی تری ئاو ڕشێن کرد ٥ **إنْتَضَخَ الماءُ ونحوه**: ئاوەکە پرژا ٥ **إنْضَخَ علیه الماءُ**: بڕوانە مادەی (ضَخَخَ) ٥ **المِنْضَخَةُ**: ئامێری ئاو پرژاندن‌و گوڵاو وشتی وا پرژاندن ٥ **النَّضْخُ**: شوێنەواری بۆن‌و شتی وا کە بە قوماشەوە بمێنێ ٥ دەگوترێ: (أرسل السماءُ نَضْخاً): ئاسمان بارانی باراند ٥ **النَّضْخَةُ**: یەك جار باران بارین، یان یەك جار پرژاندنی عەترو گوڵاو ٥ (نَضْخَة من مطر) تۆزێك باران ٥ بارانی کەم ٥ **النَّضّاخُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَضخ) دێ ٥ **غیث نَضّاخٌ**: بارانێکی بەتەوژم‌و لێزمەو ڕێژنەو زۆر ٥ **النَّضّاخَةُ**: مێینە (النَّضّاخُ) دەگوترێ: (عین نَضّاخة) سەرچاوەیەکی فیچقە کەرە ئاو بەتەوژم‌و فیچقە هەڵدەدا.

**نَضَدَ الشَّیْءَ نَضْداً**: شتەکەی ڕیزکرد بەریزو ڕێك‌و پێکی خستنیە پەنایەك ٥ **نَضَّدَهُ**: بەمانا (نَضَدَهُ) دێ ٥ **تَنَضَّدَت الأشیاءُ**: شتەکان بەتەختی‌و ڕێك‌و پێکی کەوتنە پەنایەك‌و ڕیز بەند بوون ٥ دەگوترێ: (تَنَضَّدت أسنانه) ددانی جوان ڕیزبوون ٥ **المِنْضَدَةُ**: ئەو تەختەدارو سەکۆیەی ڕاخەرو شت‌و مەکی ناوماڵی دەخرێتە سەر ٥ مێزو تەپڵەك: کەسێ قاچ یان زیاتری هەبن‌و شتی بخرێتە سەر ٥ **المُنَضَّدُ**: شتی ڕێك‌و پێك کراو ٥ **النَّضْدُ**: ڕێك خستن‌و ڕێك کردن ٥ شتی ڕێکخراو ڕیزکراو هەڵچنراو ٥ دەگوترێ: (جسم نَضَد) جەستەی ڕێك‌و پێك ٥ (وفي السماء نضد من السحاب) لەئاسمان هەور چین چین کەوتۆتە سەریەك ٥ هەروا ناوە بۆ تەختەو سەکۆیەك کە شت‌و مەکی ماڵی لەسەر ڕیز دەکرێ، هەڵدەچنرێ ٥ هەروا دەگوترێ: (لفلان نَضَدٌ) ئەوانە پشت‌و پەنای فلانکەسن ٥ **النَّضیدُ**: بەمانا ڕیزکراو دێ ٥ دەشگوترێ: (شجر نضید) درەختێکە لەخوارەوە بۆسەرەوە بەگەڵاو میوە ڕیز بووە داپۆشراوە ٥ **النَّضیدَةُ**: مێینەی (النضید) ٥ هەروا ناوە بۆ سەرین‌و پشتی ٥ هەرشتێك کاڵای تێهاخندرابێ.

**نَضَرَ نضوراً ونَضْرَةً**: شتەکە تەڕو تازەو ڕەونەق دار بوو.

**نَضَرَ الشَّیْءَ**: شتەکەی جوان‌و ڕەونەق دار کرد.

**نَضِرَ نَضَراً**: بەمانا (نَضِرَ) دێ.

**نَضُرَ نضارةً**: بەمانا (نَضَرَ) دێ ٥ (فهو نَضِرٌ) ٥ **أنْضَرَ الشَّیْءُ**: بەمانا (نَضَرَ) دێ ٥ **أنْضَرَ الشَّیْءَ**: شتەکەی ڕەونەق دار کرد، گەشەی پێ کرد ٥ جوانی کرد، ڕازاندییەوە ٥ **إسْتَنْضَرَ الشَّیْءَ**: شتەکەی بەجوان‌و ڕازاوە هاتە بەرچاو بەجوان‌و ڕازاوەی لەقەڵەم دا ٥ **الأنْضَرُ**: ئاڵتون ٥ **الناضِرُ**: دەم‌و چاوی گەشاوەو تەڕو تازە ٥ دەگوترێ: (وجه ناضر ولون ناضر) دەم‌و چاوی گەش‌و جوان ڕەنگی گەش‌و جوان ٥ هەروا وشەی (الناضر) ناوە بۆ قەوز ٥ **النُّضار**: پاڵفتە لەهەر شتێك بێ ٥ دەگوترێ: (ذهب نضار)

زێڕی خاڵیص ٥ هەروا ناوە بۆ خودی (زێڕ) ٥ **النُّضْرُ**: ئاڵتون ٥ **النُّضْرُ**: ژن، هاوسەر، خێزان ٥ دەگوترێ: (هذه نِضْرُ فلان) ئەو ئافرەتە خێزانی فلانە ٥ **النُّضْرَةُ**: پارچە زێڕ ٥ نیعمەت، ورشەو گەشەو جوانی ٥ **النَّضیر**: (نبات نضیر) ڕوەکێکی تەڕو تازەو جوان ٥ دەگوترێ: (غُصْنٌ نضیر) لقەدرەختێکی تەڕو تازەو جوانە (جاریة نضیرة) کچۆڵەیەکی ناسكو جوانە ٥ (هو نضیر) ئەو پیاوە قۆزو جوانە ٥ هەروا ناوە بۆ ئاڵتون.

**نَضَّ الماءُ**: ئاوەکە چۆڕ چۆڕ ڕەوان بوو.

**نَضَّ له بشیئ**: شتێکی کەمی پێدا.

**نَضَّ إلیّ من معروفه شیئ**: شتێکی لەعەتاو بەخششی خۆی پێدام.

**نَضَّ الشَّیْئُ**: شتەکە پەیدا بوو دەستکەوت ٥ ئەوەی لەقەرزەکەت بۆت دیاری کراوە وەری گرە.

**نَضَّ الطائِرُ**: باڵندەکە باڵی لێك دان بۆئەوەی بفڕێ.

**نَضَّ الشَّیْئَ**: شتەکەی جوڵاندو لەقاندی ٥ **أنَضَّ الرضیعَ**: کەم کەم شیری دا بە شیرەخۆرەکە ٥ **تَنَضَّضَ فلاناً**: فلانکەسی هەڵنا بۆ فلان شت ٥ **تَنَضَّضَ الحاجَةَ**: ئیشەکەی جێبەجێ کرد ٥ **إسْتَنَضَّ الشَّیْئَ**: بەدو شتەکەدا چوو ٥ شوێنی کەوتو لێی کۆڵیەوە ٥ دەگوترێ: (هو یَستَنِضّ معروف فلان) لەپیاوەتیو بەخشایشی فلان شتی دەست دەکەوێ ٥ وردە وردە شتی لێ پەیدا دەکا ٥ **یَسْتَنِضُّ حقه منه**: وردە وردە مافی خۆی لێ وەردەگرێ ٥ **النُّضاضَةُ**: شتی کەمو بچوك ٥ دەگوترێ: (ما عندي من الماء إلا نُضاضَةٌ) کەمێك ئاوم لایە جۆرێکم ئاو لایە ٥ (إستوفيت حقي منه وبقيت عليه نُضاضة) مافی خۆم لێ ستاند کەمێکی لاماوە ٥ باقی ماندەیەکی لاماوە ٥ هەروا دەگوترێ: (هو نُضاضَةُ ولده) ئەو دوا منداڵیەتی.٥ **النّضوض**: دەگوترێ: (بئر نضوض) بیرێکە ئاوەکەی بەشێوەی ئاوەدز لێ دێتەدەر ٥ **النَّضیضُ**: شتی کەمو بچوك ٥ دەگوترێ: (ماء نضیض) ئاوی کەمو چۆڕ چۆڕ (هو نضیض اللحم) ئەو کزو داڵگۆشتە ٥ **النَّضیضَةُ**: دەگوترێ: (مطر نضیضة) بارانی کەم و پچڕ پچڕ (سحابة نضیضة) تەنکە هەور هەوری کەم تۆیسکە هەور ٥ دەشگوترێ: (ترکت الدواب ذات نضیضة) وڵاخەکانم بەتینوایەتی جێ هێشت ٥ **نَضَفَت الدابة نضفاناً**: وڵاخەکە دامرکا، ژێربار بوو.

**نَضَفَ فلاناً نَضْفاً**: خزمەتی فلانکەسی کرد.

**نَضَفَ الشَّیْئَ**: هەموو شتەکەی برد، کڕی، خواردی.

**نَضَفَ الشَّیْئُ نَضْفاً**: شتەکە پیس بوو ٥ **أنْضَفَ فلان**: فلانکەس بەردەوام بوو لەسەر خواردنی ڕوەکی (النضیف) کەڕوەکێکی بۆنخۆشە ٥ **أنْضَفَت الناقةُ**: حوشترەکە ژێربار بوو ٥ **أنْضَفَ الدابة**: خاوەنی وڵاخەکە هەوڵی دا وڵاخەکە ژێربار بکاو وای لێ بکا بەویستی ئەو بڕوا ٥ **إنتَضَفَ الشَّیْئَ**: هەموو شتەکەی تەواو کرد، خواردی بردی، دایپۆشی ٥ **النَّضْفُ**: ڕوەکێکی بۆنخۆشو عەتر ئامێزە لە پێڕی (الشفویات) ٥ **النَّضَفُ**: ڕوەکێکی بۆنخۆشە لەبواری داو و دەرمان دا بەکاردێ ٥ **نَضَلَهُ نَضْلاً**: پێشی کەوت لەبواری تیرو تفەنگ هاوێژی دا ٥ دەگوترێ: (ناضَلَهُ فنضَلَهُ).

**نَضِلَ نَضَلاً**: کزو لاواز بوو، ماندو بوو ٥ **أنْضَلَ الدابة**: وڵاخەکەی ماندوو کزو لاواز کرد ٥ **ناضَلَ عنه**: پارێزگاری لێ کرد ٥ داکۆکی لێ کرد پاساوی بۆ هێنایەوە ٥ **ناضَلَ فلاناً**: لەبواری

تیرهاوێژی دا پێشبڕکێی لەگەڵ کرد ◊ **إنْتَضَلَ القومُ**: خەڵکەکە لەتیرهاوێژی دا پێشبڕکێیان کرد ◊ **إنْتَضَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دەرهێنا ◊ **إنْتَضَلَ السيفَ**: شمشێری لە کالان دەرکێشا ◊ **إنْتَضَلْتُ من القوم رجلاً**: پیاوێکم لەمنەتەوەکە هەڵبژارد ◊ **تناضَلَ القوم**: خەڵکەکە پێشبڕکێیان کرد لەتیر هاوێژی دا ◊ **تَنَضَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دەرهێنا ◊ هەوڵی دەرهێنانی دا ◊ **تَنَضَّلَ سهماً من كنانته**: تیرێکی لەتیردانەکەی دەرهێنا ◊ **النَّضيلُ**: هاوشان لەتفەنگ هاوێژیو تیر هاوێژی دا ◊ دەگوترێ: (فلان نضيلي) فلانکەس هاوشانمە لە تیر ئەندازی داو پێشبڕکێم لەگەڵ دەکا.

**نَضْنَضَ فلان**: فلانکەس ماڵو سامانی زۆر بوو ◊ **نَضْنَضَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لەقاندو دەری هێنا ◊ **نَضْنَضَ لِسانَهُ**: زمانی دەرکێشا ◊ دەشگوترێ: (ما زال يُلِحُّ به حتى نَضنَضَ منه شيئاً) بەردەوام پەخەی گرتو وازی لێ نەهێنا تا شتێکی لێ هەڵکڕاند ◊ **النَّضْناضُ من الحَيَّات**: ئەو مارەیە لەشوێنێك ئۆقرە ناگرێو هەر دێو دەچێو شەڕانیو زێنە خرۆیە ◊ یان ناوە بۆ ئەو مارەی زمان دەردێنێو دەیجوڵێنێ ◊ **النَّضْناضَةُ**: مێینەی (النَّضناض).

**نَضَا اللَّونُ**: ڕەنگەکە کاڵ بۆوە، چۆوە.

**نَضَا الماءُ**: ئاوەکە ڕۆچوو.

**نَضَا الجُرْحُ**: برینەکە هاوساوییەکەی نیشتەوە.

**نَضَا الشَّيْءَ**: شتەکەی دەرهێناو فڕێی دا.

**نَضَا الثَّوبَ عنهُ**: قوماشەکەی لەبەر داڕنی کراسەکەی لێ داکەند.

**نَضَا منه الشَّيْءَ**: لێی دەرهێنا.

**نَضَا المكانَ**: لەشوێنەکە تێپەڕی شوێنەکەی خستە دوا خۆیەوە.

**نَضَا الجوادُ الخَيلَ**: ئەسپە ڕەسەنەکە لەغاردن دا پێش ماینەکە کەوت.

**نَضِيَ الشَّيْءَ من الشَّيْءِ**: شتەکەی لەشتەکە دەرهێنا ◊ فڕێی دا.

**نَضِيَ الثَّوبَ**: کراسەکەی کۆنو ڕزیو کرد ◊ **أنضى فلان**: فلانکەس وڵاخەکانی کزو لاواز بوون ◊ **أنضى الدابة**: وڵاخەکەی لاواز کرد، ماندوی کرد ◊ **أنضى الثوبَ**: کراسەکەی ڕزاند ◊ **أنضى فلاناً**: ئاژەڵێکی لاوازی دا بە فلانکەس ◊ **نَضَّى الشَّيْءَ عَنْ الشَّيْءِ**: شتەکەی لەشتەکە دەرهێناو فڕێی دا ◊ **إنْتَضى السَّيْفَ**: شمشێری لەکالان دەرکێشا ◊ **إنْتَضى الثوبَ**: قوماشەکەی ڕزاند ◊ **تَنَضَّى الدابةَ**: وڵاخەکەی ماندو و کزو لاواز کرد ◊ **النُّضاوة**: (نُضاوة الشَّيْءِ) ئەوەی لەشتەکە دەبێتەوە لەکاتی دەرهێنان دا بەتەوژم ◊ **النِّضْوُ**: کزو لاواز ئاژەڵی داڵگۆشتو کز ◊ دەگوترێ: (فلان نِضو سَفَرٍ) فلانکەس کزو لاوازی سەفەرکردنە ◊ (ثوب نِضْوٌ) قوماشی ڕزیو ◊ (سَهم نِضْوٌ) تیری خراپو بێ کەڵك ئەوەندە هاوێژراوە خراپ بووە لەکەڵك کەوتووە ◊ ئاسنی لغاو بەبێ سەرمەکەی ◊ **النَّضِيُّ من الحيوان**: ئاژەڵی لاوازو بێ گۆشت.

**نَضِيُّ السَّهم**: نێوان پەڕو خەدەنگی.

**نَطَبَ فلاناً نَطْباً**: پەلەپیتکەی لەگوێچکەی فلانکەس دا.

**نَطَبَ الديك الشَّيْءَ**: کەڵەشێرەکە بەدەندوك لەشتەکەی دا، شتەکەی دەندوك هاژن کرد ◊ **المِنْطَبُ**: مەصفی (شت پاڵێو) ◊ **المِنْطَبَةُ**: بەمانا (المِنطَب) دێ ◊ (النواطِب) کونی شت پاڵێو، کونی مەصفی ◊ **نَطَحَهُ الثورُ ونحوه نَطْحاً**: ڕەشە وڵاخەکە قۆچی تێهەڵدا.

**نَطَحَ فلاناً عَنْ كذا:** فلانكەسی لەو كارە لادا ٥ هەروا دەگوترێ: (هذا أمر لا ينتطح فيه عنزان) ئەمە شتێكە دوو بزن شەڕەقۆچی لەسەر ناكەن (واتە: كەس نیە بڕوای بەئەوە نەبێ‌و ڕەتی بكاتەوە) ٥ **ناطحه مُناطحة ونِطاحاً:** هەریەكە لەو دوانە قۆچی لەوی تردا، شەڕە قۆچیان كرد ٥ لەشەڕەقۆچ دا بەسەری دا زاڵ بوو ٥ **ناطَحَ فلان فلاناً:** فلانكەس بەربەرەكانی فلانكەسی كرد ٥ **تناطَحَ الكبشان:** دوو بەرانەكە شەڕە قۆچیان كرد ٥ **تناطحت الأمواج والسيول:** شەپۆلەكان یان لافاوەكان تێكیانەوە هاویشت ٥ **النّاطحة (ناطحة السحاب):** باڵەخانەی بەرز ٥ **النّطيح:** قۆچ تێهەڵدراو ٥ كەسێك بەقۆچ لێدان مردبێ ٥ **النطيحة:** (الشاة النطيحة) مەڕێك بەشەڕەقۆچ مندار بوبێتەوە.

**نَطَرَ الكرمَ وغيره:** مێوەكەی پاراست بەخێوی كرد ٥ **النّاطِرُ:** ڕەزەوان، ڕەز بەخێوكەر ٥ **الناطور:** بەمانا (الناطِرُ) دێ. ٥ **النّطّارُ:** داوەڵ ٥ پۆشاكێكە (پاڵتۆیەكە) لەناو كشت‌و كاڵ دا بەدارێك دا هەڵدەواسرێ بۆئەوەی دڕندەو ئاژەڵی كێوی سڵی لێ بكەنەوەو وابزانن ئەوە مرۆڤە.

**نَطِسَ نَطَساً:** بەسەرنجدانەوە لەكارەكان ڕاماو لێیان وردبۆوە ٥ **تَنَطَّسَ فِي الشَّيْءِ:** لەشتەكە ورد بۆوە تێی ڕاما ٥ دەگوترێ: (فلان يَتَنَطَّسُ في ملبسه ومأكله) فلانكەس زۆر لە پۆشاك‌و خواردەمەنی خۆی ورد دەبێتەوە زۆریان بیر لێ دەكاتەوە تا هەڵیان دەبژێرێ ٥ (فهو يَتَنَطَّسُ في كلامه) زۆر لەقسەكردنی خۆی ورد دەبێتەوە، بیردەكاتەوە ئەمجار قسەكە دەكا ٥ **تَنَطَّسَ فلان من كذا:** فلانكەس قێزی لەو شتە كردەوە ٥ دەگوترێ: (تَنَطَّسَ من مؤاكلة فلان) بێزی كرد لەخواردن لەگەڵ فلان دا، بێزی نەهات لەگەڵ فلان نان بخوا ٥ **تَنَطَّسَ عَنْ الأخبار:** لەهەواڵەكانی كۆڵیەوە ٥ **الناطِسُ:** جاسوس ٥ **النِّطاسيّ:** زاناو شارەزا لەزانست‌و ئەدەب دا، پزیشكی كارامە ٥ **النِّطْسُ:** بەمانا (النِّطاسيُّ) دێ ٥ بێزكەرەوە لەشت ٥ **النُّطُسُ:** پزیشكانی كاراماو دەست ڕەنگین ٥ كەسانێك كەبێز لەشت دەكەنەوە. ٥ **النِّطّيسُ:** وردبین لەكارو باردا، شارەزاو پسپۆڕ لەبواری پزیشكی دا ٥ **النُّطَسَةُ:** كەسێك زۆر بیر لەشت بكاتەوە.

**نَطَّ نَطّاً ونطيطاً:** بازی دا.

**نَطَّ في الأرض:** بەناو زەوی دا ڕۆیی.

**نَطَّ في منطقه:** لەقسەكردن دا زمانی پیس بوو، قسەی نەشیاوی كرد، چەڵتەچەڵتی كرد.

**نَطَّ الشَّيْءَ نَطّاً:** شتەكەی درێژكردەوە توندو گشتی كرد ٥ **الأنَطُّ:** (سَفَرٌ أنطّ) سەفەری دوورو درێژ ٥ **عَقَبَة نطاء:** تەنگانەو ڕێگای ناخۆش كەماوەیان زۆربێ ٥ **النَّطّاطُ:** زۆربڵێ‌و چەقەچەناو و قسە ترِن ٥ جۆرێكە لە كولەبێتان كە كشت‌وكاڵ دەخوا ٥ **النَّطيطُ:** دەگوترێ: (مكان نطيط) شوێنی دوور.

**نَطَعَ اللّقمة نَطعاً:** هەندێكی لەپارووەكە خواردو باقی مەندەكەی خستەوە سەر سفرەكە ٥ **نُطِعَ لونه نَطْعاً:** ڕەنگی گۆڕا ٥ **تَنَطَّعَ فلان:** فلانكەس شتێكی لە پاروەكە خواردو ئەوی تری خستەوە سەر سینیەكەی ٥ **تَنَطَّعَ في الشّيْءِ:** زۆر بیری لەشتەكە كردەوە و لێی ورد بۆوە ٥ دەگوترێ: (تَنَطَّعَ في كلامه) لەقسەكردن دا زۆر درێژەی پێداو وردەكاریی تێدا كردو لێی كۆڵییەوە.

**تَنَطَّعَ في شهواته:** ڕۆچوو لەشەهوەت‌و نارەزۆبازی دا ٥ **تَنَطَّعَ في عمله:** لەنێشو كارەكەی دا زیرەك‌و

شارەزا بوو ٥ **النُّطاعَةُ**: پارو نیوەی بخورێ‌و نیوەکەی تری بخرێتەوە سەر سفرەکە ٥ **النِّطْعُ والنَّطَعُ**: چەرمێکە لەرۆژگاری رابردودا تاوانباری لەسەر کوژراوە بەشمشێر یان بەشتی تر ئیعدام کراوە بۆیە گوتراوە: (عَليّ بالسَّيف والنّطع) شمشێرو چەرمەکە لەعۆدەی من بێ من دابینی دەکەم بۆ کوشتنی تاوانبار ٥ هەلاشی ئەشکەوت ٥ مەلاشوو ٥ دەگوترێ: (هذا من الحروف النطعيّة) ئەم پیتە لەوانەیە کەلەمەلاشوّوە دەردەچن کەبریتین لە (گ ٥ د ٥ ت) ٥ **النُّطُعُ**: ئەوانەی لەقسەکردن دا زۆر درێژ دادڕن‌و زمانیان بادەدەن.

**نَطَفَ نَطْفاً**: دلۆپەی کرد ٥ دەگوترێ: (نَطَفَت القِرْبَة) کوندەکە لێی چوو، دلۆپەی کرد ٥ ناوی لێ تکا ٥ (نَطَفَ السَّحابُ) هەورەکە دلۆپ دلۆپ بارانی لێ هاتە خوار ٥ (جاء سيفه ينطف دماً) هات شمشێرەکەی خوێنی لێ دەتکا ٥ دەگوترێ: (فلان ينطف بسوء) فلانکەس خراپەی لێ دەتکێ.

**نَطَفَ الماءَ**: ئاوەکەی ڕژاند.

**نَطَفَ الجُرْحَ نَطْفاً**: برینەکەی هەلاشتەوە کوانەکەی دەرکرد ٥ دەگوترێ: (نَطَفَه بعيب) عەیبو خەوشی پاڵ دا، عەیبداری کرد.

**نَطِفَ الشَّيْءُ نَطْفاً**: شتەکە خراپ بوو ڕزی تێکچوو کەلکی نەما.

**نَطِفَ الحيوانُ**: ئاژەلەکە لویەکی لەگەدەدا پەیدابوو خوێن دەدەلێنێ.

**نَطِفَ الرجلُ**: پیاوەکە برینی سەری قوڵ بوو گەیشتە مۆخی ٥ لەرێی گومانەوە تۆمەتبار کرا ٥ **أنْطَفَهُ**: ڕەخنەی لێ گرت ٥ لەرێی گومانەوە تۆمەتباری کرد ٥ **نَطَّفَ فلاناً**: ڕەخنەی لەفلان گرت ٥ **نَطَّفَ المرأةَ**: گوارەی کردە گوێی ئافرەتەکە ٥ **تَنَطَّفَ**: قوڕاوی بوو، خوێناوی بوو ٥ **تَنَطَّفَتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە گوارەی لەگوێ کرد ٥ **تَنَطَّفَ من كذا**: بێزی لەوە هەلسا ٥ **النّاطِفُ**: شتی شل وەکوو ئاو و شلەمەنی لەو جۆرە ٥ جۆرە حەلوایەکە لەبادام‌و گوێزو فستق دروست دەکرێ ٥ **النُّطافَة**: ناوی کەم ٥ جۆرە ئاو ٥ **النَّطَفُ**: عەیب‌و خەوش ٥ دەگوترێ: (مابه نَطَفٌ) ٥ (وقع في النّطفِ) کەوتە ناو شەڕو ناخۆشیەوە ٥ **النُّطْفَةُ**: ناوی صاف‌و ڕون ٥ دەگوترێ: (سقاني نُطفةً عذبةً، ونِطافاً عِذاباً) ٥ دلۆپەئاو قەترە عارەق ٥ دەگوترێ: (جاء وعلى جبينه نِطاف) هات بەناوچاوانیەوە دلۆپە ئارەق هەبوون ٥ دلۆپە مەنی ٥ **النُّطْفَةُ**: مرواری بچوک‌و وردو ڕون ٥ گوارە ٥ **النَّطوف**: دلۆپەکەر؛ هەرشتێك دلۆپەی لێ بتکێ ٥ دەگوترێ: (ليلة نطوف) شەوێکی باراناوی بوو تابەیانی باران باری.

**نَطَقَ نُطْقاً ومَنْطِقاً**: قسەی کرد ٥ (نَطَقَ الطائِرَ) باڵندەکە دەنگی لێوە هات.

**نَطُقَ الرجلُ**: پیاوەکە بوو بە قسەزان‌و قسەڕەوان ٥ **أنْطَقَهُ**: بەقسەی هێنا، وای لێ کرد قسە بکا ٥ **ناطَقَهُ**: قسەی لەگەڵ کرد ٥ **نَطَّقَهُ**: بەمانا (أنْطَقَهُ) دێ ٥ ناوقەدی بەپشتێن بەست ٥ دەگوترێ: (نطّقَ الماءُ الشجرَ والأكمةَ) ئاو گەیشتە ناوقەدی درەختەکە، یان ئاو گەیشتە ناوەڕاستی گردەکە ٥ **إنْتَطَقَ**: ناوقەدی خۆی بەپشتێن یان بەقایش بەست ٥ دەگوترێ: (إنْتَطَقَت الأرض بالجبال) زەوی بەکێوەکان دەوران دەور دراوە ٥ کێوەکانی کردوە بەپشتێنی خۆی ٥ هەروا دەگوترێ: (هو ينتطق بقومه وإخوانه) ئەو پشت بەهۆزو خزم‌و کەس‌وکاری دەبەستێ ٥ **إنْتَطَقَ فرساً**: لەتەنیشت

ئەسپەکەوە ڕۆیی و سواری نەبوو ٥ **تناطَقَ الرجلان:** دوو پیاوەکە کەوتنە گفتو گۆ لەگەڵ یەکتر ٥ **تَنَطَّقَ:** ناوقەدی خۆی بەپشتێن بەست ٥ **تَنَطَّقَتِ الأرضُ بالجبال:** زەوی پشتێنی بەکێوەکان بۆخۆی دروست کرد، خۆی بەکێوەکان قایم و پتەو کرد ٥ **تَمَنْطَقَ:** ناوقەدی بەپشتێن بەست ٥ خەریکی فێربوونی زانستی مەنتیق بوو ٥ **إسْتَنْطَقَهُ:** داوای لێ کرد قسە بکا ٥ قسەی لەگەڵ کرد ٥ **المُسْتَنْطِق:** کەسێکە لەبواری پۆلیسی و دادوەری دا لێکۆڵینەوە لەگەڵ تۆمەتبار دەکا ٥ **المَنْطِقُ:** ئاخاوتن و قسە ٥ هەروا وشەی (المنطق) ناوە بۆ زانستێك یاساو ڕێسایەکی تایبەتی خۆی هەیە کە پەیڕەوییان بکەی زەین لەهەڵە دەپارێزرێ ٥ دەگوترێ: (فلان منطقي) فلانکەس مەنتیق زانە زانستی دەربارەی مەنتیق باشە ٥ بیرو زەینی بەهەڵە ناچێ ٥ **المُنْطَقُ:** پشتێن، هەرشتێك ناوقەدی مرۆڤی پێ پتەو بکرێ ٥ **المِنْطَقَةُ:** بەمانا (المِنطَق) دێ ٥ بەشێکی دیاریکراو و سنوردار لەزەوی: کە تایبەتمەندییەکی هەبێ وەکوو (المِنطَقَة الإستوائية و مِنطَقة البحر الأبيض) ٥ **المُنطَقة:** بەمانا (المِنطَقة) دێ ٥ **المُتَطَقَةُ:** پشتێن بەستو ٥ یان ئاژەڵی ناوقەد بەڵەك.٥ **المَنطوق:** بەلای زانایانی ئوصولی فیقهەوە ئەومیە لەفز ڕاستەوخۆ بێ بەرچاوگرتنی هیچ شتێکی تر دەلالەت بکا لەسەر مانا ٥ **المِنطيقُ:** زمان ڕەوان ٥ ئافرەتێك بەنیسفەنج و پەڕۆو شتی وا سمت و کەفەڵی خۆی گەورە بکا ٥ **النَّاطِقُ:** (کتاب ناطِق) کتێبی ڕون و ئاشکرا (شيء ناطِق) شتی ئاشکرا ٥ (حيوان ناطِق) ئادەمیزاد، خاوەن بیرو هۆش. ٥ **النَّاطِقة:** مێینەی (الناطق) ٥ هەروا ناوە بۆ کەلەکەو خالیگە ٥ **النِّطَاقُ:** قایش پشتێن ٥ (ذات النِّطاقين) ناوە بۆ خاتو (ئەسماء)ی کچی

ئەبوبەکر ٥ بەرهەڵبێن: کە ئافرەت بۆ ئیش و کار بەبەرخۆی هەڵدەدا ٥ دەشگوترێ: (عَقَدَ فلان حُبُكَ النِّطاق) فلانکەس خۆی بۆ کارەکە ئامادە کرد ٥ (وهو واسع النِّطاق) ئەو مرۆڤە ئاسۆی بیرکردنەوەی بەرفراوانە ٥ **نِطاق الجَوْزاء:** سێ ئەستێرەن لەنێو کۆمەڵە ئەستێرەی جەوزادا ٥ **النُّطْقُ:** قسەکردن ٥ تێگەیشتن و هەست کردن بەچەمکە گشتییەکان.

**نَطَلَ الخمرَ:** شەرابەکەی گوشی ٥ ترێی گوشی کەلەناکام دا دەبێتە شەراب.

**نَطَلَ الماءَ:** ئاوەکەی وردە وردە ڕژاند.

**نَطَلَ المريضَ:** وردە وردە ئاو و شتی وای بەسەر نەخۆشەکەدا کرد بەمەبەستی چارەسەری نەخۆشییەکەی ٥ **نَطَّلَ المريضَ:** بەمانا (نَطَلَهُ) دێ ٥ **إنتَطَلَ من الإناء:** لەگۆزەکەوە چۆڕ چۆڕ ئاوی ڕژاند ٥ **المَنْطَلَةُ:** شوێنی میوە گوشین ٥ چەرمس ٥ **النَّاطِلُ:** پیاڵەیەکی بچکۆلەیە نمونەی شەرابی تێ دەکرێ بۆ بانگەشەو ڕاکێشانی کڕیار بۆ شەرابەکە ٥ ئامێرێکی پێوانەیە بۆ پێوانەکردنی هەندێ شلەمەنی و خۆراك ٥ باقی مەندەیەك لەشتی پێوانەکراو کەلەبنکی ئامێری پێوانەکەدا دەمێنێتەوە ٥ قومە ئاو و قومە بیرەو شتی وا ٥ دەگوترێ: (ما ظفرت منه بناطل) قومە ئاوێکم لێی دەست نەکەوتووە ٥ **النَّطْلُ:** تلپەو شتی ڕەق هەڵاتوی شلەمەنی ٥ **النُّطْلَةُ:** قومە ئاو، چۆڕە ئاو ٥ شتی کەم ٥ دەگوترێ: (أخذ من الإناء نطلة) شتێکی کەمی لەزەرفەکە دەرهێنا ٥ **النَّطيلُ:** دۆڵچە ٥ ئامێرێکی بچوکە شلەمەنی پێ پێوانە دەکرێ ٥ دەشگوترێ: (فلان نطيل) فلانکەس زیرەکە، لێهاتووە ٥ (رماه الله بالنطيل) خودا بەلاو

کارەساتی بەسەر هێنا ٥ **نَطْنَطَ الشَّيْءَ**: شتەکە دوورکەوتەوە.٥ **نَطْنَطَت الأرضُ**: زەوییەکە دوور بوو ٥ (نَطْنَطَ فلانٌ) فلانکەس سەفەرەکەی دوورخستەوە ٥ (نَطْنَطَ الشَّيْءَ) شتەکەی درێژکردەوە ٥ **تَنَطْنَطَ**: دوورکەوتەوە ٥ **النَّطناطُ**: درێژو تولانی ٥ دەشگوترێ: (رجل نطناط) پیاوێکی زۆر بڵێو چەقەچەناو ٥ **النُّطْنُطُ**: بەمانا (النَّطناط) دێ.

**نطأ المنزلُ نَطْواً**: مەنزڵەکەی دوور بوو.

**نطأ الحَبْلَ**: حەبلەکەی درێژ کردەوە.

**نطأ الغَزْلَ**: ڕیسەکەی ڕست.

**أنطى**: پێی بەخشی (واتە: دەق بەمانا (أعطى))دێ ٥ بۆیە قیرائەتێك هەیە (إنا أنطيناك الكوثر) خوێندراوەتەوە ٥ **نطاةُ**: کێشەی لەگەڵ نایەوە ٥ یارمەتی دا بۆ ڕستنی ریسی بۆئەوەی زوو ڕانكوچۆغەکەی پێ بگەن ٥ **تناطى القومُ**: خەڵکەکە پێشبڕکێیان کرد ٥ **المَنْطُوُّ**: (سفر مَنْطُوٌّ) سەفەرێکی درێژ ٥ (ثوب مَنطوّ) قوماشێکی کۆنو فرێدراوە ٥ **النَّطِيُ**: بەمانا (المَنطوُّ) دێ.

**نَظَرَ الى الشَّيْءِ**: بۆ شتەکەی ڕوانی.

**نَظَرَ فيه**: تێی فکری، سەرنجی دایە ٥ دەگوترێ: (نَظَرَ في الكتاب) لەکتێبەکەی ڕوانی، تێی فکری ٥ دەشگوترێ: (فلان ينظر ويعتاف) فلانکەس سەیری کتێب دەکاو ڕەمڵ لێ دەدا.

**نَظَرَ لفلان**: فلانکەسی لاواندەوەو یارمەتیدا.

**أنظُر لي فلاناً**: فلانکەسم بۆ بانگ بکە.

**نَظَرَ بين الناس**: دادگایی نێوان ئادەمیزادەکانی کرد.٥ **نَظَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بینی ٥ دەشگوترێ: (داري تنظر داره) خانوەکەم بەرامبەر خانوەکەیەتی ٥ هەروا وشەی (نظر) بەمانا پاراستنو چاودێری کردن هاتووە ٥ بەمانا مۆڵەتدانو دواخستن هاتووە.

**نَظَرَ المبيعَ**: کاڵاکەی بەقەرز فرۆشت.

**نَظَرَ فلاناً**: شتی لەفلانکەس کڕی بەقەرز.

**نَظَرَ الشَّيْءَ**: چاوەڕوانی شتەکەی کرد ٥ دەگوترێ: (نَظَرتُ فلاناً الى الظهر) چاوەڕوانی فلانکەسم کرد تانیوەڕۆ ٥ **أنظَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دواخستو وەغراندی ٥ **أنظَرَ فلاناً**: شتی بەقەرز بەفلانکەس فرۆشت ٥ ڕێگای تێڕوانینی پێدا ٥ **أنظَرَ فلاناً بفلان**: فلانکەسی کردە هاوشانی فلان ٥ **ناظَرَ فلاناً**: بووبەهاوشانی فلانکەس ٥ گفتو گۆی لەگەڵ فلانکەس کرد، لەدەمەدەمێو موناقەشەدا بۆری دا ٥ **ناظَرَ الشَّيْءَ بالشيء**: شتەکەی کردە هاوتای ئەو ٥ دەگوترێ: (داري تناظر داره) خانوەکەم بەرامبەر خانوەکەیەتی ٥ هەروا دەگوترێ: (جمعهم يناظر الألف) کۆمەڵەکەیان نزیکی هەزار کەسە ٥ **نَظَّرَ الشَّيْءَ بالشيء**: شتەکەی بەرامبەر شتەکەی تر کرد بەنەوی گرت ٥ **إنْتَظَرَهُ**: چاوەڕوانی کرد ٥ **تناظر القومُ**: خەڵکەکە سەیری یەکتریان کرد ٥ **تناظر في الأمر**: دەمەدەمێو کێشەو جەدەلیان کرد ٥ دەشگوترێ: (دورهم تناظر) خانوەکانیان بەرامبەر یەکترن ٥ **تَنَظَّرَهُ**: چاوی تێ بڕی ٥ چاوەڕوانی بوو ٥ هێدی بوو لەگەڵی دا ٥ دوای خست ٥ ئیشەکەی وەغراند ٥ **إسْتَنْظَرَهُ**: چاودێری کرد ٥ داوای مۆڵەتی لێ کرد ٥ **إسْتَنْظَرَهُ على كذا**: کردی بە موراقیبو چاودێر بەسەر ئەو شتەوە ٥ **المُناظِرُ**: کێشەکارو بەڵگە هێنەرەوەو ڕکابەر ٥ هاوشان ٥ **المِنْظارُ**: ئاوێنە ٥ دووربین، میکرۆسکۆب ٥ تیلیسکۆب ٥ **المَنْظَرُ**: تێڕوانین ٥ دیمەنو وێنە کەسەیری بکەی

سەرنجت ڕابکێشێ ◊ شوێنی چاودێری ◊ المَنظَرَةُ: بەمانا (المَنظَرُ) دێ ◊ ژوورێکە لەناو خانودا پێشوازیی میوانی تێدا دەکرێ ◊ کۆمەڵێك مرۆڤ بڕواننە شتێك ◊ المنظور: دەگوترێ: (سيد منظور) پیاوێکی گەورەو بەخشندەیە پیاوەتی لێ چاوەڕوان دەکرێ ◊ (شيء منظور) شتێك چاو بەملۆق بوەستێنێو سەرنج ڕاکێش بێ ◊ (طفل منظور) منداڵێکە توشی چاوێشە بووە ◊ الناظر: تەماشاکەر ◊ چاو ◊ ڕەشێنەی چاو ◊ کارگێڕو کاربەدەستی وڵاتو دەفەرێك ◊ النَّاظِرَة: مێینەی (النَّاظِر) ◊ چاو ◊ الناظور: بەمانا (النّاطور) دێ ◊ ڕیش سپیو پیاو ماقوڵی نەتەوە ◊ نَظَارِ: ئیسم فیعلە بەمانا فیعلی ئەمرە، واتە چاوەڕوان بە ◊ النَّظارَةُ: سەرناسیو زیرەکیو خوێندنەوەی دەموچاوی بەرامبەر ◊ پیشەی چاودێری ◊ النَّظَرُ: چاو، ئەندامی بینین ◊ هێزی تێفکرینو بیرکردنەوە ◊ شوێنی تێ ڕامانو بیر لێ کردنەوە ◊ النَّظرُ: هاوشان ◊ النَّظرَةُ: تێڕوانینێك، چاو پیاخشاندنێك ◊ چاوەزار، بەچاو هەنگاوتن ◊ ڕەحمەتو بەزەیی ◊ النَّظِرَةُ: چاوەڕوانی، شت فرۆشتن بەشێوەی قەرز ◊ دەگوترێ: (إشتريته بِنظِرَة) بەقەرز لێم کڕی ◊ النَّظَرِيُّ: دەگوترێ: (أمر نَظَرِيٌّ) کارێکە پێویستی بەلێ وردبوونەوەو فیکرو خەیاڵ هەیە، زۆر پێویستی بەتەجرەبەی زانستیو ئەزمونی زانستی نیە ◊ النظريّة: بیروبۆچونێکە بەبورهان دەچەسپێندرێ ◊ لەبواری فەلسەفەدا کۆمەڵێك ڕاو بۆچونن هەندێ ڕوداوی (زانستی یان فەننی) یان پێ ڕون دەکرێتەوە ◊ نظرية المعرفة: لێکۆڵینەوە لەو جورتەو تەنگژانەی لەئاکامی پەیوەندی نێوان شەخسو مەوزوع، یان نێوان ناسێنەرو ناسراو پەیدا دەبن ◊ النَّظّارُ: چاوتیژ، زۆر سەیرکەر ◊ النَّظّارَةُ: خەڵك کەبڕواننە شتێك ◊ عەینەك، چاویلکە ◊ النَّظورُ: بەمانا (النَّظّار) دێ ◊ چاوتیژ، دەگوترێ: (رجل نظور) پیاوێکە چاوی لەشتەکە ناتروکێنێ ◊ (نظورة الجيش) پێشەتای سوپا؟ ◊ النَّظير: گفتو گۆکار، هاوشانو هاو وێنە ◊ دەگوترێ: (فلان منقطع النظير) فلانکەس وێنەی نیە لەو بوارەدا شارەزاو لێهاتووە ◊ دەشگوترێ: (هو نظيرة قومه) ئەو پیاوە گەورەپیاوی نەتەوەکەیەتی ◊ دەشگوترێ: (عددت الأشياء نظائِرَ) شتەکانم دوو دوو ژماردن ◊ النظائر المُشِعّة: گەردیلەی تیشك ئاوەر.

**نَظُفَ نظافةً:** لەچڵك پاکبۆوە ◊ نَظَّفَهُ: پاکی کردەوە ◊ دەگوترێ: (نَظّفَ قلبَه) دڵو دەروونی خۆی پاراست لە ڕەوشتی ناشیرینو شوبهەو حەرام ◊ تَنَظَّفَ: پاکبۆوە ◊ دەگوترێ: (نَظَّفَهُ فَتَنَظَّفَ) پاکی کردەوە پاکبۆوە ◊ دەشگوترێ: (فلان يَتَنَظَّفُ) فلان خۆدەپارێزێ لەهەرشتێك عەیبو عاربێ ◊ إستَنظَفَ الشَّيئَ: شتەکەی بەپاکی وەرگرت ◊ المِنظَفَةُ: پاککەرەوە ◊ النَّظِيفُ: دەگوترێ: (هو نظيف السراويل) ئەوپیاوە داوێن پاکە ◊ (فهو نظيف الأخلاق) ئەو ڕەوشت بەرزە ◊ هەر شتێك پاککەرەوەبێ وەکوو صابونو تایتو ئەسپۆن ◊ نَظَمَ الأشياءَ نَظْماً: شتەکانی ڕێك کردنو خستنیە پەنایەك.

**نَظَمَ اللؤلؤ ونحوه:** مرواریو شتی لەو جۆرەی هۆنینەوە.

**نَظَمَ شِعراً:** ڕستەو وشەی سەروا دارو کێشداری ڕیزکردن، شیعری دانان ◊ دەشگوترێ: (نَظَمَ أمْرَهُ) کاروباری خۆی ڕێك خستن ◊ نَظْمَ الأشياءَ: بەمانا (نَظَمَ) دێ ◊ إنتَظَمَ الشَّيئُ: شتەکە ڕێكو

پێك بوو ٥ ڕێك هاتە بەرچاو ٥ دەگوترێ: (نَظَّمَهُ فانْتَظَمَ) شتەكەی ڕێك كردو ڕێك بوو ٥ دەگوترێ: (إنْتَظَمَ أمْرُهُ) كاری دامەزراو نیشەكەی ڕێك كەوت، كێشەی نەما ٥ **إنْتَظَمَ الأشياء**: شتەكانی كۆ كردەوەو خستنیە پەنایەكەوە ٥ **تَناظَمَت الأشياءُ**: شتەكان چونە پەنایەكەوەو ریز بوون ٥ **نَظَّمَ الشَّيْئَ**: بەمانا (إنْتَظَمَ) دێ ٥ **الإنظام**: بەنی تەزبیح هۆنینەوە، هەربەن‌و دەزویەك میرو و شتی وای پێ بهۆندرێتەوە ٥ **الأنظومة**: بەمانا (الإنظام) دێ ٥ **النِّظام**: دەزو و بەن كە مرواری‌و شتی وای پێ بهۆندرێتەوە ٥ ڕێك‌و پێكی كاروبار ٥ **النَّظْمُ**: میرو و مرواری هۆنراوە، ملەوانكە ٥ دەشگوترێ: (أتانا نظم من جراد) چینە كولەیەكی زۆرمان بۆ هات ٥ كەلامی سەرەوادارو كێشەدار (پێچەوانەی پەخشان).

**نَظْمُ القرآن**: ئەو چۆنیەتی‌و شكڵ‌و شێوەیەی قورنان لە ڕوی دەق‌و شێوەی خوێندنەوەوە تەرتیبەوە ٥ هەروا ناوە بۆ كۆمەڵە ئەستێرەی سیومیل (سورەیا) و كۆو تەرازو ٥ **النظیم**: هۆنراوە ٥ هەرشتێك ڕێك‌و پێك بێ‌و بەشەكانی پێكەوە گونجاوبن ٥ **النَّظیمة**: تاڵە حەبل ٥ **النَّظِیمُ**: كەسێك زۆر شت بهۆنێتەوە ٥ شیعری زۆری نووسیبێ.

**نَعَبَ الغرابُ**: قەلە ڕەشەكە قیراندی، دەنگی لێوەهات.

**نَعَبَ البعیرُ**: حوشترەكە خێرا ڕۆیی ٥ **أنْعَبَ**: بەمانا (نَعَبَ) دێ ٥ دەشگوترێ: (أنْعَبَ فلان في الفتن) فلانكەس ئاژاوەی هەڵگیرساند ٥ **المِنْعَبُ**: (رجل مِنْعَبٌ) پیاوێكی چەقەچەناو و بەهات‌و هاوارە ٥ **النَّعْبُ**: (سیر نعب) ڕۆیشتنی خێرا (ریح نَعَبٌ) ڕەشەبای خێرا ڕەو ٥ **النَّعّابُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَعَبَ)دا دێ ٥ دەگوترێ: (ناقة نعوب) حوشترێكی خۆشرۆیە ٥ **نَعَتَهُ نَعْتاً**: مەدحی كرد ٥ دەگوترێ: (نعته بالكرم) ڕەوشتی نانبدەیی‌و سەخاوەتی پاڵ دا.

**نَعُتَ نعاتةً**: شیاوی ئەوەیە وەصفی بكرێ‌و باسی پیاوەتی‌و نانبدەیی بكرێ.

**نَعَتَ الفرسُ**: ئەسپەكە زینی لەسەر پشت لابرا ٥ ڕەسەن‌و پەسەند بوو ٥ **أنْعَتَ**: جوان بوو بۆئەوە دەشێ وەصفی بكرێ ٥ **إنْتَعَتَ الفرس**: ئەسپەكە ڕەسەن بوو ٥ **إنْتَعَتَ فلان بكذا**: فلانكەس بەو ڕەوشتە جوانە ڕازایەوە ٥ **إنْتَعَتَ فلاناً**: وەصفی فلانكەسی كرد بەچاكە ٥ **تناعته الناسُ**: خەڵك وەصفیان كرد ٥ **تَنَعَّتَهُ**: وەصفی كرد ٥ **إسْتَنْعَتَهُ**: هەوڵی دا ڕەوشتە جوانەكانی باس بكا ٥ **المَنْعَتُ**: وەصف‌و هەڵدانەوە ٥ دەگوترێ: (لە مناعت جمیلة) ڕەوشتی جوانی هەن.٥ **النَّعْتُ**: صیفەت‌و ڕەوشت ٥ دەشگوترێ: (شیئ نَعْتٌ) شتێكی باش‌و پەسەندە ٥ لەپێشبڕكێ دا هەمیشە براوەیە ٥ (فلان نعت) فلانكەس گەیشتۆتە ئەوپەڕی پلەبەرزی‌و سەركەوتن ٥ (إمرأة نعتة) ئافرەتێكە گەیشتۆتە ئەوپەڕی جوانی ٥ دەشگوترێ: (رجل نعتة) پیاوێكە پلەو پایەی لەوپەڕی بەرزی دایە ٥ **النَّعیت**: دەگوترێ: (فرس نعیت) ئەسپێكی ڕەسەنە، (رجل نعیت) پیاوێكی سەخی سروشتە پیاوێكی مەردە.

**نَعَثَ الشَّيْئَ نَعْثاً**: شتەكەی هەڵگرت ٥ **أنْعَثَ في مالە**: زێدەڕۆیی كرد لەماڵ بەخێرۆدان دا ٥ **أنْعَثَ فلان**: فلانكەس خۆی ئامادەكرد بۆسەفەر ٥ **نَعْثَلَ**: سەركەوت بەپلیكانەدا ٥ یان

بەشێوەیەك ڕۆیی وەكوو بەپەیژەدا سەربكەوێ ٥ یان واڕۆیشتو قاچی وا هەڵێنانەوە دەتگوت بەقاچەكانی شت هەڵدەهێنجێ ٥ **نَعْثَلَ الفَرَسُ في جريِه**: ئەسپەكە لەغاردان دا قاچەكانی واهەڵێنانەوە دەتگوت لەقوڕ دەریان دێنێ، واتە: بەقورسی قاچی بۆ هەڵ دەهێنرانەوە ٥ **نَعْثَلَ الشيخُ**: پیرەمێردەكە گێلو نەحمەق بوو ٥ **النُّعْثُلُ**: نێرەكەمتیار ٥ پیرە مێردی گێل ٥ **النُّعْثُلَةُ**: گێلی ٥ دەگوترێ: (فيه نُعْثلةٌ) ڕەوشتێكی گێلی تێدایە ٥ هەروا ناوە بۆ شێوە ڕۆیشتنی مرۆڤی پیر.

**نَعَجَ** نَعْجاً ونعوجاً: سپی بوو، هەموو جەستەی سپی بوو ٥ (فهو ناعج).

**نَعِجَ** نَعَجاً: قەڵەو بوو ٥ **أنْعَجَ القوم**: خەڵكەكە مەڕەكانیان قەڵەو بوون ٥ **النَّعْجَةُ**: مەڕەسپی ٥ مانگا كێوی ٥ دەگوترێ: (نساء كنعاج الرَّمْلِ) چەند ئافرەتێكی جوانو قەشەنگن چاوگەورەو چاو ڕەشن.

**نَعَرَ** نَعْراً: هاواری كرد، قیڕاندی ٥ **نَعَرَت الريحُ**: ڕەشەبا هەڵیكردو هاژەی هات.

**نَعَرَ العِرْقُ**: دەمارەكە خوێنەكەی فیچقەی كردو كفەی هات.

**نَعَرَ** فلان نَعْراً: فلانكەس سەرپێچی كردو ملی نەدا.

**نَعَرَ في البلاد**: بە وڵات دا هاتو چوو ٥ دەشگوترێ: (ماكانت فِتنة إلا و نَعَرَ فيها فلان) فیتنەو ئاشوبێك بەرپانەبووە ئیللا فلانكەس دەورێكی سەرەكی هەبووە تێیدا.

**نَعَرَ الحِمارُ** ونحوه نَعَراً: گوێدرێژەكە لوشكاندی ٥ **الناعور**: دەگوترێ: (عِرق ناعور وجرح ناعور) ڕەگێكە خوێنی ناوەستێ یان برینێكە خوێنی ناوەستێو وشك نابێ ٥ باڵو پەڕی ئاش ٥ دۆڵچەی ئاو هەڵێنجان ٥ ئامێری ئاو هەڵێنجان لەبیرو چاڵی گەورە. ٥ **النَّاعورة**: ئامێرێكە چەند دۆڵچەو دۆلابێكی لێ شەتەك دراون بەهۆی وڵاخو شتی وا هەڵدەخولێو ئاو لەبیرو چاڵی گەورە دەردەهێنێ ٥ **النَّعْرَةُ**: یەكجار هاواركردن ٥ فیشكەو لوشكەی كونەلوت ٥ **نَعْرَةُ النجم**: هەڵبونی باو تاوساندنی گەرما لەكاتی هەڵهاتنی ئەستێرەی (النجم)دا ٥ **النُّعَرَةُ**: لای ژوروی كونەلوت ٥ مێشەسەگ كە بە وڵاخەوە دەنیشێو ئەزیەتی دەدا ٥ هەروا دەچێتە ناو لوتی ئەسپو گوێدرێژەوە حەجمینی لێ هەڵدەگرێ ٥ دەشگوترێ: (في فلان نُعَرَة) فلانكەس فیزو خۆبەزلزانی تێدایە ٥ دەمارگیری پێوەدیارە ٥ **النُّعَارُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَعَرَ)دا دێ ٥ دەگوترێ: (جُرْح نعّار) برینێكە خوێنی ناوەستێ خوێنی زۆری لێ دێ ٥ (رجل نَعّار) پیاوێكە فیتنە جۆو ئاشوبگێڕە، هەمیشە خەریكی ئاژاوە نانەوەیە ٥ قۆشمەچیو فێڵباز ٥ هەروا ناوە بۆ باڵندەیەك دەشوبهێتە باڵندەی (كەناری سەوز) ٥ **النَّعورُ**: دەگوترێ: (عرق نعور) دەمارێكە لەكاتی خوێن لێ هاتنی دا كفەی لێ دێ ٥ دەنگی لێ دێ ٥ (ريح نعور) بایەكە لەكاتی سەرمادا گەرمی دێنێ یان لەكاتی گەرمادا هەوا فێنك دەكاتەوە ٥ (سفر نعور) سەفەرێكی دورودرێژە ٥ (همة نعور) وەرەو هیمەتێكی بەرز.

**نَعَسَ** نَعْساً: هەنۆزی هاتێ وەنەوز گرتی ٥ خەوی هات.

**نَعَسَ** جِسمه: جەستەی لاواز بوو (نَعَسَ رايه) رایەكەی لاواز بوو ٥ **نَعَسَت السوق**: بازاڕ شكا، بازاڕ كڕینو فرۆشتنی تێدا كەم بوو ٥ (نَعَسَ

جَدُّهُ) شانسی کەوت ٥ بێ بەخت بوو ٥ أَنْعَسَ فـلان: فلانکەس منداڵی تەمبەڵو تەوەزەلی بوون ٥ أَنْعَسَ فلاناً: فلانکەسی واڵێ کرد خەوی بێ هەنوژ بیگرێ ٥ تناعَسَ: خۆی وانیشان دا خەوی دێو هەنوژ گرتویەتی ٥ تناعَسَ البَرْقُ: هەورەبروسکە چەخماخەی دا ٥ النُّعاسُ: وەنەوز، هەنوژ ٥ لەش داهێزانو شل بوونی ڕەگەو دەمار ٥ سەرەتای خەو ٥ النُّعسَةُ: ساتە خەو، خەوێکی کەم، تۆزە خەو ٥ النَّعوسُ: کەسێك زۆر وەنەوز (هەنوژ) بیگرێ.

**نَعَشَ الشَّيْءَ نَعْشاً**: شتەکەی ڕاست کردەوە ٥ ڕاپەڕاند ٥ دەگوترێ: (نَعَشَ طرفَهُ) چاوی هەڵبڕی ٥ (نَعَشَ الشجرة المائلة) درەختە خوارەوە بووەکەی ڕاست کردەوە.

**نَعَشَ فلاناً**: دوای هەژاریی فلانکەسی کەمێ دڵدەداو هێنایەوە تایم ٥ یان لەو وەرتەو تەنگانە تێی کەوتووە ڕزگاری کرد فریای کەوت ٥ نَعَشَت الجماعة الميت: خەڵکەکە مردووەکەیان لەناوەدارەمەیت دا هەلگرت ٥ أَنْعَشَهُ: بەمانا (نَعَشَه) دێ ٥ دەگوترێ: (أَنْعَشَهُ من كبوته) لەتێکشانەکەی ڕاستی کردەوەو کەمێ وەری بەرزکردەوە ٥ نَعَشَهُ: بەرزی کردەوە، یان پێی گوت: خودا پایەبەرزو تەندروستت بکا ٥ إنْتَعَشَ من عثرته: لەنسکۆیەکەی هەڵسایەوە هەروا دەگوترێ: (إعْتَدَلَ الجوُّ فانْتَعَشَ الناس) هەوا خۆش بوو خەڵك هێزو توانای پەیدا کردووە ٥ المنعوشُ: دەگوترێ: (میت منعوش) مردوێکە لەدارە مەیت دا خراوەتە سەرشانی خەڵكو هەڵگیراوە ٥ النَّعْشُ: تەختەیەکە نەخۆشی دەخرێتەسەر یان مردو ٥ بنات النعش: حەوت ئەستێرەن لەلای قوتبی شیمالییەوە دەبینرێنو دەشوبهێندرێن بەکۆمەڵێك کە دارەمەیتیان هەلگرتبێ ٥ النُّعَیْشُ: ئەستێرەی سوهایە کەیەکێکە لە ئەستێرەکانی (بنات النعش)و لەهەموان خەفەترە.٥ نَعْطَلَ: لەڕۆیشتن دا بەملاو لادا خۆی بادا.

**نَعَّ نَعّاً**: لاواز بوو (فهو نعّ) ٥ النّعاعُ: ڕوەکی تەڕو تازەو ناسك کەتازە پێ دەگاو کامڵ نەبوو بێ ٥ تاکەکەی (نعاعة) ٥ النُّعْفُ: شوێنێکە کەمێك بەرز بێو هەندێ بەرزو نزمی تێدابێ ٥ النُّعْفَةُ: تیلمەچەرمی نەعلە: کە دەکەوێتە پشتە پێ ٥ النَّعَفَةُ: لکەمێژەر، پۆپنەی کەڵەشێرو شتی وا ٥ هەروا وشەی (النَّعَفَة) ناوە بۆ ئەو تیلمە چەرمانەی بەملاو بەولای کورتانو زینی ولاخ دا شۆڕدەبنەوەو هەندێ شتی سوارەکەی پێدا هەڵدەواسرێ.

**نَعَقَ الراعي بغنمه**: شوانەکە دەنگی ئاژەڵەکانی داو ڕاپەڕاندن.

**نَعِقَ في الفتنة**: لەفیتنە نانەوەدا جمو جوڵی هەبوو ٥ النُّعَاق: کەسێك زۆر بقیڕێنێ، زۆر فیتنە جۆبێ.

**نَعَلَ فلاناً**: نەعلی لەپێی فلان کرد.

**نَعَلَ الدابة**: ولاخەکەی ناڵ کرد ٥ شتێکی خستە قاچەکانی بیانپارێزێ.

**نَعِلَ نَعَلاً**: نەعلی لەپێ کرد ٥ أَنْعَلَت الدابة: ولاخەکە سپیایی بەپشت سمەکانیەوە دەرکەوت ٥ أنْعَلَ الدابة: ولاخەکەی ناڵ کرد ٥ پێتاو و شتی وای لەسمی ولاخەکە کرد.٥ نَعَّلَ الدابة: ولاخەکەی ناڵ کرد ٥ پێتاو و شتی وای لەسمی ولاخەکە کرد ٥ نَعَّلَ الحِذاء أو الخُفَّ: چەرمی لەبنکی پێلاوەکە یان خوفەکە دا ٥ إنْتَعَلَ: نەعلی لەپێ کرد ٥ دەگوترێ: (إنتعل الأرض) بە پێ کەوتەڕێو ولاخی سواری نەبوو ٥ إنْتَعَلَ

الشَّيْءَ: پێی لەشتەکە نا ٥ دەگوترێ: (إنتعلت المطيُ ظلالها) وڵاخەکە بەسەر سێبەری خۆی دا ڕۆیشت واتە ئەوکاتە خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان بوو ٥ تَنَعَّلَ: نەعلی لەپێ کرد ٥ تَنَعَّلَ الشَّيْءَ: شتەکەی کرد بەنەعل ٥ المَنْعَلُ والمَنعلة: زەوی پتەو ٥ دەگوترێ: (نَزَلْنا أرْضاً مَنعلاً) لەزەوییەکی پتەودا دابەزین و نیشتەجێ بووین ٥ النّاعِلُ: پیاوی خاوەن نەعل ٥ مرۆڤی پێڵاو لەپێ ٥ (حافِرٌ ناعِل) سمی ڕەق و قایم ٥ (وهي ناعلة) ئەو ئافرەتە پێستی بەری قاچی ئەستوور و پتەوە ٥ هەروا ناوە بۆ کەرەکێوی لەم ڕووەوە کە سمەکانی زۆر پتەون ٥ النَّعّالَةُ: نەعل دروستکەر، پینەچی ٥ النَّعّالُ: نەعل دروستکەر ٥ النَّعْلُ: پێڵاو، نەعل ٥ ئاسنێکی کەوانەییە، یا بڵێ جۆرە نالێکە بە بزمار لەسمی وڵاخ دەدرێ بۆ پارێزگاری سمی وڵاخەکە ٥ یان پێستێکی بتەوە دەکرێتە قاچی وڵاخەوە بۆئەوەی سمەکانی بپارێزێ.

**نَعْلُ** السیف: ئاسنێکە لەلای خواروی کالانی شمشێرەکەیە ٥ زەوی پتەو و ڕەقەن: کەڕوەکی لێ نەڕوێ ٥ دەشگوترێ: (إخْضَرَّت نِعال القوم) خەڵکەکە زاو و زێیان زۆربوو ٥ (رَقَّتْ نِعال القوم) خەڵکەکە ژیانیان خۆش بوو ٥ النَّعْلَةُ: نەعل کەبەری قاچ دەپارێزێ لەچڵ و ئازار.

**نَعِمَ** الشَّيْءُ: شتەکە نەرم و نیان بوو ٥ تەڕ و تازە بوو ٥ سێبەری خۆش بوو ٥ دەگوترێ: (نَعِمَ عَيْشُهُ) ژیانی خۆش بوو ٥ (نَعِمَ بالُه) دڵی داسەکناو ئارامی گرت.

**نَعِمَ** به: پێی کەیف خۆش بوو ٥ (نعمت به عيناً) چاوی پێی فێنک بۆوە. ، **نَعُمَ** نعومةً: نەرم و نۆڵ بوو ٥ نەرم بۆوە ٥ (فهو ناعم).

**نَعَّمَ**: فیعلێکە لە فیعلەکانی مەدح و زەم ٥ أنْعَمَ فلان: فلانکەس نازونیعمەتی دایەو زۆری کرد ٥ کەوتە ناو نازو نیعمەتەوە ٥ أنْعَمَ الريحُ: بایەکە بەهێواشی هەڵبوو ٥ أنْعَمَ عليه بكذا: ئەوەی پێ بەخشی ٥ دەگوترێ: (أنْعَمَ الله عليه بمال كثيرة وصحة وافرة) خودا ماڵی زۆرو تەندروستی زۆری پێ بەخشیوە ٥ أنْعَمَ له: پێی گوت بەڵێ ٥ أنْعَمَ فلاناً: فلانکەسی خۆشگوزەران کرد ٥ دەگوترێ: (أنْعَمَ الله بك عيناً) خودا چاوت بەدیتنی خۆشەویستانت فێنک بکاتەوە ٥ أنْعَمَ الشَّيْءَ: شتەکەی نەرم کردەوە ٥ أنْعَمَ العجينَ أو الدواءَ: زێدەڕەوی کرد لەشێلانی هەویرەکە یان دەرمانەکە ٥ أنْعَمَ النظرَ في الأمر: زۆر لەکارەکە ورد بۆوەو سەرنجی لێ دا ٥ ناعَمَ فلان: فلانکەسی ژیان خۆش کرد ٥ ناعَمَ الشَّيْءَ: شتەکەی پتەو کرد ٥ نَعَّمَ فلان: فلانکەس وتی بەڵێ ٥ نَعَّمَ فلاناً: فلانکەسی گوزەران خۆش کرد ٥ نَعَّمَ الشَّيْءَ: شتەکەی نەرم و نیان کرد ٥ تناعَمَ: خۆشی گوزەراند ٥ تَنَعَّمَ في مشيه: بەپێخواسی ڕۆیشت ٥ دەگوترێ: (أتاهم مُتَنَعِّماً) هات بۆلایان بەپیادەو وڵاخی سواری پێ نەبوو ٥ تَنَعَّمَ فلاناً: لەفلانکەس گەڕاو هەوڵی دا بیدۆزێتەوە ٥ تَنَعَّمَ الدابة: لە وڵاخەکەیەوە ژەنیو تاوی دا بۆئەوەی خێرا بڕوا ٥ الإنعام: عەتاو بەخشش ٥ الإنعامة: بەمانا (الإنعام) دێ ٥ المُتَناعِمُ: دەگوترێ: (نبات متناعم) ڕوەکێکی ڕاست هەڵچووە ٥ (رجل متناعم) پیاوێکی دەوڵەمەندو گوزەران خۆشە ٥ المُنَعَّمُ: دەگوترێ: (رجل مُنَعَّمٌ) پیاوێکی دەوڵەمەندو گوزەران خۆشە (كلام مُنَعَّمٌ) قسەی نەرم و نیان ٥ (شيء مُنَعَّمٌ) شتەکە زۆر وردکراوە زۆر کوتراو و

هـاراوە ٥ **النـاعِمُ**: دەگـوترێ: (ثـوب نـاعِمٌ) قوماشـێكی نەرمـە ٥ (نبـات نـاعِمٌ) ڕوەكێكـی ڕاستو هەڵچووە ٥ **النّاعِمة**: مێینەی (الناعِمَ)ە ٥ دەگوترێ: (طير ناعِمة) باڵنـدەی سیمانو نـەرمو نیـان ٥ (ثيابٌ ناعِمة) قوماشی نـەرم ٥ باغچە ٥ **النَّعـائِم**: مەنزڵێكـە لەمەنزڵـەكانی مـانگ لەشـێوەی نوعامەدایـە ٥ هەشـت ئەسـتێرەن قۆناغێك لەقۆناغـەكانی مانگیـان لێ پێـك دێ ٥ **النَّعَامَـة**: باڵندەیـەكی جەسـتە گەورەیـە مـل درێـژو قـاچ درێـژە كلكـی كورتـە، بـازی درێـژ دەهـاوێو بـۆ ڕۆیـشتن ئازایـە پێـی دەگـوترێ شوترمورغ ٥ شـێوەی لـەنێوان شـێوەی حوشـترو قەلـەمون دایـە ٥ (جـاء كالنعامـة) بەنائومێـدی گەڕایـەوە ٥ (شالت نعامتـه) مـرد ٥ (هـو خفيـف النعامة) ئەو عەقڵ سوكە ٥ (ركب جناحي نعامة) بەدڵـسۆزی كارەكـەی ئـەنجام دا هـەروا وشـەی (النعامة) نـاوە بـۆ ئـەو نیشانەو كەڵەكە بـەردو سـنگ چـەقاندنو شـتی وا كـە بـۆ شـارەزایی بـەڕێگای چـۆڵ دا بەكاردەهێنـدرێن ٥ چـەتری سەربیرو شتی وا ٥ **النُّعامى**: دەگوترێ: (نُعامـاك أن تفعل كذا) دەخیلت بم تـابۆت دەكرێ ئـەوە مەكـە ٥ **نُعـامى عـين**: ئـەوەم لەبـەر خـاتری دووچاوی جەنابت ئەنجام دا ٥ بای باشور، بۆیە بـەم جـۆرە بایـە دەگـوترێ: (نعـامى) چـونكە لەنیوە دورگەی عەرەبی دا تەڕترین بایە نماوی ترین بایە ٥ **النُّعْمُ**: گوزەرانی خۆشو ساماندارى ٥ دەگوترێ: (نُعْمَ عـين) ئـەو شـتە لەبـەرخاترى چـاوی تـۆ دەكـەم ٥ **الـنُّعْمُ**: ئاژەڵێـك بۆخـۆی بلەوەڕێو پێویـستی بـەئالف نـەبێ بـەزۆری بـۆ حوشتر بەكاردێ.

**نَعَم**: حەرفی جەوابە بەمانا (بەڵێ) دێ ٥ **النَّعْمـاءُ**: دابـەزین لـە ڕەوشـتی بـەرز ٥ مـاڵو سـامان ٥ **النُّعْمـى**: بـەمانا (النَّعمـاء) دێ ٥ **النَّعْمَـةُ**: نازونیعمەتو گوزەرانی خۆش ٥ دەگوترێ: (هو في نَعْمـة عـيش) ئـەو لەخۆشگوزەرانی دایـە ٥ هـەروا دەگـوترێ: (أفعلـه نَعْمـةَ عـين) ئـەو كـارە لەبەر خاتری چاوی تۆ ئەنجام دەدەم ٥ **النِّعْمَةُ**: ئەو نازو نیعمەتو ڕزقو ڕۆزیو ماڵو سامانەی خودا دەیدا بەبەندەكانی ٥ وەزعو حـاڵی خـۆش ٥ پیـاوەتیو بـەهانا هـاتنی كەسـانی تـرەوە ٥ دەشگوترێ: (أفعله نِعْمَة عين) ئـەوە لەبـەرخاتری چاوی تۆ ئەنجام دەدەم ٥ **النُّعُومة**: نـەرمو نـۆڵی ٥ **النّعيم**: ئەوەی لـەزەتی لێ دەبینـدرێ ٥ ژیـانی خۆش ٥ وەزعو حاڵەتی باش ٥ دڵخۆشی ٥ **نَعْنَعَ**: لەزوبانی دا جۆرە گنیـەك هـەبوو نەیـدەتوانی بەباشـی پیتـی (ن)و (ع) دەربـبڕێ ٥ **تَنَعْنَـعَ**: دووركەوتـەوە، دەگـوترێ: (تَنَعْنَعَـت الـدار) خانوەكـە دووركەوتـەوە ٥ (وتَنَعْنَـعَ عنـه) لەخانوەكە دووركەوتەوە ٥ **النَّعْناعُ**: پنگ، جۆرە ڕوەكێكی گیایی بۆنخۆشە چەند جۆری هەیە، هەنـدێكی خۆڕسـكە، هەنـدێكی دەڕوێنـدرێ لەشوێنی تـەڕو دەم جۆگـاو نزیـك نـاو دەڕوێ ٥ **أقراص النّعناع**: كورسی نەعنا، حەڵوایەكە ئاوی پنگـی تێـدەكرێ بـۆنی خـۆش دەبـێ ٥ (مـاء النّعنـاع) ئـاوی نـەعنا ئەوەیـە كـە بەشـێوەی تایبـەتی ئـاوی پنگەكـە دڵۆپ دڵۆپ دەگـیرێ ٥ **النُّعْنُـع**: نـەعنا ٥ دەشـگوترێ: (رجـل نعنـاع) پیاوێكی درێژی ناقۆڵاو شلو شێواوە ٥ **النُّعْنُعَةُ**: چلێدانە.

**نعـا** السِّنور نُعـاءً: پشیلەكە میوانـدی ٥ **النُّعْـوُ**: كەوانەی ژێر لوت ٥ درزی لێوی حوشتر ٥ یـان درزی سمی حوشتر.

**نَعى** فلاناً نَعْياً ونَعِيـاً: هـەواڵی مردنـی فلانكەسـی بڵاوكردەوە ٥ دەگـوترێ: (نعـاه لنـا ونعـاه إلينـا)

هەواڵی مردنی ئەوی پێ ڕاگەیاندین ◊ هەروا دەگوترێ: (هو یَنْعی علی فلان کذا) ئەو ڕەخنەی ئەوەو ئەوە لەفلانکەس دەگرێ ◊ (فلان ینعی علی نفسه بالفواحش) فلانکەس بەئاشکراو لەبەرچاوی خەڵك کاری خراپو ناپەسەند دەکا خۆی بەخراپەکار ناوزەد دەکا ◊ **أنعی علیه قَبیحاً**: کارێکی ناشیرینی لێ بڵاو کردەوەو لێی لەهەرادا بۆئەوەی بەخۆی دا بچێتەوەو لەو کارە خراپە دوور کەوێتەوە ◊ **تناعی القومُ**: خەڵکەکە هەواڵی کوژراوەکانی خۆیان ڕاگەیاند بۆئەوەی خەڵکەکە هەڵنێن بۆ تۆڵە سەندنەوەو بەرگری کردنو پەلاماردانی دوژمن ◊ **إستنعی القومُ**: خەڵکەکە هەواڵی کوژراوەکانیان ڕاگەیاند ◊ هەروا دەگوترێ: (نزلت فاجعة فاستنعی القومُ) بەڵایەك پەیدابوو خەڵکەکە هەواڵی مردنی یەکتریان ڕاگەیاندو پەرتەوازە بوون ◊ **إسْتَنعی الراعي غَنَمَهُ**: شوانەکە پێش مەڕەکە کەوتو بانگی کردن بۆئەوەی دوای بکەون ◊ هەروا دەگوترێ: (إستنعی بفلان حُبُّ کذا) خۆشەویسی فلان شت لەدڵی فلان گەشەی کردوو ڕەگی داکوتا ◊ **المَنْعی والمَنْعاةُ**: هەواڵی مردن ◊ **النّاعي**: ئەو کەسەی هەواڵی مردن ڕادەگەیەنێ ◊ ئەو کەسەی ڕێوڕەسمی مردوناشتن ئەنجام دەدا ◊ **النَّعْيُ**: بڵاوبوونەوەی هەواڵی مردنی کەسێك ◊ **النَّعيُّ**: دەگوترێ: (بلغنا نَعيُّ فلان) هەواڵی مردنی فلانمان پێ گەیی ◊ **المَنْعِيُّ**: پیاوی مردوو.

**نَغَبَ** الطائر نَغْباً: باڵندەکە دەندوکی لەئاوەکەداو لێی خواردەوە.

**نَغَبَ** الماءَ: ئاوەکەی قوت دا، خواردیەوە.

**نَغَبَ** الريقَ: تفەکەی قوت دا ◊ **النُّغْبَةُ**: قومەئاوو شتی شلەمەنی ◊ دەگوترێ: (سَقَاهُ نُغْبَةً من لبن) قومە شیرێکی دەرخوارد دا.

**نَغَتَ** الشَّعْرَ نَغْتاً: قژی ڕاکێشا ◊ **نَغَرَت القِدْرُ**: مەنجەڵەکە کوڵیو قڵپەی دا.

**نَغَرَ** فلان: فلانکەس بەهۆی ڕق هەڵسانەوە دەرونی دەکوڵا.

**نَغَرَ** الدَّمُ: خوێنەکە فیچقەی کرد ◊ **نَغِرَت القِدْرُ** نَغَراً: بەمانا (نَغَرَتْ) دێ.

**نَغِرَ** فلان: بەمانا (نَغَرَ) دێ ◊ **أنْغَرتِ البيضَةُ**: هێلکەکە پیس بوو، کەڵکی خواردنی نەما ◊ **أنْغَرَت الشاةُ**: مەڕەکە لەگەڵ شیر لێ دۆشینی خوێنی لێ هاتە دەر ◊ **نَغَّرَ** منه ویه: هاواری کرد، هاواری لێ هەڵسا.

نَغَّرَ الصبِيّ: دیقەدیقەی منالەکەی دا، هەڵی پەڕاند ◊ **تناغَرَ القومُ**: خەڵك لێك دڕ دۆم بوون ◊ **تَنَغَّرَ** جوفه: دەروونی لەرقا کوڵا ◊ **تَنَغَّر عليه**: لێی دڕدۆم بوو ڕقی لێ هەڵسا ◊ **المِنْغار**: (شاة منغار) مەڕێکە هەمیشە شیرەکەی تێکەڵ بەخوێن دەبێ، کەشیری لێ دەدۆشن خوێنی لەگەڵە ◊ **النَّغَرُ**: سەرچاوەی ئاوی سوێر ◊ **النُّغَرُ**: بێچوە چۆلەکە ◊ بولبول ◊ **النَّغّارُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَغَرَ) دێ ◊ دەگوترێ: (جرح نَغّار) برینێکە خوێنی لێ دێ.

**نَغَزَ** بين القوم نَغْزاً: خەڵکەکەی لەیەکتر هان داو دوژمنایەتی خستە نێوانیانەوە.

**نَغَزَ** فلاناً: غەیبەتی فلانکەسی کرد.

**نَغَزَ** الصبِيّ: دیقەدیقەی منداڵەکەی دا ◊ **النَّغّازُ**: دەگوترێ: (فلان نَغّاز) فلانکەس زۆر غەیبەتکەرە.

**نَفَشَ** نَفْشاً ونَفَشاناً: لەشوێنی خۆی جولا ٥ دەگوترێ: (سُقِيَ فلان فَنَفَشَ) کابرا لەهۆش خۆی چوبوو ئاوی درایە جەمو جوڵی تێکەوتەوە.

**نَفَشَ الی فلان**: مەیلی بۆلای فلانکەس کرد ٥ **إنْتَفَشَ**: دەگوترێ: (الدار تَنَفَشَ صبياناً) خانوەکە جمەی دێ لەمناڵ. تَنَفَّشَ فلان: فلانکەس دوای ئەوەی بێهۆش بوو جەمو جوڵی تێکەوتەوە ٥ بەنەسپایی‌و لەسەرخۆ کەوتەوە جەمو جوڵ ٥ **النُغاش من الرجال**: پیاوی کورتە بالاو زۆر زەعیف‌و سست ٥ کەم ئەندام ٥ **النُغاشَةُ**: جۆرە چۆلەکەیەکە دەندوك سوورە.

**نَغَصَ** علیه نَغَصاً: لێی لیڵ کرد.

**نَغَصَ فلاناً**: بەشە ئاوەکەی لەفلانکەس مەنع کرد.

**نَغِصَ الأمرُ نَغَصاً**: کارەکەی تەواو نەکرد.

**نَغِصَ الشاربُ**: شلەمەنی خۆرەوەکە خواردنەوەکەی تەواو نەکرد.

**نَغِصَ الرجلُ**: پیاوەکە مەبەستەکەی تەواو نەبوو ٥ **أنْغَصَ فلاناً رِعْيَه**: بەشەکەی لەفلانکەس مەنع کرد ٥ نەیهێشت وڵاخەکانی بلەوەڕێنێ ٥ **أنْغَصَ علیه عیشَهُ**: ژیانی لێ لیڵ کرد ٥ **نَغَّصَ فلاناً**: ژیانی فلانکەسی لیڵو تاڵ کرد ٥ **نَغَّصَ علیه عیشه**: ژیانی لێ تاڵ کرد ٥ **نَغَّصَ علینا فلان**: فلانکەس ئەوەی پێمان خۆش بوو زۆرمان لێی هەبێ لێی مەنع کردین ٥ **تناغَصَت الدوابُ علی الحوض**: ئاژەڵەکان لەسەر حەوزەکە پاڵەپەستۆیان کرد ٥ **تَنَغَّصَتْ معیشته**: ژیانی تاڵو لیڵ بوو.

**نَغَضَ الشيْءُ نَغْضاً**: شتەکە کەوتە جەمو جوڵی زۆرو هەڵبەزو دابەز ٥ دەشگوترێ: (نَغَضَ سرج الحصان) زینی ئەسپەکە کەوتە هەڵتە هەڵتەك (نَغَضَت ثنیة الغلام) ددانی منداڵەکە کەوتە لەقین.

**نَغَضَ السحابُ ونحوه**: هەورەکە زۆربوو پاشان پڕ بوو ٥ **نَغَضوا الی العدو**: ڕوبەڕوی دوژمن ڕاپەڕین.

**نَغَضَ برأسه**: لەسەر سوڕمانی خۆی لەشتەکە سەری بادا ٥ **أنْغَضَ رأسَهُ**: لەسەر سوڕمانی خۆی سەری بادا ٥ **تَنَغَّضَ الشيْءُ**: شتەکە کەوتە هەڵبەزو دابەز ٥ **النّاغِضُ من الإنسان**: بنکی مل ئەو شوێنەی کەلەگەڵ سەردا دەجوڵێ ٥ دەشگوترێ: (غَيْمٌ ناغِض) هەوری پڕو جەمو جوڵ کەر کەبەشوێن یەکدا دێن‌و دەڕۆن ٥ **النُّغْضُ**: کەسێك سەری بلەرزێ‌و لەڕۆیشتن دا بلەرزێ ٥ بێچوە نوعامە (شوتور مورغ) ٥ **النُّغْضُ**: لای ژوروی دەفەی شان ٥ **النَّغّاضُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَغض)دا دێ ٥ دەشگوترێ: (سَحابٌ نغّاض) هەورێکی نەوەستاوە یەك لەدوایەك دێن‌و دەڕۆن.

**نَغِفَ** نَغَفاً: کرمی زۆر بوو ٥ **النَّغَفُ**: کرمێکە لەلوتی حوشترو ڕەشە وڵاخ و مەڕو بزن دا پەیدا دەبێ ٥ هەروا ناوە بۆ جۆرە کرمێکی درێژ سورو بۆرو سەوزە لەژێر گڵەوە ڕەگی ڕوەك دەقرتێنێ ٥ هەروا ناوە بۆ چڵمە ڕەقەڵە: کەئادەمیزاد لەلوتی دەری دێنێ.

**نَغَقَ الغُرابُ**: قەلەڕەشەکە قیڕاندی ٥ **نَغَقَت الناقة**: حوشترەکە بۆ بێچوەکەی کورکاندی‌و بە دەنگێکی زۆر نەرم بۆی باراند.

● **نَغِلَ** وجهُ الأرض نَغَلاً ونَغْلَةً: ڕوی زەوی بەهۆی وشکە ساڵی‌و کەمئاوییەوە لێك هەڵتەکی.

**نَغِلَ** الأديمُ: چەرمەکە بۆگەنی کردو دەباغەکەی تێکچوو.

**نَغِلَ** الجرحُ: برینەکە داوەشا ٥ دەشگوترێ: (نَغِلَت نیته) نیازی خراپ بوو ٥ (نَغِلَ قلبه علی فلان) دڵی فلانکەس کرمێ بوو.

**نَغِلَ** بین القوم: فیتنەیی لەناو خەڵکەکە دا کرد

**نَغِلَ** المولود نغولة: زارۆکە لەدایکبووەکە منداڵی زینایەو دایکیو باوکی نیکاحی شەرعییان لەنێوان دا نەبووە ٥ **أنغلَ الأديمَ**: پێستەکەی واڵێ کرد بۆگەن بکا ٥ **أنغلَ فلاناً حديثاً سمعه**: قسەیەکی فیتنە ئامێزی بۆفلانکەس گێڕایەوە ٥ **النَّغِلُ**: منداڵی لەزینا پەیدا بوو (زۆڵ) ٥ دەشگوترێ: (جوزة نَغِلَة) گوێزێکی پوچەڵە ٥ **النَّغيلُ**: زۆڵ، منداڵی پەیدابوو لەبەیەکگەیشتنی ناشەرعی پیاو و ئافرەت.

**نَغَمَ** نَغماً: بەهێواشی قسەی کرد ٥ دەگوترێ: (سکت فما نَغَمَ بحرف) بێدەنگ بوو ورتەی لەدەم دەرنەهات.

**نَغَمَ** في الغناء: لەگۆرانی وتن دا گەرم بوو.

**نَغَمَ** في الشراب: کەمێکی لەشەرابەکە خواردەوە ٥ ناغَمَهُ: بەنەسپایی قسەی لەگەڵ کرد ٥ **تَنَغَّمَ**: بەمانا (نَغَمَ) دێ ٥ **النَّغَّامُ**: زۆر گۆرانی بێژ ٥ **النَّغْمَة**: جەرەسی وشە ٥ دەنگ خۆشی لەقورئان خوێندنو شتی تردا ٥ دەنگی کاریگەر ٥ **النُّغْمَةُ**: قومێك ٥ **النَّغومُ**: دەگوترێ: (رجل نغوم) پیاوێکی دەنگ خۆشە ٥ **نَغْنَغَ**: نەخۆشی توشی ئالوی بوو، بینەخرەی توش بوو ٥ **النُّغْنُغُ**: زمانە بچکۆلە، ئەوپارچە گۆشتەی لای لەوزمتێنە ٥ ئەوەی لەژێر دەندوکی کەڵەشێرەوە وەکوو ریش وایە ٥ هەوکردنی جەستە بەشێوەیەك شل بێ ٥ گێلی لاواز ٥

**النُّغْنُغَةُ**: بەمانا (النُّغْنُغُ) دێ ٥ ئافرەتی گێلو ئەحمەق ٥ **النُّغْنُغَةُ**: پارچە گۆشتێکە لای سەروی قورگ لەلای لەوزمتێن.

**نَغِيَ** نَغياً: بەشێوەیەك ئاخاوتنی کرد کەس لێی حاڵی نەبوو ٥ دەگوترێ: (نغى الى فلان بكلمة) وشەیەکی بەگوێچکەی فلانکەسدا دا ٥ **ناغى الصَّبِيَّ**: یاری لەگەڵ منداڵەکە کرد، بەهێواشیو نەرمو نیانی لەگەڵی دا جوڵایەوە.

**نَغِيَ** فلاناً: بەقسەیەك لەگەڵ فلان دوا کەکەس لێی حاڵی نەبوو ٥ دەشگوترێ: (هذا الجبل يُناغي ذاك) ئەو کێوە سەری ئاوە بەو کێوەوە دەڵێی چپەی لەگەڵ دەکا ٥ هەروا دەگوترێ: (كاد الموجُ يناغي السحاب) شەپۆلەکە ئەوەندە بەرزبۆوە خەریکە نزیك هەور ببێتەوە ٥ **النَّاغِية**: وشەو قسە ٥ **النُّغْية**: بەمانا (الناغية) دێ ٥ هەردەنگو قسەیەك سەرنج ڕاکێش بێ ٥ یەکەمجار کە هەواڵ دەبیسرێو هێشتا دڵنیانی لەڕاستیو دروستیو نەچەسپاوە ٥ دەگوترێ: (سمعت نَغية من كذا وكذا) واتە: شتێکم لە هەواڵەکە بەرگوێ کەوتووە بۆم ساغ نەبۆتەوە ئاخۆ وایە یان نا ٥ **النُّفاُ**: پارچەو کۆمەڵە ڕوەکی جیاجیاو پەرتەوازە ٥ تاکەکەی (نُفاةٌ).

**نَفَتَ** المِرجَلُ ونحوه نَفْتاً ونفتاتاً: مەنجەڵەکە یان دیزەکە بەهۆی زۆر کوڵانەوە پریشکی وا دەهاوێ دەڵێی تیرە.

**نَفَتَ** الدقيقُ: ئاردەکە کەئاوی بەسەردا کرا هەڵاوساو فشەڵ بوو

تنافَتَ: ئاوەکوڵاوەکە پریشکی یەك لەدوایەکی هاویشتن.

**نَفَثَ** نَفْثاً ونَفَثاناً: فوی پێدا کرد فوی بەسەردا کرد ٥ دەگوترێ: (نَفَثَ الراقي في العُقدَة) فالْ

خوێنەکە فوی بە گرێیەکەدا کرد ٥ (فلان يَنفُثُ غَضَباً) فلانکەس لەرق هەڵساوی خۆی فیشکەی دێ، هەر فو بەبا دەدا.

**نَفَثَ فِي أذنه**: قسەی بە چرپەی بەگوێی دا دا ٥ بەهێواشی سەری بردە بن گوێیەوەو قسەی لەگەڵ کرد.

**نَفَثَ الشَيْئَ من فيه**: قسەی هاویشت ٥ دەشگوترێ: (الجرحُ يَنفِثُ الدمَ) برینەکە خوێن فڕێ دەدا ٥ (الحية تنفث السُّمَ) مارەکە ژەهر دەڕێژێ ٥ (نُفِثَ فِي روعِي كذا) فلان شت بەدڵمداهات خرایە دڵمەوە.

**نَفَثَ فلاناً**: سیحرو جادوی لەفلان کرد ٥ **النُفاثةُ**: ئەوەی دڵتەنگ دەری دەبرێو لەدەمی دێتەدەر ٥ ئەو خواردنەی بەکەلێنو کونی دەمو ددانەوە دەمێنێتەوە فڕێی دەدا ٥ دەشگوترێ: (هذا من نفاثات فلان) ئەمە لەشیعری فلانە ٥ **النَفثةُ**: دەگوترێ: (هذه نَفثَة مصدور) ئەمە کورکاندنو ناڵەو فیغانی دڵتەنگە، دەیەوێ بەم کورکاندنە تۆزی غەم بەباداو ئارامی بەدڵی بدا ٥ دەگوترێ: (هذا من نفثات فلان) ئەمە لەشیعری فلانە ٥ **النُفّاثةُ**: فرۆکەیەکی تیژڕەوە، لەفڕین دا پشت بە چرِی هەوا دەبەستێ، واتە: (تەیارەی نەفاسە).

**نَفَجَ الشَيْئُ نَفجاً ونفوجاً**: شتەکە بەرز بۆوە.

**نَفَجَ فلان**: فلانکەس شانازی بەشتێك کرد کەنیەتی.

**نَفَجَ الإرنب ونحوه**: کەروێشکەکە ڕاپەڕیو کەوتە بازدان ٥ **نَفَجَت الريحُ**: بایەکە بەشێوەی گێژەڵوکەو زریان هەڵبو.

**نَفَجَ الفروجة من بيضتها**: جوجکەکە لەهێلکەکە هاتەدەرەوە.

**نَفَجَ الشَيْئَ نفجاً**: شتەکەی بەرز کردەوە.

**نَفَجَ فلاناً**: فلانکەسی بەگەورە زانی.

**نَفَجَ السِّقاءَ**: کوندە ئاوەکەی پڕکرد.

**نَفَجَ الإرنب**: کەروێشکەکەی لەلانەکەی خۆی دەرپەڕاند ٥ **أنفَجَ الحالِبُ**: شیر دۆشەکە قاپەکەی دوور لەگوانی ئاژەڵەکە ڕاگرت بۆئەوەی کە شیرەکەی دۆشییە ناوی کەف بکا ٥ **إنتَفَجَ وتَنَفَّجَ**: بەمانا (نَفَجَ) دێ ٥ **إستَنفَجَ الإرنب ونحوه**: کەروێشکەکەی لەلانەکەی دەرپەڕاند، دەشگوترێ: (ماالذي إستَنفَجَ غَضَبَه) چی وا ڕقی هەڵسانو جامی غەزەبی پڕکرد.؟ ٥ **المِنفَجُ والمِنفَجَةُ**: ئەو شتەیە هەندێ ئافرەت دەیخەنە سەر سمتی خۆیان بۆئەوەی سمتیان گەورە بنوێنن ٥ **النافِجُ**: دەگوترێ: (هو نافِج حِضنيه) ئەو خۆی بەزل زانیو لوتبەرزی نواند ٥ (صوت نافج) دەنگی زلو گرو ناخۆش ٥ **النافِجة**: ڕەشەبای بەهێز ٥ دەگوترێ: (سحابة نافجة) هەورێکی پڕباران ٥ ئەو کوندیلەو زەرفەی مادەی میسکی تێدایە لەجستەی ئاسك دا ٥ **النُفُجُ**: ئادەمیزادی قونگرانو تەمبەڵ ٥ دەگوترێ: (هو نفج الحقيبة) ئەو سمت پانو زلە ٥ **النَفّاج**: خۆبەزلزانو لوتبەرز ٥ ئەو کەسەی لافی شتێك لێ دەدا کەنیەتی ٥ **النَفّاجَة**: پەراوێزو شوێنی دادڕاوی کراس کە قۆپچەکانی پێوە دەنرێن ٥ **النَفيجُ**: بێگانەیەك بکەوێتە ناو قەومێکەوە بێ ئەوەی بێ ئەچاکەی هەبێ نەخراپە ٥ **النَفيجَةُ**: کەوانێك لەدرەختی (النَبع) دروست کرابێ (جۆرە درەختێکە لەبەرزایی کێو و شوێنی وادا دەڕوێ دارەکەی سەرەتیرو شتی وای لێ دروست دەکرێ) ٥ **نَفَحَت الريح نَفحاً ونفوحاً**: بایەکە هەڵی کرد، جوڵایەوە.

**نفح العِرْق نَفْحاً:** دەمارەكە خوێنى لێ هات ٥ دەشگوترێ: (نَفَحَ الطيبُ) بۆنەخۆشەكە بڵاو بۆوە.

**نَفَحَ الشَّيْءَ:** شتەكەى لێ دوور خستەوە.

**نَفَحَت الدابة الشَّيْءَ:** وڵاخەكە بەتيژايى سمى لەشتەكەى دا.

**نَفَحَ فلاناً بالمال:** ماڵى دا بەفلانكەس (نَفَحَ فلاناً بالسيف) بەشمشێر لەفلانكەسى دا بەلام بەهێواشى.

**نَفَحَ اللَّبَنَ:** ماستەكەى هەژاند.

**نَفَحَ الجُمَّةَ:** پێشەسەرى داهێناو بەشانەى كرد ٥ **نافَحَ عنه:** داكۆكى لێ كرد ٥ **نافَحَ فلاناً:** بەرهەڵستى فلانكەسى كرد، دژى وەستا ٥ **إنْتَفَحَ بە:** ڕەخنەى لێ گرت، كۆسپى خستە بەردەمى ٥ **الأَنْفَحة:** ڕوەكێكە وەكوو باينجان ٥ بەشێكە لەمەعيدەى گۆلكەڵەو كارو بەرخ ٥ مادەيەكى تايبەتييە لەديوى ناوەوەى گەدەى گۆلكەڵەو كاريلەو بەرخۆلە دەردەهێندرێ پێى دەگوترێ: (شيلوا وك) شيرى پێ دەكرێتە پەنير ٥ **الإِنْفَحَة:** (إنفحة العجول) شيلواوك ٥ **المِنْفَحُ:** كەسێك خۆبخاتە كارێكەوە كە پەيوەندى بەئەوەوە نيە ٥ **النُّفْحُ:** سەرما ٥ پێچەوانەكەى (اللَّفح) واتە: گەرما ٥ **النُّفْحة:** بۆنێك كەدڵ پێى خۆش بێ ٥ دەشگوترێ: (أصابتنا نفحة من عذاب ربك) هەروا وشەى (النَّفحة) بەمانا بەخشش دێ ٥ دەگوترێ: (لايزال لفلان نفحات) تا ئێستا فلانكەس بەخششى هەيە ٥ **النَّفُوحُ:** زۆرسارد ٥ دەشگوترێ: (ضرع نَفوحٌ) گوانێكە شير ناگرێتەوە، شيرى تێناوەستێ ٥ (بقرة نفوح) مانگايەكە بەبێ دۆشين شيرى لێ دەڕژێ ٥ (قوس نفوح) كەوانێكە تير دوور دەهاوێ ٥ (ريح نفوح) ڕەشەبايەكى بەهێزەو شت هەڵدەدا ٥ **النَّفِيحُ والنِّفِّيحُ:** بەمانا (المِنْفَحُ) دێ.

**نَفَخَ بفمه نَفْخاً:** فوى تێ كرد بەدەمى باى تێكرد.

**نَفَخَ في البوق أو اليراع:** بەهەموو هێزى فوى بە زوڕناكەدا كرد بۆئەوەى دەنگى لێ بێ.

**نَفَخَ الشيطانُ في أنفه:** شەيتان باى تێكردو هەڵێنا بۆ ئەوەى خۆى بەزل بزانێ ٥ لافى شتێك لێ بدا كەنيەتى.

**نَفَخَ الشَّيْءَ:** فوى لەشتەكە كرد، بەفو هەڵى دا.

**نَفَخَ النار:** فوى لەئاگرەكە كردو هەڵى ساند ٥ يان بەمۆشە دەمەو پانكەو شتى وا فوى لەئاگرەكە كردو پشكۆكانى گەشاندنەوە.

**نَفَخَ الطعامُ ونحوه فلاناً:** خۆراكەكە ورگى فلانكەسى پڕكرد ٥ دەشگوترێ: (نَفَخَ شِدقيه أو حِضنَيه) لوتبەرزيى نواندو خۆى بەزلزانى.

**نَفِخَ نَفَخاً:** توشى نەخۆشى باكردن بوو، ورگى باى كرد ٥ **نَفَّخَ بفمه:** بۆزێدەڕۆيى لەماناى (نَفَخَ)دێ ٥ **إنْتَفَخَ الشَّيْءُ:** شتەكە بەرزبۆوە ٥ دەگوترێ: (إنْتَفَخَ النهارُ) ڕۆژهەڵكشاو بەرز بۆوە ٥ **إنْتَفَخَ فلان:** فلانكەس خۆى بەزل زانىو لوتبەرزى نواند ٥ **إنْتَفَخَ عليه:** ڕقى لێ هەڵسا ٥ **المِنْفاخُ:** موشەدەمە ٥ هەرشتێك هەوا كۆبكاتەوەو ئاراستەى بكا ٥ وەكوو ئەو ئامێرەى ئاسنگەرو مزگەر خەڵوزى پێ دەگەشێننەوە ٥ **المِنْفَخُ:** بەمانا (المِنْفاخ) دێ ٥ **المنفوخ:** (رجل منفوخ) پياوێكى قەڵەو و خۆگەيە ٥ يان ترسنۆكە ٥ **النّافِخُ:** دەگوترێ: (مابالدار نافخ) كەس لەخانوەكەدا نيە ٥ **النُّفْخُ:** شانازىو خۆبەزلزانى ٥ **النُّفَخُ:** هەوكردنو هاوسانێكە لەزەنگى (زند)ى وڵاخ دا پەيدا دەبێ ٥ نەخۆشييەكە توشى گون دەبێ پێى دەگوترێ: (قوڕيى) ٥

النُّفَخُ: هەرمتی گەنجی ٥ النُّفَخاءُ: لای ژورووی ئێسقانی قاچ ٥ زەوییەکی بەرزو بەپیت، نە لمبەلأن بێ نە بەردی تێدا بن کەمێك درەختی تێدا روابن ٥ النُّفْخَةُ: ورگ هاوسانو مەعیدە پڕبوون بەخواردن یان بەشتی تر ٥ (نُفْخَةُ الشباب) هەرمتی گەنجیو لاویەتی ٥ (نفخةالربیع) رۆژانی پێگەیشتنی گژوگیا لە بەهاردا ٥ النُّفْخة: دەردێکە توشی ئەسپ دەبێو لەئەنجامی ئەوەدا گونی دەهاوسێن ٥ النُّفاخُ: هاوسانی بەشێك لە جەستەی بەهۆی نەخۆشییەوە ٥ النُّفاخة: هاوساوێکە لەناوسکی ماسی دایە ٥ ئەو بلّقو تلۆقانەن کەدەکەونە سەر ئاو و شلەمەنی تر ٥ میزەڵدانو شتی لەو جۆرە کە منداڵ یارییان پێ دەکەنو فویان تێدەکەنو بەرزیان دەکەنەوە ٥ النَّفیخُ: ئەو شاگرد ئاسنگەرو شاگرد مسگەرەی کە بەموشەدەمە یان بەشتی تر ئەرکی خەڵوز گەشاندنەوەوەو فوکرن لەکورە ئاگرەکەی لەئەستۆیە.

**نَفَدَ الشَّیْئُ نَفَداً:** شتەکە فەوتا، نەما، بڕایەوە ٥ أنْفَدَ فلان: فلان تێشوی بڕایەوەو ماڵو سامانی نەما ٥ أنفد الشَّیْئ: شتەکەی فەوتاند ٥ نافَدَهُ: موحاکەمەی لەگەڵ دا کردو کێشەو نیزاعی نایەوە بۆئەوەی بەبەڵگە بۆری بدا ٥ إنْتَفَدَ الشَّیْئَ: شتەکەی فەوتاند ٥ إنْتَفَدَ الحَقَّ: مافەکەی وەرگرتەوە ٥ دەشگوترێ: (إنْتَفَدَ منه) لێی وەرگرتەوە.٥ إنْتَفَدَ اللَّبَن: شیرەکەی هەموو دۆشیو هیچی بۆ نەهێشتەوە ٥ تنافَدَ القومُ: خەڵکەکە کەوتنە کێشەو دەمەدەمێوە هەرکەسە بەڵگەی خۆی خستەڕو ٥ إسْتَنْفَدَ الشَّیْئَ: شتەکەی بڕاندەوە ٥ دەگووترێ: (إسْتَنْفَدَ وسْعَهُ) تاقەتی نەما، تواناى خۆی تێدا خەرج کرد وهیچی پێ نەما ٥ إسْتَنْفَدَ الأمْرُ أغراضه: کارەکە مەبەستە سەرەکییەکانی هاتنە دیو ئیتر چی دی پێویست ناکا درێژەی پێ بدرێ ٥ المُنافِدُ: دەگوترێ: (خَصْمٌ منافِدٌ) رکەبەرێکە چی لە توانادایە بەکاری دەهێنێ بۆ ئەوەی سەربکەوێ ٥ المُتَنَفِّدُ: دەگوترێ: (فلانٌ مُتَنَفِّدُ فلان) فلانکەس کەبڕێوی نەما فلان پەکی ناخاو دەیداتێ ٥ النَّفادُ: فەوتان، نەمان، بڕانەوە.

**نَفَذَ الأمْرُ نفوذاً ونفاذاً:** کارەکە تەواو بوو ئەنجام درا ٥ دەشگوترێ: (نفذ فلان لوجهه) فلانکەس ڕێبازی خۆی گرتەبەرو ڕۆیی ٥ (نفذ الکتابُ الی فلان) نامەکە گەیشتە فلان ٥ (هذا الطریق ینفذ الی مکان کذا) ئەم ڕێگایە دەچێ بۆ فلان شوێن ٥ (نفذ الطریقُ) ڕێگاکە ئاسانو خۆشە هەموو کەس دەتوانێ پێیدا بڕوا ٥ (نفذ منه) لەم شوێنەوە چووە شوێنێکی تر ٥ دەگوترێ: (نفذ فلان في الأمور) فلانکەس لەئیشو کاردا شارەزاو وریایە ٥ (نفذ عنه) لێی تێپەڕی ڕزگاری بوو لێی.

**نَفَذَ القومَ نَفْذاً:** لەخەڵکەکە تێپەڕیو کەوتە ئەو بەریان ٥ أنْفَذَ القومَ: خەڵکەکەی دڕ داو بەناویان دا ڕۆیی ٥ دەشگوترێ: (رَمَیْتُهُ فأنفذته) تیرێکم پێوەناو هەنگاوتم تیرەکە ئەمدیواو دیو کونی کرد ٥ أنْفَذَ الکتابَ الی فلان: نامەکەی نارد بۆ فلانکەس ٥ أنْفَذَ الأمْرَ: کارەکەی ئەنجام دا ٥ إنْفَذَ عهده: وادەو بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا ٥ نَفَّذَ الحکمَ: بڕیارەکەی جێبەجێ کرد ٥ تنافذ القومُ الی القاضي: خەڵکەکە کێشەکەی خۆیان بردە لای دادوەر بۆ ئەوەی بۆیان یەکالا بکاتەوەو بڕیاری پێ دەرکا ٥ التنفیذ في الحکم:

بەکردەوە جێبەجێ کردنی بڕیارە ٥ **الهَیئة التنفیذیة**: ئەو دەسەڵاتەی یاساکانی دەوڵەت جێبەجێ دەکاو بەعەمەلی پەیڕەویان دەبێ ٥ **المُتَنَفِّذُ**: بەرفراوانی و پەك نەکەوتن ٥ دەگوترێ: (فی مالِه مُتَنَفَّذ) ماڵو سامانەکەی زۆرە بەشی ئەو شتانە دەکا.٥ **المَنفَذ**: شوێنی تێدا هەڵسوڕانی شت، شوێنی پێدارۆیشتنو لێ دەرچوون ٥ **النّافِذ**: دەگوترێ: (رجل نافذ في أمره) پیاوێکە لەکاروباری خۆی دا سەرکەوتووە ٥ (طریق نافذ) ڕێگایەکە ڕۆیشتنی پێدا دەکرێو هەمووکەس دەتوانێ پێیدا بڕوا ٥ (أمر نافذ) فەرمانێکە دەبێ پابەندی بێ ٥ وشەی (النافذ) لەجەستەی ئادەمیزاد ناوە بۆ کونە لوتو کونە گوێیو ئەو شتانە ٥ **النافذة**: دەگوترێ: (طعنة نافذة) برینێکە ئەمبەرەو بەری وەکوو یەك وەهان ٥ پەنجەرەی خانو کەڕوناکیو هەوایان لێ بچێتە ژوورەوە بۆناو ژوورەکان ٥ **النَّفاذ**: (الحکم مع النَّفاذ) حاڵەتێکە وادەخوازی لەگەڵ بڕیاری دادگا دەرچوو تەنفیز کردنیشی پێویست دەبێ، جاداواکە مەدەنی بێ یان جنائی ٥ **النَّفَذُ**: بڕاندنەوەی شتو ئەنجامدانی ٥ دەگوترێ: (أمَرَ بنَفَذِهِ) فەرمانی کرد بە ئەنجامدانی ٥ (قام بَنَفَذ الکتاب) چی لەنامەکەدا بوو تەنفیزی کرد ٥ چارەسەرو ڕێگای ڕزگاربوون لەچورتم ٥ دەگوترێ: (أتی بنَفَذ لهذا المُعضل) چارەسەری ئەو تەنگژەیەی هێنایە کایەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (طَعْنَة لها نَفَذ) برینێکە ئەمدیواو دیوە ٥ **النُّفْذة**: دەنکەمێرو ٥ دەگوترێ: (قارب الخرازُ بین النُّفَذِ) مێروچییەکە مێروەکانی لێك نزیك کردنەوە ٥ **النَّفّاذ**: ئیش لەدەست هاتوو کار ڕاپەڕێن ٥ **النُّفوذ**: بەمانا (النَّفاذ) دێ ٥ **النُّفُوذ**: دەسەڵاتو هێزو توانا ٥ دەگوترێ: (فلان ذو نفوذ عظیم) فلانکەس دەسەڵاتێکی گەورەو بەرفراوانی هەیە ٥ (مناطق النفوذ) ئەو وڵاتە زەعیفو بێ دەسەڵاتانەن کە دەوڵەتە زلهێزەکان دەسەڵاتی خۆیانی بەسەردا دەسەپێنن ٥ **النَّفیذ**، بەمانا (النّافذ) دێ، دەگوترێ: (أمر نفیذ) فەرمانێکە ملی بۆ کەچ دەکرێو تەنفیز دەبێ.

**نَفَرَ نَفْراً ونفوراً**: وڵاتی خۆی جێ هێشتو کەوتە گەڕان بەوڵاتان دا.

**نَفَرَ الجلدُ نفوراً**: پێستەکە هاوساو لەگۆشتەکە جیابۆوە.

**نَفَرَ من الشَّیْءِ نفوراً**: لەشتەکە هەڵسڵەمیەوە قێزی لێ کردەوە پێی ڕازی نەبوو.

**نَفَرَ من المکان**: لەو شوێنە ڕۆیی بۆ شوێنێکی تر.

**نَفَرَ الحاج من منی**: حاجییەکان دەشتی مینایان جێ هێشت بەرەو مەککە ڕۆیشتن.

**نَفَرَ الناسُ الی العدوّ**: خەڵك بەپەلەو هەڵەداوان بەرەو ڕوی دوژمن ڕۆیشتن بۆئەوەی شەڕی لەگەڵ بکەن.

**نَفَرَ فلاناً نَفْراً**: بەسەر فلانکەس دا زاڵ بوو لەبەربەرەکانی دا ٥ **أنْفَرَ القومُ**: خەڵکەکە وڵاغەکانیان بڵاوبوونەوە ٥ **أنْفَرَ الدابةَ**: وڵاخەکەی چەموش کرد ٥ **أنْفَرَ الرجلَ**: یارمەتی پیاوەکەی دا ٥ **أنْفَرَ فلاناً علی فلان**: بڕیاری بۆ فلانکەس دا بەسەرکەوتن بەسەر فلان دا ٥ **نافَرَهُ**: کێشەی لەگەڵ نایەوە ٥ شانازی بەسەردا کرد ٥ **نَفَّرَ فلاناً من الشَّیْءِ**: فلانکەسی لەشتەکە ترساند، لێی دوورخستەوە ٥ دەگوترێ: (نفر الدابة عَنْ الرعی) وڵاخەکەی لە لەوەڕگاکە دوورخستەوە ٥ **نَفَّرَ عَنْ ولده أو غیره**: نازناوی ناشیرینی بۆ منداڵەکەی یان بۆ کەسانی تر دانا

بەمەبەستی ئەوە جندۆکەو چاوی پیس کاری تێ نەکەن ٥ نَفَّرَ فلاناً علی فلان: بڕیاری سەرکەوتنی بۆ فلانکەس دا بەسەر فلانکەس دا ٥ نَفَّرَ فلاناً علی الشَّیْئ: فلانکەسی زاڵ کرد بەسەر شتەکەدا.٥ تنافر القوم: خەڵکەکە کێشەیان تێکەوت ٥ شانازییان بەسەر یەکتردا کرد ٥ إسْتَنفَرَت الدابة: وڵاخەکە هەڵسڵەمییەوە ٥ دوورکەوتەوە ٥ إسْتَنفر الدابة: وای لە وڵاخەکە کرد هەڵسڵەمێتەوە ٥ إسْتَنفر الحاکم الرعیة: فەرمانڕەوا داوای لەخەڵکەکە کرد بەپەلە بڕۆن بۆ بەرەنگاریکردنی دوژمن و شەڕ لەگەڵ کردنی ٥ إسْتَنفَرَ بني فلان: داوای لەهۆزی فلان کرد بەهاوارییەوە بێن و ڕزگاری بکەن ٥ النّافِرُ: دەگوترێ: (دابة نافِر) وڵاخێکە هەڵسڵەمینەوەی زۆرە ٥ لەپێشبڕکێ و کێبڕکێ دا سەرکەوتوە ٥ (شاة نافِر) مەڕێکە کرم لە لوتیەوە دێتە دەر، کرم فڕێ دەدا ٥ شتێك لە لوتیەوە دەردەدا وەکوو کرم وایە ٥ نافرة فلان: خزم و کەس وکارە نزیکەکانی فلانکەس ٥ النافورة: شتێکە لە باخچەو چێتی وادا دادەنرێ ئاو بەرز دەکاتەوە بەتەوژم بۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەو فێنك کردنەوەی شوێنەکە ٥ النِّفارُ: هەڵسڵەمینەوە ٥ النُّفارَة: ئەو شتەی ئاو بژیوان یان سەرکەوتوو لەژێرکەوتوی وەردەگرێ.٥ النَّفْرُ: خەڵکانێك بەپەلەو هەڵەداوان بۆ شتێك دەچن یان بۆشەڕ ٥ (یوم النفر الأول) دووەم ڕۆژی جەژنی قوربانە کە حاجی لەدەشتی مینایەوە دەڕۆن بۆ مەککە ٥ (یوم النفر الآخر) سێیەم ڕۆژی جەژنی قوربان ٥ النَّفَرُ: لەسێ کەسەوە بۆ دەکەس ٥ دەگوترێ: (هم نَفَرُ فلان) ئەوانە تاقمی فلانکەسن ٥ بۆتاقە پیاوێکیش ٥ النُّفْرَةُ: ئەوەی بەمنداڵ دا دەکرێ بۆ چاوەزار ٥ النُّفِيُّ: هاوشان لەشانازیی کردن دا ٥ خەڵکانێك بڕۆن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ دوژمن ٥ النَّفیر العامُّ: ڕاچەنینی تێکڕای خەڵك بۆ شەڕکردن لەبەرامبەر دوژمن ٥ کەسێك کە بێ کەڵك بێ پێی دەگوترێ: (فلان لافي العیر ولا في النفیر) واتە: فلانکەس نەلەگەڵ کاروانی قوڕەیش بوو کەلەشامەوە دەگەڕایەوە بۆ مەککە بەسەرۆکایەتی ئەبوسوفیان، نەلەگەڵ سوپای قوڕەیش دا بوو کەبەسەرۆکایەتی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بە پیر کاروانەکەوە چوو بۆ ڕزگارکردنی، جاکەسێك لەگەڵ ئەم دوو تاقمەدا نەبووبێ بەپیاو حسێب نەکراوە.

**نَفَزَ** الظَّبيُ نَفزاً ونفوزاً: ئاسکەکە بازی داو قاچەکانی لێك هەڵبڕین و بەیەکەوە داینانەوە.

**نَفَزَ** فلان: فلانکەس مرد ٥ نَفَّزَت المرأة وَلَدَها: ئافرەتەکە منداڵەکەی هەڵپەڕاند ٥ تنافَزوا: عەمبازی یەکتر بوون، پەلاماری یەکتریان دا ٥ دەگوترێ: (الصِّبیان یتنافزون في لعبهم) منداڵەکان لەیاری کردنەکەیان دا بەسەر یەکتردا بازیان دا ٥ النُّفَّازی: یارییەکە یاریکەرەکان بازی تێدا دەدەن ٥ النَّفیز: ڕۆنەکەرەی بزرکاو کەلەناو مەشکەکەدا یەکترنەگرێ و تۆپەڵ نەبێ ٥ نَفسَهُ نَفساً: بەچاو هەنگاوتی، چاوەزار لێ یدا ٥ نَفِسَتْ المرأةُ: ئافرەتەکە منداڵی بوو ٥ نُفِسَتْ وَلَداً: منداڵی بوو ٥ (دَمُ نِفاسٍ) خوێنی پاش منداڵبوون.

**نَفِسَ** بالشیء: شتەکەی لاخۆشەویست بوو لەدەستی نەبۆوە ڕژدو چرۆك بوو دڵی نەهات شتەکە ببەخشێ.

**نَفِسَ** الشَّیْئَ وبه علی فلان: حەسودی بەفلان برد بەوەی کە ئەوشتە هی ئەومو ئەوی بەشیاوی ئەوە نەزانی ئەو شتەی هەبێ.

**نَفُسَ الشيْءُ**: شتەکە بەنرخ بوو

**أنفسَ الشَّيْءُ**: شتەکە بەنرخ بوو، جێگای سەرنج بوو ٥ **نافَسَ في الشَّيْءِ**: زێدەڕەوی لەشتەکەدا کرد لەدڵی خەڵك دا شیرینی کرد ٥ **نافس فلاناً في كذا**: کێبڕکێی لەگەڵ فلان دا کرد بۆئەوەی پێشی بکەوێ بەبێ ئەوەی زیانی پێ بگەیەنێ ٥ **نَفَّسَ عَنْهُ**: قورسایی لەسەر کەم کردەوە.

**نَفَّسَ عنه كربته**: ناخۆشییەکەی لەسەر لابرد ٥ **تنافَسَ القومُ**: خەڵکەکە پێشبڕکێو مونافەسەی یەکتریان کرد بەبێ ئەوەی زیانیان بۆ یەکتر ببێ ٥ **تَنَفَّسَ**: هەناسەی دا هەناسەی هەڵکێشا ٥ **تَنَفَّسَ الريح**: بایەکە بەهێواشی هەڵیکرد ٥ **تَنَفَّسَ في الكلام**: قسەی درێژ کردەوە ٥ **تَنَفَّسَ النَّهر**: ڕووبارەکە ئاوی زیادی کرد ٥ **تَنَفَّسَ الموجُ**: شەپۆلەکە ئاوی دەردایە دەر ٥ **تَنَفَّسَ العُمْرُ**: تەمەن درێژ بوو ٥ **تَنَفَّسَ القوسُ**: کەوانەکە درزی برد ٥ **تَنَفَّسَ الصُّبْحُ**: بەیانی دەرکەوت، ڕووناکی بەیانی ئاشکرا بوو ٥ **تَنَفَّسَ الصُّعداء**: هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو ماندوێتی حەسایەوە ٥ **الأَنْفَسُ**: بەنرختر ٥ درێژتر، باشتر ٥ فراوانتر ٥ **التَّنافُس**: هەڵنانێکی دەروونی سروشتییە داخوازی ئەوەیە هەوڵ بدەی لاسایی گەورە پیاوانی مێژوو بکەیەوەو بچیتە ڕیزی ئەوان ٥ **المُتَنَفِّسُ**: دەگوترێ: (أنفٌ متنفِّس) لوتێکی پانەوەبووە کون گەورەیە ٥ **المُنافَسَة**: بەمانا (التنافس) دێ ٥ **المُنْفِسُ**: دەگوترێ: (مال مُنفِسٌ) ماڵو سامانی زۆر ٥ **المنفوس**: زاروك ٥ شتێك چاوەزار لێی دابێ ٥ خۆزگەی بۆ بخوازرێ ٥ **النّافِسُ**: چاوپیس، حەسودو چاوچنۆك ٥ (شيء نافِسٌ) شتێکە داخوازی لەسەرە ٥ **النِّفَاسُ**: جۆرە خوێنێکی ئافرەتە ماوەیە دوای منداڵبوون دێ لەو ماوەدا منداڵدان و کۆئەندامی زاوزێ دەچنەوە سەر حاڵەتی سروشتی خۆیان کەنزیکەی شەش هەفتەیەکی گەرەکە ٥ **النَّفْسُ**: گیان ٥ دەگوترێ: (خرجت نفسه أو جاد بنفسه) مردو گیانی لەدەست دا ٥ خوێن ٥ دەگوترێ: (دَفَقَ نَفْسَهُ) خوێنی بەفیچقە لێ دەرهێنا ٥ خودی شتەکە ٥ دەگوترێ: (جاء هو نَفْسُهُ أو بنفسه) ئەو خودی خۆی هات ٥ دەشگوترێ: (أصابته نفس) چاوی پیس هەنگاوتی، چاوەزار لێی داوە ٥ (فلان ذو نفس) فلانکەس خاوەن ڕەوشتی بەرزو مەردایەتییە ٥ (في نفسي أن أفعل كذا) لەنیازو مەبەستم دایە ئەوە بکەم ٥ (فلان يؤامر نفسيه) فلانکەس دوو ڕاو بۆچوونی هەیە نازانێ بەپێی کامیان بکا ٥ **النَّفَسُ**: هەناسە ٥ هەوای نەرم؛ بای شەماڵ ٥ کزەبای شەماڵ ٥ قومەئاو و شتی وا ٥ بارودۆخی ئاسایی و بێ چورتمی ٥ دەگوترێ: (هو في نفس من أمره) ئەو کاروباری ئاسایی و بێ کێشەیە دەتوانێ بەئارەزووی خۆی پەل ڕاهاوێ ٥ (بيني وبينه نَفَسٌ) نێوانی من و ئەو دوورە ٥ (شراب ذو نفس) شەرابێکە تینوایەتی دەشکێنێ ٥ (شاعر أو كاتب طويل النفس) شاعیر یان نووسەرێکی هەناسە درێژەو دەتوانێ بەچەند جۆر بەهرەکەی خۆی دەربخا ٥ (يعجبني نَفَسُ هذا المؤلف أو هذا الطاهي) من سەرسامم بە شێوازی ئەم دانەرە یان ئەم چێشت لێنەرە ٥ **النَّفوسُ**: حەسودو ڕژدو چاو چنۆك ٥ **النَّفيسُ**: ماڵو سامانی زۆر ٥ (شيء نفيس) شتی بەنرخ و خۆزگە بۆ خوراو ٥ (رجل نفيس) پیاوێکی چاو چنۆك.

**نَفَشَ القُطْنُ** ونحوه نَفْشاً ونفوشاً: لۆکەکە کرایەوە، فش کرایەوە.

**نَفَشَ القومُ:** خەڵکەکە کەوتنە حاڵەتی هەرزانیەوە ◊ **نَفَشَت الماشية في الزرع:** ئاژەڵەکان بەلەوەڕگاو ناوکشتو کاڵەکەدا بلاو بوونەوە شەو لەوەڕیان کرد.

**نَفَشَ على الطعام:** چووە سەر سفرەو خوانەکە بۆ نان خواردن.

**نَفَشَ القُطنَ أو الصوفَ:** لۆکەکەی شی کردەوە هەلاجی کرد ◊ خورییەکەی بەشەکرد بەئامێری شە تاڵەکانی لێك کردنەوە ◊ یان بەدەست خورییەکەی خاوکردەوە ◊ (ألنَفَش الراعي الماشية): ولاخەکانی بەشەو ڕەوانەی لەوەڕگا کردنو بۆخۆی نوست ◊ **نَفَّشَ القُطنَ:** لۆکەکەی کردەوە ◊ هەلاجی کرد ◊ **إنْتَفَشَ القُطنُ** ونحوه: لۆکەکە شی کرایەوە ◊ **إنْتَفَشَت الهِرَّةُ:** پشیلەکە موی جەستەی ڕاستبوونەوە تاوای لێ هات بنکی تاڵەمووەکانی جەستەی بیندران ◊ **إنْتَفَشَ الطائر:** باڵندەکە پەڕو باڵی لێ فش بوون دەتگوت دەترسێ یان سەرمایەتی ◊ **تَنَفَّشَ:** بەمانا (نَفَشَ) دێ ◊ **المُتَنَفِّشُ:** دەگوترێ: (أمةٌ متنفشة الشَّعْر) کچۆڵەیەکە قژی ژاکاو و بژن ◊ (أنف مُتَنَفِّش) لوتێکە نەرمایی کەمەو کون پانو فراوانە ◊ هەر هاوساویەك ناوەوەی بۆش بێ ◊ **النَّفَشُ:** خوری (بە شە) کراو و پشکنراو ◊ شتو مەکی پەرتەوازە بوو ◊ دەگوترێ: (باتت غَنَمُه نَفَشاً) مەڕو بزنەکانی بلاو بوونەوە ◊ قسەی زۆرو داواکاری زۆر ◊ **النَّفّاشُ:** لوتبەرزو خۆبەمزلزان ◊ کەسێك لافی شتێك لێ بدا کەنەیبێ، شانازیی بەشتێکەوە بکا کەنیەتی ◊ جۆرە نارنجێکە دەکرێتە مرەبا.

**نَفَصَ ببوله نَفْصاً:** بەتەکان میزی هەڵدا، دەگوترێ: (نَفَصَ بالكلمة) قسەی بەخێرایی کردن ◊ **أنْفَصَ بالضحك:** زۆر پێکەنی ◊ **أنْفَصَ بشفتيه:** بەلێوی ئامازەی بۆ کرد ◊ لێوی لێ داقرینجاند ◊ **أنْفَصَ بالكلمة:** قسەکەی بەخێرایی گوتن ◊ **المِنْفاصُ:** کەسێك زۆر پێبکەنێ ◊ هەروا ناوە بۆ کەسێك لەکاتی نوستن دا میز لەجێگە نووستنی دا بەخۆدا بکا ◊ **النُّفاصُ:** دەردێکە توشی مەڕوبزن دەبێو میزەچرکەیان پێ دەگا تا مندار دەبنەوە ◊ **النُّفْصَةُ:** فیچقە کردنی خوێن.

**نَفَضَ الثوبُ أو الصبغُ نفوضاً:** قوماشەکە هەندێ لەڕەنگەکانی چونەوە، نەمان.

**نَفَضَ الزرع:** کشتوکاڵەکە پێگەیی و هەموو گوڵە دانەوێڵەکانی دەرکەوتن.

**نَفَضَ الكَرْمُ:** دارمێوەکە پۆخەکانی پشکوتن ◊ **نَفَضَت الدابةُ:** ئاژەڵەکە زاو و زێی کرد.

**نَفَضَ فلان من مرضه:** فلانکەس لەنەخۆشییەکەی ڕزگاری بوو.

**نَفَضَ القوم:** خەڵکەکە تێشوویان بڕایەوە.

**نَفَضَ الشَّيْءَ نَفْضاً:** شتەکەی تەکاند بۆئەوەی ئەوەی پێوەی نووساوە هەڵوەرێ ◊ دەشگوترێ: (نَفَضْتُ الحُمّى) لەرزوتا وەشەقەتۆڵەی هێناو هەڵی پەڕاند.

**نَفَضَ المكانَ ونحوه:** سەیری شوێنەکەی کردو چی تێدا بوو بینیو لێی ورد بۆوە بۆئەوەی بزانێ چییە.

**نَفَضَ الشَّيْءَ:** شتەکەی لێ کردەوە تەکاندی دایچۆڕاند ◊ دەگوترێ: (نَفَضوا حَلائبَهم) گوانی ئاژەڵەکانیان یەکەیەکە دادۆشیو هیچیان تێدا نەهێشتەوە ◊ **نَفَضَت المرأة كَرِشَها:** ئافرەتەکە منداڵی یەك لەدوایەکی بوون، منداڵی زۆری خستنەوە ◊ **أنْفَضَ الوعاءُ:** زەرفەکە هیچی تێدا نەما ◊ **أنْفَضَ القومُ زادهم:** خەڵکەکە تێشوو

بژێوی خۆیان تەواو کرد لەناویان برد ◊ **نَفَضَ الشَّيْئَ**: شتەکەی لێ کردەوە تەکاندی دایچۆڕاند.

**إنْتَفَضَ الشَّيْئ**: شتەکە کەوتە جمو جوڵو هەڵبەزو دابەز ◊ دەگوترێ: (فلا يَنْتَفِضُ من الرعدة) فلانکەس بەهۆی لەرزوتاوە هەڵدەلەرزێ ◊ **إنْتَفَضَ الكرمُ**: دارمێوەکە پۆخەکانی کرانەوەو گەڵای کرد ◊ **إسْتَنْفَضَ الشَّيْئ**: شتەکەی داچۆڕاندو دایتەکاند ◊ **إسْتَنْفَضَ الفصيلُ مافي الضرع**: بێچوە ئاژەڵەکە ئەوەی لەگوانی دایکی دا بوو دایچۆڕاند ◊ **إسْتَنْفَضَ القومُ**: خەڵکەکە چەند کەسێکیان نارد بۆ تاقیکردنەوەی شوێنەکە تا بزانن ئاخۆ دوژمنی لێیە، ئەو شوێنە ترسی تێدایە ◊ **إسْتَنْفَضَ المكانَ ونحوه**: سەیری شوێنەکەی کرد بۆئەوەی بزانێ چی تێدایەو چی تێدا نیەو بیناسێ ◊ **إسْتَنْفَضَ القومَ**: لەخەڵکەکە وردبۆوە و زۆری سەیرکرد ◊ **إسْتَنْفَضَ ماعنده**: ئەوەی لای بوو دەری هێنا ◊ **الأنْفُوضَةُ**: ئەو میوەو شتەیە کە لەدرەختی بەردار دەکەوێتە خوار بۆ ژێر درەختەکە ◊ دەگوترێ: (أصابنا اليومَ أنافيض) ئەمڕۆ میوەی لەدرەخت بەربۆوەمان خوارد، کۆمان کردەوە ◊ **المِنْفاضُ**: قوماشێکە چارەکەیەکە لەژێر درەخت ڕادەخرێ بۆئەوەی ئەو میوەی لەدرەختەکە دەتەکێندرێ بکەوێتە سەری ◊ **المِنْفَضُ**: بەمانا (المِنْفَاضُ) دێ ◊ بێژنگی گەورە ◊ **المِنْفَضَةُ**: قاپێکە گڵ یان لمی تێدەکرێ شتی سوتاوی تێ فڕێ دەدرێ ◊ (تەپڵەکی جگەرە) ◊ **المِنْفَضَةُ**: داردەستێکە لە درەختی خەیزران بەڕەو قاڵیو شتی وای پێ دەتەکێندرێو تەپو تۆزی پێ لێ دەکرێتەوە ◊ **المَنْفُوضُ**: ئەو کەسەی لەرزوتا دەیخاتە چۆقە چۆق ◊ **النَّافِضُ**: (ثوب نافِض) قوماشەکە ڕەنگەکەی چۆوە ◊ هەروا دەگوترێ: (أخذتْه حمى نافِض) لەرزوتای بەهێز هێناویەتە چۆقە چۆق ◊ چاوساغو نیشاندەر لەپێش قافڵەوە ڕێگاکە بەتاقی بکاتەوە بزانێ ئەمینە یان نا ◊ **النَّفَاضُ**: چۆقە چۆقو هەڵلەرزین بەهۆی لەرزو تاوە ◊ **النُّفَاضُ**: گرانیو قاتو قڕی ◊ ئەوەی هەڵدەوەرێ لەشتی تەکێندراو ◊ ئەوەی لەناو دەم دا دەمێنێتەوە لەپرژە سیواکو شتی وا و تف دەدرێتەوە ◊ **النِّفَاضُ**: پۆشاک: دەگوترێ: (ماعليه نِفَاضٌ) هیچ پۆشاکێکی لەبەردا نیە ◊ **النَّفَضُ**: ئەو میوەو بەروبوومەی لەدرەخت دەکەوێتە خوار بۆ بنکی درەختەکە ◊ بۆڵەترێ کە لە هێشوەکەدا تێک دەترنجێنو پاڵەپەستۆی یەکتر دەکەن ◊ **النَّفْضُ**: کەرمشانو هەنگە مردوو کە دەکەونە ناو کوڵەسەوە ◊ **النُّفَضَاءُ**: هەڵلەرزینی لەرزوتادار ◊ **النُّفْضَةُ**: ڕێژنە باران کەلە پارچە زەویەک دەداو لەپارچە زەویەکی تر نادا ◊ **النَّفْضَةُ**: کۆمەڵە خەڵکێك دەنێردرێن بۆ شوێنێك بۆ جاسوسیو بەتاقی کردنەوەی ئاخۆ دوژمن لەوێ هەیە یان نا؟ ◊ **النُّفَضي**: هەڵلەرزین ◊ **النَّفوضُ**: دەگوترێ: (إمرأة نفوض) ئافرەتێکە منداڵ زۆرە ◊ (رجل نفوض للمكان) پیاوێکە لەشوێنەکە ورد دەبێتەوە ◊ **النَّفيضة**: بەمانا (النَّفَضَةُ) دێ ◊ **نَفَطَتِ القِدْرُ**: مەنجەڵەکە کوڵی پرژی وادەهاوێ دەڵێی تیرە.

**نَفَطَ** فلان: فلانکەس ڕقی هەڵساو لەڕقان گەرم داهاتووەو هەر خۆی دەخواتەوە.

**نَفَطَ العَنْزُ**: بزنەکە پژمی.◊ **نَفَطَ الظبيُ**: ئاسکەکە باڕاندی ◊ دەگوترێ: (نَفَطَ فلان) فلانکەس بەشێوەیەك قسەی کرد کەس لێی حاڵی نەبێ.

**نَفِطَ الصَّبِيُ نَفَطاً**: منداڵەکە خرۆێلکەی لێ هاتن.

نَفِطَت يدهُ من العمل نَفَطاً ونفيطاً: دەستی بالوکەو بڵقی لێ پەیدا بوون ئاویان تێدایە ٥ أَنْفَطَ العمل یدیە: کارکردن بڵقی لەدەست دا پەیدا کردن پڕن لەئاو ٥ تَنَفَّطَت القِدْرُ: بەمانا (نَفِطَت) دێ ٥ دەشگوترێ: (تَنَفَّطَ فلان) فلانکەس لەڕق هەڵساوی خۆی گەرم داهاتووە ٥ تَنَفَّطَت یدُهُ من العمل: بەمانا (نَفِطَت) دێ ٥ النَّافِطَةُ: بلۆق و بڵق کەبەهۆکاری کارکردنەوە لەدەست دا پەیدا دەبن و پڕن لەئاو ٥ ئاوڵەو مێکوتە ٥ دەگوترێ: (ید نافطة) دەستێکە بلۆقی کردووە، دەشگوترێ: (مالە عافطة ولانافطة) هیچی نیە ٥ النَّفَاطَةُ: نەوتچیەتی، نەوت دەرهێنن ٥ النَّفَّاط: نەوت دەرهێن لەبیرو کان ٥ نەوت فرۆش ٥ النَّفَّاطَةُ: بڵقی سەر دەست و شوێنی تری جەستە کە پڕبێ لەئاو ٥ ئەو شتەی نەوتی پێ دەهاوێ و دەیپرژێنێ ٥ شوێن دەرهێنانی نەوت ٥ النِّفْطُ: نەوت: کە بەکاردێ بۆ سوتەمەنی و شتی وا ٥ النَّفْطُ: بلۆق و بڵق لەجەستەدا ٥ مێکوتەو ئاوڵە ٥ النَّفْطَان: جۆرە کۆکەو هەناسە دانێکە لەکاتی ڕق هەڵسان دا ٥ النُّفَطَةُ: کەسێك دەستی بلۆقی کردبێ ٥ نَفَعَهُ نَفْعاً: سودی پێگەیاند ٥ أَنْفَعَ: بازرگانی لەشتی خێر ئامێزدا کرد ٥ نَفَّعَهُ: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (نَفَعَ) دێ ٥ إِنْتَفَعَ بە: قازانجی لێدەستکەوت ٥ إِسْتَنْفَعَ فلاناً: داوای سودو قازانجی لێ کرد ٥ المَنْفَعَةُ: هەرشتێك سودو قازانجی لێ ببیندرێ ٥ (مذهب المَنفعة) مەزهەبێکی ئەخلاقییە ٥ بەناوبانگترین ڕێڕەوی ئەم مەزهەبە (بنتام و ستیوَرْت میل) ٥ (منافع الدار) ئەو شتانەی کەپەیوەندیان بەخانووەوە هەیە وەکوو حەوشەو سیاج و بەربێلاو زێراب و بارکۆن .....هتد ٥ (المنافع العامة) ئەو سودو قازانجانەی بۆ هەموو کەسەو هەموو خەڵك بەگشتی لێی سودمەند دەبن ٥ النَّافِعُ: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا ٥ النافعة: سودو قازانج ٥ دەگوترێ: (ما نفعني فلان بنافعة) فلانکەس قازانجێکی پێ نەگەیاندووم ٥ النَّفْعُ: خێرو بێرو سودو قازانج و بەرەکەت ٥ هەرشتێك مرۆڤ بەمەبەست بگەیەنێ.

النُّفْعَةُ: عەصاو گۆچان.

نَفَّ الأرضَ نَفّاً: زەوییەکەی تۆو کرد.

نَفَّ السَّوِيقَ: بەوشکی قاوتەکەی بەکارهێنا نەیکردە حەڵوا.

نَفَّ نَفّاً: چڵمی دەردا لەلوتی ٥ النُّفِيُّ: شتێکە وەکوو چارەکەو سفرە وەهایە قاوتی لەسەر دەبێژرێتەوە ٥ النَّفِيفُ: قاوت و شتی وا.

نَفَقَ الشَّيْئُ نَفَقاً: شتەکە تەواو بوو، بڕایەوە نەما.

نَفَقَ اليربوع: یەربوعەکە لەکونەکەی خۆی هاتە دەر ٥ نَفَقَتْ الدابة نفوقاً: ولاخەکە تۆپی.

نَفَقَ الجرحُ: برینەکە توێکڵی هەڵدا ٥ نَفَقَت البضاعة نفاقاً: کاڵاکە ڕەواجی بوو ٥ داخوازی لەسەر زۆر بوو ٥ دەگوترێ: (نَفَقَت المرأةُ): ئافرەتەکە خوازبێنی کەری زۆر بوون ٥ أَنْفَقَ فلان: فلانکەس هەژار بوو ٥ ماڵ و سامانی فەوتا ٥ أَنْفَقَ التَّاجِرُ: بازرگانەکە کاڵاکانی ڕەواجیان پەیدا کرد ٥ أَنْفَقَ الإبلُ: حوشترەکە توکی بڵاو بۆوە لەبەر قەڵەوی توکی هەڵدا ٥ أَنْفَقَ المالَ: ماڵ و سامانەکەی لەناو برد ٥ نافق اليربوع نِفاقاً: یەربوعەکە چووە کونەکەی خۆی ٥ نافق فلان: فلانکەس دووڕو بوو، ئەوەی دەری بڕی پێچەوانەی ئەوە بوو کەلەدڵی دا بوو ٥ نَفَّقَ السِّلعةَ: ڕەواجی بەکاڵاکەدا بازاڕ گەرمی بۆ کرد ٥ إِسْتَنْفَقَ الشَّيْئَ: شتەکەی کردە نەفەقەو بژێو

بۆ ماڵو منداڵی ◊ دەگوترێ: (إِسْتَنْفَقَ المالَ على عياله) ماڵو سامانەکەی کردە بژێوو مەسرەف بەسەر ماڵو منداڵی دا ◊ **الإنفاق:** بەخشینی ماڵ لەبوارێك لەبوارەکان دا ◊ هەژاریو نەبوونی ◊ **المُنافِق:** دووڕو، کەسێك کوفر بشارێتەوەو ئیمان دەربخا ◊ کەسێك دوژمنکاری بشارێتەوەو دۆستایەتی دەربخا ◊ کەسێك شتێك دەربخاو پێچەوانەی بشارێتەوە ◊ **المِنفاق:** کەسێك نەفەقەی زۆربێ مەسرەفو خەرجی زۆر بێ ◊ **المُنَفَّقُ من السراويل:** شوێنی دۆخێن ◊ پزوی دەرپێ ◊ **المَنفَقَةُ:** هۆکاری ڕەواج دان بەکاڵا ◊ دەگوترێ: (حُسْنُ الإعلان مَنْفَقَةٌ للسِّلعة) بانگەشەکردنی لەبارو پڕوپاگەندە کردنی جوان دەبێتە هۆکاری ڕەواجی کاڵا ◊ **النافِقاء:** یەکێکە لەکونو لانەی یەربوع ئەو کونەی بەدەرەوەیە لەویان دا خۆ حەشارنادا، خۆ لەکونێك دا حەشاردەدا کە دیارنیە ◊ ئەمەیە بنەمای نیفاق نیفاق لەمنەمە وەرگیراوە ◊ **النَّفَق:** تونێل ◊ کونێکە لەژێر زەویو ژێر کێو و ئەمسەرەو سەر کونە ◊ لەکوردستانی عێراق تا ئێستا دوو تونێل هەیە یەکێکیان تونێلی دەربەندیخانە لەشەستەکانی سەدەی بیستەم تەواو بووە دووەمیان تونێلی ئەزمڕە ساڵی ٢٠٠٩ کرایەوە ◊ **النَّفِق:** شتێك زوو بڕێتەوە ◊ دەگوترێ: (طعام نَفِقٌ) خواردنێکە زوو دەبڕێتەوە ◊ (فرس نفِق الجري) ئەسپەکە زوو لەغاردان دەوەستێتەوە ◊ **النُّفُقُ من النساء:** ئافرەتێك لای مێردی نەفەقەی باشی بدرێتێو شانسو بەختی چاکی لای مێردی هەبێ ◊ **النَّفَقَة:** ناوێکە لە وشەی (الإنفاق) واتە: یەك مانایان هەیە ◊ ئەو پارەی خەرج دەکرێ بۆ ژن: کەمێردەکەی بۆی دابین بکا بۆ خواردنو پۆشاكو شوێنی نیشتەجێ بوونو پێویستیاتی تر ◊ **النَّيْفَقُ من السراويل:** پزوی دەرپێو ڕانکەو شەرواڵ ◊ نافۆکی دەرپێ.

**نَفَلَ** الرجلُ نَفْلاً: پیاوەکە سوێندی خوارد.

**نَفَّلَ** فلاناً: زیادەی بەخشی بەفلانکەس ◊ دەگوترێ: (نَفَّلَ القائدُ الجُنْدَ) سەرلەشکرەکە زیدە بەخششی دا بەسەربازەکان ◊ لەدەستکەوتی شەڕ بەشی دان ◊ **أنْفَلَ فلان:** فلانکەس تەشوێی تاودایەو ڕوەکی قەتادی بڕی بۆ حوشترەکە بۆئەوەی بیخوا ◊ **أنْفَلَ لە:** سوێندی بۆ خوارد ◊ **أنْفَلَ فلاناً:** لەدەستکەوتی شەڕ بەشی فلانکەسی دا ◊ **نَفَّلَ عَنْ صاحبه:** لەجیاتی هاوەڵەکەی پارەی دا ◊ **نَفَّلَ فلاناً:** بۆ زیدەڕۆیی لەمانای (نَفَلَهُ دێ ◊ زیاد لە بەشی خۆی پێدا ◊ سوێندی دا ◊ **إنْتَفَلَ من الأمر:** دورەپەرێزی خۆی لەکارەکە ڕاگەیاند ◊ دەگوترێ: (إنْتَفَلَ مما قيل) بەرائەتی خۆی لەو قسە گوتراوانە ڕاگەیاند ◊ **إنْتَفَلَ من القوم:** لەیارمەتیدانی خەڵکەکە دوورکەوتەوە ◊ **إنْتَفَلَ الشَّيْءَ منه:** داوای شتەکەی لەو کرد ◊ **تَنَفَّلَ المصلي:** نوێژکەرەکە نوێژی سوننەتی کردن ◊ **تَنَفَّلَ على اصحابه:** لەدەستکەوتی شەڕدا ◊ زیاتر بەشی هاوەڵەکەی وەرگرت ◊ **النَّافِلة:** زیاد لەحەقو پێویست زیاد لەبەشی خۆی ◊ زیاد لەفەرزو واجب ◊ دەگوترێ: (هو يصلي النافلة) ◊ هەروا وشەی (نافِلة) ناوە بۆ دەستکەوتی شەڕ، بۆشتی بەخشراو، بۆ کوڕەزا ◊ **النَّفْلُ:** هەر تاعەتو خودا پەرستییەك زیاد لەفەرزو واجب بێ ◊ هەروا ناوە بۆ سەرما ◊ **النَّفَلُ:** دەستکەوتی شەڕ ◊ بەخشش ◊ هەروا ناوەبۆ ڕەگەزی ڕوەکێك ساڵانەو تەمەندرێژە چەند جۆرێکی هەیە هەندێکی دیمەکارەو خۆڕسکە، هەندێکی

دەروێنندرێ دەكرێ بەمناڵ وەكوو ئەو جۆرە كەپێی دەوترێ: (النَّفَل الأسكندري) و پێشی دەگوترێ: بیرسیم ٥ النُّفَلُ: سێ شەوی دوای سێی مانگ واتە شەوی چوارەم و پێنجەم و شەشەم ٥ النَّوْفَلُ: دەریا ٥ دەگوترێ: (رجل نَوْفَل) پیاوێكی بەخشندەیە ٥ گەنجی قۆزو جوانچاك ٥ النَّفْنافُ: بۆشایی نێوان دوو كێو ٥ شتی دوور ٥ النَّفْنَفُ: هەوا ٥ سارای دوورو فراوان ٥ دەگوترێ: (قطعتُ نَفْنَفاً من الأرض) ٥ بەرزایی یەك لەنێوان ڕوی زەوی و ئەودا بۆشاییەك هەبێ ٥ دەگوترێ: (بئر بعيدة النفنف) بیرێكە نێوان بنكی و زاركی زۆرە ٥ (نفانف الدار) دەوروبەری خانوو.

**نَفَهَ** نُفوهاً: ترسنۆك بوو ٥ دڵی زەعیف و لاواز بوو ٥ ئاژەڵی چەموش كەژێر بار بكرێ و بچەمێندرێ ٥ **نَفِهَتْ نفس فلان نَفَهاً**: نەفسی فلانكەس ماندو بوو لەوزەی دا نەما (فهو نافِهٌ) ٥ **أنْفَهَ لفلان من مالە**‌بەخششی بۆ فلانكەس كەمكردەوە ٥ **أنْفَهَ الدَّابَةَ**: وڵاخەكەی ماندو كرد ٥ **نَفَّهَ الدابةَ**: وڵاخەكەی ماندو كرد ٥ **إسْتَنْفَهَ فلان**: فلانكەس ئیسراحەتی كرد ٥ پشوی دا ٥ **نَفَاهُ نفواً**: دوری خستەوە ٥ **النُّفايةُ من الشَّيْءِ**: گوێزرو بنژیل و قرپۆكی شت و بەرماوەی شت.

**نَفَى الشَّيْءَ** نَفْياً: شتەكەی دوورخستەوە.

**نَفَى الحاكم** فلاناً: فەرمانڕەوا فلانكەسی لەوڵاتی خۆی دوورخستەوە دەری كرد.

**نَفَتَ السحابة** ماءَها: هەورەكە بارانی خۆی باراند ٥ هەروا وشەی (نفی) بەمانا ئینكاركردن دێ ٥ دەڵێ ئەوشتە هەرنەبووە ڕوی نەداوە.

**نَفَتِ الريحُ الترابَ**: ڕەشەباكە گڵ و خۆڵەكەی ڕادا ٥ **نافاه**: دژی وەستا پێچەوانە بوو ٥ **إنْتَفَى**: دووركەوتەوە، دەگوترێ: (إنْتَفَى الرجل عَنْ بلده) پیاوەكە لەزێدو نیشتمانی خۆی دوورخرایەوە دەركرا ٥ **إنْتَفَى شَعْرُهُ**: قژی هەڵوەرین (إنتفى الشجر عَنْ الوادي) درەختی شیو و دۆڵەكە فەوتان ٥ **إنْتَفَى من الشَّيْءِ**: خۆی لەشتەكە بێ بەری كردو خۆی لێ ڕزگار كرد ٥ **تنافت الأحكام أو الآراء**: بڕیارەكان یان بۆچوونەكان دژ بەیەك و پێچەوانەی یەكتر بوون ٥ **المَنْفَى**: شوێنی كەسانی دوورخراوە لەزێدو نیشتمانیان ٥ **النُّفايَةُ**: شتی فڕێدراو لەبەر بێ كەڵكی و خراپی ٥ باقی مەندەی شت ٥ (نُفاية المطر) پڕژو پریشكی باران ٥ دەشگوترێ: (هو نُفاية القوم) ئەو خوێڕی نەتەوەكەیەتی، یەكێكە لەهەتیومچەكانی نەتەوە ٥ **النَّفْيُ**: پێچەوانەی ئیجاب و ئیسپاتە ٥ (عقوبة النفي) سزایەكە بریتییە لەوە تاوانبار لەزێدو نیشتمانی خۆی دوور بخرێتەوە بۆ شوێنێكی تر بۆ ماوەیەكی دیاریكراو یان دیاری نەكراو ٥ **النَّفَيان**: ئەوەی هەور دەیرێژێ لەناوی خۆی ٥ لافاو ٥ **النُّفْيَةُ**: سفرەو خوانێكە لەپوش و پرژە خورما دروست دەكرێ پێشی دەگوترێ سەلە، گۆشت و پەنیرو شتی وای لەسەر دادەنرێ و دەخرێتە بەر خۆرەتاو تا وشك بێتەوە ٥ **النُّفْيَةُ**: پاشماوەو بەرماوەی شت ٥ شتی فڕێدراو لەبەر خراپی و بێ كەڵكی ٥ **النَّفِيُّ**: بەمانا (النُّفاية) دێ دوورخراوە لەزێدو نیشتمانی خۆی ٥ دەگوترێ: (هذا نَفِيُّ الريح) ئەوە هاوردەو فڕێدراوی ڕەشەبایە ٥ ئەو گڵ و خۆڵ و شتەیە كەڕەشەبایەكە لەبن قەدە درەختەكانی دا هێشتویەتیەوە ٥ (نَفِيُّ الرحى) ئەو ئاردەیە بەرداشەكە لەسوری خولانەوەیدا فڕێی دەداتە دەر ٥ (نَفِيُّ القِدر) ئەو دڵۆپە ئاوانەی

کەمەنجەڵ لەکاتی کوڵان دا فڕێی دەداتە دەر ◊ (نَفيُ الجيش) ئەو سەربازانەی دەکەونە قەراخو بیجاخی سوپا ◊ (فلان نفي) فلان باوکی دیاریی نیەو بۆخۆی ترۆ کراوە.

**نَقَبَ فلان في الأرض نَقْباً:** فلانکەس بەناوزەوی دا گەڕا ◊ ڕۆیشت.

**نَقَبَ عَنْ الشَّيْئ:** لەشتەکەی کۆڵیەوە.

**نَقَبَ الجلدَ أو الجدارَ:** پێستەکە یان دیوارەکەی کون کرد ◊ دەشگوترێ: (نَقَبت النَّكبَةُ فلاناً) کارەسات و تێشکانەکە فلانکەسی کەلەپاچە کرد.

**نَقَبَ الثوبَ:** قوماشەکەی کردە دەرپێی کورت.

**نَقِبَ الشَّيْئُ نَقَباً:** شتەکە کون بوو.

**نَقِبَ البعيرُ:** حوشترەکە سمی تەنك بوون

**نَقُبَ على القوم نقابةً:** بوو بەگەورەو ریش سپی خەڵکەکە ◊ (ناقَبَ فلاناً): توشی فلان بوو بەبێ وادەو نەخشەی پێش وەخت ◊ لەناکاو توشی بوو ◊ **لَقيته نِقاباً:** لەناکاو تووشی بووم ◊ **ناقب الرجلَ فَنَقَبَهُ:** شانازی بەسەر پیاوەکەدا کرد بەکرداری جوان و ڕەوشتی بەرز، بەسەری دا زاڵ بوو ◊ **نَقَّبَ:** بۆ زێدەڕەوی لەمانای (نَقَبَ) دا دێ ◊ **نَقَّبَ عَنْ الشَّيْئِ:** زۆری لەشتەکە کۆڵیەوەو وردبینی تێدا کرد ◊ **تَنَقَّبَتِ المرأةُ:** ئافرەتەکە چارشێوی بەسەر ڕوخساری خۆی دا دادایەوە.

**المَنْقَبُ:** ڕێگەی تەنگەبەر لەنێوان دوو کێو دا ◊ دەربەندو تەنگڵ ◊ ئەو شوێنەی لێکۆڵەرەوە هەوڵی خۆی تێدا ئەنجام دەدا ◊ **المِنْقَبُ:** شت کونکەر ◊ کەسێك زۆر لەشت بکۆڵێتەوە ◊ **المَنْقَبَةُ:** ڕێگای تەنگ لەنێوان دوو خانودا کەنەتواندرێ ڕەوی پێدا بکرێ ◊ کرداری چاك ڕەوشتی بەرز ◊ **المِنْقَبَةُ:** بەمانا (المِنْقَبُ) دێ ◊

**النَّاقِبَةُ:** برینێکە لەلای تەنیشتی مرۆڤ پەیدا دەبێ و دەتەنێتەوە بۆ ناوەوەی جەستە ◊ **النُّقَّابُ:** زاناو بلیمەت و زیرەك ◊ سەرپۆشێك ئافرەت دەم و لوتی خۆی پێ دادەپۆشێ ◊ سك، دەگوترێ: (هما فرخان في نِقاب واحد) ئەوانە دوولانەن و بەیەك سك بوون و لەیەك دەچن ◊ **النِّقابة:** سەندیکا؛ کۆمەڵێك هەڵدەبژێرێن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری تایەفەو پێڕێك لەخەڵك وەکوو سەندیکای کرێکاران، سەندیکای ئەندازیاران، سەندیکای ڕۆژنامەنووسان ...هتد ◊ هەڵبژێراوەکان لەناو خۆیان دا یەکێك دەکەن بەنەقیب و یەکێکی تر بەجێگیرو بەو جۆرە ◊ سەیید نژادەکانی کوردستان و عێراقیش کاتی خۆی لە (مەجلیسی مەبعوسان)دا نوێنەرێکیان هەبوە پێیان گوتووە نەقیب و نوێنەرایەتی سەییدەکانی کردووە ◊ **النَّقّابُ:** کەسێك زۆر پشکنین بکاو لەشت بکۆڵێتەوە ◊ **النَّقْبُ:** کون لەپێست و دیوارو شتی وادا ◊ **النُّقْبَةُ:** دەرپێی کورت، یان دەرپێی بێ دەرەلینگ ◊ گروێیی و لەش خوران یان سەرەتای گروێیی ◊ شوێنی ژەنگ ◊ کاریگەریی ژەنگ لەسەر شتێك ◊ دەگوترێ: (جلوت سيفي من نُقَبِهِ) شمشێرەکەم لەژەنگ مشت و ماڵ کرد ◊ (إن عليه نقبة من سواد) لەسەر ئەو شتە پەڵە ژەنگی ڕەش هەیە ◊ دەشگوترێ: (فلان حسن النقبة) فلانکەس ڕوخسار جوانە ◊ **النِّقْبَةُ:** شێوەی ڕوخسار داپۆشین ◊ **النَّقيبُ:** زوڕنا ◊ زوبانەی تەرازو ◊ سەرۆکی سەندیکا ◊ پلەیەکە لەپلەی عەسکەری و پۆلیس لەژوور پلەی مولازیم و خوار پلەی ڕائیدە ◊ ڕیش سپی و سەرۆکی بنەماڵەو لێ پرسراوی کاروباریان ◊ **النَّقيبة:** (نقيبة الرجل) ئەخلاق و سروشت و ڕەوشتی پیاو ◊ مەشورەت

و راپرسی ٥ دەگوترێ: (هو ميمون النقيبة) ڕا دروستو مەشۆرەت پێکراوێکی پیرۆز ٥ هەروا دەگوترێ: (ماله نقيبة) ڕای پەسەندی نیە.

**نَقَثَ** فلان في السير أو الأمر نَقْثاً: فلانکەس لەڕۆیشتن دا یان لەکارەکەدا پەلەی کرد.

**نَقَثَ** عَنِ الشَّيْئِ: شوێنی شتەکەی هەلکۆلی بۆنەوەی دەری بێنێ.

**نَقَثَ** الأرضَ: زەوییەکەی شی کردەوە بەپاچو بێل.

**نَقَثَ** العَظْمَ: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا ٥ **نَقَّثَ** فلان في السير أو الأمر: فلانکەس لەڕۆیشتن دا یان لەکارەکەدا پەلەی کرد ٥ **نَقَّثَ الشَّيْئَ**: شتەکەی گواستەوە ٥ **إِنْتَقَثَ**: دەق بەمانا (نَقَثَ) دێ ٥ **تَنَقَّثَ** فلان: بەمانا (نَقَثَ) دێ ٥ **تَنَقَّثَ فلاناً**: هەولی دا فلانکەس وەگری خۆی بکاو مەیلی لای ئەوی هەبێ ٥ **تَنَقَّثَ ضَيْعَتَهُ**: کاروباری ئەوی گرتە دەست خۆی ٥ **نَقَاثٌ**: ناوە بۆ کەمتیار ٥ **النُّقْثُ**: فیتنەبی.

**نَقَحَ** الشَّيْئَ نَقْحاً: چاکی شتەکەی لەخراپەکەی جیاکردەوە.

**نَقَحَ** العَظْمَ: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا.

**نَقَحَ** العودَ: چلەدارەکەی سپی کرد، توێکلەکەی لێ کردەوە.

**نَقَّحَ** الجِذْعَ: پەرژو پالی لە لقەدارەکە کردەوەو گرییەکانی لوس کردن ٥ دەشگوترێ: (نَقَّحَ الكلامَ أو الكتابَ) قسەکەی ڕێکو پێك کردەوە، کتێبەکەی ڕاست کردەوە هەلەکانی لابردن ٥ **ناقَحَهُ**: قەلاچۆی کرد ٥ **نَقَّحَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَقَحَ) دا دێ ٥ **نَقَّحَ الكلامَ أو الكتابَ**: کەلامەکەی پالفتە کرد، هەلەو نارێکیەکانی لابردن ٥ **نَقَّحَتْهُ السنون**: ڕۆژگار برستی لێ بڕیوەو کاری خۆی لێ کردووە ٥ **إِنْتَقَحَ العَظْمَ**: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا ٥ **تَنَقَّحَ شحمُ الناقة**: بەزو پیوی حوشترەکە کەم بوو ٥ **المُنَقَّحِ**: دەگوترێ: (رجل مُنَقَّحٌ) پیاوێکی خاوەن ئەزموونو قالبوی ڕۆژگارە ٥ هەروا دەگوترێ: (طبعة من الكتاب مُنَقَّحَةٌ) چاپی ئەمجارەی کتێبەکە پالفتەکراوە ٥ **النُّقْحُ**: هەوری سپی هاوینە ٥ **النِّقْحُ**: زانای شارەزاو قالبوو لەزانیاری دا ٥ دەگوترێ: (إنّه لَنِقْحٌ) ٥ **النُّقَحُ**: لەبی شۆڕاوەو پالفتە.

**نَقَخَ** رأسَهُ بالعصا: بەگۆچانو دارعەسا لەسەری دا.

**نَقَخَ** المُخَّ من العظم: مۆخی لە ئێسقانەکە دەرهێنا.

**نَقَخَ** الماء العَطَشَ: ئاوەکە تینوایەتی شکاند.

إِنْتَقَخَ المُخَّ من العظم: مۆخی لە ئێسقانەکە دەرهێنا ٥ **الأَنْقَخُ**: دەماغ بچوك ٥ کەم دەماغ ٥ دەگوترێ: (ظليم أَنْقَخُ) بێچوە نوعامەیەکی بێ دەماغە ٥ **النُّقَاخ**: پالفتەو خالیص لەهەموو شتێك ٥ دەگوترێ: (هذا نُقاخ العربية) ئەمە پالفتەی زمانی عەرەبییە ٥ هەروا وشەی (النُّقاخ) بەمانا ئاوی ساردو صافو گوارا دێ ٥ ئاوی زۆر کە بیرهەلکەن لەشوێنی بێ ئاو و بێرون دا زەوی بۆ هەلکۆلێو دەری بێنێ ٥ نووستنی ئەمینو ئامانو بێ وەی ٥ **النُّقْخَةُ**: ئافرەتێك لەبەر قەلەوی نەتوانێ بڕوا ٥ لەڕۆیشتن دا لەبەر گۆشتنی بەهێواشی هەنگاو هەلێنێ ٥ **النُّقَّاخُ**: لای پێشەوەی پشتە مل (واتە: دەوروبەری گوێچکەو ئێسقانی پشتگوێ).

**نَقَدَ** الشَّيْئَ نَقْداً: شتەکەی سوژن هاژن کرد بۆنەوەی بەتاقی بکاتەوە، شتەکەی لەبۆتەدا بۆنەوەی چاكو خراپ لێك جیابکاتەوە ٥ دەگوترێ: (نَقَدَ الدراهم والدنانير وغيرهما)

دیناره زێڕو دیرهەمە زیوەکانی لەبۆتەداو ئەسڵو تەزویری لێك هەڵاوارد ◊ هەروا دەگوترێ: (نَقَدَ الشِّعْرَ و نَقَدَ النثرَ) عەیبو لەکەی لەشیعرو پەخشانەکەدا هەن هەمووی دەرخستن یان لایەنە جوانەکانی شیعرو پەخشانەکەی خستنە ڕو ◊ هەروا دەگوترێ: (فلان ینقد الناسَ) فلانکەس ڕەخنە لەخەڵك دەگرێو عەیبو عاری ئەوانی دەرخستنو پاشملە غەیبەتیان دەکا ◊ **نَقَدَت الحَیَّةُ فلاناً:** مار بەفلانکەسیەوە دا، مارگەستی.

**نَقَدَ الشَّیْئَ وإلیه ببصره نقوداً:** بەتیلەی چاوی بۆشتەکەی ڕوانی بۆئەوەی هەستی پێ نەکرێ کە بۆ ئەو دەڕوانێ.

**نَقَدَ فلاناً الدارهمَ نقداً وتنقاداً:** پارەکەی بۆ فلانکەس ژماردو دایە دەستی.

**نَقَدَ فلاناً الثَّمَنَ، وله الثمنَ:** پارەکەی بەحازری و دەستەو یەخە دا بەفلانکەسو هیچ دوای نەخست.

**نَقِدَ الشَّیْئُ نَقَداً:** شتەکە گەندەڵی تێدا دروست بوو ◊ دەگوترێ: (نَقِدَ الضِّرْسُ أو القَرْنُ) ددانەکە یان شاخەکە کرمۆڵ بوو، داخوران، شکان.

**نُقِدَ الحافِرُ:** سمەکە توێکڵی هەڵدا ◊ **أنْقَدَ الشَّجَرُ:** درەختەکە گەڵای کرد ◊ **ناقَدَهُ:** موناقەشەی لەگەڵ دا کرد دەربارەی کارەکە ◊ **إنْتَقَدَ الوَلَدُ:** منداڵەکەی گەورە بوو ◊ **إنْتَقَدَ الدراهم:** دیرهەمەکانی وەرگرتن ◊ پارەپوچو تەزویرەکانی جیاکردەوە، دەشگوترێ: (إنْتَقَدَ الشعر علی قائله) عەیبو خەوشی شیعری شاعیرەکەی دەرخستن ◊ **إنْتَقَدَت الأرضُ الجذعَ:** گڵەکە لقەدارەکەی گەندەڵ کرد و ڕزاندی ◊ **تناقد وتَنَقَّدَ الدَّراهِمَ وغیرها:** دیرهەمەکانی لەبۆتە دان ساغو تەزویری لێك هەڵاوارد ◊ **الأنْقَدُ:** کیسەڵ، یان کەسێك ددانی ژان بکا ◊ ژیشك ◊ هەر لەم ڕوەوەیە کەلەپەندی پێشینان دا هاتووە (أسری من أنقد) لەژیشك شەورەوترە، چونکە ژیشك قەت بەشەو ناخەوێ ◊ هەروەها لەپەندێکی تردا گوتراوە (بات بلیل أنقد) بەشەو بەخەبەر مایەوە نەنوست ◊ **الإنْقِدان:** کیسەڵ ◊ **المِنْقادُ:** دەندوك ◊ **المِنْقَدَةُ:** ئامێری جیاکردنەوەی گوێزی کوێرەکو ئازا لەیەکتری ◊ پارچە ڕاخەرێکە گوێزی لەسەر جیادەکرێتەوە ◊ **النّاقد الفنی:** ڕەخنەگری هونەریی؛ نووسەرێك کاری سەرەکی ئەوەبێ کاری هونەری و ناهونەری لێك جیابکاتەوە ◊ کاری باشو خراپ لێك جیادەکاتەوە ◊ (النَّقْدُ) لەبواری کڕینو فرۆشتن دا فرۆشتنو کڕین بەپارەی حازر، (واتە: پێچەوانەی قەرز) ◊ هەروا دەگوترێ: (درهم نقدٌ) دیرهەمی زیوی ئەصڵ واتە: تەزویر نیە ◊ هەروا ناوە بۆ پارەی سکە لێدراو چ زێڕبێ چ زیو بێ ◊ یان هەر پارەیەکی تر کەلەبازاڕادا مامەڵەی پێ بکرێ ◊ هەروا ناوە بۆ فەنێك قسەی باشو خراپی پێ لێك جیادەکرێتەوە ◊ **النُّقْدُ:** مرۆڤی کەم نمودو گەشە نەکردوو ◊ **النَّقَدُ:** جۆرە درەختێکە گوڵێکی زەردی هەیە لەسارا دەڕوێ ◊ جۆرە مەڕێکە قەبارە بچوك ◊ یان ڕەگەزێکە لەئاژەڵی مەڕ قاچ بچوك دەمو لمبۆز ناشیرین لە وڵاتی بەحرەین هەیە بەخێودەکرێ، تاکەکەی پێی دەگوترێ: (نَقَدَةٌ) ◊ هەروا ناوە بۆ مرۆڤی خوێڕیو هەتیومچە ◊ **النُّقْدَةُ:** بڕوانە مادەی (الکَرَوْیا) ◊ **النَّقَّادُ:** ئەو کەسەی پارەی تەزویرو ئەصڵ لێك جیادەکاتەوە ◊ شوانی ئەو جۆرە مەڕەی کەپێی دەگوترێ: (النَّقَدُ) لەوڵاتی

بەحرمین بەخێودەکرێ ٥ یان خاوەنی ئەو جۆرە مەڕەیە.

**نَقِذَ نَقَذاً:** ڕزگاری بوو خەلست ٥ دەگوترێ: (أنقذته فنقِذ) ٥ **أَنْقَذَهُ:** ڕزگاری کرد، قوتاری کرد ٥ **نَقَّذَهُ:** بەمانا (أنقذه) دێ ٥ **تَنَقَّذَهُ:** بەمانا (أَنْقَذَهُ) دێ ٥ **تَنَقَّذ منه الحديث:** قسەکەم لێ دەرهێنا ٥ قسەم لێ وەرگرت ٥ **إسْتَنْقَذَهُ:** بەمانا (أَنْقَذَهُ) دێ ٥ **الأنْقَذُ:** قالۆچە ٥ **النَّقْذُ:** سەلامەتی‌و ڕزگاربوون ٥ دەگوترێ: (نقذاً لك) سەلامەتی‌و بێ وەیی بۆتۆبێ هەمیشە لەخۆشی دا بی ٥ **النَّقَذُ:** ڕزگارکراو، ئەوەی لەدەستی یەکێکی تر ڕزگاری دەکەی ٥ دەگوترێ: (ماله شَقَذٌ ولانَقَذ) واتە هیچی نیە ٥ **النَّقيذُ:** ئەوەی لەدەستی دوژمن ڕزگار دەکرێ ٥ **النَّقيذةُ:** بەمانا (النَّقيذ) دێ ٥ دەگوترێ: (هو نقيذة بؤس) ئەو ڕزگار بووی بەلاو کارەساتە ٥ هەروا ناوە بۆ زرێ لەم ڕووەوە کە زرێ جەستەی مرۆڤ دەپارێزێ لەزەبری شمشێرو شتی وا.

**نَقَرَ عَنْ الأمر نَقْراً:** لەشتەکەی کۆڵیەوە.

**نَقَرَ في الحجر:** لەسەر بەردەکەی نووسی.

**نَقَرَ في صلاته:** پەلەی کرد لەئەنجامدانی نوێژەکەی داو خێرا خێراو سەرسەرەکی نوێژی کرد ٥ لەحەدیس دا هاتووە: کە پێغەمبەر (د.خ) (نهى عَنْ نقرة الغراب) نەی کردووە لە ئەنجامدانی نوێژ بەشێوەی پەلەپەل‌و چونەڕوکوع‌و سجود وەك دەندوك لەزەوی دانی قەلەڕەشە.

**نَقَرَ بلسانه:** بەزوبان قیکەی لێ دا.

**نَقَرَ بالدابة:** دەنگی لە ولاخەکە کرد بۆئەوەی خێرا بڕوا ٥ دەشگوترێ: (نَقَرَ بفلان) لەناو خەڵکەکەدا تەنیا بانگی فلانکەسی کرد.

**نَقَرَ في الصور:** فوی بەکەڕەنا دا کرد.

**نَقَرَ الشَّيْءَ بالشيء:** شتەکەی بەشتەکە کێشا ٥ دەگوترێ: (نَقَرَ رأسَهُ بأصبعه) بەپەنجەی لەسەری خۆی دا ٥ (نَقَرَ الدفَّ) دەفەکەی ژەنی ٥ (نَقَرَ العودَ) عودەکەی لێ دا.

**نَقَرَ السَّهْمُ الهدفَ:** تیرەکە لەنیشانی دا.

**نَقَرَ الطائرُ الحَبَّ:** باڵندەکە دەنکە دانەوێڵەکانی چنینەوە.

**نَقَرَ شيئاً من الطعام:** بەپەنجە هەندێ لە خواردنەکەی هەڵگرت.

**نَقَرَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بەئامێری هەڵکۆڵین هەڵکۆڵی.

**نَقَرَ النَّقَارُ الخشبةَ:** نەقارەکە تەختەدارەکەی کونج کونج کرد.

**نَقَرَ الخَيْلُ الأرضَ:** ئەسپەکە بەسمەکانی زەوییەکەی قوڵکە قوڵکە کرد.

**نَقَرَ فلاناً:** ڕەخنەی لەفلان گرت.

**نَقِرَ فلاناً نَقَراً:** فلانکەس هەژار کەوت ٥ **نَقِرَت الشاةُ:** مەڕەکە تووشی نەخۆشی تەبەقەو سم داوەشان بوو.

**نَقِرَ عليه:** ڕقی لێ هەڵسا ٥ (فهو نَقِرٌ ونَقِرَةٌ) ٥ **أنْقَرَ عنه:** وازی لێ هێنا ٥ دەگوترێ: (ضَرَبَهُ فما أنقر عنه حتى قتله) لێی داو وازی لێ نەهێنا هەتا کوشتی ٥ **ناقَرَهُ مناقَرَةً ونقاراً:** کێشەی لەگەڵ دا نایەوەو بەرپەرچی قسەکەی دایەوە ٥ **نَقَّرَ الطائر في الموضع:** باڵندەکە زەوییەکەی تەخت‌و خۆش کرد بۆئەوەی هێلکەی تێدا بکا ٥ **نَقَّرَ بأسم فلان:** لەناو کۆمەڵ دا ناوی فلانی دیاری کرد ٥ **نَقَّرَ الشَّيْءَ وعنه:** لێی کۆڵیەوەو پشکنینی بۆ کرد ٥ **إنْتَقَرَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بەبێ نرخ‌و پوچ لەقەڵەم دا ٥ دەشگوترێ: (جرت السيولُ

فإنتقَرَتْ نُقَراً إحتبس فيها الماءُ) لافاو هەڵساو زەوی قوڵکە قوڵکە کردو ئاوتێیان داوەستا ◊ **إنْتَقَرَ الشَّيْئَ وعنه:** بەمانا (نَقَرَ) دێ ◊ **إنْتَقَرَ الشَّيْئَ:** شتەکەی هەڵبژارد ◊ **إنْتَقَرَ في الدعوة الى الوليمة:** بۆ داوەتەکە هەندێ خەڵکی بانگ کردو هەندێکی بانگ نەکردن ◊ **إنْتَقَرَ الرجلَ وبالرجل:** پیاوەکەی تایبەت کرد بە بانگ کردن هەربەتەنها بانگی ئەوی کرد لەناو کۆمەڵە پیاوەکەدا ◊ **تَنَقَّرَ الشَّيْئَ:** لەشتەکەی کۆڵیەوە ◊ **تَنَقَّرَ على الأهل والمال:** دوعای لەخزمو خێزانو ماڵو سامانی کرد ◊ **الأنقورَةُ:** چاڵاییو شیوەڵی سەرەدەنکە دانەوێڵە ◊ **المِنْقارُ:** دەندوکی باڵندە ◊ هەروا ناوە بۆ ئاسنێك وەکوو پاچ وایە کەوانەییە بەردی پێ دەبڕدرێنەوە ◊ ئامێرێکە داری پێ کونکون دەکرێ ◊ **المِنْقَرُ:** چەکوش ◊ **المُنْقُرُ:** دارێکە کون دەکرێو شەرابی تێدا دەکرێ بەسرکە ◊ بیری ئاوی بچوك ◊ یان بیری سەرتەسك کەلەزەوی توندو پتەودا لێ بدرێ ◊ **النَّاقِرُ:** تیر: کەنیشانە بهەنگێوێ ◊ **النَّاقِرَةُ:** بەڵگەی کاریگەر ◊ دەگوترێ: (أتتني عنه نواقِر) لەو کابرایەوە قسەیەکی ناشرینم پێ گەیی ◊ (أخطأت نواقِر فلان) بەڵگەو دەلیلی فلان جێی خۆیان نەگرت هەڵەیان کرد ◊ **النَّاقور:** کەڕەناو شاخێکە فوی پێدا دەکرێ وەکوو نیشانەو پێشەکی دونیا وێرانبون دەناسرێ ◊ **النُّقَارَةُ:** ماوەی ئەوەندەی باڵندە دەندوکی بەمارو کرمو شتی وادا دەدا ◊ ئەو وردە و پارچۆکانەی لەکاتی بەرد چاککردن دا لەبەردەکە دەبنەوە، یان ئەو پارچە دارانەی لەدار بڕینەوەدا هەڵدەوەرن ◊ دەگوترێ: (ماترك عندي نقارة إلا إنتقرها) هەرشتێکی بەکەڵك هاتو لام بوو بردیو هیچی نەهێشتەوە ◊ **النِّقارة:** پیشەی بەرد چاککردنو بەرد بیراز کردن ◊ **النُّقْرُ:** کوتانەوەو بیرازکردنی شت تادەگاتە ئەندازەی کونکردن ◊ چەقەنە لێدان، کەلەئاکامی پێکێشانی قامکە گەورە بە قامکی ناوەڕاست پەیدا دەبێ ◊ **النُّقْرُ:** بەمانا (الأنقور) دێ ◊ **النُّقُرُ:** سیفەتی موشەبەهەیە ◊ ئاو یان بیر ◊ **النَّقْرُ:** دەگوترێ: (أعوذ بالله من العَقْر والنَّقْر) پەنا دەگرم بەخودا لە ئیفلیجیو ماڵ فەوتانو هەژاریی ◊ **النَّقَرى:** عەیبو تانە ◊ داوای تایبەتی ◊ دەگوترێ: (إن المولِمَ منا لایدعوا النقرى) داوەتکەر لەئێمە داوەتی تایبەتی ناکا بەڵکوو بانگی هەموو کەس دەکا ◊ **النُّقْرَةُ:** شەڕە دەندوك، دەگوترێ: (بینهما نِقَرَةٌ) ◊ **النُّقْرَةُ:** چاڵی بچوكو کەوانەیی لەزەویو بەردو شاخو شتی تر کەئاوی بارانو لافاوی تێدا دەمێنێتەوە ◊ **نُقْرَةُ القفا:** قوڵکەیەکە لەکۆتایی دەماغ دا ◊ قوڵکەی چاو ◊ قوڵکەو لانەی هێلکە کردن ◊ پارچەی زێڕو زیو کە بتوێنرێتەوە ◊ **النُّقْرَةُ:** دەردێکە تووشی قاچی ئاژەڵ دەبێ ◊ **النَّقَّارُ:** کەسێك زۆر لێکۆڵینەوەو پشکنین ئەنجام بدا ◊ دەگوترێ: (رجل نَقَّارٌ) پیاوێکی لێکۆڵەرەوەو پشکێنەرە لە کاروبارو هەواڵگری دا ◊ کەسێك پیشەی ئەوە بێ نەقاری بەردبکا یان دار کونج کونج بکا.. **النَّقِيرُ:** ئەو بەردو دارەی کونج کونج دەکرێ ◊ قەدە دار کە گرن گرن دەکرێو وەکوو پلیکانە پێیدا سەردەکەون بۆ بەرزاییو سەربان ◊ قەدە دارێکە کاسەی لێ دروست دەکرێو سرکەی خورمای تێدا دروست دەکرێ ◊ چاڵاییو شیوەڵی سەر دانەوێڵە ◊ شتی پڕو پوچو کەم نرخ، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيراً﴾ ◊ هەژارو ئاتاج ◊ تۆێکڵی دانەوێڵە ◊ **النقية:** کەشتی بچوك ◊ **نَقْرَدَ في**

المكـان: زۆر لەشـوێنەکە مایـەوە ٥ المُنقَـرِدُ: دەگوترێ: (مالـكَ مُنقـرِداً) ئـەتۆ مانـەوەت نیـە، هۆکاری مانەوەت نیـە ٥ النِّقْرِسُ: نەخۆشییەکی بەئازارە بەزۆری لەجومگەی قاچو قامکی قاچ دا پەیدا دەبێ ٥ پێشی دەگوترێ: (داء الملوك) دەردە پاشا ٥ فـەوتانو تێداچـوون ٥ بـەڵای گـەورە ٥ النِّقْـرِیسُ: چاوساغو ڕێ نیـشاندەری شارەزاو زیـرەك ٥ پزیـشکی شارەزاو زیـرەك ٥ شـتێکە وەکـوو گـوڵ ئـافرەت لەسـەری خـۆی شەتەکی دەدا ٥ نَقْرَشَ الشَّیْءَ: شتەکەی ڕنی ٥ ڕازاندیەوە ٥ لەقاندی ٥ لێی کۆڵیەوە ٥ النَّقْرَشَةُ: هەستی کەم ٥ زەخرەفەکردنو جوانکردن.

**نَقَزَ** الظبيُ وغيرهُ في عَدْوِهِ: ئاسکەکە خۆی بەرز کردەوەو بازی دا ٥ أَنْقَزَ فلان: فلانکەس شتی خراپی هـەڵگرتو کـردی بـەماڵی خـۆی ٥ بەردەوام بوو لەسەر خواردنەوەی ئاوی صاف ٥ ئاژەڵەکانی نەخۆشییان تێکەوتو مرداربوونەوە ٥ أَنْقَزَ عَنْ الشَّیْءِ: وازی لە شتەکە هێنا، تـەرکی کرد ٥ أَنْقَزَ عَدُوَّهُ: دوژمنەکەی بەخێرایی کوشت ٥ نَقَّزَهُ: بازی پێ داو هەڵی پەڕاند، ڕەقصاندی ٥ دەگـوترێ: (نَقَّـزَتِ المـرأةُ صـبیَّها) ئافرەتەکـە منداڵەکـەی هەڵیپەڕانـد ٥ إِنْتَقَـزَتِ الماشـیةُ: ئاژەڵەکان نەخۆشییان تێکەوت ٥ إِنْتَقَزَ لفلان مالَهُ: ماڵی خراپو بێ کەڵکی بۆ هەڵبژاردو پێی دا ٥ المَنْقوزُ: توشبوو بە نەخۆشی (نوقاز) جۆرە دەردێکە توشی ئاژەڵ دەبێ ٥ النّاقِزُ: دەگوترێ: (عطاء ناقِز) بەخشیشی خراپو بێ نرخ ٥ (ذو ناقِز) خاوەنی ماڵی خراپ ٥ النّاقِزَةُ: یەکێك لەقاچەکانی ئاژەڵ ٥ النُّقازُ: دەردێکە توشی ئاژەڵ دەبێو مرداری دەکاتەوە ٥ النَّقَزُ: شتی خراپو بێ کەڵك، پیاوی خوێڕیو هەتیومچە ٥ دەگوترێ: (أعطاه من نقز المال) ماڵی خراپی پێدا ٥ ئازناو و لەقەب ٥ النُّقَزُ: ئاوی صافو بێگەرد.٥ النَّقَزُ: ئاوی صافو بێگەرد ٥ بیر ٥ النُّقْزُ: بیر ٥ النُّقازُ: چۆلەکە ٥ یان چۆلەکەی بچوك.

**نَقَسَ** الناقوسُ نَقْساً: زنگەکە لێی دا، دەنگی هات.

**نَقَسَ** فلان: فلانکەس زەنگی لێ دا.

**نَقَسَ** الشرابُ: شەرابەکە مزر بوو.

**نَقَسَ** بین القوم: فیتنەو ئاشوبی لەنێو خەڵکەکەدا نایەوە.

**نَقَسَ** فلاناً: ڕەخنەی لەفلانکەس گرتو تانەو تەشەری لێ دا ٥ تناقَسَهُ، ڕەخنەیان لەیەکتر گرت ٥ نَقَّسَ فلاناً: بۆ زێدەڕۆیی لەماناى (نَقَسَ) دێ ٥ نَقَّسَ القومَ بناقوسه: بەزەنگو شاورەکەی بانگی خەڵکی کرد ٥ نَقَّسَ الدَّواةَ: نوچەکەی خستە ناو شوشە مەرەکەبەکە بۆئەوەی پێی بنوسێ ٥ الناقوس: زەنگێکە بۆئەوە کاتی نوێژکردنیان هاتووە ٥ (ك: نواقیس) ٥ النَّقاسَةُ: عەیبو گاڵتە پێکردن ٥ النُّقْسُ: جۆرێکە لەزەنگو زەنگوڵە ٥ النِّقْسُ: مەرەکەب کە شتی پێ دەنووسرێ ٥ النَّقیسُ: دەگوترێ: (رجل نَقیسٌ) پیاوێکە ڕەخنە لەخەڵك دەگرێ.

**نَقَشَ** الشَّیْءَ نَقْشاً: لەشتەکەی کۆڵیەوەو بەدوایدا چوو دەری هێنا ٥ دەگوترێ: (نَقَشَ الشوكةَ بالمنقاش) چقڵەکەی بەموکێش دەرهێنا.

**نَقَشَ** الحق من فلان: مافەکەی لەفلان وەرگرتەوە.

**نَقَشَ** الشَّعْرَ: مووەکانی هەڵکەندن.

**نَقَشَ** مَرَبَضَ الغَنَمَ: کۆزو گەوەو ئاغەڵی مەڕو بزنەکانی ماڵی، خاوێن کردەوە.

**نَقَشَ** الشَّیْءَ: شتەکەی ڕەنگاوڕەنگ کردو ڕازاندیەوە.

**نَقَشَ الرَّحى**: بەرداشی ئاشەکەی بیراز کرد بۆئەوەی زبر بێ‌و باش دانەوێڵەکە بهاڕێ‌و وردی بکا.

**نَقَشَ العِذْقَ**: هێشوە خورماکەی چقڵ هاژن کرد بۆئەوەی زوو شیرین ببێ‌و بگا.

**نُقِشَ العِذْقُ**: هێشوە خورماکە خاڵ خاڵ بوو نیشانەی گەیشتویی لێ دیاریی دا ٥ **أنْقَشَ**: بەردەوام بوو لەسەر خواردنی خورمای وشکەڵێ تەڕکراو ٥ بەدواداچونی بۆ قەرز دارەکەی ئەنجام دا ٥ **ناقَشَه مناقَشَةً ونِقاشاً**: لەحیسابەکەی کۆڵیەوە ٥ دەگوترێ: (ناقَشَه في الحساب) لە حیسابەکەدا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرد ٥ **ناقَشَ المسألة**: مەسەلەکەی لەگەڵ دا باس کرد ٥ **نَقَّشَهُ**: بەچەن ڕەنگێک ڕەنگی کردو ڕازاندیەوە. ٥ **إنْتَقَشَ فلان في فَصِّه**: داوای لەنەخشکەرەکە کرد کەلەسەر نقێمی ئەنگوستیلەکەی نەخشی بۆ دروست بکا ٥ **إنْتَقَشَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دەرهێنا ٥ شتەکەی هەڵبژارد ٥ **إنْتَقَشَ منه جميع حقه**: هەموو مافی خۆی لێ ستاند ٥ **المِنْقاشُ**: ئامێری نەخشەکردن ٥ دەگوترێ: (إسْتخرجت منه حقي بالمناقيش) زۆر بە گرمگرو ناخۆشی مافی خۆم لێ ستاند ٥ **المنقوشة**: بڕین کە نێسقانە وردەی لێ دەربێندرێ ٥ **النِّقاشَةُ**: پیشەی نەخشەکاری ٥ **النَّقْشُ**: شوێنکەو شوێندەست ٥ دەگوترێ: (ذهب الرَّمادُ حتى مانرى له نَقْشاً) گڵو خۆڵەکە ڕۆیی‌و ئەما شوێنەواری نابینین ٥ خورمای وشکەوەبووی تەڕکراو ٥ **النَّقّاشُ**: کەسێک پیشەی نەخشکاری بێ ٥ **النَّقِيشُ**: هاوشان‌و هاو وێنە ٥ دەگوترێ: (هذا نقيش هذا) ئەوە هاوشانی ئەوە.

**نَقَصَ الشَّيْءُ نقصاً ونقصاناً**: شتەکە کەم بوو، بێ هێز بوو، لاوازو زەبون بوو ٥ دەگوترێ: (نَقَصَ عقله أو دينه) عەقڵی لاواز بوو، ئایینی کز بوو.

**نَقَصَ فلاناً حَقَّهُ**: مافی فلانی ژێر لێودا ٥ حەقی کەم کردەوە.

**نَقَصَ فلاناً نقيصة**: تانەو تەشەری لەفلان دا.

**نَقَصَ الشَّيْءُ فلاناً**: شتەکە پێویستی بەفلان بوو ٥ **أنْقَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کەم کردەوە ٥ **نَقَّصَ الشَّيْءَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَقَصَه) دێ ٥ **إنْتَقَصَ الشَّيْءُ**: بەمانا (نَقَص) دێ ٥ **إنْتَقَصَ الحَقَّ**: حەقی شاردەوە، مافی پێشێل کرد ٥ **إنْتَقَصَ الثَّمَنَ**: نرخەکەی دابەزاند ٥ **تناقص الشَّيْءَ**: شتەکە وردە وردە کەم بۆوە ٥ **تَنَقَّصَ الشَّيْءَ**: کەم کەم شتەکەی لێ وەرگرت ٥ **تَنَقَّصَ فلاناً**: عەیبی لەفلان گرت ٥ **إسْتَنْقَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەکەم لەقەڵەم دا ٥ کەم‌و کوڕی پاڵ دا ٥ **إسْتَنْقَصَ الثمنَ**: داوای کەمکردنەوەی نرخەکەی کرد ٥ **المَنْقَصَةُ**: کەم‌و کوڕی ٥ **النَّقْصُ**: لاوازو کز ٥ دەگوترێ: (أصابه نقص في عقله أو دينه) کزی‌و لاوازیی لەعەقڵی دا یان لەئایینی دا تووشی بوو ٥ لەبواری زانیاری (عروز)دا فرتاندنی پیتی حەوتەمی (مفاعلتن) لەبەحری (الوافر) دا، دەبێتە (مفاعَلْتُ) دوایی دەگۆڕێ بۆ سەرکێشی (مفاعيل)، تەنها لەحەشودا دەبێ ٥ **النُّقْصان**: ئەندازەی کەمی شتە کەمبووەکە.

**النَّقِيصَةُ**: کەم‌و کوڕی ٥ سەرزەنشتکردنی خەڵک، تانەو تەشەر لێدانیان ٥ ڕەوشتی ناشیرین‌و ناکارو ڕەفتاری بەد.

**نَقَضَ الشَّيْءَ نقضاً**: شتەکەی هەڵوەشاندەوە.

**نَقَضَ البناءَ**: خانوەکەی هەڵوەشاندەوە.

**نَقَضَ الحَبلَ أو الغَزلَ:** حەبلەکەی هەڵوەشاندەوە کردیەوە ٥ ڕیسەکەی کردەوە بەخوری.
**نَقَضَ اليَمينَ أو العَهدَ:** سوێندەکەی خۆی خست، پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە.
**نَقَضَ ما ابرمە فلان:** ئەوەی فلان بڕیاری دابوو بڕیبەوە ئەو پوچی کردەوە.
**نَقَضَ وِترَهُ:** تۆڵەی خۆی ساندەوە ٥ **نَقَضَت الكَمأةُ وجه الأرض:** قاچکەکە زەوی دڕی و هاتەدەر، سەری دەرهێنا ٥ **أنقَضَ النَّباتُ:** ڕوەکەکە سەری دەرهێنا، زەوی شەق کرد ٥ **أنقَضَتِ الأرضُ:** زەویەکە ڕوەکی دەرکەوت ٥ **أنقضت الإصبعُ:** پەنجەکان دەنگیان لێوە هات لەکاتی چەقەنە پێ لێدان دا ٥ دەگوترێ: (إنْقضت الدجاجة عند البيض) مریشکەکە لەکاتی هێلکە کردنی دا گارمگاری کرد ٥ **أنقض الكَمأةُ ونحوها:** قاچکەکەی لەزەوی دەرهێنا ٥ **أنقض العَنزَ:** بانگی بزنەکەی کرد.
**أنقض الشَّيءَ:** شتەکەی واڵێ کرد دەنگی لێوە بێ ٥ دەگوترێ: (أنْقَضَ أصابعه) بەپەنجەکانی چەقەنەی لێ دا ٥ **انقض الحِملُ الظَهر:** کۆڵەکە (بارەکە) پشتی چەماند، ماندوی کرد ٥ **ناقضَ الشاعرُ الشاعرَ:** شاعیرەکە ڕەدی چامەی شاعیرەکەی تری دایەوە مانای چامەی شاعیرەکەی پێچەوانە کردەوە ٥ نمونەی ئەم جۆرە لەشیعری عەرەبی زۆرە بۆ نموونە نەقائیزی فەرەزدەق و جەریر کە دوو شاعیری سەردەمی ئەمەوییەکانن، هەرچی فەرزەدەق مەدحی خۆی و بنەماڵەکەیانی کردووە جەریر هەڵی وەشاندۆتەوە لەئەدەبی کوردیدا ئەم جۆرە ئەدەبە کەمە یان نییە، جگە لەو دوو قەصیدەیەی نالی و حەریق (ئیللا کەچ)و (ئیللا کوڕ) کەرەنگە ئەمانیش بچنە ئەو بوارەوە ٥ **نَقَّضَ النَّباتُ:** بەمانا (أنقض) دێ ٥ **نَقَّضَ النبات الأرض:** ڕوەکەکە زەوی شەق کردو سەری دەرهێنا ٥ **إنتَقَضَ الشَّيءُ:** شتەکە دوای پتەوبوونی هەڵوەشایەوە ٥ **إنتَقَضَ القومُ على السلطان:** خەڵکەکە لەفەرمانی پاشا دەرچوون و فەرمانڕەواییەکەیان ڕەتکردەوە ٥ **تناقَضَ الشَّيءُ:** بەمانا (إنتَقَضَ) دێ ٥ **تناقَضَ القولان:** دوو قسەکە دژ بەیەک بوون، پێچەوانەی یەکتر بوون ٥ **تناقض الشاعران:** هەریەک لەدوو شاعیرەکە چامەیەکی گوت، چامەی شاعیرەکەی تری هەڵوەشاندەوە ٥ **تَنَقَّضَ الحَبلُ:** حەبلەکە گرێ و بادراوییەکەی شی کرایەوە ٥ **تَنَقَّضَتِ الأرض من النبات:** زەوی بەڕوەک قەڵشایەوە ٥ **تَنَقَّضَتِ الشَّيءُ:** شتەکە دەنگی لێ هات ٥ دەگوترێ: (تَنَقَّضَت عظامه) ئێسقانەکانی تەقە تەقیان هات ٥ **التَّناقُضُ:** دەگوترێ: (في كلامه تناقض) قسەکانی هەندێکیان هەندێکیان هەڵدەوەشێننەوە ٥ لەبواری زانیاری مەنتیق دا نیسبەت و پەیوەندی نێوان دوو شتە دژبەیەکەکەیە ٥ **المُتَناقِضان:** لەزاراوەی زانیاریی مەنتیق دا بەدوو شت دەگوترێ بەیەکەوە نەبن و کۆنەبنەوە، نەشگونجێ هیچیان نەبن ٥ وەکوو (سپی و ناسپی) ناگونجێ شتێک هەبێ (سپی و ناسپی)یش بێ ٥ هەروەکوو ناگونجێ شتێک هەبێ نەسپی بێ نە ناسپی بێ ٥ ناگونجێ شتێک هەبێ (ڕاست و ناڕاست) بێ یان نەڕاست بێ نە ناڕاست بێ ٥ **النُّقاضَةُ:** ئەوەی لەشتەکە هەڵوەشاوەتەوەو لێی جیابۆتەوە ٥ **النِّقاضَةُ:** پیشەی هەڵوەشاندنەوە و شی کردنەوەو لێک کردنەوەی شت ٥ **النَّقضُ:** (نقض الحكم) هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری دادگا ئەگەر

لەسەر بنەمای هەڵە دامەزرابوو، یان هەندێ لەبنەماکانی تێکەڵ بەهەڵە بوبوو، هەڵوەشاندنەوەی حوکم وادەبێ ڕودەکاتە حوکمی مەدەنی وادەبێ ڕودەکاتە حوکمی جینائی ٥ **مَحْكَمَةُ النَّقضِ**: دادگای باڵای وڵاتەو بڕیارەکانی جێبەجێ دەکرێن‌و ڕەت ناکرێنەوە ٥ **النِّقْضُ**: ئەو شتەی هەڵوەشاوە ٥ دەگوترێ: (أصْلِح نِقْضَ بنائِك) هەڵوەشاوەی بینایەکەت چاك بکەرەوە ٥ هەروا وشەی (النِّقض) ناوە بۆ وڵاغێك کە بەهۆی ڕۆیشتنی زۆرەوە گزو لاواز بووبێ ٥ هەنگوین کەمادەی سوسی تێکەڵ بکرێ‌و هەنگی پێ سواخ بدرێ بۆنەوەی هەنگەکان شانەی تێدا ڕابەستن‌و هەنگوینی تێبکەن ٥ **النُّقَضُ**: پەتك کەشی بکرێتەوەو دوایی برێسرێتەوە ٥ **النَّقيضُ**: پێچەوانەو دژ ٥ **نقيض الدعوى**: لەبواری فەلسەفەدا بریتیە لەوەی قەزییەیەك دژی داوایەکی دیاریی کراو و تایبەت بوەستێ ٥ هەروا وشەی (نقيض) ناوە بۆ دەنگ ٥ دەگوترێ: (نقيض الفراريج) دەنگ‌و جریوەی فەروجەکان ٥ (نقيض الأصابع) تەقەو خرمەو قرمەی پەنجە تەقاندن ٥ **النَّقيضان**: لەزاراوەی مەنتیق دا دووشتی دژ بەیەك‌و پێچەوانەی یەکتر ٥ **النَّقيضة**: لەبواری فەلسەفەدا دژ وەستان‌و پێچەوانەو نەگونجانی یاساکان لەکاتی جێبەجێ کردنیان دا ٥ فەیلەسوفی بەناوبانگ (کانت) دەڵێ: (النقيضة) بریتییە لە دژایەتی قانونە عەقڵیەکان بۆ یەکتری‌و پێکەوە نەگونجانیان ٥ هەروا ناوە بۆ ڕێگایەك کە بەناو کێودا بڕوا ٥ لەبواری شیعردا چامە شیعرێکە شاعیرەکە چامەی شاعیرێکی تری پێ هەڵوەشێنێتەوە وەکوو چامە دژ بەیەکەکانی فەرەزدەق‌و جەریر.

**نَقَطَ الحرف و عليه**: خاڵێك یان زیاتری لەسەر پیتەکە دانا بۆ ناسینەوەو لێك جیاکردنەوەی.

**نَقَطَ الكتابَ**: کتێبەکەی خاڵدار کردو بزوێنی خستنە سەر وشەکانی ٥ **نَقَّطَ الحروف**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نقط) دێ ٥ **نقط الشَّيْءَ بالمداد ونحوه**: مەرەکەب‌و شتی وای لەشتەکە هەڵسو ٥ دەگوترێ: (نَقَّطت المرأةُ خدها) ئافرەتەکە ڕوخساری خۆی خاڵخاڵ کردو خۆی ڕازاندەوە ٥ **نَقَّطَ فلاناً بكلام**: قسەی ناشیرینی بەفلانکەس گوت‌و ئەزیەتی دا ٥ **نَقَّطَ العروسَ ونحوها**: دیارییەکی دا بە بوکەکە لەکاتی گواستنەوەی دا ٥ **تَنَقَّطت الأرض**: زەوی پەڵەپەڵە لەوەڕی تێدابوو ٥ **تَنَقَّطَ الخبَرَ**: هەواڵەکەی وردە وردە وەرگرت ٥ **النُّقْطَةُ**: خاڵێکی کەوانەیی‌و زۆر بچوکە لەسەر ڕوبەرێکی تەخت ٥ لەبواری خەتی شێوە عەرەبی دا نیشانەیەکی خڕی بچوك دەخرێتە سەر پیتی خاڵدار یان ژێرەوەی بۆ جیاکردنەوەی لەپیتی تر ٥ دەشگوترێ: (وَضَعَ النُّقَطَ على الحروف) خاڵی خستە سەر پیتەکان واتە: شتەکەی ڕون کردەوە ٥ **النُّقطة من الشَّيْء**: پارچەیەکی بچوك لەشتەکە ٥ دەگوترێ: (أعطاه نقطة من عسل) پارچەیەکی بچوکی لەهەنگوین دایە ٥ (له نقطة من نخل) پارچەخورمایەکی هەیە ٥ هەروا (النُّقطة) ناوە بۆ ئەو دیارییەی پێشکەش دەکرێ بە بوك یان بەزاوا ٥ یان بەهەردووکیان ٥ کارو باس‌و ڕوداو ٥ دەگوترێ: (لم يختلف الخطيبان في نقطه) دوو خەتیبەکە (بوك‌و زاواکە) هیچ ڕا جیایی یەکیان لەناودا نەبوو ٥ لەبواری ئەندازیاریی دا بەشتێك دەگوترێ درێژی‌و پانی نەبێ ٥ **النُّقْطية**: بەمانا (البرقشية) دێ‌و ڕێبازو زاراوەیەکی فەننی ڕەسم گرتنەو تەعبیر

دانەومیە بەچەند خاڵێك كە دەخرێنە سەر ڕوبەری سپی.

**نَقَعَ فلان نقوعاً:** فلانكەس نەقیعەی دروست كرد؛ واتە: شیری خاڵصی سارد كرد.

**نَقَعَ السقفُ رعوه:** سەقفەكە ئاو دڵۆپ دڵۆپ لێی هاتە خوار ئاوی لێ چۆڕا.

**نَقَعَ المائع في مُستَقَرِّه:** ئاوەكە یان شلەمەنییەكە لەشوێنی خۆی ڕاوەستاو زۆر مایەوە.

**نَقَعَ الظمآن من الماء وبالماء:** تینوەكە بەئاو تینوایەتی خۆی شكاند دەگوترێ: (شَرِب حتی نَقَعَ) خواردیەوە تا تێراو بوو ٥ دەشگوترێ: (نَقَعَت بذلك نفسي) نەفسم پێی داسەكناو ئارامی هاتو بروی ناو بیرۆشی هات ٥ هەروا دەگوترێ: (ما نَقَعتُ بخبر فلان) بەهەواڵی فلانكەس دڵم ئاوی نەخواردەوە یان گرنگیم پێ نەدا یان پێم بروانەكرد.

**نَقَعَ الشَّيْءَ نقعاً:** شتەكەی لەناو ئاودا هێشتەوە تا ئاوی هەڵمژی ٥ دەگوترێ: (نَقَعَ الدواء) ئاوی كردە ناو دەرمانەكە (و نَقَعَ التمر) خورماكەی تەڕكرد ٥ (و نَقَعَ الثوبَ) كراسەكەی خستە ناو ئاوەوە تائاو هەڵمژێ.

**نَقَعَ له الشرَّ:** شەڕەكەی لەگەڵ دا درێژە پێدا.

**نَقَعَ الجیبَ:** یەخەی خۆی دادڕی.

**نَقَعَ الماءُ العطشَ:** ئاوەكە تینوایەتی تینوەكەی دامركاندەوە ٥ **أنقع الشَّيْءَ في الماء:** بەمانا (نَقَعَهُ) دێ ٥ **أنْقَعَ اللَّبَنَ:** شیرەكەی سارد كردەوە ٥ **أنْقَعَ السُّمَّ:** ژەهرەكەی كۆن كرد ٥ **أنْقَعَ الشَّرابُ فلاناً:** شەرابەكە فلانكەسی تێراو كرد ٥ **أنْقَعَ الجزورَ:** حوشترەكەی سەر بڕی ٥ **أنْقَعَ الصارخ صوتَهُ:** هاواركەرەكە دەنگی هەڵبڕی و بەردەوام بوو لەسەر هاواركردنەكەی ٥ **إنْتَقَعَ الشَّيْءُ:** شتەكە بەهۆی زۆر مانەوەی لەشوێنی خۆی توایەوە، خاوبۆوە لێك بڵاو بۆوە ٥ ڕزی گوڕا، گۆڕا ٥ **إسْتَنْقَعَ فلان في النهر:** فلانكەس لەڕووبارەكەدا مایەوە خۆی فێنك كردەوە ٥ **الأنقوعة:** شوێنێك ئاوی بۆبێ و تێیدا كۆببێتەوە ٥ **المُسْتَنْقَعُ:** زلكاو، گەڕاو، شوێنێك ئاوی تێدابێ و زۆر بمێنێتەوە ٥ جێگایەك زلكاو بێ و خۆی تێدا فێنك بكاتەوە ٥ **المَنْقَعُ:** بەمانا (المُستَنقَعُ) دێ ٥ دەریا، ئاودێری ٥ **المُنْقُعُ:** برمەیەكی بچوكە شیرو خورمای دەخرێتە ناو بۆ ئەوەی بكرێتە بژێو بۆ منداڵ ٥ **المِنْقَعَةُ:** قاپ و سوێنەو تەشت و شتی وا كە ئاوی تێدەكرێ و شتی تری تێدا تەڕدەكرێ ٥ **النّاقِعُ:** دەگوترێ: (ماء ناقع) ئاوێكی سازگارو خۆشە تینوایەتی دەشكێنێ ٥ (سم ناقع) ژەهرێكی كوشندەیە ٥ (دم ناقع) خوێنێكی گەش و تازەیە ٥ (موت ناقع) مردنی بەردەوام ٥ **النُّقاعُ:** قاپێكە مێوژو شتی وای تێدا دەكرێنە ناو ئاو بۆ خۆشاو و شتی وا ٥ ئاوێك مێوژو شتی وای تێ بكرێ ٥ **النَّقعاءُ:** زەوی ساخ و گڵەنەرمەو دەشت و بانوی تەخت كە شیو و دۆڵی تێدا نەبێ ٥ دەشتاییەك ئاو لەخۆ بگرێ ٥ **النَّقْعُ:** ئاوی كۆبۆوە لەچاڵ و زلكاو دا ٥ (نَقْعُ البئر): ئاوی كۆبۆوە لەبیرەكەدا پێش ئەوەی ئاوی لێ هەڵێنجی و ئاوی لێ بخورێتەوە ٥ یان ئاوی زیادە كە تێیدا دەمێنێتەوە ٥ هەروا بەمانا (النّقعاء) دێ ٥ دەشگوترێ: (فلان شرابٌ بأنقع) فلانكەس خاوەن ئەزموونەو شارەزایی كارو لێزانە لەبەڕێوەبردنی كارەكان دا ٥ **النَّقّاعُ:** كەسێك خۆی هەڵكێشێ و لافی زۆر شت لێ بداو هیچیانی نەبێ، وەكوو ئەوەی كەسێك زۆر باسی ئازایەتی خۆی بكاو لەواقیعدا ترسنۆك

بێ ٥ **النَّقوع**: ڕەنگێکە بۆنێکی خۆشی تێکەڵ دەکرێ ٥ دەگوترێ: (صَبَغَ ثوبَهُ بنقوع) قوماشەکەی بەڕەنگی بۆنخۆشکراو ڕەنگ کرد ٥ مێوژ کەدەکرێتە ناو ئاو بۆئەوەی بکرێتە خۆشاو ٥ یان شتی وەکوو نۆك و کەشك و خورماو شتی وا کەدەکرێتە ئاوەوە بۆئەوەی کەڵکی خواردنیان ببێ ٥ دەشگوترێ: (رجل نقوع أذن) فلانکەس بەهەموو شتێك بڕوا دەکا، گوێ لەمستە ٥ **النَّقيعُ**: شیری ساغ کەسارد بکرێتەوە ٥ خۆشاو؛ شەربەتێکە لە مێوژ دروست دەکرێ بەم جۆرە دەکرێتە ناو ئاوەوە پاشماوەیەك ئاوەکە شیرین دەبێ و دەخورێتەوە ٥ بیرێك ئاوی زۆر بێ ٥ **النَّقيعة**: شیری ساغ کەسارد بکرێتەوە ٥ ئەو ئاژەڵەی بۆ میوان سەردەبڕدرێ ٥ خواردنێك دروست بکرێ بۆ کەسێك کەلەسەفەر دەگەڕێتەوە ٥ خواردنی پیاو لەشەوی زاوایەتی دا ٥ ئەو ئاژەڵەی تالان دەکرێ و پێش دابەشکردن سەر ببڕدرێ ٥ هەر لەم ڕوانگەوەیە کە دەگوترێ: (الناس نقائع الموت) خەڵك کوشتی مردنن ٥ مردن سەریان دەبڕێ وەکوو چۆن قەساب ئاژەڵی تالانی سەردەبڕێ.

**نَقَفَ** رأسَهُ نَقْفاً: لەسەری دا تا مێشکی پڕژاندو مێشکی هاتەدەر.

**نَقَفَ** الرُّمانةَ: هەنارەکەی قاش کرد بۆئەوەی دەنکەکانی دەربێنێ.

**نَقَفَ** الفَرْخُ البَيْضةَ: جوجکەکە هێلکەکەی شکاند بۆئەوەی لێی بێتەدەر.

**نَقَفَ** البيضة: ناوی هێلکەکەی دەرهێنا.

**نَقَفَ** الشراب: شەرابەکەی ساف و بێ غەش کرد، پالاوتی.

**نَقَفَ عَنْ الشَّيْئ**: لەشتەکەی کۆڵیەوە ٥ **أنْقَفَ الجرادُ**: کوللەکە گەرای دانا ٥ **أنْقَفَ الجراد الواديَ**: کوللەکە گەرای لە شیو و دۆڵەکان دا دانا ٥ **أنْقَفَ فلاناً العَظْمَ**: ئێسقانەکەی دا بەفلانکەس بۆئەوەی مۆخەکەی دەربێنێ ٥ **ناقَفَهُ مناقفة ونقافاً**: بەشمشێر لەسەری دا ٥ **إنْتَقَفَ الشَّيْئَ**: شتەکەی دەرهێنا ٥ **الأنْقُوفَةُ**: ئەوەی لەتوانای تەشی بەدەرەو هیچی تری لەسەر هەڵناکرێ و تەشی ڕێسەکە گلۆلەکەی دا مالی ٥ **المِنْقاف**: دەندوکی باڵندە ٥ جۆرە مێروێکی سپییە ٥ **المَنْقَفُ**: شوێنێك پێویستی بەڕاستکردنەوەو تەخت کردن بێ ٥ دەگوترێ: (نحت النجار العودَ وترك فيه منقفاً) دارتاشەکە دارەکەی تاشی و شوێنێکی جێ هێشتووە پێویستی بەڕاستکردنەوە هەیە، باش لوس و ڕاستی نەکردووە ٥ **المُنْقَفُ**: دەگوترێ: (رجل مُنْقَفُ العظام) پیاوێکە ئێسقانی بەدەرەوەن ٥ **المَنْقوفُ**: دەگوترێ: (جذع منقوف) لقەدارێکە مۆرانەی لێ دراوە ٥ خەمخۆرکە خواردوویەتی ٥ (رجل منقوف) پیاوێکی کزو داڵگۆشتە ٥ یان دەم و چاو کرۆسك و ڕەنگ زەردو زەعیفە ٥ دەشگوترێ: (عينان منقوفتان) دووچاون سور هەڵگەڕاون ٥ **النِّقاف**: جونیەك و هاوشان ٥ دەگوترێ: (جاءا في نقاف واحد) بەیەك شێوە هاتن ٥ **النُّقْفُ**: جوجك لەوکاتەدا لەهێلکە سەردەردێنێ و دێتەدەر ٥ **النَّقَفَةُ**: دەشتاییەکە، نەرمەڵانێکە لەسەر تۆپەڵاکی کێو ٥ **النقاف**: پەیکەرتاش ٥ دزێك چی دەست بکەوێ دەری بێنێ ٥ کەسێك سوربێ لەسەر سواڵکردن و بەهیچ شێوەیەك تەرکی نەکا ٥ دەشگوترێ: (رجل نقاف) پیاوێکی زیرەك و عاقڵە باش دەزانێ کارەکان ڕێك بخا ٥ **النَّقيف**: بەمانا (المنقوف) دێ ٥

دەگـوترێ: (جـذع نقيـف) پەلەدارێکـە مۆرانـە خواردويەتی ٥ نَقَّتِ الدجاجة نقيقاً: مریشکەکە گارمگاری کرد ٥ نَقَّتَ ضفادع بطنه: بۆقەکانی ورگی کەوتنە باقەباق واتە: برسی بوو ٥ أَنَقَّ: بووبە خاوەن باقەباقو واقەواق ٥ دەستی کرد بە بۆقە بۆقو قرمقرِ ٥ النَّقَّاقُ: بۆ زێدەرۆیی لەمانای (نَق) دا دێ ٥ بۆق ٥ النَّقوقُ: هاوارکەر ٥ دەگوترێ: (ضفدع نقوق) بۆقێکی قرمقرکەرەو هەمیشە دەنگی دێ ٥ النَّقِيقُ: دەنگی بۆق.

**نَقَلَ الشَّيْءَ نقلاً:** شتەکەی لەشوێنێکەوە گواستەوە بۆ شوێنێکی تر.

**نَقَلَ** الكتابَ: کتێبەکەی نووسیەوە.

**نَقَـلَ** الخبرَ أو الكـلامَ: هەواڵەکـە یـان قـسەکەی لەخاوەنیەوە گەیاند ٥ **نَقَلَ الدوابُ:** نـاوی بنکی بیرەکەی دابە ولاخەکان.

**نَقَلَ** الكتابَ الى لغة كـذا: کتێبەکەی وەرگێڕا بۆ سەر زوبانی فلان.

**نَقَلَ** الشَّيْءَ الخلقَ: شتە ڕزیوەکەی چاك کـردەوە و پینەی کرد، دەگوترێ: (نَقَلَ الثوبَ و نَقَلَ النَعْلَ) کراسـەکە یـان نەعلەکـەی پینـە کـردو چـاکی کردەوە.

**نَقِـــلَ** المكـــانُ: شـوێنەکە بـەردو داری خـانوە ڕوخاوەکەی زۆر لێ مابوو.

**نَقِلَ** البعيرُ: حوشترەکە توشی تەبەقەو سم قلیشان بوو ٥ **أَنْقَلَ الشَّيْءَ الخَلَقَ:** شتە ڕزیـو و دڕاوەکەی پینـە کـردو چـاکی کـردەوە ٥ **ناقَـلَ الفـرسُ:** ئەسـپەکە لەڕۆیـشتن دا قاچـی پاشـەوەی لەشـوێنی قاچـی پێشەوەی دانـان ٥ ئەسـپەکە لـەبازدانو ڕاکـردن دا کۆسـپو لەمپـەرەکانی بەزاندنو لێیان تێپەڕی.

**ناقَلَ ندمه القدَح:** پیاڵە شەرابەکەی دایە دەستی هاوەڵەکەی لێی وەرگرتەوە ٥ **ناقَلَ فلاناً الحديث:** هەریـەك لـەو دوانـە حەدیـسی لـەوی تریـان گێڕایەوە ٥ هەریەکەیان چی لاهەبوو بۆئـەوی تری گێڕایەوە ٥ **نَقَّلَهُ:** بۆ موبالەغەو زێدەڕۆیی لـەمانای (نَقَلَـه) دێ ٥ **إنْتَقَـلَ:** لەشـوێنێکەوە گواستیەوە بۆ شوێنێکی تر ٥ **تناقل القومُ الحديث بَيْنَهم:** هەنـدێکیان لەهەنـدێکیان حەدیـسیان گێڕایـەوە ٥ **تَنَقَّـلَ مـن مكـان الى آخـر:** لەشـوێنێکەوە گواستیەوە بـۆ شـوێنێکی تـر ٥ **تَنَقَّـلَ فـلان:** فلانکـەس میـوەو چەرەسـاتو فستەقو گوێزو شتی وای خوارد ٥ **المَنْقَلُ:** خوف ٥ نەعلی ڕزیو و کۆن ٥ ڕێبازی کورت ٥ **المِنقَل:** خـوف ٥ دەشـگوترێ: (فـرس مِنقَـلٌ) ئەسـپێکە خێرا خێـرا قاچی هەڵدێنێ ٥ **المَنْقَلَةُ:** قۆنـاغی سـەفەر ٥ دەشـگوترێ: (أرض مَنْقَلَـةٌ) زەوییـەکی بـەردەڵانو بەرداوییـە ٥ **المِنْقَلَـةُ:** ئـامێری گواستنەوە، لەبواری ئەندازیاریی دا بریتییە لە ئامێرێـك بـۆ ئەنـدازەی سوچو زاویـە ٥ **المُنَقَّلَةُ:** برینێك وردە ئێسقانی لێ بێنـەدەر ٥ تەختـەی دامەو سێ ڕسکێنو شەترەنج کەیارییان لەسـەر دەکـرێ ٥ **المنقـول:** ئـەوەی لەرێگـەی گێڕانـەوەو بیستن زانـدرابێ ٥ وەکوو عیلمی لوغـەو عیلمی حەدیسو شتی وا کە بەرامبەر عیلمی مەعقول دێ ٥ **النَّاقِلَـةُ مـن النـاس:** کەسـانی کـەرۆك ٥ هۆزێـك بـچێتە پـاڵ هـۆزێکی تـرو نـاوی ئـەو لەخۆی بنێو ناوی هۆزی خۆیان واز لێ بێنن ٥ یـەکێك لەبـەلاو کارەسـاتەکانی ڕۆژگـار ٥ مـاڵی خەراج لەوڵاتێکەوە نەقڵ بکرێ بۆ وڵاتێکی تـر ٥ **النَّقـالُ:** سـەرەتیری پـانو کـورت ٥ تاکەکـەی (نَقَلَةٌ) ٥ **النَّقالَةُ:** جۆرە قەرەوێڵەو تەختەیەکە نەخۆشو برینداری پێ دەگوێزرێنەوە ٥ **النَّقْلُ:**

ڕێگای کورت ٥ نهعل یان خوف ٥ (همزة النقل) لهزاراوهى زانستى نهحودا ئهوميه ماناى فيعلى لازم دهگۆڕى بۆ فيعلى موتهعهدى ٥ يان نهقڵى ماناى فيعلى موتهعهدى بۆ مهفعولێك بۆ دوو مهفعول ٥ يان فيعلى موتهعهدى بۆ دوو مهفعول بۆ سێ مهفعول.٥ **النُّقْلُ**: ئهو ميوهو چهرهساتو فستهقو گوێزو شتهيه كه مرۆڤ خۆى پێوه دهخافڵێنێو ورده ورده لێيان دهخوا ٥ بهزۆرى ئهم جۆره (شهوچهره خواردنه) لهشهوانى مانگى ڕهمهزان دا دهبێ ٥ **النَّقَلُ**: ئهو دارو پهردوميه؛ كه دواى ڕوخانى باڵهخانهو خانو دهمێنێتهوه ٥ پهڕهتير: كه لهتيرێكهوه دهگوێزرێتهوه بۆ تيرێكى تر ٥ كێشهو دهمهدهمێى نێوان كێشهكاران‌و دهنگ بهرزبوونهوهيان ٥ دهردێكه توشى سمى حوشتر دهبێ سمى دهقهڵشێن بهكوردى خۆمان پێى دهڵێن: (تهبهقه) ٥ **النَقِلُ**: دهگوترێ: (مكان نَقِلٌ) شوێنێكى چاڵو چوێڵو بهرزو نزمه ٥ (رجل نَقِلٌ) پياوێكى حازر وهڵامهو بۆ قسه داناممێنێ ٥ **النُّقْلَةُ**، دهگوترێ: (إمرأة نِقْلَةٌ) ئافرهتێكه لهبهر پيرى كهس ناچێته داخوازيى، پاشگوێ خراوه ٥ **النُّقْلَةُ**: فيتنه جوێىو ئاشوبگێڕ ٥ **النُّقَلَةُ**: دهگوترێ: (سمعت نُقَلَةَ الوادي) دهنگى لافاوى شيوهكهم گوێ لێ بوو ٥ **النَّقِيلُ**: ئهو بهرده وردهو زيخو شتهيه سمى ولاخ لهكاتى ڕۆيشتنى دا دهيگوێزێتهوه ٥ لافاوێك لهزهوييهك بارانى لێ باريبێ بێته خوار بۆ زهوييهك بارانى لێ نهباريبێ ٥ پياو يان ئافرهت كه كهوتبنه دووره وڵات ٥ دهگوترێ: (إمرأة نَقيلة) ئافرهتێكى دووره وڵاتو غهريبه ٥ ههر پيرۆيهك خێرا خێرا ههنگاو ههڵێنێ ٥ **النَّقِيلَةُ**: پينهيهك دراو و ڕزيوى پێ چاك بكرێتهوه ٥ وهكوو نهعلو خوفو شتى وا ٥ پارچهيهكه لهپێستى ئادهميزاد لهشوێنێك دهبڕدرێو لهشوێنێكى ترى دا دهڕوێندرێتهوه بهزۆرى لهبوارى تهجميل دا پهيڕهو دهكرێ.

**نَقَمَ منه نَقْماً ونقوماً**: سزاى دا ٥ تۆڵهى لێ سهندهوه.

**نَقَمَ الشَّيْءَ**: ڕهخنهى لێ گرتو عهيبى پاڵدا ٥ دهگوترێ: (نقمت عليه الأمرَ ونقمتُ منه كذا).

**نَقِمَ الشَّيْءَ نقماً**: خێرا شتهكهى خوارد ٥ **نَقِمَ الشَّيْءَ**: زێدهڕۆيى كرد لهعهيب لێ گرتنى لهشتهكه ٥ **إنْتَقَمَ منه**: تۆڵهى لێ سهندهوه ٥ **النَّقَمُ**: دهگوترێ: (ضربةُ ضربةَ نَقَمٍ) لێدانێكى دوژمنانهى لێ دا هيچ بهزهيى پێدا نههاتهوه ٥ ههروا وشهى (النَقم) ناوه بۆ ناوهڕاستى ڕێگا ٥ **النَّقِمَةُ**: سزاو تۆڵه ٥ (ك: نِقَمٌ) ٥ **نَقْنَقَ الضّفدع ونحوه**: بۆقهكه قراندى ٥ **نَقْنَقَت عَيْنُهُ**: چاوى بهقوڵدا چوون.

**النَّقْنِقُ**: نێره نوعامه، شوتورموغى نێر ٥ **النَّقْنِيقُ**: دارى لهسێداره دان ئهو دارهى كه تاوانبارهكه دهخرێته سهرىو پاش ئهوهى پهتى سێدارهكه دهخرێته ملى دارهكه لادهبرێو قاچى تاوانبارهكه دهكهونه بۆشى.

**نَقِهَ من مرضه**: لهنهخۆشييهكهى چاك بۆوه بهلام هێشتا ئاسهوارى نهخۆشييهكهى پێوهماوه.

**نَقِهَ الكلامَ والحديث**: لهقسهو حهديسهكه حاڵى بوو ٥ **أنْقَهَهُ الله**: خودا شيفاى دا ٥ خودا شارهزاى كرد ٥ حاڵى كرد ٥ **إنْتَقَهَ من المرض**: بهمانا (نَقِهَ) دێ ٥ **إنْتَقَهْتُ من الحديث**: له حهديسهكه حاڵى بووم ٥ **إسْتَنْقَه**: ههوڵى تێگهيشتنى دا.

**نَقَا المُخّ نَقْواً**: مۆخهكهى دهرهێنا.

**نَقَا العَظْمَ**: مۆخى ئێسقانى دهرهێنا.

**نَقَا** الشَّيْئُ نقاوةً ونِقاءً: پاكبۆوه.

**نَقِيَ** الرجلُ نِقيً: پياوەكە گۆشتى پێوە نەما ٥ **أنقى العَظْمُ**: ئێسقانەكە مۆخى تێدا پەيدا بوو ٥ **أنقى البُرُّ**: دانەوێڵەكە قەڵەو بوو ئاردى تێكەوت ٥ **أنقى العودُ**: لقەدارەكە ئاوى تێكەڕاو تەڕبوو ژيايەوە ٥ **أنقى الشَّيْئُ**: شتەكە گەيشتە ئەندازەى پاكى‌و پيسى پێوە نەما.

**أنقى الشَّيْئَ**: شتەكەى پاك كردەوە ٥ شتەكەى هەڵبژارد ٥ **نَقَّاهُ**: بەمانا (أنقاه) دێ ٥ **إنتقى المُخَّ من العظم**: مۆخەكەى لەئێسقانەكە كردەوە ٥ **إنتقى الشَّيْئَ**: شتەكەى هەڵبژارد ٥ **الأنقى**: دەگوترێ: (رجل أنقى) پياوێكە ئێسقانى لولاك‌و دەست‌و بازوى باريكن ٥ (إمرأة نقواء) ٥ **المُنَقِّي**: ئەو كەسەى دانەوێڵە پاك دەكاتەوەو توێكڵ‌و پڵ‌و پوشى لێ دوور دەخاتەوە ٥ **المُنَقِّيَةُ من النوق**: حوشترێك بەزى زۆر بێ ٥ **النَّقا**: ئێسقانێك مۆخى هەبێ ٥ ئێسقانى قوڵ ٥ كۆمەڵە لب ٥ **النَّقاوة**: ڕوەكێكە لەترشەكان پۆشاكى پێ دەشۆردرێ ٥ **النَّقاوةُ من الشَّيْئَ**: هەڵبژاردەو پاڵفتەى شت ٥ **النُّقاية من الشَّيْئ**: خراپ‌و بێ كەڵك لەشت ٥ **النِّقْو**: هەر ئێسقانێك مۆخى هەبێ ٥ ئێسقانى قوڵ ٥ **النَّقْوَةُ من الشَّيْئ**: هەڵبژاردەو باشى شت ٥ **النَّقِيُ**: مۆخى ئێسقان ٥ **النَّقِية**: وشە ٥ دەگوترێ: (ما تَفَوَّه بنقية) وشەيەكى لەدەم دەرنەهات ٥ **النَّقِيُّ**: خاڵص‌و پاڵفتە ٥ حۆرى‌و كچۆڵەى گەردن باريك.

**نَكَا** القُرْحَة نَكْناً: دومەڵەكەى قەڵاشتەوە پێش ئەوەى بگا بۆيە خوێنى لێ هات‌و تەڕبوو.

**نَكَا** فلاناً حَقَّهُ: هەموو مافى فلانكەسى دا ٥ **إنتكا الحقَ**: مافى وەرگرت ٥ **نَكَبَتِ الريحُ نُكوباً**: بايەكە لەڕێڕەوى ئاسايى خۆى لاى دا.

**نَكَبَ** عنه نكباً: ڕوى لێ وەرگێڕاو لێى گۆشەگير بوو.

**نَكَبَ** به: فڕێى دا ٥ **نَكَبَ الإناءَ**: ئەوى لەقاپەكەدا بوو ڕشتى ٥ قاپەكەى نقوم كردەوە ئەوەى تێيدا بوو ڕژا.

**نَكَبَ الجَعْبَةَ**: تيردانەكەى سەرەو ژێر كردەوەو چى تێدا بوو بڵاوى كردەوە ٥ **نَكَبت الحجارةُ رِجْلَهُ**: بەردەكە قاچى برينداركرد.

**نَكَبَ** الدهر فلاناً: ڕۆژگار كارەساتى بەمل فلان دا هێنا.

**نَكُبَ** نكابةً: بوو بەجەمسەرو پشتيوان بۆگەل‌و هۆزەكەى.

**نَكِبَ** البَعيرُ ونحوه نكباً: لەڕۆيشتن دا بەسروشت‌و زكماك لاربوو، خوارو خێچ ڕۆيى ٥ شانى توشى نەخۆشى بوو ٥ **نَكَّبَ** عنه: لێى لاداو لێى دووركەوتەوە ٥ **نَكَّبَ الشَّيْئَ**: شتەكەى دوورخستەوە ٥ **نَكَّبَهُ الطريقُ**: ڕێگاى پێ دوورخستەوە ٥ **إنتَكَبَ الشَّيْئَ**: شتەكەى خستە سەر شانى.٥ **تَنَكَّبَ**: لەسەر لا ڕۆيشت، شانەو شان ڕۆيشت ٥ **تَنَكَّبَ على الشَّيْئ**: شانى لەسەر شتەكە دادا ٥ **تَنَكَّبَ عنه**: لێى دووركەوتەوە ٥ **تَنَكَّبَ الطريقَ المعوجَّ**: خۆى لەڕێبازى خوارو خێچ پاراست ٥ **تَنَكَّبَ فلاناً**: ڕوى لەفلانكەس وەرگێڕا، پشتى تێكرد ٥ **تَنَكَّبْ عَنّي**: لێم دووركەوەرەوە ٥ **تَنَكَّبَ الشَّيْئَ**: شتەكەى خستە سەرشانى ٥ **تَنَكَّبَ قوسَهُ**: كەوانەكەى لەشان كرد ٥ **النَّكَبُ**: شانخوار ٥ كەسێك كەوانى پێ نەبێ ٥ **المَنْكِبُ**: ناوشان، شوێنى بەيەكگەيشتنى هەردوو

شان‌و مل‌و سەر ٥ دەگوترێ: (هزّ مَنكِبَهُ لكذا) شانی بۆ ئەو شتە هەڵتەکاند ٥ پێی خۆش بوو ٥ لاتەنیشت‌و لای شت ٥ تەپۆڵکە ٥ عەریف‌و ڕابەری نەتەوە ٥ دەگوترێ: (هو منكب العرفاء) ئەو سەرۆکی پیاوماقوڵەکانە ٥ النَّكباءُ: ڕەشەبایەکە لەڕێڕەوی خۆی لابداو بکەوێتە نێوان بای صەباو بای شەماڵ ٥ المناكِبُ: چوار پەڕن لەباڵی باڵندەدا ٥ دەگوترێ: (راش سَهْمَهُ بمناكب النسر) پەڕی بۆ تیرەکەی لەباڵی بازو هەڵۆ دروست کردن ٥ النَّكبُ: بەڵاو کارەسات ٥ النَّكَبُ: مەیلەو خواری لەشت دا ٥ دەردێکە توشی شانی حوشتر دەبێ‌و بەو هۆیەوە لار دەڕوا ٥ النَّكْبَةُ: بەڵاو موصیبەت ٥ النُّكَبَةُ: کۆمەڵە خواردەمەنی (کۆمەڵە گەنم‌و شتی وا) ٥ النَّكيبُ: توشبوو بەبلاو کارەسات ٥ دەوران دەوری سمی وڵاخ یان دەوران دەوری خوف ٥ اليَنكوبُ من الطريق: ڕێبازی قۆرت‌و پێچ.

**نَكَتَ** الأرضَ ونيها نَكْتاً: زەوییەکەی هاژنیەوە، پاچەکۆڵەی تێدا کرد بەدارو شتی وا زەوییەکەی هاژنی ٥ دەگوترێ: (أتيتُهُ وهو ينكت) هاتم بۆلای بیری دەکردەوەو چیلکەی بەدەستەوە بوو لەزەوییەکەیەوە دەژەنی ٥ هەروا دەگوترێ: (مر الفرسُ وهو ينكتُ) ئەسپەکە ڕۆیشت بەبازدان.

**نَكَتَ** الشَّيْءَ: شتەکەی فڕێدایە سەرزەوی ٥ ئەوی لەشتەکەدا بوو دەری هێنا، بڵاوی کردەوە ٥ نَكَتَ فلاناً: فلانکەسی بەسەرسەری دا فڕێ دا.

**نَكَتَ** كِنانَتَهُ: تیردانەکەی خاڵی کرد چی تیری تێدا بوو بڵاوی کردنەوە.

**نَكَتَ** العظمَ: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا.

**نَكَتَ** الرُّطَبَ: هێشوە خورماکە شیرینی تێکەوت ٥ قسەی خۆش‌و عەنتیکەی کردن ٥ إنتَكَتَ فلان: فلانکەس بەسەر سەردا کەوت، سەرەنگرێ بوو ٥ النَّكّاتُ: نوکتەچی، نوکتەباز ٥ تانەدەرو ڕەخنەگرو بریندارکەری ناموسی خەڵك ٥ کەسێك زۆر قسە لەسەر ناموس‌و ئابڕوی خەڵك بکاو بریندایان بکا ٥ النُّكْتَةُ: شوێنکەو قوڵکە کەلەناکامی کێڵانەوەی زەوی‌و هاژنینەوەی پەیدا دەبێ ٥ خاڵێك کەلەشوێنێك بەرەنگێکی جیا دەربکەوێ ٥ فیکرەیەك کەوردو سەرنجڕاکێش بێ‌و کاریگەر بێ لەسەر نەفس‌و دەروون ٥ مەسئەلەیەکی زانیاریی ورد کەدوای لێکۆڵینەوەو توێژینەوە بێتە کایەوە ٥ جۆرە چڵك‌و تەمێکە بەسەر ئاوێنەو شمشێرەوە دەبیندرێ ٥ جۆرە خاڵێکە لەقولینچکی چاودا ٥ النَّكيت: تانەلێدراو، بەخراپەباسکراو.

**نَكَثَ** الحَبْلَ ونحوه نكثاً: حەبلەکەی هەڵوەشاندەوە، کردیەوە بەپەتك ڕێس‌و موو و خوری.

**نَكَثَ** العَهْدَ أو اليمين أو البَيْعَةَ: وادەو بەڵێنەکەی بەجێ نەهێنا، سوێندەکەی لەخۆی خست، بەیعەتەکەی واز لێ هێنا، لێی پەشیمان بۆوە.

**نَكَثَ** السِواكَ: سەری سیواکەکەی پرژ پرژ کرد.

**نَكَثَ** الأثرَ: شوێنەکەی پڕکردەوە، سڕیەوە، کوێری کردەوە ٥ ناكَثَهُ العَهْدَ: پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە ٥ إنتَكَثَ الحَبْلُ ونحوه: حەبلەکە هەڵوەشایەوەو کرایەوە بۆوە بەریس‌و خوری ٥ إنتكث السواك: سەری سیواکەکە پرژپرژ بوو ٥ إنتَكَثَ ماكان بينهم: ئەو وادەو پەیمانەی نێوانیان هەڵوەشایەوە ٥ إنتكث البعير: حوشترەکە دوای قەڵەوی کز بۆوە ٥ تناكث القومُ عهودَهُم: خەڵکەکە پەیمانی ناو خۆیان

هەڵوەشاندەوە ◊ **النُكاثُ**: بلۆق و زیبکە کەلەدەمی حوشتردا پەیدا دەبن ◊ **النُکاث**: جۆرە نەخۆشییەکە ◊ **النُکاثَةُ**: ئەوەی لەشت هەڵدەوەرێ دەگوترێ: (نكاثة الحبل) پەتك و حەبل ◊ (نُكاثة السواك) پرزۆ پاڵی سیواك کەلەکاتی سیواك کردن دا دەکەوێتە ناودەمەوە ◊ **النِّکْثُ**: خێت و دەزوی ڕزیو ◊ پەتك و کوڵك و موی حەبلە ڕزیوو شتی وا کە سەرلەنوێ دەکرێنەوەو دەڕێسرێنەوەو دەکرێنەوە بەحەبل ◊ **النَّکَاثُ**: کەسێك ڕەشماڵە ڕزیو و ڕەشماڵ و شتی وا هەڵوەشێنێتەوەو سەرلەنوێ بیانڕێسێتەوە ◊ **النَّکیثُ**: پەتکە کراوەو هەڵوەشاوە ◊ **النَّکیثة**: کاری گەورە ◊ پلانی گەورە ◊ پلانی گەورەو قورس: کە خەڵکەکە بۆیان ئەنجام نەدرێ و تێیدا شکست بخۆن ◊ دەگوترێ: (وقعوا في نكيثة) کەوتنە ناو کارێکی قورسەوەو بۆیان ئەنجام نەدراو تێشکان ◊ دەشگوترێ: (قول لانكيثة فيه) قسەیەکە درۆی تێدا نیە ◊ سروشت و فیترەت ◊ دەگوترێ: (هو ذو نكيثة حسنة) خاوەنی سروشت و ڕەوشتی جوانە ◊ ئەوپەڕی هەوڵ و تێکۆشان ◊ دەگوترێ: (بذل فيه نكيثه) هەموو توانای خۆی خستە کار ◊ (وبلغ من دابته نكيثةً) ولاخەکەی تاوداو گەیاندییە ئەوپەڕی توانای لەغاردان ◊ **نَكَحَت المرأةُ**: ئافرەتەکە شوی کرد ◊ (فهي ناكح وناكحة).

**نَكَحَ** المرأةَ: ئافرەتەکەی مارەکرد.

**نَكَحَ** المرأةَ: لەگەڵ ئافرەتەکە جوت بوو ◊ دەست تێکەڵاوی لەگەڵدا کرد ◊ دەگوترێ: (نَكَحَ المطرُ الأرض) بارانەکە تێکەڵاوی گڵی زەوییەکە بوو.

**نَكَحَ** الدواءُ فلاناً: دەرمانەکە بەسەر فلانکەسدا زاڵ بوو گێژی کرد ◊ دەشگوترێ: (نَكَحَ النعاسُ عينيه) وەنەوز بەسەر چاوەکانی دا زاڵ بوو ◊ **أنكَحَ المرأةَ**: ئافرەتەکەی بەشوداو مارەی کرد ◊ **أنكحَ فلاناً المرأةَ**: ئافرەتەکەی لەفلانکەس مارەکرد ◊ **تناكَحَ القومُ**: خەڵکەکە ژن و ژنخوازییان لەناو خۆیان دا لەگەڵ یەکتر کرد ◊ **تناكحت الأشجار**: درەختەکان پاڵیان لەیەکتر دا ◊ **إسْتَنكَحَ المرأةَ**: داوای کرد ئافرەتەکە شوی پێ بکاو مارەی بکا ◊ **إستنكح في بني فلان**: ژنی لەخێڵی فلان هێنا ◊ **إسْتَنكَحَ النّعاسُ عَيْنَيه**: هەنوز بەسەر چاوی دا زاڵ بوو ◊ **النّاكِحُ**: ژن هێن، خاوەن ژن ◊ شوکردو، خاوەن مێرد ◊ دەشگوترێ: (هي ناكح في بني فلان) ئەو ئافرەتە شوی بەپیاوێکی خێڵی فلان کردووە ◊ **النِّكْحُ**: مێرد ◊ دەگوترێ، (هو نِكْحُها) ئەو مێردییەتی ◊ (وهي نِكْحَتُهُ) ئەو ئافرەتە ژنی ئەوە ◊ **النُكَحُ**: کەسێك ژن زۆر بێنێ، یان زۆر لەگەڵ ئافرەت جوتبێ ◊ **النُكَحَةُ**: بەمانا (النُكَحُ) دێ.

**نَكَدَ** حاجَةَ فلان نَكْداً: پێداویستی فلانکەسی مەنع کرد.

**نَكَدَ** العطاءَ: بەخششەکەی کەم کردەوە.

**نَكَدَ** الشَّيْءَ: شتەکەی فەوتاند ◊ تەواویان کرد ◊ دەگوترێ: (نكدوا ماء البئر) ئاوی بیرەکەیان تەواو کرد، هەموویان خواردەوە ◊ دەشگوترێ: (نَكَدَ الناسُ فلاناً) خەڵکەکە هەرچی لای فلانکەس بوو لێیان وەرگرت ◊ ئەوەندەیان داوا لێ کرد هیچیان پێ نەهێشت.

**نَكِدَ** نَكَداً ونكاداً: شوم بوو.

**نَكِدَ** الأمرُ: کارەکە قورس بوو.

**نَكِدَ عَيْشُهُ**: گوزەرانی زبرو توندو نارەحەت بوو.
**نَكِدَ الشَّيْئُ**: شتەکە کەم بوو ٥ دەشگوترێ: (نَكِدَ ماء البئر) ئاوی بیرەکە کەم بوو.
**نَكِدَ فلان**: فلاّنکەس بەخششی کەم بوو ٥ یان هەر هیچی نەبەخشیو دەست قوچاو بوو.
**نَكِدَ بحاجتنا**: ڕژدیو چروکی نواند دەربارەی پێداویستییەکانمان ٥ **أنكد فلان فيما طلب**: فلاّنکەس لەدابینکردنی پێداویستییەکانی دا سەرکەوتوو نەبوو، تێ شکا ٥ **أنكد فلاناً**: فلاّنکەسی بەکەم خێرو بێ کەڵك ناساند ٥ دەگوترێ: (سألَهُ فأنكَدَهُ) داوای لێ کرد ئەویش نائومێدی کرد ٥ **ناكَدَهُ**: تەنگی پێ هەڵچنیو بەسەری دا زاڵ بوو ٥ **نَكَّدَهُ**: ڕژدو چروك‌و بێ خێری کرد ٥ دەشگوترێ: (نَكَّدَ عطاءَهُ بالمَنِّ) بەخششەکەی بەمنەتکردن پوچ کردەوە ٥ **تناكَدَ القومُ**: خەڵکەکە لەناو خۆیان دا تەنگیان بەیەکتر هەڵچنی ٥ **تَنَكَّدَ الغرابُ**: قەلەڕەشەکە لەقڕاندنی هێندە قوڵبۆوە دەتگوت خەریکە برشێتەوە ٥ **تَنَكَّدَ عَيْشُهُ**: ژیان‌و گوزەرانی لێ تاڵ‌و لیڵ بوو ٥ **المُنْكِدُ**: دەگوترێ: (جاء فلان مُنْكِداً) فلاّنکەس هات‌و هاتنەکەی جێگای خۆشحاڵی نەبوو ٥ **المَنكودُ**: دەگوترێ: (عطاء منكود) بەخششی کەم ٥ (رجل منكود) پیاوێکە زۆری داوا لێ کراوەو سواڵکەری زۆر بەخەیان گرتووە ٥ (الحَظّ المنكود) شانس‌و بەختی ڕەش ٥ **النَّاكِدُ**: ئەو کەسەی منداڵی بۆ نەمێنن، منداڵی ببن‌و بمرن ٥ ئاژەڵی کەم شیر ٥ **النَّكَدُ**: هەرشتێك شەڕئاوەر بێ ٥ ببێتە هۆی شەڕو نەگبەتی بۆ خاوەنەکەی ٥ دەگوترێ: (رجل نَكَدٌ) پیاوێکی شوم‌و بەدبەختە ٥ (أرض نَكَدٌ) زەوییەکی بێ پیت‌و بەرەکەتە ٥ **النَّكِدُ**: بەخیل‌و چاوچنۆك ٥ بێ خێرو بێر.
**النُّكْدُ**: کەم بەخشش ٥ دەگوترێ: (ماء نُكْدٌ) ئاوی کەم.
**نَكِرَ فلان**: فلاّنکەس زیرەك بوو ڕای باشی دەربڕی ٥ (فهو وهي نِكرٌ).
**نَكِرَ على فلان**: کاری ترسناکی بەفلاّنکەس کرد ٥
**نَكِرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی نەزانی، نەیناسی ٥ **أنْكَرَ على فلان فعلَه**: ڕەخنەی لەکاری فلاّن گرت‌و نەی لێ کرد ٥ **ناكَرَهُ**: فێڵی لێ کرد ٥ شەڕی دژکردو جەنگی بەرپاکرد ٥ **نَكَّرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی گۆڕی بەجۆرێك کە نەناسرێتەوە ٥ **نَكَّرَ الإسمَ**: ئیسمەکەی بەنەکیرەیی هێنا ٥ **تناكَرَ فلان**: فلاّنکەس خۆی نەزان کرد ٥ **تناكَرَ القومُ**: خەڵکەکە دژایەتی یەکتریان کرد ٥ دڕدۆمی یەکتر بوون ٥ **تناكَرَ الأمرَ**: لافی نەزانی کارەکەی لێ دا بێ ئاگایی خۆی لەو بوارەدا دەربڕی ٥ **تَنَكَّرَ**: ماڵ‌و وەزعی گۆڕا ٥ پۆشاك‌و سەرو سیمای خۆی گۆڕی بەجۆرێك نەناسرێتەوە ٥ دەگوترێ: (تَنَكَّرَ لي فلان) فلاّنکەس پاش ئەوەی پیاوەتی لەگەڵ دەکردم دەستی کرد بەخراپە لەگەڵم ٥ یان بەشێوەیەکی ناشیرین بەرەو ڕوم بۆوە ٥ **إستَنْكَرَ الأمرَ**: کارەکەی بەقەبیح دانا ٥ **الإنكار**: خودانەناسی ٥ دورەپەرێزی لەڕەوشتی خۆنەویستیو خۆبەختکردن لەپێناو غەیردا ٥ ئەم وشەو زاراوەیە بەم مانایە تایبەتە بەصوّفیو دونیا نەویستەکان ٥ **الأنكر**: دەگوترێ: (صوته أنكر الأصوات) دەنگی ناخۆشترین دەنگە ٥ **المنكرُ**: هەرشتێك عەقڵی سەلیم بەناشیرین‌و ناشایستەی دابنێ ٥ یان شەریعەت بەحەرام یان مەکروهی حسێب بکا ٥

**المُنكَـرُ**: بـەلای نەحوییەکانــەوە پێـچەوانەی (المُعَرَّف) ◊ **المنكور**: نەناسراو ◊ **النُكْرُ**: لێزانیو شارەزایی ◊ (رجل نُكْرٌ) پیاوێکی زیرەك و لێزانە ◊ کـاری نـاخۆش، شـتی نـەخوازراو ◊ **النَكْـراء**: زیرەکـیو لێزانـی ◊ دەگـوترێ: (إمـرأة نكـراء) ئـافرەتێکی عـاقڵو زیـرەك و لێهـاتووە ◊ شـتی ناخۆشو نەویستراو، بەڵاو چورتم ◊ دەگوترێ: (أصـابتهم مـن الـدهر نكـراء) ◊ **النُكْـران**: ئینکەبـەری ◊ **النَكِـرَةُ**: ئینکاری کردنـی شـت ◊ بـەلای نەحوییەکانــەوە (النَكِــرَة) بریتییــە لەئیسمێك کەفەردێکە لەتاکەکانی لەرەگـەزێکی هـەبوو یـان مەزەنـدەکراو ◊ وەکـوو (رجـل) و (شمس) ◊ هـەروا وشـەی (النكـرَة) نـاوە بۆ ئـەو کێمو زوخـاوەی لـەکوانو بـرینو شـتی وا دێتـە دەر ◊ **النُكْـرَةُ**: ناوێکـە لـەناوەکانی ئینکـاری ◊ دەگوترێ: (كان لي أشَدّ نَكْرَة) ◊ **الـنَكيرُ**: ئینکار ◊ دەگوترێ: (شُتِمَ فما أبدى نكيراً) جوێنی پێدرا هیچ نارەزایی دەرنەبڕی.

**نَكَزَ** الدَابَّة نكزاً: بەنەقیزە لەولاخەکەیەوە ژەنـیو دەنەدەنـەی دا بۆئــەوەی خێـرا بـڕوا ◊ **نَكَـزَتِ** الدابة الشَيْئَ: ولاخەکە شتەکەی گەست ◊ **نَكِزَتِ** البئر نَكَزاً: بیرەکە ئاوی کەم بوو ◊ **أنْكَزَ البئـرَ**: بیرەکە ئاوی بڕا ◊ **نَكَزَ البئرَ**: بیرەکە ئـاوی کـەم بوو بڕا ◊ **المَنْكَزَةُ**: دەگوترێ: (فـلان بِمَنْكَـزَة مـن العيـش) فلانکـەس لـەگوزەرانێکی نـاخۆشو پـڕ تەنگژەدایــە ◊ **النُكْــزُ**: پیــاوی هەتیومــچەو خوێڕی، ئافرەتی پڕوپوچ ◊ باقی مانـدەی مۆخ لەناو ئێسقان دا.

**نَكَسَ** الشَيْئَ نَكْساً: شتەکەی سەرەو خـوار کـرد ◊ هەڵی گێڕایەوە ◊ پاشو پێشی کرد.

**نَكَسَ** رأسَهُ: سەری داخست لەشـەرمو ڕیسوایی دا ڕوی نەهات سەری بەرز بکاتەوە.

**نَكَسَ** الطعام وغيه داءَ المريض: خۆراکەکە جارێکی دی نەخۆشـییەکەی بـۆ نەخۆشـەکە گێڕایـەوەو سەرلەنوێ نەخۆشی خستەوە.

**نَكَسَهُ** في ذلـك الأمـر: فلانـی خـستەوە نـاو کارەکە دوای ئەوەی لێی چوبوە دەر.

**نُكِسَ** الولَدُ: منداڵەکە لەکاتی لەدایکبون دا قاچی پێش سەری هاتە دەر.

**نُكِــسَ** المـريض: نەخۆشــییەکە بـۆ نەخۆشــە چاکبوەکە گەڕایەوە.

**نُكِسَ** فلان: فلانکەس لاوازو بێ توانا بوو.

**نُكِــسَ** عَـنْ نظرائـه: لەهاوەڵـەکانی دواکـەوتو نەگەیـیشتە ئاسـتی ئـەوان ◊ دەگـوترێ: (نُكِـسَ الفــرسُ) ئەسـپەکە لــەغاردانو پێـشبڕکێ دا نەگەیشتە ئەسپەکانی تر ◊ دەشگوترێ: (نُكِـسَ علي رأسه) بەسـەر سـەری خۆی دا گەڕایـەوە ◊ **نَكَسَ الفَرَسُ**: بـەمانا (نُكِسَ)دێ ◊ **نَكَسَ الله فلاناً في العمر**: خودا تەمەنی فلانکەسی درێـژ کـردو گەیاندییـە تەمـەنێك هێـزو توانـای نـەمێنێو وەکوو منداڵی ساوا بێ وەجو زەعیف بێ ◊ **نَكَسَ الـشَيْئَ**: بـەمانا (نَكَـسَهُ) دێ ◊ **إنْـتَكَسَ الـشَيْئُ**: شـتەکە هەڵـەوگێڕ بـوو ◊ **إنْـتَكَسَ المـريضُ**: نەخۆشـییەکە بـۆ نەخۆشـەکە گەڕایـەوە دوای چاکبوونەوەی ◊ **تَنَكَّسَ الشَيْئُ**: بەمانا (إنْـتَكَسَ) دێ ◊ دەگـوترێ: (نَكَّسَهُ فَتَنَكَّسَ) ◊ **المُـنَكَّسُ مـن الخيـل**: ئەسـپێك لەڕۆیـشتن دا لەبـەر لاوازیـی نـەتوانی سـەروملی بـەرز بکاتـەوە ◊ ئەسـپێك لـەغاردان دا نـەتوانێ بەئەسـپەکانی هاوشـانی بگاتـەوە ◊ (ولـد منكـوس) منداڵێکـە لـەکاتی لەدایکبوون دا قاچی پـێش سـەری هاتۆتـەدەر ◊

دەشگوترێ: (ولادە منكوسة) ◊ هەروا دەگوترێ: (فلان يقرأ القرآن منكوساً) فلانكەس قورئان دەخوێنێتەوە لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتای ◊ النّاكِسُ: کەسێك لەبەر زەلیلی سەری دابخا ◊ پیرەمێردی بەساڵاچووی بۆڵکاو ◊ النُّكْسُ: نەخۆشی گەڕاوە بۆ نەخۆش دوای چابوونەوە ◊ النِّكْسُ: تیرێك سەرەکەی شکابێ‌و هەڵەوگێڕ کرابێ‌و خرابێتەوە ناوکەوان ◊ کورت ◊ لاواز ◊ خوێڕی‌و کەمتەرخەم‌و تەمبەڵ‌و خۆدزەوە لەیارمەتیدانی لێ قەوماوان.

**نَكَشَ الشَّيْءَ نَكْشاً**: هەرچی لەبیرەکەدا هەبوو دەری هێنا ◊ دەگوترێ: (هذه بئر لا تُنكَشُ) ئەمە بیرێکە ئاوی لێ دەرناهێندرێ.

**نَكَشَ الأمرَ**: لەکارەکەی کۆڵیەوەو بەدواداچونی بۆکرد.

**نَكَشَ العَمَلَ منه**: لە ئیشەکە بۆوە، تەواوی کرد ◊ **إنْتَكَشَ الشَّيْءَ**: بەمانا (نكشه) دێ ◊ **المِنكاشُ**: ئامێری شت دەردان، شت دەرهێنان ◊ مقاش‌و موکێش.◊ المِنْكَشُ، لێکۆڵەرەوەو پشکێنەر لەکاروبار ◊ **المَنكوشُ**: دەگوترێ: (سَفَطٌ منكوش) سندوق‌و یەغدانێکی شت لێ دەرهاتووە ◊ **النَّكّاشُ**: بەمانا (المِنكَشُ) دێ.

**نَكَصَ نَكْصاً ونكوصاً**: بەرەو دواوە گەڕایەوە.

**نَكَصَ عَنْ الأمر**: وازی لەکارەکە هێنا ◊ دەگوترێ: (نَكَصَ على عَقِبَيْه) لەو شتەی بەتەمابوو ئەنجامی بدا پەشیمان بۆوەو پاشەو باش لێی کشایەوە ◊ **المَنْكَصُ**: دوور خراوەو لاکەوتە ◊ شوێنی تێشکان‌و نوچدان ◊ **نَكِظَ الشَّيْءُ نَكَظاً**: شتەکە ناشیرین بوو ◊ **نَكِظَ فلان نَكَظاً**: فلانکەس کۆششی کرد هەوڵی دا ◊ پەلەی کرد ◊ دەگوترێ: (نَكِظَ فلان للخروج) فلانکەس پەلەی کرد لەچوونەدەر ◊ فلانکەس زۆری برسی بوو ◊ **أنْكَظَهُ عَنْ الأمر**: پەلەی لێ کرد یان لە کارەکە لای دا ◊ **نَكَّظَ**: بەمانا (أنْكَظَ) دێ ◊ **نَكَّظَ حاجةَ غيره**: جێبەجێ کردنی کاری کەسێکی تری گران کرد ◊ کۆسپی خستە بەردەم ئەنجامدانی ئیشی خەڵك ◊ **تَنَكَّظَ الأمْرُ**: کارەکە خواروخێچ بوو ◊ **تَنَكَّظَ فلان**: فلانکەس لەسەفەردا وەزع‌و حاڵی شپرێو بوو ◊ ڕژدو چرۆك بوو.◊ المَنْكَظَةُ، نارەحەتی‌و ماندووبوونی سەفەر، ناخۆشی‌و چورتم.

**نَكَعَ فلان عَنْ الأمر نَكْعاً**: فلانکەس لەکارەکە پەشیمان بۆوە لێی گەڕایەوە دواوە.

**نَكَعَ فلاناً بظهر قدمه**: شەقی لەفلانکەس هەڵدا.

**نَكَعَ الماشية**: ئاژەڵەکەی زۆر دۆشی زۆری داچۆڕاند.

**نَكَعَ فلاناً حَقَّهُ**: مافی فلانکەسی داگیر کرد.

**نَكَعَ عَنْ الشَّيْء**: لەکارەکەی لایدا ◊ پەلەی لێ کرد لەشتەکەدا.

**نَكِعَ نَكَعاً ونُكْعَةً**: سوربوو توێکڵی هەڵدا ◊ **أنْكَعَ فلان**: فلانکەس ماندووبووە ◊ **أنْكَعَ فلاناً عَنْ الأمر**: پەلەی لە فلان کرد لەکارەکەی دا ◊ **أنْكَعَ الأمر صاحِبَهُ**: کاتێ داوای کارەکەی لێ کرد ئیشەکە بەسەرچوو ◊ **نَكَّعَهُ**: ئیشەکەی بەپەلە لێ کردن لێ ناخۆش کرد ◊ **نَكَّعَهُ عَنْ حاجته**: لەئیشەکەی لایدا ◊ **المُنْكَعُ**: دەگوترێ: (أنفٌ مُنْكَعٌ) لوتێکی پانەوەبوی فشە ◊ **النَّكِعُ**: دەگوترێ: (أحمر نَكِعٌ) زۆر سور، سوری ئاڵ ◊ **النُّكَعُ**: پیاوێکی سوروڕەش سوروڕەشی جەستەی تێکەڵاوبێ.◊ النُّكَعَةُ: لای سەرەوەی بەری ڕوەکی (الطرثوث) ڕوەکێکە لەوڵاتی میصرو شام دەڕوێ وەڵێ بەزۆری بەخێمەی

قاجك دەگوترێ ٥ لایەکی لوت ٥ **النُّكَفَةُ**: سورەشلە ٥ گێلو ئەحمەق ٥ کەسێك تەمبەڵ بێو لەشوێنی خۆی نەجولێ ٥ **النَّكوعِ**: ئافرەتی کورتەبالا.

**نَكَفَ** عَنْ الشَّيْئِ نَكْفاً: بەمەنقەستو ڕکەبەری ملی نەدا.

**نَكَفَ** الدمعَ: بەپەنجە فرمێسکی لەڕومەتی خۆی سڕی.

**نَكَفَ** البئر: بیرەکەی دەردا ٥ دەشگوترێ: (جیش لاینکف) سوپایەکە ئەوەندە زۆرە لەئەژمار نایەو دوایی نایە ٥ هەروا دەگوترێ: (عندە شجاعة لاتُنكَفُ) ئازایەتییەکەی کۆتایی نایە.

**نَكِفَ** الحیوان نَكَفاً: حەیوانەکە غودەیەکی شەویلەی توشی نەخۆشی بووە، دەمی لەکلە کەوتووە ٥ **نَكِفَت اليدُ**: دەستی ئازاری لێ پەیدا بوو.

**نُكِفَ** نُكافاً: نەخۆش کەوت ٥ **أنْكَفَهُ**: لەپیسو پەلۆخی پاکی کردەوە ٥ **ناكَفَهُ الكلامَ**: سەرلەنوێ کەوتەوە قسە پێکوتنیو لێ توڕەبوونی ٥ **نَكَّفَ**: توشی نەخۆشی نیکاف بوو ٥ **إنْتَكَفَ**: لە ولاتێکەوە گواستییەوە بۆ ولاتێکی تر ٥ یان لەکارێکەوە چووە سەر کارێکی تر ٥ **إنْتَكَفَ له**: روی تێکرد ٥ دوو پیاوەکە قسەی ناشرینیان بەیەکتر گوتو یەکتریان لەککەدار کرد ٥ **إسْتَنكَفَ من الشَّيْئِ وعنه**: قیزی لەشتەکە کردو خۆی لێ پاراست بێزی نەهات خۆی لێ نزیك بکاتەوە ٥ سەرپێچی کردو ملی بۆ شتەکە نەدا ٥ **المَنْكوفُ**: توشبوو بەنەخۆشی نیکاف ٥ **النُّكافُ**: یان (الحمى النكفية) هەوکردنێکە لەغودە (ئالو)دا پەیدا دەبێو نەخۆشییەکە دەگوازێتەوە ٥ ئەم نەخۆشییە تای لەگەڵ دایە بەکوردی خۆمان جۆرێکە لەبینە خڕە ٥ وادەبێ کاردەکاتە سەر پەنکریاسو هێلکەدانو جوتەگون ٥ **النَّكَفُ**: دەردێکە توشی دەست دەبێ ٥ **النُّكْفُ**: هەرشتێك قیزی لێ بکەیەوە، بەلاتەوە نەنگ بێ ئەنجامی بدەیو خۆتی پێوە هەڵەوگیر بکەی ٥ هەرکەسێك نەتەوێ خۆتی لێ نزیك بکەیەوەو قێزت لێی بێ ٥ **رجل نِكْفٌ**: پیاوێکە پیسو پەلۆخە قێزی لێ دەکرێتەوە یان خوێڕیو هەتیومچەیە بەکەڵکی خۆ لێ نزیك کردنەوە نایە ٥ **النَّكَفَةُ**: یەکێکە لەغوددە بچوکەکان لەبناغەی لاشەویلەدا لەنێوان لاشەویلەو نەرمەی گوێ دا ٥ پێی دەگوترێ: (الغدة النكفية).

**نَكَلَ** عَنْ الأمر نكولاً: ترسنۆك بوو، پاشگەزبۆوە ٥ ملکەچی داواکە نەبوو.

**نَكَلَ** عَنْ اليمين: سوێندی نەخوارد سوێند خواردنی ڕەتکردەوە.

**نَكَلَ** عَنْ العَدُوِّ: لەدوژمن ترسا.

**نَكَلَ** فلاناً عَنْ الشَّيْئِ: فلانکەسی لەشتەکە دوورخستەوە ٥ **نَكَّلَ بِفلان نُكلةً قبيحةً**: فلانکەسی توشی بەلاو چورتمێکی ناشیرین کرد.

**نَكِلَ** عَنْ الأمر: بەمانا (نَكَلَ) دێ ٥ **أنْكَلَهُ عَنْ الشَّيْئِ أو الأمر**: لەشتەکەی دوورخستەوە یان لەسەر کارەکەی لابرد ٥ لەکارەکە ژێوانی کردەوە ٥ دەگوترێ: (أنْكَلَ فلاناً عَنْ عزمه) فلانکەسی لەمەبەستەکەی لادا دووری خستەوە ٥ **نَكَّلَ به**: سزای دا بەسزایەك کەجارێکی تر توخن ئەو شتە نەکەوێتەوە، کەسانی تریشی ترساند لەوەی ڕەچاوی ئەو کارە ناشیرینە

بكەن ◊ **نَكَّلَ الشَّيْءَ**: شتەكەی زنجیرو پێوەند كرد ◊ **نَكَّلَ فلاناً عَنْ الشَّيْءِ**: فلانكەسی لەشتەكە لادا ◊ **المُنَكِّلُ**: ئەو ئازارو جۆرتمەی توشی مرۆڤ دەبێ ◊ بەردو شاخ ◊ **النَّاكِلُ**: ترسنۆكو لاواز ◊ ئیش لەدەست نەهاتوو ◊ دەگوترێ: (هو ناكِلٌ عَنْ الأمور) ئەو لەراپەڕاندنی كاروباردا لاوازە ◊ **النَّكالُ**: سزاو تۆڵە ◊ **النِّكْلُ**: حەبلێكە لەبنكی دۆڵچەی گەورە دەبەسترێ، پیاوی ئازاو خاوەن ئەزموون و ڤاڵبوو لەناو ڕوداودا ◊ ئەسپی بەهێزو توانا ◊ لەحەدیس دا هاتووە (إن الله يحب النَّكَلَ على النَّكَلِ) خودا پیاوی ئازای سوارچاكو بەدەستو بازوی خۆش دەوێ كەلەگۆڕەپانی جەنگ دا بەسەر ئەسپێكی بەهێزو تواناوەیە ◊ **النُّكْلُ**: زنجیرو پێوەند ◊ جۆرە لغاوێكە ◊ ئاسنی لغاو یان ئاسنی هەوسار ◊ دەگوترێ: (رجل نِكْلٌ) پیاوێكە بەسەر بەرامبەرو هاوشانەكەی دا زاڵ دەبێ كەسی ناوێرێتێ.

**نِكْلُ** شر: ئازاو چاو نەترسە بۆ شەڕ ◊ (ك: أنكال ونكول) قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا﴾: لێرەدا مەبەست بە وشەی (أنكالاً) زنجیرو پێوەندە ◊ **النَّكْلَةُ**: جۆرە پارەیەكی میصرییە ◊ **النَّيْكَلُ**: فلزێكی قایەمو ڕەقە، ڕەنگی زیوی و سپییە دەتواندرێ زۆر مشتو ماڵ بكرێو لوس ببێ، تیژببێ ڕەنگ ناگرێ لەگەڵ مادەی تر گونجاوەو یەك دەگرێ، بۆ زۆر شت بەكاردەهێندرێ.◊ **نَكَهَت الشمسُ نَكْهاً**: خۆر گەرمییەكەی بەهێز بوو.

**نَكَهَ** فلان: فلانكەس هەناسەی بەلوتی یەكێكی تردا كرد.

**نَكَهَ** فلاناً: بۆنی دەمی فلانكەسی كرد.

**نَكِهَ** نَكَهاً: هەناسەی خۆی ئاڕاستەی كەسی بەرامبەرو نزیكی كرد.

**نَكِهَ** فلاناً: بەمانا (نَكَهَهُ) دێ.

**نُكِهَ** فلان: فلانكەس بەهۆی زۆر خواردنەوە بۆنی دەمی ناخۆش بوو بوو ◊ **النَّكْهَةُ**: بۆنی دەم ◊ دەگوترێ: (هو طيب النَّكْهَةِ) ئەو مرۆڤە بۆنی دەمی خۆشە.

**نَكِيَ** العَدُوَّ وفيه نكاية: فرسەتی لەدوژمن هێناو زەبری گورچكبڕی لێدا ◊ شكاندیو بەسەریدا زاڵ بوو.

**نُكِيَ** العَدُوُّ نَكِيَ: دوژمن شكاو هەڵات ◊ **النُّلْنُلُ**: پیری پەككەوتەو لاواز.

**نَمَرَ** في الجبل أو الشجر: چووە سەركێوەكە یان سەر درەختەكە.

**نَمِرَ** نَمَراً ونُمْرَةً: لەسەر شێوەی پڵنگ بوو ◊ واتە: پەڵەی سپیو ڕەنگی تری تێكەڵاو بوو (بەڵەك بوو) دەگوترێ: (نَمِرَ السَّحابُ) هەورەكە پەڵە پەڵە بوو.

**نَمِرَ** فلان: فلانكەس تورە بوو وەكوو پڵنگی چنگ بەخوێنی لێ هات ◊ ڕەوشتی ناشیرینو شەڕەنگێز بوو (فهو نَمِرٌ) ◊ **أنْمَرَ فلان**: فلانكەس توشی ئاوێكی شیرینو گوارا بوو ◊ **نَمَّرَ فلان**: فلانكەس ڕقی هەڵساو ڕەوشت ناشیرین بوو ◊ **نَمَّرَ وجهه**: دەموچاوی گرژ كرد، ناوچاوانی لێك نا ◊ **نَمَّرَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بەشێوەی ڕەنگی پڵنگ ڕەنگ كرد ◊ دەگوترێ: (بردة نمرة) بوردەو عەبایەكی ڕەنگاوڕەنگە ◊ **تَنَمَّرَ**: خۆی شوبهاند بە پڵنگ لەشێوەو ڕوخساردا یان لە هەڵسو كەوتو ڕەفتاردا ◊ **تَنَمَّرَ لفلان**: نارەزامەندیی لەفلان نیشان داو هەڕەشەی لێ كرد لەكاتی هەڕەشەكردنەكەی دا دەنگی خۆی

بەرزکردەوەو درێژی بەدەنگەکەی دا ○ الأَنْمَرُ: هەرشتێك پەڵەی سپی تێدابن لەگەڵ ڕەنگی تر ○ دەگوترێ: (فرس أنمر وثوب أنمر، وهي نمراء) ○ المُنَمَّرُ: هەرشتێك خاڵی ڕەشی تێدابن‌و لەپەناپانەوە خاڵی سپی هەبن ○ النّامِرَةُ: ئاسنێکە قولاپو شتی وای هەیە گۆشتی پێوە دەکرێ بۆ ڕاوکردنی گورگو بەتەڵەوە بوونی ○ النّامورُ: خوێن ○ النَّمِرُ: پڵنگ، ئاژەڵێکی درندەیەو جەستەی بەڵەکە لە پێری (السنورية)یە.○ النِّمْرُ: بەمانا (النَّمِرُ) دێ ○ النَّمِرَةُ: پڵنگە مێ (دێڵە پڵنگ) ○ پەڵە هەوری پێك هاتوو لەپارچە هەوری بچوك بچوك‌و لێك نزیك ○ قوماشێکە هێڵی سپی‌و ڕەشی تێدان ○ هەروا بەمانا (النّامِرَة) دێ ○ النُّمْرَةُ: نوکتەو خاڵ لەهەر ڕەنگێك بن ○ بەڵەك ○ النَّمِيرُ من الماء: ئاوی سازگارو شیرین‌و گوارا ○ دەشگوترێ: (لە حَسَبٌ نمير) نژادو ڕەچەڵەکێکی خاوێنی هەیە ○ النُّمْرُقُ: سەرینی بچوك کە ئانیشکی لەسەر دادەدرێ ○ ئەو پارچە قوماشەی بەسەر کەژاوەو شتی وا دا دەدرێ ○ النُّمْرُقَةُ: بەمانا (النُّمْرُق) دێ ○ النِّمْرِقَةُ: بەمانا (النُّمرُق) دێ ○ هەروا ناوە بۆ هەورێك کەناوناوە هەساو بێ.

**نَمَسَ** السِّرَّ نَمْساً: نهێنییەکەی شاردەوە.

**نَمَسَ** السِّرَّ فلاناً: بەسرتە نهێنییەکەی بەگوێی فلان دادا.

**نَمِسَ** السَّمْنُ والطيبُ ونحوهما نَمَساً: ڕۆنەکە یان بۆنەکە خراپ بوو.

**نَمِسَ** بفلان: فیتنەیی بەفلان کرد ○ (فهو نَمِسٌ) ○ أَنْمَسَ بين القوم: نێوان خەڵکەکەی تێك داو فیتنەو ئاشوبی خستە ناویانەوەو هەڵینان بۆ ئەوەی پەلاماری یەکتر بدەن.

نامَسَ الصائد: ڕاوکەرەکە چووە ناو کۆختەکەیەوە ○ نَمَّسَ الشَّعْرُ: ڕۆن‌و چەوری لەقژیەوە چوو قژی چەور بوو چڵکن بوو ○ نَمَّسَ السَّمْنُ والجُبْنُ ونحوهما: ڕۆنە کەرەکە یان پەنیرەکە خەریکە خراپ بێ، بۆگەنی کردووە ○ (فهو مُنَمِّسٌ) ○ نَمَّسَ عليه الأمر: کارەکەی لێ چەواشە کردو سەری لێ شێواند ○ نَمَّسَ العرقُ الجلدَ: عەرەق پێستی جەستەی تەڕکرد ○ إِنَّمَسَ فلان إنّماساً: فلانکەس خۆی شاردەوە ○ إِنَّمَسَ في الشَّيْئِ: چووە ناو شتەکەوە ○ تَنَمَّسَ الصائِدُ: ڕاوکەرەکە کۆختەو حەشارگەی بۆخۆی دروست کرد بۆئەوەی خۆی تێدا مەڵاس بدا بۆ ڕاوکردنی نێچیر ○ تَنَمَّسَ الأمْرُ: کارەکە چەواشە بوو.

الأَنْمَسُ: لیل ○ (وهي نمساء) ○ الناموس: خاوەن نهێنی‌و هەواڵگری فەرمانڕەوا، نووسینگەی نهێنی پاشا ○ ئەوکەسەی فەرمانڕەوا بەسەر نهێنی خۆی دا ئاگاداری دەکا ○ هەروا ناوە بۆ فریشتەی نیگا حەزرەتی جوبرائیل ○ وەصی‌و سەرپەریشتیار ○ قانون‌و شەریعەت ○ لێزان‌و کاردروست ○ حەشارگەو کۆختەی ڕاوکەر: کەخۆی تێدا حەشاردەدا ○ خەڵوەخانەو پەرستگای ڕەبەن‌و دێرنشین ○ لانەی شێر ○ النامُوسة: لانەو بێشەی شێر ○ مێشولەی بچوك ○ النّاموسِيَّة: پەردەکوللە، پەردەیەکە بەدەوری شوێنی نووستن دا دادەدرێتەوە بۆخۆپاراستن لەمێشولەو شتی وا ○ النِّمْسُ: ڕەگەزی حەیوانێکی گواندارە لەپێری (الزبادیة)یەو زۆر جۆری هەیە ○ النَّمَسُ: بۆنی شیرو چەوری ○ النَّمَسَةُ: بۆنی ناخۆش ○ هەرشتێك بۆنی ناخۆشی لێ بێ پێی دەگوترێ: (نَمَسَة).

**نَمَشَ** الشَّيْئَ نَمْشاً: بەشپرێوی هەڵی گرتەوە ○ ماشییەوە.

**نَمَشَ الجرادُ الأرضَ**: کوللەکە لەکشتوکاڵو شیناوەردی زەوی خواردو هەندێ پۆشو پەڵاشی هێشتەوە ◊ **نَمَشَ فلاناً**: سرتەی لەگەڵ فلان کرد، بەچرپە قسەی لەگەڵ کرد.

**نَمَشَ الکلامَ**: قسەکەی هەڵبەستو دروی تێدا کرد.

**نَمِشَ** نَمَشاً: پەڵەی بەجەستەوە پەیدابوون ڕەنگیان لەباقی ڕەنگی پێستی جوداوازە ◊ **أنْمَشَ بینَ القومِ**: فیتنەیی کردو ئاشوبی لەنێو خەڵکەکەدا نایەوە ◊ **نَمَّشَ الشَّیْءَ**: شتەکەی ڕێکخست ◊ **نَمَّشَ الحدیثَ**: بەسرتەو ئەسپایی قسەکەی کرد ◊ **النَّمْشُ**: فیتنەییو ئاشوب ◊ قسەی ڕازاوەو بێ بناغەو نادروست ◊ **النَّمَشُ**: شوێنکەی شت لەسەر شتی تر ◊ پەڵەی سەردەمو چاو کەڕەنگیان لەڕەنگی پێستی جودایە ◊ سپیاییەکە لەسەر بنکی نینۆك پەیدا دەبێو پاش ماوەیەك نامێنێو دوایی دێتەوە ◊ **النَّمِشُ**: دەگوترێ: (سیف نَمِشٌ) شمشێرێکە لەبەر ئەصلیو ڕەسەنی مادەکەی هێڵی تێدا دەبیندرێن، چاو لەسەیرکردنی دا خاڵو هێڵی جۆراو جۆری دێنە بەر تیشکی دیتنەکەی.

**نَمَصَ** الشَّعْرُ أو النَّبْتُ نَمْصاً: مووەکان یان چڵە گیاکان وردو باریك بون دەتگوت گەندەمون یان توکە وردەیە.

**نَمَصَ** الشَّعرَ: مووەکانی هەڵکەندن.

**نَمِصَ** الشَّعْرُ: مووەکان باریكو ورد بوون دەتگوت گەندەمون ◊ **أنْمَصَ النَّبْتُ أو الشَّعْرُ**: گیایەکە یان مووەکان دوای هەڵکەندنیان ڕوانەوە ◊ **أنْمَصَ النَّباتُ أو الشَّعْرُ أو نحوهما**: گیایەکە کاتی دروێنەی هات، یان مووەکان کاتی تاشینو هەڵپاچینیان هات ◊ **نَمَّصَ الشَّعْرَ أو النبتَ**: مووەکەی هەڵکێشا، ڕوەکەکەی دروەوە ◊ **إنْتَمَصَ المرأةُ**: ئافرەتەکە داوای لەدەمو چاو هەڵگرەکە کرد کە گەندەمووی دەمو چاوی بۆ هەڵکەنێ، بۆلابەرێ ◊ یان ئافرەتەکە خۆی گەندەمووی دەمو چاوی هەڵکەند ◊ **تَنَمَّصَتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە موی دەموچاوی بەدەزو هەڵگرتن، هەڵی کەندن ◊ لەحەدیس دا هاتووە: (لُعِنَتْ النامصة والمُتَنَمِّصَة) ◊ **تَنَمَّصَتِ الماشیةُ**: ئاژەڵەکە نەوبەهارو دەستە گوڵی گیایەکەی خوارد ◊ **الأنْمَصُ**: دەگوترێ: (هو الأنْمَصُ الحاجبین) ئەو پیاوە بڕۆ باریکە سەری بڕۆی لای لاجانگی باریك بوونەوە ◊ **المِنْماصُ**: موکێش، ئەو ئامێرەی چەقڵو شتی وای پێ دەردێنەدرێ ◊ **النَّامِصَةُ**: ئەو ئافرەتەی دەموچاوی ئافرەتی تر بەدەزو و شتی وا هەڵدەگرێو ئارایشتیان دەدا ◊ **النَّمّاصُ**: دەزوی دەرزی ◊ **النَّمَصُ**: پەڕوپۆڵی کورت ◊ گژوگیای هێشتا ناسکەو تازە سەری لەزەوی دەرهێناوە ◊ جۆرە گیایەکە لە شوێنی زلکاو و زەوی ئاودراوو تەڕدا دەڕوێ ◊ گەڵادرێژەکانی بۆ دروستکردنی سەلەو حەصیرو شتی وا بەکاردێ ◊ **النَّمیصُ**: ئەوەی دەڕوێتەوە لەگژوگیا یان موو پاش درونەوەو هەڵپاچینو هەڵکەندنیان ◊ **أنْمَطَ لە العطاءَ**: بەخششەکەی لێ کەم کردەوە ◊ **نَمَّطَهُ علی الشَّیْءِ**: شارەزای کرد بۆ شتەکە ◊ دەشگوترێ: (نَمَطَ له علی الشَّیْءِ) ◊ **النَّمَطُ**: توکی فەرشو بەڕە ◊ جۆرە فەرشو ڕاخەرێکە ◊ قوماشێکە لەخوری دروست دەکرێ ڕەنگاوڕەنگە بەسەر کەژاوەو شتی وادا دەدرێ ◊ ڕێبازو بەرنامەو پلان بۆهەر شتێك بێ ◊ شێوازی شت ◊ کۆمەڵێك مرۆڤ یەك ئیشیان هەبێ ◊ جۆرو شێوەی شت ◊ دەگوترێ: (عندي متاع من هذا

النَّمط) کالای لەو جۆرەم لایە ٥ نَمَغُ الشَّیْءَ: شتەکەی رەنگ کرد بەرەنگی رەش و سپی و سوور بەتێکەڵی ٥ المُنَمَّغُ: رەنگ کراو بەرەنگی جۆراو جۆر ٥ دەگوترێ: (رجل مُنَمَّغٌ) پیاوێکی رەنگاورەنگە بەڵەکە ٥ النَّمَغَةُ: مەلاشوی منداڵ کەتازە لەدایك دەبێ و مەلاشوی نەرمە تارەق دەبێ ٥ سەرانسەری کێو ٥ مرۆڤی وەجاخزادەو رەسەنی گەل و نەتەوە ٥ ماڵ و سامانی زۆر ٥ مرۆڤی زۆر.

**نَمَقَ** الكتابَ نَمْقاً: بەجوانی کتێبەکەی نووسیەوە ٥ أنمَقَت النخلة: دارخورماکە خورمای بێ ناوکی گرتن ٥ نَمَّقَ الثوبَ أو الجلدَ ونحوهما: قوماشەکە یان پێستەکەی رەنگاورەنگ کرد ٥ نَمَّقَ الكتابَ: بەشێوەی جوان و خۆشنووسی کتێبەکەی نووسیەوە، زێدەڕۆیی لەمانای (نَمَقَ) دەگەیەنێ ٥ المُنمِقُ من الرُّطَب: خورمایەکە ناوکی نەبێ ٥ النَّمَقُ: ئەو کتێبەی تێیدا دەنووسیەوە ٥ ناوەڕاستی رێگا ٥ النَّمَقَةُ: بۆنی ناخۆش، بۆگەن ٥ النَّمیقُ: شتی نەخشاو و رەنگاورەنگ ٥ دەگوترێ: (ثوب نَمیق).

**نَمَلَ** فلان نَمْلاً ونُمولاً: فلانکەس فیتنەجۆ بوو، فیتنەیی کرد.

**نَمَلَ** نَمَلاناً: بەسەر شتەکەیدا ڕوانی.

**نَمَلَ** في الشجرة نُمولاً: چووە سەر درەختەکە.

**نَمِلَ** المكانُ: شوێنەکە مێروی زۆر بوو ٥ نَمِلَتْ یدُ فلان: دەستی فلانکەس تەزی شلەپەتە بوو ٥ نَمِلَت یدُه في العمل: لەکارکردن دا دەستی سوك بوو ٥ نَمِلَت المرأةُ أو الفرسُ: ئافرەتەکە یان ماینەکە جێگیر بوو ٥ (یان سکی بۆ ڕاوەستاو لەباری نەچوو) دەشگوترێ: (غَلَت ید الصَّبي) دەستی منداڵەکە هەدادانی نەبوو لەهارو هاجی نەکەوت ٥ (فهو نَمِل وهي نَمِلَة) ٥ دەشگوترێ: (إمرأة نَمْلی) ئافرەتێکە گەڕۆکە لەهیچ شوێنێك جێگیر نابێ.

**نُمِلَ** الطعامُ: خۆراکەکە مێروی تێچوو مێرواوی بوو ٥ (فهو مَنمُولٌ) ٥ نَمَّلَ الكتابَ: دێری کتێبەکەی لێك نزیك نووسینەوە ٥ نَمَّلَ قِربَتَهُ: کراسەکەی پینەکرد ٥ تَنَمَّلَ القومُ: خەڵکەکە کەوتنە جم و جۆڵ و هاتوچۆ و تێکەوە هاویشتن ٥ بڵاومیان لێ کردو بەناوزەوی دا بڵاوبوونەوە بۆ کاسبی کردن وەکوو مێرولە ٥ الأنمُلَةُ: گرێی قامك، چاوە قامك ٥ جومگەی لای ژووری پەنجە ئەوەی نینۆکی پێوەیە.

**المُؤنمِلُ**: دەگوترێ: (رجل مؤنمِلُ الأصابع) پیاوێکی پەنجە کورت و پەنجە ئەستوورە ٥ المُنَمِّلُ: دەگوترێ: (لقد طالَبَ غیر مُنَمِّلٍ) بەهێواشی داوای شتەکەی کردو بەپەلە نەبوو لەبەدەست هێنانی دا ٥ المُنَمِّلَةُ: ئافرەتی گەڕۆك کە لەشوێنێك جێگیر نەبێ ٥ النامِلَةُ: ڕێبوار کۆمەڵە خەڵك کە بەرێگادا دەڕۆن ٥ النَّمِلُ: لێزان و شارەزا ٥ النَّمْلَةُ: مێرۆلە، حەشەرەیەکی بچکۆلەی کۆششکەرە لەژێر گڵ دا دەژی، بەتاك و کۆمەڵ ژیان بەسەردەبەن و گیانی هاوکاریان تێدایە ٥ فیتنەیی و ئاشوبگێڕ.

**النَّمْلِیَّةُ**: صندوقێکە خواردن و شتی وای تێدا هەڵدەگیرێ مێرولەو حەشەرات ناتوانن بچنە ناوی، ئەم جۆرە صندوقە لەتەختە دار یان مەعدەنی تر دروست دەکرێ و دەرگاکەی لە تەلە هێلەکێکی کون بچوکە ٥ النُّمْلَةُ: باقی ماندەی ئاو لەحەوزدا ٥ دەشگوترێ: (فرس ذو نُمْلَةٍ) ئەسپێکی سرك و هاروهاجە ٥ النَّمّالُ: فیتنەو ئاشوبگێڕ ٥ النَّمیلة: فیتنەجۆ.

**نَمَّ** الحدیث نَمّاً: قسەکە ئاشکرابوو.

**نَمَّ الشَّيْئُ:** شتەکە بۆنەکەی بڵاوبۆوە ◊ شتەکە وروژا هەڵنەربوو.

**نَمَّ الحديثَ:** قسەکەی هێناو برد بۆنەوەی فیتنەیی بنێتەوە ◊ ئاشوب لەناو خەڵکەکەدا بەرپابکا.

**نَمَّ الكلامَ:** قسەکەی بەدرۆو دەلەسە ڕازاندەوە ◊ **النَّامَّـةُ:** هەست و جم و جۆڵ ◊ دەگوترێ: (سَمِعت نامَّتَهُ) گوێم لەهەست و خوستی بوو ◊ دەشگوترێ: (أسكت الله نامَّتَـهُ) خودا مراندی ◊ **النَّمّ:** فیتنەیی و ئاشوبگێڕی ◊ **النَّمَّام:** ناوە بۆ ڕوەکی سەعتەرە کێویلە: کە ڕوەکێکی بۆنخۆشە هەروا ناوە بۆ گیا پونگە ◊ پونگی ئاویی ◊ **النَّمَّـةُ:** پەڵەیەکی سپی لەناو ڕەشایی دا، یان پەڵەیەکی ڕەش لەناو سپیایی دا ◊ **النُّمِـيُّ:** خیانەت ◊ عەیب و لەککە ◊ دوژمنایەتی ◊ سروشت و تەبیعەتی مرۆڤ ◊ ماهیەت و هیولای مرۆڤ ◊ دەشگوترێ: (ما بالدارِ نُمِّيٌّ) کەس لە خانوەکەدا نیە ◊ فلوس کەلەڕەصاص دروست کرابێ ◊ تاکەکەی پێی دەگوترێ: (نُمِّيَـةٌ) ◊ **النَّمِيمُ:** دەنگی نزم و هێواش کەلەجم و جۆڵی شتێك پەیدا دەبێ ◊ خشپەی پێ ◊ فیتنەیی و قسەهێنان و بردن ◊ **النَّمِيمةُ:** بەمانا (النَّميم) دێ ◊ نووسین ◊ سیرەو خشەی نووسین ◊ **نَمْنَمَتِ الريحُ التُرابَ:** ڕەشەباکە شوێنکەی لەگڵ و خۆڵەکە کرد هێڵ و خێتی جیاجیای تێدا جێهێشت ◊ **نَمْنَمَ الشَّيْئَ:** شتەکەی نەخشاندو ڕازاندییەوە ◊ زڕکەفتی کرد ◊ دەگوترێ: (نَمْنَمَ كِتابَـهُ) کتێبەکەی نەخشاندو بەزەرکەفت و نەخش و نیگار ڕازاندییەوە ◊ **الْمُنَمْنَمُ:** زەخرەفەکراو و ڕازێندراوە ◊ دەگوترێ: (ثوب مُنَمْنَمٌ) قوماشێکی زەخرەفەکراوە ◊ هەروا دەگوترێ: (كتاب مُنَمْنَمٌ) کتێبێکی زەخرەفەکراوە ◊ (نبات مُنَمْنَمٌ) ڕوەکێکی تێکهاڵاو و تێکچرژاوە.◊ **النُّمْنِمُ:** ئەو شوێنکەو نیشانانەی ڕەشەبا لەسەر ڕوبەری گڵ جێی دێڵێ ◊ سپیایی کەلەسەر نینۆکی مرۆڤی گەنج دەردەکەوێ ◊ تاکەکەی (نِمْنِمَةٌ) ◊ **النُّمْنِمَةُ:** هێڵی کورت و لێك نزیك ◊ **النُّمْنُمُ:** ئەسپێی بچوك.

**نما الشَّيْئَ نَماءً ونُمُوّاً:** شتەکە زیادی کردو پەرەی سەند ◊ دەگوترێ: (نما الزرع، ونما الولدُ، ونما المالُ) ◊ دەشگوترێ: (هو ینموا الی الحسب) ◊ هەروا دەگوترێ: (نَما الخضاب في اليد أو الشعر) خەنەکە سوورییەکەی پەرەی ساند ◊ قژەکە ڕەشایی زیادی کرد.

**نما الحديثَ:** حەدیسەکەی ئیسناد داو بەشێوەی ڕێك و پێك ڕیوایەتی کرد.

**نَمى الحديثُ نماءً ونُمِيّاً:** قسەکە بڵاو بۆوە.

**نَمى الحيوانُ:** ئاژەڵەکە قەڵەو بوو.

**نَمى الدوابُ:** ئاژەڵ و وڵاخەکان دوورکەوتنەوە بۆمڵ و موش و لەوەڕخواردن.

**نَمى الصَّيْدُ:** نێچیرەکە بەبرینداری لە ڕاوکەرەکە گوم بوو تیرەکە بەجەستەیەوە بوو.

**نَمى الشَّيْئَ:** شتەکەی بەرز کردەوە لەڕێزو بەهای زیاد کرد ◊ دەگوترێ: (فلان يَنْمِيهِ حَسَبُهُ).

**نَمّى الحديثَ:** فەرموودەکەی گەیاندەوە گوتەرەکەی.

**نَمّى فلاناً الی فلان:** فلانکەسی پاڵ فلانکەس دا.

**نَمّى المالَ ونحوه:** ماڵەکەی زیاد کردو گەشەی پێدا ◊ **أنمى الكرمُ إنماءً:** دارمێوەکە پۆخی دەرکەوتن، خەریکە گەڵاکەی دەربکەوێ ◊ **أنمى الشَّيْئَ:** گەشەی بەشتەکە دا ◊ **أنمى الراعي دوابَّهُ:** وڵاخ و ئاژەڵەکانی لەلەوەڕگاکەدا لێك بڵاوکردن

بۆنەوەی هەریەکەیان لەپانتاییەك دا بلەوەڕێ ◊ أَنمى الصيدَ: تیری بەنێچیرەکەوە ناو هەنگاوتیو بۆی نەگیرا لەشوێنێکی دوور منداربۆوە ◊ نَمَّى الشَّيْءَ أو الحديثَ تَنْمِيَةً: گەشەی بەشتەکە دا ◊ قسەکەی بەشێوەی فیتنەیی هێناوبرد ◊ نَمَّى النارَ: سوتەمەنی بۆ ئاگرەکە زیاد کرد ◊ إنتمى الطائرُ: باڵندەکە لەشوێنێ هەڵفڕی بۆ شوێنێکی تر چوو ◊ إنتمى الى الجَبَلَ: چووە سەر کێوەکە ◊ إنْتَمى الى كذا: نیسبەت درا بۆلای ئەوە ◊ تَنَمَّى: بەمانا (إنتمى) دێ ◊ الأُنميُّ: شریفێکە کای تێدەکرێ ◊ النَّامي: هەرشتێك گەشو نمای تێدا بێ وەکوو گیاندارو ڕوەكو درەخت ◊ النَّامية: خەڵك (مخلوقات) ◊ تولە مێو کەهێشومترێی پێوەبێ ◊ النَّماةُ: مێروی بچوك ◊ النَّمْوَةُ: زیادە ◊ الأنموذج: نموونە ◊ النَّنُّ: قژی تەنك.

**نَهَا نَهاً**: پڕبوو، دەگوترێ: (نَهَا الإناءُ) زەرفەکە پڕبوو ◊ (شربَ فلان حتى نَهَا) ئاوی خواردەوە تا تێراو بوو.

**نَهَا اللَّحْمَ نُهوءاً**: گۆشتەکەی نەکوڵاند.

**نَهِئَ اللحْمُ**: گۆشتەکە نەکوڵێ ◊ أنهَأ اللَّحْمَ: گۆشتەکەی نەکوڵاند بەکاڵی هێشتییەوە ◊ النَّاهِئُ: تێرو تەسەلە.

**نَهَبَ الشَّيْءَ نَهْباً**: بەزۆر شتەکەی وەرگرت ◊ دەگوترێ: (إنَّه ينهب الأرض) ئەو بەپەلەو خێرا دەڕوا ◊ هەروەها دەگوترێ: (إنه لَيَنْهَبُ الغاية) ئەو پێشکەوتووە بۆلای ئامانج.

**نَهَبَ الكلبُ فلاناً**: سەگەکە دەماری پاژنەپێی فلانکەسی گرت.

**نَهَبَ فلاناً**: جنێوی بەفلانکەس داو لێی تورە بوو ◊ أنهَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی واێ کرد هەڵمەتی بۆ بېرێو بەتاڵان ببرێ ◊ أنهَبَ الشَّيْءَ فلاناً: شتەکەی بۆ فلانکەس ڕانواند ◊ ناهَبَ المُتَسابِقُ مُسابِقَهُ: پێشبڕکێی لەڕاکردن دا لەگەڵدا کرد ◊ إنْتَهَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵگرت ◊ إنْتَهَبَ الفرسُ الشَّوْطَ: ئەسپەکە لەپێشبڕکێیەکەدا بردیەوە ◊ تناهب المتسابقان: هەریەك لەو دوو پێشبڕکێکارانە ویستی سەرکەوتن بەدەست بێنێ ◊ تناهَبَ الدَّوابُ الأرض: وڵاخەکە یان ئاژەڵەکە بەقاچەکانی زەوی هەڵکۆڵی ◊ المِنْهَبُ: سەرکەوتوو لەپێشبڕکێ دا ◊ دەگوترێ: (فرس مِنْهَبٌ) ◊ المَنْهوبُ: ئەوەی چەپاو دەکرێ (تاڵان دەکرێ) ◊ شتێك بەپەلە داوابکرێ ◊ النَّهْبُ: تاڵانکردن ◊ چەپاو کردن ◊ شتێك بکرێتە مەبەستو نیشانە بۆ هەنگاوتن ◊ دەگوترێ: (أصبح فلان نَهْباً للسَّبِّ) فلانکەس بوو بەنیشانە بۆ تانەو تەشەر لێدانو جنێوپێدان ◊ یان فلانکەس بوو بە ئامانج بۆنەخۆشی ◊ هەروا وشەی (النهب) ناوە بۆ ماڵی تاڵانیو دەسکەوتی جەنگ ◊ تاڵانکراو و ماڵبڕاو ◊ هەروا وشەی (النَّهْبُ) بەمانای جۆرێك لەڕاکردن دێ ◊ النُّهْبَةُ: بەمانا (إنتهاب) دێ واتە: هەڵگرتن یان سەرکەوتن ◊ النُّهْبَى: هەڵمەتو تاڵانکردن ◊ تاڵانکراو، ماڵبڕاو ◊ النَّهَّابُ: کەسێك زۆر تاڵانچی بێ، چەپاوکەربێ ◊ النَّهْبَرَةُ من النساء: ئافرەتی درێژداوەڵو داڵگۆشت ◊ کزو لاواز ◊ ئافرەتێك بگاتە حاڵەتی تێداچوونو گیانەلاو ◊ النُّهْبَرَةُ: تەپۆلکەو گردۆلکە ◊ چاڵو چۆڵی نێوان بیشەو لانەی شێر ◊ النُّهْبُورُ: بەمانا (النُّهْبَرَةُ) دێ ◊ نَهْبَلَ: فلانکەس خۆی شەلاند وای پیشان دا شەلە، لەڕۆیشتن دا خۆی شەل کرد ◊ نَهْبَلَ فلان: فلانکەس تەمەن درێژبوو ◊ النَّهْبَلُ: پیرەمێرد

◊ دەگوترێ: (شیخ نَهْبَلٌ) ◊ النَّهْبَلَةُ: ڕۆیشتنێکی تەمبەلانەیە ◊ پیرەژنی کۆنەساڵ ◊ دەگوترێ: (عجوز نَهْبَلَةٌ) ◊ هەروا ناوە بۆ حوشتری کەتەو زەبەللاح.

**نَهَتَ** القِرْدُ وغيره نهيتاً ونهاتاً: مەیمونەکە قیراندی زیراندی ◊ دەگوترێ: (نَهَتَ الأَسَدُ) شێرەکە دەنگی لێوەهاتو دەنگەکەی نەبوە نەڕاندن.

**نَهَتَ** فلان: فلانکەس ناڵاندی، نرکاندی ◊ **المِنْهَتُ والمُنهِتُ**: شێر ◊ **الناهِتُ**: قوڕگ ◊ **النُّهاتُ**: دەنگێك کەلەسنگ بێ، نرکەو ناڵە، زیخەزیخ کەلەکاتی نارەحەتی دا لەئادەمیزاد دەبیسرێ ◊ **نَهْتَرَ على فلان**: درۆی بەدەم فلانکەسەوە کرد ◊ **نَهْتَرَ فلان في كلامه**: فلانکەس قسەکانی بەشێوەی بەرەو ئاواژو گێڕانەوە.

**نَهَجَ** الطريقُ نَهْجاً ونهوجاً: ڕێگاکە ئاشکرابوو دەرکەوت ◊ دەگوترێ: (نَهَجَ أَمْرُهُ) ئیشەکەی ئاشکرابوو.

**نَهَجَ** الدابةُ أو الإنسانُ نَهْجاً ونهيجاً: وڵاخەکە یان مرۆڤەکە خێرا خێرا هەناسەی داو هانکە هانکی پێ کەوت بەهۆی ماندوبوون.

**نَهَجَ** الثَّوبُ نَهْجاً: قوماشەکە کون بوو ڕزی.

**نَهَجَ** الطريقَ: ڕێگاکەی ئاشکرا کرد، ڕونی کردەوە ◊ ڕێگاکەی پەیڕەو کرد.

**نَهِجَ** نَهَجاً وَنَهْجَةً: خێرا خێرا هەناسەی هەڵێناو هانکە هانکی پێکەوت بەهۆی ماندوێتیو شەکەتی، یان ڕاکردنو جمو جوڵی زۆر.

**نَهِجَ** الثوبُ وغيره: قوماشەکە کۆن بوو، ڕزی (فهو نَهِجٌ) ◊ **أَنْهَجَ الطريقُ**: ڕێگاکە ئاشکراو ڕون بوو، دەرکەوت ◊ **أَنْهَجَ الدابةَ**: بەسواری وڵاخەکە ڕۆیی تا ماندوی کرد ◊ **أَنْهَجَ العمَلُ فلاناً**: ئیشکردنەکە فلانکەسی ماندوکرد تاوای لێ کرد هەناسە برکەی پێ بکەوێ ◊ **أَنْهَجَ الثوبَ**: قوماشەکەی کۆن کرد. ڕزاندی ◊ **إِنْتَهَجَ الطريقَ**: ڕێگاکەی ئاشکرا کردو پێیدا ڕۆیی ◊ **إِسْتَنْهَجَ الطريقُ**: ڕێگاکە ئاشکرابوو دەرکەوت چۆنە ◊ **إِسْتَنْهَجَ سبيلَ فلان**: ڕێبازی فلانکەسی گرتەبەرو پێیدا ڕۆیی ◊ **المِنْهاجُ**: ڕێگای ئاشکراو نمایان ◊ هەروا ناوە بۆ پلانو خەریتەی کارکردن ◊ پرۆسەو پرۆگرام ◊ **المِنْهَجُ**: بەمانا (المِنهاجُ) دێ ◊ **النّاهِجُ**: دەگوترێ: (طريق ناهج) ڕێگایەکی ئاشکراو ڕون ◊ هەروا دەگوترێ: (طريقة ناهجة) ◊ **النَّهْجُ**: ئاشکراو نمایان ◊ دەگوترێ: (طريق نَهْجٌ) ◊ (أمر نَهْجٌ) ◊ ڕێگای ڕاستو ئاشکرا ◊ دەگوترێ: (هذا نهجي لاأحيد عنه) ◊ **النَّهَجُ**: نەخۆشی ڕەبۆ، هەناسە سوارییو تەپەتەپی دڵ ◊ **النَّهِيجُ**: بەمانا (النَّهَجُ) دێ.

**نَهَدَ** الثديُ نهوداً: مەمك خڕبوو، سەری هەڵداو بەرز بۆوە ◊ دەگوترێ: (نهدت ثدي المرأة) مەمکی ئافرەتەکە خڕبوون (فهي ناهد وناهدة) ئەو ئافرەتە (مەمك خڕو تونده) هێشتا مەمکی شل نەبوون.

**نَهَدَ** الإناءُ: قاپەکە نزیکە پڕ ببێ.

**نَهَدَ** فلان: فلانکەس هەڵساو ڕۆیی.

**نَهَدَ** لعدوه (أو) إلى عَدُوِّهِ: خۆی لەبەردەم دوژمن دا ڕاگرتو بەردەوام بوو لەشەڕ لەگەڵ کردنی دا.

**نَهُدَ** نُهوداً: بەرزبوو، خڕبوو ◊ سەری هەڵدا ◊ **أَنْهَدَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕکرد هەتا لەسەریەوە ڕژا ◊ یان نزیك بوو لێوان لێوبێ ◊ **أَنْهَدَ الهديةَ**: دیارییەکەی گەورەکرد؛ دیاری گەورەی برد ◊ **أَنْهَدَ فلاناً**: فلانکەسی دەست نیشان کرد.

ناهَدَ فلاناً: کێشەی لەگەڵ فلانکەس دانایەوە ◊ **ناهَدَ عَدُوَّهُ**: بەربەرەکانی دوژمنی کرد لەشەڕداو

لەقاقۆزەی بێچا ٥ تناهَدَ القومُ: خەڵکەکە لەسەفەردا هەریەکە بەشە تێشوی خۆی هێنایە دەرو تێکەڵاویان کرد (پیتاکیان) کرد ٥ تناهَدَ في الحرب: لەشەڕدا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە، بۆیەکتر ڕاپسکوتن‌و پەلاماری یەکتریان دا ٥ تناهد القومُ الشَّيْءَ: خەڵکەکە لەناو خۆیان دا شتەکەیان دەستاودەست پێ کرد ٥ تَنَهُّدَ: هەناسەی حەسانەوەو خۆشی هەڵکێشا ٥ النّاهِدُ: ئافرەتێك مەمکی خڕبووبن مەمکی قیت کردبن ٥ دەشگوترێ: (غلام ناهِد) گوڕە گەنجێکی تازە پێگەیشتووە ٥ النُّهادُ: ئەندازە، ڕێژە ٥ نزیکەی ٥ دەگوترێ: (هؤلاء نُهَادُ مائة) ئەوانە نزیکەی سەد دەبن، ئەندازەی سەد کەسن ٥ النَّهْداءُ: لەبەلانی گوێ جەم کەروەکی باشی لێ بڕوێ ٥ النَّهدانُ: دەگوترێ: (حَوْض نهدان) حەوزی پڕ ئاو کەلەسەریەوە نەڕژێ ٥ (قدح نهدان) پیاڵەی پڕ ٥ یان دوو لەسەر سێی پڕبێ.٥ النَّهْدُ: شتی بەرز ٥ مەمکی خڕبوو ٥ زەمە ڕۆنە کەرەی گەورە ٥ گیانلەبەری گەورەو بەهێز ٥ دەگوترێ: (شابٌ نَهْدٌ وفرس نَهْد) ٥ هەروا ناوە بۆ پیاوی پیاوانەو بەکەڵك‌و ڕەوشت بەرز کەهەمیشە هەوڵی پیاوەتی بدا ٥ النَّهْدُ: ئەوەی هاوەڵی سەفەرو کاروانچی لەکیسە باخەڵ‌و توێشودانی خۆیان دەری دێنن‌و تێکڕا دەیخەنە سەر سفرەی هاوبەش ٥ یان بیتاك‌و کۆمەکی هاو وڵاتیان لەکاتی هێرش هێنانی دوژمن دا ٥ دەگوترێ: (طَرَحَ نِهْدَهُ مع القوم) یارمەتی خەڵکەکەی دا ٥ النَّهِيدُ: ڕۆنەکەرەی تەنکە (بەچوك) ٥ النَّهيدَةُ: زەمە ڕۆنەکەرەی گەورە ٥ تۆوی کاڵەکە مارانە ئاردی تێکەڵاو دەکرێ‌و دەخورێ.

**نَهَرَ نَهْراً**: بەتەوژم ئاوەکە ڕۆیی.

**نَهَرَ الماءُ**: ئاوەکە بەزەوی دا ڕۆیی‌و ڕێگای خۆی کردەوە.

**نَهَرَ الحَفَّارُ**: بیرهەڵکەنەکە گەیشتە ئاو لەناوبیرەکەدا ٥ دەگوترێ: (حَفَرَ بئراً حتى نَهَرَ) بیرەکەی هەڵکەند تا گەیشتە ئاو.

**نَهَرَ الأرض**: زەوییەکەی هەڵدڕی.

**نَهَرَ فلاناً**: لەفلانکەس توڕەبوو بەڕەقی‌و ڕوی ناخۆش قسەی لەگەڵ دا کرد ٥ ڕقی هەڵسا.

**نَهَرَ النَّهْرَ**: جۆمەکەی هەڵکۆڵی‌و ئاوەکەی پێدا برد.

**نَهِرَ الشَّيْءُ نَهَراً**: شتەکە زۆر بوو ٥ (فهو نهِر) ٥ أنْهَرَ: کەوتە ڕۆژەوە ٥ یان بەڕۆژ کاری کرد ٥ أنْهَرَ السائِلُ: شلەمەنییەکە بەتەوژم ڕۆیی‌و ڕەوان بوو ٥ دەگوترێ: (أنْهَرَ البَطْنُ) سکەکە چوو، گوفیرەی گرت ٥ أنْهَرَ العِرْقُ: دەمارەکە خوێنی نەوەستا ٥ أنْهَرَت المرأةُ: ئافرەتەکە قەڵەو بوو ٥ أنْهَرَ في العَدْوِ: لەبازدان دا تەمبەڵ بوو بەهێواشی بازی دا ٥ أنْهَرَ الدَّمَ: خوێنەکەی ڕەوان کرد ڕۆیاندی ٥ أنْهَرَ الفَتْقَ: دڕاوییەکەی فراوان کرد ٥ کەلەبەرو چاڵەکەی فراوان کرد ٥ دەگوترێ: (أنْهَرَ الدَّمَ) خوێنەکەی ڕشت، ڕەوانی کرد ٥ إنْتَهَرَ النَّهْرُ: جۆمەکە شوێنی خۆی کردەوە ڕێڕەوی خۆی گرتەبەر ٥ إنْتَهَرَ بَطْنُهُ: سکی چوو، گوفیرەی گرت ٥ إنْتَهَرَ العِرْقُ: دەمارەکە خوێنی نەوەستا ٥ إنْتَهَرَ فلاناً: فلانکەسی زۆر توڕەکردو بەشێوەی زبرو دەنگی بەرزو ڕوی ترشە وەقسەی لەگەڵ کرد ٥ إسْتَنْهَرَ السائِلُ: شلەمەنییەکە بەزۆری‌و تەوژم ڕۆیی ٥ إسْتَنْهَرَ النَّهْرُ: جۆمەکە ڕێڕەوی خۆی کردەوەو جاری بوو ٥ إسْتَنْهَرَ الأمْرُ: کارەکە قورس بوو لەسنور دەرچوو ٥ المَنْهَرُ: شوێنی هەڵکەندنی

جۆگاو لادرێ كە ئاو دایدرێ ٥ جۆگایەكە لەناو قەلاو شورادایە ناوی پێدا دەڕوا ٥ **المَنهَرَةُ**: بۆشاییەكە لەنێوان خانوەكان ٥ زبڵو زاڵی تێ فڕێ دەدرێ ٥ زبڵدان ٥ سەرانگوێلك ٥ **النّاهِرُ**: ترێی سپی ٥ **النّاهور**: هەور ٥ **النّهارُ**: ڕۆژ، ڕوناكایی نێوان بەرەبەیانو شێوان؛ نێوان ڕوناكایی ئاسۆ لەبەرەبەیانەوە تا ئاوابوونی خۆر لەنێوارەدا ٥ **النّهارِيُّ**: نان خواردنی قاوەڵتی ٥ **النّهرُ**: ئاوی زۆرو شیرینو ڕەوان (ڕوبار) ٥ ڕێڕەوی ئاوی شیرینو گوارا ٥ **النَّهَرُ**: بەرفراوان ٥ ڕوناكی ٥ بەمانا (النَّهرُ) دێ ٥ **النَّهِرُ**: ترێی سپی ٥ دەشگوترێ: (نَهِرٌ ونَهِرٌ) ٥ ڕوبارێكی پانو پۆرە ٥ (نهار نَهِرٌ) ڕۆژێكی ڕۆشنو ڕوناكە ٥ (رجل نَهِرٌ) پیاوێكە بەڕۆژ كاردەكا ٥ دەگوترێ: (لست بليلي ولكني نَهِرٌ) بەشەو كارناكەم بەڕۆژ كاردەكەم ٥ **النَّهِرَةُ**: ئاژەڵی شیر زۆر.

**نَهَزَ فلان نَهزاً**: فلانكەس ڕاپەڕی بۆئەوەی شتێك بەدەست بێنێ ٥ دەشگوترێ: (نَهَزَت الدَّابَّةُ بصدرها) ئاژەڵەكە یا وڵاخەكە سینگی پێوەنا؛ واتە: دەستی كرد بەڕۆیشتن ٥ ملی درێژ كردو سینگی پێوەنا بۆئەوەی بڕشێتەوە ٥ **نَهَزَت الدابةُ برأسها**: وڵاخەكە بەڕاوەشاندنی سەری مێشو مەگەزی لەخۆی دوورخستەوە.

**نَهَزَ بالدلو في البئر**: دۆڵچەكەی لەناوبیرەكە هێناو برد بۆئەوەی پڕبێ لەناو.

**نَهَزَ الدَّلوَ من البئر**: دۆڵچەكەی لەبیرەكە دەرهێنا.

**نَهَزَ الشَّيْءَ**: پاڵی بەشتەكەوە نا ٥ دەگوترێ: (نَهَزَ راحِلَتَهُ) لە وڵاخەكەیەوە ژەنیو دەنەدەنەی دا بۆخێرا ڕۆیشتن ٥ دەشگوترێ: (نَهَزَتني اليك حاجة) پێداویستیو ئاتاجی منی هێنا بۆلای تۆ.

**نَهَزَ فلاناً في صدره**: مستەكۆڵەی لەسنگی فلانكەس دا.

**نَهَزَ رأسَهُ**: سەری بادا ٥ **أنهَزَهُ**: ڕاپەڕاند ٥ **ناهَزَ الأمرَ**: لەكارەكە نزیك بۆوە ٥ دەگوترێ: (ناهَزَ الصَّبيّ البلوغ) منداڵەكە خەریكە باڵغ دەبێ، نزیكە پێ بگا ٥ **ناهَزَ الرضيعَ الفِطامَ**: شیرەخۆرەكە نزیكە لەشیرخواردن ببڕدرێتەوە ٥ **ناهَزَ فلاناً**: پێش فلانكەس كەوت ٥ **ناهَزَ الصيدَ**: پەلەی كرد نێچیرەكە بگرێ ٥ **ناهَزَ الفُرصَةَ**: هەلەكەی قۆستەوە نەیهێشت لەكیسی بچێ ٥ **ناهَزَت الفرصَةُ فلاناً**: فورسەتو هەل بۆ فلانكەس ڕێ كەوت ٥ **إنتَهَزَ في الضحك**: زێدەڕۆیی كرد لە پێكەنین دا ٥ زۆر پێكەنی ٥ **ناهَزَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بەدڵ بوو پەلەی كرد بەدەستی بێنێ ٥ دەگوترێ: (إنتَهَزَ الفرصة) هەلی قۆستەوە نەیهێشت هەلی لەكیس بچێ ٥ **تناهَزَ القومُ الشَّيْءَ**: خەڵكەكە پەلەیان كرد بۆ بەدەستهێنانی شتەكە ٥ دەشگوترێ: (تناهَزوا الفُرَصَ) كەوتنە خۆ بۆ قۆستنەوەی هەلو ویستیان كەلكی لێ وەرگرن ٥ **المناهَزَة**: پێشبڕكێ ٥ **الناهِزُ**: ڕیش سپیو پیاوماقوڵی گەلو هۆزو هەڵسوڕێنەری كاروباریان ٥ **النُّهازُ**: ئەندازەو مەزندە ٥ دەگوترێ: (عمره نُهاز عشرين سنة) تەمەنی بیست ساڵ دەبێ، نزیكەی بیست ساڵ دەبێ ٥ **النُّهزُ**: دەست دانە شت؛ هەرشتێك بەدەست بكرێو دەستی بۆ ببرێ ٥ **النُّهزَةُ**: هەلو فرسەت ٥ دەگوترێ: (هو نُهزَة المختلس) ئەو نێچیری هەموو كەسێكە هەموو كەس دەتوانێ فرسەتی لێ بێنێ.

**النَّهازُ**: كەسێك خێرا خێراو زۆر شت بەدەست بداتە یەكێكی تر وەكوو بەردەستی وەستای دیوار دانانو شتی وا ٥ گوێدرێژ: كە سنگی

ڕەپێش دەکا بۆ ڕۆیشتن ۞ النَّهوز: شتێك کە پاڵنەری هەبێ بۆ ڕۆیشتن ۞ حوشترێك بێچوەکەی مندار بوبێتەوەو شیرنەدا تاباشباش گوانەکانی ڕانەتەکێنێو دایان نەچۆڕێنێ.

**نَهَسَ** اللَّحْمَ نَهساً: گۆشتەکەی بەددانی پێشەوەی بچڕی بۆئەوەی بیخوا.

**نَهَسَ** فلاناً الکَلْبُ: فلانکەس سەگ گەستی ۞ نَهَسَتْهُ الحیة: مارگەستی، پێوەی دا ۞ إنْتَهَسَ: زۆری گۆشت بەکەڵبەکانی بچڕی ۞ زێدەڕۆیی کرد لەگۆشت بچڕین دا ۞ المَنْهَسُ: ئەو شوێنەی گۆشتی لێ دەپچڕێندرێ ۞ دەگوترێ: (أَسَدٌ أو نَسْرٌ مِنهَسٌ) شێرێکە زۆر گۆشت دەپچڕێ ۞ یان دالاشێکە زۆر گۆشت بەدەندوکی دەپچڕێ ۞ المَنْهوسُ: کزو دالگۆشت ۞ دەگوترێ: (رجل منهوس) پیاوێکی کزو لاوازە ۞ (رجل منهوس القدمین) پیاوێکی قاچ ڕەقو تەقە ۞ النُّهَسُ: باڵندەیەکە لەپێری (الصردیة)یەو ڕەنگی کەستەنائییە لەچۆلەکە گەورەترە، سەر گەورەو دەندوك گەورەیە، ڕەوشت شەڕانیو توندو تیژە، چۆلەکەو حەشەراتی بچوك نێچیر دەکا ۞ هەمیشە کلکی هەڵدەتەکێنێ، لە وڵاتانی ئەوروپا دەژیاو پایزانو بەهاران ڕەودەکا بۆ وڵاتی میسر ۞ النَّهاسُ: بەمانا (المِنهَسُ) دێ ۞ النَّهوسُ: گازندە گەزندە، هەر دڕندەیەك شت بگەزێ ۞ النَّهیسُ: گەزراو هەرشتێك سەگو مارو شتی وا گەستبێتی ۞ نَهَسَرَ اللَّحمَ: گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد ۞ بەدەم پچڕی، ڕایتەکاند ۞ نَهْسَرَ الطعامَ: بەهەڵپە خواردنەکەی خوارد ۞ النَّهْسَرُ: گورگ: پیاوی چوستو چالاك ۞ چلێسو هەڵپەکەر بۆ خواردنی گۆشت ۞.

**نَهَشَ** الشَّیْئَ نَهْشاً: قەپالی بەشتەکەدا کرد بۆئەوەی بیخوا ۞ بیگەزێ پێوەی بدا برینداری بکا ۞ نَهَشَتْ الحَیَّةُ فلاناً: مارەکە بە فلانکەسیەوە دا ۞ گەستی ۞ نَهَشَتِ المرأةُ وَجْهَها: ئافرەتەکە دەمو چاوی خۆی ڕنین لەکاتی بەڵاو کارەسات دا خۆی نەگرتو بەنینۆك دەمو چاوی ڕنینەوە.

**نَهَشَ** الکلبُ فلاناً: سەگەکە فلانکەسی گەست، دەشگوترێ: (نَهَشَهُ الدهر) ڕۆژگار جەڕاندیو خستیە حاڵەتی ئاتاجی.

**نَهَشَ** فلاناً أو عِرْضَهُ: غەیبەتی فلانکەسی کردو تانەی لێ دا ۞ نُهِشَتْ عَضُدُهُ: باسکی باریك بوو گۆشتی پێوە نەما ۞ إنْتَهَشَتْ عَضُدُهُ: باسكو قۆڵی باریكو بێ گۆشت بوون ۞ إنْتَهَشَ الشَّیْئَ: زۆری شتەکە گەستو لێکی هەڵپچڕی ۞ المُنْتَهِشَةُ: ئافرەتێك لەکاتی بەڵاو کارەسات دا ڕوخساری بڕنێ ۞ المَنْهوشُ: دالگۆشتو کزو لاواز ۞ ماندو و لەڕو لاوازە ۞ هو منهوش القدمین: ئەو قاچ ڕەقو تەقە ۞ النُّهاوِشُ: ستەمو ماف پێشێلکردن ۞ النَّهْشُ: کەمی گۆشتی ڕان، قونپوچەڵی ۞ دەگوترێ: (فلان نَهْشُ الیدین) فلانکەس دەستو مەچەك باریكو بێ گۆشتو دەست گەرمو گورجو گۆڵە ۞ هەروا دەگوترێ (رجل نَهْشٌ) پیاوێکی دالگۆشتو جەستە سوکە ۞ نَهْشَلَ فلان نَهْشَلَةً: فلانکەس پیرو کەنەفت بوو لەرزۆك بوو ۞ (فهو نَهْشَلٌ) ۞ سواری وڵاخی خوازڕاو بوو ۞ نَهْشَلَ الشَّیْئَ: شتەکەی بەتامەزرۆوە خوارد، وەکوو برسی لرفی دا ۞ نَهْشَلَ فلاناً: فلانکەسی گەستو کەلەپارچەی کرد ۞ النَّهْشَلُ: گورگ، بازو هەڵۆ ۞ النَّهْشَلَةُ: پیریو کەنەفتی.

**نَهَضَ** نهوضاً ونَهْضاً: ڕاپەڕی، بەناگاو وریاییەوە هەڵسایە سەرپاو ڕاپسکوت.

**نَهَضَ** له: بۆی ڕاپسکوتو پەلاماری دا ٥ (نَهَضَ الی العَدُوّ) ڕاپەڕی بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن.
**نَهَضَ** النَبْتُ: ڕوەکەکە ڕاست بۆوەو پێگەیی.
**نَهَضَ** الطائِرُ: باڵندەکە باڵی کردنەوە بۆئەوەی بفڕێ.
**نَهَضَ** فلاناً نَهْضاً: ستەمی لەفلانکەس کرد ٥ **أنْهَضَ الحيوانَ**: ئاژەڵەکەی ئامادەکردو خستیە سەر ئەوە بکەوێتە جوڵەو ڕابکا غاربدا ٥ **أنْهَضَ فلاناً للأمر**: فلانکەسی ئامادەکرد بۆکارەکەو خستیە ئەستۆی ٥ **أنْهَضَ فلاناً بالشيئ**: فلانکەسی بەهێزکردو ورەی پێدا بۆئەنجامدانی کارەکە ٥ **أنْهَضَ الريحُ السحابَ**: ڕەشەبایەکە هەورەکەی ڕاداو بردنی بۆ شوێنێکی تر ٥ **أنهَضَ القِربَةَ**: کوندەکەی پڕکرد یان نزیکی ئەوەی کرد پڕبێ ٥ **ناهَضَ فلاناً**: بەربەرەکانی فلانکەسی کرد، دژی وەستا ٥ **تناهَضَ القومُ**: هەر تاقمەو پێڕێك پەلەی کرد بۆئەوەی بەرەنگاری تاقمەکەی بەرامبەری بکا ٥ **إسْتَنْهَضَ فلاناً للأمر**: داوای لەفلانکەس کرد بەپەلە کارەکە ئەنجام بدا ٥ **النّاهِضُ**: بێچوی باڵندە: کەبتوانێ بفڕێ ٥ گۆشتی لای ژوروی قوڵو باسك ٥ دەگوترێ: (عامل ناهِضٌ) کرێکارێکە بەردەوامە لەسەر ئیشەکەیو بەبڕوای تەواو و سووربوونەوە کارەکەی ئەنجام دەدا ٥ (شباب ناهِض) گەنجێکی زیرەكو وریایە، گرنگی دەدا بەئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی ٥ **النّاهِضَةُ**: (ناهِضَةَ الرجل) خزمو کەسوکاری پیاو ٥ لەبراو باوكو برازاو ئامۆزا.... هەروا ئاوە بۆ دەستو پێوەندو کەسو کاری پیاو ٥ **النُّهاضُ**: خێراو بەپەلە ٥ **النَّهْضُ**: زەوی پتەو و شاخو داخ: کەڕێگای تێدا دروست بکرێ ٥ دەگوترێ: (سلکوا نِهاضَ الطرق) ڕێگای سەختو ناخۆشیان بڕی ٥ **النَّهْضَةُ**: هێزو توانا ٥ ڕاپەڕینو هەوڵدان بۆ پێشکەوتن لەبواری کۆمەلایەتیو بوارەکانی تری ژیان دا ٥ دەگوترێ: (کان مِن فلان نهضة الی کذا) جمو جوڵو هەوڵدانی باش هەبوو لەلایەن فلانەوە بۆ ئەو کارە ٥ **النَّهّاضُ**: کەسێك بەردەوام لەسەر ڕێبازی پێشکەوتنو بەدەستهێنانی سەروەری بێ ٥ دەشگوترێ: (مکان نَهّاض) شوێنێکی بەرزە ٥ **نَهَطَهُ بالرمح نَهْطاً**: بەڕمب لێی دا.
**نَهَفَ نَهْفاً**: سەرسام بوو.
**نَهَقَ الحِمارُ**: گوێدرێژەکەی زەڕی، زەڕاندی ٥ **تناهَقَت الحُمُرُ**: گوێدرێژەکان تێکڕا زەڕین ٥ یان بەشوێن یەکتردا زەڕاندیان ٥ **النّاهِقُ**: یەکێك لەو ئێسقانە دەرپەڕیوانەی ئاژەڵی سمدارە کە دەکەونە شوێنی ڕێڕەوی فرمێسکی ٥ ئەو شوێنەی لەقوڕگی گوێدرێژدا زەڕەی لێ دێتەدەر ٥ **النَّهَقُ**: گیایەکە لەپێڕی (الصليبية) درێژ دەبێتەوە گەڵای پانی هەیە، گوڵەکەی وەکوو گوڵی ڕوەکی کەرەوز وایە بەرەکەی خەردەلەو تۆوێکی وردی هەیە وەکوو تۆوی کەرەوز وایەو لەو وردترەو تامی تیژو دەبڕێ، ناوێکی تری هەیە پێی دەگوترێ: (جرجير) یان (أيهُقان).
**نَهَكَ** الأمرُ فلاناً نَهْكاً ونهاكَةً: کارەکە فلانی ماندو کردو بەسەریا زاڵ بوو ٥ دەگوترێ: (نَهَكَهُ العَمَلُ) ئیش کردن لەپەلو پۆی خست ٥ (نهکه الشرابُ) شەراب لەگڵو گۆی خست ٥ (نَهَكَتْهُ الحمى) لەرزوتا لەپەلوپۆی خست.
**نَهَكَ** الشيئَ: زێدەڕەوی کرد لەشتەکەدا، دەگوترێ: (نَهَكَ الطعامَ) زۆری لەخواردنەکە خوارد ٥

هەروا دەگوترێ: (نَهَكَ في الطعام) ◊ (ونهَكَ من الطعام).

**نَهَكَ الضَّرْعَ**: گوانەکەی زۆر داچۆڕاند، زۆری جەرمبابەدا.

**نَهَكَ عرضَ فلان**: زۆری جنێو و قسەی ناشیرین بەفلان گوتن.

**نَهُكَ الثوبَ**: قوماشەکەی لەبەر کرد تا ڕزاندی هەر لەبەری کرد.

**نَهُكَ نهاكَةً**: زێدەڕەوی کرد لەکۆکردنەوەی شت دا.

**نُهِكَ فلان**: فلانکەس کزو لاواز بوو، نەخۆشی لاوازی کرد.

**نُهِكَ بيتُ الشعر من بحر الرجز**: سێیەکی شیعرەکە لابرا، چەرت کرا ◊ **أنْهَكَهُ السلطان عقوبةً**: فەرمانڕەوا زێدەڕۆیی کرد لەسزادانی دا ◊ **إنْتَهَكَ**: بەمانا (نَهَكَ) دێ ◊ دەگوترێ: (إنْتَهَكَتْه الحمى) ◊ **إنْتَهَكَ عرضَ فلان**: زێدەڕەوی کرد لە جنێودان بەفلانکەسو قسەی ئابڕو بەری ناڕاستەکرد ◊ **إنْتَهَكَ الشَّيْءَ**: سوکایەتی بەشتەکە کرد ◊ **إنْتَهَكَ الحرماتِ أو المحرماتِ**: کاری ناشایستەو نەشیاوی ئەنجام داو سنوورە شەرعیەکانی بەزاندن ◊ **إنْتَهَكَ حرمةَ الله**: وادەو پەیمانی شکاند، سنورشکێنی کرد ◊ **المَنْهَكَةُ**: ئەو شتەی کە مرۆڤ هەڵدەنێ بۆ سنور بەزێنی ◊ دەگوترێ: (هذا منهكة للأعراض) ئەمە مرۆڤ هەڵدەنێ بۆ ناموس شکێنی.

**النَّاهِكُ**: زێدەڕۆ لەهەموو شتێك دا ◊ **النَّهْكُ**: زێدەڕۆیی کردن لە هەرشتێك دابێ ◊ جنێو و سوکایەتی پێکردن ◊ چەرتکردنو حەزفکردنی سێیەکی شیعرە لەبەحری ڕەجەز ◊ **النَّهْكَةُ**: شوێن دەستو ئاسەوارو پاشماوە ◊ دەگوترێ: (بدت فيه نَهْكَةُ المرض) دیاردەو ئاسەواری نەخۆشییەکەی لەسەر دەرکەوت کزو لاوازیی پێوەدیارە ◊ **النَّهوكُ**: ئازاو چاونەترس ◊ **النَّهيكُ**: توندڕەو زێدەڕۆ لە کۆکردنەوەی هەرشتێك دابێ ◊ ئازاو چاونەترس لەمئادەمیزادو گیانلەبەری تر ◊ شمشێری بڕندە ◊ دەگوترێ: (سيف نهيك) ◊ هەروا ناوە بۆ مرۆڤی ڕەوشت بەرز.

**نَهِلَ نَهَلاً ومَنْهَلاً**: یەکەم پێك، یەکەم قومە ئاو و شلەمەنی خواردەوە.

**نَهِلَ الشاربُ**: تینوەکە خواردیەوە تا تێراو بوو ◊ شەرابخۆرەوەکە تامڕ بوو خواردیەوە ◊ **أنْهَلَ دابَّتَهُ**: یەکەم وەجبە ئاوی دا بە وڵاخەکەی ◊ **أنْهَلَ زَرعَهُ**: یەکەم ئاودێریی کشتو کاڵەکەی کرد ◊ **أنْهَلَ العطشان**: تینوەکەی ئاودا تا تێراو بوو.

**أنْهَلَ فلاناً**: ڕقی فلانکەسی هەڵساند ◊ دەشگوترێ: (أنهلوا القنا من عدوهم) شمشێریان لەدوژمنەکانیان ئاودان، دوژمنیان لەخوێن دا گەوزاند ◊ **المِنْهال**: کەسێك زۆر وڵاخ ئاوبدا ◊ پیاوی سەخیو دەستو دڵ فراوان ◊ گۆڕ ◊ **المَنْهَلُ**: شوێنی ئاوخواردنەوەی ئاژەڵو وڵاخ ◊ دوێڵاو ◊ خانو کاروانسەرا کەلەچۆڵەوانی دا بێو کاروانچی بیکەنە قۆناغی خۆیان بۆ پشودانو شەو تێدا مانەوە، لەم ڕووەوە کەئاوی خواردنەوەی تێدا دەست دەکەوێ ◊ **النَّاهِلَةُ**: حوشترێك بێو بچێ بۆسەر دوێڵاو و شوێنی ئاو خواردنەوە ◊ دەشگوترێ: (إبل نواهل) حوشتری برسی ◊ **النَّهْلان**: ئاو خۆرەوە ◊ **النَّهْلَةُ**: دەگوترێ: (ما سُقِيَ إلا نِهلة) یەك جار ئاوی خواردەوە.

**نَهَمَ الأسَدُ والفيلُ نَهيماً:** شێرەکە نەڕاندی فیلەکە نەڕاندی ◊ **نَهَمَت القِدْرُ:** مەنجەڵەکە قڵپە قڵپی پێکەوت و کەوتە کوڵین.

**نَهَمَ فلان:** فلانکەس ترۆی کرد، دەنگی دا.

**نَهَمَ الدابة نَهْماً ونهيماً:** وڵاخەکەی دەنگ دا بۆئەوەی خێرا بڕوا.

**نَهِمَ في الشَّيْئِ نَهْماً ونهامَةً:** زۆری حەز لە شتەکە بوو تامەزرۆی بوو ◊ دەگوترێ: (نَهِمَ في الطعام ونَهِمَ في العلم فهو نَهِم ونهيم).

**نُهِمَ بالشيئ:** خوی بەشتەکەوە گرت ئالودەی بوو ◊ (فهو منهوم) ◊ **المِنهامُ:** وڵاغێك بەدەنگدان ڕاپەڕێ و بڕوا یان بگەڕێتەوە ◊ **المَنْهَمَةُ:** دێرو کەنیشتە، یان شوێنی کۆبونەوەی ڕەبەنەکان ◊ **المَنهوم:** کەسێك ئالوودەی شتێك بێ ◊ خو بەشتێکەوە بگرێ ◊ کەسێك مربێ لەخواردن و هەناسەی بۆ هەڵنەیەتەوە ◊ **النُهامُ:** ئاسنگەر، دارتاش ◊ قەلەڕەش ◊ **النُّهامِيُّ:** خاوەنی کەنیشتە ◊ **النَّهْمَةُ:** پێداویستی ◊ حەزکردن لەشتێك ◊ **النَّهّامُ:** ڕێگای ئاسان ◊ **نَهْنَهَ فلاناً عَنْ الشَّيْئِ:** فلانکەسی لەو شتە مەنع کردو دەری کرد ◊ **نَهْنَهَ الدابةَ:** دەنگی وڵاخەکەی دا بۆئەوەی بگەڕێتەوە، ئەوەی بۆی چوبوو وازی لێ بێنێ و نەیکا ◊ **نَهْنَهَ الثوبَ:** قوماشەکەی تەنك چنی ◊ **النَّهْنَهَ:** قوماشی تەنك چنراو.

**نَهُوَ الرجلُ نهاوَةً:** پیاوەکە گەیشتە ئەوپەڕی ئاقڵمەندی ◊ (فهو نَهِيٌّ).

**نَهِيَ الشَّيْئُ اليه نَهْياً:** شتەکەی گەیشتێ ◊ **نَهِيَ اليه المثلُ:** نمونەو میسالەکەی پێگەیی.

**نَهِيَ عَنْ الشَّيْئِ:** نەی لێ کرد لەشتەکە وتی، ئەو شتە مەکە.

**نَهِيَ اللهُ عَنْ كذا:** خودا نەی لەو شتە کردووەو حەرامی کردووە.

**نَهِيَ من الشَّيْئِ نَهيَ:** بەو شتەی لێی وەرگرت کیفایەتی کرد ◊ دەگوترێ: (نَهِيَ فلان من اللَّحم) فلانکەس لە گۆشتەکە تێرو تەسەل بوو ◊ **أنْهى فلان:** فلانکەس چووە شوێنێك ئاو لێیەوە نەڕوا ◊ چووە ناو زلکاوەوە ◊ **أنْهى من الشَّيْئِ:** ئەوەی لەشتەکە دەستی کەوت بەسی بوو ◊ دەگوترێ: (أنْهى فلان من اللحم) فلان لەخواردنی گۆشت مربوو ◊ **أنْهىَ عَنْ الشَّيْئِ:** وازی لەشتەکە هێنا ◊ **أنْهى الشَّيْئَ:** شتەکەی گەیاندە شوێنی خۆی ◊ **أنْهيتُ اليه الخَبرَ:** هەواڵەکەم پێگەیاند ◊ **نَهّى فلاناً عَنْ الشَّيْئِ:** فلانکەسی لە شتەکە مەنع کرد ◊ **إنْتَهى الشَّيْئُ:** شتەکە گەیشتە کۆتایی ◊ دەشگوترێ: (إنتهى اليه الخبرُ وإنتهى اليه المثل وإنتهى بنا المسير الى موضع كذا) ◊ **إنتهى عَنْ الشَّيْئِ:** وازی لەشتەکە هێنا ◊ دەگوترێ: (إنتهى العاصي) یاخی بووەکە وازی لە تاوان هێنا ◊ **تناهى الشَّيْئُ:** شتەکە گەیشتە کۆتایی ◊ دەگوترێ: (تناهي الخَطْبُ) کارەسات و بەڵاکە گەیشتە ئەوپەڕی ناخۆشی ◊ **تناهى الماءُ:** ئاوەکە لەزلکاوەکەدا وەستا ◊ **تناهى عَنْ الشَّيْئِ:** وازی لە شتەکە هێنا ◊ **تناهى القوم عَنْ المنكر:** خەڵکەکە هەندێکیان نەهیان لە هەندێکیان کرد کە کاری خراپە ئەنجام نەدەن ◊ **إستنهى فلاناً:** بەفلانکەسی گوت وازبێنە ◊ **إستنهى فلاناً من فلان:** فلانکەسی ڕاسپارد بەفلان بلێ: وازبێنێ ◊ **التَّنْهاءُ:** ئەو شوێنەی لەمبەرەوبەری شیو ئاوەکەی بگاتێ ◊ **التَّنْهاءُ:** ئەو شتەی بەری لافاوی پێ دەگیرێ لەگڵ و بەردو شتی وا ◊ **التَّنْهَيَةُ:** بەمانا (التَّنهاءُ) دێ ◊

**المَنهی**: ئەو کارو کردەوانەی نەهیان لێ دەکرێ ٥ **المَنهاةُ**: نامانج‌و ئاکام ٥ دەگوترێ: (الموت منهاة الناس) مردن سەرەنجامی هەموو کەسێکە ٥ (المنتهی) نامانج‌و ئاکام ٥ **الناهي**: تێرو تەسەل‌و تێرئاو ٥ دەگوترێ: (رجل ناهيك من رجل) پیاوێکە کیفایەتی تۆدەکاو پێویستت بەکەسی تر نییە ٥ **الناهیة**: دەگوترێ: (إمرأة ناهيتك من إمرأة) ئافرەتێکە گەیشتۆتە ئەوپەڕی ڕەنگژنی‌و پێویستت بەژنی تر نیە ٥ **النُّهاءُ**: ئاکامی شت ٥ کۆتایی‌و ئەوپەڕی شت ٥ دەگوترێ: (بَلَغَ الخَطْبُ نهاءَهُ) ناخۆشی‌و بەلایەکە گەیشتۆتە ئەوپەڕی ٥ **النَّهاءُ من النهار والماء**: بەرزبوونەوەی خۆر ڕۆیشتنی بەرەو ئاوابوون ٥ بەرزبوونەوەی ئاو ٥ ئەندازە ٥ دەگوترێ: (هم نِهاءَ مائة) ئەوانە ئەندازەی سەد دەبن ٥ بچوکترین بەنداوی ئاو ٥ **النُّهاءُ**: بەردێکی سپییە لەڕوخام نەرمترە، وەکوو تەباشیرو شتی وا وایە ٥ **النُّهاةُ**: میرو ٥ دەشگوترێ: (نفس نُهاة عَنْ الشَّئ) نەفسێکی نەهی کەرە لەو شتە ٥ **النِّهایةُ**: کۆتایی شت ٥ سنوری خانو ٥ عەقڵ‌و ئاوەز ٥ تەختەدار کەباروشتی وای دەخرێتە سەر بۆگواستنەوە بەناو ئاودا ٥ **النُّهُوُّ**: پێچەوانەی شت ٥ دەگوترێ: (هو نُهُوٌّ عَنْ المنكر) ئەو نەی دەکا لە خراپەکاری‌و فەرمان دەکا بەچاکە ٥ **النُّهَی**: کۆی (النُّهْيَة) بەمانا عەقڵ‌و ئاوەز دێ ٥ **النَّهْيُ**: داوای وازهێنان لەشت ٥ بەلای نەحوییەکانەوە بریتییە لە فەرمانکردن بەوازهێنان لەکارێک بەهۆی بەکارهێنانی پیتی (لا)و فیعلی موضاریعی مەجزوم ٥ **النَّهْيُ**: شوێنێک کەبەربەستی ئاوی هەبێ‌و نەهێڵێ ئاوەکەی سەرڕێژ بکا ٥ زلکاو و گەمراو ٥ **النَّهْيُ**: کەسێک بگاتە ئەوپەڕی ڕادروستی‌و بیرو بۆچونی ڕاستاڵ ٥ **النُّهْيَةُ**: کۆتایی شت‌و نیهایەتی ٥ ئەڵقەو گرێ‌و پانایەک لەسەر سنگ بێ نەهێڵێ حەبلەکەی داماڵدرێ ٥ عەقڵ‌و ئاوەز ٥ **النَّهِيُّ**: کەسێک لەقەڵەوی دا بگاتە ئەوپەڕی قەڵەوی ٥ دەگوترێ: (رجل نَهِيٌّ و أمرأةُ نَهِيَّةٌ) ٥ دەشگوترێ: (فلان نَهِيُّ فلان) فلانکەس نەی دەکا لەفلان‌و ناهێڵێ فلان کاربکا.

**نَاء النَّجْمُ نَوْءاً وتنواءً**: ئەستێرە لەخۆرئاوا ئاوا بوو لەهەمان کات دا لەخۆرهەڵات ئەستێرەیەکی تر هەڵات.

**نَاء بِحِمْلِه**: بەزەحمەت لەژێر بارەکەی دا ڕاست بۆوە ٥ یان بارەکەی قورس بوو نەیتوانی بەبارەکەیەوە بڕوا و کەوت.

**نَاء به الحِمْلُ**: کۆڵ‌و بارەکە گران بوو چەماندی ٥ بەزەحمەت بۆی هەڵگیرا ٥ دەشگوترێ: (ناء الحِمْلُ حامِلَهُ) بارەکە هەڵگرەکەی چەماندو ماندوی کرد ٥ **أناءت السَّماءُ**: ئاسمان هەور دایپۆشی ٥ **أناء فلاناً**: فلانکەسی ڕاپەڕاند ٥ **أناء الحِملُ حامِلَهُ**: بارو کۆڵەکە هەڵگرەکەی ماندو کرد ٥ **أنْوأتِ السَّماءُ**: ئاسمان هەور دایپۆشی ٥ **ناوَأَهُ**: شانازی بەسەردا کرد ٥ **إستناءَ النَجْمَ**: ئەستێرەکە ئاوابوو.

إستناءَ فلاناً: داوای بەخشش‌و یارمەتی فلانکەسی کرد ٥ **الأنْوَأُ**: شارەزاو لێزان لەکەش‌و هەوادا ٥ **النَّوْءُ**: دەگوترێ: (فلان نَوْءةُ متخاذل) فلانکەس ڕاپسانەکەی سست‌و تەمبەڵانەیە ٥ ئەستێرەکە بەرەو ئاوابوون دەڕوا ٥ بارانی بەخوڕەم‌و لێزمە ٥ بەخشش‌و عەطا.

**نَاب الشَّئ نَوْباً**: شتەکە نزیک بۆوە.

**نَاب الى الشَّئ**: گەڕایەوە بۆ شتەکە، خوی بە شتەکەوە گرت ٥ دەگوترێ: (ناب النحلُ الى

الخلايـــا) هــەروا دەگــوترێ: (نـــاب الى الله) گەڕایەوە بۆلای خوداو تۆبەی کرد.

**ناب عنه نيابة:** جۆوە جێگای ئەو و لەجیاتی ئەو کـاری کـرد ئـیش‌و کـاری هەڵسوڕاند ٥ بـۆوە نوێنەری ئەو ٥ **أناب فلان الى الشّيْ:** فلانکەس چەند جارێك بۆ شتەکە گەڕایەوە ٥ **أناب الى الله:** گەڕایەوە بۆلای خودا ٥ دەشگوترێ: (أتـاني فـلان فمـا أنَبْـتُ الیـه) فلانکـەس هـات بـۆلام پێشوازی خۆشەویستانەو گـەرمم لێ نـەکرد ٥ **أنــاب فلانــاً عنــه في كــذا:** فلانکەسـی کـرد بەنوێنـەرو جێگـری خۆی لەوشتەدا ٥ **ناوَبَهُ في الشّيْ والأمر:** هاوکاری‌و نۆبەی لەگەڵدا کـرد لەئیشەکەدا.

**نَوَّبَهُ:** نۆبەی خـۆی بـۆ دیـاری کـرد ٥ **إنتابَهُ أمْـرٌ:** کـارێکی گـەورەی لێ ڕودرا، بەڵایـەکی بۆهـات ٥ **تَــوَّبَ صــديقه:** جـار دواجـار چـو بـۆلای برادەرەکەی‌و سەردانی کرد ٥ دەگوترێ: (فـلان ینتابنـا) فلانکـەس سـەرمان لێ دەدا ٥ (الـسباعُ تنتـاب المَنْهَـلَ) دڕنـدە دەچـنە سـەر دوێـلاو و شـوێنی ئاوخواردنـەوەی ئاژەڵـەکان ٥ **تنــاوَبَ الأمْرَ:** چەند جارێك بەشوێن یەکدا ئـەوکارەی لە ئەستۆ گرت ٥ **تناوب القومُ الشّيْ:** خەڵکەکە بەنۆبـە شـتەکەیان لـەناو خۆیـان بـەش کـرد، هەموویان بەنۆرەو هەرکەسە بەئەندازەی خۆی هاوکاری دەکا ٥ دەگوترێ: (تناوبوا الماءَ، وتناوبوا العَمَـلَ) ٥ **تنـاوَبَ الهمـومُ فلانـاً:** بـەڵاو ناخۆشـی یـەك لـەدوای یـەك یەخـەیان گـرت ٥ **إسْـتَنَابَهُ:** کردیـە نوێنـەری خـۆی ٥ **المُنْتـابُ:** دیدەنیکەر، شتێکی موباح بەنۆرە ئەنجامی بـدەی ٥ **المُنيبُ:** بارانی زۆر ٥ **النائب:** جێگر، کەسێك لەشوێنی یـەکێکی تـر کـار ئـەنجام بـدا ٥ **النّائِبَــةُ:** بـەڵاو کارەسات ٥ دەگوترێ: (حُمىً نائبـة) لەرزوتایەکە هــەموو ڕۆژێ دەگەڕێتــەوە بـۆ نەخۆشــەکە ٥ **النُّوبَةُ:** نۆبە ٥ دەگوترێ: (جاءت نَوْبَتُـهُ) نـۆرەی هات ٥ بەڵاو کارەسات ٥ حاڵەتی نـاخۆش ئەشـاز ٥ بـەڵاو کارەسـات ٥ دەگـوترێ: (إعْتَرَتْــهُ نوبــة عصبية، أو نوبـة الجنـون) ماوەیـەکی توڕەبوونی بەسـەردا هـات، ماوەیـەکی شـێت بـوو ٥ هـەروا وشـەی (النوبـة) بـەمانا (هـەل‌و فرسـەت) دێ ٥ دەگوترێ: (اصـبح لانوبـة لـه) فرسـەت‌و هـەلی لەکیس چوون ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزادن ٥ **النُّوبَةُ:** بــەڵاو کارەســـات ٥ کۆمـــەڵێك ئـــادەمیزادن بەتاکەکـەیان دەگـوترێ: (نـوبيّ) (بـلاد النُّوبَــةُ) زێدونیـشتمانی ئـەو تاقمـە ئادەمیزادەیـە کـە دەکەوێتــە بەشــی باشــوری میــصر ٥ **النِّيابَــةُ:** دەستـەیەکی دادوەرییـە لـەجیاتی ستـەم لێکراو داوا لەســـەر ســـتەمکارو تاوانبــارو تۆمـــەتبار دەخاتە ڕو خۆبەخشانە دەبێتە خاوەن داوا.

**نــات** نوْتــاً: لارە لاری بــوو لەبــەربێ هێــزی یــان بـــەهۆی وەنــــەوزەوە ٥ **النُّوتَـــةُ:** دەفتــــەری تێبینییــەکان؛ دەفتەرۆکێکـە مــرۆڤ هەنــدێ تێبینـی‌و وردە حیـسابی تێـدا تۆمـار دەکـا ٥ **النُّوتي:** کەشتیەوان کە لـەناو دەریـادا کاروبـاری کەشتییەکە بەڕێوە دەبا.

**ناح** نَوْحاً: کردەوەکـەی خـۆی نیشانی خـەڵك دا ٥ **النَّوْجة:** گێژەڵۆکە ٥ **ناحت الحَمَامَةُ نَوْحاً:** کۆترەکە خوێندی ٥ **ناحت المرأةُ على الميت:** ئافرەتەکە شین‌و شـەپۆڕی لەسـەر مردووەکە گێـڕاو وایـە شێرەو واوەیلای بۆ کردو بەسۆزەوە بۆی گریا ٥ **ناوَحَـهُ:** بەرامبـەری وەسـتا ٥ دەگـوترێ: (دارُهُ تنـاوِح داري) خانوەکـەی بەرامبـەر خانوەکـەی منـە ٥ **تنـاوح الـشّينان:** دووشـتەکە بەرامبـەر یەکتر بوون ٥ **تناوَحَ الرياحُ:** ڕەشەبایەکە بـەهێز بـوو ٥ بایەکـە دەمێـك سـەبابوو، چـەلێك بـای

دەبــور بــوو، کــاتێکیش بــای شــەماڵ بــوو، وەختێکیش بای جەنوب بوو ◊ **تَنَوَّحَ الشَّيْءُ**: شتەکە جوڵایەوەو شۆڕبۆوە ◊ **إسْتَناحَ فلان**: فلانکەس هێندە بەسۆز گریا کەسانی تری هێنایە گریان ◊ **إستناحَ الذِئبُ**: گورگەکە لوراندی ◊ **إستناحَ فلاناً**: فلانکەسی گریاند ◊ **المَناحة**: شین‌و شەپۆڕ ◊ شوێنی واوەیلاو شین‌و شەپۆڕ ◊ دەگوترێ: (كنا في مناحة فلان) ◊ هەروا ناوە بۆ دیمەنێك ئافرەت کۆببنەوەو بەسۆز شین‌و شەپۆڕ بگێڕن ◊ **النَّوَّاحُ**: کەسێك زۆر شین‌و شەپۆڕ بگێڕێ ◊ بۆ مێینە دەگوترێ: (نَوَّاحة).

**أناخَ بالمكان**: لەشوێنەکە مایەوە ◊ **أناخَ به البلاءُ والشَّرُّ**: بەڵاو ژێردەستەیی یەخەی گرتووەو لەکۆڵی نابێتەوە ◊ **أناخَ الجَمَلَ**: حوشترەکەی پیخ دا ◊ دەشگوترێ: (أناخ بفلان حاجته) هانای بۆ فلانکەس برد پێداویستییەکانی بۆ جێبەجێ بکا ◊ **نَوَّخَ البعيرَ**: حوشترەکەی پیخ دا ◊ دەشگوترێ: (نَوَّخَ اللهُ الأرضَ طروقة للماء) خودا زەوی وای کردووە توانای ئەو هەموو ئاوەی هەبێ ◊ **تَنَوَّخَ الجَمَلُ**: حوشترەکە پیخی خوارد (پاڵکەوت) ◊ **تَنَوَّخَ الجملُ الناقة**: حوشترە نێرەکە مێینەکەی کەڵ دا ◊ **إسْتَناخَ**: پیخی خوارد ◊ **المُناخُ**: شوێنی پیخدانی حوشتر (ئاغەڵە حوشتر) ◊ شوێنی مانەوە ◊ دەگوترێ: (هذا مناخ سوء) ئەمە شوێنێکی خراپە بۆ تێدا مانەوە ◊ بەکەڵکی نیشتەجێ بوون نایە ◊ **مناخ البلاد**: باری کەش‌و هەوای وڵات ◊ **النائخة**: زەوی دوور ◊ **النَّوْخَةُ**: مانەوەو نیشتەجێ بوون.

**نادَ نَوْداً**: لەبەر خەوهاتن‌و هەنۆز بردن لارەلاریەتی.

**نادَ فلان**: فلانکەس سەری باداو شانی هەڵتەکاند.

**تَنَوَّدَ الغُصْنُ**: لقەدرەختەکە شەکایەوە، هەژا، ڕاژا ◊ **نَوْداً**: بڕوانە مادەی (نَدَأ) ◊ **نَوْدَلَ**: بڕوانە مادەی (نَدَلَ).

**نارَ نَوْراً**: ڕوناکی کردەوە، لەئاسۆدەرکەوت، جوان بوو ◊ **نارت الفِتْنَة**: فیتنەو ئاشوب بەرپابوو

**نار فلان**: فلانکەس تێ شکا، هەڵات ◊ **نارت المرأة من الشيب**: ئافرەت لەترسی پیریی هەڵهات خۆ لەپیری دەشارێتەوە.

**نار فلان**: فلانکەس قاچاندی، هەڵات.

**نار الشَّيْءَ**: نیشانەی تایبەتی لەسەر شتەکە دانا ◊ دەگوترێ: (نار السلعة) ئارمی تایبەتی خستە سەر کاڵاکە ◊ (نار النار من بعيد) ئاگرەکە لەدوورەوە بیندرا ◊ (نار فلاناً) فلانکەسی ترساند ◊ **أنارَ**: ڕوناکی کردەوە ◊ دەگوترێ: (أنار الشجرُ) درەختەکە پشکوت‌و گوڵی کرد ◊ گوڵەکانی دەرکەوتن ◊ دەشگوترێ: (أنار النباتُ) ڕووەکەکە ڕواو گەشەی کردو خۆی ئارایش دا ◊ **أنارَ فلان**: فلانکەس ڕوخساری گەشایەوەو ڕەنگی جوان بوو ◊ **أنار المكانَ**: شوێنەکەی ڕوناك کردەوە ◊ **أنارَ الأمرَ**: کارەکەی ڕونکردەوەو ئاشکرای کرد ◊ **أنار الظبيَ**: ئاسکەکەی تەمراند ◊ **ناوَر فلاناً**: جنێوی بەفلان دا ◊ **نَوَّرَ**: ڕوناکی دا، ڕوناکی کردەوە ◊ دەگوترێ: (نَوَّرَ المكانُ) شوێنەکە ڕوناك بوو ◊ **نَوَّرَ الصُّبْحُ**: بەیانی گزنگی داو ڕوناك بوو ڕوناکایی بەیانی لەئاسۆ دەرکەوت ◊ **نَوَّرَ الشَّجَرُ**: درەختەکە گوڵی کرد ◊ **نَوَّرَ النباتُ**: ڕووەکەکە پێگەیی‌و دەرکەوت ◊ **نَوَّرَ الثَّمَرُ**: میوەکە دەنکی تێدا خولقا ◊ **نَوَّرَ على فلان**: فلانکەسی شارەزا کردو کارێکی بۆ ڕون کردەوە ◊ سەری لێ شێواندو چەواشەکاریی لەگەڵ دا ئەنجام دا ◊

نَوَّرَ المصباحَ: چراكەی هەڵكرد ◊ نَوَّرَ الأمرَ: كارەكەی ئاشكرا كرد، ڕونی كردەوە ◊ نَوَّرَ اللهُ قلبه: خودا فڵانكەسی شارەزا كرد بۆحەقو هیدایەتی دا ◊ نَوَّرَ الجِلدَ: پێستەكەی بەدارو سواخ دا ◊ داروی لە پێستەكە هەڵسو ◊ تَنَوَّرَ النّارَ: لەئاگرەكە ورد بۆوە، شوێنی پێ دەرخستنو كونو كەلەبەری پێ دۆزینەوە ◊ چوو بۆلای ئاگرەكە ◊ تَنَوَّرَ الرجلَ: سەیری پیاوەكەی كرد، كە ڕوناكی ئاگر لێی دابوو بەڵام پیاوەكە ئەمی نەبینی ◊ إسْتنارَ: ڕوناكی دا، دەگوترێ: (إستنارَ الشعب): گەلو نەتەوە ڕۆشنبیربوون ◊ إستنارَ بە: ڕوناكایی لێ وەرگرت ◊ إستنارَ عَلَيه: بەسەری دا زاڵ بوو زەفەری پێ برد ◊ الأنور: (إسم تفضيل) بەمانا لەو ڕوناكترە، ئاشكراترە.

التنويرُ: كاتی كازیوەی بەرەبەیان دەگوترێ: (صلي الصبحَ في التنوير) لەكاتی ڕوناكبوونی كازیوەی بەیان دا نوێژی بەیانی كرد ◊ المنار: شوێنی ڕوناكی ◊ نیشانەیەكە دادەنرێ لەنێوان دوو زەویو شتی وادا بۆ جیاكردنەوەی سنورەكانیان ◊ نیشانەو عەلامەتی ڕێگا ◊ المناورة: بروانە مادەی (مناورة) لەپیتی (میم)دا ◊ المنارة: مۆمی داگیرساو ◊ منارەی مزگەوتو شتی وا ◊ ئەو نیشانانەی لەبەندەرەكان دا دادەنرێ بۆ شارەزاییكردنی كەشتی و ڕێبوارانی ناو دەریا ◊ المُنَوَّرُ: پەنجەرەو دەلاقەی بچوك كە ڕوناكییان لێ بێتە ناو خانو و شتی واوە ◊ بەتاڵاییەكە لەقەراخ خانوو یان لەهەڵاشو سەقفی دا دەهێڵدرێتەوە بۆئەوەی ڕوناكایی بدا بەژورەكانو هەوایان لێوە هاتوچۆ بكا ◊ المنير: تیشك هاوێژ، ڕوناكیدەر ◊ ئاشكراو ڕون ◊ النائر: بەمانا (المنير) دێ ◊ النائِرَةُ: بەمانا (المنيرة) دێ ◊ دوژمنایەتیو كینەو ڕقی ناوسینە ◊ دەشگوترێ: (أطفأ نائرة الحرب) شەڕو ئاگری شەڕی كوژاندەوە.

النّارُ: ئاگر: عونصورێكی كاریگەرە، ڕوناكایی و گەرمیو بڵێسەی هەیە ◊ دەشگوترێ: (إستضاء بنارە) ڕاو بۆچونی ئەوی وەرگرتو پەیڕەوی كرد ◊ هەروا دەگوترێ: (أوقد نار الحرب) شەڕی هەڵگیرساندو ئاگری شەڕی خۆشكرد ◊ النَّوارُ: ئافرەتێك خۆ لە شوێنی گوماناویو كاری گوماناوی بپارێزێ ◊ النورانية: بەمانا (النور) دێ ◊ النَّوْرُ: گوڵی سپی ◊ النُّورُ: ڕوناكاییو ڕۆشنایی پرشنگ ◊ ئەوەی شت بەدیار دەخاو وایان لێ دەكا چاو بیان بینێ ◊ قەدو باڵای جوانی ڕوەك و درێژی ◊

النَّوَرُ: خەرِاتو دۆم بروانە مادەی (غَجَر) ◊ النُّورَةُ: نیشانە ◊ بەردی كلسی ◊ بەردە تسنە ◊ تێكەڵەیەك لەخوێی كالیسیۆمو باریۆن كە دەكرێنە دەرمانی موو لابردنو شتی وا ◊ النُّوَّارُ: گوڵ ◊ تاكەكەی (نوّارة) ◊ النَّوُور من النساء: ئافرەتی سرك و خۆپارێز لەشوێنی گوماناوی، كاری گوماناوی ◊ هەروا ناوە بۆ ئەو بەزو پیوو دەرمانەی خاڵی كوتراوی پێ سەوز دەكرێ ◊ دوكەڵی پیو ◊ النَّيِّرُ: ڕوناككەرەوە ◊ ڕوخساری جوانو گەشەدار.

نَوْرَجَ: پاشو پێشی كرد، دەمێك بۆ دواوەو دەمێك بۆ پێشەوە ◊ (نَوْرَجَ في الكلام) لە قسەكردنەكەی دا مینگە مینگی كردو شتەكەی ڕون نەكردەوە ◊ النَّوْرَجُ: جەنجەڕ (ئامێری كرشە گێرەكردن بۆ كردنی بەكاو دوایی جیاكردنەوەی دانەوێڵەكە لەكایەكە بەهۆی شەنەو شتی وا) ◊ نَوْرَزَ: كەوتە مانگی نەورۆزەوە ◊ ئاهەنگی جەژنی نەورۆزی گێڕا ◊

نَـوْرَزَ فلانـاً: ديـاريى جـەژنى نـەورۆزى بـۆ فلانكـەس نـارد ◊ **النَّـوْروزُ** (يـان) **الـنيروز**: رۆژى نـوێ، يەكـەم رۆژى سـاڵى خـۆرى ئێرانـىو كوردييە: كەرێكەوتى بيستو يەكى مانگى ئازار دەكـاو سـەرەتاى وەرزى بـەهارە ◊ پيرەمێـرد دەڵێ:

**ئەم رۆژى ساڵى تازەيە نەورۆزە هاتەوە**

**جەژنێكى كۆنى كوردە بەخۆشىو بەهاتەوە.**

**نـاسَ الـشَّيْئُ** نوسـاً ونوسـاناً: شـتەكە كەوتـە لەرينەوەو جمەو جۆڵو هاتو چۆ ◊ دەگوترێ: (ناست الذؤابة) لكى مێزەرەكە لەريەوە ◊ (نـاس الغـصنُ الـدقيق) لقـە باريكەكـەى درختەكـە لەريەوە ◊ (القُرْطُ ينوس في الأذن) گوارە لـەگوى دا دەلەرێتـەوە. ◊ **نـاس الإبـلَ**: حوشـترەكەى لێخـوڕى ◊ **أناسَـهُ**: خـستيە جـمو جـۆڵ ◊ لەراندييەوە ◊ **نَوَّسَ التَّمْر**: خورماكە لايەكى رەش بوو ◊ **نَوَّسَ بالمكان**: لەشوێنەكە مايەوە ◊ **تَنَـوَّسَ الـشَّيْئُ**: بـەمانا (نـاسَ) دێ ◊ دەگوترێ: (تَنَـوَّسَ الغـصْنُ الـدقيق) لقـە باريكـەكانى درەختەكـە لەرينەوە ◊ **النَّاسُ**: ئادەميزاد، گرۆهى ئادەميزاد ◊ وادەبێ مەبەسـت لـەو وشـەيە ئـادەميزادى عاقڵو رێـزدارە ◊ **النَّـاووسُ**: صندوقێكە لـەدارو تەختـە دروسـت دەكرێ مەسـيحيەكان مـردوى تێدەخـەن ◊ هـەروەها نـاوە بـۆ گۆرسـتانى مەسيحيەكان ◊ **النُّـواسُ**: ئـەوەى هەڵدەواسرێو شـۆڕدەبێتەوە لەشـێوەى داوە دەزو و شـتى وا لەهەلاَشـەوە بـەهۆى دوكـەڵى ناوماڵـەوە ◊ دەگـوترێ: (أزِلْ نـواس الـدخان) رِيـشۆڵە شـۆڕبۆوەكانى هەلاَشـەكە لابـەرە ◊ **نـواس العنكبـوت**: تـەونى جاڵجاڵۆكـە ◊ **النَّواسِـيُّ**: لەرزۆكو شلو شێواو.

**ناش فلان نَوْشاً**: فلانكەس رۆيشت ◊ پەلەى كرد لە راپەرين دا خێرا راپسكوت.

**ناش بالشيئ**: بەيوست بوو بەشتەكەوە.

**ناش الشَّيْئَ**: داواى شتەكەى كرد ◊ هەڵى گرتو بردى، دەگوترێ: (ناشە بيـدە) بەدەستى هەڵى گرت، دەستى دايە.

**ناش فلاناً**: بەسەرو ريشى ئاماژەى بۆ كرد، سەرى بۆ بادا ريشى بۆ هەڵتەكاند.

**نـاش فلانـاً بالـشيئ**: شـتەكەى دا بـەفلان يـان فلانكەسـى بەشـتەكە هـەنگاوت ◊ شـتەكەى لەفلانكەس دا ◊ **ناوَشَ الشَّيْئَ**: شتەكەى تێكەڵاو كرد ◊ **ناوش فلاناً**: پـێش ئـەوەى شـەڕى لەگـەڵ بكـا هێـزى فلانكەسـى بـەتاقى كـردەوە ◊ دەگـوترێ: (ناوشـت االعـدوَّ مقدمـةُ الجـيش) پێـشەتاى سـوپاكە لەگـەڵ دوژمـن دا كەوتـە شـەڕەوە ◊ **إنتـاشَ الـشَّيْئَ**: شتەكەى بـەگورجى هەڵگرت ◊ دەرى هێنا رزگارى كرد ◊ دەگوترێ: (إنتاشني فلان من الهلكة) فلانكـەس لەتێداچـون رزگارى كردم ◊ **تناوش القومُ في القتال**: خەڵكەكە دوراودوور هەنـدێك تەقـەيان لەيـەكتر كـردو لەيەك نزيك نەبوونەوە ◊ **تَنَوَّشَ يـده بالمنـديل**: بەدەستەسرِ دەستى سريەوە بۆئەوەى چەورىو شتى واى پێوە نەمێنێ ◊ **النُّووش**: بەهێز.

**ناصَ نَوْصاً ونَوَصاناً**: هەڵساو رايكرد، جولايـەوەو هەلات.

**ناص الفرسُ**: ئەسپەكە چەموشانە سەرى هەڵبڕى ◊ دەگوترێ: (فـلان مـا يقـدر علـى أن ينـوصَ) فلانكەس ناتوانێ پەلامارى شتێك بدا.

**نـاص عَـنْ الأمـر أو عَـنْ زميلـه**: لەكارەكـەى يـان لەبرادەرەكـەى دواكـەوت.

**ناصَ** للحركة: خۆی ئامادە کرد بۆ ڕۆیشتن.

**ناصَ** إليه: بۆی ڕاپەڕی ٥ پەنای بۆ برد.

**ناصَ** الشَّيْءَ: شتەکەی ڕاتەکاند هەوڵی بۆ شتەکە دا.٥ **ناصَ** فلاناً: پێش فلانکەس کەوت ٥ **أناصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ویستو هەوڵی بۆ دا ٥ بەرێوەی برد ٥ **أناصَ الوَتَدَ**: سینگەکەی لەقاندو بای دا بۆئەوەی دەری بێنێ ٥ **ناوَصَهُ**: ڕاکێشی کرد، بۆلای خۆی هێنای ٥ **إنْتاصَت الشَّمْسُ**: خۆر ئاوابوو ٥ **إنْتَاصَ الفَرَسُ**: ئەسپەکە کەوتە جمو جۆڵ ٥ **إنْتَاصَ فلان**: فلانکەس سەری بۆلەقاند ٥ **إنْتَاصَ عنه**: لێی دواکەوت ٥ **إنْتَاصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی جولاند ٥ **إنْتَاصَ فلاناً**: فلانکەسی خستە گەڕ چووە ژێر باڵیەوە بۆئەوەی کاری پێویستی خۆی ئەنجام بدا ٥ **المَناصُ**: پەناو پەناگە ٥ **النَّوْصُ**: کەرەکێوی ٥ ئەم ڕوەوە هەمیشە ئەم حەیوانە سەری هەڵبڕیوە ٥ **النَّويصُ**: هێزو توانا لەسەر جمو جوڵو ڕاپسکان ٥ دەگوترێ: (ما به نويص) جوڵەی تێدا نیە ٥ ناتوانێ بجوڵێ.

**ناضَ** الشَّيْءُ نَوْضاً: شتەکە جولایەوە، لەرییەوە.

**ناضَ** فلان: فلانکەس بەناو وڵات دا گەڕا ٥ دواکەوتو بەمراز نەگەیشت ٥ بۆ دواوە گەڕایەوە.

**ناضَ الشَّيْءَ**: هەوڵی دا شتەکە دەربێنێ ٥ **أناضَ النخْلُ إناضةً**: دارخورماکە بەرەکەی پێگەیی ٥ **أناضَ فلان**: فلانکەس چاوی لێ سور هەڵگەڕابوونو نەزانیو ڕقو کینەی لێ دەباری ٥ **نَوَّضَ الثوبَ بالصبغ**: قوماشەکەی بۆیەکرد ٥ ڕەنگی کرد ٥ **النَّوْضُ**: شوێنی بەرزایی، تەپۆلکە، پلوسلی ئاو، شوێنی لێ هەڵڕژانی ئاو ٥ شیو و دۆڵ.

**ناطَ الشَّيْءَ** بغيره وعليه نوطاً: شتەکەی بەشتێکی ترەوە هەڵواسی ٥ دەگوترێ: (ناط القِرْبَة بنياطها) کوندەکەی بە سینگو پەتەکانی خۆی هەڵواسی ٥ (ناط الأمرَ بفلان) کارەکەی خستە ئەستۆی فلانکەس.

**نيط الحيوان**: ئاژەڵەکە توشی نەخۆشی ملەخڕەو سنگە ئەستورە بوو ٥ **أناطَ الحيوانُ**: ئاژەڵەکە توشی نەخۆشی ملەخڕەو شتی وا بوو ٥ **أناط الشَّيْءَ به وعليه**: شتەکەی هەڵواسی ٥ پیاکرد ٥ **نَوَّطَ**: دەگوترێ: (نَوَّطَ الروحَ) تەمبەڵی کرد خەریك بوو لەخەفەتانی گیان دەرچێ ٥ **إنتاطت المسافَةُ**: مەسافەکە دوورکەوتەوە ٥ **إنتاطت به**: خۆی پێوە هەڵواسی ٥ **إنتاط الأمْرَ**: کارەکەی بەرای خۆی بڕیەوە نەك بەڕاوێژ ٥ **التَّنْواط**: ئەو گۆزو گوڵینکەی بەکەژاوەدا دەکرێن بۆ ڕازاندنەوەی ٥ **المَناطُ**: شوێنی شت هەڵواسین ٥ دەگوترێ: (هو مني مناط الثريا) نێوان منو ئەو بەئەندازەی نێوان منو شوێنی هەڵواسینی ئەستێرەی سیومیلە ٥ (فلان مناط الثريا) فلانکەس لەشوێنی ئەستێرەی سیومیلەو کەس دەستی نایگاتێ، بەرزو بەڕێزو خانەدانە ٥ **مناط الحكم**: بەلای زانایانی ئوصولی فیقهەوە عیلەتو بایسی حوکمەکەیە ٥ دەگوترێ: (مناط الحكم بتحريم الخمر هو الأسكار) عیلەتی بڕیاردان بەحەرامی مەیو بادە ئەوەیە سەرخۆش دەکا ٥ **المنوط**: کەسێك توشی نەخۆشی ملە خڕە ببێ ٥ دەشگوترێ: (هو منوط بالقوم) ئەو کابرایە خۆی هەڵواسیوە بەو هۆزەوەو لەوان نیە ٥ غەوارەو بێگانەیە لەناویان دا ٥ **النّائِط**: ڕەگی ناوەوەی پشت ٥ **النائطة**: چلێدانە ٥ **النَّوْطُ**: سەربار؛ ئەوەی دەخرێتە سەر دوو تابارەکان ٥ هەرشتێك

پەیوەندی بەشتێکەوە بێ ٥ ویسامو ڕێزلێنانی ئازایەتی، ئاشتیخوازی، زانستی .....هتد ٥ دەگوترێ: (مُنِحَ فلان نَوْط الجدارة) فلانکەس شارەی لێهاتویی پێدرا ٥ زەمیلەیەکی بچوکە خورمای تێدەکرێ ٥ ڕەگە دەمارێکی ئەستوورە لەسیو جەگەرەوە درێژدەبێتەوەو پەیوەستە بەدڵەوە ٥ ئێسقانێکی بچوکە لەخوار سێبەندەوەیە پێی دەگوترێ: (کلێجە) ٥ **النَّوْطَةُ:** چڵێدانە، هاوساوییەکە لەسینگ دا یان لەگەردن دا یان غودەیەکە لەگەدەداو کوشندەیە ٥ ئەو شوێنەی ئاو نایگاتێ زەوییەك: درەختی تەڵحو تەرفای تێدابێ ٥ ڕقو کینە ٥ **النِّیاط:** ئەوەی شتی پێدا هەڵدەواسرێ ٥ ڕەگێکە سیو دڵ پێکەوە دەبەستێ ٥ دەشگوترێ: (مفازة بعیدة النیاط) سارایەکی پانو پۆرو درێژە برانەوەی نیە ٥ **النَّیطُ:** بیرێکە ئاو لە قەراخەکانیەوە دێتە ناویەوە لەبنکییەوە هەڵناقوڵێ.

**ناعَ:** لەرییەوە ئەملاو ئەولای کرد ٥ ڕاژا ٥ دەگوترێ: (ناعَ الغُصنُ) لقەدرەختەکە ڕاژا ٥ **ناعت العُقابُ:** هەڵۆکە خۆی خوارکردەوە بۆئەوەی پەلاماری نێچیرەکەی بدا.

**ناعَ الشَّیئَ:** شتەکەی جوڵاندو خستیە گەڕ ٥ **نَوَّعت الریحُ الغُصنَ:** بایەکە لقەدرەختەکەی ڕاژاند ٥ **نَوَّعَ فلان الشَّیئَ:** فلانکەس شتەکەی داهێشتەخوارو وازی لێ هێنا بۆئەوەی بۆخۆی بلەرێتەوە ٥ **نَوَّعَ الأشیاء:** شتەکانی ڕیزبەند کردو لێکی جیاکردنەوەو کردنیە جۆرجۆر ٥ **تَنَوَّعَ الشَّیئُ:** شتەکە جولایەوەو هەژا ٥ ڕاژا.

**تَنَوَّع الغُصنُ:** لقەدرختەکە ڕاژا ٥ **تَنَوَّعَ الناعِسُ علی الرَّحلِ:** وەنەوز لێهاتووەکە بەسەر بارو بارگنەکەوە لۆژە لۆژی بوو ٥ **تَنَوَّع الصَّبِيُّ في الأرجوحة:** منداڵەکە لەناو جۆلانەکەیدا ڕاژا ٥ **تَنَوَّعت الأشیاءُ:** شتەکان لێك جیاکرانەوەو ڕیزبەندکران ٥ **إستناعَ:** دەستی کرد بە جموجوڵو ڕاژان ٥ **إستناعَ الغُصنُ:** لقەدرەختەکە ڕاژا ٥ **إستناعَ الشَّیئَ:** شتەکە درێژ بۆوە ٥ **إستناعَ في السیر:** لەڕۆیشتن دا پێشکەوت ٥ **المنواع:** شێوازو ئوسلوب ٥ **النائِعُ:** تینو ٥ کەسێك لەبرسان لۆژەی بێ، لاکەی بێ ٥ **النَّوعُ:** جۆر لەهەرشتێك بێ ٥ لەزاراوەی زانا مەنتیقیەکان دا وشەیەکی ڕەهایەو بۆ تاقەکەسێك یان بۆ چەند کەسێك دەگوترێ کەلەبناغەو سروشت دا یەك بنو لەوەڵامی پرسیاری (ماهو)دا دەگوترێ: (زید ماهو؟) وەڵامەکەی (إنسانٌ) (زید وعمر وبکر ماهم؟) وەڵامەکەی (إنسانٌ) ٥ **النَّوعُ:** دەگوترێ: (رماه الله بالجوع والنَّوع) واتە: دەکرێتە ناوەڵناوی (الجوع) ٥ **النَّوْعَةُ:** میوەی تەڕو تازە.

**نافَ الشَّيْئُ نوفاً:** شتەکە بەرز بۆوە.

**نافَ الضَّبُعَ:** کەمتیارەکە هەڵمەتی برد.

**نافَ عَلَیهِ:** بەسەریا ڕوانی ٥ **نافَ الرضیعُ الثدیَ:** منداڵەکە مەمەکەی مژی ٥ **أنافَ الشَّيْئُ:** شتەکە بەرز بۆوە ٥ **أناف العدد:** ژمارەکە لەدەیانو سەدان تێپەڕی ٥ **أناف عَلَیهِ:** بەسەریدا ڕوانی ٥ **نَیَّفَ عَلَیهِ:** لێی زیاد کرد ٥ **نَیَّفَ فلان علی السنین:** فلانکەس لەشەست تێپەڕی ٥ **المُنافُ:** بەرزو بڵندو سەخت ٥ دەگوترێ: (جبل عالي المناف) کێوێکی زۆر بڵندو سەختە ٥ **المنیفُ:** ئەوەی لەبەرزاییەوە بەسەر شتی تردا بڕوانێ ٥ **عِزٌّ منیف:** زۆر بەرزو بڵند ٥ **قصر منیف:** باڵەخانەی زۆر بەرز.

المنيفة: دەگوترێ: (إمرأة منيفة) ئافرەتێکی باڵا بەرزو شۆخ و شەنگە ◊ **النَّوفُ**: دەنگ ◊ بنی کلك ◊ دوگی بەرزی حوشتر ◊ **النِّیافُ**: شتی زۆر بەرز ◊ دەگوترێ: (قصر نیاف) و (فلاة نیاف) و (إمرأة نیاف) ◊ باڵەخانەی بەرز، سارای درێژو دوور، ئافرەتی باڵابەرزو جوان ◊ **النَّیِّفُ**: زیاد لەشت، زیادە بەسەر یەکێکی تردا، دەگوترێ: (هذا الجبل نَیِّف علی ذاك) ئەم کێوە لەو کێوە بەرزترە ◊ زیادە لەگرێی ژمارەکان واتە: زیادە لە دەیان و سەدان ◊ دەگوترێ: (عشرة ونَیِّف ومائة ونَیِّف) ◊ وشەی (نَیِّف) دەبێ لەدوای وشەی (عشرة) (عشرون)و ئەو شتانەوە بگوترێ ◊ **النَّیِّفة**: نێوان خانەی ژمارەکان (نێوان گرێ ژمارەکان) دەگوترێ: (إمرأة نیفة) ئافرەتێکی باڵابەرزو شۆخ و شەنگە.

**نـاق نَوْقـاً**: (نَقَی الشحم من اللحم) بەزەکەی لەگۆشتەکە جیاکردەوە.

**نَوِقَ نَوَقاً**: ڕەنگی سپی بوو کەمێك سورایی تێدا بوو.

**نَوَّقَ الحیوانَ**: گیانلەبەرەکەی ڕام کرد، ژێرباری کرد ◊ دەگوترێ: (نَوَّقَ البعیرَ) حوشترەکەی ژێربار کرد.

**نَوَّقَ الناقةَ**: حوشترەکەی فێری ڕۆیشتن کرد ◊ **نَوَّقَ النخلة**: دارخورماکەی موتوربە (تەلقیح) کرد ◊ **نَوَّقَ الشَّیْئَ**: شتەکەی ڕێز کرد، ڕێکی کرد ◊ کوتایەوەو تەختی کرد ◊ **إنتاق في أموره**: زۆر بەباشی کارەکانی ئەنجام دا، هەوڵی دا باش جێبەجێیان بکا ◊ **إنتاق الشَّیْئَ**: شتەکەی هەڵبژارد ◊ **تَنَوَّقَ فیه**: زێدەڕەوی کرد لەباش بەجێهێنانی شتەکە ◊ دەگوترێ: (تنوق في منطقه وتَنَوَّقَ في مَلْبسه) هەوڵی دا بەجوانی قسەکانی بکا، زێدەڕەوی کرد لەپۆشاك لەبەرکردن دا ◊ **إستنوق الجَمَلُ**: حوشترە نێرە چەموشەکە وەکوو حوشتری مێینە ڕام بوو ◊ **النَّائِقُ**: ئەو کەسەی بەزو گۆشت لێك جیادەکاتەوە بۆ جولەکە ◊ **النَّاقَة**: حوشترە مێینە، هەروا وشەی (ناقة) ناوە بۆ ئەستێرەی ڕیزبەستو ◊ **النَّوْقَةُ**: زیرەکیی و لێهاتویی لەهەموو شتێك دا ◊ **النَّوَّاقُ**: کەسێك کاروبار لەئەستۆ بگرێ و ڕێکیان بخا ◊ **النِّیقَةُ**: زێدەڕۆیی لەهەوڵدان بۆ کردنی ئیشی باش و ئەنجامدانی بەرێك و پێکی ◊ لەپەنددا هاتووە (خرقاء ذات نیقة) بە کەسێك دەگوترێ نەزان بێ و لافی زانایی لێ بدا، گەندەڵ بێ و لافی چاکسازی و نەزاهەت لێ بدا.

**نَـوِكَ نَوَكـاً ونَواكـاً**: ئەحمەق بوو ◊ **أنْوَكَهُ**: بەئەحمەقی لەقەڵەم دا ◊ دەشگوترێ: (ما أنوَكَهُ) ئای چەند گێل و ئەحمەق بوو ◊ **إسْتَنْوَكَ**: ئەحمەق بوو ◊ **إستنوك فلاناً**: فلانکەسی بەگێل و ئەحمەق دانا ◊ **الأنْوَكُ**: ئەحمەق و گێل ◊ بێ دەسەڵات و نەزان ◊ کەسێك زمانی بگیرێ و نەتوانێ قسە بەئاسانی بکا.

**نـالَ علی فلان بالشیئ**: شتەکەی بەفلانکەس بەخشی ◊ دەشگوترێ: (نال فلاناً العطیة وبالعطیة) بەخششەکەی دا بەفلانکەس.

**نالَ فلان بالحدیث**: فلانکەس ویستی قسەبکا.

**نال لَه أن یفعل کذا**: کاتی ئەوە هاتووە ئەو ئیشە بکا.

**نالَ الشَّیْئَ**: شتەکەی دەست کەوت.

**نـالَ نـلان**: فلانکەس بوو بەخاوەن بەخشش و عەتای زۆر ◊ **أنالَ المَعْدِنُ**: لەکانەکەدا شتێکی دۆزییەوە ◊ **أنالَ فلان الشَّیْئَ**: شتەکەی دا

بەفلانکەس ◊ ناوَلَـهُ الـشَّيْءَ: شتەکەی دایە ◊ نَوَّلَ: بەخششی پێدا ◊ نَوَّلَ فلاناً الشَّيْءَ: شتەکەی دابەفلان.

تناوَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵگرت، وەرگرت ◊ تناوَلَ الرِكابُ بنا مكان كذا: سوارەکان کاروانچییەکان لەگەڵ ئێمە گەیشتنە فلان شوێن ◊ تَنَوَّلَ فلان بالخير: فلانکەس کەوتە خێرکردن و چاکەخوازی ◊ تَنَوَّلَ عَلَيْهِ بِشيءٍ: شتەکەی پێ بەخشی.

تَنَوَّلَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵگرت ◊ المُتَنَاوَلُ: دەگوترێ: (هو قريب المتناول) ئەوە بەدەستە بەئاسانی دێتە دەست ◊ المِنْوالُ: شەپیتەی جۆلا ◊ خەرەکی جۆلا ◊ یان خودی جۆلاکە خۆی ◊ شێوەو شێوازو رێبازو مەزهەب ◊ دەگوترێ: (هم على منوال واحد) ئەوان لەسەریەك شێوازو تەبیات و رەوشتن ◊ النَّالُ: سەخی و نانبدە ◊ بەش و بار ◊ النَّوالُ: بەش و بار بەخشش ◊ دەگوترێ: (نوالُكَ أن تفعل كذا) ئیشی تۆ ئەوەیە ئەو کارە ئەنجام بدەی ◊ النَّوالَة: پارو ◊ النَّوْلُ: پارەو رەسمی کەشتی؛ بلیتی کەشتی ◊ ئەو پارەیەی دەدرێ بەفەرمانگەی گواستنەوەی نامەو شت و مەك بۆ کرێی گواستنەوەکە ◊ شێوێك لاقاوی لێ بێ ◊ خەرەکی جۆلا، ئەوەی کە ریسەکەی لەسەر هەڵدەکرێ ◊ النَّوْلَةُ: ئەوەی دەست مرۆڤ دەکەوێ لەخێرو بێر ◊ دەگوترێ: (ما اصبتُ منه نولة) من خێرو بێرێکم لێ دەست نەکەوتووە ◊ ماچ؛ ماچێکم نەکردووە.

**نَامَ** فلان: فلانکەس نوست، راکشا، هەنۆزی هاتێ.

**نَامَ الشَّيْءُ**: شتەکە بێدەنگ بوو ئارامی گرت.

**نَامَ الخلخال**: خرخاڵەکان بێدەنگ بوون لەم رووەوە پربەقاچن و لەگۆشت دا ونبوون ◊ (نام العِرْقُ) دەمارەکە لێی نەدا ◊ (نامت الريح) رەشەباکە بێدەنگ بوو وزەی نایە ◊ (نام البحر) دەریا هێواش بۆوە ◊ (نامت النارُ) ئاگرەکە کپ بوو کوژایەوە ◊ (نامت السوق) بازاڕ کەوت.

**نام الثوبُ** أو **الفَرْوُ**: کراسەکە یان فەروەکە کۆن بوو، رزی.

**نـام فـلان لله**: فلانکەس ملکەچی فەرمانی خودابوو.

**نام اليه**: ئارامی گرت و دڵی لەلای دامەکنا.

**نـام عَـنْ حاجتـه**: ئیشەکەی خۆی لەبیر چۆوەو گرنگی پێ نەدا.

**نام فلاناً نَوْماً**: بەسەر فلانکەس زاڵ بوو لەزۆر نوستن دا ◊ أنامَهُ: نواندی ◊ دەشگوترێ: (طعنه فأنامَهُ) زەبری لێ داو کوشتی ◊ ناوَمَهُ: پێشبڕکێیان کرد لەزۆر نووستن دا ◊ نَوَّمَ فلان: فلانکەس زۆر نوست ◊ نَوَّمَ فلاناً: فلانکەسی نواند ◊ تناوَمَ: وای خۆ نیشان دا نوستووە ◊ تناوَمَ اليه: لەلای دامەکناو ئارامی گرت ◊ تَنَوَّمَ: هەوڵی دا بنوێ، پاڵکەوت بۆئەوەی خەوی لێ بکەوێ ◊ دەگوترێ: (تَنَوَّمَ شهوة للنوم) پاڵکەوت چونکە زۆری حەز لەخەو بوو ◊ (شەیتان پێی پێکەنی)، ئیحتیلامی بوو ◊ تَنَوَّمَ فلاناً: فرسەتی لەفلان هێنا لەکاتی نووستنی دا ◊ إستنام: نووست ◊ خۆی بەنوستوو خست ◊ جێگیر بوو ◊ (التنويم المغناطيسي) حاڵەتێکی کارتێکردەی جەستەیە دیاردەی نووستوویی لەسەر مرۆڤە نوێنراوەکە دەردەکەوێ بەهۆی ئەو ئیحائات و رەهنومایی کرد نانەی نوێنەرەکە ئاراستەی خەو لێخراوەکەی دەکا بۆ دەستەبەربوونی فیکرەیەك کەکابرای نوێنراو لێی بێ ئاگایە ◊ المَنامُ: نووستن ◊ هەروا وشەی (المنام) بەمانا شوێنی نووستن دێ ◊ دوکان و شوێنی وا ◊

پۆشـاكی پێـوه نووسـتن ٥ گـۆڕ ٥ المَنُومَـة: هەرشتێك خەو لەمرۆڤ بخا ٥ دەگوترێ: (طعام مَنُومَة) خواردنێكە خەو لەمرۆڤ دەخا ٥ المُنَوِّمُ: ئـەو كەسـەی ئیشی خـەو لێ خـستن (تنـويم موگناتیـسی) دەكـا ٥ هـەر دەرمانێـك خـەو لـەمرۆڤ بخـا ٥ النَّـائم: دەگـوترێ (لیـل نـائم) شـەوێكە خـەوی تێـدا دەكـرێ ٥ النَّـؤومُ: زۆر نوسـتوو كەسـێك زۆر بخـەوێ ٥ النُّـوَامُ: نەخۆشـییەكە توشـی مـرۆڤ دەبـێ لـەناكامی گەسـتنی مێشی تـسی تـسی، كـابرا خـەوی لێ دەكەوێو لەوانەیە وەهۆش خۆی نەیەتەوە زۆر جـار كوشـندەیە ٥ النُّـوَمُ: نووسـتوەكان ٥ ماوەیەكە جەستەو عـەقڵ تێیدا پشو دەدەنو لەو مـاوەدا هەست كـەم تـازۆر نامێنێو بـڕی ئــەركی ئەندامــەكانی جەســتە نــامێننو هەستەكان لەكار دەكەون ٥ النُّوَمُ: زۆر نوستوو، كەسێك زۆری حـەز لەخـەو بـێ ٥ نومـان: زۆر نوستوو، كەسێك زۆری حەز لەخـەو بـێ ٥ ئـەم وشـەیە تایبەتـە بـەبانگ كردنـەوە ٥ دەگـوترێ: (یانومانُ) ٥ النُّوَمَةُ: كەسێك زۆر بنوێ ٥ كەسێك نـاو و ناوبـانگی لـەناو خـەڵك دا نـەبێ كـەس نەیناسێ ٥ كەسـێك لاشـەڕبێو نـەزانێ شـەڕ چییەو بـیر لەشـەڕو شـەڕخوازی نەكاتـەوە ٥ النَّـوِيمُ: بـێ ئاگـاو گێـل، لاشـەڕو ئاشـتیخواز، كەسێك دژی شەڕو ئاژاوەبێ ٥ النِّيمُ: هەرشـتێك نەرمو نۆڵ بێ ژیانی نەرمو نۆڵ، قوماشی نەرم ٥ پۆشـاكی نوسـتن ٥ پەسـتەكو فـەروەی كـورت كەلەپێستی كەروێشكو شتی وا دروست دەكرێ ٥ درەخـت ٥ پلیكانـە كەبـەهۆی ڕەشـەباوە لـە لمبەلان دا دروست دەبن ٥ مرۆڤی قسە خۆشو گونجاو بۆ هاوەڵی كردنـی ٥ دەشگوترێ: (فـلان نيمٌ) فلانكەس پیاوێكی قسەخۆشو نەربابە بۆ هـاوەڵی كردنـی ٥ پیـاوی ژنـانی ٥ النِّيمَـةُ: ئارامیو حەسانەوە بەهۆی نووستن ٥ دەگوترێ: (إنـه لَحَـسَنُ النِّيمَـةِ) ئـەو مرۆڤـە لەخـەوێكی ئارامدایە ٥ نَوَّنَ الكلمةَ: جوت بزوێنی خستە سەر كۆتایی ئیسمەكە ٥ نَوَّنَ النونَ: پیتی نونی نووسـی ٥ التنـوین: بـەلای نەحوییەكانــەوە نونێكی زێدەی بێ بزوێنـە بـەكۆتایی ئیسمەوە دەنووسێو تەئكید ناگەیەنێ.

النون: پیتێكە لە پیتەكانی هیجا ٥ تیژایی شمشێر ٥ ماسـی ٥ ئـوچو دەواتـی نووسـین ٥ النُّونـة: چاڵایی چەناگەی منداڵی ساوا ٥ ماسی.

**نـاهَ** نَوْهـاً: بـەرزبۆوە، درێـژبوو بـاڵای كـرد ٥ دەگوترێ: (ناهَ النباتُ) ڕوەكەكە بەرزبۆوە باڵای كرد.

**نـاه** البـومُ: كوندەبووەكـە سـەری بـەرزكردەوە گمانـدی ٥ قەلەڕەشـەكە سـەری بـەرزكردەوەو قڕاندی./ **ناه** بالشيءِ: شتەكەی بەرز كردەوە.

**ناه** عَنْ الـشَّيْءِ: وازی لەشـتەكە هێنـا ٥ دەگوترێ: (ناهت نفـسي عَـنْ اللحـم) نەفسم لەگۆشـتەكە بێزرا.

**ناهَ** البقـلُ الـدوابَ: گژوگیاكـە كـەمێك ولاخەكـەی تێر كرد ٥ دەشگوترێ: (إنّها لتأكُـلُ مـا ينوهها) ئـەو ئەوەنـدە دەخـوا برسـی نـەبێ بەتـەواوی خـۆی لـەخواردن مرناكـا ٥ هـەروا دەگـوترێ: (أعْطني ماينوهني) ئەوەنـدەم بدەیـە برسـیایەتیم نـەمێنێ ٥ نَوَّهَ بفلان أو باسمه: نـاوی فلانـی هێنـا، بـەڕێزەوە باسـی فلانكەسـی كـردو بەگـەورەی لەقەڵەم دا ٥ نَوَّهَ بالحديث: قسەكەی ئاشكرا كـرد ٥ النَّـوْهُ: وازهێنـان لەشـت ٥ النَّوْهَـةُ: ژەمـە خواردنێـك لەشـەو و ڕۆژدا ٥ النُّهَـةُ: هێـزی جەستە.

**نَوَى**: لەشوێنێکەوە گواستیەوە بۆ شوێنێکی تر.

**نَوَى نوىً**: دوورکەوتەوە.

**نَــوى التمــرُ**: خورماکــە دەنکــی هــەبوو (نــاوکی هەبوو).

**نوى التَّمْرَ**: خورماکەی خواردو دەنکەکەی فڕێ دا.

**نــوى الأمــرَ نِيــةً**: نیــەتی کارەکــەی هێنــاو بڕیــاری لەسەردا ◊ دەگوترێ: (نويتُ منزلَ كـذا، ونويتُ أمْراً) ◊ **نواه الله بخير**: خودا ئەوی گەیانده خێرو خۆشی.

**نوى الــشَّيْءَ**: هــەوڵی بەدەستهێنانی شتەکەی داو کۆششی بۆ کرد.

**نــوى فلانــاً**: پێداویستی فلانکەسی دابین کرد ◊ **أنوى**: سەفەرەکانی زۆر کردن ◊ دوورکەوتەوە ◊ **أنوى التَّمْرَ**: خورماکەی خواردو ناوکەکەی فڕێ دا ◊ **أنـوى المرعـى الدَّابـة**: پاوانەکـە وڵاخەکـەی قەڵەو کـرد ◊ **أنوى الحاجة**: ئیشەکەی جێبەجێ کرد ◊ **أنوى البُسْرُ**: دەنکە خورماکە ناوکی پەیدا کرد ◊ **نَـوَّى فـلان**: فلانکـەس ناوکـە خورماکانی فڕێ دا ◊ **نَوَّى فلاناً**: فلانکەسی حەواڵەی نیازو مەبەستی خۆی کردو لەڕوانگەی نیەتو نیازی خۆیەوە موحاسەبەی کرد ◊ **نَـوَّى حاجَتَـهُ**: کاری خـۆی جێبـەجێ کـرد.◊ **إنتـوى**: لەشـوێنێکەوە گواستیەوە بۆ شوێنێکی تر ◊ **إنتـوى مـن الأمـر**: لەکارەکـە وازی هێنـاو چووە سـەرکارێکی تـر ◊ **إنتوى الشَّيْءَ أو فلاناً**: چوو بۆ شتەکە یـان چوو بـۆلای فـلان ◊ دەگـوترێ: (إنتـوى منـزلاً بموضـع كذا) هەوڵی پەیداکردنی مـەنزڵێکی دا لـەفلان شـوێن ◊ (إنتــوى فلانــاً لمعروفــه) چــوو بــۆلای فلانکــەس بۆئــەوەی لــەپیاوەتیو ســەخاوەتی بەهرەمەند ببێ ◊ **إنتوى الأمْرَ**: نیازی ئیشەکەی کـردو سـووربوو لەسـەر ئەنجامـدانی ◊ **تَنَـوَّاهُ**: قەصدی کرد، چوبۆلای، نیازی لای ئەوی بوو ◊ **إسْتنوى**: دەنکـە خورماکـەی خـواردو ناوکەکـەی فڕێ دا ◊ **المُنْتَوى**: دەگوترێ: (فلان مُنْتوى القوم) فلانکەس خاوەنی بڕیاری گەلو نەتەوەکەیەتی ◊ **المَنْوِيُّ**: دەگوتـرێ: (رجل منوي) پیاوێکە هـەوڵ دەدا بۆئامـانجی پـیرۆزو دەیپێکـێ ◊ **النّـاوِي**: دەگوترێ: (فلان ناوى القوم) فلانکـەس خـاوەنی بڕیــار بەدەســتی نەتەوەکەیــەتی ◊ **النَّــوى**: دووریی ◊ دەڤەرو وڵاتێك سـەفەری بـۆ بکـەی ◊ (فلان نواك) فلان نیازو مەبەستی تۆیە.

**النَّواةُ**: نیازو مەبەست ◊ خورما عەجەمە ◊ مێوژ ◊ ناوکـە خورمـاو شـتی لـەو جـۆرە ◊ ئـەو چـڵە نەمامــە خورمایــەی لەســەر دەنکــە خورماکــە (ســەوز) یــان بڵــێ: شــین دەبــێ ◊ هەرشــتێك کێشەکەی پێنج دیرهەم بێ ◊ بەشێك لەکرۆکی زەڕە ئــــەوەی ئەلەکترۆنــــەکانی بــــەدەوردا دەخولێنــەوە ◊ هــەروا نــاوە بــۆ پێداویــستی ◊ **النَّــوءُ**: فرۆشـیاری دەنکـە خورمـا ◊ **النَّــوَوِيُّ**: ئاژەڵێك دەنکە خورما بخوا ◊ دەگـوترێ: (بعـير نوويّ) (وهي نووية) هەرشتێك نیسبەت بدرێ بۆلای (النّواة) ◊ هەرشتێك نیسبەت بدرێ بۆلای گونـدی (نَـوى) وەکـوو چـۆن پـەحیای کـوڕی شـەرەف محـی الـدین خـاوەنی (منهـاج الطـالبین والمجموع) چەندەها کتێبی تـر نیسبەت دەدرێ بـۆلای ئـەو گونـدەو دەگـوترێ: (النــووي) ◊ **النووية**: سیلاحی ئـەوەوی کـە بـەوزەی زەڕەو شتی وا کاردەکاو چەکێکی خاپورکەرە ◊ **النَّوِيُّ**: هاوەڵێك لەگەڵ تۆدا هاونیازو هاومەبەست بێ ◊ هاوەڵی سەفەر ◊ دەگوترێ: (فلان نَوي القـوم) فلانکـەس خـاوەن بڕیـاری گەلەکەیـەتی بڕیـار بەدەسـتی هۆزەکەیـەتی ◊ **النَّـيُّ**: بـەزو پیـو ◊

ئیسمێکە بـەمانا (رۆن) دێ ◊ النِّيَّـةُ: رازونیـازو مەبەسـت ◊ شـوێنێك رێبـوار مەبەسـتیەتی بیگاتێ دوربێ یان نزیك.

**ناءَ الشَّيْءُ نَيْئاً ونيوءاً**: شتەکە نـەکوڵی، نەگەیی (فهو نِيْءٌ ونِيٌّ) ◊ شتەکە دووربوو، دوورکەوتەوە ◊ **أناءَهُ**: هەڵی نەپێچا، پێنەگەیی، نەیکوڵاند ◊ **أنْيأ**: بەمانا (أناءَهُ) دێ ◊ **نَيَّأ الأمرَ**: کارەکەی قـایم نـەکرد ◊ **النِّيءُ**: هەرشـتێك پێویـست بەکوڵانـدن یـان برژانـدن بـێ نـەکوڵابێ یـان نەبرژابێ (کاڵ) بێ کرج بێ ◊ دەگوترێ: (لَبن نِيٌّ) شیری خاو و نـەکوڵاو ◊ **نابَهُ نَيباً**: کەڵبەی هەنگاوت ◊ **نُيِّبَت الناقة**: حوشترەکە پیربوو ◊ **نَيَّبَ النَّبْتُ**: رووەکەکە لاسکی کرد ◊ **نَيَّبَ الشَّيْبُ**: پـیری دەرکـەوت ◊ **نَيَّـبَ في الـشَّيْءِ**: کەڵبـەی بەشتەکەدا بـردە خـوار ◊ **نَيَّـبَ الـشَّيْءَ**: بـەددان شـتەکەی گەسـت ◊ شـوێنکەی لەشـتەکە کـرد ◊ بـەددان شتەکەی بـەتاقی کـردەوە بزانـێ رەقـە یان نەرمە ◊ **تَنَيَّبَ النَّبْتُ**: رووەکەکە لاسکی کرد، لاسکی دەرکەوت ◊ **تَنَيَّبَ الشَّيْبُ**: پیری دەرکەوت ◊ **الأنيَبُ**: کەڵبەزل ◊ بۆ مێینە دەگوترێ: (نَيْباءُ) ◊ **النَّابُ**: کەڵبەی پەنا ددانەچوارینەی پێشەوە، خـرێ ◊ هـەموو مرۆڤێـك دوو لـەو کەڵبانـەی هـەن ◊ دەگوترێ: (عَضَّهُ الـدهر بنابـه وأنيابـه) رۆژگار بەکەڵبەی خۆی گەستی، هاری ◊ شـەڕو قینـی خـۆی بەسـەردا رشـت ◊ هـەروا شـەی (النّـاب) نـاوە بـۆ حوشـتری بەساڵاچـوو ◊ دەشگوترێ: (هو ناب قومـه) ئـەوە ریـش سـپیو گـەورەی نەتەوەکەیـەتی ◊ **النُّيُـوبُ مـن النـوق**: حوشتری بەساڵاچوو.

**ناتَ نَيْتاً**: لۆژەلۆژی بـوو لـەلاوازی دا یـان بـەهۆی وەنەوزەوە.

**نـاحَ الغُـصْنُ نيحـاً ونيحانـاً**: لقەدرەختەکـە راژا، جوڵایەوە.

**ناحَ العَظْمُ نَيْحاً**: ئێسقانەکە پتـەو و رەق بـوو ◊ تـەڕایی تێـدا نـەبوو ◊ **نَـيَّحَ اللهُ عَظْمَـهُ**: خـودا ئێسقانەکەی پتـەو کـردو تونـدی کـرد ◊ وردو هاری کرد ◊ دەگوترێ: (نَيَّحَهُ بخير) شتێکی پێدا ◊ **النَّيِّحَةُ**: هێزو توانا ◊ **النَّيِّحُ**: بـەهێزو پتـەو ◊ دەگوترێ: (عظم نَيِّحٌ) ئێسقانی پتـەو ◊ **النَّيْـدِلُ**: کـاری گـەورەو گـران ◊ کـابوس و مۆتەکـە ◊ **النَّيْدِلانُ و النَّيْدَلانُ**: بەمانا (النَّيْدِلُ) دێ.

**نـارَ الثـوبَ نَيْـراً ونيـارةً**: وێنـەو خـەتو هێڵـی لەقوماشـەکەدا دروسـت کـرد ◊ تـانو پـۆی بـۆ قوماشەکە ئامادەکرد.

**أنار به**: هاواری پێ کرد ◊ **أنار الثوبَ**: هێڵو وێنەی بۆ قوماشەکە دروست کرد ◊ **نَيَّرَ الثـوبَ**: هێـڵو وێنەی بۆ قوماشەکە دروست کرد ◊ لەسـەر دوو هـێڵ قوماشـەکەی چـنی ◊ **تنـايرا**: خۆیـان رازاندەوە ◊ **المنايَرَة**: شەڕو نەگبەتی ◊ دەگوترێ: (بـين القـوم منـايرة) ناخۆشـیو شـەڕو نەگبـەتی لـەنێو قەومەکـەدا هەیـە ◊ **المُنَيَّـرُ**: (ثـوب مُنَيَّـر) قوماشێکە لەسەر دوو رایەڵ چندراوە ◊ (جِلـد مُنَيَّر) پێستێکی ئەستورو پتەوە ◊ **النِّيرُ**: نـیری جوت؛ دارێکی تایبەتیە دەخرێتە سەر ملی دوو گاجوت یان دوو وڵاخ بـۆ زەوی کێڵان ◊ **النِّيرةُ**: شـەپیتەی جـولا؛ ئـەو شـەپکە پانـەی تێوەدانەکـەی پـێ چەسـپ دەکـرێ ◊ **نَيْـرَبَ**: کۆشـشی کـردو هـەوڵی بـەرپاکردنی فیتنـەو ئاشوبی دا ◊ **نَيْرَبَ الريحُ التُرابَ فـوق الـشَّيْءِ أو عَلَيْهِ**: رەشەبایەکە گڵو خۆڵەکەی بەشـتەکەوە نووسـاندەوە ◊ **نَيْـرَبَ فـلان القَـولَ**: فلانکـەس قسەکانی تێکەڵو پێکەڵ کردن ◊ **النَّيْرَبُ**: شەڕو

نەگبەتی ◊ فیتنەیی ◊ پیاوی ئازا ◊ پیاوی شەرمنگێزو فیتنەجۆ ◊ السنیج: هاتوچۆی بەپەلە ◊ تێکەوە هاویشتن ◊ النَّیْرَنْج: کەسێکە دەڵێی سیحر لێ کراوە ◊ النَّیْروزُ: بروانە مادەی (النوروز) ◊ النَّیْزَكُ: بروانە مادەی (نزك) ◊ نَیَّسَبَ بینهما: فیتنەیی لەنێوانیان دا ئەنجام داو هەوڵی دا نێوانیان تێك بدا ◊ النَّیْسَبُ: ڕێگای ڕاستو ئاشکرا ◊ ڕێگای باریك، ڕێچکە ◊ وەکوو ڕێگای مێروو مارو شتی وا ◊ ڕێبازی کەرمکێوی‌و شتی وا بۆسەر ئاو و دوێلاو ◊ نیسان: مانگی حەوتەمە لەمانگەکانی ساڵی سریانی کەبەرامبەر مانگی چواری ساڵی زایینییە واتە مانگی نیسان.

**ناصَ** نَیْصاً: بەهێواشی جولایەوە.

**النَّیْصُ**: جم‌وجوڵی هێواش‌و لەسەرخۆ ◊ ژیشکی کەتەوزل.

**ناضَ العِرقُ** نَیْضاً: دەمارەکە پەلەپەلی پێکەوت هەڵبەزو دابەزی کرد.

**ناطَ** نَیْطاً: دوورکەوتەوە ◊ إنتاط: بەمانا (ناط) دێ ◊ النَّیْطُ: مردن ◊ ئەجەل‌و مەرگ ◊ دەگوترێ: (أتاه نیطه) ئەجەلی هات.

**ناعَ** نَیْعاً: لاربۆوە، ڕاژا ◊ دەوترێ: (ناعَ الغُصْنُ) لقەدرەختەکە ڕاژا ◊ لەرۆیشتن دا پێشکەوت‌و گورج‌و گۆڵ بوو ◊ إستناعَ: لەرۆیشتن دا خێرابوو.

**تَنَیَّقَ في ملبسه ومطعمه**: گرنگی زۆری دا بەپۆشاك‌و خواردن ◊ النِّیقُ: کێوی بڵند ◊ بەرزترین لوتکەی کێو و دوندی سەرکەش ◊ دەگوترێ: (هو کالأنوق في النیق) ئەو وەکوو لوتکەی کێوی سەرکەش وایەو کەس دەستی نایگاتێ ◊

النیکوتین: قەلوانییەکی شلەو ئامادەباشی توانەوەی تێدایە.

**نالَ** الرحیلُ نَیلاً: کاتی سەفەری نزیك بۆتەوە.

**نالَ** الشَّیْئَ: بەشتەکە گەیشت.

**نالَ** فلان من فلان: فلانکەس جنێوی بەفلان دا ناموس‌و کەسایەتی بریندار کرد.

**نالَ** الشَّیْئَ فلاناً: شتەکە گەیشتە فلانکەس.

**نالَ** فلاناً الشَّیْئَ: داوای لە فلان کرد شتەکەی دەست بکەوێ، بیدرێتێ ◊ النَّائِلُ: عەتاو بەخشش دەگوترێ: (أصبتُ منه نائلاً) بەخششێکم لەو دەست کەوت ◊ النَّائِلَةُ: بەربێلاو بەردەگاو دەوروبەری خانوو ◊ النَّیْلُ: ئەو عەتاو بەخششەی دەست دەکەوێ ◊ فرسەت‌و زەفەر بردن ◊ دەگوترێ: (أصاب عدوه نیلاً) فرسەتی لەدوژمنی هێنا.

**النِّیلُ**: ڕووباری نیل: ڕووبارێکە وڵاتی میصر و وڵاتی سودان شەق دەکا ◊ چەند ڕوەکێکی ساڵانەو تەمەندرێژن لە پێری (القرنیة)ن دەروێندرێن بۆنەوەی مادەیەکی ڕەنگ شینیان لێ دەربهێندرێ بۆ ڕەنگ کردن کەڵکی لێ وەربگیرێ ◊ النَّیْلَةُ: بەمانا (النَّوْلَة) دێ ◊ واتە: بەخشش ◊ النِّلِینُ: ئەو مادە ڕەنگ کراوەی بەڕوەکی (النیل) بۆیە دەکرێ ◊ النَّیْلَجُ: پیو کە شوێنی خاڵ کوتانی پێ دەچوزێندرێتەوە بۆ ئەوەی ڕەنگی خاڵەکە سەوز بنوێنێ ◊ ڕەنگێکی شینە لەگەڵای ڕوەکی (النیل) دەردەهێندرێ ◊ لەوڵاتی میصر پێی دەگوترێ: (النیلة) ◊ النیلوفر و النینوفر: ڕەگەزی ڕوەکێکی ئاوییە لەپێری (النیلوفریة)یە زۆر جۆری هەن لەدەم جۆگەو جۆبارو زلکاوو شوێنی ئاوادا دەڕوێ، هەندێ جۆری لەدیبەرو دێراودا دەروێندرێ بۆ کەڵك

وەرگـــرتن لەگـــەڵاو گـــوڵی ◊ النیـــوترون: قەبارمیەکـە دەچـێتە نـاو پێکهاتـەی زەرەوەو جودایە لە ئیدرۆجین.

النیم: بڕوانە مـادەی (نَـوَم) ◊ هـەروا نـاوە بـۆ تـرێ ڕێویلـە ◊ هـەروا نـاوە بـۆ جـۆرە تەرێیـەکی تـر کەلە وڵاتی میصر پێی دەگوترێ ترێی (الدیب) ◊ النیمَبِشــت: هێلکـەی نیـوە کـوڵاو ◊ نیـون: عونـــصورێکی غازییـــە، ئەگـــەر پڕیـــشکە کارەباییـەکی بـەناودا بـڕێ بڵێسەیەکی سـوری پرتـــەقاڵی پەیـــدا دەکـــا لـــەغازەکانی تـــری جیادەکاتـەوە، بـەزۆری بـۆ ئـیعلان و ئیـشاراتی ڕوناکی بەکاردێ.

**ناهَ** نَيْهاً: بەرزبۆوە ◊ بووە جێگای سەر سوڕمان ◊ **النّائه**: بـەرز ◊ **النّاهـة**: ئـەو شتەی ئـەی لەشت دەکا.



هَأْهَأَ: لەقاقای پێکەنینی داو درێژەی بەپێکەنینەکەی دا ◊ هَأْهَأَ الراعي بالماشية: شوانەکە بانگی ئاژەڵەکانی کرد بۆ لەوەڕخواردن ◊ هِئْ هِئْ: بانگی کردن ◊ لێیان توڕەبوو وتی (هَأْ هَأْ) ◊ هَاتُورُ: مانگی سێیەم سالّی قیبتییە ◊ هاروت: ناوی فریشتەیەکە هاوەڵی ماروتەو لەقورئان دا ناویان هاتووە ◊ هَبَّتْ الريحُ: بایەکە هەڵی کرد.

هَبَّ الفحلُ: نێرەکەرەکەیان کەڵەنێرەکە بۆ کەڵدانی مێیەکە کەوتە مرەمرو زەرەزەرو مرقە مرق.

هَبَّ فلان من نومه: فلانکەس لەخەو هەڵسا.

هَبَّ النجمُ: ئەستێرەکە دەرکەوت، هەڵهات.

هبَّ السائرُ: ڕێبوارەکە کەوتە پەلە پەلو خێرا ڕۆیشتن.

هَبَّ فلان الى الشَيْئ: فلانکەس پەلاماری شتەکەی دا بۆی ڕاپەڕی.

هَبَّ فلان حينا ثم قدم: فلانکەس ماوەیەك دیارنەماو دوایی هاتەوە ◊ أَهَبَّ اللهُ الريحَ: خودا بای هەڵکرد ◊ أَهَبَّ السَّيفَ: شمشێرەکەی هەڵسوڕاند ◊ أَهَبَّ فلاناً من نومه: فلانکەسی لەخەو ڕاپەڕاند ◊ إِهْتَبَ الفحلُ: نێرەکەخۆی ئامادەکرد بۆ سواربونو کەڵدانی ئاژەڵە مێیەکە ◊ بۆ کەڵدانی ماینەکە ◊ اهتبَّ الشَيْئَ: شتەکەی بڕیەوە ◊ تَهَبَّبَ الثوبُ: قوماشەکە، کراسەکە ڕزیو دادڕا ◊ أَهْبَابٌ: دەگوترێ: (ثوب أهْبَابٌ): کراسێکی دادڕاوە ◊ المِهْبَابُ من الفحول: ئەو کەڵە وانێکەیە بۆ کەڵدانو سواربوونی حەیوانە مێیەکە حەجمینی لێ بڕابێو سمکۆڵ بکاو بیرمێنێ بزەرێنێ ◊ بگمێنێ ... هتد.

المَهَبُّ: شوێنی بالێ هەڵبون، یان شوێنی بەرەو باو باگر.

الهَبَابُ: تەپو تۆز ◊ هَبَابِبُ: دەگوترێ: (ثوب هبابب): کراسێکی دادڕ دادڕە ◊ الهِبَّةُ: دەگوترێ: (إنه لَحَسَنُ الهِبَّةِ) ئەو وەزعو حالّی باشە ◊ گوزەرانی خۆشە ◊ بەخششی چاکە ◊ بریسکەی شمشێر لەکاتی لێدان ◊ پارچە قوماش ◊ ماوەیەك لەڕۆژگار ◊ ساتێك پێش هەتاو کەوتن ◊ الهَبُوبُ: ڕەشەبایەك تەپو تۆز هەڵسێنێ.

هَبِتَ هَبْتاً: نەرم بوو، شلو شەوێڵ بوو، سۆر بۆوە.

هَبَتْ فلاناً: فلانکەسی ملکەچو ژێربار کرد.

هَبَتَ الشَيْئَ: لەشتەکەی کەم کردەوە.

هَبَتَ الأمر فلاناً: کارەکە فلانکەسی سەرسامو حەیران کرد.

هَبَتَ فلاناً بالسيف: بەشمشێر لەفلانی دا ◊ المهبوبُ: ترسنۆك ◊ بێ عەقڵو هۆش ◊ باڵندەی تەمبێ دادراو بەبێ ڕێ نیشانداندو ئاراستەکردن بنێردرێ ◊ الهَبْتُ: ئەحمەق ◊ الهَبْتَةُ: زەبونی، زەلیلی ◊ الهَبِتُ: ترسنۆکی عەقڵ ڕۆیشتوو ◊ هَبَجَهُ بالعصا: بەگۆچان لێیدا بەعاصا دارکاری کردو هێواش هێواش کوتای.

هَبِجَ وَجْهُهُ هَبَجاً: دەمو چاوی هاوسانو گرژ بوو.

**هَبَجَ الملوب:** ئاژەڵە شیردەرەکە گوانی هاوسان ◊ **هَبَّجَهُ:** هاوساندی ◊ **هَوَّبَجَ:** لەنزیك سەرچاوەی ئاوەکەوە چاڵێکی هەڵکەند بۆ ئەوەی ئاوی تێبێ بۆ خواردنەوە بەکاری بهێنێ ◊ **التَّهَبُّجُ:** شێوە هاوسانێکە لەجەستەدا ◊ **المُهَبَّجُ:** دەگوترێ: (خرج مُهَبَّجَ الوجه): بەدەمو چاو هاوساویی رۆیەدەرەوە ◊ (فلان مَهَبَّجٌ): فلانکەس نەفس گرانە ◊ **الهَبیجُ من الظباء:** ئاسکێکە دووخەتی هەن لەنێوان توکی وەرگیو توکی پشتی ◊ **الهَوَبَّجَةُ:** زەوی بەرزو تەپۆڵکە کە چەوو بەردی تێدابێ ◊ شوێنی چاڵو نزم لەناو زەوی ◊ چاڵێکی بچوکە هەڵدەکەندرێ لەنزیك سەرچاوەی ئاوەوە بۆئەوەی ئاوی بێتە ناوو بۆخواردنەوە بەکاری بێنن ◊ کۆتاییو سەرانسەری شیوو دۆڵ.

**هَبَدَ الهَبیدَ هَبْداً:** کاڵەکە مارانەکەی ڕنی ◊ شکاندی ◊ کوڵاندی.

**هَبَدَ فلاناً:** کاڵەکە مارانەکەی دەرخواردی فلان دا ◊ **اهْتَبَدَ فلان:** فلانکەس کاڵەکە مارانی ڕنی ◊ **الهَبیدُ:** کاڵەکە مارانە یان تۆوەکەی.

**هَبَذَ هَبْذاً:** لەڕۆیشتن دا یان لەفڕین دا پەلەی کرد.

**هَبَرَ اللَّحْمَ هَبْراً:** گۆشتەکەی کوتکوت کرد بەکوتی گەورە گەورە ◊ دەشگوترێ: (هَبَرَ له من اللَّحْمَ هَبْرةً): پارچەیەکی گەورەی گۆشت بۆلێ کردەوە ◊ (هَبَرَه بالسیف): بەشمشێر گۆشتەکەی بڕی.

**هَبِرَ هَبَرا:** گۆشتی زۆر بوو، قەڵەو بوو ◊ دەگوترێ: (بعیرٌ هبِرٌ وبرٌ): حوشترێکی قەڵەوو کوڵك زۆرە ◊ **أهْبَرَ:** بەرێكو پێکی قەڵەو بوو ◊ **اهْتَبَرَ:** گۆشتی پوکایەوە ◊ (اهْتَبَرَ فلان غیره بالسیف): فلانکەس بەشمشێر جەستەی یەکێکی بڕی ◊ **هَوْبَرت الناقةُ:** حوشترەکە گۆشتی زۆر بوو ◊ **هَوْبَرَتْ الأذن:** گوێچکەکە توکی لی هات لەموودا گوم بوو ◊ **الهابِدُ:** برندە ◊ **الهُبَارِیة:** ئەو پەڕو پۆڵەی لەباڵندە بڵاو دەبنەوە ◊ ئەوچڵكو کرێژەی بەبنکی قژەوە دەنووسێ ◊ **الهُبَارِیَة:** ڕەشەبایەك تەپو تۆز هەڵبکا ◊ **الهَبَّارُ:** برندە ◊ مەیمونی توکنو موو درێژ ◊ **الهَبُورُ:** مێروی بچوك ◊ گەندە گیا ◊ **الهَبْرُ:** نزمایی لەزەویو لمبەڵان ◊ **الهَبْرَةُ:** پارچە گۆشت کە بێ ئێسقان بێ، ئێسقی تێدا نەبێ ◊ **الهِبْرُ:** دابڕاو ◊ **الهِبْرِیَّةُ:** ئەو تەپو تۆزو وردەو خڵتەی لە لۆکە هەڵدەوەرێ ◊ یان لەپەڕو باڵی باڵندە دەکەوێو بڵاو دەبێتەوە ◊ ئەوەی لەقەفەزاژی شەکرو بەڕەداو ئەو جۆرە شتانە هەڵدەوەرێو بەقژو کوڵكو خورییەوە کەمێل دەبێ ◊ **الهُبَیْرَةُ:** کەمتیاری بچوك ◊ (أبو هبیرة): نێرە بۆق ◊ بۆقی نێر ◊ (أم هبیرة): بۆقی مێ ◊ **الهَوْبَرُ:** کوڵك زۆر: حوشتری پڕ توكو توکن ◊ یان هەر حەیوانێك توکی زۆر بێ ◊ مەیمونی توکن ◊ بەور ◊ سەوسەن ◊ شوێنێك باڵندەی قەتێی زۆر بێ ◊ **هَبْرَجَ:** تێکەڵاوی ئەمبەرو ئەوبەری کرد لە رۆیشتن دا، بەلارو لەنجەو قۆرتو پێچ رۆیی ◊ **هَبْرَجَ الثوبَ:** کراسەکەی پەراوێز چنو نەقش چن کرد ◊ **الهَبْرَجُ:** ڕۆیشتنی خێراو هەنگاو کورتو قۆرت قۆرتو پێچ پێچاوی ◊ لارو لەنجە کەر ◊ کەتەو قەڵەو ◊ ئاسکی پیر ◊ کراسی پەراوێز چندراو ◊ **الهِبْرِزِیُّ:** ئازاو ئیش لەدەست هاتوو ◊ چاونەترسو ورە بەرز لە هەموو کارێك دا ◊ بازنگی عەجەمی ◊ زێڕی خاڵص ◊ دیناری تازە لێ دراو ◊ هەرشتێك جوانو سەرنج راکێش بێ ◊ (أم الهِبْرزي): لەرزو تا ◊ **تهَبْرَسَ:** خۆی بادا، لارو لەنجەی کرد ◊

**الهِبْرِقيُ**: هەرکەسێ ئیش بەئاگرو شتی وا بکا وەکوو ئالتونچیو ئاسنگەر ٥ کەڵەگا کێوی ٥ گەڵەگای کەتەو پیر ٥ **هَبْرَمَ**: زۆری قسە کرد ٥ زۆری خوارد.

**هَبزَ هَبْزاً وهبوزاً**: لەناکاوێك مرد تێدا چوو ٥ **الهَبَسُ**: ڕەگەز ڕووەکێکە لەپێری (الصلیبیة) گژوگیای وەرزیو تەمەنداری دەشتەکی یان دێبەرین، لەئەوروپاو وڵاتانی حەوزی دەریای سپی ناوەڕاست دەڕوێن درێژییەکەی سێ تا پەنجا سانتیمەترە گەڵاکانی پانکۆڵەو وردن، گوڵەکانی ڕەنگاو ڕەنگە، بۆنێکی خۆشی سوکی هەیە.

**هَبَشَ الضَرْعَ هَبْشاً**: بەدەست گوانەکەی گرتو دۆشی.

**هَبَشَ المالَ ونحوه**: ماڵی کۆکردەوە ٥ دەگوترێ: (هو یَهْبَشُ لعیاله): ماڵو سامان بۆ منداڵو خێزانی کۆدەکاتەوە لەهەموو لایەكو بەهەموو جۆرێك هەڵپەیەتی.

**هَبَشَ فلاناً**: تێر تێر فلانکەسی کوتا.

**هَبِشَ هَبْشاً**: کاسبی کردو ماڵو سامانی کۆکردەوە ٥ **هَبَّشَ الشیئَ**: بەمانا (هَبَشَهُ) دێ ٥ دەگوترێ: (هو یَهَبِّشُ لعیاله): بەهەر دوو دەست ماڵو سامان کۆدەکاتەوە بۆ خێزانو منداڵی ٥ (فلان یُهَبِّشُ کلاماً): فلانکەس قسە تێکەڵو پێکەڵ دەکا ٥ **إهْتَبَشَ**: کۆبۆوە.

**اهْتَبَشَ الشیئَ**: شتەکەی کۆکردەوە بەناڕەحەتی ٥ **تَهَبَّشَ**: کۆبۆوە، گەلەکۆمەکێیان کرد ٥ **تَهَبَّشَ الشیئَ**: جۆرەها هەوڵو تەقەلای بەکارهێنا بۆ وەدەستهێنانی شتەکە ٥ **الهابِشُ**: بێگانەو دورەی خێڵو هۆز، کەسێك لاوەکی بێو چوبێتە ناو خێڵێکەوە ٥ دەگوترێ: (هل هبش الیکم هابش؟): پیاوی لاوەکیو بێگانە خۆی خزاندۆتە ناوتانەوە؟ ٥ **الهَابِشَة**: کۆمەڵو تاقمو پێری تازە ٥ **الهُبَاشَةُ**: تاقمێك مرۆڤ لەیەك تایەفەو هۆزنەبن.

**هَبِصَ هَبَصاً**: چوستو چالاك بوو.

**هَبِصَ هَبَصاً**: بەپەلە ڕۆیی.

**هَبِصَ الكلبُ**: سەگەکە زۆر سور بوو لەسەر نێچیرەکەو هەوڵی خواردنی دا ٥ دەگوترێ: (هَبِصَ فلان علی الشیئ یأکله): فلانکەس پری دایە شتەکەو دەستی کرد بەخواردنیو سەیری ئەم لاو ئەو لای کرد.

**هَبِصَ بالضحك**: زێدە ڕۆیی کرد لە پێکەنین دا ٥ **اهْتَبَصَ**: پەلەی کرد ٥ بەقاقا پێکەنیو زۆر پێکەنی ٥ **إنْهَبَصَ للضحك**: زێدە ڕۆیی کرد لە پێکەنین دا ٥ **الهَبَصی**: ڕۆیشتنی بەپەلە.

**هَبَطَ هبوطاً**: هاتە خوار ٥ نزم بۆوە ٥ دەشگوترێ: (هَبَطَ في الشرّ): کەوتە ناو گێژاوی شەڕو هەراوە.

**هَبَطَ الشیئُ**: شتەکە دابەزی نرخی کەم بۆوە ٥ لەئاستی پێشوی دا کەوت.

**هَبَطَ فلان**: فلانکەس زەلیلو کەم ڕێز بوو، فلان لەحاڵی دەوڵەمەندییەوە هاتە سەر حاڵی هەژاری ٥ ڕێزی کەم بۆوە، کەسایەتی دابەزی.

**هَبَطَ الشیئَ**: شتەکەی دابەزاند ٥ کەمی کردەوە ٥ دەگوترێ: (هَبَطْتُ الثمنَ): نرخەکەم دابەزاند ٥ (هَبَطَ الدواء درجة الحرارة): دەرمانەکە پلەی گەرمی نەخۆشەکەی دابەزاند ٥ (هَبَطَ المرضُ لحمه): نەخۆشیەکە کێشو قەڵەوی فلانی دابەزاند.

**هَبَطَ السوقَ**: چووە ناو بازار، دابەزییە ناو بازاڕ.

**هَبَطَ فلاناً المكانَ:** فلانکەسی خستە ناو ئەو شوێنە ٥ **هَبْطَهُ:** بەمانا (هَبَطَـهُ)دێ ٥ **هَـبَّطَ العِـدْلَ على البعير:** لابارەکەی بەسەر پشتی حوشترەکەدا لابە لابەلا راکێشا ٥ **إنْهَبَطَ الشَيْئُ:** شتەکە کەمی کرد ٥ دابەزی ٥ نزم بۆوە ٥ **تَهَـبَّطَ:** وردە وردە دابەزی ٥ **المِهْبَطَـةُ:** ئامێرێکە وەکوو چەترو مەزەللی لەحەواوە لەتەیارەوە پێی دادەبەزییە سەر زەوی.

**الهَبْطَـةُ:** چاڵایی ٥ **الهَبِـيطُ:** کزو لاواز ٥ **المَهْـبِطُ:** شوێنی دابەزین، جێگای نزم بوونەوە ٥ دەگوترێ: (مَهْبِط الوحي ومَهْبِط الطائرة ومَهْبِط النهر).

**هَبَـعَ الحِمـارُ هَبْعاً وهبوعاً:** گوێدرێژەکە رۆیشت بەرۆیشتنێکی خوارو خێچو تەمبەڵانە.

**هَبَعَ البعيرُ رعوه في مشيته:** حوشترەکە لەرۆیشتن دا ملی درێژ کرد بۆئەوەی یارمەتیدەری بێ بۆ رۆیشتنو خۆشرەوی ٥ (فهو هابع) ٥ **أهْبَـعَ الحيـوانُ:** حەیوانەکە هاوین بێچوی بوو ٥ **إسْتَهْبَعَهُ:** وای لێ کرد بەنارێکو یێکی بڕوا ٥ **الهُبَـعُ:** بێچوە ئاژەڵێک کە لەوەرزی هاوین دا لەدایک بێ ٥ **الهَبُـوعُ:** ئەوەی ملی خۆی دەکا بەیارمەتیدەر بۆ رۆیشتن.

**هَبَغَ هَبْغاً وهبوغاً:** بەرۆژ راکشا نوست ٥ **الهُبَيْـغُ:** نوستوو خەوخۆش، کەسێک بەرۆژ بخەوێ ٥ **الهَبَيَّـغُ:** شتی گەورە ٥ ئافرەتی بێ ڕەوشت کەدەست بەڕوی کەسەوە نەنێ ٥ **الهَبَيَّغَـةُ من النساء:** ئافرەتی داوێن پیس کەلەشفرۆشی بکاو دەست بەڕوی کەسەوە نەنێ ٥ **إنْهَبَكَـتْ بـه الأرض:** زەوی قوتی دا ٥ **الهُبَكَةُ:** زەوییەک قاچی تێدا رۆچێ ٥ ئەحمەقو گێل.

**هَبِـلَ فلان هَبَلاً:** عەقڵی لەدەست داو جیاوازی نێوان چاکەو خراپە ناکا ٥ **هَبِلَت الأمُ ولَدَها هَبْلاً:** دایکە کە بۆ منداڵەکەی گریا ٥ **اهْبَلَت المرأةُ:** ئافرەتەکە بەردەوام بوو لەشینو شەپۆڕ دا ٥ **اهْبَـلَ اللّهُ فلانـةَ:** خودا ئافرەتی جەرگ سوتاو کردو منداڵەکەی لێ سەندەوە ٥ **هَبَّـلَ فلان لعياله:** فلانکەس بۆ ماڵو منداڵی کاسبی کرد ٥ **هَبَّـلَ فلانـاً:** بەفلانکەسی گوت دایکی شینی بۆ بگێڕێ ٥ **هَبَّلَ اللحمُ فلاناً:** فلانکەس گۆشتی زۆر بوو گۆشت لەجەستەی دا کەوتە سەریەک قەڵەو بوو ٥ **اِهْتَبَلَ:** خەفەتبار بوو ٥ خەمی بۆ منداڵەکەی خواردو گریا ٥ **اِهْتَبَـلَ في سيره:** لەرۆیشتن دا پەلەی کرد ٥ درۆی کرد ٥ فێڵی کرد ٥ **اهْتَبَـلَ الصيدَ:** فێڵی لەنێچیرەکە کردو داوی بۆنایەوە ٥ **اهْتَبَـلَ الفرصـةَ:** هەلی قۆزتەوە، هەلەکەی لەکیس خۆی دا ٥ **تَهَبَّـلَ لأهلـه:** کاسبی بۆ ماڵو خێزانی خۆی کرد ٥ **الأهْبَـلُ:** کەسێک هێزی جیاکردنەوەی چاکو خراپی نەمابێ ٥ **المُهَبَّلُ:** کەسێک پێ گوترابێ، دایکت شینت بۆ بگێڕێ ٥ مرۆڤی گۆشتنی دەمو چاو هاوساو ٥ **المَهْبِلُ:** کونی بەرەو خوار بۆناو زەوی ٥ هەوای هەڵبوو لەسەرانسەری کێوەوە بۆناو شیوو دۆڵ ٥ بۆری هێنی مێینە لەوانێکەوە بۆ منداڵدان ٥ **الهَبالَـةُ:** داواکاریی ٥ **الهُبالَةُ:** دەستکەوتو تالانی ٥ **الهَبّالُ:** راوچییەک فێڵ لەنێچیر بکاو تەڵەو داوی بۆ بنێتەوە ٥ کاسبکاری فەندو فێڵ زانو پیلان دارێژ.

**هُبَلُ:** بتێک بووە لە کەعبەدا ٥ **الهَبَلُ:** ئادەمیزادی کەتەو زەبەلاح ٥ ئاژەڵی کەتەو زل ٥ **الهَبِلَى:** رۆیشتنی بەهێزو لارو لەنجە ٥ **الهَبُولُ:** ئەو ئافرەتەی منداڵی بۆ نەمێنن، منداڵی بۆ

رانەگیرێ ٥ **الهِبْلاع:** قورگ گەورەو پارو زلو زۆر خۆر ٥ **الهِبْلَعُ:** رەوشت بەدو خراپ رەفتارو دڵ پیس ٥ دەگوترێ: (عبد هِبْلَعٌ)، بەندەیەك نازانرێ باوك و دایكی كێن یان یەكێكیان نادیارە ٥ سەگی سلوقی ٥ **الهَبَنْكُ:** نەحمەق و گێل و بێ دەسەلات ٥ فیتنە گێرو سەرسەری ٥ **الهَبَكَةُ:** تەمبەڵ ٥ ئافرەتی نەحمەق و گێل و بێ دەسەلات ٥ **هَبْهَبَ:** خێرا رۆیی ٥ لەخەو هەڵسا ٥ **هَبْهَبَ السَّرابُ:** تراویلکەکە دەرەوشایەوە ٥ **هَبْهَبَ التَیسُ:** نێرییە قەرەکە بۆ بەتەگەدانی بزنەکان کەوتە جومبوش و مرقاندن.

**الهَبْهَبُ:** گورج و گۆڵ و جوست و چالاك ٥ **الهَبْهَبِيُّ:** چوست و چالاك ٥ دەنگ خۆش و لێزان بۆ حودیە خوێندن ٥ لێزان و دەست رەنگین لەپیشەیەك لەپیشەكان دا ٥ وەكوو وێنەگری ٥ قەصابی، ئاشپەزی ٥ شوانی مەڕو بزن ٥ نێریەقەرە، بەران.

**هَبَا الغبارُ هَبْواً وهُبُوّاً:** تەپ و تۆز هەڵسا بەرز بۆوە.

**هبا فلان:** فلانكەس مرد ٥ هەڵات ٥ بەهێواشی رۆیشت ٥ (فهو هاب وهي هابية) ٥ **أهْبَى التراب أو الغبار:** تەپ و تۆزی بەرپا کرد ٥ **هَبَّى الثريدَ:** تێكوشاوەكەی رێكخست، دروستی كرد ٥ **تَهَبَّى فلان:** فلانكەس چاوی كز بوون ٥ بەخۆبادان و لارو لەنجە رۆیی ٥ دەشگوترێ: (جاء يتهبَّى)، بەدەستی بەتاڵ هات ٥ **ألهابي من التراب:** خۆڵە پەتە گڵە وردە ٥ گڵ و خۆڵی سەر گۆڕ ٥ ئەستێرە كە تەپ و تۆز نەهێڵێ ببینرێ ٥ **الهَبَاءُ:** تەپ و تۆزێك كە باهەڵیدەستێنێ و بەشتەوە دەنوسێ ٥ یان بەحەواوە بەهۆی تیشكی خۆرەوە نەبێ نەبینرێ ٥ ئادەمیزادی بێ عەقڵ یان كەم عەقڵ ٥ تەپ و تۆزێك لەكاتی گێژەڵوكە دا بەرز دەبێتەوە ٥ **الهَبَاءةُ:** گەردیلەیەك لەتەپ و تۆز.

**الهباية من الشجر:** توێكڵی درەخت ٥ **الهُبُو:** ئاگری خامۆش بوو ٥ **الهَبْوَةُ:** تەپ و تۆز ٥ **الهَبِيُّ:** منداڵی بچوك ٥ بۆ مێینە (هَبِيَّةٌ) ٥ **هَتَأَهُ هَتْئاً:** لێیدا ٥ (هَتَأهُ بالعصى)، بەگۆچان لێی دا.

**هَتِئَ هَتْئاً:** لەبەر پیری یان نەخۆشی پشتی چەمایەوە ٥ **تَهَتَّأ الثوبُ:** كراسەكە دڕاو رزی ٥ **الهَتْأ:** تاوێك، ماوەیەك، دەمێك، ساتێك.

**هَتَّ الماءُ ونحوه هَتِيتاً:** ئاوەكە لەكاتی هەڵڕژان و رۆكردنی دا خورەی هات.

**هَتَّ في كلامه:** لەقسەكردنی دا پەلەی كرد.

**هَتَّ الهمزةَ:** بەرێك و پێكی هەمزەی دەربڕی.

**هَتَّ الشَيْءَ:** شتەكەی شكاندو وردو هاڕی كرد.

**هَتَّ الثوبَ ونحوه:** قوماشەكەی دڕی و ونجڕ ونجڕی كرد.

**هَتَّ عِرضَهُ:** ناموسی شكاند.

**هَتَّ فلاناً:** لەروتبەو رێزو شانی فلانی كەمكردەوە.

**هَتَّ الشَيْءَ:** شوێن شتەكە كەوت و بەشوێنی دا گەڕاو خەریكیەتی.

**هَتَّ الماءَ ونحوه:** ئاوەكەی بەهێواشی رشت و درێژەی بەڕژاندنەكەی دا ٥ **الهِتُّ:** چەقە چەناوی زۆر بڵێ ٥ هێواش لەكاركردن دا ٥ **الهَتُّ:** دەگوترێ: (تركهم هَتّاً بَتّاً): بەتێكشكاوی و تارومار كراوی جێی هێشتن ٥ دەنگ و خشپەو خرمە ٥ دەگوترێ: (سمعت هَتَّ قدميه)، گوێم لەخشپەی قاچەكانی بوو ٥ **الهَتّاتُ:** چەقەچەناوو زۆر بڵێ.

**هَتَرَ هَتْراً:** نەحمەق و گێل و نەفام بوو.

**هَتَرَ فلاناً الكِبَرُ**: خۆ بەزلزانیو لوتبەرزیی عەقڵی فلانی نەهێشتووە.

**هَتَرَ عِرْضَهُ**: نامووسی شکاند ◊ **أهْتَرَ فلان**: فلانکەس بێ عەقڵ بوو ◊ **اهْتَرَ فلاناً الكِبَرُ**: خۆبەزلزانی فلانکەسی ئەحمەقو نەزان کرد ◊ **أُهتِرَ فلان بكذا**: فلانکەس شەیدای فلان شت بووە باکی نییە چی پێ دەگوترێ لەوبارەوە ◊ **هاتَرَهُ**: بەنارەوا جوێنی پێدا ◊ **هَتَّرَ العِرْضَ**: زۆر ناموسی شکاندو شرتو شۆی لێ بری ◊ **تهاترا**: هەریەك لەو دوانە قسەو بوختانی بۆ ئەوی تر هەڵبەست ◊ دەشگوترێ: (تهاترا الشاهدان): ئەو دوو شایەتە یەکتریان بە درۆخستەوەو شایەتییەکەیان بەتاڵ دەرچوو ◊ **تَهَتَّرَ**: ئەحمەقو نەزان بوو ◊ **أُسْتُهْتِرَ فلان**: فلانکەس بەهۆی پیریو شتی واوە عەقڵو هۆشی لەدەست دا ◊ کاروباری هەمووی پوچ بوو.

**أسْتُهِرَ بالشَّيْءِ**: خوی بەوشتەوە گرتوو تێیدا نوغرۆ بووە وازی بۆلێ ناهێندرێو گوێ ناداتە رەخنەو لۆمەی خەڵکی هیچ دەستی پێ لێ هەڵناگرێ ◊ **التَّهاتُرُ**: شایەتەکان کەهەریەکەیان ئەوی تر بەدرۆ دەخاتەوە ◊ **التُّهْتَارُ**: ئەحمەقیو نەزانی ◊ **المُهاتَرَةُ**: قسەو ئاخاوتن کەهەندێکی هەڵوەشێنێتەوە ◊ **المُهْتَرُ**: ئەوکەسە هەڵە بکا لەقسەکردن دا ◊ **الهُتْرُ**: نەمانی عەقڵ بەهۆی پیری یان نەخۆشی یان باغریو خۆبەزلزانییەوە ◊ **الهِتْرُ**: بەتاڵو پوچ ◊ قسەی بێ ماناو بێ بناغە ◊ درۆو دەلەسە ◊ کاری سەر سوڕهێنەر ◊ بەڵاو کارەسات ◊ جورتمو ناخۆشی ◊ نیوەی یەکەمی شەو ◊ یان کەمتر لەنیوەی شەو.

**هَتَشَ الكَلْبُ أو السَّبُعَ هَتْشاً**: سەگەکەی هەڵناو دەنگی دا بۆئەوەی پەلاماری نێچیرەکە بدا.

**هَتَفَ هَتْفاً وهتافاً**: کەوتە هەڵهەڵەکێشان قیرەو هەرا، کەوتە گۆرانی گوتنو دەنگ هەڵدان ◊ دەگوترێ: (هتفت الحمامة): کۆترەکە خوێندیو دەنگی لێ هەڵبری ◊ دەشگوترێ: (جَعَلَ يهتف بربه): دەنگی هەڵبریو کەوتە پاڕانەوە لەخودا.

**هَتَفَ فلاناً**: مەتحی فلانی کردو وەسپی دا ◊ باسی رەوشتی جوانو مەردانەی فلانی کرد ◊ **هَتَّفَ**: بۆ زێدەمانای (هَتَفَ) دێ ◊ **الهَاتِفُ**: دەنگێك ببیسرێو خاوەن دەنگەکە نەبیندرێ ◊ تەلەفۆنو مۆبایل ◊ هەر ئامێرێك قسەی پێ بکرێ ◊ **الهُتَافُ**: دەنگی بەرز کەمەبەستی پشتگیریی کردنی شتێك، یان نارەزایی دەربرین دەربارەی، یان بۆ پێداهەڵدانو تەمجید کردنی شتێك ئەنجام بدرێ ◊ **الهَتَّاف**: ئەوەی زۆر هوتاف بکێشێ یان زۆر دەنگ هەڵبرێو شیعار هەڵداو کەسانی دیکە بۆی دوبارە بکەنەوە ◊ پێشەنگی خۆ پیشاندەرانو هوتاف کێشیان ◊ **الهَتْفَى من القِسِيِّ**: تیری وێژە وێژ لێ هاتو ◊ **الهَتُوفُ**: بەمانا (الهَتَاف) دێ.

**هتك السِتْرَ هَتْكاً**: پەردەکەی راتەکاندو لای بردو لەشوێنی خۆی لایدا ◊ یان هەندێکی دڕداو دوای پەردەکە دەرکەوت.

**هَتَكَ الثوبَ**: قوماشەکەی لەباری درێژیی دادری.

**هَتِكَ**: دەگوترێ، (هُتِكَ عَرْشُهُ): کورسیو پلەو پایەی نەما ◊ شانسو بەختی سەرەو خوار بوو ◊ **هَاتَكَ الليلَ**: بەناو تاریکی شەودا رۆیی ◊ **هَتَّكَ الأسْتَارَ**: پەردەکانی داتەکاندنو لای دان لەشوێنی خۆیان نەیهێشتن ◊ بۆ زێدە رۆیی لەمانای (هَتَكَ)دێ ◊ **تَهَتَّكَ فلان**: فلان کەس باکی نەبوو ئاخۆ حەیای دەچێو سەرزەنشت دەکرێ ◊ پرکێشێ هەڵەو تاوانی کرد ◊ فلان

حەیای چوو کەسایەتی دابەزی ٥ دەگوترێ: (تَهَتَّكَ فِي البطالة): لەگومڕاییو خراپەکاری دا ڕۆچوو نوغرۆ بوو ٥ الهُتْكُ: دڕاو ونجڕ ونجڕ بوو ٥ الهُتْلَةُ: حەیا چونو دەرکەوتنی کاری خراپی بەنامەکی.

**هَتَمَ** فاه: ددانی پێشەوەی دەرهێنان.

**هَتِمَ** الشَيْئُ هَتماً: شتەکە شکا.

**هَتِمَ** الإنسانُ وغيره: ددانی پێشەوەی مرۆڤەکە شکان ٥ أَهْتَمَ الشَيْئَ: شتەکەی شکاند ٥ دەگوترێ: (أَهْتَمَ ثَنِيَتَهُ): ددانی شکاند ٥ أَهْتَمَ الإنسانَ: ددانی مرۆڤەکەی شکاند ٥ هَتَّمَهُ: بۆ زیدەڕۆیی لەمانای (هَتَمَهُ) دێ ٥ تهاتما: قسەی ناشیرینیان بەیەکتر گوت ٥ تَهَتَّمَ: دەگوترێ: (تَهَتَّمَتْ أسنانُهُ): ددانی شکان ٥ الهُتَامَةُ: ئەوەی لەشت دەشکێ ٥ الهَيْتَمُ: ڕووەکێکی دەشتەکی پڕژو پالاوییە.

**هَتْمَرَ**: زۆری قسەکرد ٥ هَتْمَلَ فلان: فلانکەس بەهێواشی قسەی کرد ٥ فیتنەیی کرد ٥ هَتْمَلَ الرجلان: دوو پیاوەکە بەیەکەوە سرتەیان کردو نەیانویست کەسی تر گوێی لەدەنگیان بێ ٥ الهَتْمَلَةُ: قسەی سرتە ٥ هَتَنَت السماءُ: ئاسمان بارانی بەخوڕەمی باراندو بەردەوام بوو لە بارین دا ٥ دەگوترێ: (هَتَنَ الدَمْعُ): فرمێسکەکە ڕژایە خوار ٥ التَهْتَانُ: بارانێکە تاو تاوە، دەمێک دەبارێو دەمێک خۆش دەکاتەوە ٥ الهَتُونُ: بارانی پڕ دڵۆپ ٥ بارانێک بەخوڕەمو ڕێژنە بێ ٥ هَتْهَتَ فلان في الكلام: فلانکەس پەلەی کرد لەقسەکردن دا زمانی تەتەڵەی کرد ٥ هَتْهَتَ الشَيْئَ: بەزەخت پێی لەشتەکە ناو شکاندی ٥ الهَتْهَاتُ: کەسێکە خێرا خێرا قسەبکاو زمانی تەتەڵە بکا.

**هَتَا** الشَيْئَ هَتواً: شتەکەی شکاند ٥ یان بە توندی قاچی بە شتەکەدا ناو شکاندی ٥ هاتى فلان: فلانکەس وەری گرت ٥ گرتی ٥ هاتى فلان الشَيْئَ: فلانکەس شتەکەی نزیک کردەوە ٥ هاتى فلاناً الشَيْئَ: شتەکەی دایە فلانکەس ٥ دەگوترێ: (الهِتِيُ من الليل): بەشێک لەشەو ٥ الهِتِيُ من الليل: بەمانا (الهِتِيُ) دێ.

**هَثَّ** فلان هَثّاً: فلانکەس درۆی کرد.

**هَثَّ** الأشياءَ: شتەکانی تێکەڵ بەیەک کردن.

**هَشَمَ** لفلان من الشَيْئِ هَشْماً: لەوشتە بەشێکی زۆری دا بەفلانکەس.

**هَثَمَ** الشَيْئَ: شتەکەی وردکرد ٥ الهَيْثَمُ: کۆمەڵە لبو کۆمەڵە گڵی نزم ٥ بازو هەڵۆ ٥ بێچوی دالاش ٥ هەروا بەمانا (الهَيْثَم)دێ ٥ هَثْهَثَ في السير: لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد ٥ هَثْهَثَ السحاب بمطره وثلجه: هەورەکە خێر خێرا بارانو بەفری باراند ٥ هَثْهَثَ الأشياءَ: شتەکانی تێکەڵاو بەیەک کردن ٥ هَثْهَثَ الشَيْئَ: پێی لەشتەکە ناو شکاندی ٥ هَثْهَثَ فلاناً: ستەمی لەفلان کرد ٥ الهَثْهَاثُ: خێرا، دەگوترێ: (سیر هثهاث): ڕۆیشتنی خێرا ٥ وڵاتێک تەپو تۆزی زۆر بێ ٥ درۆزن ٥ الهَثْهَثَةُ: هەراو هۆریاو قاوو قیژو تێکەڵاو بوونی دەنگەکان لەکاتی شەڕو هەرادا.

**هَثَى** هَثْياً: دەمو چاوی سور هەڵگەڕا.

**هَثَى** الترابَ: گڵو خۆڵی پرژاند ٥ دەگوترێ: (هثى له من ماله): لەماڵو سامانی خۆی بەشی دا ٥ هاثاه: گاڵتەی لەگەڵ کرد.

**هَجَأَ** الشَيْئُ: شتەکە دابڕا.

**هَجَأَ** جوعُهُ: برسیایەتی نەما، برسیایەتییەكەی ئارام بۆوە.

**هَجَأَ** الطعامَ: هەموو خواردنەكەی خوارد.

**هَجِئَ** هَجأً: برسیایەتیەكەی پەرەی ساندو تینی بۆ هێنا ◊ **أهْجَأَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بریەوەو لای برد ◊ دەگوترێ: (أهْجَأَ الطعامُ جوعَهُ): خواردنەكە برسیایەتییەكەی نەهێشت ◊ **أهْجَأَ الإبلَ**: حوشترەكەی بەستەوە بۆئەوەی بلەوەڕێ ◊ **أهْجَأَ فلاناً الشَّيْءَ**: شتەكەی دەرخواردی فلانكەس دا ◊ **أهْجَأَ فلاناً حَقَّهُ**: مافی فلانكەسی دایەوە ◊ **الهَجَأُ**: هەرشتێك ئادەمیزاد تێیدابێ‌و وازی لێ بیبنێ ◊ **الهَجأَةُ**: ئەحمەق‌و گێل ◊ **هَجَّتْ عينه**: چاوی بەقوڵدا چوو ◊ **هَجَّت النارُ**: ئاگرەكە بڵێسەی سەندو داگیرسا ◊ هەڵگیرسانەكەی دەنگی لێ هات لرفە لرفی هات ◊ **هَجَّ البيتَ**: خانوەكەی روخاند ◊ **هَجْهَجَ**: لەبرسا یان لەتینوا یان لەبەر ماندویی چاوی بە قوڵدا چوو ◊ دەشگوترێ: (هَجْهَجَتِ العينُ): چاوی قوڵ بوو ◊ **هَجْهَجَ النارَ**: ئاگرەكەی خۆش كرد بڵێسەی دایە ◊ **إهْتَجَّ**: سور بوو لەسەر رای خۆی‌و ئامۆژگاری كەسی وەرنەگرت ◊ **اسْتَهَجَّ**: بەرای خۆی كردو رای كەسی قبوڵ نەبوو، گومراو سەر لێ شێواو بوو ◊ خۆی خستە ناو باسەكەوە بەحەق‌و ناحەق خۆی تێ هەڵقورتاند ◊ **اسْتَهَجَّ السائرةَ**: پەلە پەلی لەكاروانەكە كردو دەنەی دان ◊ **هَجَّاج**: سواری رای خۆی بوو ◊ هەر بەقسەی خۆی كرد ◊ **الهَجَّاجَةُ**: ئەو رەشەبایەی هەموو شتێك بەگڵ دادەپۆشێ ◊ گێل‌و ئەحمەق ◊ **الهَجُّ**: نیری سەرملی گای جوت ◊ **الهَجيجُ**: شیوی قوڵ ◊ زەلكاو ◊ زەوی لاكێشەیی ◊ ئەو هێڵ‌و خەتانەی كاهین لەسەر گڵ دەیكێشێ بۆ جادو بازی.

**هَجَدَ** هجوداً: نوست ◊ شەو نوێژی كرد ◊ **أهْجَدَ البعيرُ**: حوشترەكە قورسایی خۆی خستە سەر زەوی ◊ **أهْجَدَ فلاناً**: فلانكەسی خەو لێ خست ◊ بەنوستویی بینی ◊ **هَجَّدَ فلاناً**: فلانكەسی نواند ◊ **تَهَجَّدَ**: بەمانا (هَجَدَ) دێ ◊ هەستا بۆ نوێژ یان بۆ ئیشی تر ◊ یەكتا پەرستی ئەنجام دا ◊ **التَّهَجُّدُ**: شەو نوێژ.

**هَجَرَ** هَجْراً: دوور كەوتەوە ◊ دەگوترێ: (هَجَرَ الفحلُ): نێرەكە وازی لەسواربون‌و كەڵدان هێنا ◊ **هَجَّرَ المريضُ**: نەخۆشە بزركاندی.

**هَجَرَ في الشَّيْءِ**: زۆری پێ خۆش بوو ناوی بێنێ‌و باسی بكا.

**هَجَرَ الشَّيْءَ**: وازی لەشتەكە هێنا ◊ روی لێ وەرگێرا.

**هَجَرَ الدابَّةَ**: ولاخەكەی بەپەتی كەمەندكێش بەستەوە سەرێكی لەدەستی‌و سەرێكی لەپاشوی خست‌و ئەمجار حەبلەكەی لەوكەمەندە گرێ دا ◊ **أهْجَرَ**: بەگەرمای نیوەڕۆ سەفەری كرد ◊ كەوتەكاتی نیوەڕۆ ◊ قسەی ناشیرینی وتن ◊ كەوتە چەقە چەق‌و قسەی ناشایستە ◊ دەشگوترێ: (أهْجَرَ في منطقه): قسە ناشیرینی بەدەم دا هات ◊ **أهْجَرَ الشَّيْءُ**: شتەكە تەواو بوو گەیشتە ئەندازەی خۆی ◊ **أهْجَرَتِ الفتاةُ**: كچەكە پێگەیی‌و گەیشتە تەمەنی گەنجی بەشێوەیەكی رێك‌و پێك ◊ **أهْجَرَ الحاملُ**: ئافرەتە دوگیانەكە سكی گەورە بوو ◊ **أهْجَرَ بفلان**: گاڵتەی بەفلان كرد ◊ **هَاجَرَ**: زێدی خۆی جێ هێشت ◊ **هاجَرَ من مكان كذا أو عنه**: ئەو شوێنەی تەرك كردو چو بۆ شوێنێكی تر

٥ هاجَرَ القومَ: وازى لەو گەلو هۆزە هێناو جێى هێشتن چوو بۆلاى خێڵێكى تر ٥ هَجَّرَ: لەكاتى نیوەرۆدا كەوتە رۆیشتن ٥ هَجَّرَ النهار: رۆژ بوو بەنیوەرۆ گەرماكەى پەرەى سەند.

هَجَّرَ الیه: زوو چو بۆلاىو خۆى گەیاندێ ٥ هَجَّرَ الدّابةَ: وڵاخەكەى بەكەمەند بەستەوە، بەم جۆرە حەبلێكى هێنا سەرێكى لەدەستى بەستو سەرێكى لەقاچى دواوەى ئەمجار حەبلێكى لەو حەبلە بەستو بەسنگێكەوە گرێى دا ٥ تهاجَرَ القومُ: خەڵكەكە دەنگیان لێك دابڕىو لێك ترازانو یەكتریان جێ هێشت ٥ تهاجَرَ القومُ الماءَ: خەڵكەكە بەنۆرە چونە سەر ئاوەكە ٥ تَهَجَّرَ: لەكاتى نیوەرۆدا سەفەرى كرد ٥ خۆى بەكۆچەرو موهاجیر لەقەڵەم دا ٥ لاسایى موهاجیرى كردەوە ٥ الأهْجَرُ: دەگوترێ: (هذا أهْجَرُ من ذاك)، ئەمە لەوە درێژترە ٥ گەورەترە، بەنرخ ترە، رێزدار ترە ٥ الأهْجُورَةُ: دابو نەریت ٥ المهاجِرُ: ئەوكەسەى لەمەككەوە لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) چوو بۆ مەدینە ٥ المهاجَرُ: شوێنى هیجرەت كردن ٥ المهاجَرَةُ: كۆچكردن ٥ المَهْجَرُ: ئەو شوێنەى لێوەى هیجرەت دەكەى یان كۆچى بۆدەكەى ٥ المُهْجِرُ: باشو تەواو بێ عەیبو بەنرخ لەهەموو شتێك ٥ المُهْجِرَةُ: دەگوترێ: (فتاة مُهْجِرة)، كچێكە لەناو هاوەڵەكانى دا نمونەى جوانىو عاقڵىو رەوشت بەرزییە ٥ (ناقة مُهْجِرَة)، حوشترێكى قەڵەوو خۆشرۆو رەسەنە ٥ المَهْجُورُ: دەگوترێ: (كلام مهجور)، قسەو رستەیەكە لەبیركراوەو ئێستا بەكارناهێندرێ ٥ الهاجِرُ: دەگوترێ: (شئ هاجر)، شتێكى باشو جوانو بێ عەیبە ٥ زێدە باشى بەسەر شتى تردا هەیە ٥ الهَاجِرَة: نیوەرۆ ٥ جەنگەى گەرما ٥ دەگوترێ: (طبخه الهاجرة): گەرماى نیوەرۆ كولاندویەتى ٥ وشەیەك ماناى ناشیرین لەخۆ بگرێ ٥ الهاجِرِیّ: هەجەرى؛ نیسبەت دراو بۆلاى گوندى هەجەر ٥ كەسێك واز لەسارانشینىو كۆچەریى بێنێو ببێتە شارستانى ٥ وەستاى دیوار ٥ شتى بەنرخو چاك ٥ الهِجارُ: حەبلێكە سەرێكى دەبەسترێ بەدەستى وڵاخەوەو سەرەكەى ترى دەبەسترێ بەقاچى باشویەوە ٥ بەكوردى پێى دەگوترێ: كەمەند ٥ وەتەرو ژێى كەوان ٥ هەرشتێك كەوانەیى بێو لەدەستو قاچو مل بكرێ (تۆق) ٥ تاجو كڵاوى شاهانە ٥ الهِجّیرى: زۆر بلێى ٥ قسەى ناشیرین ٥ دابو نەریت ٥ دەگوترێ: (مازال هذا هِجّیراه): تائێستا ئەوە خووو دابو نەریتیە ٥ هەرشتێك بەیادكردنى مچوڕكە بەجەستەدا بێ ٥ (بەمزۆرى لەگەڵ زەم دا دەگوترێ بۆ دابو نەریتى ناشیرین بەكاردێ ٥ الهَجْرُ: لغاو؛ لوتەوانەى وڵاخو ئاژەڵ ٥ بەمانا (الهاجِرة) دێ ٥ دەگوترێ: (شَئ هَجْرٌ): شتێكى بێ وێنە ٥ (ذهبت النخلة هَجْراً)، دارخورماكە بەرز بۆوە، گەورە بوو ٥ (لقیته عن هَجْر) دواى لێك دابرانێكى زۆر بەیەك گەیشتینەوە تووشى بوومەوە ٥ الهُجْرُ: بزركاندنو قسەى حەلەقو مەلەق ٥ قسەى ناشیرین ٥ الهَجِرُ: لاوازو هەنگاو كورت، كەسێك وردە وردە قاچ هەڵێنێ وەكوو ئەوە پێوەندكرابێ ٥ الهَجْراءُ: دەوڵەمەندىو بێ ئاتاجى ٥ الهَجْرَةُ: قەڵەوى تەواو گۆشتن ٥ الهِجْرَةُ: رەوكردن لەوڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكى تر ٥ گواستنەوەى هۆزو خێڵ لەزەوییەكەوە بۆ زەوییەكى تر بەمەبەستى دابینكردنى بژێوىو رزقو رۆزى ٥ الهَجُّورِیُّ: خواردنى نیوەرۆ ٥ الهَجِیُّ: واز لێ هێندراو ٥

پاشگوێ خراو ٥ نەویستراو ٥ ئەو گژوگیاو لقەدارەی ئاژەڵ دەیشکێنێ‌و وشك دەبێ ٥ (لبن هجیرٌ): ماستێکی باش مەییوو تام خۆش‌و بۆنخۆشە هێشتا نەترشاوە ٥ مەنجەڵ‌و قاپی گەورە، کەرەکێوی کەتەو زەبەللاح ٥ نێرە وڵاخی قەڵەو کەمەیلی کەڵدان‌و سواربوونی ماین‌و شتی وای نەبێ ٥ کاتی نیوەڕۆ بەتایبەتی لەوەرزی هاوین دا ٥ **الهَجِيرَةُ**: بەمانا (الهاجرة) دێ ٥ **الهُوَيْجِرَةُ**: کاتێکی کەمی دوانیوەڕۆ ٥ **الهِجْرِسُ**: مەیمون ٥ ڕێوی یان بێچوە ڕێوی ٥ ورچ ٥ دەگوترێ: (فلان هِجْرِس): فلانکەس دڵ پیس‌و خوێڕی‌و بەدخووە ٥ **الهَجْرَعُ**: ئەحمەق‌و گێل ٥ شێت ٥ پشت درێژ ٥ سەگی سلۆقی ٥ **الهِجْزَعُ**: ترسنۆك.

**هَجَسَ** الأمرُ في صدره هَجْساً: خەیاڵی ئەو ئیشەی بەدڵ دا هات.

**هَجَسَ** فلاناً عن الأمر: فلانکەسی لەو کارە گێڕایەوە ٥ **هاجَسَهُ**: بەگوێیدا سرکاند ٥ **تهاجسا**: بەسرتە قسەیان بۆیەکتر کرد ٥ **المُتَهَجِّسُ**: دەگوترێ: (خبز مُتَهَجِسٌ): نانێکە هەویرەکەی باش نەشێلدراوەو هەڵنەهاتووە ٥ **المَهْجوسُ**: دەگوترێ: (وقعوا في مهجوس من الأمر): کەوتنە سەر سامی‌و حەیرانبوونەوە دەربارەی کارەکەو نازانن ڕوداوەکە چۆنە ٥ **الهاجِسُ**: خەیاڵ ٥ **الهَجْسُ**: دەنگی نزم دەبیسترێ‌و لێی حاڵی نابێ ٥ هەر خەیاڵ‌و خەتەرەیەك بەدڵ دا بێ ٥ لەقسەو بیرو بۆچون ٥ **الهَجِيسَةُ**: گۆشتی تەڕو تازە.

**هَجَشَ** اليه هَجْشاً: ئارەزووی کرد حەزی لێ کرد.

**هَجَشَ** بينهم: نێوانی وروژاندن.

**هَجَشَ** الأمرَ: کارەکەی وروژاند.

**هَجَشَ** الدابّةَ: وڵاخەکەی لێ خوڕی بەلێخوڕینێکی هێواش ٥ **الهاجِشَةُ**: بەمانا (الهابشة) دێ، بێگانەو دوورەی خێڵ‌و هۆز ٥ کۆمەڵێك خەڵکی بێگانە بکەونە ناو گەل‌و هۆزو تایەفەیەك ٥ **الهَجْشَةُ**: ڕاپەڕین‌و پەلاماردان ٥ دژوەستان‌و ڕوبەڕوبوونەوە.

**هَجَعَ**: شەو نوست.

**هَجَعَ** الجوعُ: برسیایەتی دامرکایەوە نەما ٥ **أهْجَعَهُ**: نواندی خەوی لێ خست ٥ **أهْجَعَ الطعامُ الجوعَ**: خواردنەکە ئازاری برسیایەتییەکەی دامرکاند ٥ **هَجَّعَ**: بۆ موبالەغەو زێدەڕەوی لەمانای (هَجَعَ)دێ.٥**التَّهْجاعُ**: خەوی کەم، سوکە خەو، سەرە خەو ٥ خەوی شەو ٥ **المِهْجَعُ**: غافڵ‌و تێنەگەیشتوو لەمەبەست ٥ گێل‌و خەواڵوو ٥ **الهَجْعُ** من الليل: بەشێك لەشەو ٥ دەگوترێ: (زارني بعد هجع من الليل): دوای تێپەڕبوونی بەشێك لەشەو هاتە دیدەنیم ٥ **الهَجِعُ**: بەمانا (المِهْجَعُ) دێ ٥ **الهَجْعَةُ**: نوستنی کەم سەرەخەو شکاندن لەسەرەتای شەودا ٥ دەگوترێ: (استيقظتُ بعد هجعة): دوای سەرەخەو شکاندنێك بەخەبەر هاتم ٥ **الهِجْعَةُ**: جۆرێکە لەنوستنی کەم ٥ **الهُجْعَةُ**: بەمانا (الهَجَعُ)دێ ٥ دەگوترێ: (مضى هَجْعٌ من الليل): بەشێك لەشەو تێپەڕی.

**هَجَفَ** هَجْفاً: لەماندوێتی‌و شەکەتی دا لاکەلەکەی وێك هاتنەوە، پەراسوی بەورگییەوە نووسان.

**هَجِفَ** هَجَفاً: ئەوەندە کزو لاواز بوو ئێسقانی دەرکەوتن ٥ (فهو أهْجَفُ وهي هَجْفاءُ) ٥ **هَجِفَتِ** الأرضُ: چی لەزەوییەکە دا بوو بوو بەتەپ‌و تۆزو بەحەوادا چوو ٥ **إنْهَجَفَ**: کزو کۆڵەوار بوو ٥ **الهُجْفَانُ**: تینوو، پرش هەڵاتوو ٥ **الهِجَفُ**: نێرە

شوتورمورغی پیر ◊ ئادەمی وشك تەبیاتو تەمبەڵ ◊ ئاژەڵی تەمبەڵ ◊ ورگ زل ◊ کەتەو زلی بێ خێرو سود.

**هَجَلَ** الشَيئَ: شتەکەی فڕێ دا نەیویست ◊ **هَجَلَت المرأةُ بعينها**: ئافرەتەکە بەچاو ئیشارەی کرد بۆ پیاوەکە ◊ **أهْجَلَ**: بەزەوی نەرمەڵان دا ڕۆیشت ◊ **أهْجَلَ الشَيئَ**: شتەکەی فراوان کرد ◊ **أهْجَلَ المالَ**: ماڵو سامانەکەی بەفیڕۆ دا ◊ حوشترەکانی پاشگوێ خستن هیچ سەروکاری نەکردن ◊ **هاجَلَ**: بەزەوی نەرمەڵان دا ڕۆیشت ◊ **هاجل فلاناً**: لەگەڵ فلانکەس دا یەکتریان هێناو برد ◊ **هَجَّلَ فلاناً**: جوێنی بەفلانکەس دا ◊ دەگوترێ: (هَجَّلَ عِرضه): جوێنی بەناموسی دا ◊ **اهتجَلَ الشَيئَ**: شتەکەی داهێنا ◊ **المَهْجِلُ**: کونی بەرەو خوار بۆ ناو زەوی ◊ **الهاجِلُ**: نوستو ◊ کەسێك زۆر سەفەر بکا ◊ دەگوترێ: (دَمْـع هاجــل): فرمێسکی ڕەوان ◊ **الهَجْلُ**: زەوی نەرمو نەرمایی ◊ دەشتی کاکی بەکاکی ◊ **الهُجُـلُ**: ئافرەتی بەدخوو داوێنپیس ◊ **الهجيـلُ**: حەوزە ئاوێك تەواو نەبووبێو ئیش کردنی تێدا مابێ ◊ یان بەنارێكو پێکی دروست کرابێ.

**هَجَمَ** عليه هجوماً: لەناکاو پەلاماری دا ◊ دەگوترێ: (هجم البرد): سەرما هێرشی هێناو لەناکاو پەیدا بوو.

**هَجَمَ** البيتُ: خانوەکە ڕوخا ◊ **هَجَمَت العَيْنُ**: چاوەکە بەقوڵ دا چوو.

**هَجَمَ** فلان: فلانکەس سەری داخستو بێ دەنگ بوو.

**هَجَمَ** المرضُ: نەخۆشییەکە بنبڕکرا.

**هَجَمَ** المكانَ ونحوه: بەزۆرە ملێ چووە ناو شوێنەکەوە.

**هَجَمَ** الدابّةَ ونحوها: بەتوندی وڵاخەکانی لێ خوڕین ڕاپێچی کردن ◊ دەگوترێ: (هَجَمْنا الخَيْلَ على القوم): ئەسپەکانمان هەڵێنگ دا بۆسەر قەومەکەو هێرشمان کردە سەریان.

**هَجَمَ** الريحُ تَهْجُمُ الترابَ على الدار: ڕەشەبا هێرشی هێناو خشتو خۆڵی بەسەر خانوەکەدا دا.

**هَجَمَ** العَدُوَّ: دوژمنی دەرکرد.

**هَجَمَ** الناقةَ: حوشترەکەی دۆشی.

**هَجَمَ** ما في الضرع ونحوه: ئەوی لەگوانەکە دا بوو دایدۆشیو هیچی تێدا نەهێشتەوە.

**هَجَمَ** الحَرُّ الدابّةَ: گەرما ئارەقی لەوڵاخەکە دەردا.

**هَجَمَ** البَيْتَ: خانوەکەی ڕوخاند ◊ **أهْجَمَ عليه الشَيئَ**: شتەکەی هەڵنا بۆ ئەوەی پەلاماری بدا ◊ **أهْجَمَ الناقةَ**: حوشترەکەی دۆشی.

**أهْجَمَ ما في الضرع**: چی لەگوانەکە دا بوو دایدۆشی ◊ **أهْجَمَ الدابّةَ**: وڵاخەکەی حەساندەوە ◊ **أهْجَمَ المرضَ عن فلان**: نەخۆشییەکەی لەفلانکەس لابرد ◊ **هاجَمَهُ**: شتەکەی هەڵنا بۆئەوەی پەلاماری بدا، تێی بەردا ◊ **إهْتَجَمَ الشَيئَ**: بەمانا (هَجَمَ عليه) دێ ◊ **إهْتَجَمَ ما في الضرع**: چی لەگوانەکەدا بوو دایدۆشی ◊ **اهْتَجَمَ المرضُ فلاناً**: نەخۆشی فلانکەسی لاواز کرد ◊ **انْهَجَمَ البيتُ**: خانوەکە ڕوخا ◊ **انهَجَمَتْ عينه**: چاوی بەقوڵدا چوو ◊ فرمێسکی لێ هاتن، ئاوی کرد ◊ **انهَجَمَ العَرَقُ**: ئارەقی کرد ◊ **تهاجَمَا**: ئەو دووکەسە پەلاماری یەکتریان داو هێرشیان بۆیەك برد ◊ **تَهَجَّمَ على غيره**: بەشێوەی توندو تیژی هێرشی بۆکرد ◊ بەزۆرە ملێ هێرشی کرد بەویستی خۆی نەبوو ◊ **الإهتجام**: کۆتایی شەو ◊ **الهَجّامُ**: ئازاو نەبەردو هەمیشە هێرشبەر ◊ شێر ◊

**الهَجْم:** قاپی گەورە ﷺ شیری تێدا بدۆشرێ ◊ عەرەق ◊ **الهجمة من الليل:** سەرەتای تاریکایی شەو ◊ **الهَجْمَةُ من الشتاء:** جەنگەی سەرماو سۆڵی زستان. ◊ **الهجمة من الصيف:** جەنگەی گەرمای هاوین ◊ هەروا وشەی (الهَجْمَةُ): ناوە بۆ گارانە حوشتری زۆر لەخوار ژمارە سەدەوە ◊ هەروا ناوە بۆ مەڕی پیر ◊ **الهَجُوم:** هەرشتێک خێرا پەلاماری بداو لەهێرش بردندا گورچو گوڵ بێ ◊ بای بەهێزو تەوژم، کەبەلای هەرشتێک دا بڕوا دەری بێنێ هەرشتێک ئارەق لەجەستەدا ڕەوان بکا ◊ **الهَجِيمَةُ:** فڕێدراو دەرکراو ◊ شیرێک نەمەیی بێو خەریک بێ بمەیێ ◊ **الهَيْجَمَانَةُ:** دوڕو گەوهەر ◊ جاڵجاڵۆکەی نێر ◊ **هَجَنَتِ الصَبِيَّةُ:** کچەکە پێش ئەوەی باڵغ ببێ شوی کرد ◊ **هَجَنت الناقةُ:** حوشترەکە ئاوس بوو پێش ئەوەی کاتی ئاوس بوونی بێ ◊ **هَجَنت النخلةُ:** دارخورماکە بەری گرت لەکاتێکا ساوابوو کاتی بەرگرتنی نەبوو.

**هَجَنَ** الزندُ: شقارتەکە بەیەك جار لێخشاندن ئاگری نەکردەوە.

**هَجُنَ:** قسەکە بێ کەڵك و ناشیرین بوو قسەی پڕو پوچ و خوێڕیانە بوو ◊ **أهْجَنَ:** حوشتری باشی زۆر هەبوون ◊ **أهْجَنَ الفتاةَ:** کچەکەی مارەکرد لەتەمەنی منداڵی دا، هێشتا کاتی شوی نەهاتبوو بەشوی دا ◊ **أهجَنَ الفحلُ الناقةَ:** کەڵەحوشترەکە سواری حوشترە مێیەکە بوو کەڵی دا هێشتا حوشترە مێیەکە دوساڵە بوو کەڵی گرت و بێچوی بوو، سێ ساڵی تەواو کرد بوو پێی لەساڵی چوارەم نابوو ◊ **هَجَّنَ الشيءَ:** شتەکەی لەحاڵی خۆی لاداو بەتەواویی نەیخستە سەر حاڵەتی دووەمی ◊ دەگوترێ: شیری مەیاند بەڵام نەبوو بەماستی تەواو یان شتەکەی عەیبدار کرد ◊ **هَجَّنَ الأمرَ:** ناشیرینی کردو عەیبداری کرد ◊ **اِهْتَجَنت الصَبِيَّةُ:** کچەکە شوی کرد پێش ئەوەی باڵغ بێ ◊ **اِهْتَجَنَت النخلةُ:** نەمامەدار خورماکە بەساوایی بەری گرت ◊ **اُهْتُجِنَت الشاةُ:** مەڕەکە ئاوسبوونی لێ دەرکەوت ◊ **تَهَجَّنَت النخلةُ:** بەمانا (اِهْتَجَنت)دێ ◊ **إسْتَهْجَنَهُ:** ناشیرینی کرد ◊ بەلایەوە ناشیرن بوو ◊ دەگوترێ: (هذا مما يُسْتَهْجَنُ قولُه): ئەمە شتێکە گوتنی ناشیرینە ◊ **الأُهَيْجِنَةُ:** ئەو کوڕە گەنجانەی کەسوکار یان پێش باڵغ بوونیان ئافرەتی منداڵکاریان لێ مارەکردن ◊ **المُهَجَّنَةُ من النوق:** حوشتری ڕەسەن کەبەمەرج گیرابێ جگە لەکەڵە حوشتری خۆو وڵاتی لەحوشتری تر کەڵ نەدرێ ◊ هەروا ناوە بۆ درەختی خورما لەسەرەتای موتوربە کردن و تەلقیح کردنی دا ◊ یان حوشتری تازە کەڵ گرتوو ◊ **المُهْجَنَةُ:** هۆزو خێڵێك بێ خێرو بێربن ◊ **الهِجَانُ من الأشياء:** شتی چاك و ڕەسەن ◊ حوشتری سپی بەنرخ ◊ دەگوترێ: (رجل هجان): پیاوێکی نەجیب زادەو خانەدان ◊ (إمرأة هجان): ژنوییەکی بەپیت و بەرەکەتە ◊ **الهِجانة:** وەجاخزادەیی و ڕێزداری ◊ خاوەن خانەوادەی ڕەسەن ◊ **الهِجَانُ:** هێستر سوار ◊ **الهُجْنَةُ:** دەست و مل و کەفەڵ و جەستە گەورەیی ئەسپ واتە ئەسپی کەتەو ناقۆڵا ◊ عەیب و ناشیرینی ◊ دەگوترێ: (في كلامه هجنة) : لەگوفتاری دا قسەی ناشیرینی تێدا بوو ◊ **الهَجِينُ:** شیر هەوێن کرابێ و هێشتا نەبوبێتە ماست ◊ دەشگوترێ: (رجل هجين): پیاوێکی خوێڕییە ◊ لەوڵاخە بەرزەدا ناوە بۆ هێسترێك لەمایینی عەرەبی بوو بێ ◊ پیاوێك باوکی عەرەب و دایکی ناعەرەب بێ ◊ جۆرە حوشترێکە جەستە بچوك و خۆشڕەو ◊ لەبواری

زانستی زیندەوەر زانی دا بریتییە لەڕووەکێك یان ژیانداریك لەبەیەك گەیشتنی دوو توخمی جیا لەیەك هاتبێتە کایەوە ٥ **الهَجَنَّفُ**: شتی درێژو یان ٥ **هَجْهَجَ الفَحْلُ**: کەڵەکە بەتوندی مرقاندی، بۆڕاندی ٥ **هَجْهَجَ الجملَ**: حوشترەکەی ڕاونا دەری کرد بەوتەی دەنگی (هِیجْ هِیْجْ) ٥ **هَجْهَجَ فلاناً عن مقصده**: فلانکەسی لەمەبەستی خۆی لادا ٥ ڕەتی کردەوە ٥ **الهُجَاجِعُ**: کەتەو زەبەلاح ٥ زۆر بارە بارِ کەرو بۆرە بۆرِ کەر ٥ **الهَجْهَاجُ**: بۆرە بۆرکەری دەنگ تیژو ناخۆش ٥ بەلاو کارەسات، تورەو سرك ٥ ئەحمەقو بەدرەفتار ٥ شەڕانیو شەڕەنگێز ٥ کاڵفامو بێ عەقڵ ٥ درێژو کەتە ٥ پیرە حوشتر ٥ **الهَجْهَجُ**: زەوی ڕەقی بێ بەروبووم ٥ **الهُجْهِجُ**: بەران ٥ ئاوی تۆزێك تفت ٥ **الهَجْهَجَةُ**: لاسایی کردنەوەی دەنگی حوشتر لێ خوڕین.

**هَجَا** الكتابَ هَجْواً وهجاءً: کتێبەکەی خوێندەوە ٥ فێری بوو.

**هَجَا** فلاناً: زەمی فلانی کرد شتی ناشیرینی پاڵ دا ٥ عەیبەکانی ژماردن ٥ دەگوترێ: (المرأة تهجو صحبة زوجها): ئافرەتەکە گلەیی لەهەڵسو کەوتی هاوسەرەکەی دەکرد.

**هَجُوَ** اليومُ: ڕۆژەکە زۆر گەرم بوو ٥ **أهْجَى القولَ أو الشِّعْرَ**: قسەکان یان شیعرەکە ناوەڕۆکیان هەموو جنێوو وتەی ناشیرین بوو ٥ **هاجاه مهاجاةً**: هەریەك لەودوانە جنێوو قسەی ناشیرنییان بەیەکتر گوتن ٥ **هَجَّى الصبيَّ الكتابَ**: کتێبەکەی فێری فلانکەس کرد ٥ **إهْتَجَى فلاناً**: جنێوی بەفلانکەس دا ٥ **تهاجيا**: هەریەك لەو دوانە جنێوی بەوی تردا قسەی ناشیرینیان بەیەکتری وت ٥ **تَهَجَّى الحروف الأبجدية**: پیتەکانی (ابجد هوز...هتد...) ژماردنو ناوی هێنان یان دەنگەکانی دەربڕین ٥ **تَهَجَّى القرآن**: قورئانی خوێند ٥ یان فێری خوێندنی قورئان بوو ٥ **الأُهْجُوَّة**: هەرشتێك هەجوی پێ بکرێوجنێوو تانەو تەشەری تێدا بێ جا شیعر بێ یان پەخشان بێ ٥ **الأهجية**: بەمانا (الأهجوة) دێ ٥ **التَّهجِّي**: پیتەکانی هیجا ٥ ئەو پیتانەی وشەیان لێ پێك دێ لەپیتی ئەلفەوە تا پیتی (ي) ٥ **الهِجَاءُ**: جنێوو

ژماردنی عەیبو عار بەزۆری بەشیعر دەبێ
چایەکەی ماھ ئەفوەم زەردە وەک میزی ئەخۆش
نیحتیاج ناکا بەناگر هەر بەدوو تڕ دێتە جۆش
(شێخ ڕەزا)

هەروا وشەی (الهجاء): پارچە پارچە کردنی وشەیە بۆ پیتەکانی واتە بە (عینجە خوێندن) ٥ دەشگوترێ: (فلان على هجاء فلان): فلانکەس بەئەندازەی فلان درێژە بەقەد ئەو باڵای بەرزە ٥ (حروف الهجاء): ئەو پیتانەن وشەیان لێپێك دێ وەکوو (أ-ب-ت-ث-ج- تادەگاتە پیتی ی) واتە ئەو پیتانە واریز بەندکراون شێوەو ڕەسم تێیان دا بەرچاو گیراوە ئەوپیتانەی لەشێوەدا لێك دەچن خراونە پەنایەکەوە ٥ **الهَجَّاءُ**: کەسێك زۆر هەجوی خەڵكو شتی تر بکا ٥ دەگوترێ: (رجل هَجّاءٌ): پیاوێکی جوێن فرۆشە ٥ عەیبگرە.

**هَجِيَ** البَيْتُ: خانووەکە دەرکەوت.

هَجِيَت العينُ: چاوەکە بەقوڵا چوو.

**هَجِيَ** الرجلُ: پیاوەکە برسیایەتییەکەی زۆر بوو تینی بۆ هات.

**هَدَأَ** هَدءاً وهُدُوءاً: ئارام بۆوە ٥ دەگوترێ: (هَدَأ الألم عنه): ئازارەکەی ئارام بووە، ئیشی نەما

**هَدَأَ** بالمكان رفيه: لەوشوێنە مایەوە جێگیر بوو.

**هَدَأَ هَدَءاً**: چەمایەوە پشتی کۆمبۆوە شانی بۆلای سنگی هاتن.

**هَدَأَ البعیرَ**: حوشترەکە دوگی بچوك بۆوە ◊ **أهْدَأَ الشیئَ**: شتەکەی داسەکناندو ئارامی پێ گرت ◊ دەشگوترێ: (لا أهـدأه الله): خـودا مانـدوییو نارەحـەتی لەسـەر لانـەبا ◊ **أهْـدَأَ الـصَّبِيَّ**: بەهێـدیو لەسـەرخۆ بەنـەملاو ئـەولای منداڵەکەی کێشا بۆئەوەی خەوی لێ بکەوێ ◊ **أهْدَأَ الكبرُ**: پیری چەماندییەوە ◊ **أهْدَأَ كثرةُ الحمل السنامَ**: بارکێشانی زۆرو ماندویەتی دوگی حوشترەکەی بۆچاندەوە ◊ **هَدْأَة**: ئارامی پێ گرتو دایسەکناند ◊ **الأهْدَأَ من المناكب**: شانی خـوارو چـەماوە بـۆ پێشەوە بـۆلای سـنگ ◊ **المَهْدَأة**: دەگوترێ: (تركته على مُهَيْدِئته): لەسەر حاڵی خۆی جێم هێشت ◊ **الهَدْءُ**: بەشی یەکەم لەسێ بەشی شەو ◊ **الهُدُوءُ**: بـەمانا (الهَدْء)دێ ◊ **الهَدْأةُ**: ئارام گرتنو لەجوڵە کەوتن ◊ بەشی یەکەم لەسێ بەشی شەو ◊ **الهِدْأةُ**: لەسەرە خۆیی، ئارام گرتن ◊ دەگوترێ: (ماله هِدْأة ليلة): ساتێـك ئـارام نـاگرێو برسـیایەتیو خـەمو خەفەت لەکۆڵی نابنەوە.

**هَـدَبَ الـشیئَ**: شتەکەی پارچـە پارچـە کـرد ◊ دەشـگوترێ: (هَـدَبَ الهَـدَبَ): ئەوشـتەی لـەدرەختی (هَـدَب)کـردەوە ◊ **هَـدَبَ الثمـرةَ**: میوەکەی چنی.

**هَدَبَ**: بەسەری پەنجەی حوشترەکەی دۆشی.

**هَدِبَ هَدَباً**: شەرەی درێـژ بـوون ◊ **هَدِبَتِ العینُ**: برژانگی چاوەکە درێـژ بـوو ◊ **هَدِبَتِ الشجرةُ**: درەختەکە لقەکانی درێـژ بـوونو چۆمانەوە ◊ **هَدَّبَ الثَمَرةَ**: میوەکـەی چنی ◊ **هَدَّبَ الثوبَ**: پـرزو پـاڵی بۆکراسەکە دروسـت کـرد ریشوی بۆکرد ◊ **اهْتَدَبَ الثَمَرةَ**: میوەکەی چنی ◊ **تَهَدَّبَ**: بـوو بـەخاوەن بـرژانگ ◊ **تَهَـدَّبَ الـسحابُ**: هەورەکە پرزو لقو پارچـەی لـێ شـۆڕ بونـەوە بـۆ سـەر زەوی ◊ **تَهَـدَّبَ الأغـصانُ**: لقـە درەختـەکان درێـژ بـوونو چـەمانەوە ◊ شۆڕبوونەوە ◊ **الأهْدَبُ**: کەسێکە برژانگی چاوی درێـژ بـن ◊ باڵندەیەکـە پـەڕو پـۆڵی باڵو جەسـتەی زۆر بـن ◊ **الهَـدْباء**: دەگـوترێ: (أذنٌ هَدْباءُ): گوێی شۆڕو گەورە ◊ (لحية هدباء): ریشی بەرەڵداکراو، کورت نەکراوە ◊ **الهَدْبُ**: برژانگی چاو ◊ لایـەکی قوماش کەرایـەڵی هـەبێو بـێ پۆبـێ ◊ واتـە: پـرزی رایەڵەکـە مابنـەوە بـەبێ تێـوەدان ◊ **الهَـدَبُ**: لـقو پـۆپی درەخـت ◊ هەرپەلکە گەڵایەك درێژ کۆڵەبێو پان نـەبێ ◊ وەکوو گەڵای درەختی (سَرْو وطرفاء) ◊ یان ناوە بـۆ روەکێـك پـرزو پـاڵی وردی هـەبێو گـەڵای نەبێ ◊ **الهَدِبُ**: ئەسپێـك توکی ناوچاوانی (یاڵی ناوچاوانی) درێژ بێ.

**الهُدُبُ**: گێلی کەتـەو زەبـەلاح ◊ **الهَدابُ**: بـەمانا (الهُـدُبُ)دێ ◊ هـەروا بـەمانای (الهَـدَبُ)دێ ◊ هـەروا نـاوە بـۆ قوماشێـك هـەردو لای رایـەڵی هەبێو تێوەدانی نـەبێ ◊ هـەروا ناوە بـۆ لقو پرزی دارخورما ◊ **الهَیْدَبُ**: واتـە: (حمل الثوب): ریـزی فرمێـسکی رژاو ◊ هـەوری شـۆڕ بـۆوە بۆسەر زەوی بەجۆرێك لەکاتی بارانـدنی باران دا وەکوو هەوداى شۆڕ بۆوە دەبینـدرێ ◊ گۆی مەمکی شلی ئافرەت کە بـەهۆی نەخۆشی یـان پـیری یـان شـتی تـرەوە چـرچ بووبـێ ◊ دەشگوترێ: (رجـل هَیْـدَبٌ): پیاوێـکی کەتـەی وشـك تـەبیاتی تـوکن ◊ **الهَیْـدَبی**: جـۆرە رۆیشتنێکی حوشترە ◊ **الهَیْدَبِيُّ**: (رجـل هَیْـدَبِيٌّ

الكلام): پیاوێکی زۆر بلێیه ◊ الهَدِبلُ: توکن ◊ یان قژ زاکاوو سەر قژن ◊ تەمبەڵ و قونگران.

هَدَجَ الظلیمُ هَدَجاناً: نێرە شوتومروغەکە بەخۆبادان و لارو لەنجە رۆیشت.

هَدَجَ فلان: فلانکەس بەهێواشی و قونگرانی رۆیشت، لاوازبوو نەیتوانی خێرا بڕوا ◊ هَدَجَتْ الدّابَةُ هَدْجاً: حەیوانەکە سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ بێچوەکەی دەربڕی.

هَدَجَت الریح: ڕەشەباکە هاژەی هات ◊ ویژەی هات ◊ هَدَجَتِ القِدرُ: مەنجەڵەکە کوڵی و کەوتە قلپە قلپ ◊ هَدَّجَ البعیرُ: حوشترەکە دوگی گەورە بوو بەرز بۆوە دەتگوت کەژاوەی بەسەر پشتەوەیە ◊ تَهَدَّجَ الصوتُ: دەنگەکە بەهۆی لەرزین و لەرینەوە پچڕ پچڕ بوو ◊ تَهَدَّجَ القومُ علی فلان: خەڵکەکە بەباشی و جوانخاصی باسی فلانیان کردو ڕەوشتە جوانەکانی ئەویان خستنە ڕو ◊ إسْتَهْدَجَ: پەلەی کرد ◊ بەلەرزەو خۆبادان رۆیشت ◊ المسْتَهْدَجُ: پەلەی کرد ◊ المِهداجُ: دەگوترێ: (ناقة مِهداجُ) حوشترێکی بەسۆزە بۆ بێچووەکەی عەطفی هەیە ◊ (ریح مِهداج): ڕەشەبایەکی دەنگ گەورەیە ◊ الهَدَجَةُ: کورکاندن و بارەو بۆڕەی ولاخ و ئاژەڵە بۆ بێچوەکەی ◊ الهَدّاجُ: دەگوترێ: (ظلیم هَدّاج): شوتورمورغە نێرەیەکی لارو لەنجە کەرە ◊ الهَدُوجُ: دەگوترێ: (ناقة هَدُوجُ): حوشترێکی بەسۆزە بۆ بێچوەکەی ◊ قِدرٌ هَدُوجٌ: مەنجەڵێکە زوو لەکوڵ دێ ◊ یان کوڵانەکەی زۆر توندە ◊ الهَودجُ: کەژاوە ◊ الهَدَجْدَجُ: نێرە شتورمورغ لەم ڕووەوە کە لەڕۆیشتن دا لارو لەنجە دەکا ◊ کەسێک لەکاتی رۆیشتن دا بلەرزێ و وشەقەتۆڵە بکەوێ.

هَدَّ الحائط هَدّاً: دیوارەکە کەوت ◊ لەکاتی کەوتنی دەنگی لێ هات ◊ هاڕەی کرد.

هَدَّ الفحلُ: کەڵەکە، نێرەکە مرقاندی لرفاندی، بۆڕاندی، زەڕاندی.

هَدَّ فلان هَدّاً: فلانکەس لاوازو زەبوون بوو.

هَدَّ البناءَ هَدّاً وهدوداً: بەدەنگی زۆر گەورە بیناکەی روخاند.

هَدَّ الشیْئَ: شتەکەی بەتوندی شکاند ◊ دەشگوترێ: (هَدَّتْهُ الفجیعةُ): کارەسات روخاندی و برستی لێ بڕی.

هَدَّ الأرض برجله: بەتوندی ئەرزەکەی بەقاچ پەستاوت ◊ لەرۆیشتن دا ڕێگاکەی کوتایەوە ◊ دەشگوترێ: (هَدَّكَ من رجلٍ): پیاوێکی وایە وەصفی تەواو نابێ ◊ دەگوترێ: (إنه لَهَدُّ الرجلُ): بەڕاستی پیاوێکی پیاوانەی ئازاو بەجەرگە.

هَدَّ الصَّوْتُ هُدَاداً: دەنگی گەورەو گڕو ناخۆش بوو ◊ هَدَّدَهُ: هەڕەشەی لێ کرد، ترساندی ◊ تَهادَّ القومُ في السیر: خەڵکەکە بەشوێن یەکدا رۆیشتن و پاڵەپەستۆیان کرد ◊ دەشگوترێ: (هم یتهادّون): ئەوانە پرسیار لەیەکتر دەکەن ◊ تَهَدَّدَهُ: بۆ زێدەڕۆیی لەماناى (هَدَّدَهُ) دێ ◊ اسْتَهَدَّه: لاوازی کرد، هەوڵی لاوازکردنی دا ◊ الأهَدُّ: ترسنۆك ◊ التَّهْدادُ: ترساندن و هەڕەشە لێکردن بەسزا ◊ الهادُّ: دەنگی گڕو ناخۆش ◊ دەنگی دەریاو هاژەی شەپۆلی ◊ الهادة: هەور (دەنگی هەورە تریشقە) ◊ الهَدّادُ: لەسەرە خۆیی و هێدیەتی ◊ دەشگوترێ: (قوم هداد): قەومێکی ترسنۆکن ◊ الهُدادَةُ: ترسنۆك ◊ الهَدُّ: دەنگی گڕو ناخۆش ◊ پیاوی ترسنۆك و لاواز ◊ پیاوی سەخی ◊ الهِدُّ: ترسێنراو ◊ ترسنۆك و

لاواز ٥ **الهِدَان**: پیاوی گێلو تەبیاتو وشك ٥ **الهَدَّةُ**: دەنگی کەوتنە خوارەوەی شتی قورس ٥ رمبە، تمبە ٥ زرمبە ٥ **الهَدُودُ**: زەوی دەشتاییو نەرمەڵان ٥ کۆسپو تەگەرەی گەورە ٥ دەگوترێ: (أکمة هَدُودٌ): گردێکی تەلانو ناخۆشە ناتوانی پێیدا بڕۆی ٥ گردێکی سەر بەرەو ژێرە ٥ **الهَدِيُّ**: گێژەو وێژەی دەنگ ٥ پیاوی درێژ.

**هَدَرَ** هَدْراً: پوچ بوو، بەفیڕۆ ڕۆیی ٥ دەگوترێ: (هَدُرَ الشَّيْئ): شتەکەی پوچ کردەوە ٥ (هَدَرَ البعيرُ): حوشترەکە دەنگی خۆی خواردەوە ٥ (هَدَرَ الحمامُ): کۆترەکە دەنگی خۆی لەقورگیا لەراندەوە ٥ (هَدَرَ الغلامُ): منداڵەکە قسەی کرد فێری قسە بوو.

**هَدَرَ** الشرابُ: شەرابەکە کوڵی ٥ (هَدَرَ اللبنُ): شیرەکە توێی گرت ٥ لای سەرەوەی رەق بوو ٥ (هَدَرَ الجوفُ): سکی بای کرد، هاوسا.

**هَدَرَ** الشَّيْئُ هدوراً: شتەکە بەر بۆوە.

**هَدَرَ** العُشْبُ: روەکەکە درێژ بوو، پێگەیی، زۆر بوو ٥ **أهْدَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی پوچ کردەوە، دەگوترێ: (أهْدَرَ دَمَه): خوێنەکەی بەفیڕۆ دا، سزای تۆڵەسەندنەوەی لەسەر بکوژ لابرد ٥ **هَدَّرَ**: زێدەرەوی کرد لەلەرینەوەی دەنگو هێنانو بردنی لەقورگ دا ٥ **تَهادَرَ القومُ**: خەڵکەکە خوێنی کوژراوەکانیان بەفیڕۆ داو پوچیان کردەوە ٥ **إهدَوْدَرَ المطرُ**: باران بەرێژنەو لێزمە باری ٥ **المَهْدَرَةُ**: ددانی بچوکی پێشەوە ٥ **الهادِرُ**: شیری توێ گرتوو کەلای سەروی رەق بووبێو ژێرەوەی شل بێ ٥ **الهادِرَةُ**: (أرض هادرة): زەوییەکە گیاو گژی زۆرە ٥ **الهَدْرُ**: بەفیڕۆچون ٥ بەتاڵو پوچ ٥ دەگوترێ: (ذهب دمُهُ هَدْراً): خوێنی بەفیڕۆ چوو ٥ نەتۆڵە لەبکوژ ستێندرا نەخوێنی وەرگیرا ٥ (ذَهَبَ سعيه هَدْراً): کۆششەکەی بەهیچ چوو بێ سود بوو ٥ **الهَدَرُ**: بەمانا (الهَدْرُ) دێ ٥ خوێڕیو هەتیومچەی بێ خێرو بێر ٥ **الهِدْرُ**: تەمبەڵی بێ خێر ٥ **هَدَغَهُ هَدْغاً**: شکاندی، بریندار کرد ٥ **انْهَدَغَ الشَّيْئُ**: شتەکە شکا ٥ **المُنْهَدِغُ**: حەڵوای نەرم، هەر خواردنێك نەرم بێ.

**هَدَفَ** اليه هَدْفاً: چووە ژوور.

**هَدَفَ** فلانٌ للخمسين: فلانکەس تەمەنی لەپەنجا نزیك بۆوە.

**هَدَفَ** الرجلُ هَدْفاً: تەمبەڵو لاواز بوو.

**هَدَفَ** الى الشَّيْئِ: چو بۆ شتەکەو پەلەی کرد بۆلای ٥ **أهْدَفَ**: نزیك بۆوە ٥ **أهْدَفَ فلان على التلِّ**: فلانکەس بەسەر تەپۆڵکەکەی دا ڕوانی ٥ **أهْدَفَ اليه**: پەنای بۆبرد ٥ **أهْدَفَ لە**: هەستو پێشوازیی لێکرد ٥ **أهْدَفَ فلان للخمسين**: فلانکەس لەپەنجا نزیك بۆوە ٥ **استَهْدَفَ الشَّيْئُ**: شتەکە بەرز بۆوە ٥ **استَهْدَفَ الرجلُ**: پیاوەکە قیت هەڵسایە سەرپێ خۆی خوار نەکردەوە ٥ **اسْتَهْدَفَ فلان للخمسين**: فلانکەس تەمەنی لەپەنجا نزیك بۆوە ٥ **المُهْدِفَةُ**: ئافرەتی گۆشتن ٥ **الهادِفُ**: بێگانەو غەریب ٥ دەگوترێ: (هل هدف إليكم هادف): ئەرێ کەسێکی غەریب هاتە لاتان؟ ٥ هەروا ئاوە بۆ شتێك مەبەست بپێکێ ٥ دەگوترێ: (أدب هادف، وفن هادف) ٥ **الهادِفَةُ**: کۆڕو کۆمەڵ ٥ **الهَدَافُ**: ئەوکەسەی بەلێزانی تۆپەکە ئاراستەی هەدەف دەکا ٥ **الهَدَفُ**: هەرشتێك بەرز بێ ٥ نیشانە کە تیرو تفەنگی ئاراستە دەکرێ ٥ (مەرمای کورەی قەدەم) ٥ هەنگاوتنی نیشانە ٥ قونگرانو

خەوالوو قەلەوو بێ خێر ٥ **الهِدَكُ**: جەستەی مل درێژ.

**هَدَكَ البِنَاءَ**: بیناکەی ڕوخاند.

**هَدَكَ فلان**: فلانکەس خۆی گێل کرد ٥ **تَهَدَّكَ علی فلان بالکلام**: بەقسە هێرشی کردە سەر فلان‌و جوێنی پێدا.

**هَدَلَ الحمامُ او الغلامُ هديلاً**: کۆترەکە یان منداڵەکە گمە گمی کرد.

**هَدَلَ الشَيْءَ هَدْلاً**: شتەکەی بەرەو خوار شۆڕکردەوە.

**هَدِلَ البعيرُ**: حوشترەکە لیچی شۆڕ کردەوە.

**هَدِلَ الرجلُ**: پیاوەکە لیچی خوارەوەی شۆڕبۆوە.

**هَدِلَ السحابُ**: هەورەکە داکەوتە سەر زەوی، شۆڕبۆوە ٥ **تَهَدَّلَ الشَيْءُ**: شتەکە شۆڕ بۆوە، شل بوو داهات‌و چەمایەوە ٥ سیس بۆوە ٥ **الهَدَالُ**: گیایەکی هەڵتۆقیوە بەسەر لق‌و پۆپی درەختەوە دەژی‌و تەڕایی خوێنی درەختەکە هەڵدەمژێ بەکوردی پێی دەگوترێ تڕ تڕە ٥ هەروا ناوە بۆ لق‌و پۆپی شۆڕبۆوەی درەخت ٥ **الهَدَالَةُ**: تاقم‌و کۆمەڵ ٥ **الهِدْلُ**: تۆراغ، ماستی خەستەوە بووی ترش ٥ **الهَدِيلُ**: دەنگی کوتر گمە گمی کۆتر ٥ کۆترە نێرەی کێوی ٥ پیاوی توکن ٥ پیاوی تەمبەڵی قونگران ٥ **الهَيْدَلَةُ**: (الحداءُ): گۆرانی حوشتر لێخوڕ.

**هَدَمَ البناءَ هَدْماً**: بیناکەی ڕوخاند هەڵیوەشاند.

**هَدَمَ القتيلَ**: خوێنی کوژراوەکەی بەفیڕۆ دا.

**هَدَمَ الثوبَ**: کراسەکەی پینەکرد.

**هَدَمَ فلاناً**: لەفلانکەسی دا پشتی شکاند ٥ دەگوترێ: (هَدَمَ فلان ما أبرمه من الأمر): فلانکەس ئەوکارەی بڕیاری لەسەر دابوو بیکا هەڵیوەشاندەوە ٥ **هَدِمت البئرُ**: بیرەکە ئەملاو ئەولای ڕوخا ناوی‌و پڕبۆوە.

**هُدِمَ فلان**: فلانکەس توشی سەرە گێژی بوو ئاوی لێ سورا ٥ **أهدَمَ اللبنَ**: شیرەکەی بەسەر شیری ترشاودا دۆشی‌و بزرکا ٥ **هَدَّمَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (هَدَمَ)دێ ٥ **تَهَدَّمَ البناءُ**: باڵەخانەکە وردە وردە تێک ڕوخاو هاتەخوار ٥ **تَهَدَّمَ فلان علی فلان غضباً**: فلانکەس بەسەر فلان دا روخاو هەڕەشەی لێکرد ٥ **تَهَدَّمَ العجوزُ أو النابُ**: پیرەژنەکە یان ددانەکە پۆلکاو فەوتا ٥ **المهدومُ**: شیری ترشاو ماستی ترش ٥ **المهدومة**: دەگوترێ: (أرض مهدومة): زەوییەکە بارانێکی کەمی لێباری ٥ **الهُدامُ**: ئاو لێ سوران‌و سەر گێژبون‌و حاڵەتێکە لەناو دەریا دا توشی مرۆڤ دەبێ ٥ **الهَدْمُ**: بەفیڕۆ چون ٥ دەگوترێ: (دم هَدْمٌ): خوێنەکەی بە فیڕۆ چوو ٥ **الهِدْمُ**: پیرەمێردی کەنەفت ٥ گۆرەوی‌و خوففی کۆن ٥ کراسی کۆن‌و پینەکراو ٥ پۆشاکی خوری پینەکراو ٥ **الهَدْمَةُ**: وەجبە پارە ٥ مەبلەغێک پارە ٥ بارانی کەم ٥ وردە باران ٥ **الهِدْمَةُ**: پۆشاکی ڕزیو ٥ **الهَدَمُ**: خوێنی بەفیڕۆ چوو ٥ هەرشتێک بڕوخێ‌و بکەوێتە خوار ٥ دەگوترێ: (فلان شهد الهَدَم): پۆش‌و لەوەڕی ساڵی پێشوو کەلەپەناو پاساردا مابێتەوە ٥ **الهَدِمُ**: گێل‌و ئەحمەق ٥ سەر ڕەق‌و خراپەکار ٥ **الهَدِيمُ من** النبات: پڵ‌و پوشی ساڵی ڕابردو ٥ **هَدْمَلَ الرَّجُلُ**: پیاوەکە پۆشاکەکانی خۆی دڕی ٥ **الهِدْمِلُ**: کۆن‌و شلەپەتە ٥ کراسی ڕزیوو کۆن ٥ کەسێک توک‌و مۆی زۆر بێ‌و قژاکاو بێ ٥ **الهَدَمِلُ**: قورس‌و گران ٥ گردی پتەو ٥ **الهَدْمَلَةُ**: کۆمەڵە ئادەمیزادێک ٥ گردێکی پڕ دراو درەخت ٥ ڕۆژگاری دێرین.

**هَـدَنَ** فـلان هُـدوناً: فلانكـەس دامركـا، راوەسـتا، كوژايەوە ◊ گێلو نەفام بوو.

**هَدَنَ** فلانـاً: فلانكەسی كوشت ◊ فێڵی لـێ كـردو پـەيمانی پێـی دابـوو نـەيبردە سـەر ◊ لـەنيازی دانيە ئەو بەڵێنەی بەفلانی داوە جێ بـەجێی بكا.

**هَدَنَ** الـصَبِيَّ: منداڵەكـەی ژێـر كـردەوە ◊ ئاشتـی كردەوە.

**هَـدَنَ** العَـدُوَّ: شـەڕی دژی دوژمـن راگـرت، وازی لەدژايەتيكردنی هێنا ◊ بۆماوەيەك ئاگربەستی لەگەڵ دا كرد ◊ دەشگوترێ: (هَدَنَ الخبرُ فلانـاً): هەواڵەكە فلانكەسی لەمەبەستی خۆی لادا.

**هُـدِنَ** فـلان عنـك: شتێـكی بـچوك و كـەم بايـەخ فلانكەسـی لـەتۆ رازی كـرد ◊ **أهْـدَنَ الفـرسُ**: ئەسپەكە مانی گرتو غاری نەدا ◊ **أهْدَنَ الخَيْـلَ**: ئەسـپەكەی قـەدباريك كـرد ◊ وای لەئەسـپەكە كـرد قـەد باريـك بـێ ◊ **هَـدَّنَ فلانـاً**: فلانكەسی ئارام كردەوە ◊ تەمبەڵو قونگرانی كرد.

**هَدَّنَ** الـصَّبِيَّ: منداڵەكـەی ژێركـردەوە ◊ دەگوترێ: (هَـدَّنت المـرأةُ طفلـها): ئافرەتەكـە منداڵەكـەی ژێركردەوە ◊ **هـادَنَ فلانـاً**: ئـاگر بەستی لەگـەڵ فـلان كـرد، شـەڕی دژ راگـرت بـۆ ماوەيـەك ◊ **إتهَدَنَ فلان عن عزمه**: فلانكـەس ورەی دابـەزی، خـۆی رانـەگرت ◊ **تَهَـادَنَ القـومُ**: خەڵكەكـە ئاشـتەوايیان بڕيـار دا ◊ يـان وازيـان لەشـەڕو ئـاژاوە هێنـا بـۆ ماوەيـەك ◊ **تَهَـادَنَ الأمـورُ**: كارەكان جێگير بـوون ◊ **تَهَدَّنَ الرجـلُ**: پياوەكە گێلو ئەحمـەق بـوو ◊ **المُهَـدُونُ**: گێـلو نـەفام ◊ **الهِدانُ**: گێلو نەفامو تەمبات وشك ◊ قـونگرانو خـۆدزەوە لەشـەڕو نەبـەردا ◊ خـەو خـۆشو تەمبەڵ، حەزی لەخەوی بەيانيانەو زوو ناچـێ بۆ سەرئيشو كاری خۆی ◊ **الهَدِنُ**: شلو شێواو ◊ شۆڕەوە بوو ◊ **الهُدْنَة**: ئاشتی دوای شەڕ ◊ يـان مـاوەی دوا شـەڕ كەشـەڕ رابگـيرێو دوژمنـەكان خـۆ ئامـادە بكـەن بـۆ ئاشتـەوايیو مـەرج دانـان بۆيـەكتری ◊ تەمبـەڵیو خۆپـارێزی ◊ ساردبونەوەی گوڕو تينی پياو لەكارێكو هيوەر بوونـەوەی عـەزمو جـەزمی بـەهۆی بيـستنی هەواڵێك.◊ الهيدان: گێلو ئەحمـەق ◊ ترسنۆك ◊ **هَنْهَدَ الطائرُ**: باڵندەكە قـرە قـرو قاژە قـاژی كـرد ◊ **هَنْهَـدَ الـشَيْئَ**: شـتەكەی جوڵانـد، وەحەرەكـەی خـست ◊ جـمو جـۆڵی پـێ كـرد، هەڵی پەڕانـد ◊ **هَنْهَـدَ فـلان الـشَيْئَ**: فلانكـەس شـتەكەی لەبەرزييـەوە هاويـشتە خـوار ◊ دەشگوترێ: (يُهَنْهَدُ اليَ كـذا): وادێتـە خـەيالم، دڵم بۆ ئـەوە دەچـێ ئـەو شـتە وابـێ ◊ **الهُنْهُـدُ**: پەپوسلێمانكە ◊ گمە گمی كۆتر.

**هَدَى** فلان هُدىً وهـدياً وهدايـةً: فلانكـەس رێـگای راستی گرتەبەر.

**هَـدَى** فلانـاً: هيدايـەتی فلانكەسـی دا خـستيە سەررێـگای راست.

**هَـدَى** فلانـاً الطريـقَ: رێـگای نيـشانی فـلان داو شارەزای كـرد ◊ **أهْدَى الهَدْيَ أو الهَـدِيَّ الى الحرم**: ئاژەڵی قوربانی برد بۆ مەككە بۆئەوەی بيكاتـە قوربـانی ◊ **أهـدى الهديـةَ الى فـلان**: ديـاری بـۆ فلانكـەس نـارد بەمەبەسـتی رێـز لـێگرتنو دۆسـتايەتی ◊ **هـادى فـلان فلانـاً**: هەريـەك لەودوانە دياريیان بۆ يەكتر نارد ◊ **هـادت فلانةُ فلانـةً**: هەريـەك لـەو دوو ئافرەتـە خواردنيـان هێنا بۆ شوێنێكو لەوێ خوارديان.

هادی فـلان فلانـاً: فلانكـەس بڕيـاری شەڕوەسـتانی دژی فـلان دا ◊ وای لـێ كـرد لەڕۆيـشتن دا لارە لار بكـا ◊ **هـادن فـلان فلانـاً الـشِعْرَ**: فلانكـەس

بەشیعر هەجوی فلانی کرد ◊ **هَدَی العروسَ الی بعلها:** بوکەکەی نارد بۆ زاوا ◊ **هَدَی الهدیة الی فلان ولـه:** دیاری بۆفلان نارد ◊ دەشگوترێ: (فلان یهدَی للناس): فلانکەس زۆر دیاریی دەنێرێ بۆ خەڵك ◊ **اهتَدی:** ڕێبازی راستی دۆزیەوە ◊ شارەزابوو ◊ **یَهَدّي ویَهِدّي:** شارەزای دەکا ڕێی راستی نیشان دەدا ◊ هەروا بەمانا هەوڵدان و شارەزایی کردنی خەڵك بۆ ڕێبازی راست دێ ◊ یان لەسەر ڕێبازی راست بەردەوام بوو مایەوە ◊ **اهتدی فلان إمرأتە:** فلانکەس ژنەکەی وەگری خۆی کرد ◊ **اهتدی الفرسُ الخَیلَ:** ئەسپەکە بوو بە پێشەنگی ڕەوە ئەسپەکان ◊ **تهادي فلان بین رجلین:** پیاوەکە چووە ناو شانی دوکەسەوە خۆی خستە سەرشانی دوکەس لەبەر بێ هێزی ◊ **تهادی القوم:** خەڵکەکە لەناو خۆیان دا دیارییان بۆیەکتر نارد ◊ **تهادت المرأةُ:** ئافرەتەکە لەڕۆیشتن دا لارو لەنجەی کردو کەسی لەگەڵ نەبوو ◊ **تهدّی فلان:** فلانکەس هەوڵی شارەزابوونی دا ◊ خەریکی شارەزایی کردنی خەڵك بوو ◊ **استهدی فلانٌ:** فلانکەس هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگای راستی دا ◊ **استهدی فلاناً:** داوای لەفلان کرد ڕێگای راستی نیشان بدا ◊ **المِهداءُ:** کەسێك زۆر دیاریی بنێرێ بۆ خەڵك ◊ **المِهدی:** ئەو تورەکەو زەرفەی دیارییەکەی تێدا دەنێردرێ ◊ **المُهَیدِیَةُ:** دەگوترێ: (فلان علی مُهَیدیته): فلانکەس لەسەر حاڵو وەزعی پێشووی خۆیەتی ◊ **الهادی:** ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار ◊ چاوساغو ڕێ نیشاندەر ◊ **الهادیة:** پێشەتای هەموو شتێك ◊ عەصاو گۆچان ◊ بەردێك لەناو ئاودا بێ و هەندێکی دەرکەوتبێ ◊ **هادیات الخیل:** پێشەتای ڕەوە ئەسپ ◊ **هوادی الخیل:** پێشەتای ڕەوەئەسپ ◊ **هوادي اللیل:** سەرەتای شەو ◊ **هوادي الإبل:** یەکەم وەجبەی حوشتر کە دەردەکەون ◊ **الهداء من الرجال:** پیاوی زەبوونی کەم عەقڵو کاڵفام ◊ وەرگنو زۆرخۆرو تەمبەڵ ◊ **الهُدی:** ڕۆژی روناك ◊ ڕێباز ◊ ڕێگای ئاشکراو شارەزایی کەر ◊ هەروا ناوە بۆ پەروەردەکردن و شارەزایی کردن و گەیاندنی ئادەمیزاد بەمەبەست بەشێوەی هێدی و هێمن ◊ **الهَدْيُ:** ئەو ئاژەڵەیە بەدیاریی دەبردرێ بۆ حەرەم بۆ قوربانی ◊ پیاو ماقوڵو ڕێزداری وڵات و بنەماڵە ◊ ڕێ و شوێن و ڕەوشت ◊ دەگوترێ: (فلان حسن الهدی): فلانکەس هەڵس و کەوتی جوانە ◊ **الهَدْیَةُ:** ڕێبازو داب و نەریت ◊ حوشتری گەورەی تەمەن پێنج ساڵ ◊ **هدیة الأمر:** لایەنی شت ◊ **الهِدْیَةُ:** بەمانا (الهَدْیَة) دێ ◊ لایەن و جیهەت و شوێن ◊ ڕێبازی راست ◊ دەگوترێ: (ضلَّ فلان هدیته): فلانکەس لەڕێبازی راستی خۆی لای دا ◊ **الهُدَیَةُ:** نیازو مەبەست ◊ ئەوشوێنەی دەتەوێ بۆی بچی ◊ دەگوترێ: (ضلَّ فلان هُدَیْتَهُ): فلانکەس ڕێبازی راستی خۆی لێ گوم بوو ◊ **الهَدِيُّ:** پیاو ماقوڵو ریش سپی بنەماڵە ◊ بوك ◊ ئەو ئاژەڵەی بەدیاریی دەبرێ بۆ حەرەم ◊ دیل ◊ **الهُدیّا:** هاوشێوەو هاوشان ◊ **الهَدِیَّةُ:** بوك ◊ دیاریی کەدۆست و خزم دەیدەن بەیەکتری ◊ لەڕوانگەی خۆشەویستی و ڕێزگرتنەوە ◊ **هَدَأَت الخیلُ ونحوها هَدْءاً:** ئەسپەکان لەبەر ماندویی کەوتن.

**هَذَأَ** الشَیْئَ: شتەکەی بڕیەوە بەخێرایی.

**هَذَأَ** الکلامَ: قسەی زۆرو پڕو پوچی کردن.

**هَذَأَ** فلاناً بلسانه: قسەی ناشیرینی بەفلانکەس گوت ◊ هەواڵێکی ناخۆشی پێ ڕاگەیاند.

**هَذِيَ** مِن البرد: لەسەرما مرد ٥ **تَهَذّأت القَرحَةُ:** برینەکە داوەشا ٥ **الهَذّاءُ:** دەگوترێ: (سیف هَذّاءٌ): شمشێری خێرا بڕو تیژ ٥ **الهَذّأةُ:** خاکەناز، بێڵ.

**هَذَبَ** القومُ هَذباً: خەڵکەکە گاڵو بوغڵو چەقەچەقیان زۆر بوو.

**هَذَبَ** الماءُ: ئاوەکە جاری بوو، ڕەوان بوو ٥ **هَذَبَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بڕیەوە، دوولەتی کرد ٥ پاکی کرد لەشتی لاوەکیو پوختەکەی هێشتەوە.

**هَذَبَ** النخلةَ: درەختە خورماکەی لەپڕزو پاڵ پاک کردەوە ٥ **أهذَبَ:** پەلەی کرد ٥ دەگوترێ: (أهذَبَ الإنسانُ في مشيه): ئادەمیزادەکە لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد ٥ **أهذَبت السحابَةُ ماءَها:** هەورەکە بەخێرایی بارانی باراند ٥ **هَذّبَ النخلةَ:** دارخورماکەی لەپڕزو پاڵ پاك کردەوە.

هَذّبَ الكلامَ: قسەکەی پوختەکرد لەوشتانەی لای ڕەوانبێژان بەناشیرین دادەنرێ ٥ **هَذّبَ الكتابَ:** کتێبەکەی پوختەکرد لەو شتانەی زیادەنو پێویست نین ٥ **الهَذّبُ:** صافو پوختە، پاڵفتە ٥ **الهَذِبُ:** دەگوترێ: (فرس هَذِبٌ): ئەسپێکی گورجو گۆڵو تیژرۆیە.

**هَذَّ** الشَّيْءَ: خێرا شتەکەی بڕی.

**هَذَّ** القرآنَ: خێرا خێرا قورئانەکەی خوێندەوە.

**هَذَّ** الحديثَ: فەرمودەی گێڕایەوە ٥ **اِهْتَذَّ الشَّيْءَ:** شتەکەی گورج بڕیەوە ٥ **هَذاذَيْكَ:** بڕایەوە، کۆتایی هات، تەواو بوو ٥ **الهُذُّ:** تیژو بڕندە ٥ **الهِذُّ:** بەمانا (الهَذُّ)دێ ٥ **الهُذاذُ:** دەگوترێ: (ناب هُذاذٌ): کەڵبی بڕندە، ددانی تیژ ٥ **الهَذّاذُ:** بڕندە ٥ ڕێگابڕ، ئازا بۆ ڕۆیشتن ٥ دەگوترێ: (جَمَلٌ هَذّاذٌ): حوشترێکی ئازایە بۆ ڕێگا بڕین ٥ **الهَذُوذُ:** تیژو بڕندە.

**هَذَرَ** الرجل في منطقه: پیاوەکە قسەی نابەجێی گوتن.

**هَذِرَ** اليومَ هَذَراً: ئەمڕۆ گەرم بوو.

**هَذِرَ** كلامُهُ: قسەکانی زوربەی هەڵەو پڕو پوچ بوون ٥ (فهو هَذِرٌ) ٥ **أهْتَرَ في كلامه:** لەوتارەکەی دا، لەقسەکانی دا زۆری هەڵە تێدابوو ٥ گوتراوە (مِن كَثُرَ أهْتَرَ): کەسێك زۆر بڵێ هەڵە دەکا ٥ **المِهْذارُ:** کەسێکە لەقسەکانی زۆر وشەی هەڵەو نابەجێ هەبن ٥ گوتراوە (المِكثارُ مِهذارٌ) ٥ **الهَتْرُ:** دەگوترێ: (لانذرو لاهَتْرَ): نەکەم نەزۆر ٥ **الهَتَرُ:** قسەی بێماناو پڕو پوچ ٥ **الهَذّارُ:** کەسێك زۆر لەقسەکردن دا هەڵەبکا، قسەی نابەجێی لەدەم بێتەدەر ٥ **الهَذِرُ:** بەمانا (المِهذارُ)دێ ٥ **هَذْرَمَ فلان:** فلانکەس لەڕۆیشتن پەلەی کرد، خێرا ڕۆیی ٥ لەقسەکردن دا پەلەی کرد ٥ لەخوێندنەوە دا پەلەی کرد ٥ دەگوترێ: (هَذْرَمَ القرآن): بەپەلە قورئانی خوێندەوەو لەماناو وشەو ڕستەو ئایەتەکانی ورد نەبۆوە ٥ **هَذْرِم السيفُ:** شمشێرەکە بڕی ٥ **الهُذارِمُ والهُذارِمَةُ والهِذْرامُ:** زۆر بڵێ ٥ **الهَذْرَمَى:** شەڕەنگێزو ئاژاوەچیو چەقە چەناو.

**هَذَفَ** هُذُوفاً: پەلەی کرد ٥ (فهو هاذف) ٥ **الهاذِلُ:** نیوەشەو ٥ **الهُذْلُولُ:** پیاوی سوكو جەستە بچوك ٥ ئەسپی پشت درێژی زەعیفو لاواز ٥ شوێنی نزمایی لەسارای پانو پۆڕدا کەمرۆڤ نەگاتە سەرلێواری نزماییەکە هەستی پێ ناکا ٥ تیری بچوك ٥ گردۆلکە ٥ بارانێك لەدورەوە ببینرێ ٥ جۆگە ئاوی بچوك ٥ تەنکە هەور ٥ سەرەتای شەو یان کۆتایی شەو ٥ **هَذْلَمَ:**

لەرۆیشتنی دا خێرا خێرا هەنگاوی هەڵێنان بەڵام هەنگاوەکانی کورت بوون.

**هَذَمَ الشَّيْءَ هَذْماً:** خێراشتەکەی بڕی.

**هَذَمَ الطعامَ:** خێراو بەپەلە خواردنەکەی خوارد ◊ المِهذام: شمشێری بڕندە ◊ الهُذام: شمشێری تیژ ◊ ئازاو نەترس ◊ دەگوترێ: (سِنان هُذام)، نوکە ڕمبێکی تیژ ◊ (شفرة هُذام): کێردێکی تیژە خێرا شت دەبڕێ ◊ الهَيْذام: ئازاو چاونەترس ◊ زۆر خۆر ◊ الهُذامَة والهُذَمَة: تیژو بڕندە ◊ دەگوترێ: (شفرة هذامة وهُذَمة): کێردێکی تیژو خێرا بڕە ◊ الهَذُومُ: دەگوترێ: (سکین هذوم)، کێردێکی خێرا بڕو تیژە ◊ الهَيْذَمُ: خۆشڕۆ ◊ خێرا ◊ گورج و گۆڵ ◊ الهَذاهِذُ: خۆ هەڵکێش و درۆزن ◊ الهُذاهِذُ: دەگوترێ: (سیف هُذاهِذٌ)، شمشێری تیژو بڕندە ◊ الهُـذَاهِذُ: بەمانا (الهُذاهِذ)ی ◊ هَذاه بالسیف هَذْواً: بەشمشێر بڕیەوە ◊ بڕی.

**هذی فلان هَذْياً وهَذَياناً:** وڕێنەی کرد، قسەی بێ سەرو بەری گوتن ◊ بزرکاندی ◊ دەشگوترێ: (هذی فلان بالشيءِ): فلانکەس لە وڕێنەو بزرکاندنەکەی دا ئەوشتەی گوت.

**هاذاه:** هاوبەشی کرد لەوڕێنەکردن و بزرکاندن دا، لەوتەی ناشیرین و ناشایستەدا ◊ تهاذى القومُ: خەڵکەکە هەندێکیان قسەی ناشیرینیان بەهەندێکیان گوتن ◊ الهُذاءُ: وڕێنەکردن بەقسەی غەڵەت و بێ مانا ◊ الهَذَيانُ: تێکچوونی عەقڵ بەشێوەیەکی کاتی و بێ هۆشبوون و وەئاگاهاتنەوە.

**هَرَأَ فلان في منطقه هَرْءاً:** فلانکەس زۆری قسەی هەڵەت و پەڵەت کردن ◊ هَرَأَت الريحُ: ڕەشەبایەکە سارد بوو.

**هَرَأَ البرد فلاناً هرءاً وهراءةً:** سەرماکە لەسەر فلانکەس توند بوو تاگیانی دەرچواند، یان خەریك بوو بیکوژێ.

**هَرَأَ فلانٌ اللَّحْمَ:** فلانکەس گۆشتەکەی باش برژاند باشی کوڵاند ◊ هَرِئَ اللَّحمُ هَرْءاً وهُرْءاً: گۆشتەکە باشباش برژا ◊ هُرِئَ المالُ والقومُ: ماڵ و سامانەکە هەروا خاوەن ماڵەکان سەرماو گەرما لەناوی بردن ◊ أهْرَأَ القومُ في الرواح: خەڵکەکە ئێوارە سەرمایان بوو ◊ أهْرَأَ فلاناً: فلانکەسی کوشت ◊ أهْرَأَ البردُ فلاناً: سەرما لەسەر فلانکەس توند بوو تاکوشتی یان خەریك بوو بیکوژێ ◊ أهْرَأَ الکلام وفيه: زۆری قسەکردو قسەکانی مەبەستیان نەپێکا.

أهْرَأَ اللحمَ: گۆشتەکەی زۆر کولاند زۆری برژاند ◊ هَرَّأَ اللحمَ: گۆشتەکەی زۆر کولاند ◊ تَهَرَّأَ اللَّحْمُ: گۆشتەکە زۆر کوڵی تاوای لێ هات لەئێسقانەکە کەوتە خوار ◊ تَهَرَّأَت الماشيةُ: ئاژەڵەکان بەسەر فەوتان و لەناوچون ◊ الهُراءُ: ئاخاوتنی بێ سەرو بەرە، هەڵەت و پڕو پوچ ◊ دەگوترێ: (رجلٌ هُراء): پیاوێکە قسەکانی هیچیان بەسەر هیچەوە نییە ◊ الهِراءُ: نەمامی درەختی خورما ◊ الهُراءُ: بەمانا (الهُراءُ)ێ ◊ الهَرَاءَةُ: ئافرەتێك ئاخاوتنەکانی بێ سەرو بەربن ◊ الهَرِيءُ: گۆشتی چاك و باش کوڵاو ئامادەکراو بۆ خواردن بەجۆرێك ئەوەندە کوڵێندرابێ ئێسقانی بەردابێ ◊ الهَرِيئَة: ئەوکاتەی سەرما لە خەڵك و ماڵ و سامان دەداو زیانیان پێ دەگەیەنێ.

**هَرَبَ هَرَباً وهروباً:** هەڵات، ڕای کرد.

**هَرَبَ دَمُهُ:** زۆر ترسا.

**هَرَبَ نصف الوتد في الأرض:** نیوەی سینگەكە بەزەوی دا ڕۆچوو.

**هَرِبَ فلان هَرَباً:** فلانكەس پیر بوو ٥ **اهْرَبَ فلانٌ:** فلانكەس پەلەی كرد لەڕۆیشتن دا، ڕۆیی بەترسەوە.

**أهْرَبَ في الأرض:** دوور كەوتەوە ٥ **أهربَ في الرأي:** چووە قولایی ڕاو بۆچوونەكەوە ٥ دەشگوترێ: (جاء فلان مُهرِباً): فلان هات زۆر سوربوو لەسەر كارەكە ٥ **أهْرَبَ:** پەلەی كرد ٥ بەگورجی ڕۆیی ٥ **أهْرَبَت الريحُ ماعلى وجه الأرض:** ڕەشەبایەكە چی لەسەر ڕوی زەوی بوو ڕای دا ٥ **أهْرَبَ فلاناً:** فلانكەسی ناچاركرد هەڵێ ٥ ڕابكا ٥ **هَرَّبَ فلاناً:** وای لێكرد هەڵێ، بقاچێنێ، ڕابكا ٥ **هَرَّبَ البِضاعة الممنوعة:** ماڵە قاچاخەكەی لەولاتێكەوە بردە ولاتێكی تر، بەقاچاغی داخڵی كرد ٥ **المَهْرَبُ:** ماڵماڵ، دارێكە وەرزێرو كشتیار زەوی كێڵدراوی پێ تەخت دەكەن ٥ **المَهْرَبُ:** هەڵاتن ٥ پەناو شوێنی خۆلێحەشاردان ٥ دەگوترێ: (فلان مَهْرَب لنا): فلانكەس پەنای ئێمەیە ٥ **المُهَرِّبُ:** قاچاغچی كەتاوانی كاڵا ئەو دیوكردنو ئەمدیوكردن ئەنجام دەدا ٥ **هَربَجَ العَمَلَ:** ئیشەكەی بەنارێكو پێكی ئەنجام دا ٥ **هربَذَ:** ڕۆیشت بەڕۆیشتنێكی وا ئەگاتە ئەندازەی غاردان ٥ **الهِربِذُ:** پیاوی ئایینی زەردەشتی كەسەرپەرشتی ئاتەشگەدە دەكا ٥ وشەكە فارسییەو كراوە بەعەرەبی ٥ **الهِربِذِيُّ:** جۆرە ڕۆیشتنێكە لارو لەنجەی تێدایە ٥ ڕۆیشتنی حوشترو ئاژەڵو ولاخی تر كاتێ لەسەر لا دەڕوا ٥ **الهُرْبُعُ:** سوكو گورجو گۆڵ ٥ دزی گورجو گۆڵ گورگی گورجو گۆڵ.

**هَرَتَ الشيْءَ:** شتەكەی دڕی بۆئەوەی فراوان بێ ٥ دەگوترێ: (هَرَتَ ثوبَهُ): كراسەكەی دادڕی بۆئەوەی فراوان بێ.

**هَرَتَ شِدْقَهُ:** لاشەویلەی ڕاكێشا بۆلای گوێچكەی.

**هَرَتَ فلاناً بالرمح:** بەشمشێر لەفلانی دا ٥ دەگوترێ: (هَرَتَ عِرْضَهُ): تانەی لەناموسی دا لەكەداری كرد.

**هَرَتَ اللحمَ:** گۆشتەكەی باش كوڵاند ٥ (فهو هريت).

**هَرِتَ الرجلُ وغيره هَرَتاً:** پیاوەكە شەویلەی پان بوو ٥ **أهْرَتَ اللحمَ:** گۆشتەكەی چاك كوڵاند ٥ **هَرَّتَ شِدْقَهُ:** شەویلەی فراوان كرد، لێكی كێشایەوە ٥ **تهارتَ:** دەمی كردەوەو زۆری قسەكرد ٥ **الهريت (ثوب هريت):** كراسێكی دڕاوو ونجڕ ونجڕ كراوە ٥ (عِرض هريت): ناموسی تانە لێدراو ٥ (رجل هريت): پیاوێكە نهێنی بۆ ناپارێزرێو قسەی ناشیرینو نەشیاو دەكا.

**الهَرْكَمَةُ:** شێر ٥ سەری لوت ٥ ڕەشایی نێوان كەڵبی سەگ.

**هَرَجَ في الحديث هَرْجاً:** درێژەی بەقسەكردنەكە داو قسەی تێكەڵو پێكەڵ كردن.

**هَرَجَ القومُ:** خەڵكەكە كەوتنە ناو ئاژاوەو ئاشوبو كوشتنو بگرەو بەردەوە.

**هَرَجَ الفرسُ:** ئەسپەكە بەگورجی بازی هاویشت.

**هَرَجَ الرجلُ في الأمر:** پیاوەكە لەكارەكەدا كەوتە شكو گومانەوەو بڕوای بەواقیعەكە نەكرد.

**هَرَجَ البابَ:** دەرگاكەی بەكراوەیی جێ هێشت.

**هَرَجَ النومَ:** زۆر نوست.

**هَرِجَ البعيرُ ونحوه:** حوشترەكە لەبەر زۆری گەرما یان باری قورس چاوی لێڵو پێڵ بوون ٥

دەشگوترێ: (هَرِجَ الرجلُ): پیاوەکە چاوی لێڵ‌و پێڵ بوون لەبەر زۆری گەرما یان زۆر رۆیشتن ◊ **أهْرَجَ الرجلُ**: پیاوەکە حوشترەکەی بەهۆی گەرمای زۆر یان باری گران چاوی لێڵ‌و پێڵ بوون ◊ **أهْرَجَ البعيرَ وغيره**: بەگەرمای نیوەڕۆ حوشترەکەی تاودا تا چاوی لێڵ‌و پێڵ بوون ◊ **هَرَّجَ**: هەراو هۆریای بەرپاکردو کێشەو نیزاعی نایەوە.

**هَرَّجَ بالأسد**: هەرای لەشێرەکە کرد هەلهەلەی لێ کێشا بۆئەوەی دەری بکا ◊ **هَرَّجَ السبعيَ**: بەگەرمای نیوەڕۆ حوشترەکەی تاودا تا چاوی لێڵ‌و پێڵ بوون ◊ **هَرَّجَ الخمرُ فلاناً**: عەرەقەکە فلانکەسی سەرخۆش کرد، هاواری کرد پێکەنی، حاڵ‌و وەزعی شێواند ◊ **إنْهَرَجَ فلان من الخمر**: پیاوەکە لەناکامی عەرەق خواردنەوەدا هێزو توانای نەماو کەوتە لارە لارو گۆدە گۆد ◊ **اسْتَهْرَجَ الرأيُ لفلان**: راو بۆچوونی بۆ فلانکەس بەهێزو فراوان بوو ◊ **المَهَرِّجُ**: پروپاگەندەکارو زمانلوس بۆ بانگەشەو پیاهەڵدان‌و بلاوکردنەوەی شتی پڕو پوچ ◊ کەسێك بەقسەی سەیرو هەڵوێستی تایبەتی‌و لاسایی کردنەوە خەڵك وەپێکەنین بێنێ ◊ **الهَرْجُ**: زۆرینەی شت ◊ فیتنەو ئاشوب‌و تێکچڕژان ◊ گەرمەی شەڕو زۆری کوژراو ◊ زرە خەون، خەونی پڕو پوچ ◊ **الهِرْجُ**: دڕاو شەقبوو ◊ زەبون لەهەرشتێك بێ ◊ **الهَرْجَةُ**: کەوانی نەرم ◊ **الهَرَاجَةُ**: کۆمەڵێك خەڵق کەبەقسەی درۆو پروپاگەندە شت هەڵدەکێشن‌و بانگەشەی بۆدەکەن ◊ **هَرْجَلَ فلان هرجَلَةً وهِرْجالاً**: فلانکەس رۆیشتنەکەی تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو هەندێکی گورگە لوقەو هەندێکی ئاسایی بوو ◊ **هَرْجَلَ في أعماله**: نیشەکەی رێك‌و پێك نەبوو تەرتیب‌و نەزمی تێدانەبوو ◊ **الهُرْجُلُ**: هەنگاو درێژ ◊ **الهُرْجُولُ**: مرۆڤی درێژ ◊ حوشتری گەورەو زەبەللاح.

**هَرَدَ الناس هَرْداً**: خەڵکەکە تێکەلاو بوون تێك چڕژان.

**هَرَدَ الثوبَ**: کراسەکەی دڕی، ونجڕ ونجڕی کرد ◊ بەڕوەکی وەرس ڕەنگی کرد.

**هَرَدَ اللحمَ**: گۆشتەکەی زۆر کوڵاند.

**هَرَدَ العِرْضَ**: تانەی لەناموسی دا.

**هَرِدَ اللَّحْمُ هَرَداً**: گۆشتەکە هەڵوەری، رزی.

**هَرِدَ شِدْقُهُ**: شەویلەی پان‌و فراوان بوو ◊ **هَرَّدَ فلان**: فلانکەس پۆشاکی ڕەنگکراو بەوەرسی پۆشی ◊ **هَرَّدَ اللَّحمَ أو الثوبَ**: گۆشتەکەی زۆر کوڵاند یان کراسەکەی زۆر دڕی ◊ ونجڕ ونجڕی کرد ◊ دەشگوترێ (هَرَّدَ الثوبَ): کراسەکەی بەڕەنگی وەرس رەنگ کرد ◊ **الهِرْدُ**: نوعامە ◊ پیاوی خوێڕی ◊ **الهُرْدُ**: گیا کورکوم ◊ **الهُرْدِيُّ**: شتی ڕەنگ کراو بەڕەنگی وەرس ◊ **هَرْدَبَ**: بازێکی گەورەی هاویشت ◊ **الهِرْدَبُّ**: ترسنۆك‌و کەتەو بێ عەقڵ ◊ **الهِرْدَبَّةُ**: بەمانا (الهِرْدَبُّ)دێ ◊ پیاوی کەتەی زەبەللاحی درێژو چەتاوڵ ◊ پیرەمێرد.

**هَرَّ هَرّاً**: بۆڵە ترێی هەڵوەریوی خوارد.

**هَرَّ الشَّوْكُ**: چقڵەکە وشك بوو هیچ تەڕایی تێدا نەما ◊ بەجۆرێك لەوەڕ خۆر خۆی لێ بوارد نەیخوارد.

**هَرَّ سَلْحُهُ**: سکی چوو تا گیانی دەرچوو.

**هَرَّ الدَّواءُ سَلْحَهُ**: دەرمانەکە سکی ڕەوان کرد.

**هَرَّ القوسُ هريراً**: کەوانەکە دەنگی لێ هات.

**هَرَّ فلان في وجه السائل هراً**: فلانكەس بەرو گرژی سوالکەرەکەی بەرێ کرد لێی تورە بوو.

**هَـرَّ الكلبُ**: سـەگەکە لوراندی، وەری دەمـی داپچڕی و کەڵبەی دەرخستن.

**هَرَّ اليه**: وەری بەبێ لوراندن هەر عەفعەفی بوو.

**هَرَّ النـاسُ فلانـاً**: خەڵك لای فلانیان پێ ناخۆش بوو، حەزیان لەچارەی نەبوو.

**هَـرَّ البَـردُ الكلـبَ**: سەرما وای لەسەگەکە کرد بلورێنێ.

**هَرَّ الشَيئَ**: شتەکەی ناخۆش ویست.

**هَرَّ فـلان هَـراً**: فلانکەس رەوشتی ناشیرین بوو ٥ **هُـرَّت الإبِـلُ**: حوشترەکە توشی نەخۆشی هەوکردنی نێوان پێست و گۆشت بووە ٥ **أهَـرَّ فـلان الغـنم**: فلانکەس مەڕو بزنەکانی بردنە سەرئاو ٥ **أهَـرَّ البردُ الكلبَ**: سەرما سەگەکەی هێناوەتە وەڕین ٥ لەپەند دا هاتووە دەڵێ: (شرٌّ أهَرَّ ذاناب). ئەم پەندە بۆ حاڵەتێك دەگوترێ کە تارمایی شەڕو نەگبەتی لەئاسۆوە دەرکەوتبێ ٥ **هَارٌّ**: بەڕویا تەقییەوەو لێی تورە بوو، پێیدا هەڵشاخی ٥ **الهُـرارُ**: دەردێکە توشی حوشتر دەبێ وەکوو هاوسان دەکەوێتە نێوان پێست و گۆشتییەوە ٥ دەردێکە توشی حوشتر دەبێ گوفیرەی پێ دەگرێ دەتورێنێ ٥ **الهِـرُّ**: پشیلە ٥ لێخوڕینی مەڕو بزن ٥ **الهُـرُّ**: شێر کە دەنگی رۆیشتنی دێ ٥ ئاوو شیری زۆر ٥ **الهَـرّارُ**: سەگ کە کەڵبەکانی دەردەخاو دەم دەکاتەوە ٥ بێ عەقڵ و کاڵفام ٥ **الهَـرّاران**: دو ئەستێرەن پەکیان ناوی (النسر الواقع)ە ئەوی تریان ناوی (قلب العقرب)ە، دەڵێن کە هەڵاتنی ئەوان کەوتە بەرشەو دونیا زۆر سارد دەبێ ٥ **الهَـرُورُ**: ئەو بۆڵە ترێ و دەنکە مێوژانەیە کە لەهێشووە تری دەکەونە خوار ٥ **الهَرِيـرُ**: وەڕەی سەگ بەلورەو قروسکە ٥ **الهَرِيرَةُ**: پێ ناخۆش بوون ٥ گرژی و مۆنی ٥ دەگوترێ: (أجِـدُ في وجهِـهِ هريـرة): لەدەمو چاوی دا گرژییەك دەبینم ٥

**هَرْوَزَ الحيوانُ**: ئاژەڵەکە مرداربۆوە ٥ **تهـروَزَ مـن الجوع**: لەبرسا مرد.

**هَرَسَ الشَيئَ هرساً**: شتەکەی کوتا ٥ بەشتێکی پان شتەکەی پەستاوت ٥ زۆری کوتا.

**هَرَسَ الطعامَ**: بەخێرایی و پەلە پەل خواردنەکەی خوارد.

**هَرِسَ الرجلُ هَرَسـاً**: پیاوەکە نەوسن و زۆر خۆر بوو ٥ بەنهێنی نانی خوارد ٥ **المِهْراسُ**: حوشتری زۆر خۆر ٥ حوشتری کەتەو زەبەلاح ٥ پیاوێك لەشەوو شەو ڕەوی نەترسێ ٥ هاوەن و سندۆڵ کەشتیان تێدا دەکوترێ ٥ بەردێکە حەوزێکی لاکێشەیی لێ هەڵدەکەندرێ بۆ دەستنوێژ گرتن و شتی وا ٥ ئەو کوتکە دارەی گەنم و چەڵتوك و شتی وای پێ دەکوترێ ٥ **الهَـراسُ**: درەختێکی گەورەیە لەپێڕی (القرنية)یە لەولاتی میصرو حەبەشەو سەنیغال دەڕوێ، توێکڵی سپی یان خاکییە ٥ لەولاتی سودان پێی دەگوترێ: (الحُزامى) ٥ **الهُراسَةُ**: دوژمن شکێن ٥ دەگوترێ: (بنو فلان ذو هراسة)، خاوەنی نەردو نگین و دەسەڵاتن دوژمن تارو ماردەکەن ٥ **الهَـرّاسُ**: ئەوکەسەی کەشکەك دروست دەکا ٥ هەریسە لێ دەنێ ٥ هەریسە فرۆش ٥ نەوسن و زۆر خۆر ٥ **الهَـرْسُ**: پشیلە ٥ **الهَـرِسُ**: بەمانا (الهُراسُ)دێ ٥ بەمانا (الهَرْسُ)دێ ٥ هەروا بەمانا پۆشاکی رزیوو بێ کەڵك دێ ٥ **الهَـرِيسُ**: گەنمە کوتاو پێش ئەوەی بکوڵێندرێ ٥ **الهَرِيسَةُ**: کەشکەك، کێشتی هەریسە گەنمە کوتاو گۆشتی زۆری تێ دەکرێ ٥ جۆرە حەڵوایەکە لەئاردو

رۆن و شەکر دروست دەکرێ ٥ (أرض هريسة): خاك و ولاتێکە درەختی هەراسی زۆر لێ بڕوێ.

**هَرَشَ الدهرُ هَرْشاً:** رۆژگار ناخۆش و پڕچورتم بوو ٥ **هَارَشَ الكلبُ الكلبَ ولهو:** سەگەکە شەرە سەگی کرد لەگەڵ سەگەکەی تر ٥ **هارَشَ الرجلُ بعضَ الكلاب على بعض:** پیاوەکە هەندێ لەسەگەکانی بەردایە هەندێکی تریان (شەڕە سەگی پێکردن) هەڵینان بۆ شەڕکردن ٥ **هَرَّشَ فلان هَرَشاً:** فلانکەس ڕەوشتی ناشیرین بوو ٥ **هَرَّشَ بين الناس:** فیتنەو ئاشوبی خستە ناو خەڵکەوە ٥ **اهترشت الكلابُ أو الديكة او نحوها:** سەگەکان شەڕیان بوو ٥ **تهارشت الكلاب:** بەمانا (اهترشت)دێ ٥ دەشگوترێ: (تهارش القومُ): خەڵکەکە بوو بەشەڕو هەرایان ٥ **تهرّش الغيمُ:** هەورەکە لاچوو بوو بە هەساو ٥ **مُهارِشٌ:** دەگوترێ: (فرس مُهارش): ئەسپێکی گورج و گۆڵ و سەرنەرمە ٥ **الهَرِشُ:** مرۆڤی گێلی وشك تەبیات ٥ **هَرْشَفَ الشيْئُ:** شتەکە وشك بوو ٥ **تَهَرْشَفَ:** کەم کەم ئاوەکەی خواردەوە ٥ **الهِرْشَفَةُ:** پارچە پەڕۆیەکە ئاوی پێ وشك دەکرێتەوە ٥ لیقەو پەڕۆی ناو قوتوە مەرەکەب کەوشك دەبێتەوە ٥ **الهِرْشَمُ:** بەردی نەرم ٥ کێو شاخی هەڵۆڵ و کونکون ٥ کەژی بچکۆلەی ئاودار ٥ **الهِرْشن:** شەویلە پان.

**هَرِصَ هَرَصاً:** گرۆێیی وشکی توشبوو ٥ **هَرَّش:** جەستەی بە گرۆێیی داوشا ٥ **الهَرِيصَةُ:** زەلکاو ٥ **الهَرَصُ:** گرۆێیی وشك لەجەستەدا.

**هَرَضَ الثوبَ:** قوماشەکەی ونجڕ ونجڕ کرد.

**هَرَطَ في الكلام هَرْطاً:** قسەی تێکەڵاو کردن و زۆری شتی بێ کەڵك و پڕو پوچ هەڵڕشت.

**هَرَطَ عِرْضَ أخيه:** تانەو تەشەری لەناموس و کەسایەتی براکەی دا.

**هَرِطَ الرجلُ هَرَطاً:** فلانکەس گۆشتی شل بوو، داچۆڕا دوای ئەوەی گۆشتی توندو پتەو بوو، جاشل بوونی گۆشتەکەی بەهۆی نەخۆشی یان ترس و بیمەوە بێ ٥ **تهارط الحصان:** دوکەسە بەکێشە هاتووەکە جنێویان بەیەك دا ٥ **الهَرْط:** گۆشتی کزو شل و لینج کەوەکوو چڵم وابێ ٥ گۆشتێك کە کوتێندرا وردو هاڕبێ ٥ **الهَرِطَ:** گۆشتی کزو لاوازی لینج وەکوو چڵم ٥ ئاژەڵی گەورەو کەتە ٥ پیاوی دەوڵەمەند ٥ **الهِرْطَةُ:** گێل و نەحمەق و ترسنۆك ٥ **الهَيْرَطُ:** نەرم و لینج ٥ **الهَرْطالُ:** پیاوی درێژی جەستە گەورەو کەتە ٥ **الهُرْطمانُ:** رووەکی شۆفان ٥ خەرتەلە.

**هَرِعَ الدمُ هَرَعاً:** خوێنەکە رژا ٥ ڕەوان بوو.

**هَرِعَ فلان:** فلانکەس بەخێرایی رۆیی.

**هَرِعَ الصَّبِيُّ:** مندالەکە خێرا گریا ٥ (فهو هرِع وهي هَرِعة): یان بازی دا ٥ قورئان دەفەرموێ: (وجاءه قومه يهرعون اليه) ٥ **أهْرَعَ الرجُلُ:** پیاوەکە بەپەشۆکاوی رۆیی یان بازی دا ٥ **أهْرَعَ القومُ الرماحَ:** خەڵکەکە رمبەکانیان بەرز کردنەوەو رۆیشتن بۆ بەرەنگاریی ٥ **أهْرِعَ الرجلُ:** پیاوەکە بەشل و شێواوی رۆیی ٥ پیاوەکە لەرقا یان لەترسا یان بەهۆی لەرزو تاوە کەوتە لەرزین ٥ کاڵفام و عەقڵ سوك بوو ٥ **هَرَّعَ القوم رِماحَهم وبها:** خەڵکەکە رمبەکانیان بەرز کردەوەو بەرەو دوژمن رۆیشتن ٥ **اهْتَرَعَ العودَ:** کەمانەکەی شکاند ٥ یان شوڕکە دارەکەی شکاند ٥ **تَهَرَّعَ الرماحُ:** خەڵکەکە رمب بەدەستەوە هاتن ٥ **المُهْرَعُ:** سوور بوو لەسەر شت ٥ **المَهْرُوعُ:** کەسێك لەئاکامی هیلاکی و ماندویتی

بمرێ ◊ **الهُراعُ**: ڕۆیشتن بەشێوەی پەشۆکاوی‌و خێرایی ◊ خێرا لێخوڕین ◊ خێرا بازدان ◊ **الهِرْیَاعُ**: گەلای وەریو بەهۆی ڕەشەباوە ◊ **الهَرِیعَةُ**: درەختۆکەی لق‌و پۆپ باریك‌و بچوك ◊ **الهَیْرَعُ**: ترسنۆك‌و لاوازو بێ خێر ◊ بای خێرا ڕۆو تەپ‌و تۆز بەرپاکەر ◊ ئافرەتی قیژە قیژکەرو جرپن‌و گورج ◊ **الهَیْرَعَةُ**: شمشاڵ‌و بلوێری شوان ◊ خێوی بیابان.

**هَرَفَ** الرجلُ هَرْفاً: پیاوەکە چەنەی دا قسەی وڕێنەو بێ مانای کردن ◊ دەگوترێ: (فلان یَهْرِفُ بمالایعرفه): فلانکەس نازانێ چی دەڵێ.

**هَرَّفَ** بفلان: زیاد لەحەد مەدحی فلانی کرد زۆر زێدە ڕۆیی کرد لەوەسف‌و پێداهەلگوتن دا.

**هَرَّفَ** السبعُ: درندەکە گوێ قولاخی دەنگەکە بوو ◊ **هَرَفَتْ الریحُ فلاناً**: ڕەشەبایەکە فلانکەسی سوك کرد وای لێ کرد خێرا بڕوا ◊ **أهْرَفَ الرجلُ**: پیاوەکە ماڵ‌و سامانی زیادی کرد ◊ **أهرفَتْ النخلةُ**: دارخورماکە زوو میوەکەی پێ گەیاند ◊ **الهَرْفُ**: هەرشتێك زوو پێ بگا لەمیوەو شتی وا.

**هَرَقَ** الماءَ ونحوه هَرْقاً: ئاوەکەی هەڵڕژاندە ناوی ◊ **أهْرَقَ الماءَ**: ئاوەکەی ڕشت ◊ **هَرَّقَ**: دەگوترێ: (هَرَّقَ علی جَمْرِك): ئاو بڕژێنە بەسەر ئاگرەکەت دا واتە پشو درێژبەو خۆڕاگرە لەسەر کارەساتەکە ◊ **تهارق القوم**: خەڵکەکە شەڕە ئاویان کرد ◊ ئاویان بەسەریەك دا کرد ◊ شەڕیان کردو خوێنی یەکتریان ڕشت ◊ **إهْرَوْرَقَ الماءُ** أو الدم: ئاوەکە جاری بوو، ڕەوان بوو ◊ **المُهْرَقُ**: پەڕەی سپی کەلەسەری دەنووسرێ ◊ پارچە چندراوێکە لەئاوریشمی سپی صەمغی تێ هەڵدەسووڕێ‌و سفت‌و لوس دەکرێ‌و ئەمجار لەسەری دەنووسرێ ◊ ئامێرێکە لەشووشەو شتی وا پۆشاکی پێ سفت‌و لوس دەکرێ ◊ سارای ڕوتەن‌و سوتەمەڕۆ ◊ کاغەزی سفت‌و لوسی سەمغ لێ دراو کەلەبواری چاپەمەنی دا بەکاردێ ◊ **المُهْرقان**: دەریایەکە سەرڕێژ دەکاو شەپۆل دەداوێ ◊ ئەوشوێنەی ئاوی دەریای لێ دەرژێتە ناوچاڵ‌و چۆڵی دەورو بەری ◊ **المُهْرَقان**: بەمانا (المُهرقان)دێ ◊ **الهِرْقُ**: پۆشاك‌و قوماشی ڕزیوو کۆن ◊ **الهِرْقِلُ**: بێژنگ ◊ (ثیاب هِرْقِلیّة): پۆشاکی ڕزیو ◊ **هِرَقل وهِرْقِل**: ناوی مەلیکی ڕۆمە ◊ **هَرْكَلَ الرجلُ**: پیاوەکە بەلارو لەنجە ڕۆیی‌و بەحاڵ پێی لەزەوی دەناو هێواش هەنگاوی هەڵدێنایەوە ◊ **الهُراكِلُ**: پیاوی کەتەو زەلام، یان ئاژەڵی گەورەو جەستە زەبەلاح ◊ **الهَراكِلَةُ**: شوێنی کۆبونەوەی شەپۆلەکانی ئاو ◊ سەگی ئاوی ◊ گیانلەبەری دەریایی گەورەو زەبەلاح ◊ ماسی زۆر زل ◊ **الهَرْكَلَة والهِركَلَّةُ**: جەستە جوان‌و شۆخ‌و شەنگ ◊ **الهِركولة من النساء**: ئافرەتی کەفەڵ پان‌و زل ◊ یان ئافرەتی جوان ◊ **هَرْوَلَ**: گورگە لۆقەی کرد ◊ بە نەرمەغار ڕۆیشت ◊ **الهَرَلُ**: کۆلە بەسە، منداڵی ژن لەمێردێکی تری ◊ **هَرَمَتِ الإبلُ هَرْماً**: حوشترەکە درەختی هەرمێی خوارد.

**هَرِمَ** الرجلُ: پیاوەکە تەمەنی درێژ بوو گەیشتە حاڵەتی کەنەفتی پیر بوو زەعیف‌و لاواز بوو ◊ **أهْرَمَ الدهرُ فلاناً**: ڕۆژگار فلانی کەنەفت‌و لاواز کرد ◊ **هَرَّمَ الدهرُ فلاناً**: ڕۆژگار فلانی کەنەفت‌و زەبون کرد ◊ **هَرَّمَ فلان اللحمَ**: فلانکەس گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد ◊ کوتکوتی کرد ◊ **هَرَّمَ الامرَ**: کارەکەی بەگرنگ‌و گەورە نیشان دا زیاد لەحەقی دایەو زێدە ڕۆیی کرد لەوەسپ دانی دا ◊ **هَرَّمَ البناءَ**: باڵەخانەکەی لەسەر

شێوەی هەرەم بیناکرد ◊ تهارَمَ فلان: فلانکەس خۆی بەپیرو کەنەفت دانا وەلێ وانەبوو ◊ الهَرْمُ: جۆرە بەرەدارێکی ترشەو کەمێ سوێری هەیە ◊ الهَرَمُ: باڵەخانەیەکی گەورەو فراوانە یەکێ لەفیرعەونەکانی میسر بنیاتی ناوە، لەبەردی گەورەو راستەو پاستەکراو بنیات نراوە، بۆیە دروستی کردووە کەمرد تێیدا بنێژرێ زۆربەیان بناغەکەیان چوار دیواری شێوە سێ سوچە، ئەم دیوارانە بۆ حەوا بەرزبوونەوەو وردە وردەوێك هاتوونەوە تا لەئاکاما سەری دیوارەکان گەیشتونەوەیەكو بوونە یەك سوچی تیژو سەری هەرەمەکەی پێك هێناوە ◊ الهَرَمُ المُدَرَّجُ: جۆرە هەرەمێکە دیوارەکانی لە سەکۆی یەك لەسەریەك پێك دێ ◊ هەرەمی (سقارة المدرّج): کۆنترین بینای گەورەو بەرزو فراوانە لە مێژوو دا کە بەبەرد دروست کرابێ ◊ الهَرِمُ: پیری کەنەفت؛ کەبگاتە تەمەنی رەزیلیو زەلیلی ◊ عەقڵ ◊ نەفس ◊ دەگوترێ: (لا أدري بمَ يُولع هَرِمُك؟): نازانم نەفست عاشقی چی بووە؟ ◊ رای پەسەندو بەنەزموون ◊ پیاڵەی کەل بوو ◊ قاپو زەرفێك کەلی تێکەوت بێ ◊ الهَرْمي: داری وشك، قەلاشکەری ◊ الهُرْمان: عەقڵو ئاوەز ◊ رای پەسەند ◊ الهَرْمَةُ: دوامندالی پیرەمێردو پیرەژن ◊ پێچەوانەی نۆبەرە ◊ الهَرِمَةُ: دێڵە شێر ◊ الهَرُومُ: ئافرەتی بەدخوو رەوشت ناشیرین ◊ هَرْمَزَ الرجلُ: قسەی بەنەسپایی کرد بەجۆرێك هاوەڵەکەی گوێی لێنەبێ ◊ پیاوەکە پاروی لەدەمی دا هێناو بردو قوتی نەدا ◊ هُرْمُز: وشەیەکی فارسییە کراوە بەعەرەبی ◊ لەلای فارسەکان ناوی خودایەکیانە ◊ ناوی ئەستێرەی موشتەرییە ◊ ناوی یەکێکە لەپاشاکانیان ساڵی (٢٧٢ ز)ی مردووە ◊ عەرەب وشەی (الهرمز والهارموز والهُرمزات)یان داناوە بۆ شاهەنشای فارس ◊ هَرْمَسَ الرجلُ: پیاوەکە روی گرژ بوو ◊ هَرْمَسَ الناسُ: خەڵکەکە وروژان و کەوتنە تەحا تەحاو هاتوو چۆ ◊ الهُرامِسُ: شێری ئازاو بەهەڵمەتو پەلامەر دەری مرۆڤ ◊ الهِرْماسُ: بەمانا (الهُرامِس)دێ ◊ بێچوی پڵنگ ◊ الهِرْمُوس: راپەسەندو سوور بوو لەسەر هەڵوێستی خۆی ◊ الهِرْميسَةُ: مێینەی دوڕاجە؛ جۆرە باڵندەیەکە وەکوو کەو ◊ هَرْمَطَ الرجلُ عرض فلان: پیاوەکە تانەو تەشەری لەناموس و کەسایەتی فلانکەس دا ◊ إهْرَمَّعَ الرجلُ: پیاوەکە لەرۆیشتن دا پەلەی کرد ◊ خێرا رۆیی ◊ خێرا گریا، زوو فرمێسکی هاتنە خوار ◊ إهْرَمَّعَ في منطقة وحديثه: زۆر رۆچووە ناو قسەوە ◊ إهْرَمَّعَ اليه: خۆی بەگرینۆك خستە بەرچاو ◊ گریانی هێنایە خۆی ◊ هَرْمَلَتِ العجوز: پیرێژنەکە زۆر چووە ساڵەوەو کەنەفت بوو ◊ هَرْمَلَ الوبرُ: کوڵکی حوشترەکە هەڵوەری، روتایەوە ◊ هَرْمَلَ الرجلُ الشَّعْرَ: پیاوەکە مووەکانی هەڵکێشان، بڕینی ◊ هَرْمَلَ الرجُلَ: موی پیاوەکەی موکێش کردن، مووە کانی هەڵکەندن ◊ هَرْمَلَ عَمَلَهُ: کردەوەکەی پوچ کردەوە ◊ الهِرْمِلُ: حوشتری پیر ◊ ئافرەتی جەستە نارێكو پێكو شپرێو ◊ الهُرْمُولُ: پارچە مو؛ تۆپەڵە مو بەسەرەوە بمێنێتەوە ◊ الهُرْمُونُ: هۆرمۆن؛ مادەیەکە بڕێ غوودە لەخوێن دا دەری دەدەن جەستە بەهۆیەوە هەستیار دەبێو نیشاتی زیاد دەکا ◊ بۆنموونە هۆرمۆنی جوتە گون ◊ هَرْنَفَ الرجلُ: پیاوەکە پێکەنی بەهێواشی ◊ هَرْنَفَتْ المرأةُ: ئافرەتەکە بەهێواشی گریاو بەنەسپایی قسەی کرد ◊ هَرْهَرَ الشيْئُ: شتەکە دەنگی پەیدا کرد

هـاره هـاری لـێ هـات ◊ دەگـوترێ: (هَرْهَـرَتْ الـریحُ)، ڕەشـەبایەکە هـاژە هـاژی هـات ◊ هَرْهَـرَ الضأن: مەڕەکە باڕاندی ◊ هَرْهَرَ الأسدُ: شێرەکە نەڕاندی ◊ هَرْهَـرَ الرجلُ: پیاوەکە بەمەبەستی گاڵتـەکردن بەحـەق لـەقاقای پێـکەنینی دا ◊ هَرْهَرَ بالغنم: دەنگی مەڕو بزنەکانی دا بۆئەوەی بچن بۆ سەرئاوەکەو ئاوبخۆنەوە ◊ هَرْهَرَ اللّبَنُ: شیرەکە لەکاتی دۆشینی دا خوشەی هات ◊ هَرْهَرَ الـشَیْئَ: شـتەکەی جولانـد ◊ تهرهـرتْ الـریحُ: بایەکـە هـاژەی هـات ◊ الهُرَاهِـرُ: شێرێـك زۆر بنەڕێنێ ◊ ئاوی زۆر یـان شیری زۆر ◊ الهَرْهَـارُ: کەسێـك بەمەبەسـتی گاڵتـەکردن بەحـەقو ڕاستی زۆر پـێ بکـەنێو گاڵتـە بـەئایین بکا ◊ گۆشتی قەڵەو ◊ شێر ◊ الهُرْهُورُ: ئەو بۆڵـەترێو مێوژە وشکەڵانەی لەهێـشوە تـرێ بەردەبنـەوە دەکەونە ژێر دارمێوەکە ◊ جۆرە کەشتییەکە ◊ هُرَاهُ هَرَواً: بەقامچی ئەستور لێی دا ◊ هَرَی ثَوبَهُ: کراسەکەی بـەڕەنگی زەرد ڕەنـگ کـرد ◊ تَهَرّاه: بـەمانا (هَـرَاهُ)دێ ◊ الهُـراءُ: وڕێنـە ◊ الهِـرَاءُ: ئەمامـە خورمـا ◊ سـەخیو نـان بـدە ◊ الهِراوَةُ: گۆچـانی ئەسـتور ◊ قامچی ئەسـتور ◊ الهُـرِيُّ: هۆدەیـەکی گـەورە خـۆراکی پاشـای تێـدا کۆدەکرێتـەوە ◊ کەنـداو یـان زەلکاو ئـاوی لـێ هەڵدەهێنجرێ بەهۆی ئامێری ئاو هەڵێنجانەوە ◊ هَرْوَلَ: بڕوانە (هَرَلَ).

**هَزَأَ** به ومنه هَزْءاً وهُزوءاً: گاڵتەی پێ کرد.

**هَزَأَ** الشَیْئَ هَزْءاً: شتەکەی شکاند.

**هَـزَأَ** إبلَـهُ: حوشـترەکانی خـستنە بەرسـەرما تـا فەوتانو لەناو چون.

**هَزَأَ** راحلَتَهُ: وڵاخی سوارییەکەی ئاژوت.

**هَزِئَ** هَزءاً: مرد.

**هَزِئَ** بالشَیْئَ ومنه: گاڵتەی بەشتەکە کرد، گاڵتـەی لەشـتەکە هـات ◊ أهْـزَأَ: کەوتـە کوشـندەی سـەرماوە ◊ أهْـزَأت الدابـة بالرجـل: وڵاخەکـە بەخێرایی پیاوەکەی گەیاندە شوێنی مەبەست ◊ أهزَأَ الرجلُ إبلَـهُ: پیاوەکە حوشترەکەی لـێ خوڕی، ئاژوتی ◊ تَهَزّأَ بالشَیْئ: گاڵتەی بەشتەکە هات ◊ اسْتَهْزَأَ بغیه: گاڵتەی بەغەیری خۆی کرد ◊ الهازِئَـة: دەشـتی چەواشـە کـەر، دەشتێـك تراویلکـەی هـەبێو ڕێبـوار بەهەڵـە بـەرێ ◊ دەگـوترێ: (مفازةُ هازِئَـة)، سارایەکە تراویلکەی هەیە ◊ (غداة هازئة): ئێوارەیەکی سەرماو سۆڵە ◊ الهُزَأَةُ: پیاوێك ببێتە شوێنی گاڵتەی خەڵك ◊ الهُـزَأَةُ: پیاوێـك خـۆی گاڵتـە بەخـەڵك بکات ◊ هَزَبَرَهُ: بڕییەوە ◊ الهِزَبْرُ: شێری تێك شکێنەر ◊ جەستەی کەتەو پتەو.

**هَزِجَ** هَزَجاً: گۆرانی گوت ◊ دەگوترێ: (هَزِجَ القارئ في قراءتـه): قورئـان خوێنەکـە دەنگـی بـەرز کـردەوەو بەشـەوقەوە قورئـانی خوێنـد ◊ (فهـو هَزِجٌ وهـي هَزِجَـةٌ) ◊ أهْـزَجَ الـشاعرُ: شاعیرەکە بەگوێرەی بەحری هـەزەج شیعری دانـا ◊ هَـزَّجَ الرجلُ: بەمانا (هَـزِجَ)دی ◊ هَـزَّجَ صَـوتَهُ: دەنگـی خـۆی هـەڵبڕیو گـۆرانی گـوت ◊ تَهَـزَّجَ الرجـلُ: بەمانا (هَزِجَ)دێ ◊ تَهَزَّجَ القوسُ: کەمانەکە کاتێ مۆسیقاژەنەکە ژێیەکەی جولاند، دەنگی هـات ◊ دەگـوترێ: (تَهَزَّجَ الرعدُ): هەورەکە گرمانـدی ◊ الهَــــزَجُ: هــــەر دەنگێــــك لارکردنــــەوەو درێژکردنـەوەی تێـدابێ ◊ گۆڵـە گـۆڵی هـەور ◊ ویـزەی مـێشو مێـشوله ◊ کـەیفو خۆشـیو هەڵپەڕکێ ◊ جۆرە بەحرێـکی عـوروزە شـیعری عـەرەبی پـێ کێـشانە دەکـرێ ◊ هـەروا شـیعری فارســـیو کوردیـــشی پـــێ دەکێـــشرێ.

**هَزَرَ الرجلُ هَزراً:** پیاوەکە پێکەنی.

**هَزَرَ البائع:** فرۆشیارەکە کالآکانی گران کردن.

**هَزَرَ فلان:** فلآنکەس پەلەی کرد لە پێویستییەکەی دا.

**هَزَرَ لفلان:** بەخششی فلآنکەسی زۆر کرد.

**هَـزَرَ فلانـاً بالعـصا:** بەعەصـاو گۆچـان زۆری لەپشتو لاقەپرغەی فلان دا ٥ زۆری چاو لـێ داگرت.

**هَزَرَ الأرضَ به:** زەوی پێ پەستاوت دای بـەزەوی دا، خستی، دەری کرد، ترۆی کرد ٥ **المِهْزَرُ:** کەسێـك لەهـەموو شتێـك دا تـێ بـشکێو زەرەر بکـا ٥ دەگوترێ: (رجل مِهزر).

**الهَـزَار:** بولبـول ٥ وشـەیەکی فارسـییەو کـراوە بەعەرەبی ٥ دانراوە بۆ بولبول ٥ بەفارسی پێی دەگـوترێ: (هـەزار داسـتان) چـونکە بولبـول بـــەزۆر ئـــاواز دەخوێنـــێ ٥ **الهِـــزْرُ:** هەڵخەڵەتێندراوی گێل کەهەموو کەس تەماعی تێـدەکا ٥ **الهَـزْرَةُ:** زەوی نـەرم ٥ تەمبـەڵو تـەوەزەل ٥ دەگـوترێ: (رجـل فیـه هَـزَرات): پیاوێــکە زۆر تەمبەڵــە ٥ **الهَــزَوَّرُ:** زەعیــفو زەبوون ٥ **هَزْرَفَ فی عَدْوِهِ:** لەبازدانەکەی دا گورج بـوو، زۆر رۆیـی ٥ **الهُـزارف والهِـزْراف:** گـورجو خێرا ٥ جەستە گـەورە ٥ **هَـزْرَق:** پەلـەی کـرد ٥ **الهُزارِقُ:** بەمانا (الهُزارِف) دێ.

**هَـزَّ الرجـلُ هِـزَّةً:** پیاوەکـە چوسـتو چـالاك بـوو، گەشەی کردو ئارامی گرت.

**هَزَّ القِدْرُ:** مەنجەڵەکە لەکاتی کوڵان دا قڵپە قڵپی هات، گیزەی هات.

**هَزَّ الشهابُ هزیزاً:** ئەستێرەکە کشا ٥ **هَـزَّت الـریحُ:** رەشەباکە هاژە هاژی لەدرەختەکان هێنا.

**هَزَّ الرَّعْـدُ:** هەورەکە گوڵە گوڵی هات ٥ شریخو هوڕی هات.

**هَزَّ الشَیْئَ به:** شتەکەی راوەشاند رای تەکاند.

**هَـزَّ الهـواءُ والمـاءُ النبـاتَ:** هـەواو ئـاو گەشـەیان بەرووەکەکە کردو باڵای کرد.

**هَـزَّ الحـادی الإبـلَ:** حودیـە خوێنەکـە بـەگۆرانی حوشترەکەی خستنە سەر ڕەوتی خۆش ڕەوی ٥ **هَـزَّ الـشجرةَ وغیرها:** درەختەکـەی راتەکانـد ٥ **إهْتَـزَّ الـشَیْئُ:** شـتەکە کەوتـە جـەمو جـوڵو هەڵتـەكو داتـەك ٥ **إهْتَـزَّ النبـاتُ:** ڕووەکەکـە گەشــەی کــردو بــەرزبۆوە ٥ **إهْتَــزَّت الأرضُ:** زەوییە بەپیتو بەرەکەت بوو گیاو گژی روانـد ٥ **اهْتَزَ الإبلُ:** حوشـترەکە نیـشاتی پەیـداکرد لـە ڕۆیشتنی داو کەوتە سـەر ڕەوتـی خۆشڕەوی ٥ **إهْتَزَّ الرجلُ:** پیاوەکە نیشاتی پەیداکردو کەوتە سەرخۆشـیو تەندروسـتی ئـارامی ٥ **إهْتَــزَّ الشهابُ:** ئەستێرەکە بەگورجیو تیژڕەوی کشا ٥ **اهْتَـزَّ لکـذا:** بەوشتە کـەیف خۆشو شـادمان بوو ٥ **تَهَزَّزَ الشَیْئُ:** شتەکە کەوتە جـەمو جـوڵ ٥ **الإهتزاز:** حاڵەتی جەستەیە لەکاتی لەرینـەوەدا ٥ **الهَزائِـزُ:** چـورتەو تەنگانـە (تـاکی نییـە) ٥ هەربـەکۆ دێ ٥ **الهَـزَّةُ:** دەگـوترێ: (إمـرأة هَـزَّة): ئافرەتێکە شەڕانیو حەز لەئاژاوە دەکا ٥ **هَـزَعَ هَزْعاً:** پەلەی کرد ٥ **هَزَعَـتِ الدابَـةُ فی الحـشیش:** حەیوانەکە لەناو حەشیشەو لەوەڕدا لەوەڕا ٥ **هَزَعَ الشَیْئَ:** شتەکەی شکاند ٥ دەگوترێ: (هَـزَعَ فلانـاً): ملـی فلآنکەسـی کوتـا ٥ **هَـزَّعَ الأشْـیاءَ:** شـتەکانی لێـك بلآوکردنـەوە ٥ **إهْتَـزَعَ:** پەلـەی کرد ٥ چەواشە بوو ٥ **إهْتَزَعَ السیفُ:** شمشێرەکە لەرەلەری کرد نەرمە لیقە بوو ٥ **إنهزَعَ:** شکا ٥ وردبوو ٥ **تَهَزَّعَ:** بـەمانا (إهْتَزَعَ)دێ ٥ دەگـوترێ:

(تهزّعت المرأةُ في مشيها): ئافرەتەکە لەڕۆیشتن دا لارو لەنجەی کرد ٥ **تَهَزَّعَ فلان:** فلانکەس ڕوی خۆی گرژ کرد روگرژیی بەسەر خۆی دا هێنا ٥ دەشگوترێ: (تهزع لفلان): خۆی لەفلان نەناس کرد ٥ **الأهْزَعُ من القذائف والسهام:** ئەوەیە فیشەکێك یا تیرێك بەتەنیا لەفیشەکدانو تیردان دا مابێتەوە ٥ دەشگوترێ: (مافي الدار أهْزَعُ): کەس لەخانوەکەدا نییە ٥ **المِهْزَعُ:** کەسێك هەر درەختێك راوەشێنێ بیشکێنێ ٥ دەسکی سندوڵو دەسکەوان ٥ **الهِزاعُ:** فیشەكو تیرە کە لەفیشەکدانو تیردان دابمێنێ ٥ **الهَزَعُ:** جمو جوڵو هەڵبەزو دابەز ٥ **الهَزِيعُ من الليل:** سێیەکی یەکەمی شەو یان چواریەکی سەرەتای شەو ٥ ئەحمەقو گێل ٥ **الهَيْزَعَةُ:** ترسو هەراو هۆریای ناو گۆڕەپانی شەڕ ٥ **هَزَفت الريحُ الشيءَ هَزْفاً:** ڕەشەباکە درەختەکەی هەژاندو موتوربەی کرد ٥ **الهِزَفُ:** تەبیات وشكو سرك ٥ گورجو گۆڵ ٥ پەردرێژ.

**هَزِقَ هَزَقاً:** چوستو چالاك بوو ٥ **هَزِقَ في الضحك:** زۆر پێکەنی ٥ **أهْزَقَ في الضحك:** بەمانا (هَزِقَ فيه)دێ ٥ واتە زۆر پێکەنی ٥ **المِهْزاق من الناس:** کەسێك زۆر پێکەنینی هێواشی بێو کاڵفام بێ ٥ دەگوترێ: (إمرأة مِهزاق): ئافرەتێکی کاڵفامی هەمیشە دەم بەپێکەنینی لەسەرەخۆیە ٥ **الهَزَقُ:** قیژە قیژو جمو جوڵ ٥ قریشکەو تیژی دەنگی هەور ٥ **الهَزِقُ:** بەمانا (المِهزاق)دێ ٥ دەنگی هەور کە زۆر گەورەو توند بێ.

**هَزَلَ هَزْلاً:** لاواز بوو ٥ کزو کۆڵەوار بوو.

**هَزَلَ القومُ:** خەڵکەکە حەیوانەکانیان کزو لاواز بوون.

**هَزَلَ فلان في كلامه هزلاً:** فلانکەس گاڵتەو سوحبەتی کرد لەکارەکەدا جیدی نەبوو، شتەکەی بەهەوانتە گرت.

**هَزَلَ الرجلَ:** پیاوەکە ئاژەڵەکانی مندار بونەوەو هەژار کەوت.

**هَزَلَ الدابةَ:** وڵاخەکەی کزکرد بەهۆی نەوەوە بەباشی بەخێوی نەکرد.

**هَزِلَ فلان هَزَلاً:** فلانکەس گاڵتەو سوعبەتی کرد.

**هُزِلَ هُزالاً:** زەعیفو لاواز بوو، دەگوترێ: (هُزِلت حال فلان)؛ وەزعو حاڵی فلان لاواز بوو، دایە نوشوستی ٥ **أهْزَلَ الرجلُ:** پیاوەکە ئاژەڵو وڵاخەکانی کزو لاواز بوون ٥ دەگوترێ: (أهْزَلَ القومُ): خەڵکەکە گرانیو قاتو قڕی لەئاژەڵو وڵاخەکانیانی داو بەقڕچون ٥ ماڵو دارایی خۆیان شاردەوە لەترسی قاتو قڕی ٥ **أهْزَلَ الشيءَ:** شتەکەی لاواز کرد ٥ **أهْزَلَ فلاناً:** فلانکەسی بەپیاوێکی گاڵتەبازو قەشمەری کەر هاتە بەرچاو ٥ **أهْزَلَ الدابةَ:** وڵاخەکەی لاواز کرد ٥ **هازَلَ فلان فلاناً:** فلانکەس گاڵتەی لەگەڵ فلان دا کرد ٥ **المهزلة:** کزو کۆڵەواریی ٥ قاتو قڕیو گرانی ٥ وڕێنە ٥ کارێك زۆرینەی گاڵتەو سوعبەت بێ، شتە جیدییەکانی کەم بن ٥ شانۆگەریو تەمسیلییەك پێکەنینو شتی سەیرو عەنتیکەی زۆر تێدابێ ٥ **المهزول من الشعر:** ئەو شیعرەی بونیەو هەیکەلی نارێكو پێك بێ ٥ **الهُزالُ:** زەعیفو لاوازیی ٥ **الهُزالَةُ:** گاڵتەو گەپو شتی پێکەنین هاوردە ٥ **الهِزّيلُ:** شتی زۆر گاڵتە ئامێز ٥ **الهَزْلُ:** وڕێنەو قسەی پڕو پوچ ٥ قسەی خاوو بێ تامو خوی ٥ **الهَزْلَى:** مارو مۆر، پیری مار بە هەموو جۆرەکانییەوە ٥ **الهزيل:** زەعیفو لاواز ٥ **الهُزَيلى:** هەڵسو

کەوتی جادوبازو چاو بەستکەر کەبەفەندو فێڵو چاو بەستەکیو دەست سوکی بڕێ کاری سەر سوڕهێنەر ئەنجام دەدا ◊ هَزْلَجَ: پەلەی کرد ◊ هَزْلَجَتْ الألفاظ: وشەو رستەکان تێکەڵو پێکەڵ بوون ◊ الهِز لاجُ: گورجو خێرا.

**هَزَمَ** الشَيْئَ هَزماً وهزيماً: شتەکە دەنگی هات ◊ دەگوترێ: (هَزَمَ الرعدُ): هەورەکە گۆلاندی، شریخاندی ◊ هَزَمَتِ الريحُ: رەشەباکە هاشاندی، هاژاندی.

**هَـزَمَ** فلان على فلان: فلانکەس بەزەیی بەفلانکەس دا هاتەوە.

**هَـزَمَ** الشَيْئَ: شتەکەی لۆلۆ خستە سەریەك، هەندێکی بەسەر هەندێکی دادایەوە.

**هَزَمَ** العَدُوَّ هزيمة: دوژمنی شکاندو بەسەری دا زاڵ بوو.

**هَـزَمَ** الشَيْئَ: دەستی خستە ناو شتەکەوەو هەڵیکۆڵی ◊ چاڵی تێکرد.

**هَزَمَ** الأرضَ: گڵی لادا لەسەر یەکێ لەکاریزاوەکانو ئاوی زۆرو رونی لێ دەرهێنا.

**هَـزَمَ** لە حقە: مافی پێشێل کرد ◊ هَزَّمَ الشَيْئَ: شتەکەی شکاندو وردو هاڕی کرد ◊ هَزَّمَ العَدوّ: دوژمنی شکاندو بەسەری دا زاڵ بوو ◊ إهْتَزَمَ الفَرَسُ: ئەسپەکە خرمە خرمی رۆیشتنی هات ◊ إهْتَزَمَت السَحَابَةُ: هەورەکە لەگەڵ گۆڵەو گرمە گرم دا بارانیشی باراند ◊ إهْتَزَمَ الأمْرَ: بڕیاری کارەکەی داو پەلەی کرد بۆ ئەنجامدانی ◊ إهْتَزَمَ الشاةَ: مەڕەکەی سەربڕی ◊ تَهَزَّمَ الشَيْئُ: بەمانا (إهْتَزَمَ) دێ ◊ دەگوترێ: (تَهَزَّمَ الفرسُ): ئەسپەکە خرمە خرمی رۆیشتنی هات ◊ (تَهَزَّمت السحابة بالماء): هەورەکە گۆلاندیو بارانیشی باراند ◊ تَهَزَّمت العصا: عەصاکە شکاو قرچەی هات ◊ تَهَزَّمَ الرعدُ: هەورەکە گۆلاندی ◊ تَهَزَّم البناءُ: باڵەخانەکە تێك روخا ◊ استهزَمَ العَدُوَّ: دوژمنی شکاندو بەسەری دا زاڵ بوو ◊ المِهْزَامُ: گۆچانو عەصای کورت ◊ کۆڵەوەژو داری ئاگر خۆشکردن ◊ دارێکە سەرەکەی ئاگری تێ بەردەدرێو منداڵ یاری شەڕە ئاگری پێ دەکەن ◊ هەروا ناوە بۆ یارییەك منداڵ دەیکەن دەهێنن سەری یەکێکیان بەپارچە پەڕۆیەك دادەپۆشن، ئەمجار یەکە یەکە ئەوانی تر بەدەست لێی دەدەن هەمووجارێ دەڵێن کێ بوو پێی کێشای؟ کەهەڵێ هێنا کێ پێی کێشاوە ئیتر پەڕۆکە دەخەنە سەر سەروچاوی ئەوی ترو لێی دەدەن هەتا دەزانێ کێ لێی داوەو ناوەکەی دەڵێ هەروا تا کۆتایی ◊ الهَازِمَةُ: بەڵاو کارەسات ◊ الهَـزْمُ: زەوی نزمو شێوە چاڵو تەخت ◊ گەدەو ریخۆڵە ◊ هەوری تەنك کەئاوی تێدانەبێ ◊ کونو درزی کوندەی ئاو ◊ الهَـزَمُ: دەنگ ◊ دەنگی کەوانی تیر ◊ فرە فری تیر ◊ الهَزِمُ: ئەسپی جڵەو خۆش ◊ بارانی بەردەوامو درێژخایەن ◊ دەشگوترێ: (فرس هزِم الصوت): ئەسپێکە دەنگی وەکوو دەنگی هەور وایە، حیلەی دەڵێی هەورە دەگۆلێنێ ◊ الهَزْمَةُ: زەوی نزمو مەیلەو چاڵ ◊ دەنگو گرمە ◊ هزمة السِّنَور: دەنگی قورگی پشیلە ◊ قوڵکەو چاڵی هەڵکەنراو لەبەرد ◊ الهَزَمَةُ: بزنی دووساڵ ◊ الهَزِمَةُ من القدور: مەنجەڵێك دەنگی قڵپە قڵپو کوڵانی ببیسرێ ◊ الهِزْمَةُ من الدواب: وڵاخی کزو کۆڵەوارو لاواز ◊ الهَـزُومُ: شتێك بەئاشکرا دەنگی جەرەسی لێ بێ ◊ الهَـزِيمُ: گۆڵە گۆڵی هەور ◊ دەنگی خرمە خرمی رۆیشتنی ئەسپ ◊ ئەسپی حیلکە گەورە ◊ بارانی درێژخایەنو بەردەوام ◊ دوژمنی شکاوو

ڕەتێندراو ٥ **الهَزیعةُ**: تێک شکاو لەشەڕدا ٥ بیرێک ئاوی زۆر بێ ٥ وڵاخو ئاژەڵی کزو لاواز ٥ ئەسپی عەرەق کردو بەهۆی زۆر ڕۆیشتن و ماندو بوونەوە ٥ **الهزّعی**: تێکشکانی تەواوو جەرگبڕ ٥ **الهَیْزَمُ**: شێر ٥ پتەوی ڕەق و ڕەختە ٥ **الهَزْمَجَةُ**: قسەکردنی خێرا خێراو لێکدان لێکدان ٥ گاڵو بوغڵو تێکەڵاو بوونی دەنگەکان ٥ **هَزْهَزَ الشَیْئَ**: شتەکەی لەرە لەر پێ کرد، خستیە شەقەتۆڵە ٥ زەلیل و ملکەچی کرد ٥ **تَهَزْهَزَ الیه القلب**: دڵی بۆی لێ دا ٥ دڵی پێی کرایەوە ٥ **الهُزاهِزُ من الماء**: ئاوی زۆری ڕەوان کەلەبەر زۆری کڵەو بکا ٥ ئەگەر بۆ شمشێر بەکارهات مەبەست شمشێری بریسکەدارو سپی و بێ پەڵەو لەکەیەکە لەکان و مەعدەنی ڕەسەن دروست کرابێ ٥ **الهُزهاز**: دەق بەمانا (هُزاهِز)دێ ٥ **الهُزْهاز من الآبار**: بیری قوڵ، زۆر قوڵ ٥ **الهَزْهَزَةُ**: بەڵاو کارەسات کەخەڵک بتاسێنێ و مەدهۆشیان بکا.

**هَزَأ هَزْواً**: ڕۆیی.

**هَسْ**: وشەیەکە بۆ دەرکردنی مەڕو بزن ٥ فەرمانکردنە بە بێدەنگ بوون واتە وسبە.

**هَسَّ فلان هَساً**: فلانکەس لەبەر خۆیەوە قسەی بۆ خۆی کرد.

**هَسَّ الشَیْئَ**: شتەکەی باریک کردەوەو شکاندی.

**هَسَّ الکلامَ هَسیساً**: قسەکانی لەسەر خۆ کردن.

**هَسَّ الطفلَ**: لەمنداڵەکە توڕەبوو بۆئەوەی بێدەنگ بێ ٥ **الهسیسُ**: وردکراوو هاڕاو لەهەرشتێک بێ ٥ **الهَسُّ**: قسەی سرتە کەلێی حاڵی نەبی ٥ **هَسْهَسَ الرجلُ**: پیاوەکە شەو ڕۆیی ٥ **هَسْهَسَ لیلته کلها**: شەوەکە هەمووی بەڕێوە بوو هەر ڕۆیی ٥ نوزەی لێوە هات ٥ دەشکوترێ: (هَسْهَسَ الخلخالُ وهَسْهَسَت الدرعُ) ٥ **هَسْهَسَ الماءُ**: ئاوەکە بەڕونی و جوانی هاتە خوار ٥ **هَسْهَسَ الحدیث**: قسەکەی شاردەوە ٥ **تَهَسْهَسَ**: بەمانا (هَسْهَس)دێ ٥ **الهَساهِسُ**: ڕۆیشتن بەشەو ٥ دەنگی سمی حوشتر ٥ قسەی بەئەسپایی ٥ **الهُساهِسُ**: قسەی ناو دڵ وتو وێژی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی ٥ وەسوەسەو دەنەدەنەی ناو دەروون ٥ **الهَسْهَاس**: قسەی بەئەسپایی کەلێی حاڵی نەبێ ٥ ئەوکەسەی شەو ناخەوێ و خەریکی ئیشکردنە ٥ قەساب ٥ ڕۆیشتنی خێرا ٥ **الأهْساءُ**: خەڵکانێک کەدەکەونە حاڵەتی سەر سوڕمان و تاسانەوە.

**هَشَرَ الناقةَ هَشْراً**: هەرچی لەگوانی حوشترەکەدا هەبوو هەمووی دۆشی ٥ **هَشَرَ البعیرُ**: حوشترەکە سییەکانی سوتان ٥ **الهَشْرُ**: سوکی و تەنکی شت ٥ **الهَشْرَةُ**: کەیف و خۆشی و تەڕدەماخی.

**الهَشِرَةُ**: درەختێک زوو گەڵای هەڵوەرێ ٥ **الهَشورُ**: بەمانا (الهَشِرَةُ)دێ ٥ **الهَیْشَرُ**: پیاوی درێژی شل و شێواو ٥ هەروا ناوە بۆ ڕوەکێک بەتەمەن و چقڵاوییە لەپێری ڕوەکی مورەکەبەیە لەوڵاتی میصرو ولاتانی سەر دەریای ناوەڕاست دەڕوێ باڵای بەئەندازەی ٣٠سم تامەترێک بەرز دەبێتەوە ٥ قەدو لاسکەکەی نەرم و شیوەڵ شیوەڵە ٥ گەڵاکانی بەسەر خۆی دا شۆڕ دەبنەوە، لای خواروی چقڵاوی و کەلکەلە ڕوبەری سەروی لوس و گوڵەکانی زۆرو ڕەنگ شینن میوەکەی وەکوو دەنکە قەزوان وایە.

**هَشَّ الرجل هَشّاً**: بەگۆچان و عەصا هەڵمەتی بۆبرد.

**هَشَّ الشجرةَ**: بەگۆچان درەختەکەی تەکاند، درەختەکەی کوتا بۆ ئەوەی گەڵاکانی هەڵوەرێ.

**هَشَّ اليه وله:** دڵی پێی کرایەوە ◊ پێی دڵخۆش بوو.
**هَشَّ الخبز ونحوه هشاً وهشوشةً:** نانەکە تەنکو وشکو ڕەق بوو خێرا ورد بوو.
**هَشَّ العودُ:** عودەکە شکا ◊ نەمامەکە شکا.
**هَشَّ الشَیْئُ مشوشةً:** شتەکە کلۆرو بێ هێز بوو ◊ **هَشَّشَ فلاناً:** فلانکەسی کەیف خۆش کرد تەردەماخی کرد ◊ هەوڵی لاوازکردنیو زەعیف بوونی دا ◊ **إهْتَشَّ فلان للأمر وبه:** فلانکەس حەزی لەکارەکە بوو، دڵی بۆی لێ دا ◊ **استهش الشَیْئَ:** شتەکەی بەسوکو بێ نرخ زانی، سوکی کرد ◊ **الهَشُّ:** شتێک بەئاسانی بشکێ ◊ دەگوترێ: (خبز هَشٌ): نانێکی ڕەقو تەنکە هەر لە خۆیەوە ورد دەبێ ◊ هەرشتێک نەرمو تەنکو خۆنەگربێ ◊ پیاوی ڕوخۆشو دەم بەپێکەنین ◊ ئەسپێک زۆر ئارەق بکا ◊ دەشگوترێ: (فرس هشَ العنان)، ئەسپێکە جڵەو نەرمە، جڵەو خۆشە ◊ **الهَشّاش:** دەگوترێ: (خبز هَشاش): نانێکە ڕەقو تەنکە هەر لەخۆیەوە ورد دەبێ ◊ **الهَشاشَة:** (هشاشة العظام): نەخۆشییەکە زکماکە توشی کۆئەندامی ئێسکی مرۆڤ دەبێ ◊ **الهَشّاشَةُ:** کوندە ئاو کەلەبەر تەنکیو پندر نەبوونی ئاوی لێ بتکێ ◊ **الهَشوش:** مەڕێک زۆری شیر هەبێ ◊ بەشیر بێ ◊ **الهشوشَةُ:** لەبواری کیمیادا بریتییە لەتایبەتمەندییەکی مادە وای لێ دەکا ئامادە باشی زوو شکاندنی تێدابێ ◊ بەئاسانی بشکێ ◊ **الهَشیشُ من الرجال:** کەسێک نەگەر داوای یارمەتیو بەخششی لێ بکرێ پێی خۆش بێ ◊ هەرشتێک بەئاسانی تێک بشکێو خۆگرنەبێ ◊ وردو پەرت بوو جەستە لاوازو بێ وەج ◊ بۆمێینە (هَشیشَة) دەگوترێ ◊ **هَشَّلَت الناقةُ ونحوها:** حوشترەکە کەمێک شیری دا ◊ **اهتشل الدّابّةَ:** بەبێ ئیزنی خاوەنی، ولاخەکەی بەکارهێنا ◊ **الهَشیلَةُ:** ئەو ولاخو ئاژەڵو ئامێرەیە بەبێ ئیزنی خاوەنی بەکار بهێندرێ یان داگیر بکرێ ◊ **الهَیْشَلَة:** حوشتری بەساڵاچوی قەڵەو.
**هَشَمَ الشَیْئَ الأجوفَ او اليابسَ:** شتە کلۆرەکە یان وشکبوەکەی ئامادەکرد بۆ تێکوشین.
**هَشَمَ الناقَةَ:** حوشترەکەی دۆشی.
**هَشَّمَ الشَیْئَ الأجوف أو اليابس:** بۆ زێدەڕەوی لەمانای (هَشَمَ)دێ ◊ واتە شتە کلۆرەکە یان وشکەوە بووەکەی زۆر ورد کرد ◊ **إنْهَشَمَ الشَیْئُ:** بۆ موطاوعەی (هَشَمَهُ)دێ ◊ **إنْهَشَمَ الإبل:** حوشترەکە لاواز بوو لەڕو کزو کۆڵەوار بوو ◊ **إهتَشَمَ نفسَهُ له:** خۆی بۆ شکاند، خۆی لەئاستیا بچوک دانا ◊ **تَهَشَّمَ الشَیْئُ:** بۆ موطاوعەی (هَشَّمَهُ)دێ ◊ **تَهَشَّمَت الأرض:** زۆر لەمێژە زەوییەکە بارانی لێ نەباریوە ◊ **تَهَشَّمَ الشجرُ:** درەختەکە لەبەر زۆر وشک بوونی شکا تێک شکاو هاڕەی کرد ◊ دەشگوترێ: (تَهَشَّمَتِ الريحُ الشجر): ڕەشەبایەکە درەختەکەی تێک شکاند ◊ **تَهَشَّمَ على فلان:** بەزەیی بەفلان دا هاتەوە ◊ **تَهَشَّمَ فلاناً:** هەوڵی دا فلان لەخۆی ڕازی بکا ◊ دەگوترێ: (تَهَشَّمْتُ فلاناً للمعروف): داوای بەخششو پیاوەتیم لەفلان کرد ◊ ڕێزی فلانکەسم گرت ◊ **الهُشامُ من النوق ونحوها:** حوشترێک زوو کزبێ ◊ **الهَاشِمُ:** کێوی نەرمو ڕوخەک ◊ شیر دۆشی لێزان ◊ **الهاشِمة:** برینێک ئێسقان ورد بکا ◊ **الهِشامُ:** بەخشندەیی ◊ **الهَشْمُ:** زەوی سوتەمەڕۆو بێ بەرو بوم ◊ زەوی نزمو

دەشتایی ◊ **الهَشِمُ:** سەخیو دەست کراوە ◊ **الهَشَمَةُ:** بزنەکێوی ◊ **الهَشومُ مِن الأرض:** زەوییەك بیرێكی قوڵی تەسكی تێدا هەڵكەندرابێ ◊ **الهَشیمُ:** وردکراو پەرت بوو ◊ درەختی گەندەڵو رزیو کەدار کەر بەئارەزوی خۆی بەئاسانی وردی دەکا ◊ پوشو پەڵاشی ساڵی رابردوو ◊ شتی وشکەوەبوو لەهەر جۆرێك بێ ◊ جەستە لاوازو زەبوون ◊ **الهَشِیمَةُ:** کێوو کەژو زەوییەك درەختەکانی وشك بوبنو بەپێوەمابن ◊ درەختی وشکی رزیو ◊ **الهَیشوم مِن الکَلأ ونحوه:** لەوەری وشکەوە بووی ناسك ◊ **الهَشْتَقُ:** مەکۆکی جۆلا، ئەوشتەی جۆلا تێوەدانەکەی لەسەر هەڵدەکا ◊ **هَشْهَشَ الشَیْئَ:** شتەکەی جولاند ◊ **تَهَشْهَشَتِ المرأةُ:** ئافرەتەکە خۆی لای مێردەکەی خۆشەویست کرد ◊ **هاشاه:** سوعبەتو یاری لەگەڵ کرد.

**هَصَرَ فلان الشَیْئَ:** فلانکەس شتەکەی شکاند.

**هَصَرَ الغُصْنَ ونحوه وبه:** لقەدارەکەی چەماندەوە شکاندییەوە بەبێ ئەوەی بەتەواوی لێی بکاتەوە ◊ لقەدارەکەی داهێناو رایتەکاندو شوری کردەوە.

**هَصَرَ قِرنَه:** بەتوڕەیی چاوی لەبەرامبەرەکەی داگرت.

**هَصَرَ الحیوانُ رأس الفریسة:** درەندەکە سەری نێچیرەکەی تێك شکاند.

**هَصِرَ الشَیْئُ هَصَراً:** شتەکە خواربوو ◊ **اهتصر الغُصْنُ:** لقەدرەختەکە کەوتە سەرزەوی ◊ **اهتصر الشَیْئَ:** بەمانا (هَصَرَهُ)دێ ◊ **إهتصر النخلةَ:** لقو پۆپی دارخورماکەی رێك خستن ◊ **تَهَصَّرَتْ أغصان الشجرة:** لقو پۆپی درەختەکە شۆڕبۆوە ◊ **المُهْتَصِرُ:** شێر ◊ **الهَصِرُ:** شێر ◊ پیاوی بەهێزو بەتوانا ◊ **الهُصَرُ:** بەمانا (الهَصِرُ) دێ ◊ شێر ◊ **الهَصَرَةُ:** مێرویەکە ئافرەت پێیان وابووە دەتوانن بەهۆی ئەو مێرووەوە سیحرو جادو لەپیاو بکەن ◊ **الهَصُورُ:** شێر ◊ **هَصَّتْ النار ونحوها هَصیصاً:** ئاگرەکە بڵێسەی داو روناکی خستە دەورو بەری خۆیەوە.

**هَصَّ فلان هَصّاً:** فلانکەس پێی لێ ناو پلیشاندییەوە ◊ بەپەنجەکانی گرتیو گوشی ◊ **هَصَّصَ الرجلُ:** پیاوەکە چاوی بریسکەیان کرد ◊ **الهاصَّةُ:** چاوی فیل ◊ **الهَصُّ:** هەرشتێك رەقو پتەو بێ.

**هَصَمَ الشَیْئَ:** شتەکەی شکاند.

**هَصَمَ قِرنَه:** بەرامبەرەکەی شکاند، بۆڕی دا ◊ **الهِصَمُ:** شێر ◊ **الهَیْصَمُ:** ئەستورو بەهێزو پتەو ◊ جۆرە بەردێکی سفتو لووسە ◊ دەشگوترێ: (نابٌ هَیْصَمٌ): کەڵبەیەکە هەموو شتێك دەهاڕێ ◊ **الهُصامِصُ:** مرۆڤی بەهێز ◊ شێری ئازاو بەهێز ◊ **الهَصْنَاصُ:** کەسێك چاوی بریسکەیان بێ، تیشك بدەنەوە ◊ **هَصَاهَصُوا:** پیربوو کەوتە ساڵەوە.

**هَضَبَ الرجلُ:** پیاوەکە وەکوو رۆیشتنی وڵاخی گێل بەرێگادا رۆیی ◊ **هَضَبَت السماءُ:** ئاسمان بارانی بەردەوام بوو ◊ درێژخایەن بوو بروکەی نەدایە ◊ دەگوترێ: (هَضَبَ الشاعر بالشعر): شاعیرەکە درێژەی دا بەشیعر خوێندنەوە ◊ **هَضَبَتْ السماءُ القومَ:** ئاسمان خەڵکەکەی بەتەواوی تەڕکردو شرتو شۆی لێ برین ◊ **أهْضَبَ في الحدیث:** چەند جارێك چووە ناو قسەو باسەکەوەو دەنگی هەڵبڕی ◊ لەسەر تەپۆڵکەو شتی وا دابەزی ◊ **إهْتَضَبَ في الحدیث:** بەمانا (أهْضَبَ)دێ ◊ **الأهضوبَةُ:** تەپۆڵکە ◊ بان ◊ دەشتایی بانو

بەرز ۵ بارانی قەترەگەورەو درێژخایەن ۵ الهَضبَة: بان؛ دەشتایی پان و پۆر کەئەملاو ئەولای نزم بن وەکوو بانی مقان، بانی ئێران ۵ کێوی پانەوە بووی گەورە بەسەر رووبەرێکی زۆری زەوی دا بڕوانێ ۵ دەگوترێ: (رجل هَضبة): پیاوێکی سوێر قسەیە، زۆر بلێ یە ۵ الهِضَبُ: شتی پتەوی رەق ۵ ئەسپێك زۆر ئارەق بکا ۵ الهَضیبُ: (غنم هضیب): مەڕێکی کەم شیرە ۵ هَضَّجَ الرجلُ مواشِیَه: پیاوەکە جوان و رێك و پێك ئاژەڵەکانی بەخێو نەکردن ۵ الهَضیجُ: دەگوترێ؛ (صبیان هضیج): منداڵەکان بەچوکن و ئیش و کاریان بەرێك و پێکی بۆئەنجام نادرێ و هیچیان لەدەست نایە ۵ هَضَّتِ الإبلُ: حوشترەکە پەلەی کرد، خێرا رۆیشت ۵ دەگوترێ: (هَضَّت السَّیْرَ): رۆیشتنەکەی خێرا کرد.۵ هَضَّ فلان المَشْيَ: فلانکەس رۆیشتنێکی جوان رۆیی و تەکانی بەخۆی دا.

هَضَّ الشَيْئَ: شتەکەی شکاندو وردی کرد ۵ هَضْهَضَ الرجل: پیاوەکە بەتوندی قاچی بەزەوی دا داو زەوییەکەی پەستاوت ۵ اهْتَضَّ الشَيْئَ: بۆ زێدەرۆیی لەماناى (هَضَّهُ)دێ ۵ اهْتَضَّ نَفْسَهُ لفلان: خۆی کەمتەرخەم نیشان دا بەرامبەر فلان و نەفسی خۆی هەڵنا بۆ زێدە خزمەتکردنی ئەو بابایە ۵ الهَضَّاءُ: کۆمەڵ و تاقم ۵ دەستە سەربازو پۆلە پێشمەرگە ۵ الهَضّاضُ: نێرە حوشتر کەپیاو دەکوژێ یان حوشتر دەکوژێ و یان دەیانخاو دوایی قورسایی خۆی لەسەریان لادەبا ۵ الهَضهَضُ: شکان، ورد بوون.

هَضَلَ الرجلُ بالكلام: پیاوەکە کەوتە ناو قسەو گوفت و گۆوەو درێژەی پێدا ۵ أهْضَلت السماءُ: ئاسمان بارانی باراند ۵ أهضلت الدَّلْوُ: دۆڵچەکە ئاوی لێ رژا چونکە لەقەراخی بیرەکەی دا ۵ الهَضّالُ: کەسێك شیعر بەگۆرانی دەڵێ و دەیکاتە حودیە بۆ حوشترەکانی بۆئەوەی خێرا برۆن ۵ الهَضْلُ: زۆر ۵ الهَضلاءُ من النساء: ئافرەتێك مەمکی درێژبن و شۆڕبوبنەوە ۵ ئافرەتێك عادەی مانگانەی نەمابێ ۵ الهَیْضَلُ: سوپای زۆر ۵ تاقمی پرچەك و پەككەوتوو لەشەڕدا ۵ پیاوی درێژو کەتەو زەلام ۵ الهَیْضَلَةُ: ئافرەتی تەمەن مام ناوەندی ۵ نەگەنج نەپیر ۵ حوشترێك شیری زۆر بێ ۵ گاڵ و بوغڵی خەڵك کەدەنگیان تێکەڵاو دەبێ.

**هَضَمَ** علیه هَضماً: هێرشی کردە سەر ۵ کەوتە خوار، دابەزی. دەگوترێ: (ما هَضَمَ علیه): هێرشی نەکردۆتە سەر، لێی نزیك نەبۆتەوە.

**هَضَمَ** له من حقه: وازی لەهەندێ مافی خۆی هێنا بۆ هاوەڵەکەی بەگەردن ئازایی.

**هَضَمَ** الشَيْئَ: شتەکەی شکاند.

**هَضَمَ** فلاناً: ستەمی لەفلانکەس کردو مافی خۆی نەدایە.

**هَضَمَ** نفسَه: لەرێزی خۆی کەم کردەوە، خۆی شکاند ۵ نەفسی خۆی دابەزاند.

**هَضَمَ** الطعامَ: خواردنەکەی ئەزم کرد.

**هَضَمَ** الهواضیم الطعامَ: کۆئەندامی هەزم خواردنەکەیان گۆڕی بۆ مادەی کیلۆسی کەبگونجێ بۆ جەستەو سودی لێ وەربگیرێ.

**هَضِمَ** هَضَماً: گەدەی وێك هاتەوەو بچوك بۆوە ۵ قەدی باریك بوو کەلەکەی باریك بوونەوە.

**هَضِمَ** الفرسُ: ئەسپەکە پەراسووەکانی رێك بوون ۵ إهْتَضَمَ فلاناً: بۆ زێدەرۆیی لەماناى (هَضَمَهُ)دێ

٥ إنهَضَمَتْ الثمرةُ: میوەکە پێگەیی دەمی کردووە ٥ تَهَضَمَتِ الثمرةُ: بەمانا (إنهضمت)دێ ٥ تَهَضَّمَ فلان لفلان: فلانکەس ملکەچی فلان بوو ٥ تَهَضَّمَ نفسهُ له: نەفسی خۆی لێ رازی کرد وای کرد لێی رازی بێ ٥ تَهَضَّمَ فلاناً: فلانکەسی بەکەم زانی ٥ الأهضم: دەگوترێ: (رجل أهضم الكشحين): پیاوێکە کەلەکە پێچراوەیە ٥ کەلبە گەورە ٥ المُهَضَّبَةُ: دەگوترێ: (قصبة مُهَضبَةٌ): قەفەزاژێکی کونکونە دەکرێتە بلوێرو جوزەلە ٥ المهضومَة: دەگوترێ: (قصبة مهضومة): قەفەزاژێکی کونکونە دەکرێتە بلوێرو جوزەلە ٥ بۆنێکە تێکەلاوی میسكو بان دەکرێ ٥ الهاضِمُ: هەرشتێك نەرمیو شلی تێدابێ ٥ الهاضوم: هەردەرمانێك کاریگەربێ بۆ هەزمکردنی خۆراك. هەرمادەیەك خواردن هەزم بکا وەکوو تفو سەفراو هەموو ئەو مادانەی غودەی تایبەتمەندییەکان دەری دەدەنو تێکەڵ بەخواردن دەبنو دەبنە هەزم کەر ٥ ئەوکەسەی مالی خۆی دەبەخشێ ٥ الهَضّام: بەمانا (الهاضوم)دێ ٥ الهَضْمُ: عەمەلییەو کارلێکێکە مادە هەزمکەرەکان ئەنجامی دەدەن ٥ خواردنە جۆراو جۆرەکان دەگۆڕن بۆ مادەیەکی بژێوی گونجاو بۆ جەستە ٥ الجهاز الهضمي: کۆئەندامی هەزم، کۆمەلە ئەندامێکن هاوکاری یەکتر دەکەن بۆ هەزمکردنی خۆراك، وەکوو ددانو غودەی هەزم کردنو گەدەو ریخۆلە ٥ القناة الهَضْمية: قەناتو ڕێڕەوێکە لەکلۆرایی جەستەدا هەموو کۆئەندامی هەزم پێوەی بەستراون، لەدەمەوە دەست پێ دەکا تا قوڵۆن ٥ الهِضْمُ: زەوی تەختو نەرمو مەیلەو چاڵ ٥ ناوەوەی شیوو دۆڵ ٥ بوخور ٥ الهضوم: بەمانا (الهاضوم)دێ ٥ دەگوترێ: (یدهضوم): دەستێکی بەخشندەیە، چی لا هەبێ دەیبەخشێ ٥ الهضیمُ: بەمانا (المهضوم)دێ ٥ ئافرەتی نەرمو شلی قەد باریك ٥ شتی کاملو گەییو ٥ هێشووە میوەی بزمار کوتو تێکچرژاو ٥ قورئان دەفەرموێ: (ونخل طلعها هضيم) ٥ دەشگوترێ: (قصبة هضيم): قەفەزاژێکی کونکونەو دەکرێتە بلوێرو جوزەلە ٥ الهَضيمة: ستەمو داگیر کردن ٥ خواردنێك دەکرێتە خێر بۆ مردو ٥ هاضاه: بەئەحمەقو گێلی لەقەلەم داو بەبێ ڕێزی سەیری کرد.

**هَطَرَ** الفقيرُ للغنيّ مطرةً: هەژارەکە بۆ دەوڵەمەند ملکەچی نیشان داو لەبەری پاڕایەوەو سواڵی لێ کرد.

**هطَسَ** فلان الكلبَ ونحوه: فلانکەس بەدار لەسەگەکەی دا ٥ تهطَرَتْ البئرُ: بیرەکە دیوارەکەی تێك روخا ٥ تهطرس الرجلُ: پیاوەکە لەڕۆیشتن دا خۆی باداو لارو لەنجەی کرد ٥ الهُطُط: ئادەمیزادی مردو، کەلاکی مرۆڤی مردو.

**هَطَعَ** هَطْعاً وهُطوعاً: بەپەلەو بەترسو لەرزەوە هات ٥ ملی درێژکردو سەری راست کردەوە ٥ چاوی لەشتەکە بڕیو چاوی لێ نەبروکاند (نەتروکاند) ٥ أهطع فلان: فلان بەزەلیلیو چاو بەرەو ژێری سەیری کرد ٥ أهطع في سيره: لەڕۆیشتنەکەی دا پەلەی کرد ٥ إسْتَهطَعَ: ملی درێژکردو سەری بەرزکردەوە ٥ استهطعَ في سيره: لەڕۆیشتنی دا پەلەی کرد ٥ المُهْطِعُ: ئەوکەسەی بەزەلیلیو ملکەچی دەڕوانێ ٥ کەسێك لەبەر زەلیلیو داماوی خۆی بێ دەنگەو هیچی پێ ناگوترێ، هەرکە بانگی لێ دەکرێ خێرا دەچێ بۆلای ئەوکەسەی بانگی دەکا ٥ الهَيْطَع: ڕێگای

پان و بۆرو فراوان ◊ هطف الراعي هَطْفاً: شوانەكە شيرى دۆشى ◊ هطفت السماءُ: ئاسمان بارانى باراند ◊ هَطَفَ اللبنُ: شيرەكە خوشەى هات لەكاتى دۆشين دا ◊ الهَطْفُ: خوشەى شير ◊ الهَطِفُ: بارانى زۆر.

**هَطَلَ** المطر هَطْلاً وهَطَلاناً: بارانەكە دڵۆپەى گەورە بوو تاوتاو بارى و بەردەوامیش بوو ◊ دەگوترێ: (هطل الدَمْعُ) فرمێسكەكە هەڵوەرى.

**هَطَلَ** الرجلُ هطلاناً: پياوەكە بەگورجى سەرەو ژێر ملى رێگاى گرت و داپەرپە خوار.

**هَطَلَ** الجَرْيُ الفرسَ هطلاً: رۆيشتن چين چين ئارەقى بەئەسپەكە كرد ◊ تهاطل القومُ ونحوهم: خەڵكەكە شوێن يەك كەوتن و رۆيشتن ◊ تَهَطَّلَ المطر أو السحابُ: بارانەكە بەدڵۆپى گەورە گەورەو تاوتاو بارى، يان هەورەكە بارانى دڵۆپ گەورەو تاوتاوى باراند ◊ الهَاطِلُ: كشتوكاڵى تێكچرژاو ◊ الهَطَّالُ: هەورێك باران زۆر ببارێنێ ◊ الهَطَلُ: بارانى درێژخايەن ◊ ماندوبوون ◊ الهِطْلُ: ماندوكەر ◊ نەحمەق و گێل ◊ دز ◊ گورگ ◊ الهُطْلُ ديمة هُطْلٌ: هەورى باراناوى ◊ الهَطْلى: حوشترى بەرەڵلاو بێ شوان و قەتارچى ◊ الهَطْلاءُ: (ديمة هطلاء): هەورى باراناوى ◊ الهَيَاطِلة: رەگەزێكى تورك نەژادو سيندين ◊ الهَيْطَلُ: تاقم و پێرى كەم ◊ رێوى ◊ الهَيْطَلَةُ: مەنجەڵى مس، تاوەى مس كێشتى تێدا لێ دەنرێ ◊ الهَيْطَلِيّة: جۆرە حەڵوايەكە لەمادەى نيشاستەو شيرو شەكر دروست دەكرێ ◊ هَطْلَسَ: گورگە لوقەى كرد ◊ ئەوەى داواى كرد وەرى گرت ◊ تَهَطْلَسَ الرجلُ: پياوەكە گورگە لوقەى كرد پلانى دانا بۆ دەسگير كردنى ◊ تهطلس اللِّصُّ: دزەكە فرت و فێڵى كردن بۆ دزيكردن ◊ تَهَطْلَسَ المريضُ من مرضه: نەخۆشەكە چاك بۆوە ◊ الهَطَلَّسُ: دزێك كەهەرچى دەستى بكەوێ بيدزێ ◊ گورگ ◊ سوپاى زۆر ◊ الهَطَلَّعُ: زۆر ◊ تاقم و پێرى ئادەميزاد ◊ جەستەى زۆر درێژ كە بەهۆى درێژى لەرەڵەر بكا ◊ هَطْهَطَ في المشي: لەرۆيشتن دا پەلەى كرد ◊ الهُطاهِطُ: ئەسپ.

**هَطَا** الشَّيْءَ هَطْواً: شتەكەى فرێ دا ◊ الهُطى: لێدانى توندو بەئازار ◊ كێشەو بەربەرەكانى ◊ هَيْعَرَ: جوست و وێڵ بوو ◊ هَيْعَرت المرأةُ: ئافرەتەكە بەدرەوشت بوو ◊ دانەسەكناو گەرپەدە بوو، ماڵانگەڕ بوو ◊ تَهَيْعَرَتِ المرأة: بەمانا (هَيْعَرَتْ)دێ ◊ الهَيْعَرَة: ئافرەتى بەدرەوشت و زۆر بلێ و فيزەكەر ◊ دێوو درنج و خێو ◊ شتى وردو بچوك

**هَفَتَ** الرجلُ: پياوەكەى بەبێ راوەستان قسەى كردو چەنەى داو هيچى بەسەر هيچەوە نەبوو ◊ هُفِتَ الرجلُ: پياوەكە سەرسام بوو ◊ إنهفت الشَّيْءُ: شتەكە دابەزى و نرخى كەم بۆوە ◊ تهافت الجدارُ أو الثوب ونحوهما: ديوارەكە پارچە پارچە كەوتە خوار ◊ يان قوماشەكە پارچە پارچە هەڵوەرى ◊ دەشگوترێ: (تهافت الفراش على النور أو في النار): پۆل پۆل پەپولەكان هەڵوەرينە ناو ئاگرەكەوە ◊ تهافت الناسُ: خەڵكەكە وەجبە وەجبەو چين چين مردن ◊ تهافت الآراء: بيرو رايەكان هەندێكيان هەندێكيانيان هەڵوەشاندەوە ◊ رايەكان پوچەڵبوونەوەو خۆيان نەگرت ◊ تهافت الناس على الماء: خەڵكەكە چين چين چوونە سەرئاوەكە ◊ الهَفَاتُ: نەحمەق و گێل ◊ الهَفْتُ: زەوى نەرمەڵان و مەيلەو چاڵ ◊ بارانى

بەلێزمەو خورەم ◊ گێلیو نەفامی زۆر. ◊ الهَفتق: هەفتە.

**هَـفَّ الـشَّيْءُ هَفيفـاً:** شـتەكە كێشی كـەم بـوو ◊ چوست بوو.

**هَفَّ السائرُ:** رێبوارەكە لەرۆیشتن دا پەلەی كـرد ◊ **هَفَّـت الـريحُ هَفّاً وهَفيفاً:** بایەكـە هـەڵبو هاشـە هاشی هات.

**هَفَّ الـزرعُ:** كشتوكاڵەكە دانەوێڵەكـەی بـەزەوی دا بـڵاو بـۆوە چـونكە درەنـگ دورایـەوە ◊ **إهتـفَ الصوتُ:** دەنگەكە بیسترا، لەگوێچكەی بیسەران دا زرینگایـەوە ◊ **إهتـفَ الـسرابُ:** تراوێلكەكـە درەوشایەوە ◊ **المُهَفَّفُ مـن الرجـال:** پیـاوی قـەد باریـك، ورگ بـچكۆلە ◊ **الهِـفُّ:** ئـادەمیزادی سوكەڵەو چوست ◊ كشتوكاڵێك درەنـگ دروێنـە بكـرێو دانەوێڵەكـەی بڵاوبێتـەوە ◊ شـانە هەنگوینی تەنكی سوكی كەم هەنگوین ◊ تەنكە هەوری بێ باران ◊ هەر شتێك سوكو بۆش بێ ◊ **الهَفـاف:** سوكەڵەو گورجو گۆڵ ◊ باڵی تیـژو تـەنك بـۆ فـڕین ◊ پۆشـاكی تـەنكو شـەفاف ◊ سێبەری سارد ◊ تراویلكەی درەوشاوە ◊ **الهِفّان:** شوێن پـێ ◊ **اليهفـوف مـن الرجـال:** پیـاوی بـێ ڕەحمو دڵ ڕەق ◊ گێلو نەحمەق ◊ ترسنۆك ◊ زەوی چۆڵ.

**هَفَكَ الشَّيْءَ:** شتەكەی فـڕێ دا ◊ **تهفك:** لەڕۆیـشتن دا نارێكو پێك بوو خوارو خێچ ڕۆیی ◊ زۆر هەڵخلیسكاو قاچی تێك باهەڵدران ◊ **المُهَفَّكُ من الرجال:** كەسێـك زۆر هەڵەبكاو شتی لـێ تێـك بـچێ ◊ **الهَيْفَـك مـن النـساء:** ئـافرەتی گێـل ◊ **هَفهَـفَ:** جەسـتەی ڕێـكو شـوش بـوو تـالێی بروانـی جـوانی لـێ بتكـێ ◊ **هفهـف الـشَّيْءَ:** شـتەكەی جوڵانـدو پـالێ پێوەنـا ◊ **المُهَفْهَـفُ:** قـەدباریك ◊ ورگ بـچكۆلە ◊ **الهَفْهَـاف:** بـەمانا (المُهفْهَفُ) دێ ◊ تینو ◊ باڵی تیژو تەنكو سوك بۆ فڕین ◊ پۆشاكی تەنكی شەفاف ◊ **هفافي المشي هَفْواً وهفواناً:** پەلەی كرد خێرا خێـرا هـەنگاوی هـەڵێنان ◊ دەگـوترێ: (هفـا الظبـيُّ): ئاسـكەكە سوك بوو رایكردو بازی دا.

**هفا الطائر:** باڵندەكە باڵی لێك دانو فڕی.

**هفا فلان:** فلانكەس كەوتە خـوار ◊ هەڵـەی كـرد ◊ برسی بوو.

**هفت الريحُ:** بایەكە هەڵی كرد.

**هَفَـت الـريحُ بالـشَّيْءِ:** بایەكـە شـتەكەی جوڵانـدو بردی، رایدا.

**هَفَـتْ الـريحُ بـالمطر:** رەشـەبایەكە بارانەكـەی دوورخستەوە.

**هَفَتْ النفس الى الشَّيْءِ:** نەفسو ئارەزۆكە حـەزی لەشتەكە بـوو بـۆی كوركانـد ◊ بـۆی هەڵپـەڕیو كەوتە رەقصو سەما.

**هفا القلبُ:** دڵ كەوتە كوتەكوت، دڵەكە لێی دا.

**هفا الـشَّيْءُ في الهـواء:** شتەكە بەحـەواوە ڕۆیـی ◊ كەوتە حەواو ڕۆیی ◊ **هافاه:** هێنایـە سـەرهەواو هەوەسی خۆی ◊ **الهافية من الإبل:** حوشتری گوم بـوو ◊ **الهفـا:** بـاران تاوێـك دەبـارێو خـۆش دەكاتەوە ◊ **الهَفَاءُ:** هەڵەو تێـكەوتن ◊ **الهَفاة من الرجال:** پیاوی گێلو نەحمـەق ◊ **الهفـوة:** بـەمانا (الهَفَـاءُ)دێ ◊ هەڵـەكردنو تێـكەوتن ◊ **الهَقْـبُ:** پـانو پـۆڕ ◊ **الهِقَـبُ:** گـەرو فـراوان كـەبتوانێ هەمووشتێك قوت بدا جەستە گەورە ◊ قـەبارە گەورەو درێژ.

**هَقَـعَ الفَـرَسَ بـين أذنيـه هقعـاً:** نێـوان دوو گـوێی ئەسپەكەی داخ كرد ◊ **إهتقع الحمى فلاناً:** لـەرزو

تا كه رۆژێك لەكۆڵ فلان بۆومو رۆژی دوایی بۆی هاتەوە بەخەستی گرتیەوە ◊ **إهتقع فلاناً عرق سوء**: رەگەزو رەچەڵەكی خراپ بوونە هۆی ئەوەی فلان پلەی رێزو شكۆمەندی بەدەست نەهێنێ ◊ **اهتقع لون فلان**: رەنگی فلانكەس لەترسان گۆڕا ◊ رەنگی زەرد هەڵگەڕا ◊ **إنهقع فلان**: فلانكەس برسی بوو سكی تێك قبوت ◊ **تَهَقَّع الرجل**: فلانكەس كاری ناشیرینی ئەنجام دا ◊ **تهقع علينا**: خۆی بەزل زانیو فیزی بەسەرمان دا كرد ◊ هەڵسو كەوتی ناشیرینی بەرامبەرمان ئەنجام دا ◊ **تهقّعَ القومُ ورداً**: خەڵكەكە هەموویان تێكڕا چوونە سەر ئاوەكە نۆرەو سەرەیان تێك دا ◊ **الهُقاعُ**: بێ ئاگاییو غافڵبونێكە توشی مرۆڤ دەبێ لەئاكامی خەفەتو نەخۆشییەوە ◊ **الهَقِعُ**: حەریصو سوور بوو لەسەر كارێك ◊ ئەسپی داخ كراو ◊ **الهَنْعَةُ**: كەوانەیەكە بەئەندازەی پاژنەپێی سوار ◊ خاڵێكی سپییە لەتەنیشتی چەپی ئەسپ ◊ سێ ئەستێرەن لێك نزیكن لەسەروی ئەستێرەی (الجَبّار)وەن كە مەنزڵێكە لەمەنزڵەكانی مانگ ◊ **الهُقَعَةُ**: كەسێك خوی بەوەگرتبێ لەناو خەڵك دا شان دابداو رابكشێ؟ ◊ **الهَيْقَعَةُ**: لاسایی كردنەوەی دەنگی شمشێر لەشەڕدا ◊ لەسەرشتێكی وشك بەشتێكی وشك بكێشی، وەكوو ئەوە شتێك بەئاسن بكێشێ بۆئەوەی زرینگەی لێ بێ ◊ لاسایی كردنەوەی دەنگی پێكێشانو لێدانی شتە بەگشتی.

**هَقِفَ هقفاً**: ئارەزوی خواردنی نەما ◊ **الهَقَفُ**: كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردنی خۆراك.

**هَقّ هَقّاً**: هەلات بەترساویو زەندەق چوویی ◊ **تَهَقّلَ**: بەهێواشیو لەسەرەخۆیی رۆیی ◊ **الهاقِلُ**: مشكە نێرە ◊ **الهَقِلُ**: برسی ◊ **الهِقْلُ**: درێژ، درێژ داوەڵ ◊ بێچوە نوعامە ◊ **الهِقْلِسُ**: بەدخو، ئادەمیزادی بەدخو ◊ رێوی.

**هَقِمَ هَقَماً**: زۆری برسی بوو، زۆری خوارد ◊ **تَهَقّمَ العَدُوّ**: دوژمنەكەی شكاند ◊ **تَهَقّمَ الطعامَ**: پاروی گەورە گەورەی یەك لەدوای یەكی قوت دان ◊ **الهَقِمُ**: زۆر خۆر ◊ دەریای فراوانو قوڵ ◊ **الهَيْقَمُ**: دەریای فراوانی قوڵ ◊ لاسایی كردنەوەی دەنگی شەپۆلو تێكەوە هاویشتنی دەریا ◊ دەنگی قوتدانی پارو ◊ **الهَيْقماني**: شتی درێژ، هەرشتێك بێ ◊ **هَقْهَقَ الرجلُ**: پیاوەكە خێرا رۆییو وڵاخەكەی ماندو كرد ◊ **الهَقْهَاقُ**: ئەوكەسەی لەنێشەكانی دا سەركەوتوو نەبێو تێ بشكێ.

**هَقَى فلان هَقياً**: فلانكەس ورێنەی كرد، زۆری گوت. ◊ **هقى فؤادُهُ**: دەرونی كوركاندی.

**هقى فلاناً**: بەجۆرێك باسی فلانی كرد پێی ناخۆش بێ ◊ قسەی ناشیرینی ئاڕاستەكرد، بۆی هەڵبەست ◊ **أهقى**: دایوەشاند، رزاندی، خراپی كرد.

**هَكَبَ فلاناً**: گاڵتەی بەفلان كرد ◊ **هَكّدَ**: تینی بۆقەرزدارەكەی هێنا.

**هَكِرَ هَكْراً وهَكَراً**: زۆر سەرسام بوو ◊ هەنوزی هاتنو خەو سواری شانی بوو لەپەلو پۆی خست، لەشی خاو بۆوە.

**هَكَرَ الرجلُ**: زۆری خەو هاتو لەتاو خەو هۆشی نەما ◊ **تَهَكّرَ**: سەرسامو مەدهۆش بوو.

**هَكَعَ هكوعاً**: ئارامی گرتو دامەزراو جێ نشین بوو.

**هَكَعَ البقر وغيره تحت الشجر**: رەشەوڵاخەكە لەبەر گەرمای زۆر چووە ژێر سێبەری درەختەكە.

دەکرێ‌و بەدەوری باخ‌و شوێنی تایبەتی دا رایەڵ دەکرێ ◊ کەپرو ساباتێکە بۆ سەروکی سوپا لەسەر بەرزاییەك دروست دەکرێ بۆئەوەی لەوێوە چاودێری سوپاکە بکا ◊ پرژو پاڵی دارخورما ◊ وشکەڵی دارو درەخت ◊ ئارەو گوڵی قوماش ◊ **الوَشیعَةُ**: مەکۆکی جوڵا ◊ دارێکە چەند جۆرێکی لەهەوداى تێوەدان لەسەر هەڵدەکرێ جوڵا بەپێی پێویست هەرجارەو یەکێ لەهەودارەنگ کراوەکان بەناو رایەڵەکەدا دەبا ◊ گلۆڵە لۆکەی رێسراو.

**وَشَغَ ببَولِه يَشِغُ وشغاً**: بەبەکجار میزەکەی هەڵدا ◊ **اوشَغَ ببوله**: بەمانا (وَشَغَ)دێ ◊ **اوشَغَ العَطِيَة**: بەخشندەکەی کەم کردەوە ◊ **اوشَغَ الصَّبِيَّ الدواءَ**: دەرمانەکەی کردە دەمی منداڵەکەوە ◊ **وَشَّغَ الثوبَ**: قوماشەکەی خوێناویی کرد هەتا هەمووی بەخوێنەکە خەتخەت‌و رێ رێ بوو ◊ **تَوَشَّغَ بالسوء**: پەڵەی رەوشت ناشیرینی پێ هەڵپەرین ◊ **الوَشْغُ**: کەم ◊ **الوَشُوغ**: ئەوبرە دەرمانەی دەکرێتە دەمی منداڵەوە ◊ **الوَشِيغ**: بەمانا (الوَشْغُ)دێ.

**وَشَقَ اللحمَ**: گۆشتەکەی توێ توێ کردو وشکی کردەوە.

**وَشَقَ فلاناً**: زەبری لەفلانکەس دا ◊ بریندارى کردو روشاندی گەستی.

**وَشَقَ المفتاح في القفل يَوْشَقُ**: کلیلەکە چووە ناو قفڵەکەوە ◊ **اوشَقَ الشَّيء**: شتەکە چووە ناو شتێکی ترەوە پێوەی نووسا ◊ **وَشَّقَ الشَّيء**: شتەکەی بریەوە ◊ جیای کردەوە ◊ **وَشَقَ اللحمَ**: بەمانا (وَشَقَ)دێ ◊ **إتَّشَقَ اللحمَ**: بەمانا (وَشَقَه)دێ ◊ **إتَّشَقَ القوم فلاناً باسيافهم**: خەڵکەکە فلانکەسیان بەشمشێرەکانیان کوتکوت کرد ◊ **تواشَقَ القومُ فلاناً**: خەڵکەکە فلانکەسیان پارچە پارچە کرد ◊ **المواشيق**: ددانی کلیل ◊ **الواشِق**: کەمێك لەشیرو ماست ◊ **الوُشَّقُ الأُشَّقُ**: صمغێکی پزیشکی لە جۆرەها رووەك دەردەهێندرێ، لەولاتی میصر پێی دەگوترێ: (علك الكَلَخ) ئەو رووەکەی ئەم جۆرە صمغەی لێ دەردێ لەئێران‌و تورکستان‌و باشوری سیبریا دەروێ ◊ ئەم رووەکە بەتەمەنەوە دوو مەترو سێ مەتر بەرز دەبێتەوە ناوەکەی گلۆرە رەگەکانی ئەستورن‌و بەزەوی دا دەرۆنە خوار ◊ **الوَشَقُ**: لەوەری پەڵەپەڵە ◊ **الوَشَقُ**: گیانلەبەرێکە لەپێری پشیلە، گوانی هەن لە پشیلە گەورەترو لەپڵنگ بچوکترە، سەری گەورەیە ◊ لەهەرپەنا گوێچکەیەکی کۆمەڵە مویەك هەیە، کلکی کورتە لەناو دارەستان دا دەژی هەروا لەدەشت‌و ساراش دا دەژی ◊ **الوَشيقُ**: دەگوترێ: (سر وشيق): رۆیشتنی سوك‌و خێرا ◊ **الوَشيقَة**: گۆشتی کوتکوتکراوی وشکەوەبوو ◊ یان گۆشتێك لەناوو خوێ دا بکوڵێندرێ‌و دوایی وردبکرێ‌و بکرێتە قاورمەو هەڵبگیرێ بۆسەفەرو شتی وا ◊ **وَشُكَ يَوْشُكُ وشكاً**: پەلە بوو، نزیك بوو ◊ جاری وایش دەبێ وەکوو (فیعلی موقارەبە) بەکاردەهێندرێ ◊ **واشَكَ مواشكةً**: خێرا رۆیی ◊ **وَشَّكَ**: بەپەلە بوو ◊ **الوِشَاكُ**: خێرایی ◊ **الوُشكانُ**: پەلەو خێرا ◊ **الوَشيك**: بەخێرایی، بەپەلە ◊ دەگوترێ: (خرج وشيكاً): خێرا رۆیشتە دەرەوە.

**وَشَلَ الماءُ يشِلُ وشلاً**: ئاوەکە رەوان بوو (جاری بوو) ئاوەکە کەم بوو بوو بەدڵۆپ دڵۆپ.

**وَشَلَ فلان وَشولاً:** لاواز بوو دەوڵەمەندی نەما ◊ هەژار کەوتو ئاتاج بوو.

**وَشَلَ اليه:** هانای بۆ بردو لێی پاڕایەوە ◊ **اَوْشَلَ حَظَّهُ:** بەشو باری فلانکەسی کەم کردەوە ◊ **اَوشَلَ الفَصيل:** گوێ گوانی حوشترەکەی خستە دەمی بێچوەکەوە بۆئەوەی فێری شیر خواردن بێ واتە مێژاندی ◊ **اَوشَلَ الماءَ:** ئاوەکەی بینی ڕەوان بوو، جاری بوو ◊ **اَوشَلَ البِئرَ:** بیرەکەی بینی ئاوی لەبەر دەڕۆیی ◊ **الأوشال:** ئاو کە بەئەملاو ئەولای کێودا بێتەخوارو لەخوارەوە بەنداوی بۆبکرێ ئەمجار بەگوێرەی پێویست زەویو زاری پێ ئاو بدرێ ◊ دەشگوترێ: (جاءوا اوشالاً): بەرێز یەك لەدوایەك هاتن ◊ هەروا دەشگوترێ: (هو من أوشال القوم): ئەو پیاوە لەتێکەڵەی خەڵکە، لەوکەسانەیە کە هۆزو خێڵێکی تایبەتییان نیە ◊ **الواشل:** دەگوترێ: (جبل واشل): کێوێکە هەمیشە ئاوی لێ دێتە خوار (فلان واشل الحظ): فلانکەس بێ بەختە ◊ (واشل الرأي): بیرو بۆچونی لاوازە ◊ **الوَشَلُ:** ئاوی کەم کەلە دڕکە شاخو بەرد دڵۆپ دڵۆپ دەکەوێتە خوار ◊ بەزۆری ئەم وشەیە ئاوە بۆئەو دڵۆپ دڵۆپ ئاوەی کەلە بەرزایی شاخاکانەوە تکە دەکا ◊ دەشگوترێ: (ما أصاب إلا وشلاً من الدنيا): شتێکی کەمی لەبەشو باری دونیا پێ بڕا ◊ ژیانێکی کولە مەرگی بەڕێ کرد ◊ هەروا وشەی (الوَشَل): ئاوە بۆ فرمێسکی کەم ◊ **الوَشِلَة من العيون:** چاوی کەم فرمێسك ◊ **الوَشُولُ من النوق:** حوشترێك شیری زۆربێ بەجۆرێك شیر لەگوانەکانی تکە بکا.

**وَشَمَ الجلد:** پێستەکەی بەدەرزی کوتا دەرزی هاژنی کردو دوایی مادەی (نێلەجی) پێدا بڵاو کردەوە ◊ **اَوْشَمَ فلانٌ يفعل كذا:** فلانکەس دەستی بەوکارە کرد ◊ **اَوشَمَ في الأمر:** لەکارەکە ورد بۆوە ◊ **اَوشَمَ في عرض فلان:** ڕەخنەی لەناموسی فلان گرتو جوێنی پێدا ◊ **اَوشَمَت الفتاةُ:** کچەکە بناغەی مەمکی دانا، مەمکی گردن ◊ مەمکی خڕ بوون ◊ **اَوشَمَ الإبلُ:** حوشترەکە توشی لەوەڕی تازە ڕسکاو بوو ◊ **اَوشَمت السماءُ:** ئاسمان بروسکەی دا ◊ چەخماخەی دا ◊ **اَوشَمَ البرقُ:** هەورەبروسکەکە بەئاستەم چەخماخەی دا ◊ **اَوشَمَت الأرضُ:** زەوی گیاو گژی دەرکەوت، گیاو گژەکەی سەری دەرهێنا ◊ **اَوشَمَ الكرم:** ترێیەکە ئاڵو بۆڵ بوو، خەریکە بەتەواوی پێ بگا ◊ نەرم بوو، تامی پەیدا کرد شیرین بوو ◊ **اَوشَمَ الشَيْبُ في الراس:** موی سپی بەناو سەری دا بڵاو بوونەوە، سەری ماشو برنج بوو ◊ **وَشَّمَ الغصنُ:** لقەدرەختەکە گەڵای کرد، گەڵای دەرکەوت ◊ **وَشَّمَ فلان جلدهُ:** فلانکەس پێستی خۆی کوتا سوژن هاژنی کرد ◊ **إتَّشَمَ فلان:** فلانکەس کوتانو دەرزی هاژنی لەپێستی خۆی دا ئەنجام دا ◊ **استَوْشَمَ:** داوای کرد پێستی سوژن هاژن بکەن جەستەی بەدەرزی بکوتن نیشانەو وێنەی تێدا دروست بکەن ◊ **الوَشْمُ:** بریتییە لەدەرزی هاژنکردنی بەشێك لەپێست بەزۆری لەباسكو قۆڵدا ئەو جۆرە کوتانە دەکرێ ◊ هەروا ئاوە بۆ جوانو گۆڕانی ڕەنگی پێست بەهۆی وێکەوتنی زەبر یان بەربوونەوە ◊ نیشانەو داخ ◊ بۆ گا کێوی و ئاسکە کێوی، وشەی (وشم) بۆ ئەوان بریتییە لەوخەتو بەڵەکیەی بەبەرسینگو قاچیانەوە

دەبیندرێ ◊ ئەو دیمەنە لەڕووەك دا دەبیندرێ لەسەرەتای ڕوان و دەرکەوتنی دا ◊ **الوَشْمَةُ:** دڵۆپە باران ◊ دەگوترێ: (ما أصابتنا وشمة): دڵۆپە بارانێکمان بۆنەباریوە ◊ (ما عصیتە وشْمَةً): بچوکترین تاوان و سەرپێچی ئەوم نەکردوە ◊ **الوَشْمَةُ:** شەڕو دوژمنایەتی ◊ **تَوَشَّنَ الماءُ:** ئاوەکە کەم بوو ◊ **الأوْشَنُ:** کەسێکە کاتی نان خواردن خۆدابمەزرێنێ بەبێ بانگ کردن ◊ بچێتە سەر سفرەی کەسێکی ترو خواردنەکە بخوا ◊ **الوَشْنان:** ئەسپۆن ◊ بڕوانە وشەی (الأشنان) ◊ **وَشْوَشَ الرجل والنعام والبعير وشوشةً:** خێرا ڕۆیی ◊ **وَشْوَشَ الرجلُ:** پیاوەکە بەئەسپایی قسەی کرد ◊ یان بزرکاندی و قسەی تێکەڵ و پێکەڵی کردن ◊ **وَشْوَشَ فلاناً:** بەئەسپایی قسەی لەگەڵ فلان کرد ◊ **وَشْوَشَ فلاناً الشيءَ:** بەکەمی شتەکەی دا بەفلان ◊ **تَوَشْوَشَ القوم:** خەلکەکە بەئەسپایی و سرتە سرت لەگەڵ یەك دا قسەیان کرد ◊ بەگوێی یەکتریان دا چپاند ◊ **الوَشْواشَةُ:** لێکچون ◊ **الوَشْوشُ:** بەمانا (الوَشْواشُ)دێ ◊ **الوَشْوشي:** دەگوترێ: (رجل وشوشي الذراع): پیاوێکی بەدەست و بردو دەست سوکە.

**وشى به الى السلطان يشي وشياً:** لای پاشا دزی دواو قسەی وای پاڵ دا سوڵتان ڕقی لێ هەڵگرێ.

**وشى بنو فلان:** بەرە بابی فلان زۆربوون ◊ **وشت الماشية:** ئاژەڵەکان زۆربون و بلاو بوونەوە.

**وشى فلان الثوبَ وشيا وشيةً:** فلانکەس قوماشەکەی نەخشاندو ڕازاندییەوە.

**وشى الكلامَ وفيه:** درۆی لەقسەکەدا کرد.

**وشى الكذبَ:** قسەکەی هەڵبەست و ڕازاندیەوە ◊ **اوشى الرجل:** پیاوەکە ماڵ و سامانی زۆر بوو ◊ مانای جوانی لەدەقە پەخشانەکە یان چامە شیعرەکە دایەوە ◊ **اوشى في الدراهم والجوالق:** لەکیسە ◊ پارەکان یان لەفەردەکان شتی دزی و لێی کەم کردنەوە ◊ **اوشى المعدنَ:** لەکانەکەدا شتێکی کەمی ئاڵتون دۆزییەوە ◊ **اوشى فلان الشَّيْئ:** فلانکەس شتەکەی زانی ◊ بەهێواشی شتەکەی هێنایە دەر ◊ **اوشى فَرَسَهُ:** دوا ئەندازەی هێزی ڕۆیشتنی ئەسپەکەی دەرخست، زانی تا چ ئەندازەیەك دەتوانێ بڕوا ◊ بەگۆچان و قەمچی یان بە ئاوزەنگی لەئەسپەکەی دا بۆئەوەی بزانێ تا چ ئەندازەیەك توانای ڕۆیشتنی هەیە ◊ **اوشى الدَّواءُ المريضَ:** دەرمانەکەی شیفای بەنەخۆشەکە بەخشی ◊ **تَوَشَّى فيه الشيبُ:** پیری تێدا دەرکەوت ◊ مووی سەرو ڕیشی ماش و برنج بوون ◊ **استوشى المعدنَ:** بەمانا (أوْشى)دێ ◊ **استوشى فلان فرسه:** بەمانا (أوشى فرسه)دێ ◊ **استوشى الشَّيْئ:** شتەکەی داواکردو خستیە جەم و جوڵ بۆئەوەی ببینێرێ ◊ **استوشى الحديثَ:** فەرمودەکەی بەلێکۆڵینەوەو پرسیار دەرهێنا ◊ **الشِّيَةُ:** نیشانەو ئارم ◊ پەڵەی ڕەش بەشتی سپییەوە ◊ یان پەڵەی سپی بەشتی ڕەشەوە ◊ هەر ڕەنگێك لەجەستەدا لەڕەنگەکەی تری جودا بێ لەهەموو گیانلەبەرێك دا ◊ **شِية الفرس:** ڕەنگی ئەسپ ◊ **المُوَشّى:** (ثور مُوَشَّى القوائم): کەڵەگای قاچ بەڵەك ◊ **الواشى:** منداڵ زۆر ◊ جوڵا ◊ سکە لێدەری ئاڵتون ◊ **الوَشاءُ:** ماڵ و سامانی زۆر ◊ **الوَشّاءُ:** صیغە موبالەغەیە ◊ فیتنەو درۆزن ◊ ئەو کەسەی قوماشی ئاوریشم

دەفرۆشێ ◊ **الوَشْيُ**: نەخش‌و نیگاری قوماش لەهەر ڕەنگێك بێ ◊ جۆرێكە لەقوماشی پەراوێز نەخشاوی ◊ جەوهەری شمشێر ◊ دەگوترێ: (حجرٌ به وشي): بەردی كانێكە زێڕی تێدایە.

**وَصَبَ الشَّيْئ يَصِبُ وصوباً**: بەردەوام بوو جێگیر بوو ◊ دەگوترێ: (وَصَبَ شحم الناقة ولبنها): شیری حوشترەكە بەردەوام بوو نەبڕایەوە.

**وَصَبَ على الأمر**: لەسەر كارەكە بەردەوام بوو.

**وَصَبَ على ماله**: باش چاودێری ماڵ‌و سامانی خۆی كرد.

**وَصِبَ يَوْصَبُ وَصَباً**: نەخۆش كەوت، هەستی بەئازار كرد ◊ **اوصَبَ الشَّيْئ**: شتەكە بەردەوام‌و جێگیر بوو ◊ دەگوترێ: (أوصَبَت الناقة): حوشترەكە شیری نەبڕاو گۆشت‌و بەزیشی كەمی نەكرد ◊ **اوْصَبَ فلان**: فلانكەس نەخۆش كەوت ◊ منداڵی نەخۆش‌و دەردەداری بوون ◊ **اوصَبَ القومُ**: نەخۆشی منداڵی خەڵكەكەی ماندوو شەكەت كردن ◊ **اوصَبَ على الشَّيْئ**: لەسەر شتەكە بەردەوام بوو ◊ **اوصَبَ فلاناً**: فلانكەسی نەخۆش خست ◊ **واصَبَ الشَّيْئ**: شتەكە بەردەوام‌و جێگیر بوو ◊ دەگوترێ: (واصبت الناقة): حوشترەكە شیری وشكی نەكردو گۆشت‌و بەزیشی كەم نەبوو ◊ **واصَبَ فلان على الأمر**: فلانكەس لەسەركارەكەی بەردەوام بوو ◊ **وَصَّبَ**: بەمانا (وَصِبَ)دێ ◊ **وَصَّبَ فلاناً**: فلانكەسی نەخۆش خست ◊ **تَوَصَّبَ**: بەمانا (وَصِبَ)دێ ◊ **المُوَصَّبُ**: كەسێك ئازاری جەستەی زۆربێ ◊ **الواصِبَةُ**: سارای دوورودرێژ ◊ **الوَصَبُ**: لەپەدەست ◊ **الوَصَبُ**: ئازارو نەخۆشی ◊ ماندویی شەكەتبوون.

**وَصَدَ الشَّيْئ يَصِدُ وَصْداً**: جێگیر بوو ◊ دەگوترێ: (وَصَدَ النسَّاجُ بعضَ الخيط في بعض): جۆلا لە تێومدانەكەی خستە ناو رایەڵەكەوە ◊ **اوْصَدَ**: بەچەو كۆزی بۆ ئاژەڵەكان دروست كرد ◊ **اوْصَدَ عليه**: تەنگی پێ هەڵچنی‌و ماندوی كرد ◊ **اوْصَدَ القِدْرَ**: سەرقاپی خستە سەرمەنجەڵەكە ◊ **اوْصَدَ البابَ**: دەرگاكەی داخست ◊ دەرگاكەی گرت ◊ **وَصَّدَهُ**: ترساندی هەڕەشەی لێ كرد ◊ **وَصَّدَ النساج بعض الخيط في بعض**: جۆلاكە تێومدانەكەی خستە ناو رایەڵەكەوە ◊ **اسَوْصَدَ**: بەچەو كۆزو ئاغەڵی بۆ ئاژەڵەكان دروست كرد ◊ **المُوَصَّدُ**: كەژاوە ◊ **الوَصَّادُ**: جولای ئازاو دەست ڕەنگین زۆرچن ◊ **الوَصِيد**: روەكێك كەرِمگەكانیان لێك نزیك بن ◊ گەومو بەچەو ئاغەڵ بۆ ئاژەڵ ◊ بەردەرگا، زاردەرگا ◊ بەربێڵای خانوو ◊ **الوَصِيدَةُ**: ئاغەڵ‌و گەوڕ بەبەردوشتی وا لەكێو بۆ ئاژەڵ دروست دەكرێ ◊ **الأوصَرُ**: تەپۆڵكە، بەرزایی ناو زەوی ◊ **الوِصْرُ**: بەمانا (الإصْر): دی واتە عەهدو پەیمان ◊ چەك‌و كومپیالە ◊ هەر نوسراوێكی دیكۆمێنتی دوبارەی قەرز ◊ **الوَصَرَة**: بەمانا (الأوصَرُ)دێ ◊ **الوصيرة**: كومپیالەو چەكی پارە یان نوسراوێكی دیكۆمێنتی.

**وَصَّ العملَ يَوُصُّهُ وصّاً**: كارەكەی بەباشی ئەنجام دا ◊ **وَصَّصَت المرأةُ**: ئافرەتەكە روبەندی خۆی والێ كرد تەنها چاوی بەدەرەوە بوون.

**وَصَعَ الحصا يَصَعَه وَصْعاً**: چەوو وردە بەردەكانی بەزەوی دا بردنە خوارو لەگەڵ دا

گومی کردن ◊ **الوَصْعُ**: جۆرە باڵندەیەکە لەپێری چۆلەکە، دەندوکی کورتە باڵەکانی کەوانەیین، کلکی کورتو خڕە شوێنی نیشتەجێ بوونی وڵاتی ئەوروپایە بەزستان ڕەوەکا بەرەو وڵاتی ئەردەنو میسر ◊ **الوَصَعُ**: بەمانا (الوَصْعُ)دێ ◊ **الوَصيعُ**: دەنگی چۆلەکە ◊ بێچوە چۆلەکە.

**وَصَفَ المهرُ والناقةُ ونحوهما يصف وَصفاً**: جوانوە ئەسپەکە یان حوشترەکە جوان ڕۆیشت، ڕەوتی جوانە.

**وَصَفَ الصَغيرُ المَشْيَ**: منداڵەکە پێی گرتن کەوتە سەر ڕۆیشتن.

**وَصَفَ الشَيْئَ وَصْفاً**: وەسفی شتەکەی کرد پەسنیو لایەنە باشەکانی باسکردن.

**وَصَفَ الطبيب الدواءَ**: پزیشکەکە دەرمانەکەی بەناوو نیشانو چۆنیەتی بەکارهێنان بۆ نەخۆشەکە دیاری کرد.

**وَصَفَ الخَبَرَ**: هەواڵەکەی گێڕایەوە.

**وَصَفَ الثوبُ الجسمَ**: پۆشاکەکە چۆنیەتی جەستەی خاوەنەکەی دەرخست بەهۆی تەنکی یان تەنگیو تەسکی چاك چۆنیەتی جەستەی پۆشەرەکەی دەرخست.

**وَصُفَ الغلامَ والفتاةُ وصافةً**: کوڕەکە یان کچەکە کاتی خزمەت پێکردنیان هاتو قەدو باڵایان تەواو بوو خۆیان دارشت ◊ **واصفته الشَيْئَ**: شتەکەم لەسەر وەصف پێ فرۆشت، واتە شتەکەم لەبەردەستانەبوو بەوەصفو نیشانە پێم فرۆشت ◊ **إتَّصَفَ الشَيْئ**: بۆ موطاوعەی (وَصَفَه)دێ ◊ وەصف کرا ◊ بەباشی ناویان هێناو بەپەسندیان کرد ◊ **تواصَفُوا الشَيْئ**: هەندێکیان شتەکەیان بۆ هەندێکیان وەصف کرد ◊ **تَوَصَّفَ فلان وصيفاً**: فلانکەس یەکێکی ڕاگرت بۆ خزمەتکردن ◊ **استوصَفَ فلانٌ الطبيبَ لدائه**: فلانکەس داوای لەپزیشکەکە کرد دەرمانی دەردەکەی پێ بڵێ ◊ **استوصَفَ فلاناً الشَيْئ**: داوای لەفلان کرد شتەکەی بۆ وەصف بکا ◊ **الصفة**: ئەو حاڵەتەی بەشتەکەوەیە، شتەکەی پێ جیادەگرێتەوە لەشتی تر وەکوو ڕەشیو سووریو سپییەتیو کورتیو درێژی ◊ زانیاریو نەزانی ◊ لەلای زانایانی نەحو صفە شوێنکەوتەی ئیسمی پێشوویەتیو حوکمو ئیعرابی ئەوی دەدرێتێ ◊ **المُستَوْصَفُ**: خەستەخانەی بچوك کەخەندێ خزمەتی پزیشکی تێدا پێشکەش دەکرێ ◊ **المواصفة**: صیفەتو چۆنیەتی ئەوشتەی دەتەوێ بیکڕی ◊ یان دروستی بکەی.

**بيع المواصفة**: بریتییە لەوەی شتێك بفرۆشی شتەکە لەبەر دەستا نەبێ، جۆرو شێوەی بۆ کڕیار باس بکەی، دوایی بەو وەصفە دەستی بخەییو بیدەیتێ ◊ **الوَصّاف**: صیغە موبالەغەیە ◊ زاناو لێزان لەوەصف کردن دا ◊ **الوَصيف**: خزمەتکارو کارەکەر ◊ کوڕێك نەگەیشتبێتە تەمەنی باڵغ بوون ◊ **الوَصيفة**: کارەکەر ◊ کچێك نەگەیشتبێتە تەمەنی باڵغ بوون.

**وَصَلَ فلان يَصِلُ وَصْلاً**: بانگەشەی سەردەمی نەزانی هەڵداو دەمارگیریو تایەفەگەری پەیڕەو کرد.

**وَصَلَ الشَيْئ بالشيئ وَصْلاً وصِلَةً**: شتەکەی بەشتەکەی ترەوە لکاند، دەگوترێ: (وصلت المرأة شعرها بشعر غيرها): ئافرەتەکە قژی لکاندن بەقژی ترەوە قژی خۆی درێژکردن بەهۆی پێوەلکاندنی قژی تربە قژەکانی خۆی.

**وَصَلَ فلاناً وَصْلاً:** پەیوەندی بەردەوام بوو لەگەڵ فـلان دا ◊ صـیلەی رەحمـی نەپـچڕاند ◊ دەشگوترێ: (وصَلَ حَبْلَهُ بفلان): دڵی بەفلان دا چووەو خۆشی دەوێ ◊ چاکەی لەگەڵ کرد ◊ ماڵی پێ بەخشی.

**وَصَـلَ رحمَـهُ:** چاکەی لەگەڵ خـزمو کـەسو کارەکـەی دا کـرد ◊ هاموشۆی کـردن، یارمـەتی دان، چاودێری کردن پێیانەوە خەریك بوو.

**وَصَلَ المکان وصولاً:** گەییشتە شوێنەکە.

**وَصَـلَ الی بـني فـلان:** خـۆی پاڵدایـە لای فـلان بەرەباب‌و تایەفە خۆی بەیەکێ لەوان حسێب کرد ◊ **أوْصَلَهُ الشَّيءَ والیه:** شتەکەی گەیانـدە ئەوی، یان شتەکەی پێ گەیاند ◊ دەشگوترێ: (ضَرَبَه ضربةً لاتوصل): زەبرێـکی وای لـێ داوە چـارە سـەرناکرێ دەرمـان نـاکرێ ◊ **واصـلە مواصـلةً ووصـالاً:** بەردەوام بوو لـە دیـدەنی کردنـی‌و نەپـچڕانی پەیوەنـدی ◊ پێـچەوانەی مانای (هَجَـرَهُ)دێ ◊ بەزۆری بۆمانـای دڵداری‌و خۆشەویـستی ئـەو بـوارە بـەکاردێ ◊ **واصَـلَ الصیامَ:** چەند رۆژێـك لەسەریەك بەرۆژو بوو ◊ **وَصَّلَ الشَّيءَ بالشَّيءِ:** شتەکەی بەشتەکەوە لکانـد ◊ یـان زۆری دیـدەنی کـردو پەیوەندییەکـەی لەگەڵ دا چڕو پڕ کـردەوە ◊ لەخۆی گـرت، خستیە گەڵی ◊ شتەکانی لێـك دان، پێـکیەوە بەسـتن ◊ **وَصَّـلَ الـشَّيءَ الیـه:** شتەکەی گەیانە ئەو ◊ **إتَّصَلَ فلان:** فلانکەس بانگەشەی سەردەمی نەزانی کرد دەمارگیری‌و تایەفەگەری‌و داب‌و نـەریتی خێڵـەکی پـەیڕەو کـرد ◊ **اتَّصَلَ الی بـني فلان:** خۆی پـاڵ فلان بەرەباب‌و تایەفەدا ◊ **إتَّصَلَ الـشَّيءُ بالـشَّيءِ:** شتەکە بەشتەکەی تـرەوە لکا ◊ پێوەی نوسا ◊

**تواصَـلا:** پێـکەوەبوون لێـك دانـەبڕان ◊ پەیوەنـدییان بەیەکـەوە بـەردەوام بـوو پێچەوانەی (تصارما)یە کەبەمانا لێك دابڕانە ◊ **تَوَصَّلَ الیـه:** گەیشتە لای، پێی گەیشت ◊ وردە وردە لەگەڵی دا رۆیی تـا گەیـشتە مەبەسـت ◊ هەوڵی داو واسیتەی کردو خۆی نزیك کردەوە تاپێی گەیی ◊ دەگوترێ: (تَوَصَّلَ الیـه بُوصـلة أو سبب): بەهۆی واسیتەو هۆکاری جۆراو جۆرەوە پێی گەییشت ◊ **استوصلت المرأةُ:** ئافرەتەکە داوای کـرد قـژی تـر بخرێنـە سـەر قـژەکانی بۆئـەوەی قـژەکانی درێـژبن، جـوان بنـوێنن ◊ **الـصِّلَةُ:** عـەطـاو بەخـشش ◊ خـەلات ◊ ئـەو پیتەی دوای (الروی) دێ لە سەرەوای شیعردا ◊ **الـصُّلة:** تێـشوو ◊ **الإیـصال:** نوسراوێـکە وەرگرتنی ماڵێك یان قەرزێکی تێدا ئاماژەپێ دەکرێ ◊ **المستَوْصِلة:** ئـەو ئافرەتـەی دەبێتـە دەلاڵ‌و رێ نیـشاندەر بـۆ قژپێـکەوە لکانـدن‌و بارۆکە کـردن‌و ئـەو جۆرە شتانە ◊ **المَوَصَّلُ:** دەگوترێ: (خَـیْط موصَّـلٌ): حـەبل‌و هەودایەکە لـەزۆر شـوێنەوە سـەریەك خراوەتـەوە ◊ **المُوَصِّلُ المعـزول:** پلاکی کارەبـاو شـتی وا ◊ **الموَصِّلات:** ئـەو قـەبارەو شـتانەی کارەبایـان پێدا نەقڵ دەکرێ ◊ **الموصِلُ:** شوێنی گەیـشتن ◊ شـوێنی بەیـەك گەیـشتنی دوشـت‌و پێـکەوە لـەحیم کردنیـان ◊ جومگـە ◊ نێـوان کلۆت‌و رانـی حوشـتر ◊ شـوێنی گرێـی حـەبل، ئـەو شوێنەی دوو حەبلەکە دەخرێنەوە سەریەك ◊ **المَوْصُـولُ:** حەیوانێـکە ولاخ‌و ئاژەڵێـکە دایکەکەی لەیەك نێرێ کەڵی گرتبێ‌و فەحلی تر سواری دایکی نەبووبن ◊ **الواصِلَة:** ئـافرەتی داوێـن پـیس ◊ **الوَصْلُ:** عـەطـاو بەخـشش ◊ دەگـوترێ: (أعطـاه وَصْـلاً مـن ذهـب): برێـکی

ئالتون پێ بەخشی ◊ هاوشانو هاوکوف ◊ دەگوترێ: (هذا وصل هذا): ئەمە هاوشانی ئەمەیە ◊ جومژگەو شوێنی بەیەکەوە لکانی دوونێسکو زیاتر ◊ (حرف الوَصْل): ئەو پیتەیە لەدوای (الرّوی)دێ لەسەرواى شیعردا ◊ **ليلة الوصل**: شەوی کۆتایی مانگە ◊ **الوُصْلُ**: جومژگە، یان شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو ئێسقان یان زیاتر ◊ **الوَصْلَةُ**: (لەبواری زانیاری کیمیادا) ڕەمزی ئەو هێزمیە کە دوگەردیلە بەیەك دەگەیەنێ ◊ **الوُصْلَةُ**: گەیاندنو پەیوەندی ◊ دەگوترێ: (بينهما وُصْلَةٌ): لەنێوانیان دا پەیوەندی هەیە ◊ هەرشتێك بەشتێکی ترەوە بلکێ ◊ هاوڕێو هاوەڵ، تێشو ◊ زەوی دوور ◊ **الوَصِيلُ**: کەسێك هەمیشە لەگەڵ یەکێکی تربێو لێی جیانەبێتەوە ◊ **الوَصِيلَةُ**: شتێك بەشتێکی ترەوە بلکێندرێ ◊ هاوڕێ ◊ زەوی پانو پۆڕ ◊ لەسەردەمی نەزانی دا وشەی الوصیله ناو بووە بۆ حوشترێك دە سك بکا بێ بسانەوە ◊ یان مەڕێك حەوت سك بکا حەوتەم جاری نێرو مێیەکی ببێ، لەبەر ڕێزی کاوڕە مێیەکە نێرەکەشیان سەرنەدەبڕی ◊ شیری دایکەکەش هەردەبوایە پیاو بیانخواردایەوە لەئافرەت یاساغ بوو ◊ ئەم جۆرە حوشترو مەڕە ڕێزێکی تایبەتی هەبوو بەئارەزۆی خۆی لەکوێ دەلەوەڕا کەس بۆی نەبوو ڕێگرێ بکا، دەق وەکوو ئاژەڵی (سائیبە) هەڵسو کەوتی لەگەڵ دەکرا ◊ **وَصَمَهُ يَصِمُهُ صِمَةً ووَصْماً**: بەگورجی رایکێشا ◊ ڕەخنەی لێ گرت.

**وَصَمَ العود**: دارەکەی شکاندەوەو بەبێ ئەوەی لێکی جیابکاتەوە ◊ **وَصَّمَهُ**: تەمبەڵو فونگرانی کرد، هەڵی نەنا بۆ کردنی کارەکە ◊ ئەزیەتی دا، دەگوترێ: (وَصَّمَتْه الحُمى): لەرزو تا ئازاری دا ◊ **تَوَصَّمَ**: بۆ موطاوعەی (وَصَمَهُ)دێ ◊ **الوَصْمُ**: عەیبو لەکە ◊ گرێی دار ◊ درز ◊ **الوَصْمَةُ**: کەلەبەرو پیتکەو ڕوشاوی لەجەستەدا ◊ عەیبو لەکە ◊ سوێندی بەدرۆو تاوان ◊ **وَصْوَصَ**: لەکونو درزەکەوە ڕوانی ◊ **وَصْوَصَت المرأةُ**: ئافرەتەکە روبەندی خۆی وێکهێنایەوە هەرکونی چاوی بەدەرەوەن ◊ **وَصْوَصَ الجروُ**: بێچوە سەگەکە، بێچوەگورگەکە چاوی تروکاندن ◊ **وَصْوَصَ فلان**: فلانکەس چاوی خۆی بچوك کردنەوە بۆئەوەی چاك شتەکە ببینێو بەباشی ڕوانینەکەی ئاڕاستە بکا ◊ **الوَصْوَصُ**: کونێکە لەپەردەو دەرگاو شتی وا بەئەندازەی چاولێیەوە دەڕواندرێ.

**وصى فلان يصى وصياً**: دوای بەرزیو شکۆمەندی ڕەزیل بوو ◊ دوای کێش سوکی کێشی قورس بوو.

**وَصَى الشَّئ**: شتەکە گەیشت دەرکەوت ◊ دەگوترێ: (وَصَى النبتُ): گژوگیاکە پێگەیی و زۆر بوو ◊ **وَصَت الأرضُ وَصْياً ووُصياً**: زەوی گیاوو گژەکەی تێك ڕژاو زۆر بوو.

**وَصَى الشَّئُ بالشَّئ**: شتەکە بەشتەکەوە لکا پێوەی نووسا ◊ **أوصى**: چووە ناو گیاوگژی زۆرەوە ◊ **أوصَى فلاناً واليه**: فلانکەسی کردە سەر وەصیەت ماڵو منداڵی دوای مردنی داوای لێ کرد سەرپەرشتیاریان بێ ◊ پەیمانی دایەو بەڵێنی پێدا ◊ **أوصى له بشيئ**: شتەکەی کردە ماڵی ئەوو وتی بۆئەو بێ ◊ **أوصى فلاناً بالشيئ**: فەرمانی بەفلانکەس کرد بەئەنجامدانی شتەکەو لەسەری پێویست کرد ◊

**وَصَّى اليه ولـه بشيئ**: شتـەكـەی كـردە هـی ئـەوو بڕیاری بۆدا ◊ **وَصَّى فلاناً**: دوای مردنـی فلاّنكەسی كردە وەصیو سەر پەرشتیاری ماڵو منـداڵی ◊ **وَصَّـى بالـشيئ فلانـاً**: فـەرمانی بەفلاّنكەس كرد بەئەنجامدانی شتەكەو خستیە ئەسـتۆی ئـەو ◊ **تواصَـى القـومُ**: خەڵكەكـە هەندێـكیان وەسێتیان بـۆ هەندێـكیان كـرد ◊ **تواصَى النبتُ**: گیاو گژەو كـە پاڵی لێـك دا ◊ **استوصى بـه**: وەصییەتەكەی بەوشـتە قبـوڵ كـرد ◊ دەگـوترێ: (استوصـى بـه خـيراً): خێـرو بێری بۆئەو وێستو بۆی ئەنجام دا ◊ **الواصية**: دەگـوترێ: (فـلاة واصـية): دەشـتو سارایەكە بەدەشتو سارای ترتێـكەڵاو دەبـێ ◊ **الوَصَاةُ**: بـەمانا (الوَصـية)ێ ◊ سەرپەرشـتیاری كردنـی منـداڵ ◊ **الوَصي**: ئەوكەسـەی وەسـییەتی بـۆ دەكـرێو دەكـرێ بەسەرپەرشـتیار ئەوكەسـەی سـەرو كـاری منـداڵو مـاڵو سامانەكەی دەكـا ◊ **وَضُـأَه يَـضؤه وضـئاً ووضـاءةً**: لەڕوخـسار جوانیو پـاكو خـاوێنی دا بەسـەریا باڵادەسـت بوو.

**وَضُـؤَ يَوْضُـؤُ وُضـاءَةً**: جوان بـوو ڕێـكو پێـكو پـاكو خـاوێن بـوو ◊ (فهـو وَضِـيٌ) ◊ **وَضَّـأَهُ**: شـانازی بەسـەردا كـرد ◊ **وَضَّـأهُ**: وای لـێ كـرد دەسـتنوێژ بگـرێ ◊ **تَوَضَّـا للعبـادة**: هەنـدێ ئەندامی جەستەی شتو هەندێكی مەسح كرد ◊ یـان بـەنیازو مەبەسـتی نوێـژكردن ئـاوی گەیانـدە هەنـدێ ئەنـدامی جەسـتەی ◊ **تَوَضَّـا الغـلام والجاريـة**: كـوڕو كـچەكە گەیـشتنە تەمـــەنی بـــاڵغی ◊ **المتَوَضَّـــأُ**: شـــوێنی دەستنوێژشـــتن ◊ **الميـضَأَةُ**: قاپێـــك یـــان مەسـینەو گڵێنـە ئـاوی دەسـتنوێژی تێـدابێ ◊ شـوێنی دەسـتنوێژ هـەڵگرتن ◊ **الوَضُـوءُ**: دەسـتنوێژ ◊ ئـاوی دەسـتنوێژ پـێ هـەڵگرتن ◊ **الوُضـاءُ**: دەمو چـاو نـورانی ◊ **الوُضُـوءُ**: دەسـتنوێژ هـەڵگرتن ◊ شـتنو مەسـح كردنـی هەنـدێ ئەنـدامی جەسـتە ◊ گەیانـدنی ئـاو بـۆ هەندێ ئەندامی جەستە لەگەڵ نیەت دا.

**وَضَـحَ الأمـرُ يـضح ضِـحَةً ووضـوحاً**: كارەكـە ئاشـكرا بـوو ڕون بـۆوە ◊ دەگـوترێ: (وضـح الـصُبْحُ): بـەیانی ئاشكرابوو ئاسۆ ڕون بـۆوە ◊ (وَضَـحَ الراكـب): سـوارەكە دەركـەوت ◊ دەشـگوترێ: (مـن أيـن وَضَـحَ الراكـب؟): لەكوێوەوە سوارەكە دەركەوت.

**وَضُحَ الوَجْهُ**: ڕوخساری جوان بوو ◊ (فهو واضِـح) ◊ **اوضَحَ الرجل والمرأةُ**: پیـاوو ئافرەتەكـە منـداڵی سپی پێـستیان بـوون ◊ **اوضَحَ الأمْرُ**: كارەكـە ئاشـكرا بـوو، دەركـەوت ◊ **تَوَضَّحَ الطريق**: ڕێـگاكە ڕون بۆوە ◊ **تَوَضَّحَ عنه**: لێی كۆڵیـەوە ◊ **استوضَحَ الشَيئ وعنـه**: دەسـتی خـستە پـشت چـاوی لەبـەر تیـشكی خـۆر بۆئەوەی بزانێ ئـاخۆ شـتەكە دەبینـێ یـان نـا ◊ **استوضح فلانا الأمر**: داوای لەفلاّنكەس كرد شتەكەی بۆ ڕون بكاتەوە ◊ **الأواضح**: ڕۆژانێـك شـەوەكانیان ڕونـاكن شـەوی سیانزەو چواردەو پانزەی مانگی قەمەری ◊ **الأوضاح من الناس**: كۆمەڵگایەك پێك هاتبێ لەچەند هۆزو خێڵی جیاجیـا ◊ **المتَوَضِّـحُ**: كەسێـك سـواری ڕێگایەكی ڕاسـتو ئاشكرا ببـێ ◊ بەناوەڕاسـتی ڕێـگادا بـڕواو نەكەوێتـە پـەنا پەسـێوو كەندولەند ◊ حوشتری سپی زۆر سپی نـەبێ ◊ **المُوضِحَةُ**: برینێـك ئێسقانی دەربكەوێ ◊ واتە گۆشـتی سـەر ئێسقانەكەی دڕیبـێ ◊ **الواضِح**: پێچەوانەی (الخَامِلُ)ێ ◊ واتە: ئاشكراو ڕون ◊ دەگـوترێ: (رجـل واضـح الحـسب): پیاوێـكە

بنەچەو نەژادی ئاشکراو رونە ◊ حوشتری سپی بەڵام زۆر سپی نەبێ ◊ **الواضِحة:** برینێك گۆشتی هەموو برابێ‌و ئێسقانی دەکەوتبێ ◊ دیمەنی ددان لەکاتی پێکەنین دا ◊ شەوێك لەشەوەکانی (ليالي البيض): کەشەوی سیانزەو چواردەو پانزەی مانگی قەمەرین ◊ **الوَضَحُ:** روناکی، تیشك ◊ سپیایی ئاسۆ لەخۆرهەڵات کاتی بەیانی ◊ مانگ ◊ سپیایی هەمووشتێك ◊ رێگای ئاشکراو ناوەراستی رێگا ◊ دیرهەمی زیوی ساخ ◊ خشڵی زیوی ساخ ◊ پاوانەو خرخاڵ ◊ بازنەو دەستەوانە کەلەقاچ بکرێ ◊ خاڵی سپی بەناو چەوانی وڵاخەوە ◊ شیر ◊ موی سپی سەرو ریش کە نیشانەی پیرییە ◊ بەڵەکی ◊ **الوَضّاحُ:** صیغە موبالەغەیە لەمانای (وَضَحَ)دا ◊ سپی زۆر جوان ◊ روخساری جوان‌و دەم بەپێکەنین ◊ رۆژ ◊ دەگوترێ: (رجل وضّاح الحسب): پیاوێکە بنەچەو نەژادی زۆر رون‌و ئاشکرایە ◊ (عظم وضّاح): یارییەکی منداڵە عەرەبە، لەشەوی تاریك دا ئێسقانێکی سپی فرێ دەدەن ئەمجار دەست دەکەن بە گەڕان‌و پشکنین بۆ دۆزینەوەی هەرکەسێ بیدۆزێتەوە ئەوە براوەیە ◊ **الوَضيحة:** تارماییەکی سپی دێتە پێش چاوی مرۆڤ ◊ ئاژەڵ (مەڕو بزن‌و گاو حوشتر).

**وَضَخَ في السقاء يَضَخُ وضخاً:** شتێکی کەمی لەکوندە ئاوەکەدا هێشتەوە.

**وَضَخَ الدَّلوَ:** دۆڵچەکەی نیوەکرد ◊ **أوْضَخَت البئر:** بیرەکە ئاوەکەی کەم بۆوە ◊ **أوضَخَ فلان في السقاء:** فلانکەس شتێکی کەمی لە کوندەکەدا هێشتەوە ◊ **أوضَخَ بالدَّلو:** بەخێرایی دۆڵچەکەی لەناو بیرەکە هەڵکێشایەوەو پری نەکرد کەمی ئاو تێ چوو بوو ◊ **أوضَخَ للرجل:** کەمی ئاو لەبیرەکە بۆ پیاوەکە دەرهێنا ◊ **أوضَخَ الدلوَ:** بەمانا (وَضَخَ)دێ ◊ **واضَخَهُ مواضخة:** پێشبڕکێی لەگەڵ دا کرد لەئاو هەڵێنجان دا ◊ پێشبڕکێی لەگەڵ دا کرد لەبازدان دا ◊ وەکوو رۆیشتنی ئەو رۆیشت ◊ **تواضَخا:** پێشبڕکێیان کرد ◊ **تواضَخَ فلان فلاناً:** فلانکەس وەکوو رۆیشتنی فلان رۆیشت.

**وَضِرَ يَوْضَرُ وَضَراً:** چڵکن بوو.

**وَضِرَ الإناءُ:** قاپەکە، مەنجەڵەکە چەور بوو ◊ **وَضَّرَهُ:** چەوری کرد، چڵکنی کرد ◊ **الوَضَرُ:** چڵك ◊ چەوری ◊ پیس‌و پۆخەڵی بەهۆی چەورییەوە خشت‌و خۆڵی بنکی کوندەو گۆزەی ئاو ◊ بۆگەنی خۆراکی ئێکسپایەرو گەنیوو ترشاوو بەسەر چوو ◊ شوێن ئاسەواری خۆراك بەسەر روی سینی‌و قاپ‌و شتی واوە ◊ ئەو رەنگەی بەسەر زەعفەران‌و شتی واوە دەبیندرێ ◊ پاشماوەو ئاسەواری مۆرانەو زەنگ‌و پیسایی ◊ پاشماوەو ئەثەری قەتران ◊ دەگوترێ: (فلان ذو أوضار): فلانکەس چڵکن‌و پیس‌و پۆخەڵە.

**وَضَعَ يَضَعُ وضعاً وموضوعاً:** پەلەی کرد لەرۆیشتن دا ◊ دەشگوترێ: (وَضَعَ السراب على الآكام): تراویلکە لەسەر گردۆلکەو شتی وا دەرەوشایەوە ◊ **وَضَعَت المرأة وَضْعاً وتُضْعاً:** ئافرەتەکە لەکۆتایی ماوەی پاکی دا، سکی پربوو نەکەوتە عادەی مانگانەیەوە ◊ **وَضَعَت الإبلُ وضيعة:** حوشترەکە گیا ترشۆکەی گوێ چەم‌و ئاوی خواردو ئەو لەوەڕی رێگایەی جێ نەهێشت ◊ **واضَعَ فلان من فلان وعنه وضعاً وموضعاً:** فلانکەس لەرێزی فلانی کەم کردەوەو پلەی کۆمەڵایەتی هێنایە خوار ◊

دەشگوترێ: (وضعه الشُحُ ودناءة النسب) ٥ وَضَعَ عَنْ غريمه: لەقەرزەکەی بۆ قەرزدارەکەی داشکاند ٥ وَضَعَ فلاناً: فلانکەس ژێردەستەو زەلیل کرد ٥ دەگوترێ: (وضَعَ الله المتكبرين ووضع فلان نفسَه): فلانکەس نەفسی خۆی زەلیل کرد.

وَضَعَ الشَّيْئَ: شتەکەی دانا لەدەستی خۆی کردەوە ٥ دەگوترێ: (رفع السلاحَ ثم وضعَه) ٥ وَضَعَت المرأةُ خمارها: ئافرەتەکە سەرپۆش و ڕووبەندی لەسەرخۆی داماڵی و فڕێی دا.

وَضَعَ الشَّيْئَ الى الأرض: شتەکەی دابەزاندە سەرزەوی.

وَضَعَ الشَّيْئَ في المكان: شتەکەی لەشوێنەکە دامەزراند ٥ دەشگوترێ: (وَضَعَ يده في الطعام): دەستی کرد بەنانخواردن.

وَضَعَ فلان فلاناً في ماله وضيعة: فلانکەس لەماڵی خۆی بۆ فلانکەس ئەندازەیەکی بۆ دابەزاند.

وَضَعَ فلاناً: فلانکەسی کردە پیاوێکی نزم و بێ نرخ.

وَضَعَ عُنُقَه: لەملی فلانی دا.

وَضَعَ عنه الأمرَ: کارەکەی لەمل و ئەو داماڵی لەکۆڵی کردەوە ٥ دەگوترێ: (وَضَعَ عنه الدين والجزية): قەرزەکەی لەمل داماڵی ٥ (وَضَعَ عنه الجناية): تاوانەکەی لەئەستۆی ئەو لابرد.

وَضَعَ الشَّيْئَ وضعاً: وازی لەشتەکە هێنا.

وَضَعَ الرجلُ الحديثَ: پیاوەکە قسەکەی هەڵبەست ٥ درۆی ڕێك خست ٥ وَضَعَت الحاملُ ولدها وضعاً: ژنە سکپڕەکە منداڵەکەی بوو سکەکەی دانا.

وَضَعَ العلم: شارەزای یاساو بنەمای زانیارییەکە بوو.

وَضُعَ الرجلُ في تجارته وضَعاً: پیاوەکە لەبازرگانیکردنەکەدا زەرەری کرد.

وَضُعَ الرجلُ: پیاوەکە بێ ڕێز بوو هەتیو مچەو خوێڕی دەرچوو.

وُضِعَ الرجلُ في تجارته: پیاوەکە لەبازرگانی کردنەکەی دا زەرەری کرد ٥ زۆربەی کات ئەم چمکە بە شێوەی ئیسمی مفعول ئەدا دەکرێ ٥ اوضَعَ في الشَّر: پەلەی کرد لەشەڕکردنەکەدا ٥ اوضَعَ الراكبُ الدابَّةَ: سوارەکە ولاخەکەی هەلینگ دا بۆ خێرا ڕۆیشتن ٥ اوضَعَ فلان فلاناً في الأمر: فلانکەس موافەقەی بۆ فلان کرد لەکارەکەدا ٥ اوضِعَ الرجلُ في تجارته: پیاوەکە لەبازرگانی کردنەکەی دا تێشکا ٥ واضَعَ الرجل مواضَعَةً ووضاعاً: پیاوەکە لەهەڵگرتنی دەستەبارەکەدا ٥ تەرازو ئاسا هەڵی نەگرت، بەسەر لای هاوەڵەکەی دا شکاندیەوە ٥ واضَعَ فلاناً: گرەوی لەگەڵ فلان کرد ٥ لەکارەکەدا هاوڕای فلان بوو موافیقی بوو ٥ موناظەرەو چەلەحانێی لەگەڵ فلان دا کرد ٥ واضَعَ فلاناً الرايَ: لەگەڵ فلان دا هەریەکەیان ئەوی تری بەسەر ڕاو بۆچونی خۆی دا ئاگادار کرد ٥ وَضَّعَ فلاناً: فلانکەسی خوێڕی کرد ٥ بێ ڕێزی کرد ٥ وَضَّعَ الباني الحجَر: وەستاکە بەردەکەی خستە چینی دیوارەکەوەو داینا ٥ بەردەکانی چین چین خستنە سەریەك و ڕیزبەندی کردن ٥ وَضَّعَ الجُبَّةَ: دوای ئەوەی لۆکەی خستە ناو جبەکەوە ئەمجار دوری ٥ وَضَّعَت النعامةُ بَيْضَها: نوعامەکە هێلکەکانی خستنە سەریەك ٥ اتَّضَعَ فلان: فلانکەس بوو

بە خوێری‌و هەتیو مچە ◊ **اتَّضَعَ البعيرُ:** حوشترەکە سەری خۆی نەوی کرد بۆنەوەی خاوەنەکەی پێ بخاتە سەر ملی‌و سواری بێ ◊ **تواضَعَ فلان:** فلانکەس خۆی بەزەلیل‌و ترساو لەخودا نیشان دا ◊ **تواضَعَ القومُ على الأمر:** خەڵکەکە لەسەر کارەکە رێك کەوتن ◊ **تواضَعت الأرض:** زەوییەکە لەو زەوییەی ئەولای نزم تر بوو ◊ **تواضَعَ ما بيننا:** نێوانمان دوور بوو ◊ **استوضَعَ منه:** لەرێزی هێنایە خوار ◊ **استوضَعَ فلاناً الشَّيْئ:** داوای لەفلانکەس کرد شتەکەی لەسەر لابا ◊ دەگوترێ: (استوضع فلاناً في دينه): داوای لەفلان کرد قەرزەکەی لەسەر لابەرێ ◊ **التوضيع:** دەگوترێ: (في فلان توضيع): فلانکەس ژنانییە ◊ **الضَّعة:** نزم بوونەوەی رێزو نرخ ◊ شکانی کەسایەتی‌و دابەزینی سومعە ◊ خوێریەتی‌و هیچ‌و پوچی ◊ **المُوَضَّعُ:** شکاوو کەرت‌و پەرت بوو، کەسێك نەپیاوی تەواو بێ نەئافرەتی تەواو بێ (واتە نێرە موك) ◊ دەگوترێ: (فلان مُوَضَّعٌ): فلانکەس نێرەموکە ◊ شێوە ژنانییە ◊ بێ رەوشتە ◊ **المَوْضِع:** شوێن‌و مەکان ◊ دەگوترێ: (في قلبي موضع فلان): خۆشەویستی فلانکەس لەدڵم دایە ◊ **المَوْضِعَة:** ناوی شوێن (اسم المکان) ◊ **الموضوع:** سەرباس ◊ ئەو مادە زانیاری‌و رۆژنامەوانییە کەنووسەر دەیکاتە عینوانی نووسینەکەی ◊ **الموضوع من الأحاديث:** حەدیثی هەڵبەستراوو پاڵدراو بۆ لای پێغەمبەر (د.خ) لەبواری فەلسەفەدا بریتییە لەشتێك هەستی پێ بکرێ‌و مودرەك بێ. بەرامبەرەکەی بریتییە لە (الذات) ◊ لەزاراوەی مەنطیقدا بریتییە لە شتێك (مەقولو عەنهو)بێ قسە [illegible] کراو بێ لەپێشەوە بگوترێ‌و بکرێتە مەوضوع‌و بەشی یەکەمی قەضیەو شتی تری بخرێتە سەرو مەحمولی بۆ بهێندرێ ◊ **المَوضوعة من الأحاديث:** حەدیثی هەڵبەسراووبێ بنەما ◊ **الموضوعية:** لەبواری فەلسەفەدا دیدو بۆچونێکی فەلسەفییە پێی وایە مەعریفە دەگەڕێتەوە بۆ حەقیقەتێك جودایە لەزاتی مودرەك‌و هەست پێکراو ◊ **الواضعة:** باخ‌و باخچە ◊ حوشترێك لەشتی فرێدراوو پڵ‌و پوش‌و بەرماوەدا بلەوەڕێ ◊ نافرەتی داوێن پیس‌و بەدڕەوشت ◊ **الوَضْعُ:** دانان ◊ دانراو (موضوع) ◊ هێدی ترین‌و لەسەرەخۆترین شێوەی [illegible]شتنی حوشترو وڵاخی ترە ◊ شێوەی شت‌و هەیە **الوَضّاع:** زۆر قسە هەڵبەست‌و درۆ بوختانچی ◊ دەگوترێ: (رجل وَضَّاعٌ): پیاوی زۆر درۆزن‌و قسە هەڵبەست ◊ **الوَضعية:** مەزهەب‌و رێبازی (ئوجست کۆنت)ە کە بڕوای بەئەو دیو مادەنیەو نینکاری میتا فیزیقیەکان دەکا، پێی وایە زانیاریی دەبێ لەسەر روداو ئەزمون بنج بەستوبێ ◊ **الوَضيعُ:** پڕو پوچ‌و هەتیو مچەو خوێری ◊ پێچەوانەی (الشريف)ە ئەمانەت‌و ئەسپاردە ◊ دەگوترێ: (وضعت عند فلان وضيعاً): ئەسپاردەیەکم لای فلانکەس داناوە ◊ **الوَضيعَة:** ئەمانەت‌و ئەسپاردە ◊ کتێبێکە قسەی عاقڵمەندانی تێدا دەنووسرێ ◊ کۆمەڵێك سەرباز دەخرێنە هەرێمێکەوەو غەزوی ئەو دەڤەرمناکەن‌و تێیدا دەمێننەوە ◊ وردەو پردەی شت ◊ زەرەر ◊ کۆڵ‌و بارو بارگەنەی خەڵك ◊ ئەو ئەندازەیەی پاشاو خەلیفە وەری دەگرن لەباج‌و خەراج ◊ ئاردو رۆنی بەسەردا دەکرێ‌و دەخورێ.

**وَضَمَ القومُ يَضِمون وضوماً:** خەڵکەکە کۆبونەوەو لێك نزیك بوونەوە.

**وَضَمَ القوم على بني فلان:** خەڵکەکە بوونە میوانی فلان خێزان و بەرەباب.

**وَضَمَ الجزار اللحم:** حەیوان کوژەرەوەکە (قەصابەکە) گۆشتەکەی خستە سەر (وەضەم) هەرشتێك گۆشتەکە لەگڵ و خۆڵ دووربخاتەوە ◊ **اوضَمَ الجزارُ اللحمَ:** بەمانا (وَضَمَهُ)دێ ◊ **استَوضَمَهُ:** ستەمی لێ کرد ◊ **الوَضَمُ:** هەرشتێك گۆشتی لەسەر دابندرێ لەدارو حەسیرو بەردو شتی وا بەمەبەستی ئەوە لەگڵ و خۆڵ دووربێ ◊ سفرەی نانخواردن ◊ **الوَضمَة:** کۆمەڵێك ئادەمیزاد دووسەد یان سێ سەد کەس ◊ کۆمەڵێك مرۆڤی لێك نزیك ◊ **الوَضِيمُ من الأصابع:** نێوان قامکی ناوەڕاستو قامکە بچکۆلە ◊ **الوَضِيمة:** کۆمەڵێك مرۆڤ دووسەد تا سێ سەد کەس ◊ خەڵکێکە کەم دەبنە میوانی هۆزو خێڵێكو ڕێزیان لێ دەگیرێ ◊ خواردنی ئامادەکراو بەبۆنەی ماتەمینییەوە.

**وَضَنَ الشَّيْئَ يَضِنه وَضْناً:** شتەکەی خستە سەریەك ◊ دەگوترێ: (وَضَنَ الحجرَ والآخرَ): بەردو خشتەکەی خستنە سەریەك ◊ تەنی ◊ دەگوترێ: (وضن النسيج) و (وَضَنَ السرير وأشباهه بالجوهر) ◊ **اوضن الرَّجل:** بۆ ڕەحلو کەژاوەکە قەیاسەی چندراو بەسەریەك دای بۆ دروستکرد، پێی شەتەك دا ◊ **إتَّضَنَ:** پەیوەندی پێوەکرد پێیەوە لکا ◊ **تضوَضَنَ:** ژێر دەستە بوو ◊ زەلیل بوو ◊ **الموضونة:** زرێیەك کونەکانی لێك نزیك بن ◊ حەلقەکانی تێك خرابن و چوبنە ناو یەکەوە ◊ یان ئەڵقەکانی دو دو چندرابن ◊ **المِيضنة:** هۆرو جەواڵو تێرمیەکە لەپوشی دارخورما چندرابێ ◊ **الوُضنَةُ:** کورسی چندراو لەلقی دارخورماو شتی وا ◊ **الوَضِينُ:** ڕیزکراو چین چین کراو ◊ پشتێنێکی پانی چندراوە هەندێکی چووەتە سەر هەندێکی و هەوداو سیرمەکانی پێکەوە لاو نیو چندراون ◊ بەکوردی خۆمان پێی دەگوترێ: (قەیاسە) ◊ یان هەر لەپێست دروست دەکرێ شتی پێ لەپشتی حوشتر شەتەك دەدرێ ◊ بۆ ڕەحلو کەژاوە بەکاردێ ◊ دەشگوترێ: (إنه لعلق الوضين): ئەو گورج و گۆڵ و خێرایە ◊ چوستو چالاکە ◊ **وطئ الشَّيْئ يطؤه وَطْئاً:** شێلای پانی کردەوە ◊ دەگوترێ: (وطِئنا العَدُوَّ): دوژمنمان پان و پلیش کردەوە، غەزومان کردن ◊ (بنو فلان يطؤهم الطريقُ): بەرەبابی فلان هۆزی فلان لەنزیك ڕێگاکەوە نیشتەجێ بوون.

**وَطِئَ المرأة:** چووە لای ئافرەتەکە، سەرجێیی کرد.

**وَطُؤَ الموضعُ وغيره:** شوێنەکە نەرمەڵان بوو ◊ **اوطَأَ شِعْرَهُ وفيه:** لەشیعرەکەدا سەرەوای دوبارە کردەوە بەلەفظو ماناوە هەمان سەرەوای پێشوی هێنایەوە ◊ **اوطَأَ فلاناً العَشْوةَ وعَشْوةَ:** فلانکەسی والێ کرد بەسەر کوێری بڕواو نەزانێ ڕو لەکوێ دەکا ◊ **اوطَأ الأرض وبها:** پێی لەزەوییەکە ناو بەناوی دا ڕۆیی ◊ **اوطَأ فلاناً الأمرَ:** لەکارەکەدا هاوڕای فلان بوو ◊ **وَطَّأَ الموضعَ وغيره توطئةً:** شوێنەکەی تەخت کردو کردییە ڕێبازو ڕاڕەو ◊ **وَطَّأ الشَّيْئ:** شتەکەی ئامادەکرد ◊ **وَطَّأ الفراشَ:** شوێن نوستنو دۆشەك سیسەمەکەی ڕێك خستو خۆشی کرد بۆ لەسەر نووستن ◊

**تَواطَأَ القومُ على الأمر**: خەلکەکە لەسەر کارەکە ڕێك کەوتن ◊ **تواطأ فلان فلاناً على الأمر**: فلانکەس لەسەر ئیشەکە ڕەزامەندیی خۆی بۆ فلان دەربڕی ◊ **تَوَطّأَ الرجلان**: شتەکەی ژێر قاچی دا ◊ بەقاچ گێرەی کرد، وردی کرد پلیشاندیەوە ◊ **استوطأَ الشَّيْئ**: شتەکەی نزم کرد ◊ نەرمی کرد ◊ ئاسانی کرد ◊ بەوشێوانە هاتە بەردەستی ◊ **الإيطاء**: بەلای شاعیرانەوە عەیبێکی سەرەوای شیعرە، بریتییە لەوە سەرەواکە بەلەفظو ماناوە دوبارە بێتەوە ◊ **الطَّأة والطَّئَةُ**: نەرمو نیان ◊ **المَوْطَأُ**: شوێن قاچ ◊ جێ پێ ◊ **المَوْطِئُ**: بەمانا (المَوطَأ)دێ ◊ **المُوطَأُ**: سەهلو ئاسان، نەرمو نیان ◊ دەگوترێ: (رجل موطأ الأكناف): پیاوێکی بارخۆش و مامەڵە خۆشە، ڕۆخۆش و سەخی سروشتو میوان نەوازە ◊ هەرکەسێ بچێ بۆ لای پەشیمان نیەو ماندو نابێ ◊ **الميطاءُ**: چاڵایی زەوی ◊ پارچە زەوییەکی نزم ◊ **الواطئة**: ڕێبوار کە شوێنێکی زەوی دەکەنە ڕێڕەو ◊ خورمای بیژۆك و هەڵوەریو ◊ **الوطاءُ**: نزمایی، زەلکاوو چاڵایی لەزەوی دا ◊ **الوِطاءُ**: بێشکەی نەرمو خۆش بۆ منداڵ ◊ **الوَطاءَةُ**: نەرمو نیانو ئاسانو بەیدەست ◊ **الوَطْأَةُ**: پێلەقەو گرتنی بەهێزو توند ◊ **الوَطَأَةُ**: ڕێبوار ◊ **الوَطِئ**: چاڵایی زەوی ◊ نەرمو دەشت ◊ تەخت کراوو بێ کۆسپ ◊ دەگوترێ: (هذا الفراش وَطِئٌ): ئەم شوێن نوستنو دۆشەکە نەرمە ئەوکەسەی لەسەری دەخەوێ ئازاری جەستەی نابێ ◊ **الوَطِيئَةُ**: خورمایەکە دەنکەکەی دەردەهێندرێو بەشیرەوە دەشێلدرێ ◊ کەشك و شەکر ◊ **الوَطْبُ**: مەشکەی دۆ ◊ مەمك و گوانی گەورە ◊ پیاوی وشکە تەبیاتو قسە ڕەق ◊ دەشگوترێ: (صَغِرَت وِطابُهُ): مرد یان کوژار ◊ **الوَطْباءُ**: مەمك گەورە ◊ **الوَطْبَةُ**: قاوت: کەلەخورماو کەشك و ڕۆن دروست دەکرێ ◊ **وَطَحَهُ يَطحُهُ وَطْحاً**: بەزەختو هێز پاڵی پێوەنا ◊ **تواطَحَت الإبل على الحوض**: حوشترەکان پاڵەپەستۆیان کرد لەسەر حەوزی ئاوخواردنەوە ◊ **تواطح القومُ**: خەڵکەکە لەگەڵ یەك شەڕیان کردو دژی یەکتر دوانو هەڵوێستیان وەرگرت ◊ **الوَطْحُ**: ئەو چڵك و پیسییەی بەسمو چنگ نینۆکی وڵاخو ئاژەڵو باڵندەو پەلەوەرەوە دەنوسێ.

**وَطَدَ يطِدُ وَطْداً**: جێگیر بوو، چەسپا.

**وَطَدَ الشَّيْئ وَطْداً وَطِدَةً**: چەسپاندی بەهێزی کرد ◊ دەگوترێ: (وَطَدَ لە منزلة): جێگای بۆ خۆش کرد.

**وَطَدَ الإنسان الى الأرض**: پیاوەکەی بەزەوییەوە نوساندو نەیهێشت جوڵەبکا.

**وَطَدَ الأرضَ**: زەوییەکەی بەکوتك کوتایەوە بۆ ئەوەی بپەستێورێو بچێتە پاڵ یەك و بۆشایی تێدا نەمێنێ کەبیناى لەسەر بکرێ نەنیشێ.

**وَطَدَ الصَّخْرَ على الغار**: بەبەرد دەرکی ئەشکەوتەکەی گرت ◊ دەرکی ئەشکەوتەکەی بەکەڵەکە بەرد هەڵچنی ◊ **وَطّدَهُ**: بەمانا (وَطَدَهُ)دێ ◊ **وَطَّدَ الأرضَ**: زەوییەکەی تەخت کردو کوتایەوە بۆئەوەی گڵو بەردو چەوەکە بچێتە پاڵ یەك و توندبێ ◊ دەشگوترێ: (وَطّدَ له عنده منزلةً): بۆ فلان لای فلان جێگای بۆ خۆش کردو دایمەزراند ◊ **تَوَطَّدَ الشَّيْئ**: شتەکە چەسپاو جێگیر بوو ◊ **اتَّطَدَ**: بەمانا (تَوَطَّدَ)دێ ◊ **المُتَوَطِّدُ**: شتی بەردەوامو نەبڕاوە کەیەك بەدو یەك دا بێ ◊ چەسپاوو پتەوو

جێگیر بوو ٥ **المِیطَدَةُ:** کوتکێکی قورس‌و گرانە لەدارو شتی وا دروست دەکرێ بناغەی دیوارو شتی وای پێ دەکوترێتەوە بۆئەوەی پتەو ببێ‌و نەنیشێ ٥ دارێکە درێل‌و ئاسنی سورەوەکراوی کونکردنی شتی پێ دەگیرێ ٥ **الوَطِیدَةُ:** بناغەو کانگەی دیواری خانوو ٥ سێ کوچکەی ئاگردان (سەرئاگرە) ٥ دەشگوترێ: (لە عندي وطیدة): فلانکەس لای من پلەو پایەی بەرزی هەیە ٥ هەروا دەگوترێ: (أنت من وطائد الحق): ئەتۆ پایەیەکی پتەو: حەق‌و راستی ٥ **الوَطَرُ:** پێداویستی ٥ مەبەست‌و ئارەزۆ ٥ دەگوترێ: (قضی منە وطرَه): ئیشی خۆی لێ جێ بەجێ کرد ئارەزوی خۆی لی بەدی هێنا.

**وَطَسَ** الأرض یَطسُها وَطْساً: چاڵی لەزەوییەکە کرد.

**وَطَسَ الشَّیئَ:** شتەکەی شکاندو وردو هاڕی کرد ٥ بەتوندو بەهێز لێی دا ٥ **تَوَطَّسَ المَوْجُ:** شەپۆلەکان توندو زۆر بوون ٥ **الوَطَّاسُ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (وَطَسَ)دێ ٥ شوان ٥ **الوَطِیسُ:** تەندوری نانکردن کەنانی تێدا دەبرژێ ٥ شەڕو هەرا ٥ دەگوترێ: (حَمِيَ الوطیسُ): شەڕگەرم بوو پەرەی ساند.

**وَطَشَ** فلاناً یطشه وطشاً: لێی دا، پێی کێشا.

**وَطَشَ** فلاناً عَنْ فلان: فلانکەسی لەکۆڵ فلانکەس کردەوە.

**وَطَشَ** الکلامَ: کەلامەکەی بەیان کرد، جوان ڕونی کردەوە.

**وَطَشَ** الخَبَرَ: لایەنێکی هەواڵەکەی ئاشکرا کرد ٥ دەگوترێ: (ما وَطَشَ لنا): هیچی نەداینێ ٥ (سألته عَنْ شيئ فما وطَش): پرسیاری شتێکم لێ کرد هیچی بۆنەدرکاندم ٥ **وَطَّشَ عنه:** لێی دوورخستەوە ٥ **وَطَّشَ القوم عنهم:** خەڵکەکەی لێ دوورخستەوە ٥ **وَطَّشَ لفلان:** دەروازەی قسەو بۆچون‌و کرداری بۆ فلانکەس دیاری کرد ٥ **وَطَّشَ فیه:** کاریگەر بوو تێیدا ٥ دەگوترێ: (سألوه فما وَطَّشَ لهم بشیئ): پرسیاریان لێ کردو هیچی پێ نەدان ٥ (ضربوه فما وَطَّش الیهم): لێیان داو دەستی پێ نەکرایەوەو نەیتوانی دیفاع لەخۆی بکا ٥ (سألته عَنْ شيئ فما وَطَّش): پرسیاری شتێکم لێ کرد هیچی بۆ رون نەکردمەوە.

**وَطَفَ** الرَّجُلُ یَطِفُ وَطْفاً: پیاوەکە دوا ڕمتێندراوەکە کەوت دووری خستەوە.

**وَطِفَ** یَوْطَفُ وَطَفاً: موی برۆو برژانگی زۆر بوون نەرم‌و شۆڕیش بونەوە.

**وَطَفَ** المطرُ: بارانەکە بەلێزمە باری ٥ **وَطَفَتِ السحابة:** هەورەکە شوڕابەی کردە سەرزەوی ٥ (فهو اوطف وهي وَطفاء) ٥ **أوْطَفَ:** بەسەر یا ڕوانی، بەرز بۆوە ٥ دەرکەوت ٥ دەگوترێ: (خذ ما أوطف لك): چیت دی هەڵی بگرە ٥ **الأوْطَفُ:** دەگوترێ: (بعیر أوطف الوبر): حوشترێکی کوڵک زۆرو باشە ٥ (عام أوطف): ساڵێکی پڕ خێرو بەرەکەتە ٥ (عیش اوْطَف): گوزەرانی خۆش ٥ (ظلام أوطف): تاریکییەکی داگرندەو نزیک‌و داپۆشەرە ٥ **وَطَمَهُ یَطِمُهُ وَطْماً:** پێی لێنا.

**وَطَمَ** السِتْرَ: پەردەکەی دادایەوە.

**وَطِمَ** یَوْطَمُ وَطماً: گوی گیرا ٥ پیسایی بۆنەکرا.

**وُطِمَ:** بەمانا (وَطِمَ)دێ.

**وَطَنَ** بالمکان: لەشوێنەکە مایەوە ٥ **اوطَنَ البلدَ:** شارەکەی کردە زێدو نیشتمانی خۆی ٥ **اوطَنَ**

**نفسه على كذا**: نەفسى خۆى ئارام كرد لەسەر ئەوشتەو پێى ڕازى بوو ◊ **واطَنه على الأمر**: كارى خۆى لەگەڵ ئەوشاردەوە ◊ خۆى دەرنەخست ◊ بەكارەكە رازى بوو ◊ **واطن القوم**: لەگەڵ خەڵكەكە لەنيشتمانێك دا ژيا ◊ **وَطَّنَ بالبلد**: شارەكەى كردە زێدو نيشتمانى خۆى ◊ **وَطَّنَ نفسه على الأمر**: نەفسى خۆى لەسەر كارەكە ڕاهێنا ◊ **إِتَّطَنَ البلدَ**: وڵاتەكەى كردە زێدو نيشتمانى خۆى ◊ **تَوَطَّنَ**: بۆ موطاوەعەى (وَطَّنَ)دێ ◊ دەگوترێ: (تَوَطَّنَتْ نفسه على الأمر): نەفسى خۆى لەسەر ئەوكارە ڕاهێنا ◊ **تَوَطَّنَ الأرضَ وبها**: زەوييەكەى كرد بەزێدو نيشتمانى خۆى ◊ **استوطن البلدَ**: شارو وڵاتەكەى كردە زێدى خۆىو تێيدا نيشتەجێ بوو ◊ **المَوْطِن**: وەتەن ◊ هەرشوێنێك ئادەميزاد بەهۆيەكەوە تێيدا نيشتەجێ ببێ ◊ ئەنجومەنو مەجليس ◊ ديمەنێك لەديمەنەكانى شەڕ ◊ **الميطان**: شوێنى لێ ريزكردنو ڕاگرتنى ئەسپەكان پێش ئەوەى دەست بە پێشبڕكێكە بكەن ◊ **الوَطَنُ**: نيشتمان ◊ زێدو شوێنى لەدايكبونو نيشتەجێ بوون ◊ تەويلەو ئاغەڵو گەوڕى ڕەشەوڵاخو بزنو مەڕ ◊ **وَطْوَطَ فلان**: فلانكەس لاواز بوو، قسەى خێرا خێرا كردن ◊ **تَوَطْوَطَ الصبي**: منداڵەكە بەگريانەوە هاوارى كرد ◊ **الوَطْوَاطُ**: شەمشەمە كوێرە ◊ پياوى كاڵفامو لاوازو جەستە بچكۆلە ◊ كەسێك قسە خێرا خێرا بكا ◊ پياوى زەعيفو ترسنۆك ◊ دەم بەهاوارو جاڕدەر ◊ **الوَطْوَاطَةُ**: كەسێكە خێرا خێرا قسە بكا ◊ لەقسەكردن دا پەلە پەل بكا ◊ ئافرەتێك زۆر قيژە قيژ بكا ◊ **الوَطْواطي**: نيسبەتدانى شتە بۆلاى (وطواط) ◊ لاوازو ترسنۆك ◊ چەقە چەناو زۆر بلێ.

**وَظَبَ عليه يَظِبُ وظوباً**: بەردەوام بوو لەسەرى.

**وَظَبَ الأمرَ**: بەكارەكەوە نووساو وازى لێ نەهێنا ◊ بەرعۆدەى كارەكە بوو ◊ **واظَبَ على الأمر**: بەردەوام بوو لەسەر كارەكەو پشودرێژبوو ◊ **واظَبَ فلاناً على خدمة فلان**: فلانكەسى هەڵنا بۆ ئەوەى خزمەتى فلان بكا ◊ **تواظَبَت عليه الرياح**: بايەكان بە نۆبە لێيان داو هەردەمە جۆرە بايەك لێى دەدا ◊ **الموظوب**: دەگوترێ: (رجل موظوب): پياوێكە بەڵاو كارەسات نۆرەى لێ دەكەنو هەر ڕۆژەو توشى چورتمێك دەبێو ماڵو سامانى بەڵايەك لەناوى دەبا ◊ **المَوْظوبَةُ**: دەگوترێ: (أرض موظوبة): زەوييەكە ئەوەندەى مەڕو ماڵات تێكراو كرۆسراوەتەوە هيچ لەوەڕى تێدا نەماوە ◊ **الميظب**: دەسكە سندوڵ بەردێكە لەدرێژەوەيە گەنمى پێ دەگوترى ◊ **الوَظْبَةُ**: شەرمگاى ئاژەڵو وڵاخ.

**وَظَفَ البعيرَ يَظِفُهُ وَظْفاً**: زەبرى لەباريكايى قاچى حوشترەكەدا ◊ زنجيرى حوشترەكەى كورت كردەوە.

**وَظَفَ القومَ**: شوێن خەڵكەكە كەوت.

**وَظَفَ الشَّيْئَ على نفسه**: شتەكەى لەسەر خۆى پێويست كرد ◊ **واظَفَهُ**: هاوڕاى بوو، لەگەڵى كەوت ◊ **وَظَّفَهُ**: هەر ڕۆژەو ئەركو وەزيفەيەكى دياريكراوى بۆدانا ◊ **وَظَّفَ عليه العملَ والخراجَ ونحو ذلك**: كارو باجى بۆ مەزندە كردو بۆى ديارى كرد ◊ يان دەگوترێ: (وَظَّفَ على الصبي كل يوم حفظ آيات من القرآن الكريم): هەر ڕۆژە چەند ئايەتێكى دەست نيشان كردن بۆ منداڵەكە بۆئەوەى لەبەريان بكا ◊ **الوَظيف**: باريكايى قاچى حوشترو وڵاخە بەرزەو حەيوانى تر ◊ قاچى

بەهێزو توانا بۆ ڕۆیشتن بەناو نەرمەلاّنو دۆڵو شیودا ◊ **الوظیفة**: ئەوەی دیاری دەکرێ لەئیش‌و خواردن‌و بژێوو شتی تر لەماوەیەکی دیاریکراودا ◊ وادەو پەیمان‌و بەڵێن ◊ پلەو پایەی موچە خۆر ◊ دەشگوترێ: (للدنیا وظائف وَوُظُفٌ): جیهان بەلاّو کارەساتی جۆراو جۆری هەن ◊ **وَعَبَهُ یوعِبه وَعْباً**: شتەکەی هەموو هەڵگرت‌و هیچی لێ نەهێشتەوە ◊ **اوعَبَ القوم**: خەڵکەکە هەموویان چون بۆ غەزا بۆ بەرگری لەوڵات‌و زێدو نیشتمان ◊ **اوعَبَ القومُ جلاءً**: خەڵکەکە هەموویان دەرکران هیچیان لەوڵاتی خۆیان دا نەمانەوە ◊ **اوْعَبَ فلان في ماله**: فلاّنکەس ماڵ‌و سامانی خۆی تەخشان‌و پەخشان کرد بەهەموو شێوەیەك لێی بەخشی ◊ **اوْعَبَ الشَّيْئ**: هەموو شتەکەی هەڵگرت هیچی لێ نەهێشتەوە ◊ شتەکەی لەبێخ دەرهێنا ◊ **اوعَبَ الشَّيْئ في الشَّيْئ**: هەموو شتەکەی کردە ناو شتەکەوە ◊ **استوعَبَه**: هەمووی هەڵگرت، جێگای هەمووی کردەوە ◊ لەبێخ‌و ریشە دەری هێنا ◊ **استوعَبَ الحدیثَ**: قسەکەی وەرگرت‌و لێی حاڵی بوو ◊ **استوَعَبَ المکانُ او الوعاءُ**: شوێنەکە یان زەرفەکە هەموو شتەکەی تێدا جێ بۆوە ◊ **الوَعْبُ**: فراوان، دەگوترێ: (طریق وَعْبٌ): ڕێگایەکی پان‌و بەر فراوانە ◊ **الوَعِیب**: بەرفراوان بەجۆرێك ئەوەی تێی دەکەی جێگای ببێتەوە تێیدا.

**وَعِثَ الطریقُ یَوْعَثُ وَعْثاً وَوَعثاً**: ڕێگاکە ناخۆشەو ڕەوی پێدا ناکرێ.

**وَعِثَ الأمرُ**: کارەکە خراپ بوو تێکچوو تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو ◊ **وَعِثَتْ یده**: دەستی شکا ◊ **اوعَثَ**: کەوتە زەوی نەرمەلاّن‌و لمبەلاّن‌و قوڕو لیتەوە ◊ بەناو گڵە نەرمەو لمبەلاّن‌و قوڕە شل دا ڕۆیی ◊ نەیتوانی قسەبکا ◊ بزرکاندی ◊ **اوعَثَ في ماله**: لەماڵ‌و سامان خەرج کردن دا زێدە ڕۆیی کرد ◊ **اوعَثَ الأمرَ**: کارەکەی تێك دا، دایوەشاند ◊ **وَعَثَهُ**: لای دا ◊ سەرفی کرد ◊ بەندی کرد ◊ **الأوْعَثُ**: (طریق أوعَثُ): ڕێگایەکە ڕەوی پێدا ناکرێ ◊ کوێرە ڕێیە، قۆرت‌و پێچ‌و پڕ کەندو لەندە ◊ **المُوَعَّثُ**: ڕێگای بەردەلاّن‌و ناخۆش ◊ **المَوْعُوثُ**: (رجل موعوث): پیاوێکی هەتیومەچەو ناوە جاخزادەیە ◊ **الوَعْثُ**: هەرشتێك نەرم‌و ئاسان بێ ◊ شوێنێك لمبەلاّن یان نەرمەخاك یان قوڕ بێ کەقاچ تێیدا ڕۆچێ ◊ ڕێگای بەردەلاّن‌و ناخۆش ◊ هەرکارێك ناخۆش‌و برست بڕبێ ◊ ئێسقانی شکاو ◊ جەستەی کزو لاواز ◊ دەشگوترێ: (رجل وعث اللسان): پیاوێکی لاڵە پەتەیەو ناتوانێ قسە بکا ◊ **الوَعِثُ**: ڕێبازی ناخۆش ◊ **الوَعْثاء**: ماندو بون‌و نارەحەتی‌و چورتم ◊ دەگوترێ: (أعوذ بالله من وعثاء السفر): پەنا بەخوا لەنارەحەتی‌و شەکەتی سەفەر چەند ناخۆش‌و برست بڕە ◊ **الوَعْثَةُ من النساء**: ئافرەتی قەڵەو ◊ دەگوترێ: (إمرأة وَعْثَة الأرداف): ئافرەتێکە سمت‌و کەفەڵ نەرمە ◊ دەستی شکاو ◊ **الوُعُوثُ**: تەنگ‌و چەڵەمەو ناخۆشی‌و شەڕو هەرا ◊ **وَعَدَهُ الأمرَ وبه وَعْداً وعِدةً**: وادەی کارەکەی پێدا، هیوا خوازی کرد بۆئەوشتە.

**وَعَدَ فلاناً**: لەفلاّنکەس زیاتر پابەندی وادەو بەڵێن بوو ◊ دەگوترێ: (واعَدَهُ فوعَدَهُ): وادەی دایێ‌و لەوزیاتر پابەندی وادەو بەڵێن بوو ◊ **اوعَدَ الفَحْلُ**: کەڵەنێرەکە حیلکاندی مراندی زەراندی بۆڕاندی کاتێك ویستی مێیەکە کەڵ

بـــدا ◊ **أوعَـــدَ فلانـــاً**: وادەی بەفلانکـــەس دا، هەڕەشەی لەفلانکەس کرد ◊ **واعَدَهُ**: هەریەك لەو دوانە وادەیان بەیەکتر دا ◊ پێشبڕکێیان کرد لەوادەو بەڵێندان بەیەکتری ◊ **واعَدَ فلاناً وقت كذا**: بەڵێنی بەفلانکەس دا لەکاتی فلان شت دا ئەرکی سەرشانی خۆی بۆ جێ بەجێ بکا ◊ **إتَّعَدَ**: وادەکەی قبوڵ کردو بتمانەی پێ دا ◊ **إتَّعَدَ القومُ**: خەڵکەکە بەڵێنیان بەیەکتردا ◊ **اتَّعَدَ فلان فلاناً**: فلانکـــەس هەڕەشـــەی لەفلانکـــەس کـــرد ◊ (تَواعَـــدوا): خەڵکەکـــە هەندێکیان وادەیان بەهەندێکیان دا ◊ **تَوَعَّدَهُ**: هەڕەشەی لـێ کرد ◊ **المَوْعِدُ**: وادەو بەڵێن ◊ شوێنی وادە ◊ کاتی وادە ◊ عەهدو پەیمان ◊ **الموعود**: (اليوم الموعود): ڕۆژی قیامەت ◊ **الميعاد**: کاتی وادە، شوێنی وادە ◊ **الواعِدُ**: دەگوترێ: (فَرَسٌ واعِد): ئەسپێکە بەڵێن دەدا لەڕۆیشتن و غاردان نەوەستێ ◊ (أرض واعِدة): زەوییەکە هیوای ئەوەی لێ دەکرێ خێرو بێری زۆربێ و بەرو بوومی باش بێ ◊ **الوعيد**: (يوم الوعيد): ڕۆژی قیامەت.

**وَعَـرَ المكـان**: شوێنەکە بەردەڵان و چەقەن و ڕەقەن بوو ◊ پتەوو ڕەق بوو.

**وَعَرَ فلاناً**: فلانکەسی بەند کرد.

**وَعُرَ الشَّيءُ**: شتەکە کەم بوو ◊ (فهو وعِر) ◊ **وَعِرَ المكانُ**: شوێنەکە ڕەق و پتەو بوو ◊ **أوعَرَ**: کەوتە ناو زەوی بەردەڵان و چەقەن و ڕەقەنەوە ◊ **أوْعَرَ فلان**: فلانکەس هەژار بوو ◊ **أوْعَرَ الطريق بفلان**: ڕێگاکە فلانکەسی گەیاند بەشوێنێکی ڕەقەن و چەقەن ◊ **أوْعَرَ الشَّيءَ**: شتەکەی کەم کردەوە ◊ **أوعَرَ الطريقُ**: ڕێگاکەی بەپڕ کۆسپ و تەگەرە هاتە بەرچاو ◊ **وَعَّرَ المكانَ**: شوێنەکەی بەردەڵان و چەقەن و ڕەقەن کرد ◊ **وَعَّرَ فلاناً**: فلانکەسی گێڕایەوەو نەیهێشت بەمراز بگا ◊ قسەکەی بڕی ◊ **تَوَعَّرَ فلان**: فلانکەس توند ڕەوی کرد ◊ **تَوَعَّرَ المكانُ**: شوێنەکە ڕەقەڵان بوو ◊ **تَوَعَّرَ الأمرُ على فلان**: کارەکە لەسەر فلانکەس گران بوو دەرهەقەتی نایە ◊ **تَوَعَّرَ في الكلام**: لەقسەکردن دا سەرسام بوو ◊ **تَوَعَّرَ فلان فلاناً في الكلام**: فلانکەس فلانکەسی لەقسەکردن دا سەرسام کرد ◊ **اسْتَوْعَرَ الطريقَ والمكانَ**: ڕێگاکەی بەپڕ کۆسپ و تەگەرە زانی ◊ **الأوْعَرُ**: بەردەڵان و پڕکۆسپ و تەگەرە ◊ دەگوترێ: (طريق اوْعَرُ) ◊ **الواعِرُ**: شوێنی چاڵ و پڕکەندو لەند ◊ پێچەوانەی مانای (السهل) دێ ◊ دەگوترێ: (جبل واعِرٌ): کێوێکی سەخت و نەستەمە ◊ **الوَعْرُ**: شوێنی سەخت و پتەو ◊ شوێنی ترسناك ◊ دەشگوترێ: (رجل وَعْرُ المعروف): پیاوێکە عەطاو بەخششی کەمە ◊ **الوَعِرُ**: بەمانا (الوَعْرُ)دێ ◊ **الوَعِيرُ**: بەمانا (الوَعْرُ)دێ.

**وَعَزَ اليه في الأمر**: چو بۆلای و فەرمانی پێ کرد ئەو ئیشە بکا یان پێی گوت وازی لێ بێنە ◊ **أوعَزَ اليه**: فەرمانی پێ کرد بەکردنی کارێك، یان نەکردنی ◊ **وَعَّزَ اليه**: بەمانا (وَعَزَ)دێ ◊ **وَعَسَه يعسه وَعْساً**: بەتوند پێی پیانا.

**وَعَسَ الدهرُ فلاناً**: ڕۆژگار فلانکەسی لەبۆتە داو قاڵی کرد ◊ **أوعَسَ**: شوێن پێی هەڵگرت لەناو لمبەڵانەکەدا ◊ بەیانی زوو ڕۆیی ◊ **أوعَسَتْ الإبلُ**: حوشترەکە ملی خۆی درێژ کرد هەنگاوەکانی فراوان کردن و خێرا ڕۆیشت ◊ دەشگوترێ: (أوعَسَت الإبلُ بأعناقها): حوشترەکە

ملی خۆی درێژکردو خێرا ڕۆیی ◊ **واعَسَت الإبلُ**: بەمانا (أوعَسَت)دێ ◊ بەتوندی قاچی بەزەوی دادا، پێکۆڵی کرد ◊ **واعَسَ فلان فلاناً**: فلانکەس پێشبڕکێی لەگەڵ فلان دا کرد ◊ **الأوْعَسُ**: دەشتی لمباویو نەرمەلان کەقاچی تێیدا ڕۆچێ ◊ **الميعاس**: دەشتێکی لمبەلان کەلمبەکەی تەباری نەبەستبێ لمبەلانێك کە قاچ تێیدا ڕۆبچێ ◊ قاچی تێدا گوم ببێ ◊ زەوییەك کەلەوەپێش پێخوست نەکرابێ ◊ ڕێگا ◊ **الوَعْسُ**: شوێن پێو نیشانەی پێدا ڕۆیشتن ◊ بەمانا (الأوعس)دێ ◊ **الوَعساء**: مێینەی (الأوعس) ◊ زەوییەك نەرم بێو کەمێك لمبەلانی تێدابێ، وەکو بەباشی لی بڕوێ ◊ دەشتێك لمبەلانی نەرم بێ قاچی تێچەقێ ◊ **الوَعْسَةُ**: بەمانا (الأوعس)دێ ◊ **وَعَظَهُ يعظه وَعْظاً وعِظَةً**: ئامۆژگاریی کردو لەسەرەنجامی خراپەکاریی ترساندی ◊ فەرمانی پێ کرد بەچاکە کردنو تەماعی خێرو خۆشی دوا ڕۆژی بەرنا ◊ **إتَّعَظَ**: قبوڵی ئامۆژگاری کردو فەرمانبەر داری ئامۆژگاری بوو، نەفسی خۆی گرتەوە لەخراپە ◊ دەگوترێ: (وَعَظَهُ فاتَّعَظَ): ئامۆژگاری کردو ئەویش ئامۆژگارییەکانی وەرگرتن ◊ **المَوْعِظَةُ**: ئەوەی ئامۆژگاری پێ ئەنجام دەدرێ کردەوە بێ یان گوفتار بێ ◊ **الواعِظُ**: کەسێك ئامۆژگاری دەکاو شت وەبیر گوێگرانی دێنێتەوەو فەرمان دەکا بەچاکەو نەهی دەکا لەخراپە.

**وَعَفَ بَصَرُهُ يَعِفُ وعوفاً**: چاوی زەعیف بوو، کز بوو ◊ **اوعَفَ الرَّجُلُ**: پیاوەکە چاوی کزبوو ◊ **الوَعْفُ من الأرض**: هەرشوێنێکی زەوی کەڕەق بێو ئاوی تێدا ڕاوەستێو ببێتە زۆنگاو.

**وَعَقَ الفَرَسُ**: ئەسپەکە لەکاتی ڕۆیشتنی دا دەنگ لەورگی هات، قۆڕەی سکی هات.

**وَعِقَ عليه يَعِقُ وَعْقاً**: پەلەی کرد ◊ **وَعُقَ**: چەموش بوو ◊ **وَعَّقَ فلاناً**: فلانکەسی نیسبەت دا بۆ چەموشیو سەر ڕەقی ◊ تێکی دا خۆی خراپ کرد ◊ پێچەوانەی ئەو جولایەوە ◊ **تَوَعَّقَ**: سەر ڕەقو ڕەوشت خراپو سەرپێچی کەر بوو ◊ **استَوْعَقَ**: بەمانا (تَوَعَّقَ)دێ ◊ **الوُعاق**: دەنگێکە لەورگی ولاخ دەبیسرێ لەکاتی ڕۆیشتنی دا ◊ **الوَعِقُ**: مرۆڤی بەدڕەوشت ◊ **الوَعِقُ**: دەگوترێ: (رجل وَعِق): پیاوێکی ڕەوشت ناشیرینە ◊ مرۆڤی چەقە چەق کەر ◊ **الوَعْقَةُ**: بەدڕەوشتی ◊ چەموشی ◊ سەرڕەقو قسە نەبیس ◊ **الوَعِقَةُ من الرجال**: بەمانا (الوَعْقَةُ)دێ ◊ **الوعيق**: دەنگێکە لەورگی ولاخ دەبیسرێ لەکاتی ڕۆیشتنی دا.

**وَعَكَ الحرُّ**: گەرما بەتین بوو ◊ **وَعَكَت الريحُ**: بایەکە هێواش بوو.

**وَعَكَ فلان**: فلانکەس لەناکامی ماندو بون دا توشی ئازار بوو ◊ **وَعَكَت الكلابُ الصَّيْدَ**: سەگەکان نێچیرەکەیان لەگڵو خۆڵ وەردا.

**وَعَكَ المرضُ فلاناً**: نەخۆشی فلانکەسی ئازاردا ◊ دەگوترێ: (وعكته الحُمَّى): لەرزوتا ئێشی پێ گەیاند.

**وَعَكَ الشَّيْئ في التراب**: شتەکەی لەگڵو خۆڵ وەردا.

**وَعَكَ الشَّيْئ**: شتەکەی کوتا ◊ بەیەکی کێشان ◊ **اوعَكَتْ الإبلُ عند الحوض**: حوشترەکان لەسەر حەوزەکە پاڵە پەستۆیان کردو چوونە سەریەك ◊ **اوعَكَ فلان الشَّيْئ**: فلانکەس شتەکەی لەگڵ وەردا ◊ **اوعَكَ الكلابُ الصيد**: سەگەکان

نێچیرەکەیان لەگڵو خوڵ وەردا ٥ **المَوعوك**: لەرزو تادار ٥ لەش بەئازار ٥ **الوَعْكَةُ**: هەوای کەمو گەرمای توند ٥ لەرزو تا لێ هاتنو وەشەقەتۆڵە خستنی نەخۆشەکە ٥ شەڕی پاڵەوانان کەیەکتر دێننو دەبەنو یەکتر بەزەوی دادەدەن ٥ فاچ بەزەوی کێشانی بەهێز لەکاتی غاردان دا.

**وَعَلَ يَعِلُ وَعْلاً**: بەسەریا ڕوانی ٥ **تَوَعَّلَ الجبلَ**: چووە سەر کێوەکە ٥ دەشگوترێ: (توعَّلَ مصاعد الشرف): چووە سەر پەیژەو شوێنی بڵندی شەرەفو شکۆمەندی ٥ **استوعَلَ اليه**: پەنای بۆبرد ٥ **استَوعَلَ الأوعالُ**: حەیوانە کێوی‌و نێریە کێوییەکان چوونە سەر لوتکەی کێوەکان ٥ **المُسْتَوْعَلُ**: کونە شاخی حەیوانە کێوی، شوێنی تێدا حەوانەوەی حەیوانە کێوی لەئەشکەوتە شاخی عاصیو بەرزایی دا ٥ **الوَعْلُ**: نێریە کێوی (نێری بزنە کێوی) ٥ شەریفو نەجیب زادە ٥ پەناو مەلجەئو شوێنی ئەمین ٥ دەشگوترێ: (هم علينا وَعْلٌ واحد)، ئەوان لەدژی ئێمە کۆکو یەک هەڵوێستن هەروا دەگوترێ: (مالك عنه وَعْلٌ): تۆڵەو شتەدا هیچ مەجالێکت نییە ٥ هەردەبێ ئەوەبێ ٥ **الوَعِلُ**: نێریە قەرەی کێوی ٥ **الوَعْلَةُ**: لوتکە شاخی سەراسەری کێو ٥ ئەشکەوتو شوێنی سەختو عاصێ لەناو کێودا ٥ یەخەی کراس ٥ هەنگڵی گۆزەو دیزەو مەسینەو شتی وا.

**وَعَمَ بالخبر يَعِمُ وَعْماً**: بەگشتی هەواڵەکەی داو ڕونی نەکردەوە.

**وَعَمَ الديارَ**: دوعای ئاوەدانی بۆ وڵاتەکە کرد ٥ **الوَعْمُ في الجبل**: دەمارە شاخو توێسکە گڵێکە لەکێودا ڕەنگی لەوەی تر جیایە ٥ **وَعَنَتِ الدوابُ**: وڵاخو ئاژەڵەکان قەڵەو بوون ٥ **تَوَعَّنَتِ الدوابُ**: وڵاخو ئاژەڵەکان گەیشتنە ئەوپەڕی قەڵەوی ٥ **تَوَعَّنَ فلان الشيئَ**: فڵانکەس شتەکەی وەرگرتو خستیە شوێنی شیاوی خۆی ٥ **الوِعَانُ**: کۆی (الوَعَنُ والوعنة)، بریتییە لەدەمارە شاخو توێسکە گڵو چینە خاك لەکێودا کەلەوەی تر جیابێو شوێنکەی خۆی هەبێ ٥ **الوَعْنُ**: پەناگاو مەلجەئو شوێنی حەوانەوە ٥ زەوی ڕەقو پتەو ٥ **الوَعْنَةُ**: زەوی ڕەقو پتەو ٥ سپی خاکێك کەهیچی لی نەڕوێ ٥ **وَعْوَعَ الكلبُ**: سەگەکە وەڕی، لوراندی ٥ **وَعْوَعَ القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە غاڵو بوغڵو چەقەو هەرا ٥ **وَعْوَعَ فلان القومَ**: فڵانکەس خەڵکەکەی هێنایە عامێلکەو تەنگی پێ هەڵچنین ٥ **الوَعْواعُ**: قیڕەو هەرای خەڵکە ٥ هەر دەنگو قیڕەو هەرایەك تێکەڵ بێ ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد کە بکەونە غەڵبە غەڵبو هەراو هوریا ٥ چەقە چەناو زۆر بڵێ ٥ دیدەبان ٥ ئازاو چاونەترس ٥ یەکەم پێشمەرگەو جەنگاوەر کەفریای هاوەڵانی تێشکاو لەشەڕدا دەکەوێ ٥ **الوَعْوَعُ**: چەقەڵ ٥ ڕێوی ٥ خەتیبی زمانڕەوان ٥ پیاوی زەعیفو لاواز ٥ سارای کاکی بەکاکی ٥ **الوَعْوَعَةُ**: وەڕەو مرەو لوراندنی سەگو گورگو ڕێوی ٥ **الوَعْوَعِيُّ**: پیاوی مەردو ئازاو شکۆمەندو چاونەترس.

**وَعَى العَظْمُ يعي وَعْياً**: ئێسقانەکە بەخواری گرتیەوە.

**وَعَى الجُرْحُ**: برینەکە کێمی لێ ڕۆیی ٥ برینەکە لەسەر پیسیو کێم دەمەکەی وێکهات بۆوە ٥ **وَعَتِ المِدَّةُ في الجرح**: کێمو زوخاو لەبرینەکەدا کۆبۆوە.

**وَعَى الشيئَ**: شتەکەی لەکیسەو حاجەتێك دا کۆکردەوە.

**يَقِظَ** من نومه يَيْقَظ يقظاً: لەخەو بێدار بۆوە ٥ بەهۆش هاتەوە، شتەکەی لێ رون بۆوە ٥ لەکارەکە حاڵی بوو ٥ وریا بۆوەو بەحەزەرەوە چاوەڕوانی روداو بوو ٥ **أيْقَظَهُ**: بەخەبەری هێنا، وریای کردەوە ٥ ترساندی‌و داوای لێ کرد حەزەربکا ٥ هەڵی ناو هەژاندی، دەنەدەنەی دا ٥ **أيقظ الغبار**: تۆزی هەڵساند، تۆزو خۆڵی بەرپاکرد ٥ **تَيَقَّظَ**: بەمانا (يَقِظ)دێ ٥ دەگوترێ: (تَيَقَّظَ من نومه): لەخەوی بێداری خۆی ڕاپەڕی ٥ هەستی بەشتەکە کرد ٥ **اسْتَيْقَظَ**: بەمانا (تَيَقَّظَ)دێ ٥ **اسْتَيْقَظَ فلاناً من نومه**: فلانکەسی لەخەو ڕاپەڕاند، بێداری کردەوە ٥ **اليَقُظُ**: (رَجُلٌ يَقُظٌ): پیاوێکی زیرەك‌و وریایە ٥ **اليَقْظَانُ**: بەمانا (اليَقِظُ)دێ ٥ دەگوترێ: (رجل يقظان الفكر) پیاوێکی بیر تیژو وریایە ٥ **اليَقَظَةُ**: هەڵسان لەخەو ٥ بەخەبەریی‌و بەئاگایی، واتە پێچەوانەی حاڵەتی نوستن ٥ دەگوترێ: (ما أتاك في النوم واليقظة): لەحاڵەتی خەوو بێداری دا تۆم لەبیرە.

**يَقِنَ الشَّيئُ**: شتەکە چەسپاوو ئاشکراو رونە.

**يَقِنَ به**: زانیاری دەربارەی پەیداکردو لێی مەعلوم بوو ٥ **أيْقَنَه وبه**: بەمانا (يَقِنَهُ)دێ ٥ **تَيَقَّنَهُ وبه**: بەمانا (أيْقَنَه)دێ ٥ **إسْتَيْقَنَهُ وبه**: بەمانا (يَقِنَهُ ويَقِنَ به) دێ ٥ **الميقانُ**: دەگوترێ: (رجل ميقان): پیاوێکی خۆش باوەڕە هەر قسەیەکی بۆ بکرێ پێی بڕوا دەکا ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (ميقانة) ٥ **اليَقَنُ**: (رجل يقن): پیاوێکە هەرچی ببیسێ پێی بڕوا دەکاو بەلایەوە ڕاستە ٥ **اليَقِنُ**: (رجل يَقِنٌ): بەمانا (يَقَنُ)دێ ٥ **اليَقُنُ**: بەمانا (اليَقَنُ)دێ ٥ **اليَقَنَةُ من الناس**: کەسانێکن بەهەموو کەس بڕوا دەکەن ٥ دەشگوترێ: (رجل يَقَنة) تێ خرەکە بۆ موبالەغەیە ٥ **اليَقِينُ**: زانیاری بێ گومان ٥ لەبواری فەلسەفەدا یەقین بریتییە لەوەی نەفس قەناعەتی بەحوکمێك هەبێ‌و بڕواشی وابێ هەرئەوە ڕاستە ٥ هەروا وشەی (اليقين) ناوە بۆ مردن ٥ **اليَلَبُ**: تیلمە چەرم دەچێندرێ‌و تێك دەخرێ‌و دەکرێ بەکڵێتەو داپۆشەری سەر ٥ جۆرە مەتاڵێکە لەلبادو شتی وا دروست دەکرێ ٥ پۆڵا ٥ **اليَلَقُ**: رەنگی سپی بەگشتی ٥ دەگوترێ: (أبيض يَلَق) هەروا ناوە بۆ مانگای سپی بەتایبەتی ٥ **اليَلَقَةُ**: بزنی مەرەزەی سپی.

**يَلَّ** يَلِلَ يَيَلُّ يَلاً ويَلَلاً: ددانی کورت بون‌و بەرەو ناو دەمی خوار ببونەوە ٥ (فهو أيَلّ وهي يلاء) ٥ **الأيَلُّ من الحوافر**: ئاژەڵی کێوی سم کورت ٥ **اليَلاّء**: مێینەی (الأيَلّ) ٥ دەشگوترێ: (صفاة يلاّء): بەردی لوس‌و رێك ٥ **اليَلْمَقُ**: پاڵتۆ یان پۆشاکێك کەلەسەر هەموو پۆشاکەکان لەبەر دەکرێ‌و پشتێنی لەسەر دەبەسترێ.

**يَمَّ** يماً: فڕێ درایە ناو دەریاوە.

**يُمَّ** الساحلُ: ئاو کەنار روبارەکەی داپۆشی ٥ **يَمَّمَهُ**: قەصدی کرد، چوو بۆلای ٥ دەگوترێ: (يَمَّمَهُ بالرمح): بەرەب پەلاماری دا ٥ **يَمَّمَ المريضُ للصلاة**: نەخۆشەکە مەسحی دەم‌و چاوو دودەستی کرد، واتە تەیەمومی کرد بۆ نوێژکردن ٥ **تَيَمَّمَ للصلاة**: دەم‌و چاوو دودەستی بەخۆڵ مەسح کرد بۆ نوێژ ٥ **تَيَمَّمَ الشَّيئَ**: قەصدی شتەکەی کردو هەڵی پشکنی ٥ **المُيَمَّمُ**: کەسێك زەفەر بێنێ‌و بگاتە مەبەستی خۆی ٥ **اليَامُومُ**: بێچوە کۆتر ٥ **اليَمَامُ**: رەگەزی باڵندە لەپێری کۆتر ٥ تاکەکەی پێی دەگوترێ (يَمامة) ٥ **اليَمُّ**: دەریا ٥ کۆتری کێوی.

**يَمَنَ** بفلان: فلانكەسی بردە لای ڕاست ٥ لەلای ڕاستییەوە هات.

**يَمَنَ** البَلَدَ: کەوتە لای ڕاستی وڵاتەکەوە ٥ بەلای ڕاستی وڵاتەکەدا ڕۆیشت.

**يَمَنَ** فلان آله وعلى آله يُمْناً: فلانکەس پیرۆزبایی لەنەتەوەو کەس و کارەکەی کرد.

**يَمَنَ** اللهُ فلاناً يُمْناً: خودا فلانکەسی پیرۆز کرد ٥ **أَيْمَنَ**: لای ڕاستی شتەکەی گرت ٥ بوردەی یەمەنی لەبەرکرد ٥ **يَامَنَ**: لای ڕاستی گرت ٥ لای ڕاستی مەبەست بوو ٥ بۆلای ڕاستی برد ٥ **يَمَّنَ**: بەمانا (يامَنَ)دێ ٥ ویستی بچێ بۆ یەمەن ٥ بردی بۆلای ڕاست ٥ **يَمَّنَ على فلان**: پیرۆزبایی لەفلان کرد ٥ **تيامَنَ**: لای ڕاستی گرت ٥ **تَيَمَّنَ**: خۆی بە یەمەنی لەقەڵەم دا خۆی کرد بەیەمەنی ٥ دەستی ڕاستی یان قاچی ڕاستی بەکار هێنا بۆ ئیش و کار ٥ مرد ٥ **تَيَمَّنَ بالميت**: مردوەکەی لەگۆڕدا خستە سەر لای ڕاستی ٥ **تَيَمَّنَ بالشيئ**: شتەکەی بەپیرۆز زانی و لێی گەشبین بوو پێچەوانەی ڕەشبینی ٥ لەلای ڕاستەوە بۆ شتەکە چوو ٥ **إسْتَيْمَنَ بكذا**: پیرۆزیی بەشتەکەوە کردو بەلایەوە پیرۆز بوو ٥ **استَيْمَنَ فلاناً**: فلانکەسی سوێند دا ٥ **الأَيْمَنُ**: کەسێك بەدەستی ڕاستی شت دروست بکا ٥ یان بەقاچی ڕاستی ٥ **الميمون**: خاوەنی پیرۆزی و خێرو بەرەکەت ٥ **المَيْمَنَةُ**: خێرو بەرەکەت ٥ پێچەوانەی (المَيْسَرَة) ٥ **المُيَمَّنُ**: ئەوکەسەی خێرو بەرەکەت دەهێنێ ٥ **اليامن**: خاوەن خێرو بەرەکەت ٥ **اليَمَاني واليمانِيُّ**: کەسێك خەڵکی یەمەن بێ یان خۆی بەیەمەنی لەقەڵەم بدا ٥ **اليَمانية**: مێینەی (اليَماني)یە کەسێك پاڵ یەمەن بدرێ ٥ جۆ: کە گوڵەکەی سور بێ ٥ **اليُمْنُ**: خێرو بەرەکەت ٥ **اليُمْنى**: پێچەوانەی (اليُسْرَى) ٥ **اليَمْنَةُ**: لای ڕاست ٥ پێچەوانەی چەپ ٥ جۆرە بوردەیەکی یەمەنییە ٥ **اليُمْنَةُ**: جۆرە بوردەیەکی یەمەنییە ٥ **اليمين**: ڕاست ٥ پێچەوانەی چەپ ٥ خێرو بەرەکەت ٥ هێزو توانا ٥ سوێند ٥ **اليَمِينِيُّ**: ڕاست ڕەو پێچەوانەی چەپڕەو کەسێك میانڕەو بێ و حەزی لەناسانکاری و عەداڵەت بێ لەهەندێ وڵات دا نوێنەری حیزبی چەپڕەو لەلای چەپەوە دادەنیشتن و نوێنەری ڕاست ڕەوەکان کورسیەکانیان لەلای ڕاستەوە دەبێ ٥ **اليَنْبُوتُ**: بڕوانە مادەی (نَبَتَ).

**يَنَعَ** الثَّمَرُ يَيْنَعُ يَنعاً: میوەکە کاتی لێکردنەوەو چنین و ڕنینی هات.

**يَنَعَ** الشَّيْئُ: شتەکە ڕەنگی مەیلەو سوری تۆخ بوو ٥ **أَيْنَعَ الثَّمَرُ**: بەمانا (يَنَعَ)دێ ٥ **اليانِعُ**: میوەی پێگەیشتوو ٥ هەرشتێك سوربێ ٥ دەشگوترێ: (دم يانع): خوێنی زۆر سور (ثَمَرٌ يانع): میوەی ڕەنگ گرتوو، ڕەنگ گۆڕاو ٥ **اليَنَعُ**: جۆرە ئاقیقێکە ڕەنگەکەی لە نێوان سورێکی مەیلەو خوێنی تا سورێکی زەرد باو ٥ مێروی سور ٥ **اليَنِيعُ**: ئەو شتەی گەیشتبێتە ئەو پەڕی لەطافەت و پێگەیشتویی ٥ **اليَنَمُ**: تووێ گیا (قطونا) ڕوەکێکە لەوڵاتی میسرو شام دەڕوێ، بۆ ڕەوان بون گیروگرفتی قەبزی دەخورێ ٥ **اليَهْفوف**: بڕوانە مادەی (هَفَفَ).

**يَهِمَ** يَيْهَمُ يَهَماً: شێت و شەیدا بوو ٥ **الأَيْهَمُ**: مرۆڤی کەڕ ٥ ئازاو چاو نەترس ٥ نەگەڕاوە لەهیچ شتێك و چارنەکراو چەنەبەر نەهاتو ٥ بەردی لوس و پوس ٥ کێوی بەرز ٥ شاخی سەخت و بەرز کەنەتوانرێ بچیە سەری ٥ شەو کە ئەستێرەکانی دیارنەبن ٥ **الأيهمان**: جوتی

(الأيهمَ) ٥ لافاوی زۆرو ترسناكو حوشتری چەموش ٥ لافاوو ئاگر ٥ **اليَهْماءُ**: سارای کاکی بەکاکیو نەتواندرێ پێیدا بڕۆی ٥ سالّی گرانیو قاتو قڕیو بێ دەروویی رون ٥ **ياهَيَاهِ**: وشەیەکە بۆ بانگ کردن بەکاردێ ٥ وادەبێ ئەم وشەیە نیشانەی تەثنییەو کۆی پێوە دەنرێ دەگوترێ: (یاهیاهان ویاهیاهون) ٥ **يَهْيَهَ بالإبل**: بانگی حوشترەکەی کرد.

**يُوحْ**: ناوێکە لەناوەکانی خۆر ٥ **يوحي**: بەمانا (يوحُ)دێ ٥ **يَوَّدَ الدَّواءَ**: مادەی (اليود)ی تێکەڵ بەدەرمانەکە کرد ٥ **اليود**: عونصورێکی نافلزییە، ڕەقە ٥ ڕەنگی وەنەوشەیی مەیلەو ڕەشە ٥ درەوشاوەیەکی هەیە کە گەرم کرا بەحەوادا دەچێ ٥ **اليوديد**: پێکهاتەیەکی کیمیائییە، بەشەترشەڵۆکەکەی بریتییە لە ئەلیود ٥ **ياومه مياومة**: بەرۆژانە مامەڵەی لەگەڵ کرد ٥ یان بەکرێی گرت ٥ **الأيْوَمُ مِن الأيام**: رۆژی کۆتایی مانگ ٥ دەشگوترێ: (یوم أيوم): رۆژی درێژو ناخۆش ٥ **اليَوِمُ**: دەگوترێ: (يَوْمٌ يَوِمُ): رۆژگاری درێژو ناخۆش ٥ **اليَوم**: رۆژ، ماوەکەی لەخۆر هەڵاتنەوە بۆ خۆرئاوابوونە ٥ هەروا بەمانا ئێستا دێ ٥ لەبواری زانستی ئاسمانشوناسی دا وشەی (يَوْم) بریتییە لەخولێك سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆی دا، کە بەبیستو چوار سەعات ئەنجامی دەدا ٥ **أيام العرب**: رۆژگاری شەڕە خوێناوییەکانی عەرەب ٥ **أيام الله**: رۆژگاری تۆڵەستاندنەوەی پەروەردگار لەگەڵە ستەمکارە سەر ڕەقەکانی رابردو وەکوو گەلی عادو ثەمودو قەومی لوط.

# فەرهەنگی مامۆستا

## عەرەبی - کوردی

**چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم فەرهەنگە :**

* ئەڵبەتە ئەم فەرهەنگە ( عەرەبی - کوردی )یە، زمانی عەرەبیش زمانێکی ( اشتقاقي )یە، ئەمەش وا دەکات ڕیزکردنی وشەکان لەناو فەرهەنگدا بە گوێرەی (أ- ب- ت- ث.. هتد )کارێکی قورس بێت.
* هەر لە کۆنەوە زانایانی بواری فەرهەنگ بۆ ڕیزکردنی وشەگەلی ناو فەرهەنگەکانیان ڕێبازی جیاجیایان پەیڕەو کردووە، بەناوبانگترینینان دوو ڕێبازن :

ڕێبازی یەکەم : ئەوەیە وشەکان تێکڕا بە ( مجرد ) و ( مزید )ەوە بە ( أسم ) و ( فعل ) و ( حرف )ـەوە بە گوێرەی ( تلفظ ) و دەنگ ڕیزبەند بکرێن، بۆ نموونە وەکو لە قاموسی ( المنجد الأبجدي )دا پەیڕەو کراوە.

ڕێبازی دووەم : ئەوەیە : پیتی زیادە بەرچاو نەگیرێت و وشەکان بە گوێرەی پیتە ئەصڵیەکانیان ڕیز بکرێن و وشە ( مزید )ەکان ناواخن بکرێن.

ئەم فەرهەنگە بەگوێرەی ڕێبازی دووەم ڕێکخراوە، هەر وشەیەکت مەبەست بوو دەبێت ( مجرد )ەکەی بزانیت و لەم ڕوانگەیەوە بۆی بگەڕێیت و بیدۆزیتەوە.

* ئەگەر وشەکە زیاد لە مانایەکی هەبوو، ماناکان ڕیزکراون و نێوانیان بە هێمای ( ◊ ) لەبزینەیی دیاری کراوە، هەر کاتێک ئەو هێمایە دانرا نیشانەی ئەوەیە : یەکێک لە ماناکانی وشەکە تەواو بووە و ئەوەی دوای ئەو مانایەکی ترە.

نرخ: 30,000 هەزار دینار